# جیهانی سۆفیا

## "ڕۆمانێک سەبارەت بە مێژووی فەلسەفە"

نووسینی؛ یۆستاین گاردەر
وەرگێڕانی لە دانیمارکیەوە؛
بەهرۆز حەسەن

**ئەو کەسەی لە مێژووی سێ هەزار ساڵی مرۆڤ بەئاگا نەبێت، تەنها بۆ ورگی دەژی.**
**»گۆتە«**

# ناواخن

...هاوسەنگیەکی دژوار لە نێوان هێزی باشە و خراپەدا...

فەیلەسوفە سروشتیەکان

...هیچ شتێک لە «هیچ»ەوە دروست نابێت...

دیمۆکریتس «Democritus»

... بلیمەتترین گەمەی جیهان ...

چارەنووس

...«فاڵگرەوەکە» هەوڵی دەرخستنی شتێک دەدات کە لە ڕاستیدا ڕوون نیە...

سوکرات Socrates

...زیرەکترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە دەزانێت کە نازانێت...

ئەسینا

... لە نێو پاشماوەکانەوە چەندەها بینای بەرز دەرکەوتن ...

پلاتۆن «Platon»

...تاسەی گەڕانەوە بۆ ماڵی ڕاستەقینەی ڕۆح...

ژوورەکەی مێجەر

...کچی ناو ئاوێنەکە هەردوو چاوی بەیەکەوە داگرت...

ئەریستۆتالیس «Aristoteles»

...پیاوێکی وردبینی مەنهەجی بوو و دەیویست بۆچوونەکانمان ڕێک بخات...

هیللینیزمHellenism

...پریشکێک لە ئاگرەکە...

پۆست کارتەکان

...من سانسۆرێکی توندم خستۆتە سەر خۆم...

دوو بازنەی کەلتوری

...تەنها بەو جۆرە خۆت لە خولانەوە بە ئاسمانی بەتاڵدا لادەدەیت...

سەدەکانی ناوەڕاست

...بڕینی کەمێکی ڕێگاکە، مانای ئەوە نیە ڕێگای هەڵەت گرتبێت...

ڕێنیسانس «Renaissance»

...ئەی ڕەگەزی خودایی کە لە پێستی مرۆڤدا شاراویتەوە،
خۆت بناسە...

سەردەمی بارۆک"Baroque Period"

... ئێمە لە هەمان ئەو قوماشە چنراوین کە خەونی لێ چنراوە ...

دیکارت"Descartes"

..دەیویست تەواوی هەموو کەرەسە کۆنەکانی شوێنی کارەکە لابەرێت...

سپینۆزا"Spinoza"
...خودا قەرەقۆز ناجوڵێنێت...

لۆک"Locke"
... ئاگایمان هەر وەک تەختە ڕەشی ئەو پۆلەی پێش ئەوەی مامۆستا پێی تێبخات، بەتاڵ و بێمانایە ...

هیوم"Hume"
...کەواتە فڕێی بدەرە ناو ئاگرەکەوە...

بارکێلی"Berkeley"
..وەک تۆپێک بە ئاسمانەوە بەدەوری خۆرێکی ئاگریندا دەخولێتەوە...

بیرکێلی"Birkely"
... لە ڕاستیدا ئاوێنەیەکی تەلیسماوی کۆن بوو و داپیرە گەورەکەی کەمێک پێش ئەوەی شوبکات لە ژنە قەرەجێکی کڕیبوو ...

سەدەی ڕۆشنگەری «Age Of Enlightenment»
..لە شێوەی دەرزی دروستکردنەوە هەتا شێوەی تۆپ داڕشتن...

کانت «Kant»

...ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە لە سەرومەیەوە و یاسای مۆراڵیش لە ناوەوەمدایە...

رۆمانسی «Romance»

...ڕێگا پڕ نهێنیەکە بەرەو ناوەوە دەڕوات...

هیگڵ «Hegel»

...تەنها ئەو شتەی کە ئەقڵانی بێت، توانای ژیانی تێدایە...

کیاگەگۆ «Kierkegaard»

...ئەوروپا بەرەو ئیفلاسی دەڕوات...

مارکس «Marx»

...تارماییەک بەناو ئەوروپادا دەڕوات...

داروین «Darwin»

... بە بارێکی پڕ لە «جین»ەوە بەنێو ژیاندا تێدەپەڕین ...

فرۆید «Freud»

...خواستە خۆپەرست و نەگونجاوەکەی، لەناوەوەیدا دەرکەوت...

سەردەمی ئێستامان

...مرۆڤ حوکمی بەسەردا کراوە کە سەربەست بێت...

کۆبۆنەوەی باخچەکە
**...قەلە ڕەشێکی سپی...**

تێکەڵکردنی ئاوازەکان
**...دوو ئاواز یان زیاتر، کە لە هەمان کاتدا دەژەنرێن...**

تەقینەوە گەورەکە «**The Big Bang**»
**...ئێمەش گەردی ئەستێرەین...**

# باخچەی عەدەن

## ... هەرچۆنێک بێت، دەشێت شتێک لە کاتێکی دیاریکراودا، لە هیچی ڕووتەوە هاتبێتە بوون...

سۆفیا ئامۆنسن لە قوتابخانەوە بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە. پێکەوە لەگەڵ یۆرونی برادەریدا بەشێکی ڕێگاکەی بڕی. باسی ڕۆبۆتیان دەکرد. یۆرون مێشکی مرۆڤی وەک کۆمپیوتەرێکی ئاڵۆز دەبینی، بەڵام سۆفیا لەگەڵ بۆچوونەکەی یۆروندا تەواو هاویار نەبوو. مەگەر مرۆڤ لە ئامێرێک زیاتر نەبێت؟

لەلای بازاڕە گەورەکەوە جیابوونەوە و هەر یەکەو ڕێگای خۆی گرتەبەر. سۆفیا لە کۆتایی گەڕێکێکی تردا دەژیا و ڕێگای قوتابخانەکەشی دوو ئەوەندەی ڕێگای یۆرون بوو. ئەمانیش، وەک هەموو خانوەکانی تری ئەو گەڕەکە، باخچەیەکی گەورەیان هەبوو. بەڵام لەوە دەچوو ماڵەکەیان کەوتبێتە کۆتایی دونیاوە، چونکە لە پشت باخچەکەیانەوە هیچ خانوویەکی تری لێنەبوو. لەوێوە ئیتر دارستانە چڕەکە دەستی پێدەکرد.

سۆفیا بەرەو کۆڵانی کلۆیڤە وەرچەرخا. پێچێکی تیژ کەوتبووە کۆتایی ڕێگاکەوە و زیاتریش پێیان دەگوت "پێچی کەپتاین". ڕۆژانی شەمە و یەکشەممان خەڵکی بەوێدا تێدەپەڕین، دەنا بەدەگمەن کەس لەو ناوەدا دەبینرا.

سەرەتای مانگی پێنج بوو. گوڵە نێرگزی چڕ، ژێر دار میوەی ناو هەندێک لە باخچەکانی تەنیبوو. دار بییەکانیش هەر لە ئێستاوە بەگەڵای سەوز و ناسک داپۆشرابوون.

سەیرە ... چۆنە هەموو شتێک لەم وەرزەدا سەرلەنوێ ئاوها نەشونما دەکاتەوە؟ چی وا لەم گشتە سەوزاییە دەکات، هەر خێرا لە پاش گەرمبوونی ئاو و هەوا و توانەوەی دوا پاشماوەی بەفر، لەو زەوییە بێگیانەوە بێنە دەرەوە؟

سۆفیا دەرگای باخچەکەیانی کردەوە و تەماشایەکی سندوقی پۆستەکەی کرد. زۆربەی جار پڕبوو لە ڕۆژنامەی شتومەک فرۆشتن و هەندێک نامەی گەورە کە بۆ دایکی دەهاتن. ئەو هەموو ڕۆژێک پێش ئەوەی بچێتە ژوورەکەی خۆی و دەست بە خوێندن بکات، وا ڕهاتبوو سەفتەیەک نامە و ڕۆژنامە لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانێت.

باوکیشی جارجارێک نامەی لە بانکەوە بۆ دەهات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەویش باوکێکی تەواو ئاسایی نەبوو. باوکی سۆفیا کەپتاینی کەشتیەکی گەورەی نەوتکێش بوو و زۆربەی زۆری ساڵەکە نەدەکەوتە ماڵەوە. کاتێکیش کە بۆ چەند هەفتەیەک دەهاتەوە، بە خشەخشی سەرپاییەکانی سەر پێیەوە لە ماڵەکەدا دەهات و دەچوو و کاتێکی خۆشی لەگەڵ سۆفیا و دایکیدا دەبردەسەر. بەڵام لە کاتی کەشتیوانیدا بەتەواوەتی دەبووە کەسێکی دوورەدەست.

ئەمڕۆکە تەنها یەک نامەی بچوک لە سندوقی پۆستەکەدا دەبینرا، ئەویش بۆ سۆفیا هاتبوو. لەسەر زەرفەکە نووسرابوو "سۆفیا ئامۆنسن، کۆڵانی کلۆیڤە ژمارە 3" و هیچی تر. نە پولی لێدرابوو و نە ناوی ئەو کەسەشی پێوەبوو کە ناردبووی.

سۆفیا دەرگاکەی بەدوای خۆیدا داخست و نامەکەی کردەوە. پارچە کاغەزێکی چکۆلەی بەرچاوکەوت، کە لە ئەندازەی زەرفەکە گەورەتر نەبوو. بەدەست لەسەری نووسرابوو: تۆ کێیت؟

هیچ شتێکی تری تێدا نەنووسرابوو. تەنانەت سڵاو و ناوی نێردەریشی پێوە نەبوو. تەنها ئەو دوو وشەیە و تەواو، لە کۆتایشدا نیشانەیەکی پرسیاری گەورەی بەدوادا دانرابوو.

دیسانەوە تەماشای زەرفەکەی کردەوە... ڕاستە، نامەکە بۆ ئەو هاتووە، بەڵام کێ خستبوویە ناو سندوقی پۆستەکەیانەوە؟

سۆفیا بەپەلە چووە ناو خانووە ڕەنگ ئاڵەکەیانەوە. وەک هەموو جارێکیش، پێش ئەوەی دەرگاکە بەدوای خۆیدا دابخات، پشیلەکەی "شێریکان" بە ئەسپایی بە پەرژینەکەدا هاتە ئەمدیوەوە و بە قەڵەمبازێک خۆی گەیاندە سەر پلیکانەکان و خۆی کرد بە ژووردا.

ـ پش، پش، پش!

زۆر جار کە دایکی سۆفیا لە شتێک توڕە دەبوو، هاواریدەکرد و دەیگوت ماڵەکەمان بووە بە تەویلەی گیانەوەران. هەڵبەتە مەبەستی لەو گیانەوەرانە بوو کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بە مەبەستی نیشاندانیان دەگوێزرێنەوە. بەڵام سۆفیا لە هەموو بارێکدا دڵی بە گیانەوەرەکانی خۆشبوو. یەکەمجار ماسیە ئاڵتونییەکانیان بۆ کڕی: پێی دەگوتن سەر زەرد و ڕەشە و کڵاوسوور، پاشانیش کیسەڵێک کە ناوی نابوو "گۆڤیندا"، ئەوجا دوو توتی ئوسترالی و دواجاریش پشیلە پڵنگیە زەردەکەیان بۆ کڕی کە پێی دەگوت "شێریکان". بێ هۆ ئەو هەموو گیانەوەرانەیان بۆ نەکڕیبوو، بەڵکو لە ڕاستیدا وەک دڵنەواییەک بوون بۆی، چونکە لە لایەکەوە باوکی سەفەری دوور و درێژی بە جیهاندا دەکرد و لەلایەکی تریشەوە دایکی درەنگانێک لەسەر کار دەهاتەوە.

سۆفیا جانتای قوتابخانەکەی لە خۆی کردەوە و قاپێک خواردنی پشیلەی بۆ شێریکان دانا، پاشان بە نامە نهێنیەکەی دەستییەوە لەسەر کورسیەک دانیشت.
تۆ کێیت؟
بەڕاستی وەڵامی ئەو پرسیارەی لانەبوو. بێگومان ئەو سۆفیا ئامۆنسن بوو، بەڵام ئەی ئەو کێیە؟ ئەو هێشتام بەتەواوەتی پەی بەو مەتەڵە نەدەبرد.
چی ڕوویدەدا گەر ناوێکی تری هەبوایە؟ بۆ نمونە ئانا کنووسن، ئایا ئیتر ئەوسا دەبووە کەسێکی دی؟
لە پڕێکدا خۆزگەکەی باوکی بیرکەوتەوە، کاتی خۆی حەزیکردووە ناوی بنێت سینۆڤە. سۆفیا بە خەیاڵ دەستی بۆ تەوقە ڕادەکێشا و خۆی بە ناوی سینۆڤەوە دەناساند، بەڵام هەرچۆنێکی دەکرد ڕێنەدەکەوت، چونکە بەو شێوەیە هەمیشە هەستیدەکرد کچێکی ترە کە خۆی دەناسێنێت.
پاشان بە نامە سەیرەکەی دەستییەوە بەرەو گەرماوەکەیان ڕۆیشت و بەرامبەر ئاوێنەکە وەستا. ڕێک تەماشای ناو چاوی خۆی کرد و گوتی:
ـ من سۆفیا ئامۆنسنم.
کچی ناو ئاوێنەکەش بە هیچ جۆرێک وەڵامی نەدایەوە، تەنانەت دەموچاویشی گرژ نەکرد. سۆفیا هەرچیەکی دەکرد، کچی ناو ئاوێنەکەش هەمان شێوەی دووبارە دەکردەوە. ئەو دەیویست بە جوڵەیەکی خێرا دەستپێشکەری لە ئاوێنەکە بکات، بەڵام کچی ناو ئاوێنەکەش بە هەمان خێرایی دەجوڵایەوە، ئەوجا لەبەرخۆیەوە پرسی:
ـ تۆ کێیت؟

دیسانەوە هیچ وەڵامێکی دەست نەکەوت، بەڵام بۆ ساتێک دوودڵی گرتی، نەیدەزانی خۆی پرسیاری کرد یان کچی ناو ئاوێنەکە؟
سۆفیا پەنجەی دۆشاومژەی خستە سەر لوتی کچی ناو ئاوێنەکە و گوتی:
ـ تۆ منیت.
کە هیچ وەڵامێکی دەستگیر نەبوو، ڕستەکەی هەڵگەڕاندەوە:
ـ من تۆم.
سۆفیا هەموو کاتێک سیمای خۆی بەدڵ نەبوو. گەلێک جار پێیان دەگوت دوو چاوی شێوە بایەمی جوانت پێوەیە، بەڵام ئەمەیان زیاتر لەبەرئەوە دەگوت چونکە لوتی زۆر بچکۆلە و دەمیشی کەمێک گەورەبوو. جگە لەوانەش گوێچکەکانی تەواو لە چاوەکانیەوە نزیکبوون. قژە خاوەکەشی لە هەموو شتێک خراپتر بوو، مەحاڵبوو دابهێنرێت. جارجارێک باوکی دەستی بە قژیدا دەهێنا و لەسەر ناوی پارچە مۆسیقایەکی کلاوس دیبۆسی، پێی دەگوت "کچە قژ کەتانییەکە". هەڵبەتە بۆ ئەو سانا بوو وای پێ بڵێت، چونکە خۆی بەدرێژایی ژیانی حوکمی قژێکی ڕەشی ئاوها خاوی بەسەردا نەدرابوو. هیچ جۆرە کەفێک یان کرێمێک یاریدەی قژە خاوەکەی سۆفیای نەدەدا ڕێک بوەستێت.
هەندێ جار بەهۆی سیمای سەیری خۆیەوە، هەستیدەکرد بە نوقسانی لەدایک بووە. بەهەرحاڵ دایکی دەیگوت سۆفیا بە لە دایکبوونێکی سەخت هاتۆتە دونیاوە. بەڵام ئایا شێوەی لەدایکبوون سیمای مرۆڤ دەستنیشاندەکات؟
ئایا سەیر نییە کە نازانێت خۆی کێیە؟ ئایا ناهەقیش نیە کە ناتوانێت سیمای خۆی هەڵبژێرێت؟ ئەمە شتێکە بەسەریدا داسەپاوە و

تەواو. لەوانەیە خۆی بتوانێت برادەرەکانی هەڵبژێرێت، بەڵام خۆی خۆی هەڵنەبژاردووە. تەنانەت لەدایکبوونیشی وەک مرۆڤێک بە بڕیاری خۆی نەبووە.

مرۆڤ چییە؟

سۆفیا دیسانەوە تەماشای کچی ناو ئاوێنەکەی کردەوە و وەک ئەوەی داوای ڕوخسەتی لێبکات، گوتی:

- پێموابێت باشترە بچمە سەرەوە و خەریکی وانەی زیندەوەرناسی بم... پاش ماوەیەکی کەم خۆی لەناو دالانەکەدا بینیەوە... بەڵام سەرلەنوێ ڕای گۆڕیەوە:

"نا باشترە بچمە ناو باخچەکەوە."

- پش، پش، پش!

سۆفیا بەپەلە پشیلەکەی دەرکردە سەر پلیکانەکان و دەرگاکەی لەپاش خۆی داخست.

بەنامەکەی دەستیەوە لەسەر زیخی بەردەرگاکە وەستا، لە پڕێکدا ختورەیەکی سەیری بەدڵدا هات: هەستیدەکرد تا ئەو کاتە بووکەشوشەیەک بووە و لە پڕێکدا بە جادوویەک گیانی بە بەرداکراوە.

چەندە سەیرە لە ژیانێکی ئاسایدا بژیت و لە پڕێکدا خەیاڵت بچێتە سەر چیرۆکێکی پڕ نهێنی ئاوها؟

شێریکان بە هێواشی لەسەر زیخەکەوە بازێکیدا و خۆی لە نێوان دەوەنەکاندا ونکرد. چەندە پشیلەیەکی پڕ لە ژیانە، هەر لە پچوکترین تاڵی سپی سەریەوە هەتا کلکە شۆڕەکەی ژیانی تێدا دەبینرێت. ئەویش لە باخچەکەدایە، بەڵام بە هەمان شێوەی سۆفیا بەئاگا نیە لە شوێنی بوونی.

سۆفیا هێدی هێدی بیری لە ژیان و بوونی دەکردەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا بیری لەوەش دەکردەوە کە بۆ هەمیشە لەم جیهانەدا نابێت. ئەو لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"ئێستاکە من لەم جیهانەدام، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان ماڵئاوایی لێدەکەم."

بڵێیت ژیان لە پاش مردن هەبێت؟ بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارەی لەلای پشیلەکەی دەستنەدەکەوت.

شەش مانگێک بەسەر مردنی نەنکی سۆفیادا تێپەڕبووە، بەڵام ئێستاکەش سۆفیا هەر بیری داپیرەی دەکات. ناهەق نیە ژیان ئاوها ڕۆژێک لە ڕۆژان کۆتایی پێدێت؟

بۆ ماوەیەک سۆفیا لەسەر زیخەکە مایەوە و بە قووڵی بیری دەکردەوە. بە هەموو هێز و توانایەکیەوە هەوڵیدەدا بیر لە ژیانی بکاتەوە، بەڵکو بەو جۆرە بیرکردنەوەی مردن لە مێشکی دەربهێنێت. بەڵام هەرچەندێکی دەکرد نەیدەتوانی. هەرکاتێک سەرنجی لە بوون و ژیانی ئێستاکەی خۆی دەدا، بیری کۆتایی هاتنی ژیانیشی تێکەڵاوی ئەندێشەکانی دەبوو. هەمان شتیش بوو کە دەیویست بە پێچەوانەوە بیربکاتەوە: کە زۆر بە قووڵی هەستیدەکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان دەشێ لە ژیاندا نەمێنێت، ئەوسا بە تەواوەتی مانای مەزنی ژیانی بۆ ڕووندەبووەوە. هەمیشە هەر وەک دوولای پارەیەکی ئاسن وابوو کاتێک بەردەوام هەڵیدەگێڕیتەوە. هەتاوەکو دیوێکی گەورەتر و ئاشکراتر بوایە، دیوەکەی تریشی گەورەتر و ئاشکراتر دەردەکەوت. ژیان و مردن وەک دوو ڕووی هەمان کێشە دەردەکەوتن.

ئێمە ئەگەر مردن نەهێنینە بەر چاومان، ناتوانین هەست بە ژیانمان بکەین. بەڵام بە هەمان شێوەش ئەگەر بیر لە تایبەتێتی و ئەفسونی ژیان نەکەینەوە، ناگونجێت بیر لە مردن بکەینەوە.

سۆفیا قسەیەکی نزیک بەم بابەتەی نەنکی بیرکەوتەوە. کاتێک پزیشکەکان پێیان گوتبوو نەخۆشیەکەت کوشندەیە، گوتبووی: "تەنها ئێستاکە دەزانم ژیان چەندە پڕمانایە."

جێگەی داخە زۆربەی خەڵکی هەتا تووشی نەخۆشییەکی کوشندە نەکەون، تێناگەن بوونیان لە ژیاندا چەندە پڕ مانایە. یان بەلایەنی کەمەوە ئەو کاتە تێدەگەن کە نامەیەکی پڕ نهێنیان بۆ بخرێتە ناو سندوقی پۆستەکەیانەوە!

لەوانەیە وا باشتربێت دیسانەوە تەماشای سندوقی پۆستەکەی بکاتەوە، بەڵکو نامەی تری بۆ هاتبێت؟ سۆفیا بەپەلە بەرەو دەرگای دەرەوە ڕایکرد و سندوقە سەوزەکەی کردەوە. نامەیەکی وەک نامەکەی پێشوتری بەرچاوکەوت و تەواو سەریسوڕما. بەڵام... بەڵام سۆفیا دڵنیابوو لە پاش نامەی یەکەم بەدەستی خۆی سندوقی پۆستەکەی بەتاڵکردبووەوە!

دیسانەوە ناوی سۆفیا لەسەر ئەم نامەیەش نووسرابوو. نامەکەی کردەوە و پارچە کاغەزێکی دەرهێنا، لەسەر ئەم یەکەیان نووسرابوو:

جیهان چۆن دروستبووە؟

سۆفیا لە دڵی خۆیدا گوتی؛ "چوزانم، کەس هەیە بتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە؟" بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستیدەکرد پرسیارێکی بەجێ بێت و شایستەی خستنەڕووبێت. بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا بیری لەوە کردەوە کە سەختە بتوانین لە جیهانێکدا هەڵکەین، بەبێ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە پرسیار لە چۆنیەتی دروستبوونی نەکەین.

نامە نهێنییەکان تەواو سەریان لە سۆفیا شێواند، لەبەرئەوە بڕیاریدا بەرەو کوخەکەی بڕوات.
کوخەکەی شوێنی هەرە نهێنی خۆ حەشاردانی سۆفیا بوو. ئەو تەنها ئەو کاتانە دەچووە ئەوێ کە تەواو دڵڕەنجاو و تووڕە بوایە، یان ئەو کاتانەی لەو پەڕی خۆشیدا بوایە. بەڵام ئەمڕۆکە تەنها مێشکی ئاڵۆزکاوە.
خانووە ڕەنگ ئاڵەکەیان لەناو باخچەیەکی گەورەدا دروستکرابوو. لەوێدا گوڵ و گوڵزارێکی زۆر، توترک و داری میوەی جیاواز جیاوازیان ڕواندبوو. جگە لەوەش چیمەنێکی پان و بەرینیان هەبوو و جۆلانەیەکیان تێدا دانابوو. کاتی خۆی کە نەنکی منداڵی یەکەمی پاش چەند ڕۆژێک لەدوای لەدایکبوونی مردبوو، باپیرەی خانۆچکەیەکی لە باخچەکەدا بۆ دروستکردبوو. ئەو کچە کۆرپە بەستەزمانە ناوی ماریا بوو. لەسەر کێلەکەی ئەم دوو دێڕەیان هەڵکەندبوو؛ "ماریای گچکە بۆلای ئێمە هات، کەچی سەلامێکی کرد و گەڕایەوە."
لە خوارووی یەکێک لە گۆشەکانی باخچەکەدا، لە پشت توترکە سوورەکانەوە، دەوەنێکی چڕ و پڕ هەستابوو، نە تووی تێدا دەڕوا و نە گوڵیش. لە پشتی پشتەوەشدا پەرژینێکی بەتەمەن سنووری ناوەوەی باخچەکەی بەرامبەر دارستانە گەورەکە نەخشاندبوو. بەڵام لەبەرئەوەی بیست ساڵبوو کەس نەچووبوو بەلایدا، ببوو بە دەوەنێکی چڕی سەخت و مەحاڵبوو کەس بتوانێت بەناویدا تێپەڕێت. نەنکی دەیگوت لەکاتی شەڕی جیهانی دووهەمدا ڕێویەکان بۆ ڕاوە مریشک دەهاتەنە ناو باخچەکەوە و پەرژینەکە کەمێک ڕێگای لێدەگرتن...

هەڵبەتە ئەو کاتە مریشکەکان بە ئارەزووی خۆیان لە باخچەکەدا دەهاتن و دەچوون.
هەمووان، جگە لە سۆفیا، ئەو پەرژینە کۆنەیان هەروەک کولانەی کەروێشکەکانی سەرەوەی باخچەکە بێسوود دەبینی. بەڵام لە ڕاستیدا هیچیان پەیان بە نهێنی سۆفیا نەدەبرد.
لەوەتەی سۆفیا بەبیریبێتەوە، ئەو پەرژینە چڕە کونێکی تەنگی تێدا بووە. بە سکەخشێ پێیدا تێدەپەڕی و پاش کەمێک لە نێو دەوەنەکاندا دەگەشتە کوخێکی بەرین. هەروەکو کەپرێکی بچکۆلە وابوو. لەوێدا تەواو دڵنیابوو کە کەس نەیدەتوانی بیدۆزێتەوە.
بە هەردوو نامەکەی دەستیەوە بەناو باخچەکەدا ڕایکرد و پاشان بە چوارچنگۆڵە خۆی گەیاندە کوخەکەی. ناوەوەی کونەکە هێندە گەورەبوو کە بەئاسانی دەیتوانی بەپێوە تێیدا بوەستێت. هەندێ ڕەگی پیرە دارەکانیش بۆ دانیشتن دەشیان. لەوێوە دەیتوانی لە نێوان بۆشاییە چکۆلەکانی لق و گەڵاکانەوە تەماشای دەرەوە بکات. هەرچەندە هیچ یەکێک لە بۆشاییەکان لە پێنج کرۆنیەک گەورەتر نەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیتوانی تەواوی هەموو باخچەکە ببینێت. لە کاتی منداڵیشیدا چێژی لە بینینی دایک و باوکی دەبینی کە لەنێو دارەکاندا بەدوایدا دەگەڕان.
سۆفیا هەمیشە هەستیدەکرد باخچەکە خۆی بۆ خۆی جیهانێک بێت. هەموو جارێک کە لە ئینجیلدا باسی باخچەی عەدەنی بەرگوێ دەکەوت، وا دەهاتە بەرچاوی لە کوخەکەی خۆیدا دانیشتبێت و تەماشای بەهەشتە چکۆلەکەی خۆی بکات.
"جیهان چۆن دروست بووە؟"

نەخێر، ئەو وەڵامی ئەم پرسیارەی نەدەزانی. بەڵام دەیزانی زەوی ئەستێرەیەکی پچکۆلەیە و لەناو گەردوونێکی گەورەدایە. ئەی ئەو گەردوونە چۆن دروستبووە؟
بێگومان دەشێت بڵێین گەردوون هەمیشە هەر هەبووە، بەم جۆرەش هەر لە سەرەتاوە هیچ پێویست ناکات بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا بگەڕێین کە دەڵێت چۆن دروست بووە. بەڵام ئایا ڕێیتێدەچێت شتێک هەمیشە هەر هەبووبێت؟ شتێک لە ناوەوەی سۆفیادا دژی ئەو بۆچوونە دەوەستایەوە. هەموو شتێک کە بوونی هەیە دەشێت سەرەتایەکی هەبووبێت، وا نیە؟ کەواتە گەردوونیش بە هەمان شێوە دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان لە شتێکی ترەوە هاتبێتە بوون.
بەڵام ئەگەر گەردوونیش لە پڕێکدا لە شتێکی ترەوە دروستبووبێت، ئەوا دەبێت ئەو شتەش لە ڕەچەڵەکدا لە شتێکی ترەوە هاتبێت. سۆفیا هەستیدەکرد تەنها گرفتەکە پاش دەخات. کەواتە هەرچۆنێک بێت، دەشێت شتێک لە کاتێکی دیاریکراودا لە هیچی ڕووتەوە هاتبێتە بوون. بەڵام ئایا ئەمەشیان ڕێی تێدەچێت؟ ئایا ئەمەش بەهەمان شێوە نەگونجاو نیە؟ ئایا ئەمەش وەک ئەوە نیە کە مەزەنەبکەین جیهان هەمیشە هەر هەبووبێت؟
لە قوتابخانەدا وا فێرکراون کە خودا جیهانی خوڵقاندووە، ئێستاکەش سۆفیا بە ناچاری هەوڵی پەسەندکردنی ئەو چارەیە دەکات. بەلای سۆفیاوە لە هەموو بارێکدا ئەمە باشترین چارەی گرفتەکەیە. بەڵام دیسانەوە بیرکرنەوەکان سەر هەڵدێننەوە. ئەو تەواو ڕازیبوو بەوەی یەزدان گەردوونی خوڵقاندووە، بەڵام ئەی خوا خۆی چی؟ خۆ خودی خۆی لە هیچی ڕووت نەهێناوەتە بوون؟ دیسانەوە شتێک لە ناوەوەیدا دژی دەوەستایەوە. هەرچەندە خوا بە دڵنیاییەوە دەتوانێت هەموو

شتێک بخوڵقێنێت، بەڵام ئەگەر لە پێشدا "خودی خۆی" نەبووبێت کە شتی پێ بخوڵقێنێت، ئەوا مەحاڵە بتوانێت خۆی خۆی بهێنێتەبوون. کەواتە تەنها یەک ئەگەر ماوەتەوە؛ خودا هەمیشە بوونی هەر هەبووە. بەڵام سۆفیا هەر لە سەرەتاوە وازی لەم ئەگەرە هێنا! هەرچی شتێک کە بوونی هەیە، دەشێت سەرەتایەکیشی هەبووبێت.

ـ نەفرەتت لێ بێت شەیتان!

دیسانەوە نامەکانی کردەوە.

"تۆ کێیت؟"

"جیهان چۆن دروست بووە؟"

دوو پرسیاری چەندە بێ مانان! ئەی باشە کێ ئەم نامانەی ناردووە؟ ئەمەشیان پڕە لە نهێنی.

کێ بوو سۆفیای لە ژیانی ڕۆژانە دەرهێنا و لە پڕێکدا ڕووبەڕووی مەتەڵی گەورەی گەردوونی کردەوە؟

بۆ جاری سێهەم سۆفیا چووەوە سەر سندوقی پۆستەکە.

کەمێک لەوەوبەر پۆستەچیەکە بەوێدا تێپەڕی و پۆستی ڕۆژەکەی دانا. سۆفیا کۆمەڵێک ڕیکلام و ڕۆژنامەی دەرهێنا، یەک دوو نامەشی بەرچاوکەوت کە بۆ دایکی هاتبوون. پۆستکارتێکیشی تێدابوو کە وێنەی یەکێک لە قەراغ دەریاکانی باشوری لەسەربوو. سۆفیا تەماشای پشتی کارتەکەی کرد، پولی نەرویجی و مۆری بەتالیۆنی نەتەوە یەکگرتووەکانی پێوەبوو. بڵێیت بابە ناردبێتی؟ مەگەر ئەو لە شوێنێکی تەواو جیاوازدا نەبێت؟ تەنانەت دەست و خەتەکەش هی ئەو نیە.

ترپەی دڵی سۆفیا لەگەڵ بینینی ناوی سەر پۆستکارتەکەدا خێراتر لێیدەدا؛ "هیلدە میوللە کنەی، لە ڕێگەی سۆفیا ئامۆنسنەوە، کۆڵانی

کلۆیڤە ژمارە سێ..."کۆتایی ئەدرێسەکەشی هەمووی تەواوبوو. لەسەر پۆستکارتەکە نووسرابوو؛
"هیلدە گیان، هەزارجار جەژنی پانزە ساڵەی لەدایکبوونت پیرۆزبێت. هەروەک دەزانیت دەخوازم دیارییەکت پێشکەشبکەم کە پێی گەورەبیت. ببورە کارتەکە بۆ سۆفیا دەنێرم. بەم جۆرە کارەکەم ئاسانتر دەبێت... سڵاوی خۆشەویستانەی بابە."
سۆفیا تەواو مێشکی ورووژا، بەڕاکردن گەڕایەوە ماڵەوە و خۆیکرد بە چێشتخانەکەیاندا .
ئەو هیلدەیە کێیە کە تەمەنی بۆتە پانزە ساڵان، لە کاتێکدا جەژنی پانزەساڵەی لەدایکبوونی خۆی تەنها نزیکەی مانگێکی ماوە؟
سۆفیا کتێبی تەلەفونەکەی لە دالانەکەدا دۆزییەوە. زۆر کەسی بە ناوی میوللەوە بینی، هەندێکیش ناویان کنەی بوو، بەڵام لە هەموو ئەو کتێبە ئەستورەدا هیچ کەسێکی نەبینی کە ناوی هیلدە میوللە کنەی بێت .
جارێکی تریش بە ووردی تەماشای کارتە پڕ نهێنیەکەی کردەوە... بەڵێ، کارتێکی ڕاست و دروست بوو، مۆر و پولیشی لێدرابوو. بۆچی باوکی هیلدە کارتی پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایکبوونی کچەکەی بۆ سۆفیا دەنێرێت، لە کاتێکدا سوور دەزانێت دەبوایە بۆ شوێنێکی تری بناردایە؟ چ باوکێک بەدەستی ئەنقەست دەخوازێ کچی خۆی هەڵخڵەتێنێت و کارتی ڕۆژی لەدایکبوونەکەی بۆ شوێنێکی تر ڕەوانەبکات؟ پاشانیش نووسیویەتی "بەم جۆرە کارەکەم ئاسانتر دەبێت"، چۆن چۆنی ئاسانتر دەبێت؟ لە سەرو هەموو شتێکیشەوە سۆفیا چۆن هیلدە بدۆزێتەوە؟

بێگومان سۆفیا توشی گرفتێکبووە و پێوەی دەتلێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوشدا سەرلەنوێ هەوڵی ڕێکخستنەوەی بیرکردنەوەکانی دا:
لە ماوەی یەک دوو کاتژمێری پاشنیوەڕۆیەکدا ڕووبەڕووی سێ مەتەڵ کرایەوە، یەکەمیان؛ کێ ئەو دوو نامە سپییەی خستبووە ناو سندوقی پۆستەکەیانەوە؟ دووهەمیان پرسیارە سەختەکانی ناو نامەکان بوون.
سێهەمیش ئەو هیلدە میوللەیە کێیە و بۆچی کارتی پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایکبوونی ئەو کچە نامۆیە بۆ سۆفیا نێردراوە؟
سۆفیا تەواو دڵنیابوو هەموو مەتەڵەکان بە شێوەیەک لە شێوەکان دەشێ پەیوەندیەکیان پێکەوە هەبێت، چونکە هەتاوەکو ئەمڕۆ ژیانێکی ئاسایی دەژیا.

# کڵاوە درێژەکە
## ...گەر تەنها توانای تێڕامانمان هەبێت،
## دەتوانین ببینە فەیلەسوفێکی لێهاتوو...

سۆفیا تەواو دڵنیابوو خاوەنی نامە نهێنیەکانی پێشوو، جارێکی تریش پەیوەندی پێوە دەگرێتەوە. هەر لەبەرئەوەش لە کاتی ئێستادا بڕیاریدا باسی نامەکان لای هیچ کەسێک نەدرکێنێت.
لە قوتابخانەشدا پڕاوپڕ نەیدەتوانی گوێ بۆ مامۆستاکانی شلبکات. بەبڕوای سۆفیا ئەوان تەنها باسی بابەتی لابەلایان دەکرد. بۆچی لەبری ئەوە باسی سروشتی مرۆڤیان نەدەکرد؟ یان بۆچی باسی جیهان و چۆنیەتی خولڵقاندنی ناکەن؟
لە پڕێکدا شتێکی بە خەیاڵدا هات کە هەرگیز لەوەوپێش بیری لێ نەکردبووەوە؛ خەڵکی چ لە قوتابخانە و چ لە شوێنەکانی تریشدا کەم تا زۆر سەرقاڵی شتی کاتی و لاوەکین. لە هەمان کاتدا کۆمەڵێ پرسیاری سەختمان هەیە کە وروژاندنیان لە پرسیارە ئاساییەکانی قوتابخانە سەختتر و گرنگترە.
کەس هەیە وەڵامی ئەو پرسیارانە بزانێت؟ بەلای سۆفیاوە بیرکردنەوە لەو پرسیارانە زۆر گرنگترە لەوەی پاش خۆ ماندووکردنێکی زۆر شێوەی گۆڕینی کردارەکانی زمانێک لەبەرکات.
زەنگی تەواوبوونی دواهەمین وانە لێدرا و بەپەلە پۆلەکەی جێهێشت. یۆرونیش بۆ ئەوەی پێیبگاتەوە، ناچاربوو بەدوایدا ڕابکات.
پاش ماوەیەکی کەم یۆرون گوتی؛
ـ تاقەتت هەیە ئێوارە یاری کاغەزێن بکەین؟
سۆفیا شانی هەڵتەکاند؛

ـ پێموانیە چیتر تاقەتی یاریکردنی کاغەزم هەبێت؟
یۆرون باوەڕی بە گوێچکەکانی خۆی نەدەکرد.
ـ هێی، تاقەتت نیە؟ باشە دەڵێیت چی وازی ڕیشە بکەین؟
سۆفیا چاوی بڕیبووە جادە قیرەکە، پاشان سەری هەڵبڕی و تەماشای هاوەڵەکەی کرد؛
ـ وابزانم تەنانەت یاریکردنی ڕیشەش خۆش نیە.
ـ ئێی... خۆش نیە؟
سۆفیا لە دەنگی یۆروندا هەستی بە تۆنێکی نائومێدیکرد.
ـ ئەی دەتوانیت پێمبڵێیت چ شتێک بەلاتەوە گرنگە؟
سۆفیا بە ئاستەم سەرێکی ڕاوەشاند.
ـ ئەوە... ئەوە نهێنیەکی خۆمە.
ـ ئمم! دڵنیام کە ئاشقبوویت!
کچان بەبێ ئەوەی هیچ بڵێن بۆ ماوەیەکی زۆر بە ڕێگادا دەڕۆشتن. کاتێکیش گەیشتنە یاریگای فتبۆڵێنەکە، یۆرون گوتی؛
ـ من بەناو یاریگاکەدا دەڕۆم.
بێگومان "بەناو یاریگاکەدا" نزیکترین ڕێگابوو بۆ ماڵی یۆرون، بەڵام تەنها ئەو کاتانە بەوێدا دەڕۆی کە پەلەی بوایە، بۆ نمونە کاتێک کە میوانیان هەبووایە، یان کاتێک کە دەبوایە بڕۆیشتایە بۆ لای دکتۆری دانەکەی.
سۆفیا پێی ناخۆشبوو هەستی یۆرونی بریندارکرد، بەڵام چی پێ بگوتایە؟ بیگوتایە لە پڕێکدا سەرقاڵی ئەوە بووم کە بزانم خۆم کێم و گەرەکمە بزانم جیهان چۆن سەریهەڵداوە؟ یاخود کاتی یاریکردنی ڕیشەم نیە؟ بڵێیت هاوەڵەکەی لەمە تێبگەشتایە؟

بۆچی دەبێت بایەخدان بەو پرسیارە گرنگانە، وە لە هەمان کاتیشدا ئەو پرسیارە ئاساییانە، هێندە سەخت بێت؟

سۆفیا گەیشتەماڵەوە و دیسانەوە لەکاتی کردنەوەی سندوقی پۆستەکەدا، هەستیکرد دڵی خێراتر لێدەدات. یەکەمجار نامەیەکی بانکی بەرچاوکەوت و پاشان هەندێ نامەی گەورەی زەرد کە بۆ دایکی هاتبوون. هێی... سۆفیا ئوێدەواربوو نامەیەکی نوێی لە کەسە نەناسراوەکەوە پێبگات.

دەرگای سندوقەکەی داخست و ناوی خۆی لەسەر یەکێک لە نامە گەورەکان بەدیکرد. لە پشتی نامەکەدا نووسرابوو؛ "کۆرسی فەلسەفە. دەشێ زۆر بە وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت."

سۆفیا بەسەر زیخی بەر ماڵەکەیاندا ڕایکرد، جانتای قوتابخانەکەی لە خۆی دامالًی و خستیە سەر پلیکانەکان. نامەکانی تریشی خستە ژێر حەسیری بەر دەرگاکە، پاشان بە ڕاکردن بەرەو باخچەی پشتەوە هەڵهات و خۆی گەیاندە کوخەکەی... نامە گەورەکە دەبێت لەوێدا بکرێتەوە.

شێریکانیش بەڕاکردن دوایکەوت، بەڵام سۆفیا گوێی نەدایە، دەیزانی پشیلەکەی هیچ شتێک بۆ هیچ کەسێک ناگێڕێتەوە.

نامەکە سێ پەڕەی گەورەی چاپکراوی تێدابوو، بە کلێبسێکیش پێکەوە نووسێنرابوون. سۆفیا دەستی بە خوێندنەوە کرد؛

**فەلسەفە چیە؟**

سۆفیای ئازیز؛

خەڵکی چەندەها ئارەزووی جۆرا و جۆریان هەیە. هەندێ کەس پارەی کۆن کۆدەکەنەوە، هەندێکی دی سەرقاڵی ئیشی دەستن، خەڵکانێکی

تریش زۆربەی کاتی بەتاڵیان بە جۆرە وەرزشێکی تایبەتیەوە دەبەنەسەر.
خەڵکانێکی زۆریش هەن حەز بە خوێندنەوە دەکەن، بەڵام هەر کەسە و ئارەزووی بابەتێکی تایبەتی دەکات؛ هەندێک تەنها ڕۆژنامە یان زنجیرە چیرۆکی وێنەی کارتۆنی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان دەخوێننەوە. هەندێکی دی حەز بە خوێندنەوەی ڕۆمان دەکەن، لە کاتێکدا خەڵکانێکی تر وای بەباش دەزانن کتێبی هەمەڕەنگ بخوێننەوە، بۆ نمونە دەربارەی ژیانی ئاژەڵ یان لە بابەت ئەستێرە ناسیەوە یاخود دەربارەی داهێنانە تەکنیکیەکان دەخوێننەوە.
بەڵام ئەگەر من بۆ نمونە ئەسپ سواریم بەلاوە خۆش بێت، یان خولیای خشڵ کۆکردنەوەبم، ئەوا ناتوانم داوا لە هەموو کەسێکی تر بکەم کە بە هەمان شێوەی من خولیای ئەسپ سواری و خشڵ کۆکردنەوە بن. یاخود ئەگەر من زۆر بە پەرۆشییەوە تەماشای هەموو بەرنامە وەرزشیەکانی تەلەفیزۆن بکەم، ئیدی ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت ڕێگە بەخۆمبدەم و ڕەخنە لە هەموو کەسێک بگرم کە پێی وابێت وەرزش شتێکی وەڕس هێنەرە.
بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایا هیچ شتکێکمان هەیە کە دەبوایە جێگەی بایەخی هەمووان بووایە؟ هیچ شتێک هەیە پەیوەندی بە هەموو مرۆڤێکەوە هەبێت، هەڵبەتە بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە کێن و لە چ شوێنێکی جیهاندا دەژین؟ بەڵێ سۆفیای ئازیز، لەڕاستیدا هەندێ پرسیار هەن کە دەبوایە جێگەی بایەخی هەموو کەسێک بوونایە. ئەم کۆرسەش دەربارەی ئەو جۆرە پرسیارانەیە.
ئایا گرنگترین شت لە ژیاندا چیە؟ گەر ئەم پرسیارە لە کەسێکی برسی بکەین، ئەوا لە وەڵامدا دەڵێت خواردنە. هەمان پرسیار لە

یەکێکی تر بکەین کە سەرمای بێت، دەڵێت گەرما گرنگترین شتە. بەو شێوەیەش گەر هەمان پرسیار ئاڕاستەی کەسێک بکەین کە تەنیایە و هەست بە تەنهایی دەکات، ئەوا زۆر ڕێی تێدەچێت لە وەڵامدا بڵێت، گرنگترین شت ئەوەیە لەگەڵ خەڵکانی تردا بیت.

بەڵام کاتێک هەموو ئەم شتانە تێرکران ـ ئایا هێشتام هیچ شتێک هەیە کە هەموو کەسێک پێویستی بێت؟ فەیلەسوفەکان لەو بڕوایەدان کە هەبێت. ئەوان دەڵێن مرۆڤ تەنها بە نان ناژی. بێگومان هەموو کەسێک پێویستی بە نان هەیە، هەموو کەسێکیش پێویستی بە خۆشەویستی و سۆز هەیە. بەڵام هێشتام شتێک هەیە ـ جگە لەو هەموو شتانە ـ کە هەموو مرۆڤێک پێویستی پێیەتی: ئێمە ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە دەبینەوە؛ ئێمە کێین و بۆچی دەژین؟ دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەش کتومت ئەو شتەیە کە هەموومان پێویستمانە.

واتە کاتێک کە دەمانەوێت بزانین بۆچی دەژین، وەک ئارەزووی "بە ڕێکەوتی" پول کۆکردنەوە نیە. ئەو کەسەی خولیای ئەو جۆرە پرسیارانە بێت، سەرقاڵی شتێکە مرۆڤایەتی بە درێژایی بوونی لەسەر ئەم زەویە گفتوگۆی لەسەر کردووە.

پرسیارکردن دەربارەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی گەردوون و زەوی و ژیانی سەر زەوی، لەو پرسیارە گرنگتر و گەورەترە کە دەڵێت چ کەسێک زۆرترین مەدالیای ئاڵتونی لە دواهەمین ئۆڵۆمپیاتدا بردۆتەوە.

باشترین ڕێگەش کە نزیکمان بکاتەوە لە فەلسەفە، وروژاندنی هەندێک پرسیاری فەلسەفییە؛

چۆن چۆنی جیهان هاتۆتە بوون؟ ئایا هیچ مەرامێک یان مانایەک لە پشت ڕووداوەکانەوە هەیە؟ ئایا لەدوای مردنەوە ژیان هەیە؟ بە

شێوەیەکی گشتیش چۆن وەڵامی ئەم پرسیارانە بدۆزینەوە؟ لە سەرو هەموو شتێکیشەوە؛ ژیانمان چۆن بەسەربەرین؟
مرۆڤ بە درێژایی مێژووی ئەم جۆرە پرسیارانەی کردووە. ئێمە هیچ کەلتورێک ناناسین کە خولیای ناسینی مرۆڤ نەبووبێت یان سەرقاڵی دۆزینەوەی چۆنیەتی گەردوون نەبووبێت.
لە بنەڕەتدا زۆر پرسیاری جیاواز جیاوازی فەلسەفیمان نیە کە بتوانین ئاڕاستەیان بکەین. گرنگترینیان ئەوانەبوون کە کەمێک لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کردن، بەڵام مێژوو بەرامبەر هەر یەک لەو پرسیارانە کۆمەڵێ وەڵامی جیاواز جیاوازمان پێدەبەخشێت.
واتە وروژاندنی پرسیاری فەلسەفی لە وەڵامدانەوەیان ئاسانترە.
تەنانەت ئەمڕۆکەش، هەموو کەسێک دەبێ وەڵامی تایبەتی خۆی بۆ ئەو پرسیارانە هەبێت. بۆ نمونە گەر بمانەوێت لە ڕاست و دروستی خوا تێبگەین یان گەر بمانەوێت بزانین لە دوای مردنەوە ژیان بوونی هەیە یان نا، بێسوودە بێین و تەماشای فەرهەنگ بکەین. لە هەمان کاتیشدا فەرهەنگە گشتیەکان ڕێگەی ژیانمان نیشان نادات و چۆنیەتی ژیان بەسەربردنمان بۆ ڕوون ناکاتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک بخوازین بۆچوونی تایبەتی خۆمان هەڵچنین، لەوانەیە خوێندنەوەی ئەو شتانەی خەڵکانی دی بیریان لێکردۆتەوە ببێتە یاریدەدەرێکمان.
دەکرێت گەڕانی فەیلەسوفەکان بەدوای هەقیقەتدا لەگەڵ پۆلیسی نهێنی چیرۆکێکدا بەراورد بکرێت. بۆ وێنە چەند کەسێک وا هەستدەکەن ئانەرسن پیاوکوژەکەیە، کۆمەڵێکی تریش پێیان وایە نیلسن یان یانسن بێت. بەڵام کاتێک باس لە نهێنی دۆزینەوەی تاوانێکی ڕاستەقینە دەکەین، ئەوا پێدەچێ پۆلیس ڕۆژێک لە ڕۆژان

بتوانێت نهێنی تاوانەکە دەربخات. بێگومان ڕێشی تێدەچێت هەرگیز نەتوانن بچنە بنج و بناوانیەوە. بەڵام لە هەموو بارێکدا نهێنیەکە چارەسەرێکی هەر هەیە.

بە هەمان شێوەش، هەرچەندە وەڵامدانەوەی پرسیارێک سەخت بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرسیارەکە یەک ـ وە تەنها یەک ـ وەڵامی ڕاستی هەیە. بۆ نمونە لە دوای مردن یان جۆرە ژیانێک بوونی هەیە یاخود بوونی نیە.

زانست بەرە بەرە هەندێک لە نهێنیە کۆنەکانی دەرخستووە. هەر بۆ وێنە کاتی خۆی چۆنیەتی ڕووی ئەو دیوی مانگ، گەورەترین مەتەڵ بووە. ئەوان لە ڕێگەی گفتوگۆوە نەدەگەشتنە هیچ ئەنجامێک، بەڵکو ئەو کاتە وەڵامەکەیان بۆ فەنتاسیای تاکەکەس جێدەهێشت. بەڵام ئەمڕۆکە چیتر کەس "باوەڕ" بەوە ناکات کە مرۆڤ لەسەر مانگ بژی، وە کەسیش پێی وانیە مانگ سەلکە پەنیرێک بێت.

یەکێک لە فەیلەسوفە کۆنەکانی یۆنان کە زیاتر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر دەژیا، پێی وابوو فەلسەفە بە هۆی تێڕامانی مرۆڤەوە سەریهەڵدابێت. ئەو دەیگوت؛ مرۆڤ بەلایەوە سەیرە کە دەژی و بوونی هەیە، هەر ئەو سەرسوڕمانەش وا لە پرسیارە فەلسەفیەکان دەکات خۆیان بۆ خۆیان سەردەربهێنن.

وەک ئەو کاتە وایە کە تەماشای جادووگەرێک دەکەین؛ ئێمە ناتوانین پەی بە چۆنیەتی کارەکەی بەرین، لەبەرئەوە پرسیارەکەمان بەم جۆرە دادەڕێژین؛ جادووگەرێک چۆن دەتوانێت دوو دەسڕی سپی ئاوریشمی بکات بە کەروێشکێکی زیندوو؟

خەڵکانێکی زۆر لەو بڕوایەدان تێگەیشتن لە جیهان بە هەمان شێوەی تێگەیشتن لە کاری جادووگەرێک سەخت بێت، کاتێک کە کەروێشکێک لە کڵاوێکی درێژی بەتاڵەوە دەردەهێنێت.
کاتێک باس لە کەروێشکەکە دەکەین، دەزانین جادووگەرەکە بە شێوەیەک لە شێوەکان هەڵیخڵەتاندووین، وە لە هەمان کاتیشدا ئارەزوودەکەین چۆنیەتی کردنی جادووەکەیمان بۆ ئاشکرابێت. بەڵام کاتێک باس لە جیهان دەکەین، باسەکەمان کەمێک جیاوازی تێدەکەوێت. ئێمە دەزانین جیهان سەرلێشێواندن و هەڵخڵەتاندن نیە، چونکە لەسەر جیهان دەژین و خۆشمان بەشێکی پێکدێنین. لە بنەڕەتدا ئێمە ئەو کەروێشکە سپییەین کە لە کڵاوەکەوە دەریدەهێنن. جیاوازی ئێمە و کەروێشکەکە تەنها لەوەدایە کە کەروێشکەکە بەئاگا نیە لەوەی بەشداری جادوویەک دەکات، بەڵام کارەکە بەلای ئێمەوە تەواو جیاوازە. ئێمە لەو بڕوایەداین بەشداری شتێکی پڕ نهێنی دەکەین و دەخوازین هەموو شتێکمان بۆ ڕوون ببێتەوە.
پەراوێزی نامە؛
لەوانەیە وا باشتربێت کەروێشکە سپیەکە بە هەموو گەردوون بچووێنین. ئێمەی دانیشتوانی سەر زەویش لە چەند مێروولەیەکی چکۆلە دەچین و لە قوڵایی خواری خوارەوەی فەرووی کەروێشکەکەدا دەژین. بەڵام فەیلەسوفەکان بۆ ئەوەی بتوانن ڕێک تەماشای نێو چاوانی ئەو جادووگەرە گەورەیە بکەن، هەوڵدەدەن بە تاڵێکی زرافی فەرووەکەدا هەڵزنێن.
تێدەگەیت سۆفیا؟ ... نامەی تری بەدوادا دێت.
سۆفیا تەواو بێدەنگبوو... تێگەیشت؟ ئەو بە ڕاستی لەیادی نەبوو لە کاتی خوێندنەوەدا هەناسەی دەدا یان نا.

کێ ئەو نامەیەی نارد؟ کێ؟ کێ؟
مەحاڵە هەر هەمان ئەو کەسەبێت کە پێشتر پۆستکارتی پیرۆزباییەکەی بۆ هیلدە میوللە کنەی نارد، چونکە پۆستکارتەکە هەم پول و هەم مۆریشی لێدرابوو. بەڵام نامە زەردەکە هەروەک دوو نامە سپییەکە، کەسێک ڕاستەوخۆ خستبویە ناو سندوقی پۆستەکەیانەوە.
سۆفیا تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد. چارەکی دەویست بۆ سێ، کەواتە هێشتام دایکی نزیکەی دوو سەعاتێکی تری پێدەچێت تا لەسەر کارەوە دەگەڕێتەوە.
سۆفیا دیسانەوە بەسکەخشێ هاتەوە ناو باخچەکە و بەرەو لای سندوقی پۆستەکە ڕایکرد. لەوەیە نامەی تری تێدابێت؟ نامەیەکی زەردی نوێی بینی، ئەم یەکەشیان ناوی خۆی لەسەر نووسرابوو.
بە هەر چوارلادا ڕوانی، بەڵام کەسی نەبینی. سۆفیا بەرەو قەراخی دارستانەکە ڕایکرد و تەماشای تولە ڕێگاکەی کرد، بەڵام دیسانەوە کەسی بەرچاو نەکەوت.
لە پڕێکدا لە قوڵایی ناو دارستانەکەوە گوێی لە قرچەقرچی لقە وشکەکانبوو. تەواو دڵنیا نەبوو، بەڵام لە هەموو بارێکدا بێسوودبوو گەر دوای بکەوتایە، چونکە ئەو بە هەموو هێز و توانایەوە دەیویست دوربکەوێتەوە.
سۆفیا گەڕایەوەماڵەوە و جانتای قوتابخانە و نامەکانی دایکی دانا. بەپەلە بەرەو ژوورەکەی خۆی ڕۆشت. قتووی کێکە گەورەکەی دەرهێنا، لەوێدا بەردە جوانەکانی دەپاراست. هەموو بەردەکانی فڕێدایە سەر زەویەکە، لەبری وان هەردوو نامە گەورەکەی خستە ناو قتووەکەوە. بە قتووی کێکەکەی بن دەستیەوە دیسانەوە بەپەلە بەرەو باخچەکە تێی تەقاند. پێش ئەوەی بڕوات خواردنی پشیلەی بۆ شێریکان دانا.

ـ پش، پش، پش!
کە گەڕایەوە کوخەکەی، نامەکەی کردەوە و هەندێ کاغەزی چاپکراوی تری دەرهێنا و دەستیکرد بە خوێندنەوە.

**بوونەوەرێکی سەیر**

دیسانەوە وا بەیەک دەگەینەوە! هەروەک دەبینیت ئەم کۆرسی فەلسەفە چکۆلەیە بە چەند بەشێکی گونجاو دەگاتە دەستت. با وەک پێشەکیەک بە چەند تێبینیەکی سەرەتایی دەست پێبکەین؛
ئایا لەوەوپێش گوتم گەر تەنها توانای تێڕامانمان هەبێت، دەتوانین ببینە فەیلەسوفێکی لێهاتوو؟ ئەگەر نا، ئەوا ئێستا دەیڵێم؛ گەر تەنها توانای تێڕامانمان هەبێت، دەتوانین ببینە فەیلەسوفێکی لێهاتوو.
هەموو منداڵێک ئەو توانایەی هەیە، ئەمەش بەڵگە نەویستە. منداڵان پاش چەند مانگێکی کەم دێنە ناو هەقیقەتێکی نوێی بریقەدارەوە. بەڵام هێدی هێدی لەگەڵ گەورەبوونیاندا توانای سەرسامبوونیشیان کەم دەبێتەوە. بۆچی ئەو توانایە کەم دەبێتەوە؟ ئایا سۆفیا ئامۆنسن هیچ وەڵامێکی پێیە؟
بەهەرحاڵ؛ ئەگەر ساوایەک توانای قسەکردنی هەبووایە، ئەوا بێگومان باسی ئەو جیهانە سەرسامەی دەکرد کە هاتۆتە ناوی. هەرچەندە منداڵەکە ناتوانێت قسەبکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین چۆن دەست بۆ چواردەورەکەی ڕادەکێشێت و بە پەرۆشەوە هەوڵدەدات شتەکانی ژوورەکە بگرێت.
کاتێکیش لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا فێری قسەدەبێت، هەموو جارێک کە سەگێک دەبینێت، ڕادەوەستێت و دەڵێت "وەو ـ وەو". لەناو گالیسکەکەیدا هەڵدەبەزێتەوە و دەستی ڕادەوەشێنێت؛ "وەو ـ وەو! وەو

ـ وەو!"، لەوانەیە ئێمەی بەتەمەنتریش لە پەرۆشی منداڵەکە ماندووببین و بە بێزارییەکەوە بڵێین؛ "وایە ڕاستدەکەیت، ئەوە وەو ـ وەوە، بەڵام ئیتر بە هێمنی لەناو گالیسکەکەتدا دانیشە". ئێمە بە هەمان شێوەی ئەو بەپەرۆش نین بۆ بینینی سەگێک، چونکە لەوەوپێش سەگمان زۆر بینیووە. لەوانەیە بینینی سەگێک یان فیلێک یاخود ئەسپێکی دەریایی، چەند سەد جارێک دووبارە ببێتەوە، ئەوجا منداڵەکە بتوانێت بە هێمنی بەلایدا تێپەڕێت. بەڵام زۆر پێش ئەوەی منداڵەکە زمانی پاک ببێتەوە و زۆر پێش ئەوەش فێرببێت فەیلەسوفانە بیربکاتەوە، جیهان بەلایەوە بۆتە خوویەک.

بە بڕوای من، ئەمە جێگەی داخە.

سۆفیای ئازیز، مەبەستم ئەوەیە تۆ لەو کەسانە نەبیت کە جیهان بە شتێکی بەڵگەنەویست وەردەگرن. تەنها بۆ دڵنیابوونیش پێش ئەوەی دەست بە خودی کۆرسی فەلسەفیەکەمان بکەین، یەک دوو تاقیکردنەوەی فیکری تاووتوێ دەکەین .

وا بهێنە بەرچاوت ڕۆژێک لە ڕۆژان بەناو دارستانێکدا پیاسە دەکەیت و لە پڕێکدا چاوت بە کەشتیەکی ئاسمانی دەکەوێت. لە کەشتیەکەوە کەسێکی خەڵکی مەریخ دادەبەزێت و ڕێک تەماشای نێو چاوت دەکات... لەوێدا بیر لە چی دەکەیتەوە؟ بەهەرحاڵ لەوانەیە بیر لە هەر شتێک بکەیتەوە وەک یەک وابێت. بەڵام ئایا تۆ هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە کە خۆت خەڵکی مەریخ بیت؟

لە ڕاستیدا زۆر ڕێی تێناچێت ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕووبەڕووی بوونەوەرێک ببیتەوە کە لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتبێت. ئێمە تەنانەت ناشزانین ژیان لەسەر ئەستێرەکانی تر بوونی هەیە یاخود نیە. بەڵام پێدەچێت ڕۆژێک لە ڕۆژان بەرامبەر خۆت بوەستیت.

لەوەیە ڕۆژێک ڕووبەڕووی خۆت بوەستیت و خۆت تەواو بە جۆرێکی نوێ ببینیت. لەوانەشە ئەمە ڕێک لە کاتی پیاسەیەکی ناو دارستانێکدا ڕووبدات و ئەوسا لە دڵی خۆتدا بڵێت؛

- من بوونەوەرێکی سەیرم... من ئاژەڵێکی ئەفسوناویم...

ئەو ڕۆژە زیاتر لەوە دەچێت لە پاش خەونێکی دورودرێژ خەبەرت ببێتەوە. ئەوجا لە خۆت دەپرسیت؛ من کێم؟ بە ئاگایت لەوەی گاگۆڵکێ لەسەر ئەستێرەیەکی ناو گەردووندا دەکەیت، بەڵام ئەی گەردوون خۆی چیە؟

ئەگەر خۆت بەم شێوەیە ببینیت، ئەوا شتێکی هێندە سەیر دەبینیت، کە وەک بینینی بوونەوەرە مەریخیەکەی لە سەرەتادا باسمانکرد، سەیرە.

تێدەگەیت سۆفیا؟ با تاقیکردنەوەیەکی فیکری تریش بکەین؛

بەیانیەکیان دایە و بابە و تۆماسی چکۆلەی دوو سێ ساڵەیان، لەسەر مێزی نانخواردن دانیشتوون و نانی بەیانی دەخۆن. دایە هەڵدەستێ و لە مێزی نانخواردنەکە دور دەکەوێتەوە. لە پڕێکدا... لە پڕێکدا بابە بەرز دەبێتەوە و لە هەوادا دەخولێتەوە، تۆماسیش دانیشتووە و تەماشای دەکات.

ئایا بە بڕوای تۆ تۆماس دەڵێت چی؟ ..لەوانەیە پەنجە بۆ باوکی ڕاکێشێت و بڵێت؛ بابە دەفڕێت!

بێگومان تۆماس سەرسام دەبێت، بەڵام بەلای ئەوەوە شتێکی سەیر نیە " ئەو زوو زوو سەرسام دەبێت". بەهەرحاڵ، بابەی چەندەها شتی سەیر سەیر دەکات، ئەم فڕینەشی بەسەر مێزی نانخواردنەکەدا، لە ڕوانگەی تۆماسەوە هیچ سەیریەکی تێدا نیە. باوکی هەموو ڕۆژێک بە مەکینەیەکی سەیر ڕیشی دەتاشێت، هەندێ جار بە سەربانەکەدا

هەڵدەزنێ و ئارێڵی تەلەفیزۆنەکە دەگۆڕێت، یان سەر دەخاتە ناو ماتۆڕی ئۆتۆمبیلەکەی و کە سەر دەردێنێتەوە تەواوی دەموچاوی هەروەک دەموچاوی زنجیەک ڕەشە.
ئینجا سەرەی دایەیە، ئەو گوێی لە قسەکانی تۆماسبوو و بەپەلە ئاوڕ دەداتەوە. بەڕای تۆ ئاخۆ چی بکات کاتێک مێردەکەی دەبینێت بە ئاسمانی مێزەکەدا دەسوڕێتەوە؟ بێگومان شوشە مرەباکەی دەستی دەکەوێتە خوارەوە و لەترسدا دەست بەهاوار هاوار دەکات. لەوانەیە پاش ئەوەی بابە دێتە خوارەوە و بە جوانی لەسەر کورسیەکەی دادەنیشێت، پێویستی بە یارمەتی دکتۆریش بێت. (دەبوایە لە مێژەوە بیزانیبایە بە جوانی لەسەر مێزی نانخواردن دانیشێت).
بەڕای تۆ بۆچی تۆماس و دایکی هێندە جیاواز بەرپەرچی حاڵەتەکە دەدەنەوە؟ ئەمە پەیوەندی بە ڕاهاتنەوە هەیە "وەک تێبینیەک ئەمە لای خۆت بنووسە!" دایە دەزانێت مرۆڤ توانای فڕینی نیە، بەڵام تۆماس هێشتام فێری ئەوە نەبووە و نازانێت چ شتێک لە ژیاندا ڕێی تێدەچێت و چ شتێکیش ناگونجێت.
بەڵام ئەی دەربارەی خودی جیهان چی سۆفیا؟ ئەو شێوەیەی جیهانت بەلاوە ئاساییە کە هەیە؟ وەک دەزانیت ئەویش بە ئاسمانەوە دەخولێتەوە!
لە ڕاستیدا لە کاتی گەورەبوونماندا ڕاهاتن لەسەر یاسای ڕاکێشانی زەوی تەنها شت نیە کە جێگەی دڵتەنگی بێت، بەڵکو ئێمە زۆر بە خێرایی بەو شێوەیەی جیهان ڕادێین کە هەیە.
پێدەچێت لە کاتی گەورەبوونماندا توانای تێڕامانمان بەرامبەر جیهان لەدەستبدەین. بەڵام لەدەستدانی تێڕامانمان خۆی لە خۆیدا شتێکی گرنگە، شتێکە فەیلەسوفەکان هەوڵدەدەن سەر لەنوێ ژیانی پێ

ببەخشنەوە. لەبەرئەوەی لە شوێنێکی ناوەوەماندا شتێک هەیە پێمان دەڵێ ژیان نهێنییەکی مەزنە. ئەمەش شتێکە ڕۆژێک لە ڕۆژان و زۆر پێپش ئەوەی فێرببین بیری لێبکەینەوە، هەستمان پێکردووە .
بە کورتی دەڵێم؛ هەرچەندە پرسیارە فەلسەفیەکان هەموو کەسێک دەگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموومان نابینە فەیلەسوف. لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵکی لەبەر هۆی هەمەڕەنگ هێندە بە ژیانی ڕۆژانەوە دەبەسترێنەوە کە تاڕادەیەک کاتی تێڕامانی ژیانیان نامێنێتەوە. (وردە مێرووەکانی ژێری ژێرەوەی فەرووی کەروێشکەکە، جێگەیان گەرمە و بەدرێژایی ژیانیان لەوێدا دەمێننەوە).
ژیان ـ بەهەموو شتێکی ناویەوە ـ بەلای منداڵانەوە شتێکی نوێیە، شتێکە سەرسامبوونیان بەخەبەر دێنێتەوە، بەڵام بەلای هەموو خەڵکانی بەتەمەنەوە بەو جۆرە نیە، بەڵکو جیهان بەلای زۆرینەی خەڵکیەوە شتێکی تەواو ئاساییە.
لێرەدا فەیلەسوفەکان دەراویتەن، بەڵام بە شێوە باشەکەی. فەیلەسوف هەرگیز بە جیهان ڕانایەت. ئەو چ پیاو بێت و چ ئافرەت، بەردەوام ژیان بە شتێکی نارۆون دەبینێت... بەڵێ، وەک شتێکی سەیر و پڕ نهێنی دێتە پێش چاوی. بەم جۆرەش فەیلەسوف و منداڵ خاسیەتێکی هاوبەشیان هەیە. دەتوانین بڵێین پێستی فەیلەسوف بەدرێژایی ژیانی، وەک پێستی منداڵ، بە نەرمی دەمێنێتەوە.
ئێستاش سۆفیای ئازیز هەڵبژاردنەکە لە دەستی خۆتدایە، ئایا تۆ منداڵێکیت و هێشتام هێندە گەورە نەبوویت کە بە جیهان ڕابێیت؟ یاخود فەیلەسوفێکیت و دەتوانیت سوێند بخۆیت کە هەرگیز ڕانەیەیت؟

ئەگەر تەنها سەر ڕادەوەشێنیت و ناتوانیت نە وەک منداڵێک و نە وەک فەیلەسوفێک خۆت بناسیتەوە، ئەوا هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تۆش هێندە بە جیهان ڕاهاتوویت کە چیتر سەرت ناسوڕمێنێت.
ئەم حاڵەتەشیان جێگەی مەترسییە، هەر لەبەرئەوەشە ئەم کۆرسی فەلسەفیەت بۆ ڕەوانە دەکرێت، واتە هەروا بۆ دڵنیابوون. پێمخۆش نیە تۆ، وە بەتایبەت تۆ، لە نێوان سست و بێ ئاگاکاندا بیت، پێمخۆشە ژیانت بەچاو کراوەییەوە بەسەر بەریت.
هەموو ئەم کۆرسەشت بە خۆڕایی بۆ ڕەوانە دەکرێت، لەبەرئەوە گەر کۆرسەکە تەواو نەکەیت، هیچ پارەیەکت بۆ ناگەڕێنرێتەوە. ئەگەر دەشخوازیت کۆرسەکە بوەستێنیت، ئەوا خۆت تەواو سەرپشک بە. هەرچۆنێک بێت دەتوانیت پەیامێکم بۆ بخەیتە ناو سندوقی پۆستەکەوە. بۆ نمونە بۆقێکی زیندوو پڕ بە پێستی خۆی دەبێت، بەهەرحاڵ وا باشترە شتێکی سەوز بێت، ئەگەر نا، ئەوا لەوەیە پۆستە چیەکە تەواو بترسێت.
بە پوختی؛ کەروێشکێکی سپی لەناو کڵاوێکی بۆشی درێژەوە دەردەهێنرێت. بەڵام لەبەرئەوەی کەروێشکەکە یەکجار گەورەیە، جادووەکە ملیارد ساڵی پێدەچێت. هەموو منداڵی مرۆڤەکان لە سەری سەرەوەی تاڵە ناسکەکانی فەرووەکەیدا لەدایک دەبن، لەبەرئەوە دەتوانن سەریان لەو جادووە مەحاڵە بسوڕمێت. بەڵام لەگەڵ گەورەبوونیاندا، کەمە کەمە بەرەو قوڵایی ناخی فەرووی کەروێشکەکە دەخشێن و لەوێدا دەمێننەوە. لەوێشدا زۆر خۆش دەیگوزەرێنن و هەرگیز زات ناکەن جارێکی تر بە تاڵی ناسکی فەرووی کەروێشکەکەدا سەرکەونەوە. تەنها فەیلەسوفەکان دەوێرن بەو ڕێگا پڕ مەترسیەدا تا ئەو پەڕی سنووری زمان و بوون بڕۆن. هەندێکیان

دەکەونە خوارەوە، هەندێکی تریشیان بە ترۆپکی تاڵی فەرووی کەروێشکەکەوە خۆیان توند دەگرن و هاوار بۆ هەموو ئەو خەڵکانە دەکەن کە لە ژێری ژێرەوەی فەرووە نەرمەکەدا دانیشتوون و سەرقاڵی خواردن و خواردنەوەن؛
ـ خوشک و برایانی ئازیز؛ ئێمە لە بۆشایدا هەڵواسراوین! ئاوها دەڵێن. بەڵام هیچ کەسێکی خوارەوەی فەرووەکە گوێ بۆ هاوای فەیلەسوفەکان شل ناکات، بەڵکو لە وەڵامدا دەڵێن؛
ـ پف، مێشکیان بردووین و ئارامیان لێ هەڵگرتووین.
پاشانیش درێژە بە قسەکانی پێشتریان دەدەن؛
ـ پەنیر و کەرەکەم بۆ دەنێریت؟ ئاگات لە بۆرسەی بانکە ئەمڕۆ چەندە بەرز بۆتەوە؟ ئەرێ تەماتە بە چەندە؟ ئاگاداری خانم دایانایت دیسانەوە سکی هەیە؟

کاتێک پاشنیوەڕۆ دایکی هاتەوە، سۆفیا تەواو تاسابوو. نامەکانی فەیلەسوفە نادیارەکەی لە ناو قتووی کێکەکەدا دانابوو و لە ناو کوخەکەدا بە باشی هەڵیگرتبوون. هەوڵیدا وانەکانی ئەنجام بدا، بەڵام بێسوودبوو، بێ دەنگ دانیشتبوو و بە قوڵی بیری لە نووسینی ناو نامەکان دەکردەوە.
ئای لەو هەموو شتە زۆرەی کە لەوەو پێش سۆفیا بیری لێنەکردبوونەوە! ئەو چیتر منداڵ نەبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا گەورە نەبوو. ئێستاکە دەیبینی کە خۆشی دەستیکردبوو بەوەی بەرەو ناخی فەرووی چڕی کەروێشکەکە بڕوات، ڕێک ئەو کەروێشکەی لە کڵاوە ڕەشە درێژەکەی گەردوونەوە هێنرابووە دەرەوە. بەڵام فەیلەسوفەکان وەستاندیان. ئەو پیاوە "یان ئەو ئافرەتە؟" ملی

سۆفیای گرت و بۆ سەر ترۆپکی فەرووەکەی بەرزکردەوە، بردیەوە ئەو شوێنەی بە منداڵی یاری لەسەر دەکرد. لەوێڕا و لەو سەری تاڵی باریکی فەرووەکەوە جارێکی دیش، هەروەک یەکەمین جاری، سەرلەنوێ جیهانی بینییەوە.

بێگومان فەیلەسوفەکە ڕزگاریکرد، ئەو نووسەرە نەناسراوەی نامەکانی دەنارد، لە ژیانی بێ ئاگایی ڕۆژانە قورتاریکرد.

دایکی نزیکەی کاتژمێری پێنج هاتەوە، سۆفیا دەستی گرت و لە ژووری دانیشتنەکەیاندا لەسەر کورسیەک داینیشاند.

ـ بەڕای تۆ ژیان سەیر نیە، دایە؟

دایکی سەری لێشێواو نەیدەزانی بە چ جۆرێک وەڵامی بداتەوە. ڕۆژانی پێشتر کە دەهاتەوە، سۆفیا بۆ خۆی خەریکی وانەکانی بوو.

ـ ئمم، جارجارێک... دایکی گوتی.

ـ جارجارێک؟ مەبەستی من ئەوەیە... بەشێوەیەکی گشتی بوونی ئەم جیهانەت پێ سەیر نیە؟

ـ بەڵام... باشترە بەم شێوەیە بیرنەکەیتەوە!

ـ بۆ نا؟ لەوانەیە جیهان بەلاتەوە هەر زۆر شتێکی ئاسایی بێت؟

ـ بەڵێ تا ڕادەیەک ئاساییە.

فەیلەسوفەکە ڕاستی دەکرد. گەورەکان جیهان بە شتێکی بەڵگەنەویست وەردەگرن. یەکجاریش بۆ هەتاهەتایە بەبێدەنگی چوونەتە نێو خەونی قوڵی ڕۆژانەیانەوە.

ـ تۆ هێندە بە جیهان ڕاهاتوویت کە چیتر سەرت ناسوڕمێنێت.

ـ ئەوە باسی چی دەکەیت؟

ـ دەڵێم تۆ هەر زۆر بێزاربوویت. بە شێوەیەکی تر بیڵێم وەک ماسیە گێژەکەت لێهاتووە.

ـ نا، نا، سۆفیا، ڕازی نیم بەم شێوەیە قسەم لەگەڵدا بکەیت.
ـ باشە، بە جۆرێکی تر پێت دەڵێم، بە ڕاشکاوی خۆت لە ژێری ژێرەوەی فەرووی کەروێشکە سپیەکەدا گونجاندووە، ئەو کەروێشکەی ڕێک لە کاتی ئێستاکەدا لە کڵاوە درێژەکەی گەردوونەوە دەریدەهێنن.
ئێستاکەش دەشێ پەتاتەکانت بکوڵێنیت و ڕۆژنامەکەت بخوێنیتەوە، پاشانیش دوای نیو سەعاتێک پشوودان، تەماشای دەنگ و باس دەکەیت.
خەمێک لە دەموچاوی دایکیدا بەدیدەکرا. ڕێک بەرەو چێشتخانەکەیان ڕۆیشت و پەتاتەکانی خستە سەر ئاگرەکە. پاش ماوەیەک گەڕایەوە و ئینجا ئەو سۆفیای لەسەر کورسیەک دانیشاند و پێی گوت؛
ـ دەمەوێت شتێکت لەگەڵدا باسبکەم.
سۆفیا هەر بەدەنگیدا دەیزانی دەیەوێت شتێکی گرنگ باس بکات.
ـ چاوەکەم، خۆ تێکەڵ بە جیهانی موخەدەرات نەبوویت؟
سۆفیا دایە قاقای پێکەین، بەڵام دەیزانی بۆچی ڕێک ئێستاکە ئەو باسە هاتە ناو ناوانەوە.
ـ ئەقڵت هەیە؟ خۆ ئەگەر وابێت، ئەوا زیاتر خاو دەبینەوە!
لەوە زیاتر، هیچی تر نە دەربارەی موخەدەرات و نە دەربارەی کەروێشکی سپی باسکرا.

## ئەفسانەکان

## ...هاوسەنگیەکی دژوار لە نێوان هێزی باشە و خراپەدا...

بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر سۆفیا هیچ نامەیەکی بەدەست نەگەیشت، لەلایەکی تریشەوە ڕۆژی دورودرێژی قوتابخانە تەواو بێزاری کردبوو. سۆفیا لە پشووەکاندا دەیویست کەمێک نەرمتر لەگەڵ یۆروندا هەڵسوکەوتبکات. لە ڕێگای گەڕانەوەیاندا باسی گەشتێکی ناو دارستانەکەیان کرد و بڕیاریاندا هەر کاتێک دارستانەکە ووشک و شیاوبێت بڕۆن و چادری تێدا هەڵبدەن.
سۆفیا گەیشتەوە ماڵەوە و دیسانەوە خۆی لەبەردەم سندوقی پۆستەکەدا بینییەوە. نامەکانی دەرهێنا، یەکەم جار نامەیەکی چکۆلەی کردەوە کە باوکی لە مەکسیکەوە ناردبووی. ئەو تاسەی وڵاتی دەکرد و نزیکەی هەموو ئەو کتێبانەی خوێندبووەوە کە لە پشووی زستاندا لەگەڵ خۆیدا بردبووی. دواتریش نوسیبووی؛ بۆ یەکەمین جار شەترەنجم لە سەرۆکی گشتی کەشتییەکە بردەوە.
پاشان ناوی خۆی لەسەر نامەیەکی زەرد بینی! سۆفیا پۆست و جانتای قوتابخانەکەی لە ماڵەوە دانا و بەرەو کوخەکەی ڕایکرد. دیسانەوە کۆمەڵێ پەڕەی چاپکراوی دەرهێنا و دەستیکرد بە خوێندنەوەیان؛

***وێنەی ئەفسانەیی جیهان***

ئەم کاتەت باش سۆفیا! لەبەر زۆری بابەتەکان، وای بەباش دەزانم یەکسەر دەستپێبکەین.
مەبەستمان لە فەلسەفە ئەو جۆرە بیرکردنەوە نوێیەیە کە 600 ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح لە یۆناندا سەریهەڵدا. بەر لەو کاتەش

ئاینە جۆراو جۆرەکان وەڵامی هەموو پرسیارێکی مرۆڤیان خستبووە ئەستۆی خۆیان. ئەو لێکدانەوە ئاینیانەش لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر لە ڕێگەی ئەفسانەکانەوە دەماودەم دەگێڕدرانەوە. ئەفسانە چیرۆکێکە کە دەربارەی خواکانە و هەوڵی لێکدانەوەی ژیان و سروشت دەدات.
بە درێژایی هەزاران ساڵ لە سەرانسەری هەموو جیهاندا، تەوژمی لێکدانەوەیەکی ئەفسانەیی سەبارەت بە پرسیارە فەلسەفییەکان گەشەی سەند. هەتاوەکو دواتر فەیلەسوفە یۆنانیەکان هاتن و پێیان وابوو ئەو جۆرە بۆچوونانە جێگەی متمانە نەبن.
بە کورتی، بۆ ئەوەی لە ڕەوتی فیکری فەیلەسوفە سەرەتاییەکان تێبگەین، دەشێ لە پێشدا وێنەیەکی ئەفسانەیی جیهانمان لەبەرچاودا بێت. بۆ تێگەیشتن لەمەش هەندێ لە بیروڕای ئەفسانەی باکور وەک نمونە بەکاردەهێنین (چ پێویست دەکات زۆر دور بڕۆین).
بێگومان باسی تۆر «Thor» و چەکوشەکەیت بیستووە. پێش ئەوەی ئاینی مەسیحی بگاتە باکور، خەڵکی لەو بڕوایەدابوون تۆر بە خۆی و گالیسکەکەیەوە، کە دوو سابرێن ڕایاندەکێشا، بەئاسماندا سەفەر دەکات. هەرکاتێکیش چەکوشەکەی ڕادەوەشاند، هەورە بروسکە و هەورە گرمە ڕوویدەدا. وشەی هەورەگرمەش (*لە زمانی نەرویجی و دانیمارکیدا.و) ڕێک مانای «گرمەگرمی تۆر» دەبەخشێت. بە سویدیش پێی دەڵێن ْ«ئۆس ـ کا» واتە «سەفەری خودایی» بە ئاسماندا .
باران لەگەڵ هەورەگرمە و هەورە بروسکەدا دەبارێت. ئەمەش لە سەردەمی چەتە دەریاییەکاندا (*قەراسینەکاندا.و) گرنگترین ڕووداوی ژیان بووە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە تۆر وەک خودای پیت و فەڕ دەپەرسترا.

واتە لە ڕوانگەی ئەفسانەوە، باران بە هۆی چەکوش ڕاوەشاندنی "تۆرە"وە دەباری. کاتێکیش باران دەباری، دانەوێڵەکانی کێڵگەکان شیندەبوو و بەروبومیان فرەتر دەبوو.
چۆنیەتی سەوزبوون و گەشەکردنی بەروبوم، شتێک بوو کە لێی تێنەدەگەیشتن. بەهەرحاڵ، جوتیارەکان دەیانزانی پەیوەندی بە بارانەوە هەیە. جگە لەمەش هەموو کەسێک دەیزانی باران بارین پەیوەندی بە تۆرەوە هەیە. وەک ئاکامێکی ئەمەش، تۆر بوو بە یەکێک لە خوا هەرە گەورەکانی باکور .
هۆیەکی تریش کە تۆری گرنگ کردبوو، پەیوەندی بە ڕێکخستنی هەموو جیهانەوە هەبوو.
بەپێی مەزەنەی چەتە دەرياييەکان، ئەو بەشەی جیهان کە خەڵکی لەسەر دەژی، دوورگەیەکە و بەردەوام لە لایەن دەرەوەی خۆیانەوە هەڕەشەی لێدەکرێت. ئەوان بەم بەشەیان دەگوت «حەساری ناوەڕاست» واتە مەملەکەتی ناوەڕاست. حەوشەی خوا کەوتبووە حەساری ناوەڕاستەوە وماڵی خواکانی لێبوو. حەساری دەرەکیشیان بەو مەملەکەتە دەگوت کە کەوتبووە دەرەوەی حەساری ناوەڕاستەوە. لەوێشدا دێوە دڕندەکانی لێدەژیان و دەیانویست بە جادوو و فێڵبازی جیهان بشێوێنن. ئەم جۆرە بوونەوەرە پڕ نیەت خراپانەش، دەکرێت ناوی «هێزی گێرەشێوەکان»یان لێ بنرێت. بەم شێوەیەش خەڵکی هەم لە ئەفسانەی باکور و هەم لە زۆرینەی کەلتورەکانی دیدا، هاوسەنگییەکی دژواریان لە نێوان هێزی باشە و خراپەدا بەدیدەکرد.
دێوە دڕندەکان بە دزینی فرایا «Freja» ی خواژنی پیت و فەڕ، دەیانتوانی بەتەواوەتی حەساری ناوەڕاست بشێوێنن. هەر کاتێکیش بیانتوانیبایە فرایا بفڕێنن، هیچ شتێک لە کێڵگەکاندا نەدەڕوا و

ژنەکانیش چیتر توانای منداڵبوونیان نەدەما. لەبەرئەوە گرنگبوو خوا باشەکان بە تەواوەتی چاودێری دێوە دڕندەکان بکەن.
تۆر لێرەدا ڕۆڵێکی گرنگی دەبینی، چەکوشەکەی تەنها بارانی نەدەباراند؛ بەڵکو وەک چەکێکی گرنگیش دژ بە هێزی گێرەشێوێنەکان بەکاریدەهێنا. تا ڕادەیەک چەکوشەکەی هێزێکی بێ پایانی پێ بەخشیبوو. بۆ نمونە دەیتوانی چەکوشەکەی بگرێتە دڕندەکان و بیانکوژێت، بەبێ ئەوەی ترسی لەدەست دانی هەبێت. چونکە چەکوشەکەی هەروەک بومەڕەنگ (*دارێکی چەماوەیە کاتێک فڕێی دەدەیت، بۆ خۆت دەگەڕێتەوە.و) وابوو، هەمیشە بۆ خۆی دەگەڕایەوە.
ئا بەم شێوەیە ئەفسانەکان هۆی ڕوودانی دیاردەکانی سروشت و شەڕی بەردەوامی نێوان باشە و خراپەیان لێکدەدایەوە. فەیلەسوفەکانیش کتومت دەیانویست ئەو جۆرە تەفسیرانە ڕەتبکەنەوە.
بەڵام بابەتەکە تەنها دەربارەی لێکدانەوەی دیاردەیەک نەبوو، بۆ نمونە نەدەکرا خەڵکی لە کاتی وشکانیدا یان لە کاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکی ساریدا دەستەوئەژنۆ دانیشن و چاوەڕوانی خواکانبن شتێکیان بۆ بکەن، بەڵکو دەبوایە لە شەڕی دژ بە خراپەکاندا چالاکانە بەشداریان بکردبایە. کارەکانیشیان لە ڕێگەی کردەوەی هەمەڕەنگی ئاینی یان سروتی تایبەتییەوە ئەنجامدەدا.
لە سەردەمی چەتە دەریاییەکاندا، قوربانیدان گرنگترین کرداری ئاینی بووە. قوربانی کردنیش بەو مانایە بووە کە هێزی خوداکەی زیاتر کردووە. بۆ نمونە بۆ ئەوەی هێز و توانای خەڵکی زۆر بێت و بتوانن بەسەر هێزی گێرەشێواندا سەرکەون، دەبوایە قوربانیان پێشکەش بکردایە. پێدەچوو ئاژەڵێک قوربانی بکەن، بۆ وێنە بۆ تۆر

ئاساییترین شت قوربانی کردنی سابرێنێک بوو. بەڵام بۆ ئۆدین «Odin»ڕوویدەدا مرۆڤیش قوربانی بکەن.
بە ناوبانگترین ئەفسانەی باکور، ئەو ئەفسانەیەیە کە لە ڕێگەی هۆنراوەی تریمسکفادەوە «Trymskvadet» ناسراوە؛ لەوێدا دەڵێت تۆر خەوتبوو، کاتێکیش خەبەریدەبێتەوە، چەکوشەکەی دیارنەماوە. ئەوجا تۆر لە تورەیدا دەستەکانی دەلەرزێنێت و ڕیشی دەلەرێتەوە. پاشان لەگەڵ لۆگە«Loke» ی شاگردیدا دەچنە لای فرایا و داوای قەرزکردنی باڵەکانی لێدەکەن. هەتاوەکو بەم شێوەیەش لۆگە بتوانێت بفڕێت بۆ جۆتونهایمن «Jotunheimen» و سۆراغی چەکوشەکەی تۆر بکات. کاتێک دەگاتە ئەوێ چاوی بە تریۆم «Trym» ی پاشای دێوە خراپەکان دەکەوێت، ئەویش زۆر بە شانازییەوە پێی دەڵێت؛ بەڵێ من چەکوشەکەی تۆرم لە قوڵایی هەشت میلی ناخی زەویدا شاردۆتەوە، پاشان دەڵێت؛ هەتاوەکو فرایا نەبێتە هاوسەرەم، هیچ یەکێک لە خواکان چاویان بە چەکوشەکە ناکەوێتەوە.
هێشتام هەر لەگەڵ باسەکەمدا دەڕۆیت، سۆفیا؟
خوا باشەکان لە پڕێکدا ڕووبەڕووی درامای ترسناکی فڕاندنی فرایا دەبنەوە. ئێستاکەش دێوە خراپەکان دەسەڵاتیان هەم بەسەر خواکان و هەم بەسەر گرنگترین چەکی بەرگریکردنی مرۆڤیشدا هەیە. واتە بەڕاستی کەوتوونەتە ناو حاڵەتێکی سەختەوە! هەتاوەکو دێوەکان چەکوشەکەی تۆریان لابێت، هەموو دەسەڵاتێکیان بەسەر جیهانی خواکان و مرۆڤیشدا دەبێت. لە بری چەکوشەکەش داوای فرایا دەکەن، بەڵام ئەمەشیان هەر بە تەواوەتی مەحاڵە؛ ئەگەر خواکان خواژنی پیت و فەڕ لەدەستبدەن، واتە ئەو خواژنەی هەموو ژیان دەپارێزێت، ئەوا هەموو سەوزایی کێڵگەکان دەفەوتێن و هەم خواکان و هەم

مرۆڤەکانیش دەفەوتێن. بەم جۆرەش هەموو ڕێگایەکی ڕزگاربوون داخراوە. (گەر بتوانیت مەزەنەی گروپێکی تێرۆریست بکەیت کە داوایەکی کوشندەیان هەبێت و بڵێن ئەگەر داواکەمان جێبەجێ نەکرێت، لە ناوەڕاستی لەندەندا یان لە پاریسدا قومبەلەیەکی ئەتۆمی دەتەقێنینەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە لەمەبەستەکەم تێدەگەیت).

پاشان ئەفسانەکە دەڵێت لۆگە دەگەڕێتەوە بۆ حەساری خواکان. لە وێڕا داوا لە فرایا دەکات کراسی بووکێنی بپۆشێت، چونکە دەبێت شوو بە پاشای دێوە خراپەکان بکات (بە داخەوە، بە داخەوە!). فرایاش توڕە دەبێت و دەڵێت ئەگەر شوو بە دێوێکی خراپ بکەم، ئەوا خەڵکی وا بیردەکەنەوە کە من تەواو شێتی پیاوان بم.

لێرەدا خوایەک بە ناوی هیمداڵ «Heimdal» ەوە بیرۆکەیەکی باشی بە خەیاڵدا دێت، ئەو پێشنیارێک دەکات و دەڵێت لە بری فرایا تۆر بگۆڕن و وەک بووک نیشانی بدەن. دەتوانن قژی وەک ئافرەت دابهێنن و لە جیاتی مەمکیش دوو بەرد بە سنگیەوە بنووسێنن، بەو جۆرەش شێوەی لە ئافرەت دەچێت. بێگومان تۆر زۆر دڵی بە پێشنیارەکە خۆش نیە، بەڵام بۆ ئەوەی چەکوشەکەی بەدەست بهێنێتەوە، ناچارە و دەبێت بە گوێی ئامۆژگارییەکەی هیمداڵ بکات.

بەهەرحاڵ، لە کۆتایدا تۆر وەک بووک دەڕازێننەوە و لۆگەش دەبێتە کچۆڵە بووکی. ئەوجا لۆگە دەڵێت؛ «کەواتە ئێمەی ئافرەت بەرەو جۆتونهایمن سەفەر دەکەین.»

ئەگەر بە زمانێکی کەمێک مۆدێرانەتر باسیبکەین، دەتوانین بڵێین تۆر و لۆگە «تیپی دژ بە تیرۆر»ی خواکانن، دەشێ بە جلوبەرگی

ئافرەتانەوە هەوڵدەن بچنە ناو قەڵا بەرزەکەی دێوە خراپەکانەوە و چەکوشەکەی تۆر ڕزگاربکەن.
هەر کە دەگەنە جۆتونهایمن، دێوەکان دەستدەکەن بە ئامادەکردنی ئاهەنگی ژنهێنانەکە. بەڵام بووکێ، واتە تۆر، لەکاتی ئاهەنگەکەدا گایەکی تەواو و هەشت ماسی سلێمانکە دەخوات، هەروەها سێ بیرەی فەلیش دەخواتەوە. ئەمەش دەبێتە جێی سەرسوڕمانی تریۆم. «سەربازە کۆماندۆکان» خەریکە پەردەیان لەسەر دادەماڵرێت. بەڵام لۆگە لە حاڵەتە پڕ مەترسیەکەیان تێدەگات و بەپەلە بیرێکی نایابی بە خەیاڵدا دێت، لۆگە دەڵێت؛ «فرایا لە خۆشی هاتنی بۆ جۆتونهایمن، هەشت ڕۆژە هیچی نەخواردووە». بەمەش خۆیان ڕزگاردەکەن.
دواتر تریۆم تارای بووکێ هەڵدەداتەوە بۆ ئەوەی ماچیبکات، بەڵام کاتێک چاوی بە چاوە تیژ و تورەکانی تۆر دەکەوێت، دەسڵەمێتەوە و بەپەلە دەگەڕێتەوە دواوە. دیسانەوە لۆگە بەفێڵێک خۆیان ڕزگاردەکات و دەڵێت؛ «بووکێ لەبەر دڵخۆشی مەزنی ئاهەنگەکەی، هەشت ڕۆژە خەو نەچۆتە چاوی». پاشان تریۆم فەرمان دەدات چەکوشەکە بهێنن و لەکاتی مارەبڕینەکەدا بیخەنە باوەشی بووکێوە.
دەگێڕنەوە دەڵێن چەکوشەکە دەخەنە باوەشی تۆڕەوە و ئەویش تێر تێر پێدەکەنێت. یەکەم جار تریۆمی پێدەکوژێ و پاشانیش هەموو دێوە خراپەکانی تری پێ لەناودەبات. بەم جۆرەش دراما‌ی ناخۆشی فڕاندنەکە بە کۆتاییەکی دڵشاد تەواودەبێت.
ئا بەم شێوەیە تۆر «باتمان» یان «جیمس بۆند»ی خواکان بەسەر هێزی خراپەدا زاڵدەبێت.

خودی ئەفسانەکە ئاوهایە سۆفیا، بەڵام ئایا مانا ڕاستەقینەکەی چییە؟ «خۆ هەر تەنها بۆ خۆشی نەنووسراوەتەوە». دیسانەوە ئەم ئەفسانەیەش دەخوازێت پەیامێکمان پێ بگەیەنێت. لەوانەیە بکرێت بەم شێوەیە لێکیبدەینەوە؛
کاتێک ووشکانی وڵاتی دەگرتەوە، خەڵکی دەیانویست هۆی باران نەبارینەکە بزانن. بڵێیت دێوەکان چەکوشەکەی تۆریان نەدزیبێت؟
لەوانەیە ئەفسانەکە هەوڵی ڕوونکردنەوەی هۆی گۆڕانی وەرزەکان بدات؛ لە زستاندا سروشت دەمرێت، لەبەرئەوەی چەکوشەکەی تۆر لە جۆتونهایمنە. بەڵام لە بەهاردا دەتوانێت سەرلەنوێ بەدەستی بهێنێتەوە. بەم شێوەیەش وەڵامی پرسیارێک دەداتەوە کە خەڵکی سەریان لێ دەرنەدەکرد.
بەڵام ڕۆڵی ئەفسانە تەنها لێکدانەوەی شتێک نەبوو. بەڵکو خەڵکی زۆر جار چەندەها کردەوەی هەمەڕەنگی ئاینییان بەجێدەهێنا کە بە ئەفسانەوە گرێدرابوو. دەتوانین بڵێین خەڵکی لە کاتی ووشکانی یان کەمی بەروبومدا، هەروەک چۆن لە ئەفسانەکەدا هاتووە، شێوە نواندنێکیان «یان درامایەکیان» پێشکەش دەکرد. بۆ نمونە لەوانەیە پیاوێکی لادێکە خۆی وەک بووک بگۆڕیبایە و بەردیشی لە جێگەی مەمکی دابنایە، تەنها بۆ ئەوەی چەکوشەکە لە دێوەکان بدزێتەوە. بەم شێوەیەش خەڵکی چالاکانە کاریاندەکرد بۆ ئەوەی باران بباریبایە، لێرەشەوە بەروبوومی کێڵگەکان نەشونمای دەکرد و شیندەبوو.
هەرچۆنێک بێت، لە شوێنەکانی تری جیهانیشەوە چەندەها نمونەی ترمان هەیە کە مرۆڤ تێیدا «ئەفسانەی وەرزەکانی» کردۆتە درامایەک بۆ ئەوەی پەلە لە پڕۆسیسی سروشت بکات.

ئێمە لێرەدا تەنها چاوێکی خێرامان بە جیهانی ئەفسانەی باکوردا خشاند. بەڵام ژمارەیەکی بێپایانی ئەفسانە لەسەر تۆر و ئۆدین، فرای و فرایا، هیودەر و بالدەر، و چەندەها خواندی تریش هەبوون. ئەم جۆرە وێناکردنانە لە سەرانسەری جیهاندا تەشەنەی کردبوو، هەتاوەکو فەیلەسوفەکان هاتن و دەستیان وەردایە ناو ئەفسانەکانەوە. تەنانەت یۆنانیەکانیش لەسەرەتای سەرهەڵدانی فەلسەفەکەیاندا وێنەیەکی ئەفسانەیی جیهانیان هەبووە. بەدرێژایی سەدان ساڵ لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر باسی خواکانیان دەماودەم دەگێڕایەوە. لە یۆناندا خواکانیان ناوی زیۆس «Zeus» و ئەپۆلۆن «Apollon» ، هیڕا «Hera» و ئەسینا «Athene» ، دیۆنیسۆس «Dionysos»و ئەسکلیپۆس «Asklepios» ، هیراکلس «Herakles» و هیفایستۆس «Hefaistos» بوو. ئەمە گەر ناوی بەشێکی کەمی خواکانیان بهێنین، لەبەرئەوەی خاوەنی چەندەها خوای تریش بوون.
نزیکەی حەوت سەد ساڵ لەپێش لەدایکبوونی مەسیحدا، زۆرینەی ئەفسانەکانی یۆنان لەلایەن هۆمیر «Homer» و هێسیۆد «Hesiod»ەوە نووسرایەوە. ئەمەش حاڵەتێکی تەواو نوێی خوڵقاند؛ هەر خێرا پاش نووسینەوەی ئەفسانەکان، بواری گفتوگۆکردن لەسەریان بەرکەماڵبوو.
فەیلەسوفە سەرەتاییەکانی یۆنان ڕەخنەیان لە باسە خواییەکانی هۆمێرس دەگرت، وە دەیانگوت خواکان تا ڕادەیەکی زۆر لە مرۆڤ دەچن و وەک مرۆڤیش جێگەی باوەڕ نین. بۆ یەکەمین جاریش گوتیان لەوانەیە ئەفسانەکان تەنها مەزەنەکردنی خەڵک بن و هیچی تر.
دەتوانین لەلای زەینۆفانیس «Xenofanes» ی فەیلەسوف نمونەی یەکەمین ڕەخنە ببینین کە لە ئەفسانە گیرا. ئەم فەیلەسوفە لە

دەوروبەری ساڵی 570ی پێش زایندا ژیاوە. ئەو دەیگوت؛ خەڵکی خودایان لەسەر وێنەی خۆیان دروستکردووە، هەروەها پێیان وایە خواکان هەروەک ئێمە لەدایک ببن و وەک ئێمەش خاوەنی لەش و جلوبەرگ و زمان بن. زنجیەکان لەو بڕوایەدان خواکان ڕەشن و لوتیان کولە. تراکەر«Thraker» ەکان وا مەزەنەدەکەن خواکان چاویان شین بێت و قژیان زەرد. بەڵێ، گەر ئەسپ و گا و شێریش توانای وێنە کێشانیان هەبووایە، ئەوا ئەوانیش وێنەی خوایان لەسەر شێوەی ئەسپ و گا و شێر دەکێشا!
یۆنانیەکان ڕێک لەو کاتەدا چەندەها شاریان هەم لە یۆنان و هەم لە کۆڵۆنیە یۆنانیەکانی خواروی ئیتاڵیا و ئاسیای بچوکدا دامەزراند. بۆ ئەم مەبەستەش هەموو کارەکانیان بە کۆیلەکان ڕادەپەڕاند و خەڵکە ئازادەکەش سەرتاپای کاتیان بە ڕامیاری و ژیانی کەلتوریەوە بەسەردەبرد.
لەم شارانەشدا گۆڕانکاریەکی تەواو نوێ بەسەر شێوەی بیرکردنەوەی خەڵکیدا ڕوویدا. بۆ نمونە تاکەکەس بەو پەڕی سەربەستیەوە دەیتوانی پرسیار دەربارەی چۆنیەتی ڕێکخستنی کۆمەڵگا بکات. بەم شێوەیەش هەموو کەسێک، بەبێ ئەوەی پەنا بەرێتە بەر ئەفسانەی سەردەم، توانای پرسیارکردنی فەلسەفیشی هەبوو.
ئێمە دەڵێین پێشکەوتنێک لە شێوە بیرکردنەوەیەکی ئەفسانەییەوە بۆ شێوە تێڕوانینێکی تر ڕوویدا، کە لەسەر تاقیکردنەوە و ژیریی هەڵچنرابوو. لە ڕاستیدا ئامانجی فەیلەسوفە سەرەتاییەکانی یۆنان دۆزینەوەی شێوە لێکدانەوەیەکی سروشتی بوو بۆ پڕۆسەی سروشت .

سۆفیا بەردەوام بە ناو باخچەکەدا دەهات و دەچوو. هەوڵی لەیادکردنی هەموو ئەو شتانەی دەدا کە لە قوتابخانە فێری بوو بوو، بەتایبەتی لەیادکردنی وانەی سروشتی بەلاوە گرنگ بوو.
ئەگەر سۆفیا لەو باخچەیەدا گەورە بوایە و هیچ شتێکی دەربارەی سروشت نەزانیبایە، ئاخۆ بە چ شێوەیەک بەهاری دەبینی؟
بڵێیت هەوڵیبدایە جۆرە لێکدانەوەیەک بۆ هۆی باران بارین بهۆنێتەوە؟ ئایا فەنتاسیای خۆی دەخستەکار بۆ دۆزینەوەی تێگەیشتنێک بۆ توانەوەی بەفر یان هەڵهاتنی خۆر؟
بەڵێ، ئەو هیچ گومانێکی نەبوو، پاشانیش کەوتە هۆنینەوە؛
زستان دەستی بەستووی بەسەر وڵاتدا ڕاکێشابوو، لەبەرئەوەی "مۆریت"ی بەدکار، "سیکیتا"ی شازادەی ناسکی لە زیندانە ساردەکەیدا گرتبوو. بەڵام بەیانیەکیان "براڤاتۆ"، کوڕە پاشا ئازاکە، هات و سەربەستی کرد. پاشان سیکیتا زۆر دڵی خۆشبوو، لە ئاسوودەیدا لەسەر مەرزاکە دەستیکرد بە هەڵپەڕکێ و ئەو سروودەی دەخوێند کە لە زیندانە ساردەکەدا هۆنیبوویەوە. بەمەش زەوی و دارەکان تارادەیەکی زۆر هەستیان بزوا و هەموو بەفرەکە توایەوە و بووە فرمێسک. بەڵام پاشتر خۆر هەڵهات و هەموو ئەسرینەکانی ووشک کردەوە. باڵندەکانیش لاسایی سرودەکەی سیکیتایان دەکردەوە. لەو کاتەی شازادە جوانەکە قژە ئاڵتونەکەی ڕادەوەشاند، چەند تاڵێکی زوڵفی کەوتنە سەر زەوی و لە کێڵگەکاندا بوونە گوڵە سەوسەن...
سۆفیا پێی وابوو چیرۆکێکی جوانی هۆنیبێتەوە. ئەگەر ئەو هیچ لێکدانەوەیەکی تری بۆ گۆڕانی وەرزەکان نەزانیبایە، ئەوا بڕوای بە حەکایەتەکەی خۆی دەکرد.

ئەوجا سۆفیا تێگەیشت کە مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە دۆزینەوەی لێکدانەوەیەک بووە کە پرۆسیسە سروشتیەکانی پێ ڕوونبکاتەوە. لەوانەیە بەبێ ئەو تەفسیرانە مرۆڤ توانای ژیانی نەبووایە. هەر لەبەرئەوەشە کاتێک هێشتام زانست نەبوو، ئەو هەموو ئەفسانانەیان دەهۆنییەوە.

## فەیلەسوفە سروشتیەکان

## ...هیچ شتێک لە «هیچ»ەوە دروست نابێت...

پاشنیوەڕۆ دایکی سۆفیا لەسەر کارەوە گەڕایەوەماڵەوە، لەو کاتەدا سۆفیا لەسەر جۆلانەی باخچەکە دانیشتبوو، دەیویست پەیوەندیەک لە نێوان هیلدە میوللە کنەی، ئەو کچەی کارتی پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایکبوونی پێناگات، و کۆرسی فەلسەفەکەدا بدۆزێتەوە.

لە دورەوە دایکی هاوارکرد؛

ـ سۆفیا! نامەیەکت بۆ هاتووە!

خورپەیەک بە دڵی سۆفیادا هات. ئەو بەدەستی خۆی پۆستی ڕۆژەکەی دەرهێنابوو، کەواتە دەبێت لە فەیلەسوفەکەوە هاتبێت. ئەی چی بە دایکی بڵێت؟

بە هێواشی لەسەر جۆلانەکە هەستا و بەرەو لای دایکی هەنگاوینا.

ـ هیچ پولێکی لێنەدراوە. پێموابێت نامەیەکی دڵداریە!

سۆفیا نامەکەی وەرگرت.

ـ نایکەیتەوە؟

ـ هەرگیز بیستووتە کەس نامەی دڵداری لەبەرچاوی دایکیدا بکاتەوە؟

باشتربوو دایکی لەو باوەڕەدابێت نامەیەکی دڵداریە. هەرچەندە جێگای شەرمبوو، بەڵام زۆر خراپتردەبوو گەر لە پڕێکدا کۆرسی نامە گۆڕینەوەکەی ئاشکرابووایە، لە چ کەسێکیشەوە نامەی بۆ دەهات؟ لە فەیلەسوفێکی تەواو نامۆوە، جگە لەوەش هەر وەک چۆن پشیلە یاری بە مشک دەکات، ئەویش ئاوها یاری بە سۆفیا دەکرد.

نامەکە یەکێک بوو لە زەرفە سپییە بچکۆلەکان. سۆفیا بەرەو ژوورەکەی خۆی ڕۆیشتە سەرەوە و نامەکەی کردەوە، سێ پرسیاری نوێ لە نامەکەدا نووسرابوون؛

ئایا هیچ مادەیەکی بنەڕەتی هەیە کە هەموو شتێکی تری لێوە دروست بووبێت؟
بەبڕوای تۆ دەکرێت ئاو ببێتە شەراب؟
چۆن ڕێی تێدەچێت خاک و ئاو ببێتە بۆقێکی زیندوو؟

سۆفیا پرسیارەکانی تەواو بە شێتانە لەقەڵمدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە درێژایی هەموو ئەو ئێوارەیە بە مێشکیدا دەهاتن و دەچوون. تەنانەت ڕۆژی پاش ئەوەش دیسانەوە لە قوتابخانە یەکە یەکە بە قوڵی بیری لە پرسیارەکان کردەوە.
ئایا مادەیەکی بنەڕەتی هەیە کە هەموو شتێکی لێوە دروست بووبێت؟
ئەگەر وادانێین هەموو شتێکی سەر زەوی لە «مادە»یەکی دیاریکراوەوە دروست بووبێت، ئەی کەواتە چۆن تەنها ئەو مادەیە لە پڕێکدا گۆڕاوە بۆ گوڵێک، یان بۆ نمونە بۆ فیلێک؟
هەمان لێکدانەوە پرسیاری دووهەمیشی دەگرتەوە. بێگومان سۆفیا چیرۆکەکەی مەسیحی بیستبوو کە گوایە ئاوی کردووە بە شەراب، بەڵام هەرگیز بە مانای وشە وەرینەگرتبوو. ئەگەر مەسیح بەڕاستی ئاوی کردبێ بە شەراب، کەواتە موعجیزەیەک بووە و شتێکە لە ڕاستیدا ڕێی تێناچێت. سۆفیا دەیزانی ئاو لە شەرابیش و لە شتەکانی تری سروشتیشدا زۆرە، بۆ نمونە، هەرچەندە خەیار لەسەدا نەوەد و

پێنجی ئاوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت شتێکی تری لەگەڵدا بێت، چونکە خەیار خەیارەو تەنها لە ئاوی پەتی پێکنەهاتووە.
پاشان هاتە سەر دوا پرسیار، سەبارەت بە بۆقەکە... بە شێوەیەکی گشتی دیاربوو مامۆستای فەلسەفەکەی خولیای بۆق بوو. سۆفیا لەوانەیە بهاتایەتا سەر ئەو بڕوایەی بۆق لە خاک و ئاو دروست بووبێت، بەڵام لە هەموو بارێکدا پێی وابوو زەویەکە دەبێت لە یەک جۆر مادە پێکنەهاتبێت. ئەگەر زەوی لە چەندین مادەی جۆرا وجۆر پێکهاتبێت، ئەوا بێگومان ڕێی تێدەچێت خاک و ئاو کۆببنەوە و بۆق پێکبهێنن. ئەمەش بەمەرجێک بۆقەکە بە قۆناخی هێلکە و سەرەمێکوتەدا بڕوات. لەبەرئەوەی بۆق هەروا لە خۆڕا لە باخچەکەی پشتەوەدا سەر دەرناهێنێت، هەرچەندە گەر پڕ بە پێستی خۆشی ئاوی بدرێت.
بۆ پاش نیوەڕۆ کە گەڕایەوە ماڵەوە، زەرفێکی ئاستوریان بۆ خستبووە ناو سندوقی پۆستەکەیەوە. سۆفیاش وەک هەموو جارێکی دی خۆی گەیاندە کوخەکەی.

### *پڕۆژەی فەیلەسوفەکان*

دیسانەوە هاتینەوە! ئەم جارەیان بەبێ ئەوەی باسی کەروێشکی سپی و ئەو جۆرە پێشەکییانە بکەین، ڕێک دەچینە ناو وانەی ڕۆژەکەمانەوە.
دەمەوێت هەر لەسەردەمی یۆنانی کۆنەوە هەتاوەکو ئەمڕۆکە، پوختەی بیرکردنەوەی مرۆڤت دەربارەی پرسیارە فەلسەفیەکان بۆ باس بکەم. بەڵام یەک بەدوای یەک باسی بابەتەکان دەکەین.

فەیلەسوفەکان لە سەردەمێکی تردا دەژیان، پێشیدەچێت لە کەلتورێکی تەواو جیاوازی وەک لەوەی خۆماندا ژیابن، لەبەرئەوە زۆر جار ژیرانەیە گەر بەدوای پڕۆژەی فەیلەسوفەکانی مێژوودا بگەڕێین. واتە دەشێ ڕێک ئەو شتە بدۆزینەوە کە فەیلەسوفێکی دیاریکراو بایەخی بە دەرخستنی داوە. لەوانەیە فەیلەسوفێک گرنگی بە ڕەچەڵەکی سەرهەڵدانی دار و ئاژەڵەکان بدات. یەکێکی تر لەوانەیە بەقوڵی بیر لە بوونی خوا بکاتەوە، یان لە نەمری ڕۆحی مرۆڤ بکۆڵێتەوە.

واتە کە توانیمان پەنجە بخەینە سەر «پڕۆژەی» تایبەتی فەیلەسوفێک، ئەو کاتە ئاسانتر دەتوانین لە تەرزی بیرکردنەوەی ئەو تێبگەین. چونکە فەیلەسوفێکی دیاریکراو سەرقاڵی سەرجەمی هەموو پرسیارە فەلسەفیەکان نیە.

گوتم «بیرکردنەوەی "ئەو" وەک پیاوێک» واتە فەیلەسوفەکە، لەبەرئەوەی مێژووی فەلسەفە مۆرکی پیاوی پێوەیە. چونکە ئافرەت هەم وەک ڕەگەز و هەم وەک بوونەوەرێکی بیرکەرەوەش پێشێلکرابوون. بێگومان ئەمەش جێگەی دڵتەنگیە، لەبەرئەوەی بەم جۆرە چەندەها ئەزموونی گرنگمان لەدەست چووە. تەنها لەم سەدەیەی ئێمەدایە کە ئافرەت بە ڕاستی هەنگاو دەنێتە ناو مێژووی فەلسەفەوە.

(من نامەوێت ئەرکی ماڵەوەت بدەمێ، لە هەموو بارێکدا ڕاهێنانی سەختی ماتماتیکت پێ نادەم. لێکدانەوە و گۆڕینی کردارە ئینگلیزیەکانیش هەر زۆر لە مەبەستی منەوە دورە. بەڵام جارجارێک داوات لێدەکەم ڕاهێنانێکی زۆر چکۆلە جێبەجێبکەیت).

ئەگەر بەم مەرجانە ڕازیت، ئەوا دەست پێدەکەین.

### فەیلەسوفە سروشتیەکان

بەشێوەیەکی گشتی بە فەیلەسوفە یەکەمینەکانی یۆنان دەگوترێت «فەیلەسوفە سروشتیەکان»، چونکە بەر لە هەموو شتێکی دی سەرقاڵی سروشت و پڕۆسیسی سروشت بوون.

لەوەوپێش پرسیارێکمان دەربارەی ڕەچەڵەکی شتەکانی جیهانمان لە خۆمان پرسی.

ئەمڕۆکە خەڵکانێکی زۆر تاڕادەیەک لەو بڕوایەدان لە کاتێکی دیاریکراودا شتێک لە هیچی پەتییەوە سەریهەڵدابێت. بەڵام ئەم بڕوایە لەناو یۆنانیەکاندا بە هەمان شێوە بڵاونەبوو. ئەوان بەو پەڕی دڵنیاییەوە دەیانگوت «شتێک» هەمیشە دەبێت بوونی هەر هەبووبێت.

واتە چۆنیەتی سەرهەڵدانی هەموو شتێک لە هیچەوە، پرسیارێکی گەورە نەبوو لە لایان. لە بری ئەوە یۆنانیەکان لە چۆنیەتی گۆڕانی ئاو بۆ ماسیەکی زیندوو ڕادەمان. بیریان لە زەوی بێگیان دەکردەوە و دەیانویست بزانن چۆن لە زەویەوە دارێکی بەرز و گوڵێکی پڕ ڕەنگ سەر دەردێنێت. سەریان لەوە دەسوڕما کە چۆن منداڵێکی بچوک لە سکی دایکیدا دێتە بوون!

فەیلەسوفەکان بەچاوی خۆیان دەیانبینی سروشت بەردەوام گۆڕانکاری بەسەردادێت. بەڵام ئایا هۆی گۆڕانکاریەکان چیە؟ واتە چۆن چۆنی توخمێک سروشتی خۆی دەگۆڕێ و دەبێتە شتێکی تەواو جیاواز ـ بۆ نمونە زیندەوەرێکی پڕ لە ژیان؟

فەیلەسوفە یەکەمینەکان پێیان وابوو لە پشت هەموو گۆڕانکاریەکانەوە، مادەیەکی سەرەتایی دیاریکراو هەبێت، ئەمەش خۆی بۆ خۆی خاڵێکی هاوبەشی هەموویان بووە.

چۆنیەتی گەیشتنیشان بەم ئەنجامە نادیارە، ئێمە تەنها ئەوەندە دەزانین بەرە بەرە باوەڕکردنیان بە بوونی مادەیەکی بنەڕەتی گەشەی کردووە. بەپێی ئەوان دەبێت مادەیەک، تاڕادەیەکیش مادەیەکی شاراوە، لە پشت هەموو گۆڕانکاریەکانی سروشتەوە هەبووبێت. دەبێت «شتێک» وەک سەرچاوەی هەموو شتێکی تر هەبووبێت و هەموو شتێکی بۆ بگەڕێتەوە.

لە ڕاستیدا ئەو وەڵامانەی فەیلەسوفە یەکەمینەکان پێی گەیشتبوون، جێگەی مەبەستی ئێمە نین. بەڵکو بە پێچەوانەوە، زیاتر ئەو پرسیارانەمان مەبەستە کە دەیان ورووژاند و ئەو وەڵامانەمان بەلاوە گرنگە کە بەدوایدا دەگەڕاند. واتە زیاتر چۆنیەتی شێوازی بیرکردنەوەیان بەلامانەوە گرنگە، نەک ئەو شتانەی کتومت بیریان لێدەکردەوە .

دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین پرسیاریان دەربارەی گۆڕانکاریە بینراوەکانی سروشت کردووە، هەوڵی دۆزینەوەی هەندێ یاسای هەتاهەتایی سروشتیان داوە. ئەوان بە بێ ئەوەی پشت بە ئەفسانەی سەردەم ببەستن، گەرەکیان بووە لە ڕووداوەکانی سروشت تێبگەن. لەسەرو هەموو شتێکیشەوە هەوڵی تێگەیشتنی پرۆسیسی سروشتیان لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی خودی سروشتەوە داوە. ئەمەش شتێکی تەواو جیاوازە لەوەی هۆی هەورەبروسکە و باران، بەهار و زستان بە ڕووداوەکانی جیهانی خواکانەوە گرێبدەنەوە!

بەم شێوەیەش فەلسەفە خۆی لە دیانەت سەربەستکرد. دەتوانین بڵێین فەیلەسوفە سروشتییەکان یەکەمین هەنگاویان بەرەو جۆرە بیرکردنەوەیەکی زانستیانە برد. لێرەشەوە بوونە دامەزرێنەری سەرەتای هەموو زانستی سروشت ناسی دواتر.

لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا زۆربەی زۆری نووسین و وتەکانی فەیلەسوفە سروشتیەکان فەوتاون. ئەو کەمەی دەیزانین لە ڕێگەی نووسینەکانی ئەریستۆتالیسەوە «Aristoteles» بۆمان ماوەتەوە. ئەویش دوو سەد ساڵێک پاش یەکەمین فەیلەسوف ژیاوە. ئەریستۆتالیس تەنها پوختەی ئەو ئەنجامانەی نووسیبووەوە کە فەیلەسوفەکانی پێش خۆی پێی گەیشتبوون. واتە ناتوانین پەی بە چۆنیەتی گەیشتنیان بەو دەرئەنجامانە بەرین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین گۆڕانکاریە سروشتیەکان و بابەتی مادەی سەرەتایی، پڕۆژەی یەکەمین فەیلەسوفی یۆنانی بووە.

### *سێ فەیلەسوفەکەی میلیت*

تالیس «Thales» یەکەمین فەیلەسوفە کە ناویمان بەرگوێ دەکەوێت، خەڵکی کۆلۆنی یۆنانی میلیت بوو کە دەکەوتە ئاسیای بچوکەوە. تالیس گەشتی زۆری بە جیهاندا کردووە. لە نێو ئەو شتانەی دەربارەی تالیس دەیگێڕنەوە، دەڵێن بەرزی یەکێک لە هەرەمەکانی میسری بەهۆی پێوانەی سێبەرەکەیەوە پێواوە، کارەکەشی ڕێک لەو کاتەدا ئەنجامداوە کە سێبەرەکەی خۆی ڕێک بەقەد بەژنی خۆی بووە. دەشڵێن پێشبینی خۆرگیرانی ساڵی 585ی کردووە.
تالیس لەو بڕوایەدا بوو «ئاو» سەرچاوەی هەموو شتێک بێت. بەڵام بە تەواوەتی نازانین مەبەستی چی بووە. لەوانەیە مەبەستی ئەوە بووبێت هەموو ژیان لە ناو ئاودا دروست دەبێت و دیسانەوەش لە کاتی فەوتاندنیدا دەبێتەوە بە ئاو.
بەدڵنیاییەوە لە میسردا سەرنجی لە کێڵگەکان داوە و لە کاتی گەڕانەوەی نیلدا ناوچە ووشکەکانی دەلتای نیلی بینیوە کە شین

بووە. لەوانەشە لەپاش باران بارین، سەرهەڵدانی کرم و بۆقی بینیبێت.
ڕێشی تێدەچێت تالیس بیری لەوە کردبێتەوە کە ئاو دەبێتە سەهۆڵ و هەڵم، وە سەرلەنوێش دەکرێت ببێتەوە بە ئاو.
بەر لەمانەش تالیس دەیگوت «هەموو شتێک پڕە لە خودا»، دیسانەوە لێرەشدا ناتوانین بە دڵنیاییەوە لە مەبەستی بگەین. لەوانەیە خاکی ڕەشی وەک سەرچاوەی هەموو شتێک بینیبێت، هەر لە گوڵ و دانەوێڵەوە هەتا مێشوولە و سیسرک. لەوانەیە لێرەشەوە ئەندێشەی چووبێتە سەر زەوی و پێدەچێت بە بڕوای ئەو پڕبووبێت لە «تۆوی ژیان»ی بچکۆلە و نەبینراو. هەرچۆنێک بێت تالیس بە دڵنیاییەوە بیری لە خواکانی هۆمێرس نەدەکردەوە.
دووهەمین فەیلەسوف ئەناکسیماندەر«Anaximander» مان هەیە، ئەمیش هەر لە میلیتدا دەژیا. بەڕای ئەو، ئەم جیهانەی ئێمە یەکێکە لە چەندەها جیهانی تر و لەناو شتێکی «نادیاردا» (هەروەک خۆی ناوینابوو) دروست دەبن و دەفەوتێن. ئاسان نیە بزانین مەبەستی لە «نادیار» چیە، بەڵام ئاشکرایە وەکو تالیس بیری لە مادەیەکی دیاریکراو نەکردۆتەوە. لەوەیە پێی وابووبێت هەموو شتێکی خوڵقێنراو، دەشێ لە خالقەکەی جیاواز بێت. واتە لە ڕوانگەی ئەمەوە ڕێی تێناچێت مادە بنەڕەتیەکە تەنها ئاوی ئاسایی بێت، بەڵکو دەبێت شتێکی «نادیار» بێت.
سێهەم فەیلەسوفی میلیت، ئەناکسیمینس «Anaximenes» بوو، کە لە نزیکەی ساڵی 570 تا 526ی پێش مەسیحدا ژیاوە. بە بڕوای ئەو مادەی بنەڕەتی هەموو شتێک دەشێ هەوا یان تەم بێت.

بێگومان ئەناکسیمینس ئاشنای تیۆری ئاوەکەی تالیس بووە، بەڵام ئەی ئاو لە چیەوە دروست بووە؟ بەڕای ئەم دەبێت ئاو خەستکەرەوەی هەوا بێت. لە کاتی باران باریندا، دەبینین ئاو لە هەواوە دێتە دەرەوە. بە بڕوای ئەو کاتێک ئاو زیاتر چڕ دەبێتەوە ئەوسا دەبێتە خاک. لەوانەیە سەرنجی لم و خۆڵی دابێت کاتێک لە سەهۆڵی تواوەوە دێنە دەرێ. بە هەمان شێوەش لەو بڕوایەدابووە ئاگر ڕوونکراوەی هەوا بێت. واتە بەلای ئەناکسیمینسەوە زەوی و ئاو و ئاگریش لە هەواوە دروست بوون.
ماوەی نێوان زەوی بۆ ئاو و بۆ ناو گژوگیای سەوزی کێڵگەکان زۆر دور نیە، لەبەرئەوە پێدەچێت ئەناکسیمینس لەو بڕوایەدا بووبێت زەوی و هەوا و ئاگر و ئاو پێویست بن بۆ ئەوەی ژیان سەرهەڵبدات. بەڵام خاڵی هەرە سەرەتا دەشێ «هەوا» یان «تەم» بووبێت. بەم شێوەیەش لەگەڵ بڕواکەی تالیسدا تەبابووە کە دەیگوت مادەیەکی بنەڕەتی لە بنچینەی هەموو گۆڕانکاریە سروشتیەکاندا بوونی هەیە.

### هیچ شتێک لە «هیچ»ەوە دروست نابێت

هەر سێ فەیلەسوفەکەی میلیت لەو بڕوایەدابوون یەک (وە تەنها یەک) مادەی بنەڕەتی هەبێت کە هەموو شتێکی تری لێوە هاتبێتە بوون. بەڵام چۆن دەگونجێت تەنها یەک توخم لە پڕێکدا بگۆڕێت و ببێتە شتێکی تەواو جیاواز؟ دەتوانین ئەم گرفتە ناو بنێین «گرفتی گۆڕانکاری.»
لە نزیکەی ساڵی 500ی پێش لەدایک بوونی مەسیح، چەند فەیلەسوفێک لە کۆڵۆنی ئیلیای خواروی ئیتاڵیادا دەژیان. ئەم «ئیلیاییانەش» بەدەست ئەو جۆرە پرسیارانەوە دەیان ناڵاند.

بەناوبانگترین فەیلەسوفیان ناوی پارمێنیدس «Parmenides» بوو «نزیکەی 540 تا 480ی پێش مەسیح ژیاوە.«
لە دیدەی پارمێنیدسەوە هەرچی شتێک کە بوونی هەیە، هەمیشە بوونی هەر هەبووە. ئەمەش شێوە مەزەنەکردنێکی ئاساییبوو لای یۆنانیەکان. ئەوان تا ڕادەیەک هەتاهەتایی شتەکانی جیهانیان وەک شتێکی سروشتی دەبینی. پارمێنیدس دەیگوت؛ هیچ شتێک لە هیچەوە دروست نابێت و هەر شتێکیش کە بوونی هەیە، هەرگیز توانای فەوتاندنی نیە.
بەڵام پارمێنیدس لە زۆربەی ئەوانی تر زیاتر دەڕۆشت، بە بڕوای ئەو هیچ گۆڕانکاریەکی ڕاستەقینە ڕوونادات، لەبەرئەوەی هیچ شتێک، جگە لەو شێوەیەی کە هەیە، ڕێی تێناچێت ببێتە شتێکی تر.
بێگومان پارمێنیدس بەئاگابوو کە سروشت بەردەوام گۆڕانکاری خۆی نیشاندەدا. لە ڕێگەی هەستەکانیەوە سەرنجی گۆڕانی شتەکانی دەدا. بەڵام ئەمە لەگەڵ پەیامی ئەقڵی پارمێنیدسدا نەدەگونجا. کاتێکیش ناچارانە کەوتە بەردەم هەڵبژاردنێک لە نێوان ئەقڵ و هەستەکانیدا، ئەقڵی هەڵبژارد.
هەمووومان ئەو ڕستەیەمان بیستووە کە دەڵێت «هەتا نەیبینم باوەڕی پێ ناکەم»، بەڵام پارمێنیدس ئەو کاتەش باوەڕی نەدەکرد. بەپێی دیدەی ئەو هەستەکانمان وێنەیەکی هەڵەی جیهانمان پێدەبەخشن. وێنەیەک کە لەگەڵ ژیریێتی مرۆڤدا کۆک نیە. وەک فەیلەسوفێکیش بە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانی پەردە لەسەر هەموو شێوەیەکی «هەڵخڵەتاندی هەستی» هەڵماڵێت.
ئەم باوەڕە بە هێزەش بە ژیریەتی مرۆڤ ناوی ڕاشیونالیزم «Rationalism»ی لێدەنرێت، کەسێکیش زۆر بە توندی بڕوای بە

ئەقڵی مرۆڤ هەبێت وەک سەرچاوەی هەموو زانیاریەکی جیهان، پێی دەگوترێت ڕاشیۆنالیست.«Rationalist»

### هەموو شتێک لە بزاوتندایە

هیراکلیتس«Heraclitus» (نزیکەی 480 تا 540ی پێش زاین) لە هەمان سەردەمی پارمێنیدسدا دەژیا و خەڵکی ئیفیسۆس«Efesos» ی ئاسیای بچوک بوو. بە ڕای ئەو گۆڕانکاریە بەردەوامەکان کتومت خاسیەتی بنەڕەتی سروشتن. دەکرێت بڵێین هیراکلیتس، بە بەراوردکردنی لەگەڵ پارمێنیدسدا، زیاتر متمانەی بە هەستەکانی دەکرد.

ئەو دەیگوت هەموو شتێک لە بزاوتندایە، هەموو شتێک لە جوڵەدایە و هیچ شتێکیش هەتاهەتایی نیە. لەبەرئەوە ناتوانم دوو جار بچمە ناو هەمان ئاوەوە. چونکە کاتێک بۆ جاری دووهەم دەچمە ناوی، هەم ئاوەکە و هەم منیش شتێکی ترین.

هەروەها هیراکلیتس دەیگوت جیهان مۆرکی دژایەتیەکی بەردەوامی لە خۆ گرتووە؛ ئەگەر هەرگیز نەخۆش نەکەوین، ئەوا ناتوانین لە لەش ساخی تێبگەین. گەر هەرگیز برسیمان نەبووبێت، ئەوسا تێربوون بەهیچ جۆرێک دڵی خۆش نەدەکردین. ئەگەر شەڕ نەبووایە، هەرگیز ڕێزمان لە ئاشتی نەدەگرت وە ئەگەر زستان نەبوایە، هەرگیز چێژمان لە بەهار نەدەبینی.

هیراکلیتس پێی وابوو باشە و خراپە شوێنێکی پێویستیان لە سەرجەمی شتەکاندا داگیرکردبێت. ئەگەر یاری بەردەوامی نێوان دژایەتیەکان نەبووایە، جیهان کۆتایی دەهات.

ئەو دەیگوت؛ خودا شەو و ڕۆژە، هاوین و زستانە، شەڕ و ئاشتیە، برسێتی و تێربوونە. لێرەدا وشەی خودا بەکاردەهێنێت، بەڵام ئاشکرایە مەبەستێکی تەواو جیاوازتری هەیە وەک لەو خوایانەی ئەفسانەکان باسیان دەکرد. بەلای هیراکلیتسەوە خودا یان (خوداییانە) شتێکە هەموو جیهان دەگرێتەوە. بەڵێ، خودا کتومت لە گۆڕانکاریە بەردەوامەکانی سروشت و ناواخنە دژەکاندا خۆی نیشان دەدات.

زۆرجاریش لە بری وشەی خودا، وشەی لۆگۆس«Logos» ی یۆنانی بەکاردەهێنێت کە مانای هزر دەبەخشێت. بە پێی هیراکلیتس ئێمەی مرۆڤ هەرچەندە هەمیشە وەک یەک بیرناکەینەوە یان هەمان ژیرێتیمان نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەک شێوەی «ژیرێتی جیهان» بوونی هەیە و ئەمیش جڵەوی هەموو ڕووداوەکانی ناو سروشتی بەدەستەوەیە. بە بڕوای ئەو، ئەم «ژیرێتی ژیانە» یان «یاسای سروشتە» بۆ هەموان هاوبەشە و دەشێ هەموو مرۆڤێک پەیڕەوی بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی خەڵکی بەپێی ژیرێتی تایبەتی خۆیان دەژین. بە شێوەیەکی گشتی هیراکلیتس سەرنجی بەلای بیرکردنەوەی خەڵکانی تردا ڕانەدەکێشا، بەڵکو دەیگوت؛ ئەو بڕوایانەی زۆربەی خەڵکی لایان گەڵاڵە بووە، دەکرێت لەگەڵ یاری منداڵی بچوکدا بەراورد بکرێت.

هیراکلیتس سەرجەمێک یان بوونێکی گشتی لە نێوان گۆڕانکاریە سروشتیەکان و دژەکانیدا دەبینی. ئەم «شتەش» کە بنچینەی هەموو شتێکی ترە، ئەو پێی دەگوت «خودا» یان «لۆگۆس.«

**چوار مادە بنچینەییەکە**

بەم جۆرە بڕوای پارمێنیدس و هیراکلیتس بەمانای وشە دژ بەیەک بوون. بەپێی ئەقڵی پارمێنیدس هیچ شتێک شیاوی گۆڕان نیە. ئەزموونی هەستی هیراکلیتسیش، ڕوودانی گۆڕانکاری بەردەوامی لە سروشتدا نیشاندەدا. بەڵام کامیان ڕاستیان دەکرد؟ ئایا دەبێت پشت بە هەستەکانمان ببەستین، یان بەو شتانەی ئەقڵمان پێمان دەڵێت؟

هەریەک لە پارمێنیدس و هیراکلیتس جەختیان لەسەر دوو شت دەکرد؛

پارمێنیدس دەڵێ؛

»هیچ شتێک توانای گۆڕانی نیە و لەبەرئەوە بۆچوونە هەستیەکان دەشێ جێگەی باوەڕ نەبن.«

هیراکلیتسیش دەڵێ؛

»هەموو شتێک لە گۆڕاندایە (هەموو شتێک لە بزاوتندایە)، کەواتە بۆچوونە هەستیەکان جێگەی متمانەن.«

سەختە دوو فەیلەسوف لەمە زیاتر ناکۆکبن! بەڵام کامیان ڕاستیان دەکرد؟ ئێمپیدۆکلس «Empedocles» (نزیکەی 494 تا 434ی پێش زاین)ی خەڵکی سیسیلیان ئەو گرێ سەختەی کردەوە. بەبڕوای ئەو هەردوو پارمێنیدس و هیراکلیتس لە یەکێک لە بانگەوازەکانیاندا ڕاستیان دەکرد، بەڵام هەردووکیشیان لە خاڵێکدا هەڵەبوون.

بەڕای ئێمپیدۆکلس ناکۆکیە گەورەکەیان لەوەدایە هەردوو فەیلەسوفەکە وایدەبینن کە تەنها یەک مادەی بنەڕەتی بوونی هەبێت. ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت، ئەوا کەلێنی نێوان ئەو شتانەی ئەقڵ دەیڵێت و ئەوانەی «بە چاوی خۆمان دەیبینین»، تەواو نەشیاو دێتەوە.

بێگومان نەشیاوە ئاو ببێتە ماسی یان ببێتە پەپولە. بە شێوەیەکی گشتی ئاو گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، ئاوی پاک بۆ هەتاهەتایە وەک ئاوی پاک دەمێنێتەوە. بەم جۆرەش پارمێنیدس لەو خاڵەدا ڕاستی دەکرد کە دەیگوت «هیچ شتێک ناگۆڕێت.»

لە هەمان کاتیشدا ئێمپیدۆکلس لەگەڵ هیراکلیتسدا لەسەر بابەتی پشت بەستن بە هەستەکانمان تەبابووە. دەشێ باوەڕ بەو شتانە بکەین کە دەیان بینین و هەمیشەش گۆڕانکاری لە سروشتدا بەدیدەکەین.

لێرەشەوە ئێمپیدۆکلس گەیشتە دەرئەنجامێک؛ دەشێ وێناکردنی تەنها یەک مادەی بنەڕەتی، پەسەند نەکرێت. نە ئاو و نە هەواش بە تەنها دەتوانن خۆیان بۆ خۆیان بگۆڕێن و ببنە پەپولەیەک یان گوڵزارێک، لەبەرئەوە مەحاڵە سروشت تەنها یەک «توخمی بنەڕەتی» هەبێت.

بەپێی ئێمپیدۆکلس تێکڕای سروشت چوار جۆر لەو «توخمە بنەڕەت»یانە یان وەک خۆی دەیگوت «ڕەگانەی» هەیە. بە چوار ڕەگەکەشی دەگوت خاک، هەوا، ئاگر و ئاو.

هەموو گۆڕانکاریەکانی سروشت بەهۆی تێکەڵبوون و سەرلەنوێ هەڵوەشاندنەوەی ئەم چوار مادەیەوە ڕوودەدات، چونکە هەموو شتێک لە خاک و هەوا و ئاگر و ئاو پێکهاتووە، بەڵام بە ڕێژەی تێکەڵبوونێکی جیاواز. کاتێکیش گوڵێک یان زیندەوەرێک دەمرێت، ئەوسا هەر چوار مادەکە لە یەکتری جودا دەبنەوە. تەنانەت بە چاوی ڕووت دەتوانین سەرنج بۆ ئەو گۆڕانکاریە ڕابکێشین. بەڵام خاک و هەوا و ئاگر و ئاو بەبێ گۆڕانکاری و «وەک خۆیان» لە ناو تێکەڵەکەی کە تیایدان، دەمێننەوە. واتە هیراکلیتس ڕاست ناکات کە دەڵێت «هەموو شتێک

دەگۆڕێت». لە بنەڕەتدا هیچ شتێک خۆی لە خۆیدا گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، بەڵکو ئەو شتەی کە ڕوودەدات تەنها تێکەڵبوون و لێکجیابوونەوەی ئەو چوار توخمە جیاوازەیە، دواتریش سەرلەنوێ تێکەڵ بەیەک دەبنەوە.
دەتوانین ئەم بابەتە لەگەڵ وێنە کێشێکدا بەراورد بکەین. ئەگەر ئەو تەنها یەک ڕەنگی لەبەردەستدا بێت، بۆ نمونە ڕەنگی سوور، ئەوا بێگومان ناتوانێت وێنەی دارێکی سەوز بکێششێت. بەڵام ئەگەر ڕەنگی زەرد و سوور و شین و ڕەشی هەبێت، دەتوانێت بەسەدان ڕەنگی جیاواز جیاواز دەربهێنێت، لەبەرئەوەی دەتوانێت ڕەنگەکان بە هێندی جیاواز تێکەڵ بەیەک بکات.
نمونەیەکی تری چێشتخانەش هەمان شتمان نیشان دەدات؛ ئەگەر من تەنها ئاردم هەبێت، ئەوا دەبێت جادووگەربم گەر بتوانم کێکێک دروستبکەم. بەڵام ئەگەر ئارد و هێلکە و شیر و شەکرم هەبێت، ئەوسا دەتوانم چەندەها جۆری جیاوازی کێک لەم چوار توخمە سەرەتاییە بەرهەم بهێنم.
ئێمپیدۆکلس بەڕێکەوت نەیدەگوت «ڕیشەی» سروشت دەبێت ڕێک خاک و هەوا و ئاگر و ئاو بێت؛ لەلایەکەوە فەیلەسوفەکانی پێش ئەو هەوڵی ڕوونکردنەوەی مادە بنەڕەتیەکەی سروشتیان دەدا و گەرەکیان بوو بیسەلمێنن کە مادە بنەڕەتیەکە دەشێ ئاو یان هەوا یان ئاگر بێت، لەلایەکی تریشەوە تالیس و ئەناکسیمێنس لەو بڕوایەدابوون ئاو و هەوا دوو توخمی گرنگی سروشت بن. بەدەر لەمەش، یۆنانیەکان باوەڕیان بە گرنگی ئاگریش هەبووە، بۆ نمونە دەیاندی خۆر چ ڕۆڵێکی گرنگی لەسەر هەموو ژیانی سەر زەوی هەیە، بێگومان گەرمی لەشی ئاژەڵ و مرۆڤیشیان لا ئاشنا بووە.

پێدەچێت ئێمپیدۆکلس سەرنجی لە سووتانی لقی دارێک دابێت، ئەو کاتە شتێکی بەدیکردووە کە ڕێک بەرەو فەوتان دەچێت؛ بەئاسانی گوێمان لە قرچەقرچ و چزەچزی دارەکەیە، ئەوە «ئاوە»کەیەتی. شتێکیشی دەبێتە دووکەڵ، ئەوەش «هەوا»کەیەتی. بێگومان «ئاگر»ەکەش بەئاسانی دەبینرێت. کاتێکیش ئاگرەکە دەکوژێتەوە، شتێک لە پاشماوەی دەمێنێتەوە، ئەوەش خۆڵەمێشەکەیەتی یان «خاک»ەکەیە.

ئێمپیدۆکلس دەیگوت گۆڕانکاریە سروشتیەکان بەهۆی تێکەڵبوون و هەڵوەشانەوەی ئەو چوار «ڕەگ»ەوە ڕوودەدات، بەڵام لەوێدا هێشتام شتێک بە ناڕوونی دەمایەوە؛ خودی ئەو هۆیە چیە کە وا لە مادەکان دەکات بەیەکەوە کۆببنەوە و ژیانێکی نوێ دروستبکەن؟ وە هەروەها ئەو شتە چیە کە وا لە تێکەڵەکە دەکات دیسان هەڵبوەشێتەوە، بۆ نمونە هەڵوەشانەوەی گوڵێک؟

بە بڕوای ئێمپیدۆکلس دوو هێزی کاریگەر لە سروشتدا بوونی هەیە، بەم هێزانەشی دەگوت «خۆشەویستی» و «شەڕ». ئەو هێزەی شتەکان کۆدەکاتەوە «خۆشەویستی»یە، لە کاتێکدا ئەو هێزەی شتەکان دەفەوتێنێت «شەڕ»ە.

لێرەدا ئەو «مادە» و «هێز» جودا دەکاتەوە. ئەمەش شایانی ئەوەیە وەک تێبینیەک بنووسرێت، چونکە تەنانەت زانستی ئەمڕۆکەش «مادەی بنچینەیی» و «هێزی سروشت» جیادەکاتەوە. زانستی مۆدێرن لەو بڕوایەدایە هەموو پرۆسیسی سروشت بگەڕێنرێتەوە بۆ هاوکارییەکی نێوان مادە بنچینەییە جیاوازەکان و چەند هێزێکی زۆر کەمی سروشتی.

ئێمپیدۆکلس مامەڵەی لەگەڵ دیاردە هەستەکانیشدا دەکرد. بۆ نمونە دەیگوت من چۆن دەتوانم گوڵێک ببینم؟ ئایا لە ڕاستیدا چی ڕوودەدات؟ هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە، سۆفیا؟ ئەگەر نا، ئەوا ئێستاکە ئەو بوارەت لەبەردەستدایە!

بەپێی ئێمپیدۆکلس چاومان، هەروەک هەموو شتێکی تری سروشت، لە خاک و هەوا و ئاگر و ئاو پێکهاتووە. بەم شێوەیەش «خاک» لە چاوماندا ئەو شتانەی چواردەورمان دەبینێت کە لە خاک پێکهاتوون. «هەوا»کەش هەوا دەبینێت و «ئاگر»یش لە ناو چاوماندا ئەوە دەبینێت کە ئاگرە. «ئاو»یش ئەوەی کە ئاوە. ئەگەر چاومان یەکێک لەم توخمانەی کەم بێت، ئەوا ناتوانین سەرتاپای سروشت ببینین.

### *بەشێکی هەموو شتێک لە هەموو شتێکدا*

فەیلەسوفێکی تر کە نەیدەتوانی لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا تەبابێت کە دەیگوت هەموو ژیانی سروشت لە یەک مادەی دیاریکراوەوە (بۆ نمونە لەئاوەوە) دروست بووە، ئەناکساگۆرس «Anaxagoras» بوو (500 تا 428ی پێش زانین). ئەو تەنانەت ئەو بیرۆکەیەشی پەسەند نەدەکرد کە دەیگوت خاک و هەوا و ئاو یان ئاگر دەکرێت ببنە خوێن و ئێسقان. ئەناکساگۆرس لەو بڕوایەدا بوو سروشت لە چەندەها بەشی وورد ووردی بەچاو نەبینراو پێکهاتبێت. ئەو دەیگوت هەموو شتێک شیاوی دابەشکردنە بەسەر بەشی بچوکتردا، بەڵام تەنانەت لە بچوکترین بەشیشدا، بەشێکی سەرجەمی تێدایە. بە بڕوای ئەو ئەگەر پێست و موو لە هیچ شتێکی ترەوە دروست نەبن، کەواتە ئەو شیرەی دەیخۆینەوە و ئەو نانەی دەیخۆین دەبێت پێستیش و مووشی تێدابێت.

لەوانەیە بە هێنانەوەی یەک دوو نمونەی مۆدێرن باشتر بتوانین بیری ئەناکساگۆرس ڕوونبکەینەوە؛ بە بەکارهێنانی ئەو تەکنیکی لیزەرەی ئەمڕۆکە لەبەردەستدایە، دەتوانین جۆرە وێنەیەکی تایبەتی بگرین کە پێی دەڵێن «وێنەی سێ تەوەری». بۆ نمونە ئەگەر وێنەیەکی سێ تەوەرەیی ئۆتۆمبیلێک بگرین و پاشان وێنەکە لەت لەت بکەین ئەو کاتە لە هەموو بەشێکی وێنەکەدا وێنەی هەموو ئۆتۆمبیلەکە دەبینین، هەرچەندە ئەگەر ئەو پارچەیە پارێزەرەکەشی (دەعامیەکەشی) بێت، ئەمەش زۆر بە ئاسانی لەبەرئەوەیە کە وێنەی گشتی هەموو ئۆتۆمبیلەکە لە هەموو بەشێکی چکۆلەی وێنەکەدا بەرجەستە کراوە.
لەشیشمان تا ڕادەیەک بە هەمان شێوە داڕێژراوە. ئەگەر خانەیەکی پێستم لە پەنجەیەکم لێبکەمەوە، ئەوا کرۆکی خانەکە تەنها شێوەی ڕەنگی پێستم نیشان نادات، بەڵکو لە ڕێگەی هەمان خانەوە دەتوانین شێوەی چاو و ڕەنگی قژم بزانین، هەروەها دەتوانین بزانین چەند پەنجەم هەیە و چ جۆرێکیشن... هەموو ئەمانەی تێدایە. لە ناو هەموو خانەیەکی لەشدا وەسفێکی وردی چۆنیەتی پێکهاتنی هەموو خانەکانی تری لەشی تێدایە. واتە «بەشێک لە گشت» لە ناو هەموو تاکە خانەیەکدا هەیە. تەنانەت لە بچوکترین بەشیشدا بوونی سەرجەم هەیە.
ئەناکساگۆرس بەم «بەشە بچوکانە»ی، کە «بەشێک لە گشتی» تێدایە، دەگوت «تۆو» یان «چەکەرە.«
لێرەدا وەک یادکردنەوەیەک دەڵێین ئێمپیدۆکلس پێی وابوو «خۆشەویستی» بەشە جیاوازەکان کۆدەکاتەوە و بەو جۆرەش تەنی تەواو پێکدەهێنێت. بە هەمان شێوەش ئەناکساگۆرس جۆرە هێزێکی

دەبینی کە جگە لە ڕێکخستن، مرۆڤ و گیانەوەرانیش دەخولْقێنێت. ئەو بەم هێزەی دەگوت «ڕۆح» یان «ئەقلْ» (بە یۆنانی پێی دەلْێن نۆوس «Nous» ).

ئەناکساگۆرس گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە یەکەمین فەیلەسوفی ئەسینایە کە بیناسین. لە ڕەچەلْەکدا خۆی لەدایکبووی ئاسیای بچوک بوو، بەلاْم لە تەمەنی چل سالْیەوە لە ئەسینادا نیشتەجێبووە. دواتر لەوێدا تاوانی بێخودابیان دایە پالْی و لەدوا ئەنجامدا بەزۆرەملێ شاربەدەریان کرد. ئەو، جگە لە وتەکانی تری، دەیگوت خۆر خودا نیە بەلْکو تەنێکی سوورەوەبووە و لە نیوە دورگەی پیلۆپۆنس «Peloponnes» گەورەترە.

ئەناکساگۆرس بەشێوەیەکی گشتی خولیای ئەستێرەناسی بوو. پاش لێکۆلْینەوەی لەسەر بەردێکی نەیزکی، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە تەنە ئاسمانیەکان لە هەمان مادەی وەک زەوی دروستبوون. لەبەرئەوە بە بڕوای ئەو پێدەچێت خەلْکی لەسەر ئەستێرەکانی تر هەبن. هەروەها دەیگوت ڕووناکی مانگ لە مانگەوە نایەت، بەلْکو لە زەویەوە ڕووناکی وەردەگرێت. جگە لەمانەش دیاردەی خۆرگیرانی ڕوونکردەوە.

پەراوێزی نامە؛ سوپاسی سەرنج بەخشینت دەکەم، سۆفیا. بۆ ئەوەی باش لەم بەشە تێبگەیت، پێدەچێت دوو سێ جارێک بیخوێنیتەوە. بەلاْم تێگەیشتنیش هەمیشە هەولْ و کۆششی خۆی دەوێ. لەو بڕوایەدام بە زیرەکی برادەرێکت سەرسام نەبیت، گەر زانین و زیرەکیەکەی هەولْ و کۆششێکی زۆری نەویستبێت.

باشتریش چارەش بۆ پرسیاری مادە بنەڕەتیەکە و گۆڕانکاریە سروشتیەکان، دەشێ تا بەیانی لێی بوەستیت... تا ئەو کاتەی بە دیمۆکریتس «Democritus» دەگەین... ئیدی لێرەدا دەوەستم!

سۆفیا لە کوخەکەیدا بە بێدەنگی مایەوە، لە کونێکی پەرژینەکەوە تەماشای باخچەکەی دەکرد. دەیویست پاش ئەو هەموو خوێندنەوەیە، بیرکردنەوەکانی ڕێکبخات.
بێگومان ئاشکرایە ئاوی ئاسایی جگە لە سەهۆڵ و هەڵم، ناگونجێت ببێت بە هیچ شتێکی تر. تەنانەت مەحاڵە ببێت بە شوتیش، لەبەرئەوەی شوتیش جگە لە ئاو، لە شتێکی تریش پێکهاتووە. بەڵام دڵنیابوونەکەی دەگەڕایەوە بۆ ئەو شتانەی فێریان کردبوو. ئایا ئەگەر بەبێ ئەوەی بیخوێندایە، ئاوها سووردەبوو لەسەر ئەوەی سەهۆڵ تەنها لە ئاو پێکهاتووە و هیچی تر؟ بەلایەنی کەمەوە دەبێت لەوەوپێش چۆنیەتی بەستنی ئاو و توانەوەی سەهۆڵی بەوردی خوێندبێت.
پارمێنیدس نکۆڵی لە پەسەندکردنی هەموو جۆرە گۆڕانکاریەک دەکرد.
سۆفیا هەتا زیاتر بیری لەمە دەکردەوە، زیاتر و زۆرتر باوەڕی پێدەکرد... تا ڕادەیەک ڕاست دەکات. ئەقڵی پارمێنیدس پەسەندی نەدەکرد «شتێک» لە پڕێکدا بگۆڕێت بۆ «شتێکی تەواو جیاواز». لە ڕاستیدا زۆر ئازابووە کە وێراویەتی ئەمە بڵێت، چونکە هەموو کەسێ بە ئاسانی گۆڕانکاریەکانی سروشتی دەبینی و ئەویش لە هەمان کاتدا ناچاربوو نکۆڵی لە هەموو گۆڕانکاریەک بکات. بێگومان خەڵکانێکی زۆریش هەبوون کە پێی پێکەنیوون.

هەروەها ئێمپیدۆکلسیش بەڕاستی دەبێت زیرەک بووبێت، چونکە دەیگوت دەبێت جیهان لەیەک مادەی سەرەتایی زیاتر پێکهاتبێت. بەم شێوەیەش گۆڕانکاریەکانی سروشت دەگونجێ ڕووبدەن، هەڵبەتە بەبێ ئەوەی لە ڕاستیدا هیچ شتێک گۆڕانی بەسەردابێت.
ئەم فەیلەسوفە یۆنانیە دێرینە، تەنها لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەقڵەوە گەیشتە ئەم ئەنجامانە. بێگومان ئەو سروشتی خوێندووە، بەڵام وەکو ئەمڕۆکە بواری شیکردنەوەی کیمیایی لەبەردەستدا نەبووە.
سۆفیا بەڕاستی نەیدەزانی تا چ ڕادەیەک باوەڕکات هەموو شتێک لە خاک و هەوا و ئاو و ئاگر پێکهاتووە. بەڵام ئەمانە چ گرنگیەکیان هەیە؟ بە شێوەیەکی بنەڕەتی ئێمپیدۆکلس هەڵە نەبووە، چونکە بەبێ ئەوەی لە ئەقڵ لابدەین، گریمانەکردنی بوونی چەند مادەیەکی بنەڕەتی، تەنها شێوەیەکە کە بتوانین گۆڕانە سروشتیەکانی پێ پەسەند بکەین.
سۆفیا هێدی هێدی بۆی دەرکەوت فەلسەفە چەندە سەرنجڕاکێشەرە. لەبەرئەوەی خۆی بەپێی ئەقڵی خۆی دەیتوانی لەگەڵ بیرکردنەوەکاندا بڕوات، وە بەبێ ئەوەی پێویست بێت بگەڕێتەوە سەر ئەو شتانەی لە قوتابخانەدا فێری بووبوو. پاشان گەیشتە دەرئەنجامێک؛ بەڕاستی فەلسەفە شتێک نیە کە بتوانین فێری ببین، بەڵام لەوانەیە بتوانین فێری بیرکردنەوەی فەلسەفیانە ببین.

## دیمۆکریتس «Democritus»
## ... بلیمەتترین گەمەی جیهان ...

سۆفیا نامەکانی مامۆستای فەلسەفە نەناسراوەکەی خستەوە ناو قتووی کێکەکەوە و دایخست. بە هێواشی لە کوخەکەیدا هاتە دەرەوە. بۆ ساتێک وەستا و تەماشای باخچەکەی کرد. لە پڕێکدا «نامە دڵداریەکە»ی دوێنێ و گاڵتە پێکردنەکەی دایکی بە خەیاڵدا هاتەوە. بۆ ئەوەی دیسانەوە هەمان شت ڕوونەداتەوە، بەپەلە خۆی گەیاندە سندوقی پۆستەکە. تا ڕادەیەک ئاساییە نامەیەکی دڵداریت پێبگات، بەڵام دوو ڕۆژ لەسەر یەک جێگەی شەرمەزاریە.
دیسانەوە نامەیەکی سپی بەدیکرد! سۆفیا سەرنجی بۆ شێوەی نامە ناردنەکە ڕاکێشا؛ هەموو پاش نیوەڕۆیەک نامەیەکی زەردی گەورەی پێدەگەیشت. کاتێکیش سەرقاڵی خوێندنەوەی نامە گەورەکە دەبوو، فەیلەسوفەکە بە دزییەوە نامەیەکی سپی بچکۆلەی بۆ دەخستە ناو سندوقی پۆستەکەوە.
واتە سۆفیا بە ئاسانی دەیتوانی بزانێت چ پیاوێکە. یان لەوانەیە ئافرەتێک بێت، کێ دەزانێت؟ ئەوەندەی بەسە لەبەر پەنجەرەکەدا بوەستێت، لەوێوە بە ئاسانی دەتوانێت سندوقی پۆستەکە ببینێت و بەو شێوەیەش بە دڵنیاییەوە چاوی بە فەیلەسوفە نهێنیەکە دەکەوێت. بێگومان خۆ نامە سپیەکان خۆیان بۆ خۆیان نایەنە ناو سندوقی پۆستەکەوە؟
سۆفیا بڕیاریدا بۆ بەیانی پیلانەکەی جێبەجێ بکات... سبەینێ هەینیە و هەموو پشووی هەفتەکەی لەبەردەستدایە.

بەنامەکەی دەستیەوە خۆی گەیاندە ژوورەکەی خۆی و کردیەوە. ئەمڕۆ تەنها یەک پرسیاری تێدا نووسرابوو، بەڵام لە بەرابەردا لە هەر سێ پرسیاری پێشوتری ناو «نامە دڵداریەکە» شێتانە تربوو؛

بۆچی یاری لیگۆ بلیمەتترین گەمەی جیهانە؟

لەپێش هەموو شتێکدا سۆفیا دڵنیا نەبوو یاری لیگۆ بلیمەتترین گەمەی جیهان بێت. هەرچۆنێک بێت دەمێ ساڵە یاری پێ نەکردوون. جگە لەوەش هیچ پەیوەندییەکی لە نێوان فەلسەفە و لیگۆدا بەدی نەدەکرد.

بەڵام لەبەرئەوەی سۆفیا قوتابیەکی گوێڕایەڵ بوو، خێرا کەوتە پشکنینی تاقی سەری سەرەوەی دۆڵابەکەی و کیسەیەکی پڕ لە پارچە لیگۆی دۆزیەوە، پڕبوو لە شێوە و ئەندازەی جیاواز جیاواز.

ماوەکی زۆر بوو دەستی لەو پارچە پلاستیکانە نەدابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یاری پێکردن و شت دروستکردن پێیان، هەندێ بیرکردنەوەی دەربارەی تایبەتمەندی لیگۆکانی بە مێشکی سۆفیادا هێنا.

لە دڵی خۆیدا گوتی؛ بە ئاسانی شتیان پێ دروست دەکرێت. هەرچەندە پارچەکان شێوە و ئەندازەی جیاواز جیاوازیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان بەیەکەوە دەنووسێن. جگە لەمەش لیگۆکان هەرگیز تێکناچن. سۆفیا هەرچەندێکی دەکرد بیری نەدەهاتەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان لیگۆیەکی شکاوی دیبێت. ئەو پارچانەش کە هەیبوون، ئێستاش هەروەک ئەو کاتەی چەندین ساڵ لەمەوبەر بۆیان کڕیبوو، تەواو نوێ دیاربوون. لە هەموو شتێک گرنگتریش، دەیتوانی بە پارچە لیگۆکان هەموو شتێک دروست بکات، دیسانەوەش هەڵیان بوەشێنێتەوە و سەرلەنوێ شتێکی نوێیان پێ دروستبکات.

لەمە زیاتر چی پێویستە؟ دواجار هاتە سەر ئەو بڕوایەی یاری لیگۆ بلیمەتترین گەمەی جیهان بێت، بەڵام سۆفیا هێشتام پەیوەندی نێوان لیگۆ و فەلسەفەی وەک نهێنیەک دەبینی.

سۆفیا خانوویەکی گەورەی یاری پێ دروستکردن... لە دڵی خۆیدا نەیدەوێرا دان بەو ڕاستیەدا بنێت کە ماوەیەکی یەکجار زۆرە کاتێکی ئاوها خۆشی بەسەر نەبردووە. بۆچی خەڵکی کاتێک گەورەدەبن چیتر یاری ناکەن؟

کاتێک دایکی هاتەوە و بینی سۆفیا خەریکی یاریکردنە، بە دڵخۆشیەکەوە گوتی؛

ـ چەندە خۆشە بتبینم هێشتام وەک منداڵێک یاری دەکەیت.

ـ یاری ناکەم! خەریکی هەندێک تاقیکردنەوەی فەلسەفیم.

دایکی هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، بێگومان بیری لە کەروێشکە گەورەکە و کڵاوە درێژەکە دەکردەوە.

بۆ بەیانی کاتێک کە سۆفیا لە قوتابخانە هاتەوە، نامەیەکی زەردی گەورەی بۆ هاتبوو. لەگەڵ خۆیدا بردیە ژوورەکەیەوە و دەیوست یەکسەر دەست بە خوێندنەوەی بکات، لە هەمان کاتیشدا گەرەکیبوو چاودێری سندوقی پۆستەکە بکات.

## تیۆری ئەتۆم

وا جارێکی تریش پێک دەگەینەوە. ئەمڕۆ باسی دواهەمین فەیلەسوفی گەورەی سروشتی دەکەین. ناوی دیمۆکریتس «Democritus» بوو (نزیکەی 460 تا 370 پێش زاین). بە ڕەچەڵەک خەڵکی شاری ئەبدەری سەر قەراغ دەریای ئیجە بوو. ئەگەر توانیبێتت وەڵامی

پرسیاری لیگۆکە بدەیتەوە، ئەوا هیچ گرفتێکت لە تێگەیشتنی پرۆژەی ئەم فەیلەسوفەدا توشنابێت.
فەیلەسوفەکانی پێش دیموکریتس دەیانگوت گۆڕانکاریە بینراوەکانی سروشت لە ڕاستیدا بە هۆی «گۆڕانی» شتێکەوە ڕوونادەن، ئەمیش لەگەڵ بڕواکەیاندا تەبایە. لەبەرئەوە دەیگوت دەبێت هەموو شتێک لە بنەڕەتدا لە توخمی بچکۆلە بچکۆلەی نەبینراو پێکهاتبێت و هەر یەک لەو توخمانەش دەبێت هەمیشەیی و نەمربن. ئەم بەشە بچکۆلانەشی ناونابوو ئەتۆمەکان، واتە شتێک کە شیاوی دابەشکردن نیە.
جەختکردن لەسەر دابەش نەبوونی ئەو توخمە چکۆلانەی هەموو شتێکی لێ پێکهاتووە، بەلای دیموکریتسەوە شتێکی گرنگ بوو. لەبەرئەوەی دەیگوت ئەگەر بەردەوام شیاوی دابەشکردن بن، ئەوا ناکرێت ببنە توخمی پێکهێنەری شتەکانی سروشت. ئەگەر بەردەوام ئەتۆمەکان وردبکرێنەوە و بەسەر بەشی بچکۆلە و بچکۆلەتردا دابەشبکرێن، ئەوسا سروشت چڕیەتی خۆی لەدەست دەدات و بەردەوام وەک شۆربایەک شلتر و شلتر دەبێتەوە.
جگە لەمەش بەردی بناخەی سروشت دەشێ هەتاهەتایی بێت، لەبەرئەوەی هیچ شتێک لە «هیچ»ەوە نایەتە بوون. دەربارەی ئەم خاڵەش دیموکریتس لەگەڵ پارمێنیدس و ئیلیاتەکاندا تەبابوو. پاشانیش پێی وابوو ئەتۆمەکان ڕەق و چڕ بن، بەڵام بەبێ ئەوەی وەک یەک بن. ئەگەر ئەتۆمەکان وەک یەک بوونایە، ئەوا هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی پڕاوپڕمان بۆ چۆنیەتی پێکهاتنی شتە جۆرا و جۆرەکانی سروشت نەدەبوو. بۆ نمونە وەک خەشخاش و داری زەیتون و پێستی بزن و قژی مرۆڤ.

دیمۆکریتس دەیگوت ژمارەیەکی بێ پایانی ئەتۆمی جۆرا و جۆر لە سروشتدا بوونیان هەیە. هەندێکیان خڕ و لوسن، هەندێکی تریشیان چرچ و نا ڕێکوپێکن. ڕێک لەبەرئەوەی شێوەکانیان جیاوازە، دەتوانن کۆ ببنەوە و بەو شێوەیەش تەنە جیاوازەکان پێک بهێنن. هەرچەندە ژمارەی ئەتۆمەکان بێ پایانن و زۆر جیاوازیشن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەتاهەتاین و شیاوی فەوتان نین.

کاتێک تەنێک (بۆ وێنە دارێک یان ئاژەڵێک) دەمرێت و هەڵدەوەشێتەوە، ئەوسا ئەتۆمەکانی بڵاودەبنەوە و سەرلەنوێ توانای دروستکردنی لەشێکی نوێ بەدەست دەهێننەوە، چونکە ئەتۆمەکان لە هەوادا دەجوڵێنەوە و بەهۆی «دان» و «قولاپ»ەکانیانەوە هەمیشە دەتوانن پێکەوە بنووسێنەوە و شتەکانی چواردەورمان دروست بکەنەوە.

لەوانەیە ئێستاکە لە مەبەستی لیگۆکان تێبگەیت، وا نیە؟ تا ڕادەیەک لیگۆکان هەموو ئەو خاسیەتانەیان تێدایە کە دیمۆکریتس بە ئەتۆمەکانی دەبەخشی، هەر لەبەر ئەم هۆیەش دەتوانین هەموو شتێکیان پێ دروستبکەین. لە پێش هەموو شتێکەوە شیاوی دابەشکردن نین، پاشان چەندەها شێوە و ئەندازەی هەمەڕەنگیان هەیە و چڕ و ڕەقیشن. هەروەها «دان» و «قولاپ»یان هەیە و ئەوەش پێکەوە لکاندنیان ئاسانتر دەکات و بەم جۆرەش دەتوانین شێوەی جۆراو جۆریان پێ دروست بکەین. دواتریش شتە دروستکراوەکان شیاوی هەڵوەشاندنەوەن و بەمەش دەتوانرێت لە هەمان لیگۆ تەنی نوێی پێ دروست بکرێت.

سەرکەوتوویی و بڵاوبوونەوەی ئەم یاریە دەگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانەوەی بێ پایانی پارچەکانی. ئەگەر ئیمڕۆ پارچەیەکی لە

ئۆتۆمبیلێکدا بەکاربهێنین، دەکرێت سبەی هەمان پارچە لە قەڵایەکدا بخەینەکار. لە سەرو ئەمانەشەوە دەتوانین بڵێین لیگۆکان «نەمرن»، منداڵانی ئەمڕۆ دەتوانن بە هەمان پارچەی ئەو لیگۆیانە یاریبکەن کە کاتی خۆی دایک و باوکیان گەمەیان پێ کردووە.

هەڵبەتە دەتوانین لە قوڕیش چەندەها شێوەی جیاواز دروست بکەین، بەڵام ناکرێت هەویری قوڕەکە چەند جارێک بەکار بهێنینەوە، لەبەرئەوەی هەڵدەوەشێت و دەبێتە پارچەی بچوک بچوک و ئاستەمە بتوانین دیسانەوە تەنی نوێی پێ دروست بکەینەوە.

ئەمڕۆکە بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین تیۆری ئەتۆمەکەی دیمۆکریتس دروستە. سروشت بە ڕاستی لە چەند ئەتۆمێکی جیاواز جیاواز پێکهاتووە، کە کۆدەبنەوە و سەر لە نوێ لەیەک جودا دەبنەوەوە. پێدەچێت ئەو توخمی هایدرۆجینەی ئێستاکە لە خانەیەکی لوتی مندایە، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە خەرتومی فیلێکدا بووبێت... کێ دەزانێ، لەوانەیە ئەو توخمی کاربۆنەی ئەمڕۆکە لە دڵی مندایە، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کلکی دایناسۆرێکدا بووبێت.

بەڵام زانستی ئەمڕۆکە سەلماندویەتی کە ئەتۆمەکان شیاوی دابەشکردنن بۆ «گەردیلەی سەرەتاییەکان»، کە پێیان دەگوترێت پڕۆتۆن و نیوترۆن و ئیلیکترۆن. ڕێی تێدەچێت ئەم گەردیلانەش ڕۆژێک لە ڕۆژان بەسەر بەشی بچوکتردا لەتبکرێن، بەڵام زانا فیزیکەکان تەبان لەسەر ئەوەی کە دەبێت سنوورێک بۆ دابەشکردنیان هەبێت. دەبێت گەردیلەی زۆر ورد هەبن کە هەموو سروشتی لێ پێک هاتبێت.

بێگومان دیمۆکریتس سوودی لە ئامێرە ئەلەکترۆنیەکانی ئیمڕۆکە وەرنەدەگرت. ئەقڵی تەنها ئەداتی ڕاستەقینەی دەستی بوو، بەڵام

ئەقڵیش لە ڕاستیدا بواری هیچ جۆرە هەڵبژاردنێکی نەدەدایە. چونکە ئەگەر وا دابنێین هیچ شتێک گۆڕانکاری بەسەردا نایەت و هیچ شتێکیش لە «هیچ»ەوە نایەتە بوون و هیچ شتێکیش شیاوی فەوتان نیە، کەواتە دەبێت ناچارانە بڵێین سروشت لە کۆمەڵێک گەردیلەی بچوک پێکهاتووە، کە کۆ دەبنەوە و جیا دەبنەوە و دیسانەوەش سەرلە نوێ کۆدەبنەوەوە.

لەلایەکی تریشەوە دیمۆکریتس لێکدانەوەی دیاردەکانی سروشتی نەدەگەڕاندەوە بۆ هیچ «هێز»ێک یان «ڕۆح»ێک. لە دیدەی ئەوەوە هەموو بوون تەنها ئەتۆمەکان و بۆشاییە و هیچی تر. لە کاتێکیشدا تەنها باوەڕی بە شتە مادیەکان دەکرد، دەڵێن کەسێکی مەتریالیست «Materialist»بووە.

واتە هیچ «نیەت»ێکی بە ئاگا لە پشت جوڵەی ئەتۆمەکاندا بوونی نیە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە ڕووداوەکان بە ڕێکەوت ڕوودەن، بەڵکە هەموو شتێک بەپێی یاسای حەتمی سروشت بەڕێوە دەڕوات. بە بڕوای دیمۆکریتس هۆیەکی سروشتی شاراوە لە پشت هەموو دیارداکانەوە هەیە، هۆیەک کە لە خودی شتەکەندایە. جارێکیان دەربارەی سروشت گوتی؛ «دەرخستنی یاسایەکی سروشت بەلامەوە خۆشترە وەک لەوەی ببمە پادشای فارس .«

بەڕای دیمۆکریتس تیۆری ئەتۆمەکەی چۆنیەتی «هەستکردن»یشمانی ڕوون دەکردەوە؛ ئێمە بە هۆی جوڵەی ئەتۆمەکانەوەیە، کە دەتوانین هەست بە شتێک بکەین. بۆ نمونە کاتێک مانگ دەبینم، لەبەرئەوەیە کە ئەتۆمەکانی مانگ بەرچاوم دەکەون.

بەڵام ئەی دەربارەی ڕۆح چی؟ خۆ ناگونجێت ئەویش هەروەها لە ئەتۆم پێکهاتبێت، واتە لە «شتێکی مادی»... بۆ نا، بەپێی دیمۆکریتس

ڕۆح لە چەند ئەتۆمێکی تایبەتی خڕ و لوس پێکهاتوە و پێی دەگوتن «ئەتۆمی ڕۆحی». لە کاتی مردنی مرۆڤدا، ئەتۆمە ڕۆحیەکانی بە هەموو لایەکدا دەفڕن. بەم جۆرەش پێدەچێت جارێکی دی لە پێکهاتنی ڕۆحێکی نوێدا بەشدار ببنەوە.
واتە ڕۆحی مرۆڤ نەمر نیە. خەڵکانێکی زۆری ئەمڕۆکەش وەک دیمۆکریتس بڕوادەکەن و دەڵێن؛ ڕۆح پەیوەستی مێشکە و کاتێکیش مێشک هەڵدەوەشێت، مەحاڵە هیچ جۆرە ئاگاییەک بوونی بمێنێتەوە.
دیمۆکریتس بە تیۆری ئەتۆمەکەی خەتێکی ڕەشی بەسەر فەلسەفەی سروشتی یۆنانیدا هێنا. ئەو لەگەڵ هیراکلیتسدا تەبابوو لەسەر ئەوەی هەموو شتێکی سروشت «دەجوڵێتەوە»، چونکە دەیگوت فۆڕمەکان دێن و دەچن. بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەیگوت لە پشت هەموو ئەو شتانەی کە «دەجوڵێنەوە»، هەندێ توخمی نەگۆڕ و هەمیشەیی هەن کە «ناجوڵێنەوە»، ئەمەش ئەو توخمانە بوون کە دیمۆکریتس پێی دەگوتن «ئەتۆمەکان.»
سۆفیا بەو مەبەستەی چاوی بە نووسەری نامە نهێنیەکان بکەوێت، بەدەم خوێندنەوەوە چەند جارێک لە پەنجەرەکەوە تەماشای سندوقی پۆستەکەی دەکرد. بە بێدەنگی دانیشتبوو و دەیڕوانیە شەقامەکە، لە هەمان کاتیشدا سەرلەنوێ بیری لە هەموو ئەو شتانە دەکردەوە کە کەمێک لەوەوپێش خوێندبوونیەوە.
سۆفیا هەستیدەکرد دیمۆکریتس زۆر ساکارانە بیری دەکردەوە، بەڵام هاوکات یەکجار بلیمەتانە دەیڕوانی. ئەو چارەی نێوان «مادەی سەرەتایی» و «گۆڕانکاریەکانی» سروشتی دۆزیەوە. دیمۆکریتس هات و ئەو پرسیارەی فەیلەسوفەکان بۆ ماوەی چەند نەوەیەک بوو لە بەردەمیدا چەقیبوون، تەنها بە بەکارهێنانی ئەقڵی ڕوونی کردەوە .

سۆفیا شتێکی بە خەیاڵدا هات و خەریک بوو بداتە قاقای پێکەنین؛ بە ڕاستی لە دواهەمین ئەنجامدا دەبێت سروشت لە چەند توخمێکی بچوک پێکهاتبێت کە هەرگیز گۆڕانکاریان بەسەردا نایەت. لەهەمان کاتیشدا بە دڵنیاییەوە هیراکلیتس ئەو کاتە ڕاستیدەکرد کە دەیگوت هەموو فۆڕمەکانی سروشت «دەجولێنەوە» و گۆڕانکاریان بەسەردادێت، چونکە هەموو مرۆڤێک و ئاژەڵێک دەمرن، تەنانەت زنجیرە شاخەکانیش بەرە بەرە دادەخورێن. بەڵام لێرەدا گرنگە بزانین شاخەکان لە هەندێ گەردیلەی چکۆلە پێکهاتوون کە شیاوی دابەشبوون و داخوران نین.

لە هەمان کاتیشدا دیمۆکریتس هەندێ بابەتی نوێی هێنایە ئاراوە، بۆ نمونە دەیگوت؛ هەموو شتێک خۆی بۆ خۆی بە شێوەیەکی میکانیکی دەڕوات بەڕێوە. دیمۆکریتس بڕوای بە بوونی هیچ جۆرە هێزێکی ڕۆحی نەبوو (هەروەک چۆن ئێمپیدۆکلس و ئەناکساگۆرس بڕوایان پێبوو) جگە لەمانەش دیمۆکریتس بڕوای بە نەمری ڕۆحی مرۆڤ نەبوو.

بڵێیت سۆفیا لەم خاڵەیاندا لەگەڵ دیمۆکرتسدا تەبا بێت؟

ئەو وەڵامی پڕاوپڕی ئەمەی نەدەزانی، بەڵام لە ڕاستیشدا هێندە نەبوو دەستی بە خوێندنی کۆرسی فەلسەفە کردبوو.

## چارەنووس

## ...«فاڵگرەوەکە» هەوڵی دەرخستنی شتێک دەدات کە لە ڕاستیدا ڕوون نیە...

سۆفیا لە کاتی خوێندنەوەی دیموکریتسدا، بەردوام چاوێکی لەسەر دەرگای باخچەکە دانابوو. بەڵام تەنها بۆ دڵنیابوون بڕیاریدا تەماشایەکی سندوقی پۆستەکە بکات. دەرگای دەرەوەی کردەوە و نامەیەکی لەسەر پێپلیکانەکان بینی. ناوی تەواوەتی خۆشی لەسەر نووسرابوو.

کەواتە هەڵیخڵەتاند! ڕێک ئەمڕۆ کە سۆفیا چاودێری سندوقی پۆستەکەی دەکرد، فەیلەسوفە نهێنیەکە لە گۆشەیەکی تری ماڵەکەوە بەدزییەوە نامەیەکی تری فڕێدابووە سەر پلیکانەکان و پاشانیش لەناو دارستانەکەدا خۆی ونکردبووەوە... هەروا بە ئاسانی!

لە کوێوە دەیزانی سۆفیا ڕێک ئەمڕۆ چاودێری سندوقی پۆستەکە دەکات؟ بڵێیت ئەو پیاوە، یان ئەو ئافرەتە، لەبەر پەنجەرەکەدا بینیبێتی؟ هەرچۆنێک بێت... سۆفیا پێی خۆشبوو کە نامەکەی بینی و نەکەوتە بەردەستی دایکی.

سۆفیا بەپەلە گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و نامەکەی کردەوە. بەڵام قەراغی ئەم نامەیەیان کەمێک تەڕبوو، جگە لەوەش یەک دوو کونی قوڵی تێدابوو. سۆفیا زیاتر سەری لە تەڕی زەرفەکە سوڕمابوو، چونکە چەند ڕۆژێک بوو باران نەباریبوو.

لەسەر پارچە کاغەزەکە نووسرابوو؛

باوەڕت بە چارەنووس هەیە؟

ئایا نەخۆشی جۆرە سزایەکی خوایانەیە؟
چ هێزێک ڕەوڕەوەی مێژوو دەبات بەڕێوە؟

باوەڕت بە چارەنووس هەیە؟ یەکسەر گوتی نەء، لەبەرئەوەی بەڕاستی دڵنیا نەبوو. بەڵام لە هەمان کاتدا خەڵکانێکی زۆری دەناسی کە بڕوایان پێ بوو. بۆ نمونە زۆرینەی برادەرەکانی بورجەکانی ئەستێرەناسی ناو گۆڤارە هەفتەییەکانیان دەخوێندەوە. بەڵام ئەگەر باوەڕیان بە ئەستێرەناسی هەبێت، کەواتە دەبێت بڕوایان بە چارەنووسیش هەبێت. لەبەرئەوەی ئەستێرە ناسەکان پێیان وایە شوێنی ئەستێرەکانی ئاسمان، پێشبینی ژیانی مرۆڤی سەر زەوی بکەن.
یان ئەگەر بینینی پشیلەیەکی ڕەش لەسەر ڕێگاکەماندا بە نیشانەیەکی شووم دابنێین، کەواتە ئەوسا بڕوامان بە چارەنووس هەیە، وا نیە؟ سۆفیا هەتاوەکو زیاتر بیری لەم بابەتە دەکردەوە، نمونەی زیاتر و زیاتری بە خەیاڵدا دەهات؛ بۆ وێنە، بۆچی دەڵێن «لە تەختە بدە!»؟ یان بۆچی ڕۆژی هەینی 13ی مانگ بە شووم دادەنرێت؟ سۆفیا ئەوەشی بیستبوو کە هەندێ لە ئوتێلەکان ژمارەی سیانزەیان لە نمرەکردنی ژوورەکاندا پەڕاندووە. کەواتە بەلایەنی کەمەوە خەڵکانێکی زۆر هەن کە بڕوایان بە خورافیات هەیە.
«خورافیات»... ئایا لە بنچینەدا ئەم وشەیە سەیر نیە؟ گەر مرۆڤ بڕوای بە ئاینی ئیسلام یان ئاینی مەسیحی هەبێت، تەنها پێی دەگوترێت کەسێکی «بڕوا» دارە. بەڵام ئەگەر بڕوای بە ئەستێرە ناسی هەبێت یان ڕۆژی هەینی سیانزەی مانگ بە ڕۆژێکی شووم دابنێت، ئەوا یەکسەر ناوی «خورافیات»ی بەسەردا دەچەسپێنن.

کێ مافی ئەوەی هەیە کە بە بڕوای خەڵکانی دی بڵێت «خورافیات»؟
لە هەموو بارێکدا سۆفیا لە یەک شت دڵنیابوو؛ دیمۆکریتس بڕوای بە چارەنووس نەبوو، ئەو تەنها بڕوای بە ئەتۆمەکان و بۆشایی دەکرد و هیچی تر.
سۆفیا تەماشای پرسارەکانی تری کردەوە و کەوتە بیرکردنەوە.
ئایا نەخۆشی جۆرە سزایەکی خوایانەیە؟
لەدڵی خۆیدا گوتی کەس هەیە لەم سەردەمەدا بڕوای بەم جۆرە شتانە هەبێت؟ بەڵام پاشان چەندەها کەسی بیرکەوتەوە کە بەڕاستی پێیان وایە دوعاکردن و پاڕنەوە لە خودا، یاریدەی چاکبوونەوەی نەخۆشی بدات. کەواتە دەبێت لەو بڕوایەشدابن کە خودا دەستێکی لە نەخۆشکەوتن و چاکبوونەوەیاندا هەبێت.
پرسیاری سێهەمیش لە هەردوو پرسیارەکەی تر سەختتربوو. سۆفیا هەرگیز لەوەوپێش بیری لەوە نەکردبۆوە کە کێ ڕەوڕەوەی مێژوو دەبات بەڕێوە. بەڵام دەشێ مرۆڤ خۆی بێت، دەنا کێی تر؟ ئەگەر بڵێین خودایە یان چارەنووسە، کەواتە مرۆڤ خاوەنی هیچ ویستێکی سەربەست نیە.
دوو وشەی «ویستی سەربەست» خەیاڵی سۆفیای بردە سەر شتێکی تەواو جیاواز؛ بۆچی ڕازی دەبێت فەیلەسوفە پڕ لە نهێنیەکە یاری مشک و پشیلەی لەگەڵدا بکات؟ بۆچی ئەویش نامەیەکی بۆ نەنووسێت؟ ئەو، چ پیاو بێت یان ئافرەت، ئەم شەو یان سبەی پاش نیوەڕۆ نامەیەکی دی دەخاتە ناو سندوقی پۆستەکەوە، کەواتە دەتوانێت هەر لەوێدا نامەیەک بۆ مامۆستامەی دابنێت.
سۆفیا یەکسەر دەستیکرد بە نووسین. بەڵام سەخت بوو نامە بۆ کەسێک بنووسێت کە هەرگیز لەوەوپێش ئاشنایی لەگەڵدا نەبووە.

تەنانەت نەشیدەزانی پیاوە یان ژن؟ گەنجە یان پیر؟ لەوانەشە فەیلەسوفە نە ناسراوەکە کەسێکی ناسیاوی بێت.
لە دواجاردا ئەم نامەیەی بۆ نووسی؛
جەنابی فەیلەسوفی بەڕێز؛
ئەم ماڵە شانازی بە نامە گۆڕینەوەی کۆرسی فەلسەفەکەتان دەکات. بەڵام لە هەمان کاتدا پڕبەدڵ حەز دەکەین بتان ناسین. لەبەرئەوە داواتان لێدەکەین بە ناوی تەواوەتی خۆتانەوە، خۆتانمان پێ بناسێنن.
مایەی دڵخۆشیمانە کە بانگتان کەینە ماڵەکەمان و کوپێک قاوەمان لەگەڵدا بخۆنەوە. باشترە کاتێک بێت کە دایکم لێرە نەبێت. ئەو لە ڕۆژانی دوشەمەوە هەتا هەینی، لە کاتژمێری حەوت و نیوی بەیانییەوە هەتا پێنجی پاش نیوەڕۆ لەسەر کارە. منیش لە هەمان کاتدا دەچمە قوتابخانە و جگە لە ڕۆژانی پێنج شەمە، هەمیشە کاتژمێری دوو و چارەک دەگەمەوە ماڵەوە. دڵنیاشتان دەکەم قاوەیەکی باش لێدەنێم. لە ئێستاوە سوپاستان دەکەم.
قوتابیە دڵسۆزەکەتان؛ سۆفیا ئامۆنسن، تەمەن؛ 14 ساڵ.

لە کۆتایی خواری خوارەوەیدا نووسیبووی؛ تکایە وەڵام بدەنەوە.
نامەکەی یەکجار ڕەسمی دەرچوو، بەڵام سانا نەبوو وشەی تەواو و پڕاوپڕ بۆ کەسێکی نەناسراو هەڵبژێرێت.
سۆفیا نامەکەی خستە ناو زەرفێکی پەمەییەوە و دایخست. پاشان لێی نووسی «بگاتە دەستی فەیلەسوفەکە.»
گرفتەکە لەوەدا بوو بە چ شێوەیەک نامەکە بەدزی دایکیەوە بخاتە سندوقی پۆستەکەوە. کەواتە بەر لە هەموو شتێک دەبێت پێش ئەوەی

ئێوارێ دایکی بێتەوە، نامەکەی دانابێت. لە هەمان کاتیشدا دەبێت بەیانی زوو پێش ئەوەی ڕۆژنامە بێت، لە یادی بێت تەماشایەکی سندوقی پۆستەکە بکات. وە ئەگەر ئێوارە یان ئەم شەو هیچ نامەیەکی نوێی پێ نەگات، دەبێت خێرا زەرفە پەمەییەکەی دەربهێنێتەوە.

بۆچی دەبێت کارەکەی هێندە دژوار بێت؟

هەرچەندە ئێوارەی هەینی بوو، بەڵام سۆفیا هەر زوو خۆی خزاندە جێگاوە. دایکی بە بیانوی خواردنی پیتزا و تەماشاکردنی فلیمی پۆلیسیەوە، هەوڵی مانەوەی سۆفیای دەدا. بەڵام سۆفیا وای نیشاندا کە هیلاکە و دەیەوێت لە جێگاکەیدا پاڵکەوێت و بۆ خۆی کتێب بخوێنێتەوە. لەو کاتەدا کە دایکی تەماشای تەلەفیزۆنی دەکرد، سۆفیا فرسەتی لێهێنا و خۆی گەیاندە سندوقی پۆستەکە، خێرا نامەکەی تێ فڕێدا.

نائارامی دایکی بە ئاشکرا دەبینرا. هەر لەپاش باسکردنی کەروێشکە گەورەکە و کڵاوە درێژەکەوە، بە جۆرێکی تەواو جیاواز سۆفیای دەدواند. هەڵبەتە ئەویش پێی ناخۆشبوو هێندەی تر نیگەرانی بکات، بەڵام دەبوایە بڕۆشتایەتە ژوورەکەی خۆی و چاودێری سندوقی پۆستەکەی بکردایە.

نزیکەی کاتژمێری یانزە دایکی ڕۆیشتە سەرەوە و سۆفیاش هێشتام هەر لەبەر پەنجەرەکەدا دانیشتبوو، ڕێک تەماشای شەقامەکەی دەکرد. ئەوجا لە سۆفیاس پرسی؛

ـ ناشێت دانیشتبیت و تەماشای سندوقی پۆستەکە بکەیت؟

ـ من تەماشای ئەو شتە دەکەم کە حەزم پێیە.

ـ بەڕاستی ئاشق بوویت سۆفیا... هەرچۆنێک بێت، ئەگەر نامەیەکی نوێت بۆ بنووسێت، پێم وا نیە لە نیوە شەودا بۆت بێنێت.
ئاخ، سۆفیا چەندە قینی لە باسی ئەو دڵداریە خەیاڵیە دەهاتەوە، بەڵام چی بکات؟ باشتربوو دایکی لەناو گومانە هەڵەکەی خۆیدا بهێڵێتەوە.
دایکی بەردەوامبوو؛
ـ ئەو کەسەیە کە باسی کەروێشکەکە و کڵاوە درێژەکەی بۆ بکردیت، وا نیە؟
سۆفیا سەرێکی بۆ لەقاند.
ـ دەڵێم ئەو... خۆ ئالوودەی موخەدەرات نیە؟
ئەمجا سۆفیا بەڕاستی بەزەیی بە دایکیدا دەهاتەوە. دڵی نەدەهات دایکی لەو دڵە ڕاوکێیەدا بهێڵێتەوە، بەڵام بە ڕاستی پێچەوانەی هەقیقەت بوو! تەنها لەبەرئەوەی خەیاڵی سۆفیا دەچووە سەر بیرکردنەوەی سەرنجڕاکێش، ئیدی دەبێت یەکسەر پەیوەندی بە موخەدەراتەوە هەبێت؟ جارجارێک خەڵکانی بەتەمەن چەندە بێ ئەقڵن؟
سۆفیا ئاوڕی دایەوە و گوتی؛
ـ دایە، سوێندت بۆ دەخۆم کە هەرگیز توخنی ئەو شتانە نەکەوم. ئەویش... ئەویش هیچ جۆرە موخەدەراتێک ناخوات، بەڵام تەنها سەرقاڵی فەلسەفەیە و هیچی تر.
ـ لە تۆ بە تەمەنترە؟
سوفیا سەری بەملاولادا ڕاوەشاند.
ـ هاو تەمەنتە؟
سۆفیا سەرێکی بۆ لەقاند.

ـ دەشلێیت سەقاڵی فەلسەفەیە؟
دیسانەوە بە هەمان شێوە سەری بۆ لەقاندەوە.
ـ کەواتە بێگومان مرۆڤێکی شیرینە، گوڵەکەم... دەی، ئێستاکە ئیتر دەشێ وەک کچێکی باش کەمێک بخەوی.
بەڵام سۆفیا یەک دوو سەعاتێکی تر مایەوە و هەر تەماشای شەقامەکەی دەکرد. کاتژمێر نزیکبووەوە لە یەک و لە هیلاکیدا بە ئاستەم چاوەکانی بۆ هەڵدەهات. خەریکبوو بڕواتە ناو جێگەوە، بەڵام لە پڕێکدا چاوی بە تارماییەک کەوت کە لە دارستانەکەوە دەهاتە دەرەوە .
ئەو شەوە زۆر تاریکبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانی تارمایی پیاوێک ببینێت. هەستیدەکرد پیاوێکی بە تەمەن بێت، بەهەرحاڵ لە خۆی بەتەمەنتر بووا! شتێکیشی لە سەردا بوو، زیاتر لە کڵاو دەچوو.
بۆ ساتێک لەوە دەچوو تەماشای خانووەکەیان بکات، بەڵام سۆفیا هیچ گڵۆپێکی دانەگیرساندبوو. پیاوەکە بەرەو سندوقی پۆستەکە ڕۆشت و نامەیەکی گەورەی خستە ناوی. لەو کاتەدا کە نامەکەی فڕێدا، چاوی بە نامەکەی سۆفیا کەوت و دەستیکرد بە سندوقەکەدا و بردی. پاش چەند چرکەیەک بەرەو ڕێگای دارستانەکە کەوتە ڕێ و لە چاو تروکاندنێکدا ونبوو.
سۆفیا هەستیدەکرد دڵی خێراتر لێدەدات. زۆر حەزیدەکرد بە جلی خەوەوە دوای بکەوێت، بەڵام نا... نەیدەوێرا بەو نیوە شەوە بەدوای مرۆڤێکی نە ناسراودا ڕابکات. بەهەرحاڵ ناچاربوو، دەبوایە بڕۆشتایەتە دەرەوە و نامەکەی دەربهێنایە. پاش ماوەیەکی کەم بە نامەکەوە لە ژوورەکەی خۆیدا خۆی بینیەوە. بەهەناسە بڕکێوە لەسەر

جێگاکەی دانیشت. چەند خولەکێک تێپەڕی وماڵەکە بەردەوام هەر ئارام بوو، ئەوجا نامەکەی کردەوە و دەستی بە خوێندنەوە کرد.

**چارەنووس**

دیسانەوە بەیانیت باش سۆفیای ئازیز! لە پێش هەموو شتێکدا وە تەنها بۆ دڵنیایی، دەمەوێت ئاگادارت بکەمەوە و بڵێم بە هیچ جۆرێک بۆت نیە سیخوڕیم بکەیت... ڕۆژێک دێ یەکتری ببینین، بەڵام من بڕیاری کات و شوێنی دیاریکراو دەدەم. ئیتر وا ئاگادارم کردیتەوە و پێم وابێت گوێڕایەڵ دەبیت، وایە؟

ئەوجا با بگەڕێینەوە سەر فەیلەسوفەکانمان. لەوەوپێش بینیمان چۆن هەوڵی لێکدانەوەیەکی سروشتیان بۆ گۆڕانکاریەکانی سروشت دەدا. پێش ئەوانیش هەموو ئەو بابەتانەیان بە یاریدەی ئەفسانەکانەوە لێکدەدایەوە.

بەڵام خورافیاتی کۆن دەبوایە لە چەند بوارێکی تریشدا گۆڕەپانەکەی چۆڵکردایە؛ ئەو بوارانەش بابەتی نەخۆشی و لەش ساغی، وە هەروەها بابەتە ڕامیارییەکانیشی دەگرتەوە. یۆنانیە کۆنەکان لەم دوو بوارەدا باوەڕێکی بەهێزیان بە چارەنووس هەبوو.

ئەگەر لەو بڕوایەدابین ڕووداوەکان پێشتر بڕیاری ڕوودانیان لەسەر دراوە، کەواتە بڕوامان بە چارەنووس هەیە. ئەم جۆرە تێڕوانینەش بە درێژایی هەموو مێژوو لە سەرانسەری هەموو جیهاندا بەدیدەکەین، تەنانەت ئێستاکەش. بۆ نمونە لای خۆمان، لە باکوردا، ئێمە باوەڕێکی بە هێز بە جۆرە «چارەنووسێک» دەبینین کە سەرچاوەی لە ئەفسانەی ئیسلاندی کۆنەوە وەرگرتووە .

بەدەر لەمانەش، هەم لە لای یۆنانیە کۆنەکان و هەم لە شوێنەکانی تری جیهانیشدا، دەبینین مرۆڤ لەو بڕوایەدا بووە بەهۆی فاڵگرەوەی هەمەڕەنگەوە بتوانێت پەی بە چارەنووسی خۆی بەرێت. واتە پێدەچێت چارەنووسی کەسێک یان دەوڵەتێک بەچەند شێوازێکی جیاواز شیاوی دەرخستن بێت. تەنانەت ئێستاکەش خەڵکانێکی زۆر بڕوایان بە «کارت خوێندنەوە» یان «دەست گرتنەوە» یان لێکدانەوەی ئەستێرەکان» هەیە.
شێوەیەکی تایبەتی تریش قاوە گرتنەوەیە؛ پاش قاوە خواردنەوە، هەندێکی کەمی بە فنجانەکەوە دەمێنێتەوە. لەوانەیە نەخشێک یان شێوەیەکی دیاریکراو بنەخشێنێت (کاتێک دەبینرێت کە فەنتاسیمان بە باشی بەکاربهێنین). بۆ نمونە ئەگەر لە فنجانەکەدا شێوەیەک دەرکەوێت کە لە ئۆتۆمبیلێک بچێت، ئەوا لەوانەیە مانای ئەوە بێت ئەو کەسەی قاوەکەی خواردۆتەوە سەفەرێکی دورودرێژ بە ئۆتۆمبیل بکات.
بەم جۆرە دەبینین «فاڵگرەوەکە» هەوڵی دەرخستنی شتێک دەدات کە لە ڕاستیدا ڕوون نیە. ئەم ڕاستیەش هەموو جۆرە هونەرێکی پێشبینیکردن دەگرێتەوە، بەڵام ڕێک بە هۆی ئەم ناڕوونیەوە، سەختە دژ بە ڕای فاڵچیەکە بوەستینەوە.
کاتێک تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمان دەکەین، جگە لە کۆمەڵێ ئەستێرەی پشێوی پرشنگدار زیاتر هیچ شتێکی تر بەدی ناکەین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو سەردەمێکدا خەڵکانێک پێیان وابووە ئەستێرەکان توانای باسکردنی ژیانی سەر زەوی ئێمەیان هەبێت. تەنانەت ئەمڕۆکەش هەندێ سەرۆکی ڕامیاری هەن، پێش ئەوەی بڕیارێکی گرنگ بدەن، ڕێنومایی ئەستێرەناسەکان دەکەن.

### فاڵگرەوەی دێلفی

یۆنانیەکان لەو بڕوایەدابوون لە ڕێگەی فاڵگرەوە بە ناوبانگەکەی دێلفی«Delfi» یەوە، بتوانن پەی بە چارەنووسیان بەرن. خەڵکانی ئەو سەردەمە ئەپۆلۆن«Apollon» یان وەک خودای فاڵگرەوەکە لە قەڵەم دەدا. ئەویش لە ڕێگای پیسیا«Pythia» ی ژنە قەشەوە دەدوا. ئەمیش لەسەر کورسیەک دادەنیشت کە لەسەر درزێکی زەوی دانرابوو. هەندێ گاز لە درزەکەوە دەهاتە دەرەوە و پیسیای گێژ دەکرد، ڕێک لە ڕێگەی ئەو گێژبوونەشەوە دەبووە زمانی حاڵی ئەپۆلۆن.

خەڵکی دەهاتنە دێلفی و پرسیارەکانیان دەبردە لای قەشەکانی شارەکە. ئەوانیش دەیانگەیاندە پیسیا. وەڵامە دژوار و پڕ نهێنیەکانی ئەمیش، قەشەکانی ناچاردەکرد سەر لەنوێ وەڵامەکان وەرگێڕنەوە. بەم شێوەیەش یۆنانیەکان پێیان وابوو سوود لە حیکمەتی ئەپۆلۆن وەرگرن، چونکە بە بڕوایان ئەپۆلۆن هەموو شتێکی دەربارەی ڕابووردوو و داهاتووش دەزانی.

زۆربەی حاکمەکان گەر لە پێشدا ڕێنومابیان بە فاڵگرەوەکەی دێلفی نەکردایە، نەیاندەوێرا بکەونە شەڕەوە یان بڕیارێکی گرنگ بدەن. بەم جۆرەش قەشەکانی ئەپۆلۆن تا ڕادەیەک وەک دیپلۆمات و ڕاوێژکار ڕۆڵیان دەبینی، چونکە هەم خەڵکیان بە باشی دەناسی و هەم وڵاتیش.

لەسەر پەرستگاکەی دێلفی ئەم وتە بەناوبانگە هەڵکەندرابوو؛ «خۆت بناسە!». مەبەستیشیان لەوە بوو کە هیچ کەسێک هەرگیز نابێت بیر لەوە بکاتەوە کە لە مرۆڤێک زێدەترە و هیچ مرۆڤێکیش ناتوانێت لە چارەنووسی خۆی ڕابکات.

لە نێو یۆنانیەکاندا چەندین داستان دەربارەی ئەو خەڵکانەی دووچاری چارەنووسیان بوون، دەماودەمی دەکرد. هێدی هێدیش زنجیرەیەک شانۆی «تراجیدی»یان دەربارەی کەسە تراجیدیەکان نووسیەوە. چیرۆکی ئۆدیبیش نمونەیەکی هەرە بەناوبانگی ئەو تراجیدیانەیە.

### *زانستی مێژوو و پزیشک ناسی*

لەلای یۆنانیەکان چارەنووس تەنها ژیانی مرۆڤی دیاری نەدەکرد، بەڵکو لەو بڕوایەشدابوون تێکڕای هەموو پاشەڕۆژی جیهان بەدەست چارەنووسەوە بێت. ئەوان دەیان گوت پێدەچێت چارەنووسی شەڕێک خەتای دەست تێوەردانی خواکان بێت. تەنانەت لە سەردەمی ئێستاشماندا خەڵکانێکی زۆر پێیان وایە خودا یان هێزێکی نهێنی ڕەوڕەوەی مێژوو بەڕێوە بەرێت.

بەڵام ڕێک لەو کاتەدا کە فەیلەسوفە یۆنانیەکان هەوڵی دۆزینەوەی لێکدانەوەیەکی سروشتیان بۆ پڕۆسێسی سروشت دەدا، زانستێکی نوێ بە ناوی زانستی مێژووەوە سەریهەڵدا و هەوڵی دۆزینەوەی هۆ سروشتیەکانی ڕەوڕەوەی مێژووی دەدا. واتە لەوە بەدواوە کاتێک دەوڵەتێک شەڕێکی دەدۆڕاند، چیتر بەو شێوەیە لێک نەدەدرایەوە کە جۆرە سزایەکی خوایانە بێت. بەناوبانگترین مێژوونووسی یۆنانیش هیرۆدۆت «Herodot» ( 484تا 424ی پێش زاین) و سیۆسایدیدس «Thucydides»( 450تا 400ی پێش زاین) بوون.

بە بڕوای یۆنانیەکان نەخۆشیش بەهۆی دەست تێوەردانی خواکانەوە ڕوویدەدا. زۆر جار کە نەخۆشیەکی ساری بڵاو دەبووەوە، وەک جۆرە

سزایەکی خوایانە دەیانبینی. لەلایەکی تریشەوە لەو بڕوایەدابوون خوا توانای چارەسەرکردنی نەخۆشی هەبێت، بەو مەرجەی بە شێوەیەکی ڕاست و ڕێک و پێک قوربانیان پێشکەش بکردایە.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە تەنها تایبەت بە یۆنانیەکان نیە، بەڵکو تا ڕادەیەک لە هەموو شوێنێکدا دەبینرێت. پێش ئەوەی زانستی مۆدێرن بێتە کایەوە، مرۆڤ هۆی نەخۆشی بۆ دیاردەکانی سەرو سروشت دەگەڕاندەوە. بۆ نمونە وشەی "ئینفلۆنزا" (Influenza) لە بنەڕەتدا مانای ئەوە دەبەخشێت کە مرۆڤ لە ژێر کاریگەری خراپی ئەستێرەکاندا بێت.

تەنانەت ئەمڕۆکەش خەڵکانێکی زۆر لە سەرانسەری جیهاندا نەخۆشی (بۆ نمونە نەخۆشی ئایدز) وەک سزایەکی خوایانە تەماشا دەکەن. لە کاتێکدا هەندێکی دی پێیان وایە چارەسەری نەخۆشی لە ڕێگەی هێزی سەرو سروشتیەوە بەدەست بهێنرێت.

بەم شێوەیەش لە هەمان کاتدا کە فەیلەسوفە یۆنانیەکان ڕێگەیان بۆ جۆرە بیرکردنەوەیەکی نوێ دەکردەوە، زانستی پزیشکی یۆنانیش لە دایک بوو. ئەم زانستەش هەوڵی لێکدانەوەی نەخۆشی و چاکبوونەوەی بە شێوەیەکی سروشتی دەدا. هیپۆکراتس «Hippocrates» (لەدایک بووی ساڵی 460ی پێش زاین) بەردی بناغەی زانستی پزیشکی یۆنانی دامەزراند.

تەرزی ژیانێکی ئاسایی و مامناوەندی بەلای هیپۆکراتسەوە گرنگترین شێوەی خۆپاراستن بوو لە نەخۆشی. ئەو دەیگوت لەش ساغی حاڵەتی سروشتی مرۆڤە. ئێمە کاتێک نەخۆش دەکەوین، کە لاسەنگی لەشی یان ڕۆحی لەسەر «ڕێڕەوی سروشتی خۆی لابدات». ڕێگای لەش

ساغیش بۆ مرۆڤ، ژیانێکی مامنامەندی و هاوئاهەنگییە «ڕۆحی ساغ لەناو لەشی ساغدایە.»
ئەمڕۆکە یەکجار زۆر باسی «ئاکاری پزیشکی» دەکرێت. واتە پزیشکێک لە کاتی ڕاپەڕاندنی کارەکەیدا، دەبێت وەک ئەرکی سەرشانی پابەندی هەندێ یاسای ئاکاری بێت. بۆ وێنە پزیشکێک بۆی نیە ڕاچێتەیەکی بێهۆشکەر بۆ کەسێکی لەش ساغ بنووسێت. لەسەرو ئەوەشەوە ئەرکی پاراستنی نهێنی نەخۆشەکانی لەسەر شانە کە دەڵێت؛ هیچ پزیشکێک بۆی نیە باسی نەخۆشی هیچ یەکێک لە نەخۆشەکانی لەلای کەسانی دی بدرکێنێت. دەکرێت بیرۆکەی ئەمەش بگەڕێنرێتەوە بۆ هیپۆکراتس.
ئەو داوای لە قوتابیەکانی دەکرد بەم شێوەیەی خوارەوە سوێند بخۆن؛
«سوێند دەخۆم هەموو چارەیەک کە بە نەخۆشەکانمی دەدەم، لە بەکارهێنانی هەموو هێز و توانایەکمەوە هەڵقوڵابێت، وە لە هەمان کاتدا خۆم لە زیان بەخشین و ئازاردانیان دوورەپەرێز دەگرم. سوێند دەخۆم نە بە هیچ جۆرێک بە دەستی ئانقەست ژەهر بدەمە هیچ مرۆڤێک وە نە بە هیچ جۆرێکیش ببمە سەرچاوەی هیچ جۆرە ئامۆژگاریەک دەربارەی ژەهر. لە هەمان کاتیشدا هیچ شتێک نادەمە ئافرەت کە زیانی پێبگەیەنێت. بەڵام سەر ڕاست و پاک ژیانم بەسەردەبەم و هونەرەکەم بەکاردەهێنم.
هەروەها سوێند دەخۆم هیچ جۆرە برینێک بە بەرد ئەنجام نەدەم، بەڵکو ئەمە بۆ شارەزایانی خۆی بە جێدەهێڵم. لە هەموو ئەو ماڵانەی ڕوویان تێدەکەم، ئامانجم ڕزگارکردنی نەخۆشەکان دەبێت و لە هەموو خراپە کاریی و هەڵخڵەتاندنێک بەدور دەبم. بە تایبەتیش دور دەبم

لە دەست درێژکردنە سەر ناموسی پیاوان و ئافرەتان، چ سەربەست بن و چ کۆیلە.
هەموو شتێکیش لە کاتی جێبەجێکردنی کارەکەمدا، کە دەیان بیستم یان دەیان بینم، وە هەروەها لە دەرەوەشدا لەناو خەڵکیدا، وەک نهێنیەک لام دەمێنتەوە و لای هیچ کەسێک نایدرکێنم. چونکە من سوێندی نهێنی پاراستن دەخۆم.
کاتێکیش ئەم پەیمانە پەیڕەوی دەکەم و نایشکێنم، دەبا خۆشی و چێژ لە ژیانم ببینم، دەبا هەمیشە لەناو خەڵکیدا سەربەرزبم؛ بەڵام ئەگەر ئەم پەیمانەم شکاند، دەبا پێچەوانەکەیم بێتە ڕێ.»

بەیانی ڕۆژی شەممە بەخەبەربوونەوە و ڕاپەڕینی سۆفیا یەک بوو. لە خەویدابوو یان بەڕاستی فەیلەسوفەکەی بینی؟
بۆ دڵنیابوون دەستێکی بە ژێر جێگاکەیدا کرد. بەڵێ، نامەکەی دوێنێ شەو هێشتام هەر لەوێدا بوو، کەواتە خەونی نەدیبوو.
ئەو لەبنینی فەیلەسوفەکە تەواو دڵنیابوو! لەوەش زیاتر، بە چاوی خۆی بینی کە فەیلەسوفەکە نامەکەی برد.
سۆفیا دانەویەوە و هەموو کاغەزە چاپکراوەکانی لەژێر جێگاکەیدا دەرهێنا. بەڵام شتێکی سووری بینی بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو... ئەوە چیە؟ دەسرە؟
سۆفیا بەسکە خشێ بەژێر جێگاکەدا خشا و دەسرێکی سووری ئاوریشمی لە دیوارەکە کردەوە. بەڵام تەواو دڵنیابوو کە هی خۆی نەبوو.

بەوردی تەماشای دەسڕەکەی کرد و لەسەرسوڕمانیدا هاوارێکی لێ بەرزبووەوە... بە خەتێکی ڕەش لەسەر قەراغی خواری خوارەوەی دەسڕەکە نووسرابوو «هیلدە.»

هیلدە! ئەم هیلدەیە کێیە؟ بۆچی ئاوها تووشی یەکتر دەبن؟

## سوکرات Socrates

## ...زیرەکترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە دەزانێت کە نازانێت...

سۆفیا جلی هاوینەی لەبەرکرد و بە پەلە خۆی گەیاندە چێشتخانەکەیان. لەو کاتەدا دایکی خەریکی ئامادەکردنی نانی بەیانی بوو. سۆفیا بڕیاریدابوو هیچ شتێک دەربارەی دەسرە ئاوریشمیەکە باس نەکات .

ـ ڕۆژنامەی ئەمڕۆت هێناوە.

دایکی ئاوڕێکی دایەوە و گوتی؛

ـ نەخێر، دەتوانیت بۆم بهێنیت؟

سۆفیا بەپەلە بەسەر زیخەکەی دەرەوەدا ڕایکرد و خۆی گەیاندە لای سندوقی پۆستە سەوزەکەیان.

تەنها ڕۆژنامەیەک! نەدەکرا هەروا زوو وەڵامی نامەکەی بەدەست بگاتەوە، بەڵام لە سەر لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەدا چەند دێڕێکی دەربارەی سەربازە نەرویجیەکانی لوبنان خوێندەوە.

بەتالیۆنی نەتەوە یەککگرتووەکان... باشە هەمان شت لەسەر پۆستکارتەکەی باوکی هیلدە نەنووسرابوو؟ بەڵام کارتەکەی ئەو پولی نەرویجی لێدرابوو. پێدەچێت سەربازە نەرویجیەکان پۆستی تایبەتی خۆیان هەبێت...

کاتێک گەڕایەوە چێشتخانەکەیان، دایکی بە زمانێکی گاڵتە پێکردنەوە گوتی؛

ـ سەیرە وا ڕۆژنامەت بەلاوە گرنگە.

خۆشبەختانە نە لەکاتی نانخواردن و نە پاش نانخواردنیش، دایکی هیچی تری دەربارەی سندوقی پۆستەکە و نامەکان باس نەکرد. هەر

خێرا کە دایکی بەرەو بازاڕ کەوتە ڕێ، سۆفیا دەستی دایە نامەی چارەنووسەکە و خۆی گەیاندە ناو کوخەکەی.
لە تەنیشت قتووەکەوە، ئەو قتووەی نامەکانی تری فەیلەسوفەکەی تێدا دانابوو، نامەیەکی سپی چکۆلەی بۆ دانرابوو. سۆفیا بە بینینی نامە سپییەکە واقی وڕما، چونکە زور دڵنیابوو کە خۆی هیچ نامەیەکی لەوێدا دانەنابوو.
دیسانەوە قەراغی ئەم نامەیەش تەڕبوو. بە هەمان شێوەی نامەکەی دوێنێش یەک دوو کونی قوڵی تیابوو.
بڵێیت فەیلەسوفەکە هاتبێت بۆ ئێرە؟ ئاخۆ شوێنە هەرە نهێنیەکەی سۆفیا پێ بزانێت؟ بەڵام ئەی چۆنە وا قەراغی زەرفەکە تەڕە؟
هەموو ئەم پرسیارانە سەری سۆفیایان تەواو سوڕماند. بەڵام دواتر نامەکەی کردەوە و دەستیکرد بە خوێندنەوە؛

سۆفیای ئازیز؛
نامەکەتم بە بایەخ پێدانێکی زۆرەوە خوێندەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا کەمێکیش داخی دامێ. جێگەی داخە دەبێت دەربارەی هاتم بۆ قاوە خواردنەوەکە نائومێدت بکەم. ڕۆژێک دێت بەیەک بگەین، بەڵام هێشتام زۆری ماوە بتوانم لە پێچی کەپتایندا خۆم دەرخەم. لەلایەکی تریشەوە لەمەودوا چیتر ناتوانم خۆم نامەکان بگەیەنم؛ لەبەرئەوەی مەترسیەکی گەورەی تێدایە. نامەکانی داهاتوومت بە پەیامنێرە بچکۆلەکەمدا بۆ ڕەوانە دەکەم، ئەویش ڕێک دەیانگەیێنێتە شوێنە نهێنیەکەی ناو باخچەکە .
بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرکاتێک هەست دەکەیت پێویستتە، دەتوانیت پەیوەندیم پێوە بگریت. لەم بارەشیاندا کلۆ شەکرێک یان پسکیتێک

بخەرە ناو نامە ڕەنگ ئاڵەکەتەوە، ئەو کاتە پەیام نێرەکە تێدەگات و نامەکەتم بۆ دەهێنێت .
تێبینی؛ جوان نیە داوای قاوە خواردنەوە لەگەڵ کچێکی گەنجدا ڕەتبکەینەوە، بەڵام هەندێ جار تەواو پێویستە.
تێبینیەکی دی؛ ئەگەر دەسڕێکی سووری ئاوریشمیت دۆزیەوە، داوات لێدەکەم کە زۆر ئاگاداری بیت. جارجارێک ڕێک دەکەوێت ئەو شتانە بکەونە لای یەکێکی تر. بەتایبەتیش لە قوتابخانە و ئەو جۆرە شوێنانەدا، لە یادیشت بێت ئەمە قوتابخانەی فەلسەفەیە.
لەگەڵ ڕێز و سڵاومدا، ئەلبێرتۆ کنۆکس.

ڕاستە تەمەنی سۆفیا چواردە ساڵە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشی خۆی نامەی بۆ هاتبوو، بۆ نمونە بە بۆنەی ڕۆژی لەدایکبوون و جەژنە تایبەتیەکانەوە. بەڵام هەرگیز لەوەوپێش نامەیەکی سەیری ئاوهای بەدەست نەگەیشتبوو.
نامەکە نە پولی لێدرابوو نە لەناو سندوقی پۆستەکەشدا دانرابوو. جگە لەمانەش ڕێک هێنابوویانە ناو شوێنە هەرە نهێنیەکەیەوە. بەدەر لەمەش سەیرە لەگەڵ ئەو بەهارە خۆشەدا نامەکە ئاوها تەڕبێت.
بێگومان لە هەموو شتێک سەیرتریش دەسڕە ئاورشمییەکە بوو. لەوانەیە مامۆستای فەلسەفەکە قوتابیەکی تریشی هەبێت! ئەویش دەسڕە ئاوریشمیەکەی ونکردبێت. بەڵام ئەی چۆن گەیشتە ژێر جێگاکەی سۆفیا؟
ئەی ناوی ئەلبێرتۆ کنۆکس... ئایا ناوێکی پڕ نهێنی نیە؟

هەرچۆنێک بێت لە ڕێگەی نامەکەوە بۆی دەرکەوت کە پەیوەندیەک لە نێوان مامۆستای فەلسەفەکە و هیلدە میوللە کنەی دا هەیە. بەڵام هێشتام خاڵێک وەک نهێنیەک مابووەوە و لێی تێنەدەگەیشت؛ بڵێیت باوکی هیلدەش ئەدرێسەکانی لێ گۆڕدرابێت یان چی!؟

سۆفیا دانیشتبوو و بۆ ماوەیەکی دورودرێژ هەر بیریدەکردەوە، دەیویست پەیوەندیەک لە نێوان هیلدە و خۆیدا بدۆزێتەوە.

بەلام لە دواجاردا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و دەستی هەڵگرت. مامۆستای فەلسەفەکەی نووسیبووی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەتوانێت بیبینێت، بەڵام بڵێیت ڕۆژێکیش دابێت کە هیلدەی تێدا ببینێت؟

سۆفیا پەڕەکەی هەڵگێڕایەوە و لەو دیویەوە چەند دێڕێکی بەرچاو کەوت .

ئایا شەرم و شکۆی سروشتی بوونی هەیە؟

زیرەکترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە دەزانێت کە نازانێت.

زانیاری ڕاستەقینە لەناوەوە هەڵدەقوڵێت.

ئەو کەسەی ڕاستی دەزانێت، هەڵسوکەوتی ڕاستەش دەکات.

سۆفیا دەیزانی ئامانجی ئەم ڕستە کورتانەی ناو نامە سپییەکە، ئامادەکردنێکە بۆ نامە گەورەکەی کە بەدوایدا دێت. بەڵام لە پڕێکدا شتێکی بە خەیاڵدا هات؛ ئەگەر «پەیام نێرەکە» نامە زەردەکە بگەێنێتە ناو کوخەکەی، کەواتە هەر لەوێدا دەتوانێت چاوەڕوانی بکات. ئەو کاتەش کە دێت، وازی لێناهێنێت هەتاوەکو زانیاری زیاتری دەربارەی «فەیلەسوفەکە» بۆ نەدرکێنێت... بەڕاست، لە نامەکەدا نووسیبووی پەیام هێنەرەکە بچکۆلەیە؛ تۆ بڵێیت منداڵێک بێت؟

»هیچ شەرم و شکۆیەکی سروشتی بوونی هەیە؟«
سۆفیا دەیزانی کە شەرم وشەیەکی کۆنە و مانای جاڕسبوون لە شتێک دەبەخشێت، بۆ نمونە گەر بەڕووتی خۆمان دەربخەین. بەڵام ئایا لە ڕاستیدا سروشتیە گەر لەوە جاڕس ببین؟ کە دەڵێین شتێک سروشتیە، واتە هەموو کەسێک دەگرێتەوە. بەڵام لە زۆر شوێنی جیهاندا سروشتیە گەر خۆت بە ڕووتی نیشان بدەیت. کەواتە کۆمەڵگا بڕیاری شیاوبوون و نەشیاوبوونی شتەکان دەدات. بۆ نمونە لە کاتی گەنجێتی داپیرەدا، کەس بۆی نەبوو بە ڕووتی لەبەر خۆردا ڕابکشێت. لە کاتێکدا ئەمڕۆکە زۆربەی خەڵکی ئەم بابەتە بە شتێکی «سروشتی» دادەنێن. بەڵام هێشتام لە زۆربەی وڵاتانی تردا تەواو قەدەغەیە. سۆفیا سەریسوڕما و لە تاودا سەری ڕاوەشاند؛ ئەمە پەیوەندی بە فەلسەفەوە چیە؟
پاشان چووە سەر ڕستەی دووهەم؛ «زیرەکترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە دەزانێت کە نازانێت». بەڵام زیرەکتر لە کێ؟ ئەگەر فەیلەسوفەکە مەبەستی لەوە بێت ئەو کەسەی بەئاگابێت لەوەی هەموو شتێکی نێوان ئاسمان و زەوی نازانێت، زیرەکترە لەو کەسەی کەمێک دەزانێت و وا خۆی نیشان دەدات کە زۆر دەزانێت ـ بەڵێ، ئەو کاتە سۆفیاش لەگەڵیدا تەبایە. سۆفیا هەرگیز لەوەوپێش لەم ڕوانگەیەوە بابەتەکانی هەڵنەسەنگاندبوو، بەڵام هەتاوەکو زیاتر بیری لێدەکردەوە، زیاتر و زۆرتر بۆی دەردەکەوت کە پەی بردن بە نەزانینمان خۆی لە خۆیدا شێوە زانینێکە. بێماناترین شتیش بەلایەوە ئەو خەڵکانە بوون کە وایان دەردەخست تەواو دڵنیان لە بابەتێک، بەبێ ئەوەی لە ڕاستیدا سەروبۆری بابەتەکە بزانن.

پاشان هاتە سەر بابەتی زانینی ڕاستەقینەکەی کە لە ناوەوەدێت. بەڵام خۆ دەبێت هەموو زانیاریەک بەر لەوەی هاتبێتە ناو کەللەی مرۆڤەوە، ڕۆژێک لە ڕۆژان لەدەرەوەدا هەبووبێت؟ لەلایەکی تریشەوە سۆفیا ئەو کاتانەی لە یادە کە دایکی یان مامۆستاکانی دەیانویست شتێکی فێربکەن و ئەویش نەیدەویست. لە ڕاستیدا تەنها ئەو کاتانە شتێک فێردەبوو کە خۆشی بەشداری دەکرد، ئەوجا لە پڕێکدا شتێک تێدەگەیشت. مەگەر ئەمە ڕێک ئەو شتە نەبێت کە پێی دەڵێن «زانینی ڕوون.»

بەڵێ، سۆفیا هەستیدەکرد ڕاهێنانەکانی بە باشی هەڵدەسەنگاند، بەڵام سەیر و سەمەرەیی دواهەمین ڕستە خستیە پێکەنین؛ «ئەو کەسەی ڕاستی دەزانێت، هەڵسوکەوتی ڕاستەش دەکات.»

ئایا مەبەست لەوەیە کاتێک دزێک بانکێک دەبڕێت، لەبەرئەوەیە لەوە باشتر نازانێت؟ سۆفیا باوەڕی بەمە نەبوو! بەڵکو لەو بڕوایەدابوو هەم منداڵ و هەم گەورەش شیاوی ئەوەبن هەڵەی بێمانا بکەن و پاشانیش لێی پەشیمان ببنەوە، ئەمەش لە ڕاستیدا هەڵەکردنە دژ بە بیروباوەڕیان.

سۆفیا بە بێدەنگی دانیشتبوو و بیریدەکردەوە، لەو کاتەدا خشە خشێکی دارە ووشکەکانی ناو دارستانەکە سەرنجی ڕاکێشا. بڵێیت پەیام هێنەرەکە بێت؟ بەرە بەرە دڵی خێراتر لێیدەدا و زیاتریش دەترسا، چونکە دەیزانی ئەو شتەی لێی نزیک دەبێتەوە، وەک گیانەوەرێک هەناسە دەدات.

پاش ماوەیەکی کەم لەو دیوی دارستانەکەوە سەگێکی گەورە خۆی خزاندە کوخەکەوە، بێگومان "لابرادۆر"ە (*جۆرە سەگێکی گەورەیە.و). نامەیەکی زەردی گەورەی بەدەمەوە گرتبوو و ڕێک لەبەردەمی

سۆفیادا داینا. هەموو کارەکە بە خێرایی ڕوویدا و سۆفیاش بە هیچ جۆرێک فریا نەکەوت بجولێتەوە. چەند چرکەیەک دوای ئەوە نامە گەورەکەی بەدەستەوە گرت و سەگە زەردەکەش سەرلەنوێ لە دارستانەکەدا ونبووەوە. ئەوجا لەپاش تەواوبوونی هەموو شتێک، کاریگەری تاساندنەکەی دەرکەوت... سۆفیا دەستی خستە سەر ئەژنۆی و دەستیکرد بە گریان.

پاش ماوەیەک سەری هەڵبڕی، بەڵام نەیدەزانی چەندێک بەو جۆرە مابووەوە.

ئەمە بوو پەیام هێنەرەکە! سۆفیا هەناسەیەکی هەڵکێشا. کەواتە بۆیە قەراغی نامە سپییەکان تەڕبوون و چەند کونێکیشیان تێدابوو. چۆن لەوەوپێش خەیاڵی بۆ ئەوە نەدەچوو! بەهەرحاڵ، ئێستاکە تێگەیشت بۆ دەبێ کلۆ شەکرێک یان پسکیتێک بخاتە نێو ئەو نامەیەی کە دەیەوێت بۆ فەیلەسوفەکەی بنێرێت.

بێگومان هەموو کاتێک نەیدەتوانی بەو شێوەیەی دەیویست زیرەکانە بیربکاتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەلایەوە تایبەت بوو کە پەیام هێنەرەکە سەگێگی مەشق پێکراوە. هەڵبەتە ناشتوانێت زۆر لە «پەیام هێنەرەکە» بکات کە شوێنی ئەلبێرتۆ کنۆکسی بۆ ئاشکرا بکات.

سۆفیا زەرفە گەورەکەی کردەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوە.

***فەلسەفە لە ئەسینادا***

ئازیزم سۆفیا، لەوانەیە کاتێک ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە، بە هێرمس «Hermes»ئاشنا بووبیت. تەنها بۆ دڵنیابوونیش پێم خۆشە بڵێم هێرمس ناوی سەگەکەمە. بەڵام ئاسایی بێت بەلاتەوە، چونکە هەتا

بلێیت سەگێکی شیرینە، وە جگە لەوەش لە خەڵکانێکی زۆر ژیرترە. بەلایەنی کەمەوە هەرگیز بەو شێوەیە خۆی نیشان نادات کە زیرەکتر بێت لەوەی کە هەیە. پێم خۆشە بزانیت ناوی سەگەکەم هەروا بە ڕێکەوت هەڵنەبژاردووە. هێرمس پەیام نێری خوا یۆنانیەکان و لە هەمان کاتیشدا خودای کەشتیوانەکان بووە، بەڵام ئێستاکە با لەم بابەتەیان بگەڕێین. لەوە گرنگتر وشەی هێرمتیسک«Hermetisc» ە کە لە ناوی هێرمسەوە هاتووە و مانای شتێکی شاراوە دەبەخشێت یان شتێک کە نەتوانین بیگەینێ. ئەمەش لەگەڵ ئەم بارەی ئێمەد زۆر دەگونجێ؛ بەهۆی هێرمسەوە هەردووکمان لەلای یەکتر شاراوە دەبین. لەلایەکی تریشەوە هێرمس سەگێکی گوێ ڕایەڵە و بە شێوەیەکی گشتیش باش پەروەردەکراوە... لێرەدا ئیدی کۆتایی بە ناساندنی پەیام نێرەکەم دەهێنم.

ئەوجا با بگەڕێینەوە سەر فەلسەفە. پێشتر بەشی یەکەممان بینی، مەبەستم لە فەیلەسوفە سروشتیەکان و ئەو بەشەیە کە دەربارەی وێناکردنی ئەفسانەیی جیهان بوو. ئێستاکەش سێ فەیلەسوفی مەزنی سەردەمی کۆن باسدەکەین، ناویان سوکرات «Socrates» و پلاتۆن «Platon»و ئەریستۆتالیس«Aristoteles» ە.

هەریەک لەم سێ فەیلەسوفە بە شێوەی تایبەتی خۆی کاریگەری لەسەر شارستانی ئەوروپی بەجێهێشتووە.

فەیلەسوفە سروشتیەکان لەپێش سوکراتدا دەژیان، لەبەرئەوە پێشیان دەگوترێت «فەیلەسوفە پێش سوکراتیەکان». ڕاستە دیمۆکریتس چەند ساڵێک دوای سوکرات مرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شێوازی بیرکردنەوەی سەر بە فەلسەفەی «پێش سوکراتیەکانە». لەلایەکی تریشەوە تەنها بەهۆی سەردەمەوە سوکرات وەک نیشانەیەکی

وەرچەرخان دیاری ناکرێت، بەڵکو وەک جوگرافیاش ناچارین شوێنی دیاریکراوی خۆی بدەینێ، لەبەرئەوەی لە ڕاستیدا سوکرات یەکەمین فەیلەسوفە کە لە ئەسینادا لەدایک بووبێت و هەم خۆی و هەم قوتابیە فەیلەسوفەکانی دوای ئەویش لە ئەسینادا دەژیان و وەک فەیلەسوفێک ڕۆڵی خۆیان دەبینی. لەوانەیە لەیادت بێت کە گوتمان ئەناکساگۆرس بۆ ماوەیەک لە ئەسینادا دەژیا، بەڵام وەک باسمانکرد لە شارەکەیان دور خستەوە، چونکە لەو بڕوایەدابوو خۆر تۆپێکی ئاگری بێت. «دیارە سوکراتیش باشتری بەسەر نایەت.«!

واتە ژیانی کەلتوری یۆنانی لەسەردەمی سوکراتەوە لە ئەسینادا کۆبووەوە. بەڵام کاتێک لە فەیلەسوفە سروشتیەکانەوە دەچینە سەر سوکرات، گرنگە سەرنج بدەینە گۆڕانکاری خودی پڕۆژە فەلسەفیەکان.

لێرەشدا پێش ئەوەی باسی سوکرات بکەین، کەمێک دەربارەی سۆفیستەکان «Sophist» دەدوێین، کە لە کاتی سوکراتدا وێنەیەکی دیاری ئەسیناییەکانیان دەنەخشاند.

پەردەکەت دادەرەوە سۆفیا! مێژووی بیرکردنەوە وەک شانۆیەکی چەند بەشی وایە.

### مرۆڤ لە چەقدا

لە نزیکەی ساڵی 450ی پێش مەسیحەوە، ئەسینا بوو بە چەقی کەلتوری جیهانی یۆنانی. لەو کاتە بەدواوە فەلسەفەش ئاڕاستەیەکی نوێی وەرگرت.

فەیلەسوفە سروشتیەکان بەپلەی یەکەم لێکۆڵەرەوەی سروشت بوون، هەر لەبەرئەوەشە جێگەیەکی گرنگیان لە مێژووی زانستدا هەیە.

بەڵام لە ئەسینادا زیاتر سەرنجیان بۆ مرۆڤ و ڕۆڵی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا ڕادەکێشا.
لەو شارەدا هێواش هێواش شێوە دیموکراتیەک سەریهەڵدا، دادگا و ئەنجومەنی گەل گەشەی پێدرا. یەکێک لە بنچینەکانی دیموکراتیش ئەوەبوو کە خەڵکی دەبوایە زانیاریەکی پێویست و پڕاوپڕیان هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانن لە پرۆسیسە دیموکراتیەکاندا بەشداربن. دیموکراتیەکی گەنجیش پێویستی بە ڕاگەیاندنی گەل هەیە، ئەمەش شتێکە تەنانەت ئەمرۆکەش دەیبینین. لەسەرو هەموو شتێکی تریشەوە بەلای ئەسینابیەکانەوە گرنگبوو کە بتوانن بەسەر هونەری ئاخافتندا یان بەسەر ڕەوانبێژیدا زاڵ بن.
پاش ماوەیەکی کەم تەوژمی گروپێکی مامۆستا و فەیلەسوف ڕوویان لە ئەسینا کرد. ئەمانەش خۆیان ناو نابوو «سۆفیست»ەکان. وشەی سۆفیست مانای مرۆڤێکی ڕۆشنبیر یان ڕووناکبیر دەبەخشێت. پیشەی مامۆستایش لە ئەسینادا بوو بە سەرچاوەی گوزەرانی سۆفیستەکان.

سۆفیستەکان پەیوەندیەکی گرنگ و هاوبەشیان لەگەڵ فەیلەسوفە سروشتیەکاندا هەبوو؛ هەردوو لایەنەکە ڕەخنەیان لە ئەفسانەی سەردەم دەگرت. بەڵام لە هەمان کاتیشدا سۆفیستەکان ڕەفزی بیرکردنەوەی بێسوودیان (بەلای ئەوانەوە) دەکرد. بەپێی بڕوای ئەوان پێدەچێت وەلامێک بۆ پرسیارە فەلیسەفیەکان هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیانگوت ئێمەی مرۆڤ ناتوانین بگەینە یەقینێک، ناتوانین وەڵامێکی پڕاوپڕ و ڕاست و دروستی نهێنی سروشت و گەردوون بدۆزینەوە. ئەم جۆرە ڕوانگەیەش لە جیهانی فەلسەفەدا پێی دەگوترێت "سکێپتیسیزم"(Skepticism*) لە زمانی عەرەبیدا زیاتر بە

«الشكوكيه» وەردەگێردرێت، واتە گومانکەر بەڵام بەمانا فەلسەفیەکەی.و)
هاوکات دەیانگوت هەرچەندە ئێمە ناتوانین وەڵامی هەموو نهێنیەکانی سروشت بدەینەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەزانین کە ئێمە مرۆڤین و دەشێ فێربین پێکەوە بژین. لەبەر ئەم هۆیەش سۆفیستەکان گرنگیان بە مرۆڤ و شوێنی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا دەدا.
پرۆتاگۆراس«Protagoras» ی سۆفیست (نزیکەی 487 تا 420ی پێش زاین) دەیگوت «مرۆڤ پێوانەی هەموو شتێکە». مەبەستی لەوە بوو کە سەرتاپای باشە و خراپە و ڕاست و هەڵە هەمیشە دەبێت بەپێی پێویستی مرۆڤ هەڵبسەنگێنرێت. کاتێکیش پرسیاریان سەبارەت بە بڕوابوونی یان نەبوونی بە خواکانی یۆنان لێکرد، لە وەڵامدا گوتی «ئەم بابەتە سەختە و ژیانی مرۆڤیش کورتە». ئەو کەسەش کە نەتوانێت بە ڕوونی دەربارەی بوون و نەبوونی خودا بڕوای خۆی دەربڕێت، پێی دەڵێین ئەگنۆستیک «Agnostic» (*لە زمانی عەرەبیدا وشەی «اللادری» بەرامبەر ئەم وشەیە دادەنێن.و).
سۆفیستەکان سەفەری زۆریان بە جیهاندا دەکرد، بەم جۆرەش شێوەی حوکمڕانی هەمەڕەنگیان دەدی. سەرنجیان لە داب و نەریت و یاسای جیاوازی وڵاتان دەدا. لەم ڕوانگەیەشەوە گفتۆگۆیەکی بەم شێوەیەیان لە ئەسینادا هێنایە کایەوە؛ چ شتێک سروشت دەستنیشانی دەکات و چ شتێکیش کۆمەڵگا دیاری دەکات؟ لێرەشەوە بنچینەی ڕەخنەگرتنی کۆمەڵایەتیان لە شاری ئەسینادا دامەزراند.
بۆ نمونە دەیانگوت واژەی وەک «شەرم و شکۆی سروشتی» مەرج نیە هەمیشە لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینەدا بگونجێت. چونکە ئەگەر شەرمکردن «سروشتی» بوایە، کەواتە دەبووایە شتێکی زگماک بووایە.

بەڵام ئایا شتێکی زگماکە سۆفیا؟ یان شتێکە کە کۆمەڵگا دەیخوڵقێنێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەلای کەسێکەوە کە کەمێک سەفەری کردبێت، هەر زۆر ئاسانە؛ نەخێر «سروشتی» نیە یان زگماک نیە گەر بترسیت خۆت بە ڕووتی دەربخەیت. شەرم و شکۆ (یان بێ شەرمی) بەپلەی یەکەم گرێدراوی داب و نەریتی کۆمەڵگایە.
هەروەک دەبینیت ئەو سۆفیستانەی ڕوویانکردبووە ئەسینا، گفتوگۆیەکی توند و تیژیان دامەزراند، تەنها بەوەی کە دەیانگوت ڕاست و هەڵە مەرج نیە هەمیشە پێوانەیەکی موتڵەقیان هەبێت. سوکراتیش بە پێچەوانەی ئەوانەوە هەوڵیدەدا بیسەلمێنێت کە هەندێ لەو پێوانانە موتڵەقن و هەموو کەسێکیش دەگرێتەوە.

### *سوکرات کێ بووە؟*

لەوانەیە سوکرات «Socrates» ( 470تا 399ی پێش زاین) بە نهێنیترین فەیلەسوفی هەموو مێژووی فەلسەفە دابنرێت. هەرچەندە یەک دێڕیشی نەنووسی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە نێوان ئەو فەیلەسوفانەدا لەقەڵەم دەدرێت کە گەورەترین کاریگەریان لەسەر بیرکردنەوەی ئەوروپی هەبووە. ئەمەش بەتایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ مردنە تراجیدیاکەی.
ئێمە دەزانین سوکرات لە ئەسینادا لەدایک بووە و زۆربەی ژیانی بە لێدوان لەگەڵ ئەو خەڵکانەی لەسەر گۆڕەپان و شەقامەکاندا پێیان دەگەیشت، بەسەربردووە. ئەو دەیگوت «درەختەکانی وڵات هیچم فێر ناکەن». هەروەها دەشزانین بۆ ماوەی چەندەها کاتژمێر لەسەر یەک توانای مانەوەی لە بیرکردنەوەی قوڵدا هەبووە.

هەر لە کاتی ژیانیدا وەک مرۆڤێکی پڕ لە نهێنی تەماشای دەکرا. کەمێک پاش مردنیشی، بەدامەزرێنەری چەندین قوتابخانەی فەلسەفی جیاواز جیاواز دانرا. چونکە نادیاری و پڕ نهێنیەکەی ڕێگەی بە چەندین قوتابخانەی هەمەڕەنگ دەدا کە بە سەرچاوەی بۆچوونەکانیانی لەقەڵەم بدەن.

هەرچۆنێک بێت، یەک شت بەدڵنیاییەوە دەزانین؛ سوکرات پیاوێکی ناشیرینی بچکۆلە و قەڵەو بووە. دوو چاوی دەرپەڕیوو و زەقی پێوە بووە. بەڵام دەڵێن لە جەوهەردا «پڕ لە جوانی و قەشەنگی بووە». هەروەها دەیانگوت؛ «هەرچەندێک لە کاتی ڕابوردوو و ئێستاکەدا بگەڕێین، هەرگیز وێنەی کەسێکی تری وەک سوکرات نادۆزینەوە». لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر چالاکیە فەلسەفیەکانی بڕیاری کوشتنی دەرکرا.

هەرچی دەبارەی ژیانی سوکراتە بەپلەی یەکەم لە ڕێگەی پلاتۆنی قوتابیەوە دەیزانین، خۆشی پاشان بوو بە یەکێک لە فەیلەسوفە مەزنەکانی مێژوو. پلاتۆن چەندین دایەلۆگ (یان گفتوگۆی فەلسەفی) نووسی و لە باسەکانیدا سوکراتی وەک قسەکەرێک بەکاردەهێنا.

بەڵام پلاتۆن وتەی جۆراوجۆر دەخاتە سەر زاری سوکرات، هەر لەبەر ئەوەش ناتوانین بەتەواوەتی دڵنیابین لەوەی کە هەموو وتەکان بە ڕاستی قسەی سوکراتن. بەمانایەکی تر، سەختە وانەکانی سوکرات و وتەکانی خۆی جودا بکرێنەوە. لە ڕاستیدا هەمان گرفت چەندەها کەسایەتی تری مێژووش دەگرێتەوە، بەتایبەتیش ئەوانەی کە هیچ جۆرە نووسینێکیان لەپاش خۆیان بەجێ نەهێشتووە. بێگومان ناسراوترین نمونەش «مەسیح»ە. دیسانەوە لێرەشدا ناتوانین ڕاست و دروست بڵێین «مەسیحی مێژوویی» باسی ئەو شتانەی کردووە کە

ماسیۆ و لۆکاس لە زمانی ئەوەوە بۆمان دەگێڕنەوە یان بە پێچەوانەوەیە. بە هەمان شێوەش هەموو وتەکانی «سوکراتی مێژوویش» هەمیشە وەک نهێنیەک دەمێنێتەوە.
پێدەچێت زۆر گرنگ نەبێت کە بزانین سوکرات کێ بووە، بەڵام وا نزیکەی 2500 ساڵە سروشی بە بیرمەندەکانی ئەوروپا بەخشیوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاڤانەی پلاتۆن کە لەسەر سوکراتی نووسیوە.

## هونەری دواندن

دەکرێ جەوهەری شێوە کارکردنی سوکرات بە شێوەیەکی نەگەتیف لە قەڵەم بدرێت؛ ئەو هەوڵی نەدەدا کە شت فێری خەڵکی بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە وا خۆی نیشان دەدا کە دەیەوێت شتێک لە بەرامبەرەکەیەوە فێربێت. واتە وەک مامۆستایەکی قوتابخانە وانەی نەدەگوتەوە... نەخێر، ئەو لەگەڵ خەڵکیدا دەدوا.
بێگومان ئەگەر تەنها گوێی شلبکردایە، ئەوا هەرگیز نەدەبووە فەیلەسوفێکی بەناوبانگ، بە دڵنیایشەوە حوکمی کوشتنی دەرنەدەکرا. سوکرات بەشێوەیەکی گشتی بەم جۆرە دەستی پێدەکرد؛ پرسیارێکی دەکرد و بەشێوەیەک خۆی نیشاندەدا کە هیچ نازانێت. پاشانیش لەگەڵ بەردەوامبوونی لێدوانەکەیدا، وای لە بەرامبەرەکەی دەکرد خۆی لایەنە لاوازەکانی بیرکردنەوەکانی خۆی ببینێت. دواجاریش بەرامبەرەکەی لە سوچێکدا قەتیس دەکرد و ناچاریدەکرد بە چاوی خۆی هەڵە و ڕاست ببینێت.
دەڵێن دایکی سوکرات مامان بووە. سوکراتیش چالاکی فەلسەفی خۆی لەگەڵ «هونەری پیشەی» مامانەکاندا بەراورد دەکرد. خۆ ئەوە

مامانەکە نیە کە منداڵێک «دێنێتە دونیاوە»، بەڵکو ئەو لە کاتی لەدایکبوونەکەدا یاریدەی خۆی دەبەخشێت و هیچی تر. بە هەمان شێوەش سوکرات، وەک مامانێک، بە کاری خۆی دەزانی لە کاتی «لەدایکبوونی» بیرکردنەوەی ڕاستی خەڵکیدا، یاریدەی خۆی پێشکەشی ئەقڵی خەڵک بکات و هیچی تر. واتە زانیاری ڕاستی دەبێت لە ناوەوە هەڵبقوڵێت. تەنها ئەو تێگەیشتنەی لەناوەوەمانەوە دێت، «زانیاری» یان مەعریفەی ڕاستیە و مەحاڵیشە لەدەرەوەڕا کەسێکی دی بتوانێت فرێیبداتە ناومانەوە.

بە کورتی دەڵێم؛ توانای منداڵبوون خاسیەتێکی سروشتیە. بە هەمان شێوەش هەموو کەسێک بە بەکارهێنانی ئەقڵیان دەتوانن هەقیقەتە فەلسەفیەکان ببینن. لەبەرئەوەی کاتێک خەڵکی ئەقڵیان بەکار دەهێنن، ئەو کاتە بەدەستی خۆیان لە ناوەوەیاندا شتێک هەڵدەهێنجێنن.

سوکراتیش بە خۆ نیشاندانی وەک نەزانێک، خەڵکانی بەرامبەری ناچاردەکرد مێشکیان بخەنە کار. ئەو دەیتوانی «وا خۆی نیشان بدات» کە هیچ نازانێت، یان وای دەربخات کە لە بەرامبەرەکەی بێ ئەقڵترە، ئێمە بەمە دەڵێین ئایرۆنی «Irony» سوکراتی. بەم شێوەیەش هەمیشە دەیتوانی پەنجە بۆ لایەنە لاوازەکانی تەرزی بیرکردنەوەی ئەسینابیەکان ڕابکێشێت. ڕووی دەدا ئەمە لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا ڕووبدات، واتە بە ئاشکرا لەبەرچاوی خەڵکیدا. چاوپێکەوتنی سوکراتیش، وەک خۆ بێ ئەقڵکردن و بوونە گاڵتەجاڕێک لەبەرچاوی خەڵکانێکی زۆردا دەبینرا.

لەبەرئەوە زۆر سەیر نیە کە وەک بێزارکەرێک و جاڕسکەرێک تەماشابکرێت (بەتایبەتیش لای ئەوانەی کە دەسەڵاتیان لە کۆمەڵگادا

هەبووە). سوکرات دەیگوت؛ «ئەسینا وەک ئەسپێکی تەمبەڵ وایە، منیش وەک مێشی ئەسپ وام، دەمەوێت بەخەبەری بکەمەوە و ژیانی پێ بدەمەوە. (مرۆڤ چی لە مێشی ئەسپ دەکات، سۆفیا؟ دەتوانیت وەڵامی ئەوە بدەیتەوە).

### دەنگێکی خوایانە

کاتێک سوکرات بەردەوام خەڵکی دەگەست، بەو مەبەستە نەبوو کە ئازاریان بدات. بەڵکو شتێک لەناوەوەیدا هانیدەدا و ڕێگەی هەموو شتێکی لێگرتبوو. ئەو دەیگوت لە ناوەوەمدا «دەنگێکی خوایانە» هەیە. بۆ نمونە سوکرات دژی ئەوەبوو ئامادەی لە سێدارەدانی کەسێک بێت. هەروەها ناوی نەیارانی سیاسی نەدەبەخشی. نکۆڵی لە بەخشینی ناوی بەرەنگارە سیاسیەکان دەکرد. پاشانیش لەسەر ئەمانە ژیانی دانا.
لە ساڵی 399ی پێش مەسیحدا بە تاوانی «هێنانی خودای نوێ» و لادانی گەنجان» تاوانباریان کرد. پاشانیش زۆرینەی ئەو 501 ئەندامەی لە دادگاکەیدا دەنگیاندا، تاوانەکەیان پەسەند کرد.
بێگومان سوکرات دەیتوانی داوای بەزەیی بکات، بەلایەنی کەمەوە بە بەجێهێشتنی ئەسینا دەیتوانی خۆی قورتاربکات. بەڵام ئەگەر ئەوەی بکردبایە، ئەوساکە نەدەبووە سوکرات. گرنگی ئەم بڕیارە لەوەدایە کە ئەو «ویژدانی» خۆی و «هەقیقەتی» لە ژیانی تایبەتی خۆی بە بەرزتر دادەنا. سوکرات جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە بۆ باشکردنی کۆمەڵگا هەوڵدەدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حوکمی لە سێدارەدانی دەرکرا. کەمێک پاش حوکمەکەی بە ئامادەبوونی نزیکترین برادەرەکانی، پەرداخێک ژەهری خواردەوە و مرد.

بۆچی سۆفیا؟ بۆچی دەبوایە سوکرات بمردایە؟ 2400 ساڵە مرۆڤ ئەم پرسیارە دەکات. بەڵام ئەو تەنها کەسی مێژوو نیە کە لە هێڵ لایدابێت و ژیانیشی لەسەر دابێت. لەوەوپێش باسی مەسیحم کرد، بە ڕاستی چەندەها خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا بەدیدەکرێت، وا هەندێکیان ناو دێنم؛

هەم سوکرات و هەم مەسیحیش بەلای خەڵکانی سەردەمەکەیانەوە وەک مرۆڤێکی پڕ نهێنی تەماشا دەکران. هیچیان بە دەستی خۆیان پەیامەکانیان نەنووسیەوە. بەم شێوەیەش بە تەواوەتی پشت بەو وێنەیە دەبەستین کە شاگردەکانیان دەماندەنێ. دەشزانین هەردووکیان مامۆستای هونەری دواندن بوون و لە سەرو هەموو گومانێکەوە بوون. هەردووکیشیان هێندە بە بڕوایەکی بەهێزەوە دەدوان کە یان بەرامبەرەکەیان دەخستە ژێر کاریگەری خۆیانەوە، یان هەراسانیان دەکرد. لە هەموو شتێک گرنگتریش هەردووکیان دەیانگوت لە سەرچاوەیەکەوە دەدوێین کە لە خۆمان گەورەترە. هەردووکیان بەربەرەکانێی دەستەی دەسەڵاتیان دەکرد و ڕەخنەیان لە هەموو شێوەیەکی نارەوایی و بەکارهێنانی خراپی دەسەڵات دەکرد. گەورەترین خاڵی هاوبەشیشیان؛ هەردوکیان بەهۆی چالاکیەکانیانەوە ژیانیان لە دەست دا.

لە هەمان کاتدا لێکچوونێک لە شێوەی دادگای مەسیح و سوکراتدا دەبینین. هەردوکیان بە ئاسانی دەیانتوانی داوای بەزەیی بکەن، بەم جۆرەش ژیانیان ڕزگاربکەن. بەڵام هەردوکیان پەیام هێنەربوون و هەستیان دەکرد گەر تاسەر بەردەوام نەبن، خیانەت دەکەن. بەم شێوەیەش بە سەربەرزیەوە پێشوازیان لە مردن کرد و هەزارەها شاگردیان، تەنانەت لە پاش مردنیشیان، لە دەوری خۆیان کۆکردەوە.

من كە ئەم خاڵە هاوبەشانەی نێوان مەسیح و سوكرات دەهێنمەوە، لەبەر ئەوە نیە كە بڵێم هەردووكیان وەك یەك بوون. بەڵكو دەمەوێت بڵێم هەردووكیان خاوەنی جۆرە پەیامێك بوون، كە پابەندبوو بە جەربەزەیی كەسایەتیانەوە.

### *كارتێكی جۆكەر لە ئەسینادا*

سوكرات! هێشتام سوكراتمان تەواو نەكردووە سۆفیا، دەزانی؟ شتێكمان دەربارەی تەرزی كاركردنەكەی باسكرد، بەڵام ئەی پڕۆژەی فەلسەفیەكەی چی بوو؟

سوكرات لە هەمان سەردەمی سۆفیستەكاندا دەژیا. هەروەك ئەوانیش زیاتر بایەخی بە مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ دەدا، ئەمەش بەلای ئەوەوە گرنگتربوو لەو بابەتانەی فەیلەسوفە سروشتیەكان دەیان خستە ڕوو. چەند سەدەیەك پاش ئەو، فەیلەسوفێكی ڕۆمانی «سیسیرۆ « Cicero گوتی؛ «سوكرات فەلسەفەی لە ئاسمانەوە هێنایە سەر زەوی و لە شارەكاندا جێگەی بۆ كردەوە، فەلسەفەی هێنایە ناو ماڵەكان و خەڵكی ناچاركرد بیر لە ژیان و داب و نەریت و باشە و خراپە بكەنەوە.»

بەڵام سوكرات لە خاڵێكی گرنگدا لە سۆفیستەكان جودا دەكرێتەوە. ئەو خۆی بە «سۆفیست»ێك دانەدەنا، واتە وەك مرۆڤێكی ڕۆشنبیر و زانا خۆی نەدەبینی. لەلایەكی تریشەوە بە پێچەوانەی سۆفیستەكانەوە، بەرابەر وانەكانی هیچ پارەیەكی وەرنەدەگرت. نەخێر، سوكرات بە خۆی دەگوت «فەیلەسوف»، بە هەموو مانایەكی ڕاستی ئەم وشەیە. لە ڕاستیدا «فیلۆ ـ سۆف» واتە «كەسێك كە هەوڵ دەدات بگات بە حیكمەت.»

ئاگاداریت سۆفیا؟ زۆر گرنگە بۆ بەشەکانی دواتری ئەم کۆرسە، جیاوازی نێوان «سۆفیست» و «فەیلەسوف» تێبگەیت. سۆفیستەکان بەرامبەر فێرکردنە کەم تا زۆر وردەکانیان پارەیان وەردەگرت، ئەم جۆرە سۆفیستانەش بە درێژایی مێژوو هاتوون و ڕۆیشتوون. مەبەستم لە هەموو ئەو مامۆستای قوتابخانە و ڕۆشنبیرانەیە کە یان بەو ئاستە کەمەی دەیزانن دڵخۆشن، یاخود شانازای بەوە دەکەن کە لە چەندەها بابەتدا شارەزان و لە ڕاستیشدا هیچی لێنازانن. بێگومان لەو چەند ساڵەی ژیانتا نمونەی ئەو کەسانەت بینیوە... بەڵام فەیلەسوفی ڕاستەقینە شتێکی تەواو جیاوازە، سۆفیا. بەڵێ، تا ڕادەیەکی زۆر پێچەوانەی ئەو کەسانەیە. فەیلەسوف، لە بنچینەدا بەئاگایە لەوەی کە کەم دەزانێت، هەر ڕێک لەبەر ئەم هۆیەش هەمیشە هەوڵدەدات بگاتە مەعریفەی ڕاستەقینە. سوکراتیش یەکێک بوو لەو کەسە بەدەگمەنانە. ئەو بەئاگابوو لەوەی کە هیچ دەربارەی ژیان و جیهان نازانێت، هەموو جەوهەری خاڵەکەش لێرەدا کۆدەبێتەوە؛ ئەو کتومت بەدەست کەم زانینیەوە ئازاری دەچەشت.

کەواتە فەیلەسوف کەسێکە کە دان بە نەزانینەکەیدا دەنێت و بە دەستیشیەوە دەناڵێنێت. لەم ڕوانگەیەشەوە زیرەکترە لەو کەسەی شانازی بە زانینی شتێکەوە دەکات و لە هەمان کاتیشدا هیچی وای لێ نازانێت. من گوتم؛ «زیرەکترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە دەزانێت کە نازانێت». سوکرات خۆشی دەیگوت من تەنها یەک شت دەزانم؛ ئەویش ئەوەیە کە هیچ نازانم. ئەم وتەیەی وەک تێبینیەک لای خۆت بهێڵەرەوە، چونکە تەنانەت لەناو فەیلەسوفەکانیشدا ئەم جۆرە دان پیانانە زۆر دەگمەنە. گەر بە ئاشکرا ئەم بانگەوازە بکرێت، هێندە پڕ مەترسیە کە لەوانەیە کەسەکە ژیانی لەسەر دابنێت. هەمیشە پڕ

مەترسیترین کەس ئەوانەن کە دەپرسن. وەڵامدانەوە هیچ مەترسیەکی تێدا نیە، چونکە پێدەچێت پرسیارێک هێندەی هەزارەها وەڵام تەقینەوە دروستبکات.
بەرگە نوێکەی پاشات بیستووە؟ لە ڕاستیدا پاشا وەک کرم ڕووت بوو، بەڵام هیچ کەسێکی دەستە و دایەرەکەی نەیان دەوێرا بڵێن پاشا ڕووتە. پاشان لە پڕێکدا منداڵێک هاواری لێبەرز بووەوە؛ «پاشا هیچی لەبەردا نیە». منداڵێکی ئازا و چاو نەترسبوو، سۆفیا. بەهەمان شێوەش سوکرات بێترس وێرای هاواربکات و بڵێت ئێمەی مرۆڤ کەم دەزانین.
بەکورتی دەڵێم؛ ئێمەی مرۆڤ ڕووبەڕووی هەندێ پرسیاری سەخت بووینەتەوە، کە ناتوانین بەشێوەیەکی بنەڕەتی وەڵامێکی ڕاست و دروست و پڕاوپڕیان بدەینەوە. لێرەشدا دەگەینە بەر دووڕیانێک؛ یان خۆمان و هەموو دونیا هەڵدەخڵەتێنین و وای نیشان دەدەین هەموو شتێ دەزانین کە شایانی زانین بێت، یاخود چاومان لەو پرسیارە گەورانە دەنوقێنین و بۆ هەتاهەتایە دەست لە هیوای پێشکەوتنمان هەڵدەگرین. بەم شێوەیەش مرۆڤایەتی خۆی دەکات بە دوو بەشەوە؛ زۆربەی زۆریان یان تەواو دڵنیان یان بێباکن (هەردوو بەشەکە لە ژێری ژێرەوەی فەرووی کەروێشکەکەدا گاگۆڵکێ دەکەن و دەخولێنەوە!). سۆفیای ئازیز، ئەم بابەتە وەک یاریەکی وەرەقە وایە کە بەسەر دوو بەشدا دابەشی بکەیت؛ ڕەشەکان لە لایەک و سوورەکانیش لەلایەکی تر. بەڵام جارجارێکیش جۆکەرێک دێت، کە نەقەرە و نە دینار و نە سینەک و نە کوپیشە. سوکرات لە ئەسینادا وەک ئەو جۆکەرە وابوو. ئەو نە تەواو دڵنیابوو، نە کەسێکی بێباکیش بوو، بەڵکو تەنها ئەوەندەی دەزانی کە نازانێت، ئەمەش ئازاری دەدا.

واتە بوو بە فەیلەسوفێک، کەسێک کە نەک هەر هەرگیز دەست هەڵناگرێت، بەڵکو هەمیشە هەوڵی گەیشتن بە هەقیقەت دەدات.
دەگێڕنەوە دەڵێن کەرەتێکیان پیاوێکی خەڵکی ئەسینا لە فاڵگرەوەکەی دێلفی دەپرسێ کێ زیرەکترین کەسی ئەسینایە. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت سوکرات زیرەکترین کەسە. سوکراتیش کاتێک ئەو وەڵامە دەبیستێتەوە، سەری دەسوڕمێ (لەوەشە پێی پێکەنیبێت، سۆفیا!). پاشان پیاوەکە یەکسەر دەچێتە ناو شار و بەدوای کەسێکدا دەگەڕێت کە چ لە دیدەی خۆی و چ لە دیدەی خەڵکانی ترەوە زۆر زانا بێت. بەڵام کاتێک کە بۆی دەردەکەوێت تەنانەت ئەو کەسەش ناتوانێت وەڵامی پڕاوپڕی پرسیارەکانی سوکرات بداتەوە، ئەوجا بە تەواوەتی تێدەگات کە فاڵگرەوەکە بە هەڵەدا نەچووە.
بەلای سوکراتەوە گرنگ بوو بنچبنەیەکی پتەوی مەعریفە بدۆزێتەوە. بەڕای ئەو ئەم بنچینەیەش لە ئەقڵی مرۆڤدا بوونی هەیە. بەم جۆرە بڕوا بەهێزەشەوە بە ئەقڵی مرۆڤ، ئاشکرا دەریدەخات کە فەیلەسوفێکی «ڕاشیۆنالیست»ە .

## ***زانیاری ڕاستی، دەمانگەیێنێتە هەڵسوکەوتی ڕاستی***

لەوەو پێش گوتم سوکرات لەو بڕوایەدابوو دەنگێکی خوایانە لە ناوەوەیدا بوونی هەبێت و پێی وابوو ئەم «ویژدانەش» شتە ڕاستەکانی بۆ ئاشکرا بکات. ئەو دەیگوت؛ «ئەو کەسەی کە دەزانێت باشە چیە، شتی باش دەکات». مەبەستی ئەوە بوو کە زانیاری ڕاستی بەرەو هەڵسوکەوتی ڕاستیمان دەبات، وە تەنها ئەو کەسەی کە باشە دەکات، دەبێتە «مرۆڤێکی باش». کاتێک کە هەڵسوکەوتێکی هەڵە دەکەین، لەبەر ئەوەیە کە باشتر نازانین. لەبەرئەوە زۆر گرنگە

مەعریفەمان زیاد کەین. سوکرات کتومت سەرقاڵی دۆزینەوەی پێناسەیەکی ڕوون و گشتی ڕاست و هەڵە بوو. بە پێچەوانەی سۆفیستەکانیشەوە، لەو بڕوایەدا بوو توانای جیاکردنەوەی ڕاست و هەڵە، سەرچاوەی لە ئەقڵەوە هەڵبقوڵێت نەک لە کۆمەڵگاوە.
لەوانەیە سەخت بێت لەمە تێبگەیت، سۆفیا! لەبەر ئەوە هەوڵدەدەم بە جۆرێکی تر ڕوونی بکەمەوە؛ بە پێی بڕوای سوکرات ئەگەر دژ بە قەناعەتمان هەڵسوکەوت بکەین، ئەوا هەرگیز بەختەوەر نابین، واتە ئەو کەسەی کە دەزانێت مرۆڤ چۆن بەختەوەر دەبێت، هەوڵی ئەوەش دەدات کە بەختەوەر بێت. چونکە ئەو کەسەی بزانێت ڕاستی چییە، کاری ڕاستیش دەکات، لەبەرئەوەی هیچ کەسێک ناخوازێت کە بێ بەخت بێت، وا نییە؟
ئەی تۆ سۆفیا، تۆ چۆن بیردەکەیتەوە؟ ئەگەر هەمیشە ئەو شتانە بکەیت کە لە ناوەوەتدا بزانیت هەڵەیت، ئایا ئەوسا دەتوانیت بەختەوەرانە بژیت؟ زۆر کەس هەن درۆ دەکەن، دزی دەکەن، لە پاشەملە قسە و قسەڵۆک هەڵدەبەستن، هاوکات بەئاگاشن لەوەی کە ئەوان ڕاست نین، ئایا لەو بڕوایەدایت ئەمە بەختەوەریان بکات؟
سوکرات لەو بڕوایەدا نەبوو.

سۆفیا هەر کە باسەکەی سوکراتی خوێندەوە، نامەکەی خستە ناو قتووەکەوە و بە سکە خشێ لە کوخەکەیدا هاتە دەرەوە. دەیوست پێش ئەوەی دایکی لە بازاڕ بگەڕێتەوە، بگاتەوە ماڵەوە. نەیدەخواست بوارێک بۆ دایکی بڕەخسێنێت کە لێی بپرسێت لە کوێ بووە. جگە لەوەش پەیمانی دابوو قاپەکان بشوات.

هەر کە ئاوەکەی کردەوە، دایکی بەخۆی و دوو کیسەی گەورەی پڕ لە شتەوە خۆی کرد بە ژووردا. لەبەر ماندووبونی خۆی گوتی؛
ـ سۆفیا، ماوەیەکە کەمێک لەسەر خۆت نیت.
سۆفیا تێنەگەشت بۆچی دایکی وا دەڵێت؛ وشەکان تا ڕادەیەک خۆیان بۆ خۆیان لە دەمیەوە هاتنە دەرەوە.
ـ سوکراتیش هەر وابوو!
ـ سوکرات؟
دایکی چاوی چووە پشتی سەری.
سۆفیاش زیرەکانە بەردەوامی بە قسەکانیدا؛
ـ بەڕاستی جێگەی داخە کە لەسەر ئەوە ژیانی دانا.
ـ سۆفیا! بەڕاستی خەریکە وام لێدێت کە چیتر نەزانم بە چ شێوەیەک قسەت لەگەڵدا بکەم.
ـ سوکراتیش نەیدەزانی، تەنها شتێک کە دەیزانی ئەوە بوو کە هیچی نەدەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا زاناترین کەسی ئەسینا بوو.
دایکی تەواو مات بوو، بەڵام پاش کەمێک گوتی؛
ـ ئەمە لە قوتابخانەوە فێربوویت؟
سۆفیا بە توندی سەری ڕاوەشاند.
ـ هیچ شتێک لە فوتابخانەوە فێر نابین... گەورەترین جیاوازی نێوان مامۆستای قوتابخانە و فەیلەسوفی ڕاستەقینە ئەوەیە کە مامۆستا وا دەزانێ شتی زۆر دەزانێت و هەمیشە دەیەوێت بەزۆر شت بئاخنێتە مێشکی قوتابیەکانیەوە، بەڵام فەیلەسوف هەوڵ دەدات لەگەڵ قوتابیەکانیدا شتەکانی بۆ ڕوون بێتەوە.

ـ کەواتە سەر لەنوێ هاتینەوە سەر باسی کەروێشکە سپیەکە! دەزانی چی... دەمەوێت بە زووترین کات بزانم ئەو برادەرەی تۆ کێیە، چونکە بەرە بەرە هەستدەکەم خەریکە هەراسانمان دەکات.
سۆفیا بۆ ماوەیەک دەستی لە قاپ شۆرینەکەی هەڵگرت و بە فلچەی قاپ شۆرینەکەی دەستیەوە ئاماژەی بۆ دایکی کرد؛
ـ ئەو کەس هەراسان ناکات. بەڵام پێی خۆشە خەڵکی بووروژێنێت، تەنها بۆ ئەوەی لە تەرزی ڕۆتینی بیرکردنەوە کۆنەکانیان دەریان بهێنێت.
ـ بەسە ئیتر، خەریکە تەواو ناخۆشی ئەکەیت. پێم وابێت برادەرەکەت کەسێکی بێ شەرمە.
سۆفیا دیسانەوە دەستی کردەوە بە قاپ شۆرینەکەی.
ـ ئەو نە زانایە و نە بێ شەرمیشە. بەڵام تەنها ئەوەندەیە کە دەیەوێت بگاتە هەقیقەتی تەواوەتی. لە یاری وەرەقەدا، جیاوازیەکی گەورە لە نێوان جۆکەری ڕاستەقینە و هەموو کارتەکانی تردا هەیە.
ـ گوتت جۆکەر؟
سۆفیا سەرێکی لەقاند و بەردەوام بوو؛
ـ هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە بۆچی چەندەها کوپ و قەرە و سینەک و دینار لە یاری وەرەقەدا هەیە، بەڵام تەنها یەک جۆکەری تێدایە؟
ـ مەگەر تۆ بزانیت بۆ، سۆفیا!
ـ مەگەر تۆش پرسیار بکەیت!
دایکی هەموو ئەو شتانەی کڕیبوونی لە شوێنی خۆیاندا داینان، ڕۆژنامەکەی هەڵگرت و خۆی گەیاندە ژووری دانیشتن. سۆفیا هەستی کرد دایکی دەرگاکەی کەمێک بە توندی بە دوای خۆیدا داخست.

کاتێکیش لە شۆردنی قاپەکان بووەوە، بەرەو ژوورەکەی خۆی ڕۆیشت. دەسرە ئاوریشمیە سوورەکەی، کە لەگەڵ لیگۆکاندا لەسەری سەرەوەی دۆڵابەکەدا دایڕنابوو، داگرت و بەوردی تەماشای کرد.
هیلدە...

## ئەسینا

## ... لە نێو پاشماوەکانەوە چەندەها بینای بەرز دەرکەوتن ...

سەر لە ئێوارە دایکی سۆفیا چووە سەردانی برادەرێکی. کەمێک پاش دایکی، سۆفیا خێرا بەرەو باخچەکە ڕۆیشت و خۆی گەیاندە کوخەکەی ناو پەرژینە کۆنەکە. لەوێدا لە تەنیشت قتووی کێکەکەوە، پاکەتێکی پێچراوەی ئەستوری بۆ دانرابوو. سۆفیا بەپەلە کاغەزی پاکەتەکەی لێکردەوە و کاسێتێکی ڤیدیۆی بەدیکرد.
کاسێتێکی ڤیدیۆ! ئەمەیان شتێکی نوێیە. بەڵام فەیلەسوفەکە چۆن دەیزانی ئەوان ڤیدیۆیان هەیە؟ ئاخۆ کاسێتەکە چی لەسەربێت؟
سۆفیا بەپەلە گەڕایەوە ماڵەوە.
کاسێتەکەی خستە ناو ڤیدیۆکەوە. دوای کەمێک وێنەی شارێکی گەورە لەسەر شاشەی تەلەفیزۆنەکە دەرکەوت. سۆفیا یەکسەر زانی شارەکە ئەسینایە، چونکە زۆمی وێنەکە لەسەر «ئەکرۆپۆلیس» بوو. سۆفیاش چەندین جار لەوەوپێش ئەو پاشماوە کۆنانەی لە تەلەفیزۆندا بینیبوو.
وێنەکان ڕاستەوخۆ نیشاندەدران. گەشتیارانێکی زۆر لە نێو پاشماوەی پەرستگاکەدا بە جلوبەرگە هاوینەکانی بەریان و کامێراکانی ملیانەوە، جمەیان دەهات. بەڵام لەوە دەچێت یەکێک لە نێوانیاندا بەیاخێکی بەرزکردبێتەوە... وا دیسانەوە دەرکەوتەوە! ... لەسەر بەیاخەکەی نووسراوە هیلدە یان چی؟
کەمێک پاش ئەوە کامێراکە چووە سەر پیاوێکی تەمەن مام ناوەندی کورتە بنە. ڕیشێکی ڕێککراوی دانابوو و کڵاوێکی شینی لەسەردابوو. ڕێک تەماشای کامیرەکەی کرد و گوتی؛

- بەخێر بێیت بۆ ئەسینا سۆفیا. بێگومان ئێستا دەزانیت کە من ئەلبێرتۆ کنۆکسم. ئەگەر هێشتام دڵنیانیت، ئەوا دووبارە دەڵێم کەروێشکە سپییە گەورەکە بەردەوام لە کڵاوە ڕەشە درێژەکەی گەردوونەوە دەردەهێنرێت.
ئێستاکە لەلای ئەکرۆپۆلیسەوە وەستاوین. وشەکە مانای «قەڵای شار» یان «شاری سەر بەرزایی»ەکە دەبەخشێت. هەر لە سەردەمی خاچە بەردینەکانەوە، مرۆڤ لێرەدا ژیاون. بێگومان هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ جێگا نایابەکەی. لەم ئاستە بەرزەدا، بەرەنگاریکردنی قەڵاکە ئاسانە. جگە لەمەش بەسەر یەکێک لە جوانترین بەندەری سەر دەریای ناوەڕاستدا دەڕوانێت... بەرە بەرەش کاتێک ئەسینا لەلاپاڵی خوارەوەی دەشتەکەدا گەشەی دەکرد، ئەکرۆپۆلیسیان وەک قەڵایەک و پەرستگایەک بەکار دەهێنا. لێرەدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجی پێش مەسیحدا، شەڕێکی تووند و تیژ لەگەڵ فارسەکاندا ڕوویدا. لە ساڵی 480ی پێش مەسیحدا، زێرکسیز«Xerxes» ی پاشای فارس هاتە ناو شاری ئەسینا و هەموو بینا دارینە کۆنەکانی ئەکرۆپۆلیسی سوتاند. بەڵام ساڵێک پاش ئەوە فارسەکانیان بەزاند. لەو کاتەشەوە سۆفیا، سەردەمی ئاڵتونی ئەسینا دەستی پێکرد. ئەکرۆپۆلیسیان زۆر جوانتر و قەشەنگتر ئاوەدانکردەوە، ئەگەرچی لەوەودوا تەنها وەک پەرستگایەک بەکاریان دەهێنا. لەم کاتەدا بوو کە سوکرات بە شەقام و گۆڕەپانەکاندا دەسوڕایەوە و لەگەڵ ئەسینایییەکاندا گفتوگۆی دەکرد. لە هەمان کاتیشدا ئاگای لە ئاوەدانکردنەوەی ئەکرۆپۆلیس و دروستکردنەوەی هەموو ئەو بینایانەبوو کە لە چواردەورماندا دەیانبینین. ئێرە چ جۆرە شوێنێک بووە! لە پشتمەوە گەورەترین پەرستگا دەبینیت، ناوی «پارسینۆن»ە، واتە «ماڵی کچ». (لەبەر

ڕێزلێنانی «ئەسینە»ی خواژن دروستکراوە، کە خواژنی پارێزەری ئەسینایییەکان بوو). ئەو بینا مەڕمەڕە گەورەیە بە هیچ شێوەیەک قەراغی ڕێکی تێدا نیە؛ لە هەر چوار لاوە کەمێک خڕ دروستکراوە. ئەمەش لەلایەکەوە لەبەر جوانی و لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی زیاتر ژیان بە هەندەسەی بیناکە ببەخشێت. هەرچەندە بیناکە تەوەرەی یەکجار گەورەی تێدایە، بەڵام لەبەر هەمان هۆ (خڕی قەراغەکانی) هێندە قەبە نایەتە پێش چاو. بە جۆرێکی تر بیڵێین، جۆرە فێڵێکی بیناسازی تێدا بەکار هاتووە. تەنانەت پایەکانیش کەمێک بەرەو دیوی ناوەوە لارن، وە ئەگەر هەموویان بخەیتە سەر یەک و لە خاڵێکدا لەسەر پەرستگاکە بەرزکرێنەوە، ئەوا هەرەمێکی بەرزی 1500مەتری لێدەردەچێت. تەنها شتیش کە لەم بینا گەورەیەدا دانرابوو، پەیکەرێکی دوانزە مەتری «ئەسینە»ی خواژن بووە. ئەو مەڕمەڕە سپییە، ڕۆژێک لە ڕۆژان بە ڕەنگی پڕ لە ژیان ڕازێنرابووەوە، لە شاخێکەوە هێنابوویان کە شانزە کیلۆمەتر لێرەوە دورە...

سۆفیا تەواو وشک بووبوو. بڵێیت ئەو کەسەی دەیدواند بەڕاستی مامۆستای فەلسەفەکەی بێت؟ لەوەوپێش تەنها یەکجار لە تاریکیدا تارماییەکەی بینیبوو... بەڵام پێدەچێت هەر هەمان پیاوبێت کە ئێستاکە لە ئەکرۆپۆلیسی ناو ئەسیناوە قسەی بۆ دەکات.
پاش ماوەیەک پیاوەکە بە درێژایی لاکانی پەرستگاکە دەڕۆشت و کامێراکەش دوای کەوتبوو. لەدواجاردا بەرەو قەراغی تاشە بەردێک ڕۆشت و پەنجەی بۆ دیمەنێکی ئەولاترەوە ڕاکێشا. زۆمی کامێراکە

چووه سەر شانۆیەکی کۆن، هەر ڕێک کەوتبووە خواروی قەڵای ئەکرۆپۆلیسەوە.

پیاوە کڵاو بەسەرەکە لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛

ـ ئەو شانۆ کۆنەی کە دەیبینیت، پێی دەڵێن دیۆنیسۆس .«Dionysos» زۆر ڕێی تێدەچێت کە کۆنترین شانۆی ئەوروپا بووبێت. هاوتا لەگەڵ سەردەمی سوکراتدا، کارەکانی نووسەرە تراجیدیە گەورەکانی وەک ئایسخیلۆس «Aischylos» و ئۆریپیدێس «Euripides» و سۆفۆکلیس «Sofocles»لێرەدا نمایش دەکران. لەوەوپێش ناوی تراجیدیای ئۆدیبی بەدبەختی پاشام برد. ئەو تراجیدیە بۆ یەکەمین جار ڕێک لەسەر ئەم شانۆیە پێشکەشکرا. شان بە شانی تراجیدیا، کۆمیدیاشان پێشکەش دەکرد. بەناوبانگترین نووسەری کۆمیدی "ئەریستۆفانیس " «Aristophanes»بوو. ئەم جگە لە کارەکانی تری، کۆمیدیایەکی دڵڕەقانەی دەربارەی سوکراتی خەڵکی ڕەسەنی ئەسینا نووسی. لە پشتی پشتەوە ئەو دیوارە بەردینیە بەدی دەکەین کە ئەکتەرەکان لە کاتی ڕۆڵ بینینیاندا وەک پشتی شانۆکە بەکاریان دەهێنا. ئەوان بەم دیوارە بەردینییەیان دەگوت «سکینە «Skene کە پاشان وشەی «سیین Scene ـ دیمەن»ی لێوە دروستبوو. بەڕاست وشەی «تیاتەر» لە وشەیەکی یۆنانیەوە هاتووە کە مانای «بینین» دەبەخشێت، بەهەرحاڵ با بگەڕێینەوە سەر فەلسەفەکەمان، سۆفیا. بە چواردەوری پارسینۆندا دەڕۆین و بەرەو شوێنی چوونە ژوورەوەکەی دەکەوینە ڕێ...

ئەوجا پیاوەکە بەناو پەرستگاکەدا خولایەوە و بە دەستی ڕاستیدا چەند پەرستگایەکی بچکۆلەی نیشاندا. پاشان بە پێپلیکانەکاندا چووە خوارەوە و بە نێو چەندین پایەی بەرزدا ڕۆشت. کاتێکیش

گەیشتە خواری خوارەوەی قەڵای ئەکرۆپۆلیس، لەسەر تەپۆڵکەیەکی بچکۆلە دانیشت و دەستی بۆ ئەسینا ڕاکێشا، ئەوجا گوتی؛
- ئەم تەپۆڵکەیەی لەسەری وەستاوین، پێی دەڵێن «ئاریۆپاگۆس Areopagos». لێرەدابوو کە دادگای باڵای ئەسینی، حوکمیان دەربارەی قەزیەی پیاو کوشتن دەردەکرد. پاش چەند سەدەیەک پاولۆس«Paulus» ی شاگردەکەی مەسیح، لێرەدا وەستا و باسی مەسیح و ئاینی مەسیحی بۆ ئەسینایییەکان دەکرد (پاشان لە دەرفەتێکی تردا دێینەوە سەر ئەو باسە). لە خواروی لای چەپەوە، پاشماوەی گۆڕەپانە کۆنەکەی ئەسینا دەبینرێت، جگە لە پەرستگا گەورەکەی «هێڤیاستۆس«Hefaistos ی خوای کانزا و چەند پارچە مەڕمەڕێک زیاتر هیچ شتێکی تری لێ نەماوەتەوە، با بڕۆینە خوارەوە...
پاش کەمێک پیاوەکە لە نێوان پاشماوە کۆنەکانەوە دەرکەوتەوە. پەرستگا گەورەکەی ئەسینا، لە سەری سەرەوەی ئاسمان و لە خواری خوارەوەی شاشەی تەلەفیزۆنەکەی سۆفیادا، لەسەر ئەکرۆپۆلیسەوە سەری بەرزکردەوە. مامۆستای فەلسەفەکەش لەسەر پارچە مەڕمەڕێک دانیشتبوو. تەماشایەکی کامێراکەی کرد و گوتی؛
- ئێستا لەسەر قەراغی گۆڕەپانە کۆنەکەی ئەسینادا دانیشتووین. دیمەنێکی غەمگینە، وا نیە؟ مەبەستم لە کاتی ئێستادایە سۆفیا. بەڵام سەردەمێک بوو ئەم چواردەورە پڕبوو لە پەرستگای گەورە و خانەی دادگا و چەندەها شوێنی گشتی تر. جگە لەمانەش چەندەها هۆڵی کارکردن و هۆڵێکی مۆسیقا و بینایەکی جومناستیکی لێبووە. هەموو ئەمانەش بە دەوروبەری ئەو گۆڕەپانەدا دروستدرابوون، کە شوێنێکی چوارگۆشە بوو... لەم شوێنە چکۆلەیەدا، بنچینەی هەموو

شارستانی ئەوروپا دامەزرێنرا. وشەی وەک «ڕامیاری» و «دیموکراتی» و «ئیکۆنۆمی» و «مێژوو» و «بایۆلۆجی» و «فیزیا» و «ماتماتیک» و «لۆژیک» و «تیۆلۆژی» و «فەلسەفە» و «ئیتیک» و «تیۆری» و «میتۆد» و «دەروون ناسی» و «ئیدیە» و «ڕژێم»، هەموو ئەم وشانە و چەندەها و چەندەهای تریش لە خەڵکانێکی کەمەوە هاتوون کە ژیانی ڕۆژانەیان لە چواردەوری ئەم گۆڕەپانەدا بەسەربردووە. سوکرات بێرەدا تێدەپەڕی و لەگەڵ خەڵکانی سەر ئەم شەقام و گۆڕەپانەدا گفتوگۆی دەکرد. لەوانەیە کۆیلەیەکی دیبێت، کە گۆزەیەک ڕۆنی زەیتونی بەسەر شانەوە بووبێت و پرسیاری فەلسەفی لێکردبێت. چونکە سوکرات دەیگوت کۆیلەکانیش هەمان ئەقڵی مرۆڤە ئازادەکانیان هەیە. پێدەچێت لێرەدا وەستابێت و گفتوگۆیەکی تووند و تیژی لەگەڵ کەسێکی خەڵکی شارەکەدا سازدابێت، یان لەوانەیە بە نەرمی لەگەڵ پلاتۆنی قوتابیە گەنجەکەیدا دوابێت. سەیرە کاتێک بیر لەم شتانە دەکەینەوە، ئێمە بەردەوام دەربارەی فەلسەفەی «سوکراتی» یان «پلاتۆنی» دەدوێین، بەڵام تەواو شتێکی ترە گەر خۆمان ببینە «سوکرات» یان «پلاتۆن.«
بێگومان سۆفیاش پێی وابوو ئەوە حاڵەتێکی سەیرە، بەڵام بە هەمان شێوەش سەیرە کە فەیلەسوفێک لەڕێگەی کاسێتێکی ڤیدیۆوە دەیدوێنێت .
پاشان فەیلەسوفەکە لەسەر پارچە مەڕمەڕەکە هەستا و بەدەنگێکی نزم گوتی؛
ـ سۆفیا، مەبەستەکە ئەوەبوو لێرەدا ئیتر بوەستین. من ویستم ئەکرۆپۆلیس و گۆڕەپانە کۆنەکەی ئەسینات پیشان بدەم. بەڵام دڵنیانیم تەواو تێگەیشتبیت کە ئەو شوێنانە کاتی خۆی چەندە مەزن

بوون... لەبەرئەوە سەرنجت ڕادەکێشمە سەر... با کەمێکی تریش بڕۆین. بێگومان ئەمە شتێکی ڕەسمی نیە... بەڵام من تەواو متمانەت پێدەکەم کە لە بەینی خۆماندا دەمێنێتەوە... دەی، بەهەرحاڵ لەوانەیە دیمەنێکی کەممان بەس بێت...

لەوە زیاتری نەگوت، بە پێوە وەستابوو و بۆ ماوەیەکی دور و درێژ تەماشای کامێراکەی دەکرد. پاش کەمێک وێنەیەکی تەواو جیاواز هاتە سەر شاشەکە؛ لە نێو پاشماوەکانەوە چەندەها بینای بەرز دەرکەوتن. لەوەدەچوو بە جادوویەک هەموو بینا کۆنەکان دروست ببنەوە. هێشتام لە ئاسۆدا ئەکرۆپۆلیسی دەبینی، بەڵام ئەویش و هەموو بیناکانی تری خوارەوەی گۆڕەپانەکەش، وەک نوێ دەردەکەوتن. بە ئاڵتون داپۆشرابوون و ڕەنگە تیژەکانیان بریقەی دەدایەوە. لە گۆڕەپانە چوارگۆشەکەدا خەڵکی بە جلی ڕەنگاوڕەنگەوە دەهاتن و دەچوون. هەندێکیان شمشێریان پێبوو، هەندێکی دی گۆزەیان بەسەر شانەوەبوو. بەڵام یەکێکیان چەترێکی لەبن باڵیدا دانابوو .

ئەوجا سۆفیا مامۆستای فەلسەفەکەی ناسیەوە. ئەو هێشتام کڵاوە شینەکەی هەر لەسەردا بوو، بەڵام ئەمیش وەک ئەوانی تری ناو وێنەکە جلوبەرگێکی زەردی پۆشیبوو. بەرەو ڕووی سۆفیا هاتە پێشەوە، تەماشای ناو کامێراکەی کرد و گوتی؛

ـ ئاوها دەبێت، سۆفیا! ئێستاکە لە ئەسینای کاتی کۆنداین. خۆشتردەبوو گەر خۆشت لێرە بوویتایە. ساڵ، ساڵی 402ی پێش مەسیحە، تەنها سێ ساڵ پێش ئەوەی سوکرات بمرێت. هیوادارم چێژ لەم میوانداریە تایبەتیە ببینیت، بەڕاستی سانا نەبوو لەم کاتەدا کامێرایەکی ڤیدیۆ بەکرێ بگرم...

سۆفیا سەری گێژی دەخوارد، چۆنە ئەو پیاوە پڕ نهێنیە لە پڕێکدا دەتوانێت لە 2400 ساڵ لەمەوبەری ئەسینادا بێت؟ چۆن سۆفیا دەیتوانی وێنەی بە ڤیدیۆ گیراوی ئەو سەردەمە ببینێت؟ بێگومان دەیزانی کاتی کۆن ڤیدیۆ نەبووە. بڵێیت هەر هەمووی فلیمێک نەبووبێت و هیچی تر؟ بەڵام بینا مەڕمەڕیەکان تەواو وەک ڕاستی وابوون. ئەگەر هەموو گۆڕەپانە کۆنەکەی ئەسینا و هەموو ئەکرۆپۆلیسیان تەنها لەبەر فلیمێک دروستکردبێتەوە... بەڵێ، ئەوسا دەبێت پارەیەکی یەکجار زۆریان لە دیکۆرکردندا بەکارهێنابێت. بەهەرحاڵ تەنها بۆ ئەوەی سۆفیا شتێک دەربارەی ئەسینا فێربێت، دەبێت پارەیەکی زۆریان سەرف کردبێت.

پیاوە کڵاو بەسەرەکە سەرلەنوێ تەماشای کامێراکەی کردەوە؛
ـ ئەو دوو پیاوەی ژێر پایەکانی ئەو سەرەوە دەبینیت؟
سۆفیا پیاوێکی پیری بینی کە جلوبەرگێکی کەمێک شڕی لەبەردابوو، ڕیشێکی درێژ و ئاڵۆزکاوی دانابوو. لوتێکی پان، دوو چاوی شینی بریقەدار و چەناگەیەکی قوپاو، سیمای دەموچاویان دیاریکردبوو. لە تەنیشتیشیەوە پیاوێکی گەنجی قۆز وەستابوو.
ـ ئەوە سوکرات و پلاتۆنی قوتابیەتی. دەتوانیت ڕاستەوخۆ پێیان ئاشنابیت.
پاشان مامۆستای فەلسەفەکە بەرەولای دوو پیاوەکە ڕۆشت، کاتێکیش تەواو لێیان نزیکبووەوە، کڵاوەکەی داکەند و چەند وشەیەکی بەزمانێک گوت کە سۆفیا تێی نەدەگەیشت. بێگومان زمانی یۆنانی بوو. دواتر تەماشای کامێراکەی کرد و گوتی؛

ـ پێم گوتن کە تۆ کچێکی نەرویجیت و دەتەوێت پێیان ئاشنابیت. پلاتۆنیش چەند پرسیارێکت ئاراستە دەکات و دەیەوێت بیریان لێبکەیتەوە. بەڵام پێش ئەوەی پاسەوانەکان بمانگرن، دەشێ زوو کارەکەمان ئەنجام بدەین.

لەوێدا سۆفیا موچوڕکەیەکی پێداهات، چونکە پیاوەکە چەند هەنگاوێک هاتە پێشەوە، ڕێک ڕوانیە کامێراکە و گوتی؛

ـ بەخێربێیت بۆ ئەسینا سۆفیا .

پیاوەکە زۆر تێکەڵ و پێکەڵ قسەی دەکرد.

ـ من ناوم پلاتۆنە و دەخوازم چەند ڕاهێنانێکت بدەمێ؛ لەپێش هەموو شتێکدا بزانم دەزانیت چۆن چۆنی وەستای شیرینیەک دەتوانێت پەنجا کێکی وەک یەک دروست بکات؟ پاشان لە خۆت بپرسە بۆچی هەموو ئەسپەکان وەک یەک وان. ئەوجا بە بڕوای تۆ ئایا ڕۆحی مرۆڤ نەمرە؟ دواجاریش، پێت وایە ئافرەت و پیاو وەک یەک ژیر بن؟ جارێ کاتێکی خۆش!

پاش کەمێک وێنەی سەر شاشەکە دیارنەما. سۆفیا کاسێتەکەی بۆ پێشەوە برد و بۆ دواوەشی گەڕاندەوە، بەڵام جگە لەو شتانەی بینیبووی، هیچ شتێکی تری لەسەر تۆمار نەکرابوو.

سۆفیا دەیویست بیرکردنەوەکانی کۆبکاتەوە. بەڵام پێش ئەوەی بیرکردنەوەی لەسەر شتێک بوەستێت، خێرا خەیاڵی دەچووە سەر شتێکی تر.

دەمێک بوو دەیزانی مامۆستای فەلسەفەکەی کەسێکی ڕەسەن و تایبەتە، بەڵام کاتێک بگاتە ئەوەی جۆرە شێوازێکی فێرکردنی وەها

بەکاربهێنێت کە هەموو یاسا سروشتیکان بشکێنێت... بەڵێ، ئەوسا بەڕای سۆفیا تەواو لە سنوور لادەدات.
بەڕاست ئەوە سوکرات و پلاتۆن بوو کە لەسەر شاشەی تەلەفیزۆنەکەی بینی؟ بێگومان نا، بەهیچ جۆرێک ڕێی تێناچێت! بەڵام خۆ فیلیمی کارتۆنیش نەبوو. سۆفیا کاسێتی ڤیدیۆکەی دەرهێنا و لەگەڵ خۆیدا بردیە سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. لەوێدا لەگەڵ هەموو پارچە لیگۆکاندا، لەسەری سەرەوەی تاقەکەدا داینا.
پاشانیش هێندە هیلاک بوو، ڕێک لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت و یەک و دوو خەوی لێکەوت.
پاش چەند کاتژمێرێک دایکی هاتە ژوورەکەی، بە هێواشی ڕایوەشاند و گوتی؛
ـ چیتە سۆفیا؟
ـ ئممم...
ـ بەجلەکانی بەرتەوە خەوتوویت؟
سۆفیا بەئاستەم چاوی کردەوە و گوتی؛
ـ لە ئەسینا بووم...
لەوە زیاتر لەدەمی نەهاتە دەرەوە، ڕووی وەرچەرخاندەوە و دیسانەوە خەوتەوە.

# پلاتۆن «Platon»

## ...تاسەی گەڕانەوە بۆ ماڵی ڕاستەقینەی ڕۆح...

بۆ سبەی بەیانی لە پڕێکدا سۆفیا ڕاچڵەکی و خەبەری بووەوە. تەماشای کاتژمێرەکەی کرد، کەمێک لە پێنج لایدابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چیتر خەوی نەدەهات. پاش ساتێک لە جێگاکەیدا بەرزبووەوە.

بۆچی بەجلەکانیەوە خەوتبوو؟ ... پاشان هەموو شتێکی بیرکەوتەوە. چووە سەر کورسیەک و تەماشایەکی قاتی سەری سەرەوەی دۆلابەکەی کرد. کاسێتی ڤیدیۆکە هێشتام هەر لەوێدا بوو، کەواتە هەرچۆنێک بێت هەموو ئەو شتانەی بینیبووی خەون نەبوو.

بەڵام بەڕاست... ئەوە سوکرات و پلاتۆن بوو کە بینینی؟ هێی... بەڕاستی چیتر نەیدەتوانی بیربکاتەوە. لەوانەیە دایکی ناهەقی نەبێت کە پێی گوت ماوەیەکە لەسەر خۆت نیت.

هەرچۆنێک بێت تازە خەوی زڕابوو و چیتر نەیدەتوانی بخەوێتەوە. ئەی بۆ سەرێک لە کوخەکەی نەدات، بەشکم سەگەکە نامەی نوێی بۆ هێنابێت.

سۆفیا زۆر بە ئەسپایی بەسەر پلیکانەکاندا هاتە خوارەوە. پێڵاوەکانی لەپێکرد و چووە دەرەوە.

هەموو شتێک لە باخچەکەدا تەواو بێدەنگ و هێمن بوو، تەنها چۆلەکەکان نەبێت، توووند توووند دەیان جریواند و خەریکبوون سۆفیایان دەخستە پێکەنین. شەونمی سەر هەرێزەکەش وەک کریستاڵ دەدرەوشایەوە.

دیسانەوە سەیر و سەمەرەیی جیهان بە خەیاڵی سۆفیادا هاتەوە .

ناو کوخەکەی هێشتام کەمێک شێیاوی بوو. سۆفیا هیچ نامەیەکی نوێی بەدینەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەگێکی ئەستوری سڕی و لەسەری دانیشت.
پلاتۆنی ناو ڤیدیۆکە و ڕاهێنانەکانی بیرکەوتەوە؛ یەکەمیان، چۆن وەستای کێکێک دەتوانێت پەنجا کێکی وەک یەک دروست بکات؟
سۆفیا ناچاربوو زۆر بیری لێبکاتەوە. پاشان بۆی دەرکەوت وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە سەختتربوو لەوەی کە مەزەنەی دەکرد. جارناجارێک دایکی کێکی بچکۆلەی دروستدەکرد، بەڵام هیچ یەکێکیان لەوانی تری نەدەچوون. ڕاستە دایکی پیشەی شیرینی دروستکردن نەبوو، هەندێ جاریش هەموو شتەکانی چێشتخانەکەی پەرش و بڵاودەکردەوە، بەڵام... تەنانەت ئەو کێکانەی لە بازاڕیش دەیکڕین تەواو وەک یەک نەبوون، چونکە هەموو کێکێک یەکە یەکە بەدەستی وەستاکە دروستدەکران.
لە پڕێکدا بزەیەکی خۆشی هاتە سەر لێوەکانی سۆفیا. ئەو ڕۆژەی بیرکەوتەوە کە لەگەڵ باوکیدا چوونە دەرەوە و دایکیشی لە ماڵەوە خەریکی دروستکردنی کێکی جەژنی لە دایکبوونی مەسیح بوو. کاتێک کە گەڕانەوە ماڵەوە، دایکی چەند کێکێکی تایبەت بەو جەژنەی لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانابوو. بێگومان شێوەی هەموو کێکەکان دەقاودەق وەک یەک نەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەک لە شێوەکان لەیەک دەچوون. چۆن توانی هەموویان وەک یەک دروست بکات؟ بەڵێ، چونکە دایکی هەمان قاڵبی بۆ هەموو کێکەکان بەکار هێنابوو.
سۆفیا دڵی بە لێکدانەوەکەی خۆش بوو و هەستی دەکرد ڕاهێنانی یەکەمی تەواو کردووە. کاتێک وەستای شیرینیەک پەنجا کێکی تەواو

وەک یەک دروست دەکات، هۆکەی ئەوەیە کە هەمان قاڵب بەکاردەهێنێت و هیچی تر!
ئەوجا هاتە سەر پرسیاری دووهەم؛ بۆچی هەموو ئەسپەکان وەک یەکن؟ بەڵام کەی ئەمە ڕاستە! بە پێچەوانەوە، سۆفیا دەیگوت هیچ ئەسپێک وەک یەک نیە، هەروەک چۆن هیچ مرۆڤێک لەیەک ناچێت.
خەریک بوو دەست لە پرسیارەکە هەڵگرێت، بەڵام لەناکاودا ئەندێشەی چووەوە سەر چۆنیەتی لێکدانەوەی پرسیاری کێکەکان. هەرچەندە هیچ یەکێکیان لەسەدا سەد وەک ئەوانی تر نەبوون، لەبەرئەوەی هەندێکیان ئەستورتر و هەندێکی تریشیان ناتەواوبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاڕادەیەک هەموو کەسێک بە ئاسانی دەیبینی کە هەموویان «ڕێک وەک یەکن.»
لە ڕاستیدا لەوانەیە پلاتۆن ویستبێتی بڵێت بۆچی ئەسپ هەمیشە هەر ئەسپە و مەحاڵە بۆ نمونە ببێتە شتێک لە نێوان ئەسپ و بەرازدا؟ هەرچەندە هەندێ ئەسپ وەک ورچ قاوەیین و هەندێکیشیان وەک بەرخ سپین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەسپەکان شتێکی هاوبەشیان لە نێواندا هەیە. بۆ نمونە سۆفیا هەرگیز ئەسپێکی شەش قاچ یان هەشت قاچی نەدیبوو.
بەڵام ناشێت پلاتۆن مەبەستی ئەوە بێت کە بڵێت؛ ئەسپەکان بۆیە وەک یەکن، چونکە لە هەمان قاڵب دروست کراون؟
پاشان پلاتۆن پرسیارێکی لە ڕادەبەدەر سەخت و دژواری ورووژاند؛ ئایا ڕۆحی مرۆڤ نەمرە؟ سۆفیا هەستی دەکرد نەتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. ئەو تەنها ئەوەندەی دەزانی کە لاشەی مردویان یان دەسوتاند یان دەیانناشت. بەم جۆرەش لاشەکە بەلایەنی کەمەوە هیچ پاشەڕۆژێک چاوەڕوانی ناکات. ئەگەر مرۆڤ خاوەنی ڕۆحی نەمر بێت،

کەواتە دەبێت دان بەوەدا بنێت کە مرۆڤ لە دوو بەشی تەواو جیاواز پێک هاتووە؛ لەشێک کە پاش چەند ساڵێک تەمەنی تەواو دەبێت و دەسڕێتەوە، هەروەها ڕۆحێکیش کە کەم تا زۆر نەبەستراوەتەوە بە پێگەیشتن و فەوتاندنی لەشەوە. داپیرەی کەڕەتێکیان گوتی هەست دەکەم تەنها لەشم پیر دەبێت، بەڵام لە ناوەوەمدا هەمان کچە گەنجەکەی جارانم.
دوو وشەی «کچە گەنجەکە» سۆفیای بردە سەر دواهەمین پرسیار؛ ئایا ئافرەت و پیاو وەک یەک ژیرن؟ بەڕاستی دڵنیا نەبوو، وەڵامی ئەم پرسیارە کەوتۆتە سەر ئەوەی پلاتۆن مەبەستی لە «ژیرێتی» چیە؟
لەپڕێکدا باسەکەی سوکراتی بیرکەوتەوە کە ماوەیەک لەمەوبەر مامۆستای فەلسەفەکەی بۆی نووسیبوو. سوکرات دەیگوت هەر مرۆڤێک گەر ژیرێتی بەکاربهێنێت، ئەوا دەتوانێت بگاتە ڕاستیە فەلسەفیەکان. زیاتریش دەیگوت کۆیلەکانیش وەک ئازادەکان هەمان ژیرێتییان هەیە. سۆفیا لەو بڕوایەدابوو سوکرات بڵێت پیاو و ئافرەتیش یەک ئاستی ژیرێتیان هەیە.
لەو کاتەدا ئاوها دانیشتبوو و بەقوڵی بیریدەکردەوە، گوێی لە خشەخشێک بوو کە لەناو پەرژینەکەوە دەهات؛ هەناسەکانیشی وەک ئامێرێکی بوخاری دەهاتە بەر گوێ. پاش کەمێک سەگە زەردەکە خۆی کرد بەناو کوخەکەدا و نامەیەکی گەورەشی بە دەمەوە گرتبوو.
ـ هێرمس! سوپاس، سوپاس. سۆفیا گوتی.
سەگەکە نامەکەی فڕێدایە باوەشی سۆفیاوە و ئەویش دەستی بەسەردا هێنا و گوتی؛
ـ هێرمس، تۆ سەگێکی زیرەکیت.

بۆ ماوەیەک سەگەکە دانیشت و چێژی لەو ساتانە دەبینی کە سۆفیا دەستی بەسەریدا دەهێنا، بەڵام پاش ساتێک هەستا و بەرەو هەمان ئەو ڕێگایە ڕۆشتەوە کە لێوەی هاتبوو. سۆفیاش بە نامە زەردەکەی دەستیەوە دوایکەوت. بەسکەخشێ بەنێو پەرژینە چڕەکەدا ڕۆیشت و لە پڕێکدا خۆی لەو دیو باخچەکەوە بینییەوە...

هێرمس لەسەرخۆ بەرەو دارستانەکە ڕایدەکرد و سۆفیاش لە دوری چەند مەترێکەوە دوای کەوتبوو. یەک دوو جار سەگەکە هەڵگەڕایەوە و پێی وەڕی، بەڵام سۆفیا کۆڵی نەدا. ئەو دەیویست فەیلەسوفەکە بدۆزێتەوە، تەنانەت ئامادەبوو هەتا ئەسیناش بەدوایدا ڕاکات.

سەگەکە خێراتر ڕایکرد و خۆیکرد بە لاڕێیەکی ناو دارستانەکەدا. سۆفیاش خێراتر دوای کەوت، بەڵام پاش چەند خولەکێک هێرمس وەرچەرخایەوە و وەک سەگێکی پاسەوانی پێی وەڕی. سۆفیا هەر وازی نەهێنا و بەهەلی زانی لێی نزیک ببێتەوە.

ئەوجا هێرمس بە خێرایی بەلاڕێکەدا تێی تەقاند. لە دواجاردا سۆفیا لەتوانایدا نەما پێی بگاتەوە و بێچارە لە شوێنی خۆیدا چەقی. بۆ ماوەیەکی دورودرێژ وەستا و گوێی لێبوو سەگەکە هەتا دەهات دورتر و دورتر دەکەوتەوە... پاشان هەموو شتێک خامۆش بووەوە.

لە پانتاییەکی کەمی دارستانەکەدا، لەسەر ڕەگی دارێک دانیشت. نامە زەردەکەی کردەوە، چەند پەڕەیەکی چاپکراوی تری دەرهێنا و دەستیکرد بە خوێندنەوە؛

## ئەکادیمی پلاتۆن

پێم خۆشە دیسان بەیەک دەگەینەوە سۆفیا. جاری پێشوو، بێگومان مەبەستم لە ئەسینایە، توانیم خۆمت پێ بناسێنم. هەروەها چاوت بە

پلاتۆنیش کەوت، لەبەرئەوە بەبێ پێشەکی با ڕاستەوخۆ بچینە ناو بابەتەکەوە.
پلاتۆن «Platon» ( 427تا 347ی پێش زاین) تەمەنی 29 ساڵ بوو کاتێک سوکرات ژەهرەکەی خواردەوە. ئەو ماوەیەکی دورودرێژ قوتابی سوکرات بوو و بەبایخدانێکی مەزنەوە لەگەڵ دادگا کردنەکەیدا دەڕۆشت. ئەسینابییەکان توانیان حوکمی کوشتنی زاناترین مرۆڤی شارەکە دەربکەن، ئەم کارەش نەک تەنها کاریگەرییەکی هەمیشە زیندووی لای پلاتۆن دروستکرد، بەڵکو ئاڕاستەی هەموو کارە فەلسەفیەکانیشی دیاری کرد.
مردنی سوکرات بەلای پلاتۆنەوە، دەربڕینێکی ڕاستەوخۆی ئەو دژایەتیەی نیشاندەدا کە لە نێوان پەیوەندیە باوەکانی کۆمەڵگا و شتە ڕاستیەکاندا یان نمونەییەکاندا هەبوو. یەکەمین کاری فەلسەفی پلاتۆنیش، بڵاوکردنەوەی وەڵامدانەوەکانی سوکرات بوو. لەوێدا هەموو وتەکانی سوکرات دەگێڕێتەوە کە لە دادگا گەورەکەیدا گوتبوونی.
بێگومان لە یادتە کە لەوەوپێش گوتمان سوکرات خۆی هیچ شتێکی نەنووسیوەتەوە. (زۆربەی فەیلەسوفەکانی پێش ئەو کارەکانیان دەنووسیەوە، بەڵام بەداخەوە نووسینەکانیان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا فەوتاون). هەرچی دەربارەی پلاتۆنیشە، لەو بڕوایەداین هەموو کارە سەرەکیەکانی لە بەردەستدابن. «جگە لە دادگاکەی سوکرات، کۆمەڵێ نامە و 35 گفتوگۆی فەلسەفیە». هۆی مانەوەی نووسینەکانی پلاتۆنیش بەتایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پلاتۆن قوتابخانەیەکی تایبەت بە خۆی لە دەرەوەی ئەسینادا دامەزراند (لە باخچەیەکی بچوکدا بوو و بە ناوی یەکێک لە پاڵەوانە ئەفسانەییەکانی یۆنانەوە ناونرابوو کە ناوی «ئەکادیمۆس

«Academos»بوو). پاشانیش قوتابخانە فەلسەفیەکەی پلاتۆن ناوی ئەکادیمیای پێوە لکا. (لەو کاتەوە هەزارەها «ئەکادیمیا» لەسەرانسەری جیهاندا دامەزراوە، ئێستاکەش بەردەوام باسی خەڵکی ئەکادیمی و بابەتی ئەکادیمی دەکەین).
لە ئەکادیمیاکەی پلاتۆندا وانەی فەلسەفە و ماتماتیک و جومناستیک دەگوترایەوە. هەرچەندە «فێرکردن» لێرەدا لەوانەیە بە تەواوەتی مەبەست نەپێکێت، لەبەرئەوەی لە ئەکادیمیاکەی پلاتۆنیشدا گفتوگۆی ڕاستەوخۆ ڕۆڵی سەرەکی دەبینی. واتە بە ڕێکەوت نەبوو کە پلاتۆن شێوازی گفتوگۆی بە باشترین تەرزی کارکردن لەقەڵەم دەدا.

***ڕاستی و جوانی و باشیە هەتاهەتاییەکان***

لە پێشەکی ئەم کۆرسی فەلسەفەیەدا گوتم بەشێوەیەکی گشتی کارێکی سوود بەخشە گەر پەی بە پڕۆژەی دیاریکراوی فەیلەسوفێک بەرین، لەبەرئەوە ئێستاکە ئەم پرسیارە پێشنیاز دەکەم؛ ئەو شتە چی بوو کە پلاتۆن دەیویست لێی بکۆڵێتەوە؟
زۆر بە کورتی دەتوانین بڵێین پلاتۆن کتومت بایەخی بە پەیوەندی نێوان شتە نەمر و نەگۆڕەکان و شتە کاتیەکان دەدا. (بە شێوەیەکی تر بیڵێین، هەر ڕێک وەک فەیلەسوفە پێش سوکراتیەکان!).
پاشانیش گوتمان سوکرات و سۆفیستەکان لە بابەتی فەیلەسوفە سروشتیەکان دور کەوتنەوە و سەرقاڵی مرۆڤ و کۆمەڵگابوون. بەڵام سەربارى ئەم دورە پەرێزیەش، سوکرات و سۆفیستەکانیش بەشێوەیەک لە شێوەکان گرنگیان بە نەمری و کاتێتی شتەکان دەدا. بەتایبەت ئەو پرسیارانەی گرێدراوی ئاکاری مرۆڤ و ئیدیاڵ و خاسیەتی چاکەی کۆمەڵگابوون. بەکورتی، سۆفیستەکان پێیان وابوو

بابەتی ڕاست و هەڵە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گۆڕانکاریان بەسەردا دێت، چونکە ڕاست و هەڵە شتێکن کە «دەگۆڕێن». سوکراتیش کتومت دژی ئەم تێڕوانینە بوو. بە بڕوای ئەو ڕاست و هەڵە هەندێ یاسای نەمر و هەتاهەتایی هەیە، هەروەها لە دیدەی ئەوەوە هەموو مرۆڤێک بە بەکارهێنانی ژیرێتی خۆی دەتوانێت بەو پێوانە نەگۆڕانە بگات، چونکە ئەو دەیگوت ژیرێتی مرۆڤ نەمر و نەگۆڕە.
سەرنج دەدەیت سۆفیا؟ لێرەدایە کە پلاتۆن دێت و گرنگی بە هەردوو بەشەکە دەدات؛ واتە ئەو شتانەی نەمر و نەگۆڕن لە سروشتدا و لەگەڵ ئەو شتانەی کە نەمر و نەگۆڕن لە ئاکار و کۆمەڵگادا. بەڵێ، بەلای پلاتۆنەوە هەموو ئەمانە دەبنە یەک بابەت. ئەو هەوڵدەدات بگاتە «ڕاستیەکی» تایبەت بە خۆی، ڕاستیەک کە نەمر و نەگۆڕە. لەڕاستیدا کاری فەیلەسوفەکان دەرخستنی ئەو ڕاستیانەیە. فەیلەسوفەکان نایەن جوانترین ئافرەتی ساڵ هەڵببژێرن، یان بەدوای تەماتەی هەرزانی پێنج شەممماندا بگەڕێن. (هەر لەبەرئەوەشە کە هێندە ناویان بەر گوێمان ناکەون!)، فەیلەسوفەکان هەوڵدەدەن ڕواڵەت پەرستی و باسی «شتی سەرزارەکی» پشت گوێ بخەن و لەبری ئەوانە ئاماژە بۆ شتێک بکەن کە «ڕاستی» نەمر و «جوانی» نەمر و «باشی» نەمرە.
بەم شێوەیە کورتەیەکی پڕۆژەی پلاتۆنمان خستە ڕوو. بەڵام با یەکە یەکە بێینە سەر باسەکان. لەپێشدا هەوڵدەدەین لەم شێوازی بیرکردنەوە تایبەتیە تێبگەین کە پاشتر بە قوڵی کاریگەری خۆی لەسەر هەموو فەیلەسوفە ئەوروپیەکان بەجێهێشت.

ئێمپیدۆکلس و دیمۆکریتس دەیانگوت هەموو دیاردەکانی سروشت «دەگۆڕێن»، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیانگوت دەبێت «شتێک» هەبێت کە گۆڕانکاری بەسەردا نەیەت. ("چوار توخمەکان" یان "ئەتۆمەکان").
پلاتۆن لەگەڵ خستنە ڕووی بابەتاکانیاندا تەبایە، بەڵام بەشێوەیەکی تەواو جودا دەریدەبڕێت.
بەبڕوای ئەو هەموو شتێکی سروشت کە هەستی پێ دەکەین، شیاوی «گۆڕانکاری»ە. واتە لە دیدەی ئەوەوە هیچ جۆرە «مادەیەکی بنچینەیی» بوونی نیە، کە شیاوی هەڵوەشاندنەوە و فەوتان نەبێت.
تەواوی ئەو شتانەی سەر بە «جیهانی هەستن» لەمادە دروستبوون و بە تێپەڕبوونی کات دەفەوتێن. بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەموو شتێک لەسەر «فۆڕمێکی» هەتاهەتاییەوە هاتوونەتە بوون، کە نەمر و نەگۆڕن.
تێدەگەیت سۆفیا؟ ... نا... باشە...
بۆچی هەموو ئەسپەکان وەک یەکن، سۆفیا؟ لەوانەیە ئێستاکە وا بیرکەیتەوە کە وەک یەک نەبن! بەڵام شتێک هەیە کە لە نێوان هەموو ئەسپەکاندا هاوبەشە... شتێک، کە وامان لێدەکات هەرگیز گرفتمان نەبێت لەوەی پەنجە بۆ ئەسپێک ڕاکێشین. بێگومان ئەسپێکی دیاریکراو «دەگۆڕێت». شیاوی پیربوون و لەنگ بوونە، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیشدا نەخۆش دەکەوێت و دەمرێت. بەڵام خودی «فۆڕمی ئەسپەکە» نەمر و نەگۆڕە.
واتە بەلای پلاتۆنەوە، ئەو شتەی نەمر و نەگۆڕە «مادە بنەڕەتیە» فیزیاییەکە نیە. بەڵکو شتێکە کە ڕۆحییە یان تەرزە وێنەیەکی ئەبستراکتە کە هەموو دیاردەکانی سروشتی لەسەر دروستکراوە.

بەکورتی دەڵێم؛ فەیلەسوفە پێش سوکراتیەکان لێکدانەوەیەکی تەواو باشیان بۆ گۆڕانکاریە سروشتیەکان دانابوو، بەبێ ئەوەی ناچاربن گریمانەی ئەوە بکەن کە شتێک لە ڕاستیدا «گۆڕانکاری» بەسەردادێت. ئەوان لەو بڕوایەدابوون لەنێو سوڕی سروشتدا هەندێ بەشی چکۆلەی هەمیشەیی و نەمر هەبێت کە شیاوی فەوتاندن نەبن. بەڵام لە هەمان کاتدا هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی پەسەندیان لا نەبوو کە پێمان بڵێت چۆن ئەم «بەشە چکۆلانە»، کە لەوەوپێش ئەسپێکی لێ دروستبوو بوو، لە پڕێکدا کۆ دەبنەوە، ئەوجا بۆ نمونە پاش چەند سەدەیەک ئەسپێکی تەواو نوێ دروست دەکات! یان دەبێتە ئەسپێک یان تیمساحێک. مەبەستی پلاتۆن ئەوەیە کە ئەتۆمەکانی دیمۆکریتس هەرگیز نابنە «تیمیل»ێک یان «فیساح»ێک (* نووسەر وشەی «تیمیل» و «فیساح»ی لە تێکەڵکردن و لێکدانی وشەی فیل و تیمساحەوە داڕشتووە.و). هەر ڕێک ئەم هۆیەش وای لە هەڵسەنگاندنە فەلسەفیەکانی پلاتۆن کرد کە سەر هەڵبدەن.

ئەگەر تا ئێستا لە مەبەستم تێگەیشتبیت، ئەوا دەتوانیت ئەم بڕگەیەی خوارەوە بپەڕێنیت. بەڵام هەر بۆ دڵنیایی بە کورتی دەڵێم؛ گریمان کۆمەڵێک پارچەی لیگۆت هەیە و ئەسپێکی پێ دروست دەکەیت، پاشان هەڵی دەوەشێنیتەوە و پارچەکان دەخەیتە ناو قتوویەکەوە. لێرەدا تەنها بە لەرانەوەی قتووەکە ئەسپێکی نوێت بۆ دروست نابێت (چۆن ڕێی تێدەچێت کە پارچە لیگۆکان خۆیان خۆیان ڕێکبخەنەوە و سەرلەنوێ ئەسپێک پێکبهێننەوە؟ نابێت)، دەبێت تۆ جارێکی تر ئەسپەکە دروست بکەیتەوە. کاتێکیش کە دەتوانیت ئەمە بکەیت، ئەوا لەبەر ئەوەیە کە لە ناوەوەتدا وێنەی سیمای ئەسپێک بوونی هەیە. واتە ئەسپە لیگۆکە لەسەر تەرزی وێنەیەک دروست

دەکرێت کە بەبێ گۆڕانکاری لە ئەسپێکەوە بۆ ئەسپێکی تر دەمێنێتەوە.

دەربارەی پەنجا کێکەکەی کە وەک یەک وان چی؟ گەیشتیتە هیچ ئەنجامێک؟ با وایدابنێین تۆ لە ئاسمانی دەرەوەوە هاتوویت و هەرگیز لە ژیانتا دوکانی کێک فرۆشێکت نەدیوە. لە پڕێکدا خۆت دەکەیت بە دوکانێکدا و پەنجا کێکی شێوە مرۆیی وەک یەک سەرنجت ڕادەکێشێت. پێم وابێت کەمێک سەرت دەخورێنیت و بیر لەوە دەکەیتەوە چۆن هەموویان وەک یەکن. لەوەیە یەکێکیان دەستێکی نەبێت، یان دانەیەکی تریان کەمێک لەلای سەریەوە شکابێت، یان کێکێکی تریان کەمێک سکی هەڵئاوسابێت. بەڵام پاش ئەوەی کە تەواو سەرنج دەدەیت، بۆت دەردەکەوێت هەموویان یەک سیمایان هەیە. هەرچەندە هیچیان بێ کەم و کوڕی نین، بەڵام دەگەیتە ئەو ئەنجامەی کە هەموویان یەک سەرچاوەی هاوبەشیان هەیە. لە پڕێکدا تێدەگەیت کە هەموو کێکەکان لە هەمان قاڵب دروست کراون. زیاتریش سۆفیا؛ ئەو کاتە تەواو پەرۆشی بینینی ئەو قاڵبە دەبیت. لەبەرئەوەی ئاشکرایە کە خودی قاڵبەکە دەبێت لە هەموو کێکە کۆپیەکان زۆر بێ کەم و کوڕیتر بێت، کەواتە دەبێت زۆر جوانتریش بێت.

ئەگەر توانیبێتت ئەم ڕاهێنانە بەدەستی خۆت شیکار بکەیت، ئەوا ڕێک بە هەمان شێوەی پلاتۆن گرفتێکی فەلسەفیت شیکردۆتەوە. ئەو، هەر وەک زۆربەی فەیلەسوفەکانی تر «لە ئاسمانەوە کەوتە خوارەوە». (لەسەر ئەوپەڕی یەکێک لە تاڵە باریکەکانی فەروی کەروێشکەکە وەستا) سەری لەوە دەسوڕما کە چۆن هەموو دیاردەکانی سروشت هێندە زۆر لە یەک دەچن، لێرەشەوە گەیشتە ئەم دەرئەنجامە؛ دەبێت کۆمەڵێک فۆڕمی دیاریکراو هەبن کە لە «پشت»

یان لە «سەرو» هەموو ئەو شتانەوەبن کە لە چواردەورماندا دەیانبینین. لەپشت هەموو ئەسپ و بەراز و مرۆڤێکەوە، بیری «ئەسپ» و بیری «بەراز» و بیری «مرۆڤ» بوونی هەیە. (هەروەک دوکانی کێک فرۆشەکە، دەشێ کێکی مرۆڤ و کێکی بەراز و کێکی ئەسپی هەبێت، لەبەر ئەوەی لە دوکانێکی باشدا دەبێ لە یەک قاڵب زیاتر هەبێت. بەڵام تەنها یەک قاڵبی بەسە بۆ ئەوەی بتوانێت چەندەها کێک لەو جۆرە دروست بکات).
بەکورتی؛ پلاتۆن لەو بڕوایەدابوو لەپشت جیهانی هەستەوە هەقیقەتێکی تر بوونی هەبێت. ئەو بەم هەقیقەتەی دەگوت جیهانی ئەندێشە «بیر». لەوێدا هەموو «تەرزە وێنە»ییە نەمر و نەگۆڕەکانی لێیە، کە لە پشت هەموو دیاردە جیاوازەکانی سروشتەوە وەستاون. ئێمە ناوی ئەم جۆرە تێگەیشتنە پڕ مانا و تایبەتیەش دەنێین تیۆری «بیر»ی پلاتۆن.

## *زانینی دڵنیا*

لەوانەیە تا ئەم خاڵە لێم تێبگەیت سۆفیا، وانیە؟ بەڵام لەوانەشە بپرسیت؛ ئایا بەڕاستی پلاتۆن بەم شێوەیە بیری دەکردەوە؟ بەڕاستی پێی وابوو ئەو جۆرە فۆڕمانە لە جیهانێکی تەواو جودادا بوونیان هەبێت؟
پڕ بە مانای وشە و بەدرێژایی هەموو ژیانی بەو شێوەیە بڕوای نەدەکرد، بەڵام هەرچۆنێک بێت لە هەندێ گفتوگۆ فەلسەفیەکانیدا بەو جۆرە لێی تێدەگەین. ئێستاش هەوڵدەدەین تەماشایەکی مشتومڕەکانی بکەین.

هەروەک گوتمان فەیلەسوف هەوڵدەدات شتێک بدۆزێتەوە کە نەمر و نەگۆڕ بێت. بۆ نمونە بێسوودە گەر لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی دەربارەی بڵقی جۆرە سابوونێکی دیاریکراو بنووسین. بەر لە هەموو شتێک پێشئەوەی فریا کەوین لە بنچینەوە لێی بکۆڵینەوە، دەتەقێت و دەفەوتێت. پاشانیش کێ لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی لەسەر شتێک دەکڕێت کە کەس نەیدیوە و تەنها پێنج چرکە بوونی هەیە؟
پلاتۆن پێی وابوو هەموو شتێکی چواردەورمان کە دەیانبینین، بەڵێ، هەموو شتێک کە دەستی لێدەدەین و هەستی پێ دەکەین، شیاوی ئەوەبێت لەگەڵ بڵقی سابوونێکدا بەراورد بکرێت. لەبەرئەوەی هیچ شتێک لەو شتانەی کە لە جیهانی هەستدا بوونیان هەیە، بەردەوام نامێننەوە. بێگومان خۆت دەزانیت هەموو گیانەوەرێک و مرۆڤێک ئەمرۆ یان سبەی دەمرن و هەڵدەوەشێنەوە. تەنانەت پارچە مەڕمەڕێکیش گۆڕانکاری بەسەردا دێت و هێواش هێواش دادەخورێت. (ئەکرۆپۆلیس بۆتە پاشماوە سۆفیا! گەر لە من بپرسیت، دەڵێم ئەمە مایەی شەرمەزاریە، بەڵام ژیان بەو جۆرەیە). هەرچۆنێک بێت بەپێی بڕوای پلاتۆن هەرگیز ناتوانین زانیارییەکی پڕاوپڕ دەربارەی شتێک بزانین کە بەردەوام گۆڕانکاری بەسەردا دێت. بەڵکو تەنها دەتوانین تێگەیشتنێکی گوماناوی یان گریمانەییمان دەربارەیان هەبێت، واتە سەبارەت بە هەموو ئەو شتانەی کە گرێدراوی جیهانی هەستن (یان ئەو شتانەی کە دەتوانین دەستیان لێبدەین و هەستیان پێبکەین). تەنها ئەو شتانەی بەهۆی ژیرێتیەوە دەتوانین لێیان تێبگەین، دەکرێت زانیارییەکی گومان هەڵنەگرمان دەربارەیان هەبێت.
بەڵێ سۆفیا، دەمەوێت بابەتەکەم باشتر ڕوونبکەمەوە؛ یەکێک لە کێکەکانی وەستایەک، بۆ نمونە کە لە شێوەی پیاوێکدا دروستی

کردووە، لەوانەیە هێندە ناتەواو بێت کە نەتوانم پەی بە شێوەکەی بەرم. بەڵام پاش بینینی بیست سی کێکی شێوە پیاو (کە کەم تا زۆر بێکەموکوڕی بن) ئەوسا بەو پەڕی دڵنیاییەوە شێوەی قاڵبی کێکەکەم بۆ دەردەکەوێت. واتە لەگەڵ ئەوەشدا کە  هەرگیز لەوەوپێش قاڵبەکەم نەدیوە، بەڵام دەتوانم مەزەنەی بکەم. لەوانەشە بێسوود بێت گەر تەنانەت خودی قاڵبەکەش بەچاوی خۆم ببینم، چونکە ناتوانین هەمیشە پشت بە هەستەکانمان ببەستین، هەستی بینینیش بۆی هەیە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر بگۆڕێت. بەڵام لەبەرامبەردا دەتوانین متمانە بەو شتانە بکەین کە ژیرێتیمان پێمان دەڵێت، چونکە ژیرێتی لەلای هەموو کەسێک هەر هەمان شتە.
گریمان لە پۆلی قوتابخانەدا لەگەڵ سی قوتابی تردا دانیشتویت و مامۆستاکەت پرسیارێکی بەم شێوەیە دەکات؛ کام ڕەنگە جوانترین ڕەنگی پەلکە زێڕینەیە؟ بێگومان ئەوسا چەندین وەڵامی جیاواز جیاوازی دەدرێتەوە. بەڵام ئەگەر بپرسێت هەشت کەڕەت سێ چەند دەکات، ئەوا هەموو قوتابییەکان دەگەنە یەک ئەنجام. لێرەدا ژیرێتی مرۆڤە کە حوکمێک دەدات، ژیرێتیش بە شێوەیەک لە شێوەکان پێچەوانەی «هەست» و «بینین»٥. واتە دەتوانین بڵێین ژیرێتی نەمر و گەردوونیە، ڕێک لەبەرئەوەی تەنها دەربارەی پەیوەندیە نەمر و گەردوونیەکان دەدوێت.
بەشێوەیەکی گشتی پلاتۆن گرنگیەکی زۆری بە ماتماتیک دەدا، چونکە پەیوەندیە ماتماتیکیەکان هەرگیز گۆڕانکاریان بەسەردا نایەت. لێرەشەوە دەتوانین بڵێین شتێکن کە دەکرێت بەدڵنیاییەوە زانیاریمان لەسەریان هەبێت. بەڵام تەنها بۆ ڕووکردنەوەی زیاتر وا نمونەیەکت بۆ دەهێنمەوە؛ گریمان لە دارستانێکدا گزگلێکی خڕ دەدۆزیتەوە.

لەوانەیە بڵێیت «بەڕای» من خڕە، لەکاتێکدا پێدەچێت یۆرون بڵێت لە یەکێک لەلاکانیەوە کەمێک قوپاوی تێدایە. (پاشان دەست دەکەن بە گفتوگۆ لەسەری!) بەڵام ناتوانن لەسەر ئەو شتەی بە چاوتان دەیبینن، بگەنە زانیارییەکی بێ چەندوچوون. هاوکات هەردووکتان بەو پەڕی دڵنیاییەوە دەڵێن سەرجەمی گۆشەکانی بازنەیەک 360 پلەیە. لێرەدا ڕێک باسی بازنەیەکی نمونەیی دەکەن، کە پێدەچێت لە سروشتدا بوونی هەر نەبێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوەوەتاندا دەتوانن بەو پەڕی ڕوونیەوە بیبینن. (ئێوە باس لە قاڵبی نادیاری کێکەکە دەکەن، نەک باسی کێکێکی ڕێکەوتی سەر مێزی نانخواردنەکە).

بە کورتی؛ ناتوانین تێگەیشتنێکی دڵنیامان دەربارەی ئەو شتانە هەبێت کە هەستیان پێ دەکەین. بەڵام ئەو شتانەی لە ڕێگەی ژیریێتیەوە دەیان بینین، دەمانگەیێننە زانیارییەکی دڵنیا. سەرجەمی گۆشەکانی سێگۆشەیەک بۆ هەتاهەتایە 180 پلەیە. بە هەمان شێوەش هەرچەندە ئەگەر هەموو ئەسپەکانی جیهانی هەست لەنگیش بن، «بیر»ی ئەسپ کە لەسەر چوار قاچ دەوەستێت، هەمیشە دەمێنێتەوە.

**ڕۆحی نەمر**

لەوەوپێش بینیمان کە هەقیقەت لەلای پلاتۆن بەسەر دووبەشدا دابەشدەکرێت؛

بەشێکیان جیهانی هەستە، کە تەنها زانیارییەکی نزیکەیی یان ناتەواومان پێدەبەخشێت، ئەویش لە ڕێگەی بەکارهێنانی پێنج هەستەکەمانەوەیە (کە نزیکەیی و ناتەواون). لە جیهانی هەستدا

هەموو شتێک «شیاوی گۆڕانە» و هیچ شتێکی بۆ هەتاهەتایە نامێنێتەوە. هیچ شتێکی جیهانی هەست بوونی نیە، تەنها کۆمەڵێ شت نەبێت کە خۆیان نیشان دەدەن و ون دەبن.
دووهەمین بەش جیهانی «بیر»ە، کە زانیارییەکی تەواو دڵنیامان پێ دەبەخشێت، ئەویش لە ڕێگەی بەکارهێنانی ژیریێتیمانەوەیە. ئەم جیهانی «بیره»ش ناتوانین لە ڕێگەی هەستەکانمانەوە پەی پێبەرین.
لە بەرامبەریشدا «بیر»ەکان یان فۆڕمەکان نەمر و نەگۆڕن.
بەپێی بڕوای پلاتۆن مرۆڤیش بوونەوەرێکی دوو بەشییە. ئێمە خاوەنی لەشێکین کە «دەگۆڕێت». لەشیش بەتەواوەتی گرێدراوی جیهانی هەستە و هەروەکو هەموو شتەکانی تری ئەم جیهانەش (بۆ نمونە بڵقێکی سابون) هەمان چارەنووس چاوەڕوانی دەکات. هەموو هەستەکانمان بەستراونەتەوە بە لەشەوە، لەبەرئەوە جێگەی متمانە نین. بەڵام لە هەمان کاتدا ئێمە خاوەنی ڕۆحێکی نەمریشین، ئەم ڕۆحەش ماڵی ژیرێتییە. ڕۆحیش شتێکی مادی نیە، لەبەرئەوە دەتوانێت جیهانی «بیر» ببینێت .
وا نزیکەی هەموو شتێکم باس کرد، بەڵام هێشتام زۆر ماوە باسی بکەم، دەڵێم؛ هێشتام زۆر ماوە باسی بکەم!
بەدەر لەوەش لە دیدەی پلاتۆنەوە ڕۆح پێش ئەوەی بێتە ناو لەشەوە، بوونی هەبووە. بەپێی ئەو، ڕۆح لەوەوپێش لە جیهانی «بیر»دا بووە. (لەگەڵ هەموو قاڵبە کێکەکاندا لەسەری سەرەوەی دۆڵابەکەدا بووە).
بەڵام هەر کە ڕۆح لە مرۆڤێکدا بەخەبەردەبێتەوە، خێرا هەموو «بیر»ە تەواوەکان (*بێ کەم و کوڕیەکان.و) لەیاد دەکات. پاشان شتێک ڕوودەدات، لەڕاستیدا پڕۆسەیەکی سەیر دەست پێدەکات. کاتێک مرۆڤ هێدی هێدی فۆڕمەکانی سروشتی بۆ دەردەکەوێت، یادێکی لاواز

لە ڕۆحەوە سەر دەردێنێت. کەسەکە ئەسپێک دەبینێت، بەڵام ئەسپێکی ناتەواو (هەروەک کێکێک دەبیینێت کە لەسەر شێوەی ئەسپ دروستکرابێت!). بەڵام بینینی ئەسپەکە بەسە بۆ ئەوەی یادێکی لاواز لە ڕۆحەکەدا دەربارەی ئەسپی تەواو و بێ کەموکوڕی بەخەبەربهێنێتەوە، واتە ئەسپێک کە لەوەوبەر ڕۆح لە جیهانی «بیر»دا بینیویەتی. لێرەشەوە تاسەی گەڕانەوە بۆ ماڵی ڕاستەقینەی ڕۆح سەرهەڵدەداتەوە. پلاتۆن بەم تاسەیەی دەگوت ئیرۆس«Eros» ، واتە خۆشەویستی. بەم جۆرەش ڕۆحەکە هەست بە «تاسەیەکی خۆسەویستی» دەکات بۆ گەڕانەوەی بەرەو سەرچاوە ڕاستەقینەکەی خۆی. لەوە بەدواشەوە هەم لەش و هەم هەستەکانیش وەک شتێکی ناتەواو و بێ بایەخ دێنە بەرچاو. ڕۆحەکە دەخوازێت بە باڵی خۆشەویستی بفڕێتەوە بۆ «ماڵەوە»، دەیەوێت بەرەو جیهانی «بیر» بگەڕێتەوە، دەیەوێت خۆی لە «زیندانی لەش» ڕەهابکات.

لێرەدا باشترە بەپەلە تێبینیەک بخەمە ڕوو؛ پلاتۆن باس لە بازنەیەکی ژیانی نمونەیی دەکات، چونکە هەموو مرۆڤێک ڕۆحیان سەربەست ناکەن و ڕێگەی پێ نادەن کە دەستبکات بە گەڕانەوە بەرەو جیهانی «بیر». زۆرینەی خەڵکی خۆیان بە «بەرپەرچدانەوەی وێنەی» بیرەکانەوە دەبەستنەوە کە لە جیهانی هەستەکەندا بوونیان هەیە. ئەوان کە ئەسپێک دەبینن، تەنها ئەسپێک دەبینن و هیچی تر، بەڵام ئەو شتە ڕەسەنە نابینن کە لە ڕاستیدا هەمو ئەسپەکانی لەسەر دروستکراوە. (دێنە ناو چێشتخانەکەوە و بەردەبنە کێکەکان، بەبێ ئەوەی بپرسن چۆن دروستکراون). پلاتۆن باسی ڕێگەی بیری فەیلەسوفەکان دەکات. دەکرێت فەلسەفەکەی وەک باسکردنێکی هەڵسوکەوتی فەلسەفی بخوێنرێتەوە.

تۆش سۆفیا، کاتێک سێبەرێک دەبینیت، بیر لەوەش دەکەیتەوە کە دەبێت لە شتێکەوە هاتبێت. بۆ نمونە سێبەری ئاژەڵێک دەبینیت، لەوانەیە وا بیربکەیتەوە کە ئەسپێک بێت، بەڵام ناتوانیت تەواو دڵنیا بیت. پاشان ئاوڕ دەدەیتەوە و ئەسپە ڕاستیەکە دەبینیت (بێگومان سیمای زۆر ڕوونتر و جوانتریشە لە «سێبەری ئەسپەکە»). بەم شێوەیەش پلاتۆن لەو بڕوایەدابوو هەموو دیاردەکانی سروشت تەنها وێنەیەکی سێبەری «فۆڕم»ە یان «بیر»ە نەمرەکان بن و هیچی تر. بەڵام زۆربەی زۆری خەڵکی دڵخۆشانە لەگەڵ وێنە سێبەرییەکاندا ژیان بەسەردەبەن، ئەوان بیر لەوە ناکەنەوە کە دەبێت شتێک هەبێت ئەم سێبەرانەی بەخشیبێت. ئەوان وادەزانن سێبەرەکان هەموو شتێکن، لەبەرئەوەی سێبەرەکان وەک سێبەر نابینن، لێرەشەوە نەمری ڕۆحی خۆیان لەیاد دەکەن.

### *ڕێگەی دەرچوون لە تاریکی ئەشکەوتەکە*

پلاتۆن باس لە نمونەیەک دەکات کە ڕێک مەبەستەکەی من دەپێکێت. ئێمە پێی دەڵێین "نمونەی ئەشکەوتەکە". وا منیش لێرەدا بە شێوەی دەربڕینی خۆم بۆت دەگێڕمەوە؛

کۆمەڵێک خەڵک بهێنە بەرچاوت کە لە ئەشکەوتێکدا دەژین. بەڵام کەسەکان بە جۆرێک دانیشتوون کە پشتیان لە دەمی ئەشکەوتەکەیە و دەست و قاچیشیان بەستراوەتەوە، بەم جۆرەش تەنها دیواری ئەو بەری ئەشکەوتەکە دەبینن. لە پشتیانەوە دیوارێکی بەرز دروستکراوە و لەو دیویەوە کۆمەڵێک خەڵک چەند شکڵێکی جیاواز جیاواز بەسەر دیوارەکەوە بەرز دەکەنەوە. ئاگرێکیش لەپشت شکڵەکانەوە کراوەتەوە، بەو شێوەیەش سێبەری شکڵەکان لەسەر دیواری ئەوبەری

ئەشکەوتەکە دەردەکەون. بەم جۆرە دانیشتوانی ئەشکەوتەکە تەنها «شانۆی سێبەرەکان» دەبینن و هیچی تر. هەر لەکاتی لەدایک بوونیشیانەوە بە هەمان شێوە دانیشتوون، لەبەرئەوە وا هەست دەکەن کە سێبەرەکان تەنها شتن کە بوونیان هەیە.

ئێستاکە مەزەنەی ئەوە بکە یەکێک لە دانیشتوانی ئەو زیندانە، خۆی ڕزگاردەکات. لەپێش هەموو شتێکدا لە خۆی دەپرسێت؛ سێبەرەکانی سەر دیوارەکە لە کوێوە هاتوون؟ بەڕای تۆ چی ڕوودەدات کە ئاوڕ دەداتەوە و هەموو ئەو شکڵانە دەبینێت کە بەرز کراونەتەوە؟ بێگومان لەسەرەتادا بینینی ئەو هەموو تیشکە تیژانە سەرسامی دەکات. پاشانیش سەرسامی هەموو ئەو شکڵە ڕووناکانە دەبێت، کە لەوەوپێش تەنها سێبەرەکانی دیبوون. ئەگەر توانای سەرکەوتنی بەسەر دیوارەکەدا هەبێت و بەلای ئاگرەکەدا بڕوات و دواجاریش بکاتە ناو سروشت، ئەوا بێگومان زۆر زیاتر سەرسام دەبێت. بەڵام پاش ئەوەی کەمێک چاوی هەڵدەگڵۆفێت، جوانی دەوروبەرەکەی لە خشتەی دەبات. بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا ڕەنگەکان و سنووری تەواوی شتەکان بەدیدەکات. شێوەی ڕاستەقینەی گوڵ و گیانەوەرەکان دەبینێت، لە کاتێکدا شکڵەکانی ناو ئەشکەوتەکە تەنها چەند وێنەیەکی خراپی ئەوان بوون. بەڵام دیسانەوە پرسیار لە خۆی دەکاتەوە؛ ئەم هەموو گوڵ و گیانەوەرانە چۆن دروست بوون؟ پاشان لە ئاسماندا نیگای دەچێتە سەر خۆر و تێدەگات کە خۆر ژیان بە هەموو گوڵ و گیانلەبەرەکان دەبەخشێت، هەروەک چۆن ئاگری ناو ئەشکەوتەکە وێنە سێبەرییەکانی سەر دیوارەکەی دروست دەکرد.

ئەوجا مرۆڤە ئازادەکەی ناو ئەشکەوتەکە بە سروشتدا دەگەڕێت و چێژ لەو سەربەستیە دەبینێت کە دەستی کەوتۆتەوە. بەڵام هاوکات

بیر لە هەموو ئەوانە دەکاتەوە کە هێشتام لە ئەشکەوتەکەدا ماونەتەوە، لەبەرئەوە دەگەڕێتەوە بۆ لایان. هەر لەگەڵ گەڕانەوەیدا هەوڵدەدات بۆیان بسەلمێنێت کە وێنە سێبەرەکانی سەر دیوارەکە تەنها نمونەی خراپ و شێواوی شتە ڕاستەقینەکانن. بەڵام کەس بڕوای پێ ناکات، بەڵکو پەنجە بۆ دیوارەکە ڕادەکێشن و دەڵێن تەنها ئەو وێنانە بوونیان هەیە و هیچی تر. لە کۆتایشدا کەسە ئازادەکە دەکوژن.

مەبەستی پلاتۆن لە نمونەی ئەشکەوتەکەدا دەرخستنی ڕێگەی فەیلەسوفە کە لە وێنای ناڕوونەوە دەڕواتە سەر ئەو «بیر»ە ڕاستیانەی کە لە پشتی دیاردەکانی سروشتەوەن. بێگومان بیر لە سوکراتیش دەکاتەوە (کە خەڵکی ناو ئەشکەوتەکە کوشتیان، چونکە شێوەی بینینە ڕۆتینیەکانیانی دەستنیشان دەکرد و گەرەکی بوو ڕێگای بینینی ڕاستەقینەیان نیشانبدات). بەم جۆرەش نمونەی ئەشکەوتەکە وەک وێنەیەکی جەربەزەیی و بەرپرسیاری پەروەردەیی فەیلەسوف دەمێنێتەوە.

پلاتۆن گەرەکیەتی بڵێت پەیوەندی نێوان تاریکی ئەشکەوتەکە و سروشتی دەرەوەی، بەرامبەر پەیوەندی نێوان دیاردە دەرکەوتووەکانی سروشت و جیهانی «بیر» دەوەستێتەوە. سروشت لەڕوانگەی ئەوەوە شتێکی تاریک و خەمگین نیە، بەڵام بە بەراوردکردنی لەگەڵ ڕوونی جیهانی «بیر»دا، تاریک و دڵ گوشێنەرە. هەروەک چۆن وێنەی کچێکی قەشەنگیش جوان و ڕازاوەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا تەنها وێنەیەکە و هیچی تر (*واتە بە بەراوردکردنی لەگەڵ کچەکە خۆیدا شتێکی تایبەت نیە.و).

**وڵاتی فەلسەفی**
نموونەی ئەشکەوتەکە لە گفتوگۆی «وڵات»ی پلاتۆندا بەدی دەکەین. لەوێدا پلاتۆن وەسفی «وڵاتێکی نموونەیی» دەکات، واتە جۆرە وڵاتێک کە لە خەیاڵدا داڕێژراوە (یان ئەو شتەی کە ئێمە پێی دەڵێین یۆتۆبیا «Utopia»). زۆر بە کورتی دەتوانین بڵێین بەبڕوای پلاتۆن دەبێت فەیلەسوفەکان وڵات بەڕێوە بەرن. ئەمەشمان لە تێڕوانینی بۆ شێوەی دروستبوونی لەشی مرۆڤەوە بۆ لێکدەداتەوە.
بەپێی بڕوای پلاتۆن لەشی مرۆڤ بەسەر سێ بەشدا دابەشکراوە؛ سەر و سنگ و خوارووی لەش. هەروەها بەبڕوای ئەو توانایەکی ڕۆحیش بەرامبەر هەر بەشێک دەوەستێت. سەر، جێگەی «ژیریێتی»یە. سنگیش، جێگەی «خواست»ە. دواجاریش خوارووی لەش، جێگەی «حەز و ئارەزوو»ە. جگە لەوەش هەریەکێک لەو سێ توانا ڕۆحیە بەستراوەتەوە بە شتێکی نموونەییەوە یان بە شتێکی «باش»ەوە. ئامانجی ژیرێتی دەبێت حیکمەت بێت. خواستیش دەبێت جەربەزەیی نیشان بدات. حەز و ئارەزووش دەبێت سنووربەند بکرێن. بەم جۆرەش مرۆڤ دەتوانێت مامناوەندێتی خۆی نیشان بدات. ئەو کاتەش مرۆڤێکی هاوئاهەنگمان یان «سەر ڕاستمان» دەستدەکەوێت، کە هەر سێ بەشەکەی پێکەوە وەک یەک بەش کاردەکەن. منداڵانی قوتابخانە دەبێت یەکەمجار فێری ئەوە بکرێن کە دەست بەسەر ئارەزووەکانیاندا بگرن، پاشانیش دەبێت گەشە بە ئازایەتییان بدرێت. دوا جاریش دەشێ ژیرێتی یاریدەدەرێکیان بێت بۆ ئەوەی حیکمەتی پێ بەدەست بهێنن.
لێرەدا پلاتۆن بیر لە وڵاتێک دەکاتەوە کە ڕێک وەک مرۆڤ داڕێژراوە (کتومت هەروەک سێ بەشەکەی). هەروەک چۆن لەش خاوەنی «سەر»

و «سنگ» و «خواروی لەش»ە، بە هەمان شێوە وڵاتیش خاوەنی «بەڕێوەبەر» و «پاسەوان یان سەرباز» و «ئیشکەر»ەکانە (بۆ نمونە جوتیاران). ئاشکرایە پلاتۆن لێرەدا زانستی پزیشکی یۆنانی وەک نمونەیەکی بەرز بەکاردەهێنێت. هەروەک چۆن مرۆڤێکی هاوئاهەنگ و لەش ساغ مامناوەندێتی و سنووربەندی خۆی دەردەخات، بە هەمان شێوەش لە وڵاتێکی «داد پەروەر»دا دەبینین هەموو تاکە کەسێک شوێنی تایبەتی خۆی لەناو سەرجەمدا دەزانێت.

ناواخنی فەلسەفەی وڵاتی پلاتۆن، هەروەک سەرتاپای هەموو کارە فەلسەفیەکانی تری، لەژێر ناونیشانی ڕاشیۆنالیزمدا (*ئەقڵانیەتدا.و) دادەنرێت. ئەو شتەی ڕۆڵی سەرەکی لە وڵاتێکی باشدا دەبینێت، ئەوەیە کە دەبێت ژیرێتی بەڕێوەی بەرێت. هەروەک چۆن سەر لەش بەڕێوە دەبات، بە هەمان شێوەش دەبێت فەیلەسوفەکان وڵات بەڕێوە بەرن.

وا لە خوارەوەدا هەوڵدەدەین بە هێڵکاریەکی سادە پەیوەندی نێوان سێ بەشەکەی مرۆڤ و وڵات دەربخەین.

| لەش | ڕۆح | باشە | وڵات |
|---|---|---|---|
| سەر | ئەقڵ | حیکمەت | بەڕێوەبەران |
| سنگ | خواست | ئازەیەتی | پاسەوانان |
| خواروی لەش | ئارەزوو | سنوربەندی | کرێکاران |

دەکرێ وڵاتە نمونەییەکەی پلاتۆن، ڕژێمی «کاست «Caste ی کۆنی هیندیمان بێنێتەوە یاد (*کاست، واتە چینی داخراو یان چینی بە بەردبوو، یەکێک لە تایەفە کۆمەڵایەتیە ڕەچەڵەکەکانی هیندۆسە. جۆرە سیستمێکە کە لە ڕێگەی دەوڵەمەندی و پلەی کۆمەڵایەتی و هتد، پشت بە جیاوازی چینایەتی دەبەستێت.و) کە هەموو تاکە

کەسێک تێیدا ڕۆڵێکی دیاریکراوی بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵ هەیە. هەر لەسەردەمی پلاتۆنەوە، هەروەها زۆر لەپێش ئەویشەوە ڕژێمی «کاست»ی هیندی بەسەر هەمان سێ بەشدا بەشکرابوو؛ کاستی یان چینی حوکمڕان (یان چینی قەشەکان) و چینی شەڕکەر و سێهەمین چینیش کرێکاران بوون.

ئەمڕۆکە لەوانەیە بتوانین ناوی وڵاتەکەی پلاتۆن بنێین «تۆتالیتی «Totalitarian(*دیکتاتۆری.و) بەڵام شایانی باسە کە ئەو لەو بڕوایەدابوو ئافرەتیش شان بەشانی پیاو بتوانێ ببێتە حوکمڕان. لەبەرئەوەی حوکمڕانی شارێک لەسەر ئەقڵ وەستاوە و بەپێی پلاتۆن ئافرەتیش ڕێک وەکو پیاو هەمان ئەقڵی هەیە. تەنها ئەوەندەیە ئەگەر بە هەمان شێوەی پیاوان فێربکرێن و جگە لەوەش لە بەخێوکردنی منداڵ و ئیشی ناو ماڵ سەربەست بکرێن. پلاتۆن دەیویست خێزان و موڵکی تایبەتی بەڕێوەبەران و پاسەوانان لابەرێت. بەبڕوای ئەو پەروەردەکردنی منداڵیش، لە هەموو بارودۆخێکدا، زۆر لەوە گرنگترە کە بخرێتە ئەستۆی تاکە کەسێک. دەبێت وڵات بەرپرسیاری پەروەردەکردنی منداڵان بگرێتە ئەستۆ. (پلاتۆن یەکەم کەس بوو کە داوای دامەزراندنی باخچەی ساوایان و قوتابخانەی هاوبەشی کرد).

پاش ئەوەی پلاتۆن ڕووبەڕووی کۆمەڵێک نەهامەتی گەورەی ڕامیاری بووەوە، گفتوگۆی «یاساکانی» نووسی. لەوێدا باس لە یاسای وڵاتێک دەکات، کە لە پاش وڵاتە یۆتۆبیاکەی، بە باشترین وڵات لەقەڵەمی دەدات و هەر لەوێدا لە لابردنی خێزان و موڵکیەتی تاکەکەس پەشیمان دەبێتەوە. بەم شێوەیەش ئازادی ئافرەتان کەمتر دەکاتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێت؛ ئەگەر وڵاتێک ئافرەتەکانی پەروەردە

نەکات و شتیان فێر نەکات، ئەوا وەک مرۆڤێک دەبێت کە تەنها مەشق بەدەستی ڕاستی بکات.
بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین پلاتۆن تێڕوانینێکی گەشبینانەی سەبارەت بە ئافرەتان هەبووە، بەهەر حاڵ ئەگەر لەگەڵ بیروبۆچوونی خەڵکی ئەو سەردەمەدا بەراوردی بکەین. لە گفتوگۆی «سیمپۆسیۆم«Symposium دا (*سیمپۆسیۆم، گفتوگۆیەکە کە بەشداران بە ئازادییەوە ڕای خۆیان لەسەر چەند بابەتێک دەردەبڕن.و) ناوی ئافرەتێک دەهێنێت «دیۆتیما «Diotima کە سروشی بینینی فەلسەفی بە سوکرات دەبەخشێت.
سۆفیا، ئەمە بوو باسی پلاتۆن. بە درێژایی دوو هەزار ساڵە مرۆڤ گفتوگۆ لەسەر تیۆری «بیر»ە سەیرەکەی دەکات و ڕەخنەی لێدەگرێت. یەکەمین کەسیش کە بەم کارە هەستا، «ئەریستۆتالیس «Aristoteles بوو، ئەم قوتابی خۆی بوو لە ئەکادیمیەکەدا و سێهەمین فەیلەسوفی مەزنی ئەسینایە.
ئێستاکە ئیدی لەمە زیاتر هیچی تر ناڵێم!

سۆفیا لەسەر ڕەگی دارێک دانیشتبوو و پەڕەکانی باسەکەی پلاتۆنی دەخوێندەوە... لەو کاتەدا خۆر لەسەر ڕۆژهەڵاتی دارستانەکەوە هەڵهاتبوو. ئەو گورزە تیشکانەی خۆر کە لە ئاسۆوە دیاربوون، ڕێک باسەکەی سوکراتی هێنایەوە یاد کە لە ئەشکەوتەکدا هاتە دەرەوە و وەستا، پاشانیش چاوی لە ئاستی تیشکە تیژەکانی دەرەوەدا هەڵگڵۆفی.
سۆفیاش هەروەها، ئەویش تا ڕادەیەک هەستی دەکرد لە ئەشکەوتێکەوە هاتبێتە دەرەوە. هەرچۆنێک بێت، پاش خوێندنەوەی

باسەکەی پلاتۆن، لە ڕوانگەیەکی تەواو نوێوە سروشتی دەبینی. پێی وابوو لەوەوپێش نەخۆشی ڕەنگ کوێری هەبووبێت. جاران تەنها کۆمەڵێک سێبەری دەبینی، بەڵام «بیر»ە ڕووناکەکانی بەرچاو نەدەکەوت.

سۆفیا بڕوای نەکرد کە هەموو ئەو شتانەی پلاتۆن لەسەر وێنە نەمرەکان دەیگوت، ڕاستبن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بیرکردنەوەیەی بەلاوە جوانبوو کە دەیگوت هەموو گیان لەبەرەکان کۆپییەکی ناتەواوی فۆڕمە نەمرەکانی جیهانی «بیر»ن. چونکە بە ڕاستی هەموو گوڵ و دار و مرۆڤ و گیان لەبەرەکان «ناتەواون»، مەگەر وا نەبێت؟

جوانی شتەکانی چواردەوری کە پڕبوون لە ژیان، تا ڕادەیەک وای لە سۆفیا کرد ئەویش چاوی هەڵگڵۆفێت، بۆ ئەوەی بتوانێ لێیان تێبگات. بەڵام هیچ شتێک لەوانەی کە دەیبینی بۆ هەتاهەتایە نامێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، پاش سەد ساڵی تریش سەرلەنوێ هەمان گوڵ و گیانەوەر لێرەدا سەر دەردەهێننەوە. هەرچەندە هەموو تاکە گوڵ و گیانەوەرێک بە شێوەیەک لە شێوەکان دەسڕێنەوە و لەبیر دەچنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێک هەیە کە شێوەکانی لە «یاد دەبێت» و دەزانێت کاتی خۆی چۆن چۆنی بوون.

سۆفیا تەماشایەکی شتەکانی چواردەوری خۆی کرد. لە پڕێکدا نیگای چووە سەر سمۆرەیەک کە بەسەر دار سنەوبەرێکدا هەڵدەزنا. یەک دوو جار بەدەوری قەدەکەیدا خولایەوە و پاشان لەنێو لقەکانیدا خۆی ونکرد.

- تۆ... لەوەوپێش تۆم دیوە! سۆفیا لە دڵی خۆیدا گوتی. بێگومان دەیزانی هەمان سمۆرە نیە کە لەوەوپێش بینیبووی، بەڵام ئەو هەمان

«فۆڕم»ی دیبوو. بەپێی زانیاری ئێستاکەی سۆفیا، پێدەچێت پلاتۆن ڕاست بکات و لەوەوپێش «سمۆرەی» نەمری لە جیهانی «بیر»دا بینیبێت، بەڵام دەبێت ئەمە لەو کاتەدا بووبێت کە پێش ئەوەی ڕۆحی هاتبێتە ناو لەشیەوە.

بڵێیت لەوەوپێش ژیابێت؟ ڕێی تێدەچێت پێش ئەوەی ڕۆحی هاتبێتە ناو ئەو لەشەوەی کە دەوراندەوری پێدەکات، بوونی هەبووبێت؟ بڵێیت بەڕاستی ئاڵتونێک یان مرواریەکی بچکۆلەی لەناودابێت کە کات نەتوانێت بیسڕێتەوە... ڕۆحێک کە پاش پیربوون و مردنی لەشی، بەردەوام بژی؟

# ژوورەکەی مێجەر

## ...کچی ناو ئاوێنەکە هەردوو چاوی بەیەکەوە داگرت...

هێشتام کاتژمێر حەوت و چارەک بوو، لەبەرئەوە هیچ پێویستی نەدەکرد پەلەی ماڵەوەی بێت. بێگومان دایکی سۆفیا یەک دوو کاتژمێرێکی تر دەخەویت، ئەو هەمیشە ڕۆژی یەک شەممان تەمبەڵبوو.

چی دەبێت ئەگەر بڕواتە ناو دارستانەکەوە و بەدوای ئەلبێرتۆ کنۆکسدا بگەڕێت؟ بەڵام ئەی بۆچی سەگەکە هێندە بەتووندی پێی دەوەڕی؟

سۆفیا لەسەر ڕەگی دارەکە هەستا و بەرەو ئەو ڕێگایە ڕۆیشت کە دواجار هێرمس لێوەی قوچاندی. نامە زەردەکەش، کە باسی پلاتۆنی تێدا بوو، هێشتام هەر بەدەستیەوە بوو. یەک دوو جار ڕێگاکە دەگەیشتە سەر دوڕیانێک، ئەویش ڕێگا گەورەکەیانی هەڵدەبژارد.

بولبوولەکان لە هەموو شوێنێکەوە دەیانجریواند، لەسەر دارەکان و لە ئاسماندا، لەسەر پەرژین و دەوەنەکاندا. ئەوان سەرقاڵی نەغمەی بەیانییانی خۆیان بوون. ڕاستە جیاوازی نێوان ڕۆژانی پشوو و ئاساییان نەدەزانی، بەڵام ئەی کێ فێری ئەو هەموو شتانەی کردوون کە دەیانکەن؟ بڵێیت کۆمپیوتەرێکی چکۆلە لەناو هەر دانەیەکیاندا نەبێت؟ یان شێوە «پڕۆگرام»ێکیان تێدابێت و ڕێنومایییان بکات؟

پاش ساتێک ڕێگاکەی بەرەو گردۆڵەیەک دەڕۆیشت، دواتریش سەرەولێژ بەرەو دار سنەوبەرەکان دەچووە خوارەوە. لەوێدا لەبەر چڕی دارستانەکە، نەیدەتوانی لە چەند مەترێک زیاتر ببینێت.

لە پڕێکدا لەنێو قەدی دار سنەوبەرەکانەوە، چاوی بە پانتاییەکی ڕووناک کەوت. لە دەریاچەیەکی بچکۆلە دەچوو. لەوێوە ئیدی ڕێگاکە بەلایەکی تردا دەڕۆیشت، بەڵام سۆفیا خۆی کرد بەناو دارەکاندا. بەڕاستی نەیدەزانی بۆ ناو دارەکانی هەڵبژارد، بەڵام قاچەکانی بەرەو ئەو ڕێگایەیان برد.

دەریاچەکە بەقەد یاریگایەکی فتبۆڵێن دەبوو. ڕێک لەو بەری ئاوەکەوە و لە پانتاییەکی ناو دارستانەکەدا، کوخێکی سووری بەرچاو کەوت. بەهەر چواردەوریدا داری بێتوولا ڕوێنرابوو. دووکەڵێکی چڕیش لە دووکەڵکێشی ئاگردانەکەیەوە بەرز دەبووەوە.

سۆفیا بەرەو قەراغی ئاوەکە چووە خوارەوە. دەوروبەری دەریاچەکە تا بڵێیت شێیاوی بوو، پاشان لە قەراغ ئاوەکەدا بەلەمێکی بینی، دوو سەوڵیشی تیابوو. سۆفیا بەهەرچوارلادا چاوی گێڕا. هەرچۆنێک دەیڕوانی، دەبوایە بچوایەتە ناو ئاوەکە، دەنا بەهیچ جۆرێکی تر ڕێگا نەبوو بەچواردەوری دەریاچەکەدا بڕوات و خۆی بگەیەنێتە کوخە سوورەکە. لەبەرئەوە بڕیاری خۆی دا و بەرەو لای بەلەمەکە ڕۆیشت، خستیە ناو ئاوەکەوە. پاشانیش چووە ناویەوە و سەوڵەکانی لە شوێنی خۆیدا دانا و کەوتە سەوڵ لێدان. پاش ماوەیەکی کەم بەلەمەکە گەیشتە قەراغی ئەوبەر. سۆفیا هاتە خوارەوە و هەوڵیدا بەلەمەکە ڕاکێشێتە قەراغ ئاوەکەوە، بەڵام قەراغی ئاوەکەی ئەمبەر زۆر لەدیوەکەی ئەوبەر لێژتربوو.

تەنها یەکجار ئاوڕێکی دایەوە و ڕێک بەرەو کوخەکە ڕۆیشت.

سۆفیا بەتەواوەتی سەری لە ئازایەتی خۆی سوڕما بوو، خۆشی نەیدەزانی چۆن وێرای ئەوە بکات؟ لەوە دەچوو «شتێکی تر» ڕێنومایی بکات.

بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و لەدەرگای دا. کەمێک وەستا و چاوەڕوانی وەڵام بوو، بەڵام کەس دەرگاکەی لێنەکردەوە. پاشان بە هێواشی دەسکی دەرگاکەی بادا و دەرگاکە کرایەوە.

ـ ماڵەکە! کەس لە ماڵە؟

سۆفیا چووە ناوەوە و خۆی لە ژوورێکی گەورەدا بینییەوە، نەشیدەوێرا دەرگاکە لەپاش خۆی دابخاتەوە.

ئاشکرا دیاربوو کە کەسێک لەوێدا دەژیا. سۆفیا گوێی لە قرچەقرچی سوتانی دارەکانی ناو ئاگردانە کۆنەکە بوو. بێگومان دەبێت کەمێک لەمەوبەر کەسێک لێرەدا بووبێت.

لەسەر مێزی نانخواردنێکی گەورە، ئامێرێکی چاپ و چەند کتێبێکی بەرچاو کەوت، یەک دوو قەڵەم و کۆمەڵێک پەڕەی زۆریشی لەسەر بوو. لەبەردەم ئەو پەنجەرەیەی دەیڕوانیە سەر دەریاچەکە، مێزێک و دوو کورسی دانرابوو. جگە لەمانە، هیچ شتێکی تری ناو ماڵ لە ژوورەکەدا نەبوو، بەڵام لەم سەرەوە بۆ ئەوسەری یەکێک لە دیوارەکان بە کتێبخانەیەکی پڕ لە کتێب داپۆشرابوو. لەسەروی کۆمۆدییەکی سپیشەوە، ئاوێنەیەکی گەورەی خڕی لێبوو، ئاوێنەکە چوارچێوەیەکی مسینی هەبوو.

دوو تابلۆش بە دیوارێکی ترەوە هەڵواسرابوون؛ یەکێکیان وێنەی خانوویەکی سپی بوو کە لە نزیک کەنداوێکی بچوکەوە بوو. بەڕەنگی سووریش بەندەری بەلەمەکان کێشرابوو. لە نێوان خانووەکە و کەنداوەکەدا باخێکی سەرەولێژی لێبوو، کە پڕبوو لە داری سێو و چەند دەوەنێکی چڕ و چەند بەردێک. کۆمەڵێک داری بێتوولاش کە زۆر لەیەکەوە نزیکبوون، بەدەوری باخەکەدا ببوونە پەرژینێک. ناونیشانی تابلۆکەش «بیرکێلی» بوو.

لەتەنیشت ئەم وێنەیەوە، پۆرترێتێکی کۆن هەڵواسرابوو؛ پیاوێک لە تەنیشت پەنجەرەیەکەوە لەسەر کورسیەک دانیشتبوو و کتێبێکی لە باوەشدا دانابوو. لەوێشدا وەک پشتی وێنەکە، وێنەی کەنداوێکی بچوک و چەند دار و بەردێک کێشرابوو. بەدڵنیاییەوە وێنەکە چەند سەد ساڵێک لەمەوبەر کێشرابوو. ناونیشانی ئەم وێنەیەیان «بارکێلی «Berkeleyبوو، ناوی وێنەکێشەکەشی «سمیبرێت» بوو.
بیرکێلی و بارکێلی، چ دوو ناوێکی سەیر و پێکەنیناوین!
سۆفیا لەسەر تەماشاکردنی ناو کوخەکە بەردەوامبوو. لەناو ژوورەکەوە دەرگایەک بۆ سەر چێشتخانەیەکی بچکۆلە دەڕۆیشت. پەرداخ و قاپەکان بە دەمەونخونی لەسەر پارچەیەک پەڕۆ دانرابوون. بەئاسانی دیاربوو تازە شۆردرابوون، چونکە هێشتام کەفێکی کەم بە یەک دوو قاپەوە مابووەوە. لەسەر زەویەکەش تاسێکی بچکۆلە دانرابوو، کەمێک پاشماوەی خواردنی تیابوو. کەواتە گیانلەبەرێکیش لەوێدا دەژیا، سەگێک یان پشیلەیەک .
سۆفیا گەڕایەوە ژوورەکە. دەرگایەکی تر، دەڕۆیشتە سەر ژوورێکی نووستنی بچکۆلە. لەبەردەم جێگای خەوەکەدا، چەند بەتانیەک هەڵچنرابوو. سۆفیا چەند تووکێکی زەردی بە بەتانیەکانەوە بینی. ئەوەش ڕێک ئەو بەڵگەیەبوو کە بەدوایدا دەگەڕا؛ ئەوجا سۆفیا تەواو دڵنیابوو کە ئەلبێرتۆ کنۆکس و هێرمس لەو کوخەدا دەژین.
گەڕایەوە ژوورەکە و لەبەردەم ئاوێنەی سەر کۆمێدییەکەدا وەستا. شوشەکەی مات و ڕووشاوبوو، لەبەرئەوە وێنەیەکی تەڵخ دەهاتە بەرچاوی. سۆفیا دەستی کرد بە دەموچاو گرژکردنی خۆی (هەروەک چۆن لەوەوپێش لە گەرماوەکەی ماڵەوەیاندا دەیکرد)، بێگومان وێنەی ناو ئاوێنەکەش ڕێک هەمان شێوەی ئەوی پیشاندەدایەوە.

بەڵام لە پڕێکدا شتێکی سەیر ڕوویدا؛ یەکجار (بۆ ماوەی چرکەیەک) سۆفیا کچی ناو ئاوێنەکەی بینی کە هەردوو چاوی بەیەکەوە داگرت. سۆفیا لەترسا گەڕایەوە دواوە. ئەگەر خۆی هەردوو چاوی پێکەوە داگرتبێت، کەواتە چۆن توانی کچی ناو ئاوێنەکە ببینێت کە هەردوو چاوی پێکەوە دادەگرێت؟ نەک هەر ئەمەش، لەوە دەچوو کچی ناو ئاوێنەکە چاوی لە سۆفیا داگرتبێت، وەکو ئەوەی پێی بڵێت؛ دەتوانم بتبینم سۆفیا، من لەناوەوەدام و لە دیوەکەی ترەوەم.

سۆفیا بە ئاسانی گوێی لە ترپەی دڵی خۆی بوو لێیدەدا، هاوکات گوێی لە سەگێکیش بوو لە دورەوە دەوەڕی. بێگومان ئەوە هێرمسە دەوەڕێت! لەبەرئەوە دەبوایە بەپەلە جێگاکەی بەجێ بهێشتایە.

ئەوجا لەسەر کۆمۆدییەکەی ژێر ئاوێنەکەدا، چاوی بە جزدانێکی سەوز کەوت. لەناوەوەیدا سەد کرۆنیەک و پەنجا کرۆنیەک و... پێناسەیەکی قوتابخانەی تێدا بوو. پێناسەکە وێنەی کچێکی قژ زەردی لێدرابوو. لەژێر وێنەکەشدا نووسرابوو «هیلدە میوللە کنەی». سۆفیا موچوڕکەیەکی پێدا هات. پاشان دیسانەوە گوێی لەسەگەکە بوو دەوەڕی. ئیدی دەبوایە بەپەلە ئەو ناوەی جێهێشتایە.

کە بەلای مێزەکەدا ڕۆیشت، لە نێوان کتێبەکان و پەڕە هەڵدراوەکاندا، نیگای چووە سەر نامەیەکی سپی. لەسەر نامەکە نووسرابوو بۆ «سۆفیا.«

بەبێ بیرکردنەوە نامەکەی هەڵگرت و خستیە ناو زەرفە زەردەکەوە (کە پەڕەکانی باسەکەی پلاتۆنی تێدابوو) پاشان لە کوخەکە هاتە دەرەوە و دەرگاکەی لەپاش خۆی داخست.

گوێی لێبوو وەڕینی سەگەکە نزیکتر و نزیکتر دەبێتەوە، بەڵام لە هەموو شتێک خراپتر ئەوە بوو کە بەلەمەکەی لێنەمابوو. پاش یەک

دوو چرکە بەلەمەکەی لە ناوەڕاستی دەریاچەکەدا بینی. لەتەنیشت بەلەمەکەشەوە یەکێک لە سەوڵەکان سەر ئاو کەوتبوو.
هەڵبەتە کە هاتبووە ئەمبەرەوە، نەیتوانیبوو بەلەمەکە بەتەواوەتی ڕابکێشێتە قەراغ ئاوەکەوە. دیسانەوە گوێی لەسەگەکەبوو دەوەڕی، هەروەها لەو بەری ئاوەکەوە شتێکیشی بینی لەناو دارەکاندا دەجولایەوە.
سۆفیا چیتر بیری نەکردەوە، بە نامە گەورەکەی دەستیەوە خۆیکرد بەناو دەوەنە چڕەکانی پشتی کوخەکەدا. پاش کەمێک ناچاربوو بە گۆماوێکدا بڕوات، چەند جارێک قاچی ترازا و تا ناوەڕاستی ڕانی کەوتە ئاوەکەوە. بەڵام ناچاربوو بەردەوام بێت. ئەو دەیویست بەهەر شێوەیەک بێت بگاتەوە ماڵەوە!
پاش کەمێکی دی گەیشتە سەر ڕێگایەک. بڵێیت هەمان ئەو ڕێگایە بێت کە لێوەی هاتبوو؟ سۆفیا وەستا و جلە تەڕەکانی گوشی، ئاوەکەش تکە تکە کەوتە سەر ڕێگاکە. ئەوجا دەستیکرد بە گریان.
بۆچی هێندە بێ ئەقڵ بوو؟ لە هەموو شتێک خراپتریش بەلەمەکە بوو! وێنەی بەلەم و سەوڵەکەی ناو دەریاچەکەی لەبەرچاودا لانەدەچوو. هەمووی بێمانا و مایەی شەرمەزاری بوو...
ئێستا بێگومان مامۆستای فەلسەفەکەی گەیشتۆتە دەریاچەکە. پێویستیشی بە بەلەمەکەیە بۆئەوەی بگەڕێتەوە ماڵەوە. سۆفیا زیاتر وەک تاوانبارێک خۆی دەبینی. بەڵام خۆ لە ڕاستیدا مەبەستی نەبوو بەلەمەکە بەربدات.
بەهەرحاڵ، ئەی زەرفەکە! لەوانەیە ئەمەیان خراپترین شت بێت، بۆچی بردی؟ بێگومان لەبەرئەوەی ناوی خۆی پێوە بوو؛ کەواتە بە شێوەیەک لە شێوەکان هەر هی خۆی بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

هەستی دەکرد کە دزە. بەبردنی نامەکەش، بەڕاستی سەلماندی کە سۆفیا لەناو کوخەکەدا بووە.
سۆفیا پەڕەیەکی چکۆلەی لەناو زەرفەکەدا دەرهێنا. تیایدا نووسرابوو؛

چ شتێک لەپێشدا دێت، مریشک یان بیری «مریشک»؟
ئایا مرۆڤ هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەکی زگماکی هەیە؟
جیاوازی نێوان ڕووەک و ئاژەڵ و مرۆڤ چییە؟
بۆچی باران دەبارێت؟
چ شتێک پێویستە بۆ ئەوەی مرۆڤێک ژیانێکی باش بژی؟

سۆفیا نەیدەتوانی یەکسەر بیر لە پرسیارەکان بکاتەوە، بەڵام دەیزانی کە پەیوەندی بە فەیلەسوفی دوای پلاتۆنەوە هەیە. بەڕاست، ناوی ئەریستۆتالیس نەبوو؟
دواتر پاش ڕاکردنێکی دورودرێژ بەناو دارستانەکەدا، چاوی بە پەرژینی ماڵەکەیان کەوت. لەوەدەچوو نوقوم بووبێت و بەمەلە هەوڵبدات بگاتەوە قەراغ ئاوێک. بینینی دار پەرژینەکانی دیوی ئەوبەرەوەش، هەستێکی سەیری پێ دەبەخشی. پاشان کە گەیشتە ناو کوخەکەی، تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد... دە و نیوی نیشاندەدا.
زەرفە گەورەکەی خستە ناو قتووی کێکەکەوە، لەگەڵ پەڕەکانی تردا داینا. لاپەڕەی پرسیارە نوێکانیشی ئاخنیە ناو گۆرەویەکەیەوە.
لەو کاتەدا کە گەیشتە ماڵەوە، دایکی بەتەلەفون قسەی لەگەڵ یەکێکی تردا دەکرد. هەر کە لەم دیو دەرگاکەوە سۆفیای بینی، خێرا تەلەفونەکەی داخستەوە.

ـ لەکوێ بوویت سۆفیا؟
ـ من... پیاسەیەکم کرد... لەناو دارستانەکەدا.
ـ بەڵێ، دەبینم.
سۆفیا هیچ وەڵامێکی نەدایەوە؛ بینی هێشتام ئاو لە کراسەکەیەوە دەتکێ.
ـ تەلەفونم بۆ یۆرون کرد...
ـ بۆ یۆرون؟
دایکی هەندێ جل و بەرگی ووشکی بۆ هێنا. لەکاتی جل گۆڕیندا خەریک بوو فریا نەکەوێت پەڕەی مامۆستای فەلسەفەکەی بشارێتەوە. پاشان پێکەوە ڕۆیشتنە چێشتخانەکەیان و دایکی کاکاوێکی گەرمی لێنا. پاش ماوەک لێی پرسی؛
ـ لەگەڵ کوڕەکەدا بوویت؟
ـ لەگەڵ ئەودا؟
سۆفیا تەنها بیری لە مامۆستای فەلسەفەکەی دەکردەوە.
ـ بەڵێ، بەڵێ لەگەڵ ئەودا. ئەو... «کەروێشکەکەت.»
سۆفیا سەرێکی ڕاوەشاند.
سۆفیا... ئێوە چی دەکەن کاتێک کە پێکەوەن؟ بۆچی ئاوها تەڕبوویت؟
سۆفیا زۆر بە وریاییەوە دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە سەر مێزەکە. بەڵام هاوکات لە ناوەوەیدا پێکەنینی دەهات و دەیووت؛ ئای دایکە نەگبەتەکەم، چۆن بە خۆڕایی ئاوها خۆت نائارام دەکەیت!
دیسانەوە سەری ڕاوەشاندەوە، بەمەش کۆمەڵێک پرسیاری نوێی بەسەر خۆیدا داباراند.
ـ ئێستا دەمەوێت ڕاستی هەموو شتێک بزانم... ئەم شەو لە دەرەوە بوویت؟ بۆچی بەجلەکانتەوە خەوتبوویت؟ هەر کە من خەوم لێکەوت،

ئیتر خێرا بەدزییەوە ڕۆیشتیتە دەرەوە، ها؟ سۆفیا... تەمەنت چواردە ساڵە، لەبەرئەوە دەمەوێت بزانم لەگەڵ کێدا دەچیتە دەرەوە!
ئەوجا سۆفیا دەستی کرد بە گریان. پاشان کەوتە باسکردن. ئەو هێشتام هەر دەترسا، زۆر جاریش کە مرۆڤ دەترسێت، دەست بەقسە دەکات.
پێی وت کە چۆن زوو خەبەری بووبووەوە و باسی پیاسەی ناو دارستانەکەی بۆ کرد. دەربارەی کوخ و بەلەم و ئاوێنە سەیرەکەشی گێڕایەوە. بەڵام هیچ شتێکی دەربارەی نامەکانی کۆرسی فەلسەفە نهێنیەکەی نەدرکاند. ناوی جزدانە سەوزەکەشی نەبرد. نەیدەزانی بۆچی... بەڵام هەستی دەکرد ناچاربێت باسی هیلدە وەک نهێنیەک لەلای خۆی بهێڵێتەوە.
دایکی باوەشێکی پیاکرد. ئەوجا سۆفیا هەستیکرد دایکی باوەڕی پێدەکات و بەدەم گریانەوە گوتی؛
- من هیچ جۆرە دڵدارێکم نیە... تەنها لەبەر ئەوەش گوتم چونکە باسی کەروێشکە سپییەکە زۆر نائارامی کردیت.
- باشە بە ڕاستی ڕۆیشتیتە ناو ژوورەکەی مێجەرەوە؟... دایکی بەسەرنجێکەوە گوتی.
- ژوورەکەی مێجەر؟
سۆفیا هەردوو چاوی زەقکردەوە.
- بەو کوخە چکۆلەیەی ناو دارستانەکە دەگوترێت «ژوورەکەی مێجەر»، چونکە چەندین ساڵ لەمەوبەر، مێجەرێکی پیر لەوێدا دەژیا. کەسێکی کەمێک سەیر و شێتولکەش بوو، سۆفیا. بەڵام ئێستا چ پێویست دەکات بیر لەوە بکەینەوە؟ ماوەیەکی زۆرە کوخەکە چۆڵە.
- تۆ وا دەزانی چۆڵە، دەنا فەیلەسوفێکی تێدا دەژی.

ـ دیسانەوە... بەس شتی سەیر سەیر لە فەنتاسیاکانتا دروست کە!
سۆفیا لە ژوورەکەیدا دانیشتبوو و بیری لە بەسەرهاتەکەی دەکردەوە. خەیاڵی وەک هاتوهاواری سێرکێک جمەی دەهات، سێرکێک بە هەموو فیلە قورسەکان و موهەریجە خۆشەکانیەوە، بە هەموو ئەکرۆپاتە ئازاکان و مەیمونە مەشق پێکراوەکانیانەوە. لەهەمان کاتیشدا وێنەیەک بەردەوام دەهاتەوە بەر چاوی؛ لەناو قوڵایی دارستانەکەدا، بەلەمێک و سەوڵێکی چکۆلە بەسەر ئاوی دەریاچەکەوەن، کەسێکیش بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵەوە، پێویستی بە بەلەمەکەیە...
سۆفیا دڵنیابوو مامۆستای فەلسەفەکەی هیچ ئازارێکی نادات. کاتێکیش بۆی دەردەکەوێت کە سۆفیا لەناو کوخەکەیدا بووە، ئەوا بێگومان لێی دەبوورێت. دەبوایە سۆفیا سوپاسی ئەو کەسە نامۆیەی بکردایە کە پەروەردەکردنی فەلسەفی ئەوی گرتبووە ئەستۆ، بەڵام لەبری ئەوە کارێکی ناپۆڵای کرد... چۆن بتوانێت جارێکی تر هەموو شتێک بخاتەوە سەر باری ئاسایی خۆی؟
سۆفیا پەڕەیەکی لە دەفتەری نامە نووسینە پەمەییەکەی دەرهێنا و یەکسەر دەستیکرد بەنووسین؛
فەیلەسوفی ئازیز؛
من بووم کە سەر لە بەیانی ڕۆژی یەک شەممە هاتمە ناو کوخەکەتەوە. زۆرم پێخۆش بوو بتبینم و چەند باسێکی فەلسەفیت لەگەڵدا تاوتوێبکەم. تا ئێستا لایەنگری پلاتۆنم، هەرچەندە زۆر دڵنیا نیم کە دەڵێت «بیر»ەکان یان تەرزی وێنەییەکان لە هەقیقەتێکی تردا بوونیان هەیە. بێگومان لە ناو ڕۆحماندا بوونیان هەیە، بەڵام ئەمە بەڕای ئێستاکەی من، بەتەواوەتی بابەتێکی جودایە. بەداخەوە دەبێت دان بەوەشدا بنێم کە تا ئەمڕۆکەش زۆر باوەڕم بەوە نیە کە

ڕۆحمان نەمر بێت. بەهەر حاڵ من خۆم هیچ جۆرە یادێکی ژیانە پێشینەییەکانم نیە. ئەگەر دەتوانیت قەناعەتم پێبکەیت کە ڕۆحی داپیرە مردووەکەم، بە باشی لە جیهانی «بیر»دا دەیگوزەرێنێت، ئەوا سوپاسێکی بێپایانت دەکەم.
بەڕاستی لەبەر خاتری فەلسەفە نەبوو کە دەستم بە نووسینی ئەم نامەیە کرد، (کە دواتر دەیخەمە ناو زەرفێکی پەمەییەوە و کلۆیەک شەکریشی تێدەخەم)، بەڵکو تەنها ویستم داوای لێبووردن بکەم کە گوێڕایەڵ نەبووم. زۆر هەوڵم دا بەلەمەکە بەتەواوی ڕاکێشمە قەراغ ئاوەکەوە، بەڵام پێم وابێت زۆر بەهێز نەبووم. لەوانەشە شەپۆلێکی توند دیسانەوە بەلەمەکەی ڕاکێشابێتەوە ناو دەریاچەکە .
هیوادارم توانیبێتت بە ووشکی بگەڕێیتەوە ماڵەوە. ئەگەر نا، ئەوا دەتوانیت دڵنەوایی خۆت بەوە بدەیتەوە کە منیش تەواو تەڕبووم و لەوانەشە هەڵامەتێکی سەخت بگرم. بەڵام ئەمەیان گوناهی خۆمە.
دەستم بۆ هیچ شتێکی ناو کوخەکەت نەبرد. بەڵام بەداخەوە بەرامبەر نامەی سەر مێزەکە لاوازبووم و هەڵمگرت. بێگومان لەبەرئەوە نەبوو کە بمەوێت شتێکت لێبدزم، بەڵام کە ناوی خۆمم لەسەر زەرفەکە بینی، ئیدی لە چرکەیەکی سەرلێشێواویدا وامزانی هی خۆمە. بە ڕاستی داوای لێبووردنت لێدەکەم و پەیمانت دەدەمێ جارێکی تر نائومێدت نەکەم.
تێبینی؛ هەر ئێستا بەوردی بیر لە پرسیارە نوێکان دەکەمەوە.
تێبینیەکی تر؛ ئایا ئاوێنەی سەر کۆمۆدییەکە، ئاوێنەیەکی ئاساییە یاخود ئاوێنەیەکی تەلیسماوییە؟ بۆیە ئەم پرسیارە دەکەم، چونکە من ڕانەهاتووم وێنەی خۆم لەناو ئاوێنەیەکدا ببینم و هەردوو چاوم بەیەکەوە لێ دابگرێت!

سڵاوی دڵسۆزانەی قوتابیە ئارەزوومەندەکەت.
سۆفیا.
سۆفیا پێش ئەوەی نامەکە بخاتە زەرفەکەوە، دوو جاری خوێندەوە. هەرچۆنێک بێت هەروەک نامەکەی پێشوو زۆر ڕەسمی نەبوو. پێش ئەوەی بڕواتە چێشتخانەکە و بەدزییەوە کلۆیەک شەکر بهێنێت، پەڕە نوێکەی دەرهێنا و خستیە بەر دەمی.
«چی لەپێشدا دێت، مریشک یان بیری مریشک؟» ئەم پرسیارە هێندەی هەمان مەتەڵە کۆنەکەی مریشک و هێلکەکە سەخت بوو. بەبێ هێلکە، مریشک دروست نابێت، بەڵام لەهەمان کاتدا بەبێ مریشکیش، هێلکە نایەتە بوون... بەڵام ئایا بە ڕاستی وەڵامی ئەم پرسیارە هێندەی مەتەڵی مریشک و هێلکەکە سەختە؟ سۆفیا دەیزانی کە پلاتۆن لە چ باوەڕێکدا بووە. ئەو دەیگوت؛ بیری مریشک، زۆر پێش ئەوەی هیچ مریشکێک لە جیهانی هەستدا بوونی هەبووبێت، لە جیهانی بیردا بوونی هەبووە. بەپێی بڕوای پلاتۆن، ڕۆح پێش ئەوەی بێتە ناو لەشەوە، بیری مریشکی «بینیوە». بەڵام ئایا ڕێک لێرەدا نەبوو کە سۆفیا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە پلاتۆن بەهەڵەدا چووە؟ کەسێک کە لەوەوپێش نە مریشکی زیندوو و نە وێنەی مریشکی دیبێت، ئەوا ناتوانێت هیچ جۆرە بیرێکی دەربارەی مریشک هەبێت. لەدوای ئەوەوە یەکسەر هاتە سەر پرسیاری دواتر؛
»ئایا مرۆڤ هیچ جۆرە بیرێکی زگماکی هەیە؟«
زۆر گوماناویە... سۆفیا لەدڵی خۆیدا گوتی. زۆر سەختبوو باوەڕبکات کە کۆرپەی تازە لەدایک بوو، لە بیردا دەوڵەمەند بن. بێگومان ناتوانین زۆر دڵنیابین، چونکە هەرچەندە منداڵەکە هیچ جۆرە زمانێک نازانێت، بەڵام ئەمە مەرج نیە مانای ئەوە بگەیەنێت کە منداڵەکە

مێشکی تەواو بەتاڵە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا پێش ئەوەی شتێک دەربارەی شتەکانی جیهان بزانین، ئایا ناچارنین لەپێشدا بیان بینین؟

جیاوازی نێوان ڕووەک و ئاژەڵ و مرۆڤ چیە؟ سۆفیا یەکسەر جیاوازیەکی تەواو ئاشکرای هاتە بەرچاو. ئەو پێی وانەبوو ڕووەکێک هەبێت کە خاوەنی ژیانێکی ڕۆحی ئاڵۆز بێت. کێ بیستویەتی گوڵە نێرگزێک بەدەست ئازاری دڵدارییەوە بناڵێنێت؟ ڕووەک تەنها ئەوەندەیە کە خواردن هەڵدەمژێت و نەشونما دەکات. پاشان کۆمەڵێک تۆوی ورد بەرهەم دێنێ و بەهۆیەوە خۆی زیاد دەکات. جگە لەمانەش هیچ شتێکی دی دەربارەی ڕووەک نیە کە شایانی باسکردن بێت. سۆفیا لەو بڕوایەدابوو هەمان شتیش (هەروەک ڕووەکەکە) دەربارەی ئاژەڵ و مرۆڤ بگوترێت. بەڵام جگە لەمە، ئاژەڵەکان خاسیەتی تریشیان هەیە، بۆ نمونە دەتوانن بجولێنەوە (کێ بینیویەتی گوڵێک ڕاکردنی شەست مەتری بکات؟). نیشاندانی جیاوازی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵیش کەمێک سەختتر بوو. مرۆڤ دەتوانێت بیربکاتەوە، بەڵام ئەی ئاژەڵەکان چی، ناتوانن؟ سۆفیا تەواو لەو بڕوایەدا بوو کە شێریکان «پشیلەکەی» دەتوانێت بیربکاتەوە. بەلایەنی کەمەوە بە شێوەیەکی بەئاگا هەڵسوکەوتی دەکرد. بەڵام ئایا دەیتوانی بیر لە پرسیارە فەلسەفیەکان بکاتەوە؟ ئایا پشیلەیەک بیر لەوە دەکاتەوە کە جیاوازی نێوان ڕووەک و ئاژەڵ و مرۆڤ چیە؟ بێگومان نا! پشیلەیەک دەتوانێت هێندەمان نیشان بدات کە دڵی خۆشە یان نا، بەڵام ئایا لە خۆی ئەپرسێت کە خوا هەیە؟ یاخود خاوەنی ڕۆحێکی نەمرە؟ پاش بیرکردنەوە، سۆفیا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە وەڵام دانەوەی پرسیارەکە تەواو گومانDاوییە. بەڵام لێرەدا، هەروەک منداڵەکە و بیری

زگماکی، هەمان کێشەمان تووش دەبێت. هەروەک چۆن ئەو پرسیارانە سەختە لەگەڵ پشیلەیەکدا گفتوگۆی لەسەر بکرێت، بەهەمان شێوەش لەگەڵ کۆرپەیەکی تازە لەدایک بووشدا هەر سەختە .

«بۆچی باران دەبارێت؟» سۆفیا شانەکانی هەڵتەکاند. بێگومان لەبەرئەوەیە کە دەریاکان دەبنە هەڵم و هەورەکان چڕ دەبنەوە و دەبنە باران. هێشتام لە پۆلی سێ بوو کە ئەوەی دەزانی. بێگومان دەکرێت بڵێین، باران بۆیە دەبارێت، بۆ ئەوەی ڕووەک و ئاژەڵەکان نەشونما بکەن، بەڵام ئایا ئەمە ڕاستە؟ ئایا پەلکە زێڕینە لە ڕاستیدا هیچ ئامانجێکی هەیە؟

بەلایەنی کەمەوە شتێک دەربارەی ئامانج لە دووتوێی دواهەمین پرسیاردا هەبوو؛ «چی پێویستە بۆ ئەوەی مرۆڤێک بە باشی بژی؟» مامۆستای فەلسەفەکەی لەوەوبەر شتێکی دەربارەی ئەم بابەتەی لە کۆرسی فەلسەفەکەیدا نووسیبوو. هەموو مرۆڤێک پێویستی بە خواردن و گەرمی و خۆشەویستی و سۆزە. ئەم شتانە بەلایەنی کەمەوە چەند مەرجێکی سەرەتاین بۆ ئەوەی مرۆڤێک بتوانێت ژیانێکی باش بژی. پاشانیش دەیگوت هەموو مرۆڤێک پێویستی بە دۆزینەوەی وەڵامی چەند پرسیارێکی فەلسەفیە. جگە لەمانەش، زۆر گرنگە مرۆڤ ڕێک ئەو کارە بکات کە پێی خۆشە. بۆ نمونە ئەگەر کەسێک ڕقی لە هاتوچۆ و ڕێگاوبان بێت، ئەوا زۆر بەختەوەر نابێت ئەگەر ببێتە شۆفێری تاکسیەک. یاخود ئەگەر کەسێک ڕقی لە ئامادەکردنی وانەکانی بێت، ئەوا کارێکی باش ناکات گەر ببێتە مامۆستا. سۆفیا زۆر دڵی بە ئاژەڵ خۆشبوو. لەبەرئەوە حەزیدەکرد ببێتە پزیشکی ئاژەڵان. بەهەرحاڵ، سۆفیا لەو بڕوایەدا نەبوو کە پێویستیمان بە بردنەوەی ملیۆنێک هەبێت لە یانسیبدا، بۆ ئەوەی بتوانین ژیانێکی

باش بژین. بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئێمە پەندێکمان هەیە دەڵێت «بێ ئیشی ڕەگی هەموو خراپەکارییەکە.»
سۆفیا هەتاوەکو ئەو کاتەی دایکی بانگی نەکرد بۆ نانخواردن، لە ژوورەکەیدا نەهاتە دەرەوە. دایکی گۆشت و پەتاتەی فڕنی ئامادەکردبوو. چ خۆشە! مۆمەکانیشی داگیرساندبوو. بۆ پاش نانخواردنیش، ترێ و کێکی دانابوو.
باسی بابەتی هەمەڕەنگیان دەکرد. ڕۆژی لەدایک بوونی پانزە ساڵەی سۆفیا تەنها چەند هەفتەیەکی ماوە، لەبەرئەوە دایکی لێی پرسی؛
ـ ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونەکەت چۆن ساز دەکەیت؟
سۆفیا شانەکانی هەڵتەکاند.
ـ کەس بانگ ناکەیت؟ مەبەستم ئەوەیە، ئاهەنگێک ناگێڕیت؟
ـ لەوانەیە...
ـ دەتوانین مارتە و ئانا ماریا بانگکەین. بێگومان یۆرونیش. لەوانەشە یۆرگن... بەڵام خۆت باشتر دەتوانیت بڕیار بدەیت. دەزانیت، من هێشتام ڕۆژی لەدایکبوونی پانزە ساڵەم زۆر بەباشی لە بیرە. هەستیش ناکەم هێندەی بەسەردا تێپەڕیبێت!... سۆفیا، هەر لەو کاتەوە هەستم دەکرد کە گەورەبووم. سەیر نیە؟ لەو بڕوایەدا نیم لەو کاتەوە هیچ گۆڕابم.
ـ بەڵێ وایە، لە ڕاستیشدا هیچ نەگۆڕاویت. هیچ شتێک «گۆڕانکاری» بەسەردا نایەت. تۆش تەنها گەشەت کردووە و پیرتر بوویت و هیچی تر.
ـ ئمم... ئەمەیان لە قسەی گەورە دەچێت. مەبەستم ئەوەیە هەست ئەکەم زۆر خێرا تێپەڕی...

## ئەریستۆتالیس «Aristoteles»

## ...پیاوێکی وردبینی مەنهەجی بوو و دەیویست بۆچوونەکانمان ڕێک بخات...

سۆفیا، لەو کاتەدا کە دایکی سەرخەوێکی دەشکاند، بەرەو کوخەکەی ڕۆیشت. کلۆیەک شەکری خستە ناو نامە پەمەییەکەوە و لەسەری نووسی؛ «بۆ ئەلبێرتۆ.«

هیچ نامەیەکی نوێی بۆ نەهاتبوو، بەڵام پاش چەند خولەکێک گوێی لە سەگەکە بوو نزیک دەکەوتەوە.

ـ هێرمس! سۆفیا هاواریکرد و پاش کەمێک سەگەکە خۆیکرد بە کوخەکەدا و نامەیەکی زەردی گەورەشی بەدەمەوە گرتبوو.

ـ سەگە زیرەکەکە!

سۆفیا دەستی کردە ملی سەگەکە، ئەویش بە چەشنی باوبۆران هەناسەبڕکێ و مشەمشی بوو. زەرفەکەی کە شەکرەکەی تێدا بوو، دەریهێنا و خستیە دەمیەوە. پاشان سەگەکە لە کوخەکە هاتە دەرەوە و دیسانەوە بەرەو ناو دارستانەکە بۆی دەرچووەوە.

سۆفیا لە کاتی کردنەوەی نامەکەدا کەمێک نائارامبوو، بڵێیت هیچ شتێکی دەربارەی کوخ و بەلەمەکە تێدا بێت؟

نامەکە هەر هەمان شێوەی پەڕەکانی پێشوی تێدابوو و بە کلێبسێک پێکەوە گرێدرابوون. بەڵام ئەم جارەیان پەڕەیەکی بچکۆلەی جوداشی تێدا بوو، لەسەری نووسرابوو؛

ئازیزم خاتونی پۆلیسی نهێنی! یان با بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆتر بیڵێم، خاتونی دز. پۆلیسم ئاگاداری کارەکەت کردەوە...

نا، نا، بێگومان نا! گاڵتە دەکەم، یەکجار وا تووڕە نەبووم. ئەگەر تۆ هێندە مەبەستت بێت وەڵامی مەتەڵە فەلسەفیەکان بدۆزیتەوە، ئەوا کارەکە بە باشی دەگەڕێتەوە. تەنها ئەوەندەیە کە جێگەی داخە بە ناچاری دەبێت بگوێزمەوە. بەڵام بێگومان خەتای خۆمە، دەبوایە بمزانیبایە کە تۆ لەو کەسانەیت کە دەیانەوێت بچنە سەر ڕەگی شتەکان.
لەگەڵ سڵاومدا، ئەلبێرتۆ.

سۆفیا لە خۆشیدا هەناسەیەکی هەڵکێشا. کەواتە تووڕە نەبووە. بەڵام بۆچی ناچارە بگوێزێتەوە؟
پەڕە گەورەکانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و بەڕاکردن خۆی گەیاندە ژوورەکەی. باشتر وابوو کاتێک دایکی خەبەری دەبێتەوە، ئەم لەماڵەوە بێت.
پاشان بە ڕاشکاوی لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت و دەستیکرد بە خوێندنەوە.

### *فەیلەسوف و پیاوی زانست*

ئازیزم سۆفیا، بێگومان تیۆری «بیر»ەکانی پلاتۆن سەری سوڕماندوویت، لە ڕاستیدا تۆش یەکەمین کەس نیت ئەو هەستەی هەبێت. نازانم گەر بەبێ لێکدانەوە باوەڕت بە هەمووی کردبێت، یان چەند نارەزایی و ڕەخنەیەکت هەبووبێت. گەر ئەمەی دووهەمیانە، ئەوا دەتوانیت دڵنیابیت کە هەمان ڕەخنە و نارەزایی یەکەمجار لە لایەن ئەریستۆتالیسەوە (384 تا 322ی پێش زاین) وروژێندرا. ئەو بە درێژایی 20 ساڵ لە ئەکادیمیاکەی پلاتۆندا قوتابی بوو.

ئەریستۆتالیس خۆی خەڵکی ئەسینا نەبووە، بەڵکو ماکەدۆنی بووە. پلاتۆن تەمەنی 61 ساڵ بوو کە ئەریستۆتالیس هاتە ناو ئەکادیمیاکەیەوە. باوکی پزیشکێکی بەناوبانگ و پەسەنکرابوو، لە هەمان کاتیشدا زانای سروشتیش بووە. هەر ئەم ڕابووردوەی ئەریستۆتالیس لە ئێستاوە شتێکمان دەربارەی پڕۆژە فەلسەفیەکەی پێ دەڵێت. ئەو زیاتر خولیای سروشتی زیندوو بووە. ئەریستۆتالیس نەک هەر تەنها دواهەمین فەیلەسوفی مەزنی ئەسینا بوو، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا یەکەمین گیانەوەرناسی گەورەی ئەوروپاش بوو.
ئەگەر کەمێک توندڕەوانە دەربیبڕین، ئەوا دەتوانین بڵێین پلاتۆن هێندە سەرقاڵی فۆڕم یان «بیر»ە نەمرەکان بوو، کە تاڕادەیەک هیچ جۆرە تێبینیەکی تایبەتیی بە دیاردەکانی سروشت نەدەدا. ئەریستۆتالیسیش ڕێک خولیای ئەو دیاردانە بوو، یان ئەو شتەی کە بەزمانی ئەمڕۆکە پێ دەڵێن «پڕۆسێسی سروشت.»
وە ئەگەر توونڕەوتریش دەربیبڕین، ئەوا دەتوانین بڵێین پلاتۆن پشتی لە جیهانی هەستکرد و چاوی لە ئاستی هەموو ئەو شتانەی چواردەورمان داخست. (دەیویست لە ئەشکەوتەکە بێتە دەرەوە و تەماشای جیهانی نەمری «بیر» بکات!). ئەریستۆتالیسیش ڕێک بە پێچەوانەی ئەوەوە؛ بەچوارپەل خەریکی خوێندنی ماسی و بۆق و خەشخاشەکان و گوڵە ئامینۆنەکان بوو (*ڕووەکێکە گوڵی زەرد و شین و سپی دەگرێت.و).
دەتوانین بڵێین پلاتۆن تەنها ئەقڵی بەکاردەهێنا، بەڵام ئەریستۆتالیس هەستەکانیشی لەگەڵدا بەکاردەهێنا.
تەنانەت لە شێوازی نووسینیشیاندا، جیاوازیەکی تەواو ئاشکرا لەنێوانیاندا بەدیدەکەین. پلاتۆن شاعیر و ئەفسانە خوڵقێنەر بوو،

بەڵام نووسینەکانی ئەریستۆتالیس هەر وەک فەرهەنگەکان ووشک و سەخت و دژوارن، هەرچەندە لێکۆڵینەوەی تەڕوبڕی سروشت لە ناواخنی زۆربەی ئەو بەرهەمانەدان کە نووسیونی.
سەرچاوە کۆنەکان باس لە 170 ناونیشان دەکەن کە لەلایەن ئەریستۆتالیسەوە نووسرابن. لە هەموو ئەو نووسینانەش تەنها 47 دانەی پارێزراوە. هەڵبەتە لێرەدا باس لە کتێبی تەواوبوو ناکەین، بەڵکو زیاتر تێبینیەکانی ئەریستۆتالیسە کە لەسەر وانەکانی نووسیبوونی. دیسانەوە دەبێت لەیادمان بێت کە فەلسەفە لە سەردەمی ئەویشدا چالاکیەکی دەمگۆ (*شەفەیی) بوو.
نرخی ئەریستۆتالیس لەناو کەلتوری ئەوروپیدا دەگەڕێتەوە بۆ خاڵێکی دیاریکراو؛ ئەو بوو کە بنەڕەتی زمانی زانستی دامەزراند، ئەو زمانەی کە تا ئێستاکەش زانستە جیاوازەکان سوودی لێ وەردەگرن. ئەریستۆتالیس ئەو سیستماتیکە (*واتە ڕێک خەرێک کە شتەکان بە پێی شێوازێکی تایبەتی بەدەستور و بەرنامەوە پۆل پۆل دەکات.و) بوو کە بنچینەی زانستە جۆراوجۆرەکانی دامەزراند و ڕێکی خستن.
ئەریستۆتالیس لەسەر هەموو زانستەکان شتی دەنووسی، لەبەرئەوە لێرەدا تەنها چەند لایەنێکی هەرە گرنگیان دەخەمە ڕوو. تا ئێستا زۆرت دەربارەی پلاتۆن و تیۆری «بیر»ی پلاتۆنت بیست، لەبەرئەوە لە پێشدا باسی ئەوەت بۆ دەکەم کە چۆن ئەریستۆتالیس تیۆریەکەی پلاتۆنی بە بەڵگەوە ڕەتکردەوە. پاشانیش تەماشای چۆنیەتی دامەزراندنی فەلسەفەی تایبەت بە خۆی دەکەین. ئەریستۆتالیس هەموو ئەو شتانەی لەوەوپێش لەلایەن فەیلەسوفە سروشتیەکانەوە گوترابوو، کۆیکردنەوە و پوختەی کردن. دواتریش ڕوونی دەکەینەوە کە

ئەو چۆن تێگەیشتنەکانمان (*مەفهومەکانمان.و) ڕێک دەخات و چۆن چۆنیش بنچینەی بابەتی لۆژیک وەک زانستێک دادەمەزرێنێت. دواجاریش کەمێکت دەربارەی بۆچوونەکانی ئەریستۆتالیس بۆ باس دەکەم کە لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگان.
ئەگەر بەم مەرجانە ڕازیت، ئەوا با قۆڵی لێ هەڵکەین و دەست پێبکەین.

### نەبوونی بیری زگماک

پلاتۆن هەروەک هەموو فەیلەسوفەکانی پێش خۆی، دەیویست لەنێو هەموو گۆڕانکاریەکاندا شتێکی نەمر و نەگۆڕ بدۆزێتەوە. پاشان «بیر»ە بێ کەموکوڕییەکانی داهێنا، کە بەبڕوای ئەو لەسەرو جیهانی هەستەکانەوە بوون. جگە لەوەش بەبڕوای پلاتۆن «بیر»ەکان لە هەموو دیاردەکانی سروشت ڕاست و دروستتریێکن. واتە لە پێشدا «بیر»ی ئەسپ هەبووە، پاشان هەموو ئەسپەکانی جیهانی هەست، وەک وێنە سێبەرییەکانی سەر دیواری ئەشکەوتەکە دەرکەوتن. بەم جۆرەش «بیر»ی مریشک لەپێش مریشک و هێلکەشدا بوونی هەبووە.
بەڕای ئەریستۆتالیس، پلاتۆن هەموو بابەتەکەی هەڵگێڕاوەتەوە. ئەو هاوبڕوای مامۆستاکەی بوو کە ئەسپێکی دیاریکراو «دەگۆڕێ» و هیچ ئەسپێکیش بۆ هەتاهەتایە ناژی. هەروەها لەو بڕوایەشدا بوو کە فۆڕمی ئەسپەکە نەمر و نەگۆڕبێت. بەڵام دەیگوت «بیر»ی ئەسپ تەنها بیرۆکەیەکە کە ئێمەی مرۆڤ خوڵقاندومانە و هیچی تر، ئەویش پاش بینینی چەندین ئەسپ لامان گەڵاڵە بووە. واتە «بیر» یان فۆڕمی ئەسپەکە خۆی لەخۆیدا بوونی نیە. «فۆڕم»ی ئەسپ بەلای

ئەریستۆتالیسەوە، خاسیەتی ئەسپەکەیە _یان بەزمانی ئەمڕۆکە بیڵێین، ڕەگەزی ئەسپەکەیە.
بەپوختی؛ بەلای ئەریستۆتالیسەوە «فۆڕم»ی ئەسپ، مانای ئەو شتانە دەبەخشێت کە لە نێوان هەموو ئەسپەکاندا هاوبەشە. لێرەدا نمونەی قالبەکان ناگونجێت، لەبەرئەوەی بوونیان تەواو سەربەستە لەو کێکانەی بەهۆیانەوە دروستدەکرێن. ئەریستۆتالیس باوەڕی بەهیچ جۆرە فۆڕمێک نەبوو، کە لەسەر ڕەفەی تایبەتی خۆیان لەدەرەوەی سروشتدا دانرابن. بەڵکو بەلای ئەریستۆتالیسەوە بەپێچەوانەوەیە؛ «فۆڕم»ەکان لەناو شتەکاندان، چونکە خاسیەتی تایبەتی شتێکی دیاریکراون.
بەم شێوەیەش ئەریستۆتالیس لەگەڵ پلاتۆندا ناتەبایە کە دەیگوت «بیر»ی مریشک لەپێش مریشکدا بوونی هەبووە. ئەو شتەی ئەریستۆتالیس پێی دەڵێت «فۆڕم»ی مریشک لەناو هەموو تاکە مریشکێکدا، وەک خاسیەتی تایبەتی مریشک بوونی هەیە، بۆ نمونە خاسیەتی هێلکە کردن. لەم ڕوانگەیەشەوە مریشکەکە و «فۆڕم»ی مریشک هەروەک ڕۆح و لەش پێکەوە نووساون.
بەم جۆرە کورتەی گرنگترین ڕەخنەی ئەریستۆتالیسمان دەربارەی تیۆریەکەی پلاتۆن نیشاندا. بەڵام دەشێ لێرەدا سەرنجی ئەوە بدەیت کە ئێمە باس لە وەرچەرخانێکی گەورەی تەرزی بیرکردنەوە دەکەین. بەلای پلاتۆنەوە، باڵاترین پلەی هەقیقەت لەو شتە پێکهاتووە کە بە ئەقڵ بیری لێدەکەینەوە. بەڵام بەلای ئەریستۆتالیسەوە بەهەمان شێوە ڕوون و ئاشکرایە کە باڵاترین پلەی هەقیقەت ئەو شتەیە کە بە هەستەکانمان هەستی پێ دەکەین. بەپێی بڕوای پلاتۆن هەموو شتێک کە لە سروشتدا دەیبینین تەنها بەرپەرچدانەوەی شتێکە کە لە

جیهانی «بیر»دا بوونی هەیە، وە لێرەشەوە لە ڕۆحی مرۆڤدا. ئەریستۆتالیسیش ڕێک پێچەوانەکەی دەبینی؛ ئەوەی کە لە ڕۆحی مرۆڤدایە، تەنها بەرپەرچدانەوەی شتەکانی سروشتن و هیچی تر. بەم جۆرەش لای ئەو سروشت جیهانی ڕاستەقینەیە. بەپێی دیدەی ئەریستۆتالیس، پلاتۆن لە وێنەیەکی ئەفسانەیی جیهاندا گیریخواردووە، لەوێدا کە مەزەنەکردنی مرۆڤ لەگەڵ جیهانی ڕاستەقینەدا ئاڵوگۆڕدەکرێت.

بەلای ئەریستۆتالیسەوە هیچ شتێک، ئەگەر لەوەوپێش هەستەکان پەییان پێنەبردبێت، ئەوا لە ئاگایدا بوونیان نیە. گەر پلاتۆن بوایە دەیگوت؛ هیچ شتێک لە سروشتدا بوونی نیە، گەر لەوەوپێش لە جیهانی «بیر»دا بوونی نەبووبێت. پلاتۆن، لە ڕوانگەی ئەریستۆتالیسەوە بەشێوەیەک لە شێوەکان «ژمارەی شتەکان دووجا دەکاتەوە». بۆ نمونە ئەو پەنای دەبردە بەر «بیر»ی ئەسپ، تەنها بۆ ئەوەی تاکە ئەسپێک لێکبداتەوە. بەڵام ئەمە چ جۆرە لێکدانەوەیەکە سۆفیا؟ مەبەستم ئەوەیە ئەی «بیر»ی ئەسپ لە کوێوە هاتووە؟ بڵێیت ئەسپێکی سێهەمیش لەسەرو ئەوەوە هەبێت و ئەم «بیر»ی ئەسپە تەنها کۆپییەکی ئەو بێت؟

ئەریستۆتالیس پێی وابوو هەموو شتێک، هەموو بیرکردنەوەکانمان، لە ڕێگەی ئەو شتانەی کە بینیومانن یان بیستوومانن هاتوونەتە ناو ئاگاییمانەوە. بەڵام لەهەمان کاتدا دەیگوت ئێمە خاوەنی ژیرێتییەکی زگماکیشین. ئێمە توانایەکی زگماکمان هەیە کە لە ڕێگەیەوە هەموو مۆرکە هەستیەکان ڕێکدەخەین و لە گروپ و پۆلی جیاجیادا دایاندەنێین. بەم جۆرەش دەستەواژەی وەک «بەرد» و «ڕووەک» و

«ئاژەڵ» و «مرۆڤ» سەرهەڵدەدات. بە هەمان شێوەش دەستەواژەی وەک «ئەسپ» و «قرژاڵی دەریایی» و «بوولبولی کەناری» دێتە بوون.
ئەریستۆتالیس نکۆڵی لەوە نەدەکرد کە مرۆڤ ژیریێتیەکی زگماکی هەیە. بە پێچەوانەوە، بەلای ئەوەوە خاسیەتی دیاری مرۆڤ کتومت ژیریێتییە. بەڵام بەپێی ئەو هەتاوەکو ئەو کاتەی هەستەکانمان هەست بە شتێک نەکەن، ئەقڵمان بە «بەتاڵی» دەمێنێتەوە. بەم جۆرەش مرۆڤ بەلای ئەریستۆتالیسەوە هیچ شێوە «بیر»ێکی زگماکی نیە.

## فۆڕم خاسیەتی شتە

پاش ئەوەی ئەریستۆتالیس بۆچوونی خۆی بەرامبەر تیۆری پلاتۆن دەرخست، ئەوجا گوتی هەقیقەت لە بەشی جیاجیا پێکهاتووە و تێکەڵەیەکە لە مادە و فۆڕم. «مادە»کە بەشی مەتریالی شتێک پێکدەهێنێت، لە کاتێکدا «فۆڕم»کە خاسیەتی تایبەتی شتەکەیە.
گریمان مریشکێک لەبەردەمتا باڵەکانی ڕادەوەشێنێت، سۆفیا. «فۆڕم»ی مریشکەکە کتومت ئەوەیە کە باڵەکانی لەیەک دەدات، گارەگار دەکات، هێلکە دەکات. واتە «فۆڕم»ی مریشکەکە خاسیەتە تایبەتییەکانی مریشکەکەیە، یاخود ئەو چالاکیانەیە کە مریشکەکە دەیانکات. کاتێکیش مریشکەکە دەمرێت (واتە چیتر ناتوانێت گارەگار بکات)، ئەو کاتە «فۆڕم»ی مریشکەکەش بوونی نامێنێت. تەنها شت کە دەمێنێتەوە «مادە»ی مریشکەکەیە (جێگەی داخە سۆفیا!)، بەڵام ئیدی لەوە زیاتر پێی ناگوترێت «مریشک.»
هەروەک لەوەوپێش گوتم، ئەریستۆتالیس گرنگی بە گۆڕانکاریەکانی سروشت دەدا؛ لەناو «مادە»دا هەمیشە توانایەک هەیە بۆ ئەوەی بیگەیێنێتە «فۆڕم»ێکی دیاریکراو. دەتوانین بڵێین ئامانجی «مادە»،

بەهەقیقەتکردنی ئەو توانایەیە کە لەناوەوەیدا بوونی هەیە. هەموو گۆڕانکاریەکانی سروشت، بەپێی ئەریستۆتالیس، فۆڕم وەرگرتنەوەی مادەیە، لە «تواناوە» بۆ «هەقیقەت.«
دەزانم بابەتەکە کەمێک ناڕوونە، بەڵام دەخوازم بەهۆی چیرۆکێکی خۆشەوە زیاترت بۆ ڕوونبکەمەوە؛ جارێکیان پەیکەرتاشێک لەسەر پارچە گرانیتێک (*جۆرە بەردێکی ڕەقە.و) ئیشی دەکرد. هەموو ڕۆژێک خەریکی چەکوشکاری و داتاشینی بەردە بێ شێوەکەی بوو. ڕۆژێکیان کوڕێکی منداڵ چووە میوانی و لێی پرسی؛ «بەدوای چیدا دەگەڕێیت؟» پەیکەرتاشەکەش وەڵامی دایەوە و گوتی؛ «چاوەڕوان بە، پاشان دەیبینی». پاش چەند ڕۆژێک منداڵەکە هاتەوە و پەیکەرتاشەکەش ئەسپێکی جوانی لە پاچە گرانیتەکە دەرهێنابوو. کوڕەکە زۆر بەسەرسامیەوە تەماشای ئەسپەکەی کرد و پاشان ڕووی کردە پەیکەرتاشەکە و گوتی؛ «چۆن زانیت ئەو ئەسپە لەناو بەردەکەدا بوو؟.«
بەڕاست چۆن زانی؟ بەشێوەیەک لە شێوەکان، پەیکەرتاشەکە شێوەی ئەسپەکەی لەناو پارچە گرانیتەکەدا بینیبوو. ڕێک لەبەرئەوەی پارچە گرانیتەکە توانایەکی زگماکی تێدابوو، بۆ ئەوەی ببێتە فۆڕمی ئەسپێک. ئەریستۆتالیس لەو بڕوایەدا بوو هەموو شتەکانی سروشت، توانایەکی زگماکیان تییێدابێت و بتوانن ببنە «فۆڕم»ێکی دیاریکراو.
ئێستاش دێینەوە سەر باسی مریشک و هێلکەکە... هێلکەی مریشک توانایەکی زگماکی تێدایە بۆ ئەوەی ببێتە مریشک. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە هەموو هێلکەی مریشکێک ببنە مریشک، وەک دەزانیت هەندێکیان دەبنە نانی بەیانی (وەک دەڵەمە و ئۆملێت و هێلکە و ڕۆن) لەم کاتەشدا «فۆڕم»ی زگماکی هێلکەکە نابێتە هەقیقەتێک.

بێگومان ئاشکراشە کە هێلکەیەکی مریشک نابێتە قازێک، لەبەرئەوەی ئەم توانایە لە هێلکەی مریشکێکدا بوونی نیە. کەواتە «فۆڕم»ی شتێک دوو لایەنمان بۆ دەردەخات؛ تواناکانی شتەکە و هەروەها سنووربەندیەکانیشی.

ئەریستۆتالیس لەباسەکەیدا دەربارەی «فۆڕم» و «مادە»، تەنها بیر لە بوونەوەرە زیندووەکان ناکاتەوە. بەڵکو دەڵێت هەروەک چۆن «فۆڕم»ی مریشکێک لەوەدایە کە گارەگار بکات و باڵەکانی لەیەک بدات و هێلکە بکات، بە هەمان شێوەش «فۆڕم»ی بەردێک بۆ نمونە لەوەدایە کە لەکاتی فڕێدانیدا بکەوێتەوە خوارەوە بۆ سەر زەوی. هەروەک چۆن مریشک ناتوانێت واز لە گارەگارەکەی بهێنێت، بەردیش بە هەمان شێوە ناتوانێت نەکەوێتەوە خوارەوە. بێگومان دەتوانیت بەردێک هەڵبگریت و بەرو ئاسمان فڕی بدەیت، بەڵام ناتوانیت بەردەکە فڕێبدەیتە سەر مانگ، چونکە سروشتی بەردەکە کەوتنە خوارەوەیە. (کەمێک ئاگاداربە گەر ئەم تاقیکردنەوەیەت کرد، چونکە بەردەکە زوو تۆڵەی خۆی دەسێنێتەوە. لەماوەیەکی یەکجار کەمدا دەکەوێتەوە سەر زەوی، خواش ئاگای لەو کەسە بێت کە لە ئاستی کەوتنە خوارەوەی بەردەکەدا وەستاوە!).

**هۆی مەبەست**

پێش ئەوەی دەست لە باسی ئەو «فۆڕم»ە هەڵبگرین کە هەموو شتێکی زیندوو و مردوو هەیەتی وە لەهەمان کاتیشدا شتێکمان دەربارەی بواری چالاکی شتەکان بۆ دەخاتە ڕوو، حەز دەکەم بڵێم ئەریستۆتالیس تێگەیشتنێکی سەرسوڕهێنەری سەبارەت بە دیاردەکانی سروشت هەبووە.

لە سەردەمی ئێستاماندا کە باسی «هۆی» شتێک لە شتەکان دەکەین، ئەوا مەبەستمان لە چۆنیەتی ڕوودانی شتەکەیە؛ شوشەکە شکا، لەبەرئەوەی پیتەر بەردێکی پێدا کێشا. پێڵاوێکمان هەیە، چونکە پینەچییەک پارچە چەرمەکانی پێکەوە نووساندووە و دووریویەتەوە. بەڵام بەپێی بڕوای ئەریستۆتالیس هۆی جیاواز جیاواز لە سروشتدا بوونی هەیە. ئەو چوار لەو هۆیە جیاوازانەشمان بۆ دەژمێرێت. گرنگترینیان ئەوەیە کە تێبگەین مەبەستی لە «هۆی مەبەست» چییە. کاتێک باس لە پەنجەرە شکاوەکە دەکەین، ئەوا بێگومان هەقی خۆمانە بپرسین بۆچی پیتەر بەردەکەی تێگرت. دەمانەوێت بزانین مەبەستی یان «نیەتی» چی بووە. بە هەمان شێوەش کاتێک باس لە پێڵاوەکان دەکەین، ئەوا دیسان نیەت یان مەبەست ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت (لەم بارەشیاندا مەبەستەکە ئاشکرا دیارە). بەڵام ئەریستۆتالیس «هۆی مەبەست»ی بەسەر پرۆسێسە بێگیانەکانی سروشتدا دەسەپاند. لێرەدا دەتوانین بە تاکە نمونەیەک مەبەستەکەمان ڕوونکەینەوە؛

بۆچی باران دەبارێت، سۆفیا؟ بێگومان لە خوێندنگەوە فێربوویت؛ هەڵمی ئاوەکان لە هەورەکاندا سارد دەبنەوە، دواتر چڕ دەبنەوە و دەبنە باران. پاشانیش بە هۆی هێزی ڕاکێشانی زەوییەوە دەکەونە خوارەوە. ئەریستۆتالیسیش بوایە هەر هەمان شتی دەگوت، بەڵام زیاتریش دەیگوت کە تۆ تا ئێستا پەنجەت بۆ تەنها سێ هۆ ڕاکێشاوە؛ «هۆی مادی»، هەڵمی ئاوەکەیە (هەورەکان) کە لەوێدابوون کاتێک هەواکە سارد ببووەوە. بە ساردبوونەوەی هەڵمەکەشی دەگوت «هۆی کاریگەر». سێهەمیش «هۆی شکڵی»ە کە «فۆڕم» یان سروشتی ئاوەکەیە کە بەرەو زەوی بکەوێتە خوارەوە. بەڵام هێشتام چوارەمین

هۆمان ماوە، کە ئەریستۆتالیس دەیوست زیادی بکات؛ «هۆی مەبەست» (یان دواهەمین هۆ)، باران بۆیە دەبارێت، چونکە ڕووەک و گیانلەبەرەکان پێویستیان بە ئاوی بارانە بۆ ئەوەی نەشونما بکەن. ئەریستۆتالیس لە ڕێگەی ئەم «هۆی مەبەست»ەوە ڕۆڵی ژیانی یان «مەبەستی» بە باران دەبەخشی.

هەڵبەتە دەشتوانین هەموو بابەتەکە هەڵبگێڕینەوە و بڵێین ڕووەکەکان لەبەرئەوە نەشونما دەکەن، چونکە شێ هەیە. بە ئاسانی جیاوازیەکە دەبینی سۆفیا، وانیە؟ بەلای ئەریستۆتالیسەوە هەموو شتەکانی سروشت، مەبەستێک یان ئامانجێکیان هەیە. باران دەبارێت؛ بۆ ئەوەی ڕووەکەکان نەشونما بکەن. یان داری پرتەقاڵ و میوەکان بەرهەمیان دەبێت؛ بۆ ئەوەی مرۆڤ بیانخوات.

ئەمڕۆکە زانست بەم جۆرە بیرناکاتەوە. ئێمە دەڵێین ئاو و خواردن مەرجێکن بۆ ئەوەی مرۆڤ و گیانلەبەر بتوانن بژین. ئەگەر ئەم مەرجانەش بوونیان نەبووایە، ئەوا ئەو کاتە نەماندەتوانی بژین. بەڵام مەبەستی بوونی پرتەقاڵ یان ئاو، بۆ ئەوە نیە ببنە خۆراک و خواردنەوەمان.

بەبێ هیچ گرفتێک دەتوانین بڵێین ئەریستۆتالیس لە بینینی هۆکاندا بە هەڵەدا چووبوو، بەڵام دەشێ بڕیاری بەپەلە نەدەین. تەنانەت ئێستاکەش خەڵکانێکی زۆر لەو بڕوایەدان کە خودا جیهانی بەم شێوەیە بۆیە دروستکردووە، بۆ ئەوەی مرۆڤ و گیانلەبەر بتوانن تێیدا بژین. لەم ڕوانگەیەشەوە دەتوانین بڵێین؛ ئاوی ڕووبارەکان بۆیە بوونیان هەیە، چونکە مرۆڤ و ئاژەڵ بۆ ئەوەی بژین پێویستیان بە ئاوە. بەڵام لێرەدا باس لە مەبەست یان ئامانجی خوا دەکەین، واتە ئاوی ڕووبارەکان نیە کە خۆیان بۆ خۆیان باشی ئێمەیان گەرەک بێت.

دواتر ئەریستۆتالیس دێتە سەر چۆنیەتی تێگەیشتنی مرۆڤ سەبارەت بە شتەکانی جیهان، دیسانەوە لەوێشدا جیاوازی نێوان «فۆڕم» و «مادە» ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت.
کە لە شتێک تێدەگەین، مانای ئەوەیە کە لە گروپ یان بەشی جیاواز جیاوازدا دایان دەنێین. من ئەسپێک دەبینم، ئەسپێکی تریش، دیسانەوە ئەسپێکی تریش دەبینم. ڕاستە هەموو ئەسپەکان وەک یەک نین، بەڵام شتێک هەیە لە نێوان هەموو ئەسپەکاندا هاوبەشە. واتە «فۆڕم»ی ئەسپەکان کتومت ئەو شتەیە کە بەلای هەموو ئەسپەکانەوە وەک یەکە. بەڵام ئەو شتەی کە جودایە، سەر بە «مادە»ی تاکە ئەسپێکە یان بەجۆرێکی تر بیڵێین پەیوەندی بە مادەی تاکە ئەسپێکەوە هەیە.
ئێمەی مرۆڤ بەم شێوەیە بە جیهاندا دەخولێینەوە و شتەکان جیادەکەینەوە و پۆل پۆلیان دەکەین. مانگاکان دەخەینە گەوڕەوە و ئەسپەکان بۆ تەویلە و بەرازەکانیش بۆ گەوڕی بەراز و مریشکەکانیش بۆ کولانەکانیان. هەمان شتیش ڕوودەدات کاتێک سۆفیا ئامۆنسن ژوورەکەی ڕێک دەخات. کتێبەکانی دەخاتە کتێبخانەکەوە، کتێبی قوتابخانەش لە جانتاکەیدا دادەنێت، گۆڤارە هەفتەییەکانیش دەخاتە چەکمەجەی کۆمێدیەکەوە. جلەکانی جوان قەد دەکات و دەیانخاتە کەنتۆرەکەوە، جلی ژێرەوە لە چەکمەجەیەکدا دادەنێت و بلوسەکان لە یەکێکی تردا جێدەکاتەوە، گۆرەویەکانیش جیا دەکاتەوە و لە چەکمەجەیەکی تایبەت بە خۆیدا دایان دەنێت. سەرنج بدە، ئێمە هەمان شتیش لەناو سەرماندا دەکەین؛ ئەو شتانە جیا

دەکەینەوە کە لە بەرد دروستکراون، یان لە لاسیک و خوری پێکهاتوون. ئێمە تەنی زیندوو و مردوو جیادەکەینەوە، هەروەها «ڕووەک» و «گیانلەبەر» و «مرۆڤ»یش جیادەکەینەوە.
تێدەگەیت سۆفیا؟ ئەریستۆتالیس دەیخواست لە بنچینەوە ژووری کچی سروشت ڕێکبخات. هەوڵیدەدا بیسەلمێنێت کە هەموو شتەکانی سروشت دەکەونە ژێر گروپی جیاجیاوە. (هێرمس بوونەوەرێکی زیندووە، زیاتریش دیاری بکەین گیانەوەرە، زیاتریش گیانەوەرێکی بڕبڕەدارە، زیاتریش گیانەوەرێکی شیردەرە، زیاتریش سەگێکە، زیاتریش دیاریبکەین جۆری لابرادۆرە، لەوانە وردتریش لابرادۆرێکی نێرە).
بڕۆ ژوورەکەتەوە سۆفیا. دەست بدەرە هەر شتێک کە لەسەر زەویەکە کەوتووە. هەرچی شتێک کە بەدەستەوە دێت سەر بە گروپێکی بەرزترە. ئەگەر ڕۆژێک شتێکت دۆزییەوە و نەتتوانی پۆلێنی بکەیت، ئەوا دەتاسێیت. بۆ نمونە ئەگەر ڕۆژێک شتێکی بچکۆلە ببینیت و بەدڵنیاییەوە نەزانیت کە سەر بە جیهانی ڕووەکە یان ئاژەڵە یان کانزا، ئەوسا لەو بڕوایەدام نەوێریت دەستی بۆ بەریت.
گوتم جیهانی ڕووەک و جیهانی ئاژەڵ و جیهانی کانزا. من بیر لەو یاریە دەکەمەوە کە کەسێکی نەگبەت دەکەنە دەرەوە و ئەوانی تریش لەسەر شتێکی دیاریکراو ڕێک دەکەون. کاتێکیش دەگەڕێتەوە، دەبێت بزانێت ئەوانی تر چ شتێکیان لە خەیاڵدایە.
بۆ نمونە کۆمەڵەکە بڕیار دەدەن کە بیر لە پشیلەیەک بکەنەوە کە ناوی «پیللە»یە و ئێستاکە لەناو باخچەی دراوسێکەدایە. پاشان کەسەکە دێتە ژوورەوە و دەکەوێتە پرسیاکردن. کۆمەڵەکەش دەبێت یان بە «بەڵێ» یان بە «نەخێر» وەڵام بدەنەوە. ئەگەر ئەو کەسە

بەدبەختە ئەریستۆتالیسێکی باش بێت (ئەوسا لە ڕاستیدا کەسێکی بەختدار دەبێت)، ئەوا گفتوگۆکەیان بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت؛ شتێکی دیاریکراوە؟ «بەڵێ!»، سەر بە جیهانی کانزایە؟ «نەخێر!»، شتێکە کە دەژی؟ «بەڵێ!»، سەر بە جیهانی ڕووەکە؟ «نەخێر!»، گیانلەبەرە؟ «بەڵێ!»، باڵدارە؟ «نەخێر!»، شیردەرە؟ «بەڵێ!»، تەواوی گیانلەبەرەکەیە؟ «بەڵێ!»، پشیلەیە؟ «بەڵێ!»، پیللەیە؟ «بەڵێ!» هاهاهاها.

ئەریستۆتالیس ئەم یاریەی داهێنا. هەرچی دەربارەی یاری خۆشاردنەوەشە، وا باشترە ڕێزی پلاتۆن بگرین بۆ دۆزینەوەی. کاتی خۆشی سوپاسی دیمۆکریتمان کرد، چونکە یاری لیگۆکانی داهێنا.

ئەریستۆتالیس پیاوێکی وردبینی مەنهەجی بوو و دەیویست بۆچوونەکانمان ڕێک بخات. هەر ئەویش بوو کە «لۆژیک»ی وەک زانستێک دامەزراند. ئەو چەندین یاسای توند و تیژی هێنایە کایەوە، تەنها بۆ ئەوەی بۆمان ڕوونکاتەوە کە چ بەڵگەیەک یان سەرئەنجامێک بەپێی لۆژیک شیاوی پەسەند کردنە. لێرەدا نمونەیەکی پڕاوپڕی ئەم بابەتە دێنمەوە؛ ئەگەر جەخت لەوە بکەم کە «هەموو بوونەوەرێکی زیندوو دەمرێت» (ئەمە مەرجی یەکەمە) و پاشانیش بڵێم «هێرمس بوونەوەرێکی زیندووە» (ئەمەش مەرجی دووهەمە)، کەواتە وەک سەرئەنجامێک دەتوانم بڵێم «هێرمس شیاوی مردنە.«

لە نمونەکەوە دەبینین لۆژیکی ئەریستۆتالیس دەربارەی پەیوەندی نێوان زاراوەکانە (*بیرۆکەکانە.و). لەم نمونەیەشدا «بوونەوەری زیندوو» و «مردوو»ە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەبێت بڵێین کە ئەو لە ڕاستیدا هیچ شتێکی نوێی نەگوتووە. ئێمە هەر لەوەوپێشەوە

دەمانزانی هێرمس «شیاوی مردنە». (ئەو سەگێکە و سەگیش «بوونەوەرێکی زیندووە، واتە شیاوی «مردنە» و بە پێچەوانەی بەردێکی شاخی ئێفێریستەوەیە). بەڵێ، بەدڵنیاییەوە ئەمەمان دەزانی، بەڵام پەیوەندی نێوان گروپەکان هەمیشە هێندە ڕوون و ئاشکرا نین. جارجارێک پێویستە زاراوەکانمان (*بۆ چوونەکانمان.و) ڕێک بخەین.
تەنها یەک نمونە دەهێنمەوە؛ ئایا بەڕاستی بەچکەی چکۆلەی مشک، هەروەک بەرخ و بەراز شیری دایکیان دەخۆنەوە؟ دەزانم نمونەکەم پێکەنیناوی دیارە، بەڵام دەشێ «بیرکردنەوەکانمان» بەکاربهێنین؛ مشک بەهەرحاڵ هێلکە ناکات (لە ژیانتا هێلکەی مشکت بینیوە؟) واتە هەر ڕێک وەکو مەڕ و بەراز بەچکەیان دەبێت. بەڵام ئێمە ناوی «شیردەرەکان» لەو گیانەوەرانە دەنێین کە شیر بە بەچکەکانیان دەدەن. شیردەرەکانیش ئەو گیانەوەرانەن کە شیری دایکیان دەخۆنەوە. بەمەش گەیشتینە ئەنجام. وەڵامەکەمان لا هەبوو، بەڵام لە پڕێکدا لەبیرمان دەچێتەوە، لەوانەیە لەبەرئەوەبێت کە هەرگیز بەچاوی خۆمان مشکێکمان نەدیبێت کە شیری دایکی بخواتەوە. بێگومان ئەمەش لەبەرئەوەیە کە مشک کەمێک شەرم دەکات لەبەرچاوی مرۆڤ ئاگاداری بەچکەکانی بێت.

**پلیکانەی سروشت**

دواتر ئەریستۆتالیس دێتە سەر باسی «ڕێکخستنی» بوون، یەکەم شتیش دەڵێت دیاردەکانی سروشت شیاوی دابەشکردنن بەسەر دوو گروپی سەرەکیدا. لەلایەکەوە شتە بێگیانەکانمان هەیە، وەک بەرد و دڵۆپی ئاو و خۆڵ. ئەمانە هیچ توانایەکی خۆییان لەناودا نیە کە

بگۆڕێن بۆ شتێکی تر. بەپێی بڕوای ئەریستۆتالیس ئەم جۆرە شتانەی کە «نا-زیندوون» تەنها لە ژێر کاریگەری دەرەوەڕا دەکرێت گۆڕانکاریان بەسەردا بێت. لەلایەکی دیکەشەوە هەموو شتە زیندووەکانمان هەیە، ئەماناش توانایەکی خۆییان لە ناوەوەدایە و دەتوانن بگۆڕین بۆ شتێکی تر.

لە دیدەی ئەریستۆتالیسەوە هەرچی دەربارەی «شتە زیندووەکانە»، دەکرێت بەسەر دوو گروپی سەرەکیدا دابەشبکرێن؛ لەلایەکەوە گژوگیا زیندووەکان (یان ڕووەکەکان)، وە لەلایەکی تریشەوە بوونەوەرە زیندووەکان. پاشانیش بوونەوەرە زیندووەکان بەسەر دوو پۆلی دیدا دابەشدەکرێن؛ مرۆڤ و ئاژەڵ.

دەشێت دان بەوەدا بنێین کە ئەم پۆلێنکردنەی ئەریستۆتالیس دابەشکردنێکی ڕوون و ئاشکرایە. جیاوازیەکی گەورە لە نێوان شتی زیندوو و نازیندوودا هەیە، بۆ نمونە لە نێوان گوڵێک و بەردێکدا. هەروەها جیاوازیەکی مەزنیش لە نێوان ڕووەک و ئاژەڵدا هەیە، بۆ وێنە لە نێوان گوڵێک و ئەسپێکدا. پێم خۆشە بڵێم چەند جیاوازیەکیش لە نێوان ئەسپ و مرۆڤدا هەیە، بەڵام ئایا ناواخنی ئەو جیاوازیانە چین؟

بەداخەوە کاتم نیە چاوەڕوانت بم، چونکە هەتاوەکو تۆ وەڵامەکە دەنووسیتەوە و لەگەڵ کلۆیەک شەکردا دەیخەیتە زەرفێکی پەمەییەوە و بەدەستم دەگات، زۆری پێدەچێت. لەبەرئەوە باشترە خۆم یەکسەر وەڵام بدەمەوە؛ ئەریستۆتالیس دێت و دیاردەکانی سروشت بەسەر چەند گروپێکدا دابەشدەکات، لێرەدا ئەو پشت بە خاسیەتی شتەکان دەبەستێت. زیاتریش ڕوونی بکەینەوە؛ پشتی بەو

خاسیەتانە دەبەست کە شتەکان دەیانکرد یان ئەو خاسیەتانەی کە لەتوانایانداباوو بیکەن.
هەموو «شتە زیندووەکان» (ڕووەک، ئاژەڵ، مرۆڤ) توانای خۆراک وەرگرتنیان هەیە و لەو ڕێگەیەوە دەتوانن نەشونما بکەن و خۆیان دروستبکەن. جگە لەوەش هەموو «بوونەوەرە زیندووەکان» (مرۆڤ و ئاژەڵ) توانای هەستکردنی چواردەورەکەشیان هەیە، وە هەروەها دەشتوانن لە سروشتدا بجولێنەوە. لەسەرو ئەمەشەوە هەموو مرۆڤێک توانای بیرکردنەوەی هەیە، یاخود توانای ڕێکخستنی مۆرکە هەستییەکانی هەیە و دەتوانێت لە گروپ و پۆلی جیاواز جیاوازدا دایان بنێت.
بەم شێوەیەش لە ڕاستیدا هیچ جۆرە سنوورێکی ئاشکرا لە سروشتدا نیە، بەڵکو جۆرە خزانێک دەبینین کە لە ڕووەکێکی ساکارەوە بۆ ڕووەکێکی ئاڵۆزتر دەڕوات، لە گیانەوەرێکی ساکاروە بۆ گیانەوەرێکی ئاڵۆزتر سەردەکەوێت. لە دواهەمین پلەدا مرۆڤ دێت، کە بەپێی بڕوای ئەریستۆتالیس هەست بە هەموو سروشت دەکات؛ مرۆڤ هەروەکو ڕووەک خواردن وەردەگرێت و نەشونمادەکات، وەک ئاژەڵیش هەست و توانای جولانی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مرۆڤ خاسیەتێکی تایبەت بە خۆشی هەیە، ئەویش توانای بیرکردنەوەی ئەقلانیە.
بەم جۆرە مرۆڤ خاوەنی پریشکێکی ژیری خوایانەیە، سۆفیا. بەڵێ، گوتم خوایانە؛ ئەریستۆتالیس لەهەندێ شوێندا دەڵێت دەبێت خوایەک هەبێت و دەستی بە هەموو جوڵەیەکی سروشت کردبێت. لەبەرئەوەش خودا لە هەرە پلەی بەرزی سروشتدایە.

بەبڕوای ئەریستۆتالیس جوڵەی ئەستێرە و پلانیتەکان، دەسەڵاتیان بەسەر جوڵەی زەویدا هەیە. بەڵام دەیگوت دەبێت شتێک هەبێت کە تەنە ئاسمانیەکان بجوڵێنێتەوە. ئەریستۆتالیس بەمەی دەگوت «یەکەمین جوڵە» یان «خودا». «یەکەمین جوڵە» خۆی لەئارامیدایە، واتە ناجوڵێتەوە. بەڵام هەر خۆی «یەکەمین هۆی» جوڵانەوەی تەنە ئاسمانیەکانە، لێرەشەوە سەرچاوەی هەموو جوڵەکانی تری سروشتە.

## ئیتیک Ethic

با بگەڕێینەوە سەر مرۆڤ، سۆفیا. لە ڕوانگەی ئەریستۆتالیسەوە «فۆرم»ی مرۆڤ خاوەنی «گیانێکی ڕووەکی» و «گیانێکی ئاژەڵی» و «گیانێکی ژیرییە»، ئەوجا دێت و چەند پرسیارێک دەکات؛ مرۆڤ دەشێ چۆن چۆنی بژی؟ چ شتێکمان پێویستە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت ژیانێکی باش بژی؟ من دەتوانم زۆر بەکورتی وەڵام بدەمەوە؛ مرۆڤ تەنها ئەو کاتە دەتوانێت ئاسوودە بێت کە هەموو بوار و تواناکانی بەکاربهێنێت.

بەبڕوای ئەریستۆتالیس سێ جۆری جیاوازی ئاسوودەیی بوونی هەیە؛ یەکەم جۆری ئاسوودەیی بەسەربردنی ژیانێکە لە هەوەس و ئارەزوودا. دووهەمیان وەک ژیانی مرۆڤێکی سەربەست و بەرپرسیارە. سێهەمین ئاسوودەیش، ژیانێکە وەک لێکۆڵەرەوەیەک و فەیلەسوفێک.

لێرەدا ئەریستۆتالیس دەڵێت؛ ئەو کاتە مرۆڤ دەتوانێت ژیانێکی ئاسوودە بژی، کە هەرسێ مەرجەکەمان هەبن. بەشێوەیەکی تر بیڵێین نکۆڵی لە هەموو جۆرێکی تاکڕەوی کردووە. ئەگەر ئەمڕۆکە بژیابایە، لەوانەیە بیگوتایە؛ ئەو کەسەی تەنها خەریکی لەشیەتی، بە هەمان شێوەی ئەو کەسەیە کە تەنها مێشکی بەکاردەهێنێت، هەر لەبەر ئەم

هۆیەش ژیانێکی ناقس و تاکڕەوانە دەژی، چونکە لە هەردوو بارەکەدا ژیانێکی ناهاوسەنگ بەدی دەکرێت.
ئەریستۆتالیس هەرچی دەربارەی پەیوەندیشە بە خەڵکانی ترەوە، دەهات و وەک ئامۆژگارییەک ئامازەی بۆ «ڕێگای مامناوەندی ئاڵتونی» دەکرد؛ دەشێ نە ترسنۆک بین و نە بێباکیش بین، بەڵام دەبێت ئازا بین. (کەمی جورئەت، ترسنۆکیە و جورئەتی زۆریش بێباکییە). دەبێت نە بەرچاو تەنگ بین و نە دەستبڵاویش، بەڵام دەبێت دڵئاوا بین. (بەخشندەیی کەم، بەرچاو تەنگییە و زۆر بەخشینیش کەم تەرخەمییە).
بە هەمان شێوەش سەبارەت بە خواردن دەیگوت؛ زۆر خواردن خراپە، بەڵام کەم خواردنیش هەر خراپە. هەردوو ئیتیکی پلاتۆن و ئەریستۆتالیس لە زانستی پزیشکی یۆنانی دەچێت؛ تەنها لە ڕێگەی ژیانێکی هاوسەنگ و مام ناوەندییەوە دەبمە مرۆڤێکی ئاسوودە، یان دەبمە کەسێکی «هاوئاهەنگ.»

***ڕامیاری***

دیسانەوە لە بینینی ئەریستۆتالیسدا بۆ کۆمەڵگا، بابەتی تاک ڕەوێتی مرۆڤ دەردەکەوێتەوە. ئەو دەیگوت ؛مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە» و بە بڕوای ئەو بەبێ ئەو کۆمەڵگایەی چواردەورمان، ئێمە مرۆڤێکی ناتەواوین. خێزان و لادێ پێداویستی ژیانمان دابین دەکەن، هەروەک خۆراک و گەرمی و ژن هێنان و شووکردن و بە خێوکردنی منداڵ. بەڵام تەنها دەوڵەت دەتوانێت بەرزترین فۆڕمی پێکەوە بوونی مرۆییانە پڕبکاتەوە.

لێرەدا پرسیارێک دەهاتە پێشەوە؛ چۆن چۆنی دەشێت دەوڵەت ڕێک بخرێت؟ (وڵاتە فەلسەفیەکەی پلاتۆنت لە یادە؟). ئەریستۆتالیس ناوی سێ جۆر دەوڵەتی سەرکەوتوو دەبات؛ یەکەمیان پادشاییە (لەوێدا تەنها یەک بەڕێوەبەری بالای وڵات هەیە. ئەم شێوە وڵاتەش ئەو کاتە باش دەبێت کە نەکەوێتە ژێر دەستی «ستەمکارێکەوە»). واتە تەنها سەرۆکێک کە لەسەر بەرژەوەندی خۆی وڵات بەڕێوە بەرێت. دووهەمین شێوەی وڵاتی باش، ئەریستۆکراتییە. لە وڵاتێکی ئاوهادا گروپێکی گەورە یان گچکە دەبنە ڕابەری وڵات. ئەم جۆرە وڵاتە دەشێ خۆی لە «هەڵگەڕانەوەی چەند کەسانێکی کەم بپارێزێت»، واتە ئەو شتەی بە زمانی ئەمڕۆکە پێی دەڵێن «جێنتا «Junta (*جێنتا واتە دەستەیەکی سیاسی، بەتایبەتیش ئەو کۆمەڵە دەسەڵاتدارەی پاش هەڵگەڕانەوەیەکی شۆڕشگێڕانە، دەست بەسەر دەسەڵاتدا دەگرن.و). ئەریستۆتالیس ناوی سێهەمین فۆڕمی وڵاتی باشیش دەنێت «پۆلیتی»، کە نزیکەی مانای دیموکراتی دەبەخشێت. بەڵام ئەم جۆرە وڵاتە لایەنێکی تریشی هەیە؛ ڕێی تێدەچێت وڵاتێکی دیموکراتی لە ماوەیەکی کەمدا بکەوێتە ژێر دەستی کۆمەڵکی کەمەوە (هەرچەندە هیتلەری ستەمکار سەرۆکی ئەڵمانیش نەبووایە، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا ڕێی تێدەچوو هەموو نازیە «بچکۆلەکان» وڵاتێکی ترسناکی بەو شێوەیەیان دەمەزراندایە).

### وێنەی ئافرەت

لە کۆتایدا دەشێ سەبارەت بە ئافرەت، شتێک دەربارەی بینینی ئەریستۆتالیس بڵێین. بەداخەوە لەم بوارەدا دونیا بینینی ئەم هەروەک دیدەی پلاتۆن دڵخۆشکەر نیە. ئەریستۆتالیس تا ڕادەیەک

لەو بڕوایەدا بوو ئافرەت ناقس بێت. لەلای ئەو ئافرەت «پیاوی تەواو» نیە. لە کاتی زاوزێدا ئافرەت ناچالاک و وەرگرە، بەڵام پیاو چالاک و بەخشندەیە. بەڕای ئەریستۆتالیس منداڵ تەنها خاسیەتی پیاوی بۆ دەمێنێتەوە. بەپێی بڕوای ئەو تەواوی هەموو سیفاتێکی منداڵ لە تۆوی پیاودایە. ئافرەتیش وەک زەوی کێڵگەکان وایە، تۆو وەردەگرێت و دەبێتە هەڵگرێک، لە کاتێکدا پیاو کەسە «تۆو ڕێژەکەیە». یان بە شێوەیەکی ئەریستۆتالیسی بیڵێین؛ پیاو «فۆڕم»ەکە دەبەخشێت و ئافرەتیش «مادە.«

بێگومان ئەمە جێگەی داخ و سەرسوڕمانە؛ چۆنە پیاوێکی ژیری وەک ئەریستۆتالیس، دەربارەی پەیوەندی نێوان ڕەگەزەکان هێندە بە هەڵەدا بچێت؟ بەڵام ئەمە دوو شت نیشان دەدات؛ یەکەمیان ئەریستۆتالیس هیچ جۆرە زانیارییەکی فراوانی دەربارەی ژیانی ئافرەت و منداڵ نەبووە. دووهەمیش بەئاشکرا پێمان دەڵێت چەندە ترسناکە گەر تەنها پیاو تاقانەی بواری فەلسەفە و زانست بێت.

بەداخەوە هەرچی دەربارەی ڕەگەزەکانە، بۆچوونەکانی ئەریستۆتالیس بوو (نەک پلاتۆن) کە تاوەکو سەدەکانی ناوەڕاست باوبوو. بەم شێوەیەش کلێسەکان وێنەی ئافرەتێکیان بۆ مایەوە کە لە بنەڕەتدا لە ئینجیلەوە نەهاتووە، چونکە لە ڕاستیدا مەسیح کەسێکی دژ بە ئافرەت نەبووە!

ئێستاکە ئیدی لەمە زیاتر ناڵێم! پاشان پەیوەندیت پێوە دەگرمەوە.

پاش ئەوەی سۆفیا کەڕەت و نیوێک بەشەکەی ئەریستۆتالیسی خوێندەوە، پەڕەکانی خستەوە زەرفەکە و هەر بە دانیشتنەوە کەوتە تەماشاکردنی ژوورەکەی. ئەوجا سەرنجی دا ژوورەکەی چەندە ناڕێک

و پێکە. کتێب و دەفتەر بەناو ژوورەکەدا پەرش و بڵاو بووبوونەوە. گۆرەوی و بلوس و پانتۆڵی کاوبۆش لە کەنتۆرەکەدا هەڵچنرابوون و هاتبوونە دەرەوە. لەسەر کورسیەکەی بەردەم مێزی نووسینەکەشی سەبەتەیەکی پڕ لە جلی پیس کەوتبوو.

سۆفیا پڕ بەدڵ حەزیدەکرد شتەکانی ژوورەکەی ڕێک بخات. یەکەمین شت هەموو جلەکانی ناو کەنتۆرەکەی دەریهێنا. هەر هەمووی خستە سەر زەویەکە. گرنگبوو سەرلەنوێ لە سەرەتاوە دەست پێبکات. پاشان هەموو جلەکانی بە جوانی و بە قەدکراوی خستەوە ناو کەنتۆرەکە. سۆفیا چەکمەجەیەکی بۆ جلی ژێرەوە تەرخانکرد و یەکێکی تریش بۆ گۆرەوی کورت و درێژ. چەکمەجەیەکی دیکەشی بۆ پانتۆڵی درێژ دانا. بەو جۆرەش چەکمەجەکانی یەکە یەکە پڕکردەوە. بەبێ ئەوەی هیچ گومانێکی هەبێت، هەموو شتێکی لە شوێنی تایبەتی خۆیدا دادەنا. لەناو چەکمەجەی خواری خوارەوەدا زەرفێکی پلاستیکی دۆزیەوە و هەموو جلە پیسەکانی تێفڕێدا.

تەنها شتێک کە گومانی لێ هەبوو و نەیدەزانی لە کوێدا دایبنێت، تاکە گۆرەویەکی درێژی سپی بوو. گرفتەکە لەوەدا نەبوو کە تاکەکەی تری دیارنەبوو، بەڵکو ئەو تاکەش هی سۆفیا نەبوو.

بۆ چەند ساتێک وەستا و بەوردی تەماشای گۆرەویە درێژەکەی کرد. هیچ ناوێکی لەسەر نەنووسرابوو، بەڵام دڵی خورپەی کرد کە هی کێیە. گۆرەویەکەی لەگەڵ کیسەیەک پارچە لیگۆ و کاسێتێکی ڤیدیۆ و دەسرێکی ئاوریشمی سووردا، خستە ناو چەکمەجەکەی سەری سەرەوە. ئەوجا نۆرەی سەر زەوی ژوورەکە هات. سۆفیا کتێب و دەفتەرەکانی جیاکردەوە و ڕێکی خستن. گۆڤارە هەفتەییەکان و وێنە گەورەکانیشی پۆل پۆلکرد (ڕێک هەروەک چۆن مامۆستای فەلسەفەکەی وەسفی

کردبوو). پاش ئەوەی لە ڕێکخستنی سەر زەویەکە بووەوە، ئەوجا هاتە سەر ڕێکخستنی جێگای خەوەکەی و دواتریش مێزی نووسینەکەی.
دواهەمین شت هەموو پەڕەکانی وانەکەی ئەریستۆتالیسی کۆکردەوە و بە ڕێکوپێکی لە فایلێکدا دایانا. فایلێکی بەتاڵی دۆزییەوە و بە ئامێری کونکەرەکەی چەند کونێکی کردە پەڕەکان و بە جوانی لەناو فایلەکەدا ڕێکی خستن. پاشانیش لەتەنیشت تاکە گۆرەویە درێژەکەوە لە سەری سەرەوەی دۆڵابەکەدا داینا. بڕیاریشی دا دواتر بچێتە کوخەکە و قتووی کێکەکە بهێنێت.
لە ئێستە بەدواوە دەبێت شتەکان ڕێک بخرێن! سۆفیا تەنها بیری لە شتەکانی ناو ژوورەکەی نەدەکردەوە. بەڵکو پاش ئەوەی دەربارەی ئەریستۆتالیسی خوێندەوە، ئەوجا تێگەیشت کە بە هەمان شێوەش گرنگە بیرکردنەوەکان و وێناکردنەکانی ڕێکبخات. ئەو لە سەری سەرەوەی کەنتۆرەکەدا چەکمەجەیەکی تایبەتی بۆ ئەو بابەتانە دانابوو. ئەوێ تەنها شوێنی ژوورەکەبوو کە تا ئێستاکە بە تەواوەتی لێی تێنەگەیشتبوو.

یەک دوو کاتژمێرێک تێپەڕی و دایکی هێشتام هەر بێ دەنگ بوو. سۆفیا ڕۆیشتە خوارەوە و پێش ئەوەی دایکی خەبەرکاتەوە، پێی باشبوو خواردن بۆ گیانەوەرەکانی دانێت.
لە چێشتخانەکەیاندا خۆی بەسەر حەوزی ماسیەکاندا چەماندەوە. یەکێک لە ماسیەکان ڕەش بوو، ئەوی تریان پەمەیی و سێهەم دانەش سپی و سوور بوو. هەر لەبەر ئەوە بوو کە سۆفیا ناوی نابوون ڕەشە و سەرئاڵتون و کڵاوسووره. لەو کاتەدا کە خوارنەکەی بۆ ڕۆکردنە ناو ئاوەکەوە گوتی؛

- ئێوە سەر بە بەشی زیندەوەرانی سروشتن. واتە دەتوانن خواردن بخۆن و نەشونما بکەن و زاوزێ بکەن. زیاتریش دیاری بکەین، ئێوە سەر بە جیهانی گیانەوەرانن، واتە دەتوانن بجوڵێنەوە و تەماشای ئاسمان بکەن. گەر تەواو تەواو وردیش بین، دەڵێین ئێوە ماسین و بەهۆی کەوانە ڕیشەدارەکانتانەوە هەناسەدەدەن و دەتوانن لە ناو ئاوی ژیاندا بەم لاولادا مەلە بکەن.

سۆفیا سەری حەوزەکەی دادایەوە. بە شوێنی ماسیەکانی لە سیستەمی سروشتدا شادمان بوو و بە تایبەتیش دەربڕینی «ئاوی ژیان»ەکەی خۆی بەدڵبوو. ئەوجا سەرەی بەبەغا چکۆلەکانی هات. سۆفیا کەمێک تۆوی باڵندەی لەناو تاسەکەیاندا بۆ دانان و گوتی؛

- ئازیزان سمیت و سمۆڵە، ئێوە بوونەتە ئەم دوو تووتیە چکۆلە جوانانە، چونکە ئێوە لە دوو هێلکەی بچکۆلەی جوانی تووتیەوە گەشەتانکردووە، وە بەهۆی فۆڕمی هێلکەکانەوە توانیتان ببن بە دوو تووتی چکۆلە، لەبەرئەوە خۆشبەختانە نەتانتوانی ببنە دوو تووتی گەورەی چەنەباز.

سۆفیا بەرەو گەرماوە گەورەکەیان ڕۆیشت، لەوێدا کیسەڵە تەمبەڵەکەی لەناو سندوقێکی گەورەدا دەژیا. جارناجارێک کە دایکی خۆی دەشۆری هاوارێکی دەکرد و دەیگوت؛ «ڕۆژێک دێت ئەم کیسەڵە بکوژم». بەڵام تا ئێستاکە لە هەڕەشەی بەتاڵ زیاتر هیچی تر نەبووە. سۆفیا گەڵایەکی کاهوی لەناو شوشە گەورەکەدا دەرهێنا و خستیە ناو سندوقەکەوە و لەبەر خۆیەوە گوتی؛

- ئازیزم گۆڤیندا، تۆ سەر بە گیانەوەرە خێراکان نیت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گیانەوەرێکیت و دەتوانیت کەمێک لەو جیهانە گەورەیە تاقیبکەیتەوە کە هەمووانی تێدا دەژین. دەشێ تۆ دڵنەوایی خۆت

بەوە بدەیتەوە کە تۆ تەنها شت نیت کە نەتوانیت سنوورەکانت ببەزێنیت.
بێگومان شێریکان لەبەر سروشتی پشیلەیی خۆی لەدەرەوەیە و مشک دەگریێ. پاشان سۆفیا بەرەو ژووری نووستنەکەی دایکی ڕۆیشت. بە سالۆنەکەدا تێپەڕی و نیگای چووە سەر گوڵدانە پڕ گوڵ و نێرگزەکەی سەر مێزەکە. لەو کاتەدا سۆفیا بەلایدا تێپەڕی، لەوە دەچوو گوڵەکان بەو پەڕی ڕێزەوە سەری بۆ دابنەوێننەوە. سۆفیا بۆ ساتێک وەستا و یەک دوو پەنجەی بەسەر پەڕی گوڵەکاندا هێنا و گوتی؛
ـ ئێوەش سەر بە بەشی زیندەوەرانی سروشتن. بەم شێوەیەش چەند تازیارییەکتان (*ئیمتیاز) بەسەر ئەو گوڵدانەدا هەیە کە تێیدا دەژین. بەڵام بەداخەوە ئێوە خۆتان ناتوانن هەست بەوە بکەن.
ئەوجا سۆفیا گەیشتە ژووری نووستنەکەی دایکی. دایکی لە خەوێکی قوڵدا بوو، بەڵام سۆفیا دەستی خستە سەر سەری و گوتی؛
ـ تۆ سەر بە بەختەوەرین بوونەوەریت، لەبەرئەوەی تۆ نەک تەنها وەک گوڵە نێرگزەکانی کێڵگەکان زیندوویت و نەک تەنهاش وەک شێریکان و گۆڤیندا بوونەوەرێکی زیندوویت، بەڵکو لەسەرو ئەوانەشەوە تۆ مرۆڤیت؛ واتە تۆ خاوەنی توانایەکی بەدەگمەنیت... ئەویش ئەوەیە کە دەتوانیت بیربکەیتەوە.
ـ ئەوە دەڵێی چی سۆفیا؟!
ئەم جارەیان لەوەدەچوو دایکی زووتر خەبەری بێتەوە.
ـ تەنها ئەوەندە دەڵێم کە تۆ وەک کیسەڵێکی تەمبەڵ وایت. جگە لەوەش دەتوانم پێت بڵێم کە ژوورەکەمم ڕێکخست، ئەمەشم لەسەر بنچینەیەکی فەلسەفی بەجێهێنا.
دایکی لە جێگاکەیدا ڕاست بووەوە و گوتی؛

ـ هەر ئێستا بۆت دێم... دەتوانیت قاوەیەک چێ کەیت؟
سۆفیا داواکەی بە جێهێنا و پاشان پێکەوە لە چێشتخانەکەیاندا بەدەوری قاوە و شەربەتی میوە و کاکاودا دانیشتن. لە پڕێکدا سۆفیا گوتی؛
ـ دایە هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە بۆچی دەژین؟
ـ هۆهۆوو... دیسانەوە دەسمان پێکردەوە!
ـ بەڵێ، لەبەرئەوەی ئێستا وەڵامەکەی دەزانم. خەڵکی لەسەر ئەم زەویە بۆیە دەژین، بۆ ئەوەی یەکێک هەبێت بەسەر زەویدا بڕوات و ناوی هەموو شتێک بنێت.
ـ ئاوها؟ هەرگیز مەزەنەم بۆ ئەوە نەچووە.
ـ کەواتە گرفتێکی گەورەت هەیە، لەبەرئەوەی مرۆڤ بوونەوەرێکە بیردەکاتەوە. ئەگەر بیرنەکەیتەوە، کەواتە تۆ مرۆڤ نیت.
ـ سۆفیا!
ـ وای دانێ گەر تەنها ڕووەک و ئاژەڵ هەبووایە! ئەوسا کەس نەدەبوو «پشیلە» و «سەگ» و «نێرگز» و «ڕێباس» (*ترێ ڕێویلە) جیابکاتەوە. ڕووەک و ئاژەڵیش زیندوون، بەڵام ئێمە تەنها کەسین کە دەتوانین سروشت لە گروپ و پۆلی جیاواز جیاوازدا ڕێکبخەین.
ـ بە ڕاستی تۆ سەیرترین کچی کە هەمە!
ـ هیوادارم... هەموو مرۆڤێک کەم تا زۆر سەیرە. من مرۆڤم، کەواتە منیش کەم تا زۆر سەیرم. تۆش تەنها یەک کچت هەیە، کەواتە من سەیرترین کچتم.
ـ مەبەستم لەوەبوو کە تۆ بەم جۆرە باسانەت بە تەواوەتی دەمترسێنیت.
ـ بەڕاستی ترساندنت ئاسانە.

دەمەو ئێوارە سۆفیا خۆی گەیاندە کوخەکەی، قتووی کێکەکەی هەڵگرت و بەبێ ئەوەی دایکی پێی بزانێت، سەرکەوتووانە توانی بیگەیێنێتە ژوورەکەی.
یەکەم شت پەڕەکانی بەپێی کاتەکانیان ڕێک خست و پاشان لەژێر وانەکەی ئەریستۆتالیسدا داینان. دواجار لەلای ڕاستی سەروی هەموو لاپەڕەیەکەوە ژمارەی لێدان. ژمارەی پەڕەکان هەر لە ئێستاوە لە پەنجا تێدەپەڕین. سۆفیا خەریکی دروستکردنی کتێبی فەلسەفی تایبەت بە خۆی بوو. ڕاستە ئەو نەیدەنووسی، بەڵام پەڕەکان بەتایبەتی بۆ ئەو نووسرابوون.
سۆفیا نەیپرژایە سەر ئامادەکردنی وانەکانی دووشەممەی. لەوانەیە تاقیکردنەوەیەکی ئاینی مەسیحیان بکرێت. بەڵام مامۆستاکەی هەمیشە دەیگوت گرنگترین شت بەلامەوە هەڵسەنگاندن و ڕای تایبەتی قوتابیەکانە، سۆفیاش هەستی دەکرد جۆرە بنچینەیەکی دەربارەی ئەو دوو شتە دانابێت.

## ...پریشکێک لە ئاگرەکە...

دواتر مامۆستای فەلسەفەکە نامەکانی ڕاستەوخۆ ڕەوانەی کوخە کۆنەکە دەکرد. بەڵام چونکە سۆفیا ڕاهاتبوو، سەر لەبەیانی ڕۆژی دووشەممە دیسانەوە تەماشای سندوقی پۆستەکەی کردەوە.
بێگومان بەتاڵبوو... هێدی هێدی بە کۆڵانی کلۆیڤەدا ڕۆیشتە خوارەوە. لەپڕێکدا... لەسەر ڕێگاکەی چاوی بە وێنەیەک کەوت. وێنەی جێبێکی سپی بوو و ئاڵایەکی شینی بەسەرەوە بوو، لێی نووسرابوو «UN». مەگەر ئەوە ئاڵای نەتەوە یەککگرتووەکان نەبێت؟
سۆفیا وێنەکەی هەڵگێڕایەوە و ئینجا بۆی دەرکەوت کە پۆستکارتێکە و لە ڕێگەی ئەوەوە بۆ «هیلدە میوللە کنەی» نێردراوە. پولی نەرویجی و مۆری نەتەوە یەککگرتووەکانی بە بەرواری 15ی 6ی 1990 لێدرابوو.
15ی 6 ڕۆژی لەدایک بوونی سۆفیایە!
لەسەر پۆستکارتەکە نووسرابوو؛

گیانەکەم هیلدە، پێم وابێت ئەمڕۆ ئاهەنگی ڕۆژی لەدایک بوونتە، یاخود بەهەڵەدا چووم و هێشتام ڕۆژێکی ماوە؟ بەهەرحاڵ ئەم بابەتە هیچ لە دیاریەکەت ناگۆڕێت... لەبەرئەوەی دیاریەکەت لە هەموو بارێکدا بە شێوەیەک لە شێوەکان بەدرێژایی ژیانت لەلات دەمێنێتەوە. دیسانەوە حەز دەکەم جارێکی تریش پیرۆزباییت لێبکەم. لەوانەیە ئێستاکە تێبگەیت بۆچی نامەکانت بۆ سۆفیا دەنێرم. من دڵنیام کە ئەو پێتی دەگەیێنێت.

تێبینی؛ دایکت پێی گوتم جزدانەکەت لێ گووم بووە. من پەیمانت دەدەمێ 150 کرۆنەکەت بۆ ببژێرم، بێگومان پێناسی قوتابخانەکەشت، پێش ئەوەی پشووی هاوینە دەست پێبکات، دەتوانیت لە قوتابخانە دەریبهێنیتەوە .
سڵاو و خۆشەویستی بێ پایانی بابە.

سۆفیا واقی ورمابوو و لەوەدەچوو بە قیرەکەوە نووسابێت. ئەی کارتەکەی پێشووتر چ بەروارێکی لێدرابوو؟ شتێک لەناوەوەیدا پێی دەگوت مانگی شەش بوو، هەرچەندە هێشتام مانگێکی ماوە، بەڵام ئەو کاتی خۆی بەوردی تەماشای نەکرد...
سۆفیا تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد و بەپەلە گەڕایەوەماڵەوە، هیچ شتێکی وا ڕوونادات گەر تەنها ئەمڕۆ دوابکەێت!
دەرگاکەی کردەوە و بەڕاکردن بەرەو ژوورەکەی سەرکەوت. لەوێدا کارتەکەی هیلدەی لەژێر دەسرە سوورەکەدا دەرهێنا... ڕاستە مۆری 15ی 6 پێوەیە! ئەو ڕۆژەش ڕۆژی لەدایک بوونی سۆفیایە و ڕۆژێکیش پێش دەستپێکردنی پشووی هاوینە.
وەک شێتێک بە مێشکی وروژاوەوە بەرەو بازاڕەکە ڕایکرد... دەبوایە لەوێدا چاوی بە یۆرون بکەوتایە.
هیلدە کێیە؟ چۆن باوکی هەروا بەئاسانی دڵنیایە کە سۆفیا دەیدۆزێتەوە؟ هەرچۆنێک بێت، بێمانایە کە ئەو لەبری ئەوەی کارتەکانی ڕاستەوخۆ بۆ کچەکەی بناردایە، دەیناردن بۆ سۆفیا. سۆفیا دەیزانی کە ئەو ئەدرێسی کچەکەی خۆی دەزانێت. ڕادەبوێرێت یان چی؟ ئایا بەبەکارهێنانی کچێکی تەواو نامۆ، وەک پۆستە چیەک و پۆلیسێکی نهێنی، دەیەوێت کچەکەی لە ڕۆژی لەدایک بوونەکەیدا

سەرسام بکات؟ هەر لەبەر ئەوەشە بەرواری مانگێک لەوەوپێشی لێداوە؟ ئەی کاتێک سۆفیا وەک تەتەر بەکاردەهێنێت، ئایا لەبەرئەوەیە کە دەیەوێت لە ڕۆژی لەدایکبوونەکەیدا برادەرێکی نوێی پێ بناسێنێت؟ تۆ بڵێیت سۆفیا دیاریەکە بێت کە «بەدرێژایی ژیانی» بەردەوام دەبێت؟

ئەگەر ئەو باوکە سەیرە بەڕاستی لە لوبنان بێت، ئەی لە کوێوە ئەدرێسی سۆفیای دەزانی؟ جگە لەمانەش، سۆفیا و هیلدە لە هەموو بارێکدا دوو شتی هاوبەشیان هەیە؛ ئەگەر ڕۆژی لەدایک بوونی هیلدە 15ی 6 بێت، کەواتە هەردووکیان لە هەمان ڕۆژدا لەدایک بوون. هەروەها باوکی هەردووکیشیان بە جیهاندا سەفەر دەکەن.

سۆفیا هەستی دەکرد بەرەو جیهانێکی ئەفسوناوی دەڕوات. بەهەرحاڵ، لەوانەیە زۆر بێ ئەقڵی نەبێت گەر بڕوا بە چارەنووس بکەین؟ دەی... نابێت هەروا بەپەلە ئاکام بدەین بەدەستەوە، چونکە ڕێی تێدەچێت هەموو شتێک لێکدانەوەیەکی ئاسایی هەبێت. بەڵام لە کاتێکدا هیلدە لە لیللەساند دەژیا، ئەی چۆن ئەلبێرتۆ کنۆکس جزدانەکەی ئەوی دۆزیەوە؟ لیللەساند بە سەدان کیلۆمەتر لەوێوە دورە. ئەی بۆچی سۆفیا ئەو کارتەی لەسەر ڕێگاکە دۆزیەوە؟ بڵێیت پۆستەچیەکە پێش ئەوەی گەیشتبێتە سندوقی پۆستەکەی سۆفیا لێی کەوتبێت؟ بەڵام بۆچی ڕێک ئەو کارتەی لێکەوت؟

کاتێک یۆرون لە بازاڕەکەدا چاوی بە سۆفیا کەوت، هاوارێکی لێبەرز بووەوە و گوتی؛

ـ چی بووە؟ ون بوویت؟

ـ ببوورە!

یۆرون هەروەک مامۆستای قوتابخانە، زۆر بە توند و تیژی تەماشای دەکرد؛
ـ ئومێدەوارم هۆیەکی گەورەت بەدەستەوە بێت.
ـ شتێکە پەیوەندی بە وڵاتە یەکگرتووەکانەوە هەیە. لەلایەن سەربازەکانی دوژمنەوە لە لوبنان گیرام.
ـ ئۆی... هیچ نیە گیانە ئاشق بوویت!
پاشان تا هێزیان تیابوو بەپەلە بەرەو قوتابخانە ڕایانکرد.
تاقیکردنەوەی ئاینی مەسیحی، کە سۆفیا فریا نەکەوت خۆی بۆ ئامادەبکات، لە کاتی وانەی سێهەمدا دەستی پێکرد و بەم جۆرە بوو؛

دونیابینی و پەسەندکردنی یەکتری
(1 لیستەیەک بنووسە لەسەر ئەو شتانەی مرۆڤ دەتوانێت پەییان پێبەرێت و پاشان لیستەیەکی دی دەربارەی ئەو شتانە دارێژە کە تەنها دەتوانین بڕوایان پێبکەین.
(2 چەند هۆکارێک باسبکە کە بەشداری پێکهێنانی دونیا بینینی مرۆڤێک دەکەن.
(3 مەبەستمان لە ویژدان چیە؟ ئایا لەو بڕوایەدایت هەموو مرۆڤێک هەمان ویژدانی هەبێت؟
(4 مەبەست لە پلەی نرخاندن چیە؟

سۆفیا پێش ئەوەی دەست بە نووسین بکات، بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بیریکردەوە. بڵێیت بتوانێت شتێک لە وانەکانی ئەلبێرتۆ کنۆکس بەکاربهێنێت؟ لە ڕاستیشدا ناچاربوو، چونکە ماوەیەکی زۆربوو کتێبی

ئاینی مەسیحی نەکردبووەوە. کاتێکیش دەستیکرد بە نووسین ، ڕستەکان یەک بەدوای یەکدا لە خامەکەیەوە هەڵدەڕژان.
سۆفیا دەستیکرد بە نووسین؛ دەتوانین بزانین کە مانگ پەنیر نیە و ئەو دیوی مانگیش چاڵ چاڵە... دەتوانین بزانین کە هەم سوکرات و هەم مەسیحیش بڕیاری کوشتنیان دەرکرا... کە هەموو مرۆڤێک ئەمڕۆ یان سبەی هەر دەبێت بمرێت... کە پەرستگا گەورەکانی ئەکرۆپۆلیس لەسەدەی پێنجی پێش لەدایک بوونی مەسیحدا و لەپاش شەڕی فارسەکانەوە دروستکران... کە گرنگترین فاڵگرەوەی یۆنانی لەو کاتەدا فاڵچیەکەی دێڵفی بوو. وەک نمونەش بۆ ئەو شتانەی تەنها دەتوانین باوەڕیان پێبکەین، ئاماژەی بۆ ئەم بابەتانەی خوارەوە کرد؛ تا چ ڕادەیەک ژیان لەسەر ئەستێرەکانی تر بوون یان نەبوونیان هەیە... دەربارەی بوون و نەبوونی خودا... دەربارەی ژیان لە دوای مردن... دەربارەی دانانی مەسیح بە کوڕی خوا یان وەک مرۆڤێکی ژیر... دواجاریش نووسی؛ «هەرچۆنێک بێت ناتوانین بزانین جیهان بە چ شێوەیەک هاتۆتە بوون... دەکرێت گەردوون لەگەڵ کەروێشکێکی گەورەدا بەراورد بکەین کە لە کڵاوێکی درێژەوە دیهێننە دەرەوە. فەیلەسوفەکان هەوڵدەدەن بە تاڵە باریکەکانی فەروەکەیدا هەڵزنێن، بۆ ئەوەی ڕێک تەماشای نێو چاوی جادووگەرە گەورەکە بکەن. لە ڕاستیشدا پرسیارە گرنگەکە لێرەدایە؛ ئایا فەیلەسوفەکان هەرگیز دەتوانن بە ئەنجامەکەیان بگەن یان نا؟ بەڵام ئەگەر فەیلەسوفەکان بەسەر پشتی یەکتردا سەرکەون، ئەوا بەو جۆرە بەردەوام بەسەر فەروی نەرمی کەروێشکەکەدا بەرزدەبنەوە. لەم ڕوانگەیەشەوە، بە بڕوای من، ڕۆژێک لە ڕۆژان دەتوانن بە ئەنجام بگەن.

تێبینی؛ «لە تەوراتدا باسی شتێک هاتووە کە لەوانەیە تاڵێکی نەرمی فەروی کەروێشکەکە بووبێت. بەو تاڵە مووە دەگوترێت، قەڵای بابل. پاشانیش لەگەڵ زەویدا تەخت کرا، لەبەرئەوەی جادووگەرەکە بەدڵی نەبوو مرۆڤە گچکەکان هێندە بێنە سەرەوەی فەروی کەروێشکە سپیەکە.. ئەو کەروێشکەی کەمێک لەوەوپێش خۆی خولقاندبووی.»

پاشان هاتە سەر پرسیاری دووهەم « چەند هۆکارێک باسبکە کە بەشداری پێکهێنانی دونیا بینینی مرۆڤێک دەکەن»؛ لێرەدا شێوەی بەخێوکردن و ژینگە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن. خەڵکانی سەردەمی پلاتۆن، بەبەراوردکردنیان لەگەڵ خەڵکانی ئێستەدا، جۆرە تێگەیشتنێکی جیاوازیان هەبووە بۆ ژیان، هەر زۆر بە ئاسانی لەبەرئەوەی لە کاتێکی تر و لە ژینگەیەکی تردا دەژیان. هەروەها ئەزموونیش گرنگی تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام ژینگە ژیرێتی مرۆڤ دیاری ناکات، لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤێک لە ژیرێتیدا هاوبەشە. لەوانەیە بتوانین ژینگە و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، بە حاڵەتی ناو ئەشکەوتەکەی پلاتۆن بەراوردبکەین. لە ڕێگەی بەکارهێنانی ژیرێتییەوە، تاکە کەس دەتوانێت لە تاریکی ئەشکەوتەکە بێتە دەرەوە. بەڵام ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارە پێویستی بە ئازایەتیەکی گەورەی تاکە کەس هەیە. سوکراتیش نمونەیەکی باشی ئەو کەسەیە، ئەو بەیاریدەی ژیرێتییەوە توانی خۆی لە جۆرە تێگەیشتنێکی باوی سەردەمەکەی ڕزگاربکات. پاشانیش نووسی؛ «لە کاتی ئێستاماندا خەڵکی وڵاتان و کەلتوری جیاواز جیاواز، زیاتر و زۆرتر تێکەڵی یەکتری دەبن. لە هەمان گەڕەکدا لەوانەیە مەسیحی و موسڵمان و بودی پێکەوە بژین، لەبەرئەوە گرنگە ڕێز لە باوەڕی یەکتری بگرین و

هەمیشە پێویست ناکات بپرسین بۆچی هەموومان باوەڕ بە یەک شت ناکەین.«

سۆفیا پێی وابوو بە باشی سوودی لە مامۆستای فەلسەفەکەی وەرگرتبێت. لە کاتی نووسینیشدا دەیتوانی کەمێک لە ژیریێتی زگماکی خۆی بەکاربهێنێت و تێکەڵی ئەو شتانەی بکات کە خوێندبوونیەوە یان کە لە باسەکانی تردا بەرگوێی کەوتبوون.

پاشان هاتە سەر پرسیاری سێهەم؛ «مەبەستمان لە ویژدان چیە؟». لە پۆلەکەیاندا زۆر جار باسی ئەم بابەتەیان دەکرد. سۆفیا نووسی؛ «مەبەست لە ویژدان توانای هەڵسەنگاندن و هەڵسوکەوتی مرۆڤە بەرامبەر باشە و خراپە. بەڕای من هەموو مرۆڤێک خاوەنی ئەو توانایەیە، واتە بە مانایەکی تر ویژدان زگماکە. سوکراتیش بوایە هەر هەمان شتی دەگوت. بەڵام لە هەمان کاتیشدا پێدەچێت ویژدان لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر بگۆڕێت. بەبڕوای من لێرەدا سۆفیستەکان باسی شتێکی گرنگیان دەکرد، بەپێی ئەوان ژینگە و شێوەی بەخێوکردن، ویژدانی تاکەکەس دیاری دەکات. سوکراتیش لەبەرامبەردا لەو بڕوایەدا بوو ویژدان لەلای هەموو مرۆڤێک هەر هەمان شت بێت. لەوانەیە شتێکی ڕاستی لە هەردوو بۆچوونەکەدا هەبێت. بۆ نمونە؛ ئێمە هەموومان وەک یەک تووشی ویژدانی خراپ نابین گەر خۆمان بەڕووتی نیشانبدەین. بەڵام زۆربەی زۆری مرۆڤ ئەگەر خراپەکاری بەرامبەر مرۆڤێکی تر بکەن، ئەوا ویژدانیان ئازاریان دەدات. هەڵبەتە ئاشکرایە بوونی ویژدان و بەکارهێنانی ویژدان هەمان شت نین. لە بارێکی دیاریکراودا لەوانەیە وادەربکەوێت هەندێ مرۆڤ بێ ویژدانانە ڕەفتاربکەن، بەڵام بەڕای تایبەتی من، تەنانەت لەو جۆرە مرۆڤانەشدا شێوە ویژدانێک هەیە.

تەنها ئەوەندەیە کە بە قوڵی لە ناوەوەیاندا شاردراوەتەوە. بە هەمان شێوەش لەوانەیە هەندێ مرۆڤ بێ ئەقڵ دیاربن، بەڵام تەنها لەبەرئەوەیە کە بەکاریناهێنن.
تێبینی؛ دەتوانین هەم ئەقڵ و هەم ویژدانیش لەگەڵ ماسولکەیەکدا بەراوردبکەین. ئەگەر مرۆڤ هەرگیز بەکاری نەهێنێت، ئەوا هێدی هێدی لاوازتر و لاوازتر دەبێت.
پاش ئەمە تەنها یەک پرسیار مابووەوە؛ «مەبەست لە پلەی نرخاندن چییە؟» دیسانەوە ئەم بابەتەش یەکێک بوو لەو باسانەی کە لەماوەی ڕابووردودا زۆریان باس دەکرد. بۆ نمونە لەوانەیە لێخوڕینی ئۆتۆمبیل شتێکی باش بێت، چونکە مرۆڤ بە خێرایی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوێزێتەوە. بەڵام ئەگەر لێخوڕینی ئۆتۆمبیل ببێتە هۆی فەوتاندنی دارستان و پیسکردنی ژینگە، ئەوا مرۆڤ ئەوسا دووچاری هەڵبژاردنی یەکێک لە بەهاکان دەبێتەوە. سۆفیا پاش هەڵسەنگاندنێکی قوڵ گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دارستانی جوان و سروشتی پاک، بەنرختره لەوەی لەماوەیەکی کەمدا بگەینە سەر کار. پاشان چەندین نمونەی تریشی ناوبرد. لەدواجاریشدا نووسی؛ «بەبڕوای من وانەی فەلسەفە لە ڕێزمانی زمانی ئینگلیزی گرنگترە، لەبەرئەوە ئەگەر هەندێک لە وانەکانی ئینگلیزی لاببرێت و بوارێک بۆ وانەی فەلسەفە بکرێتەوە، ئەوا بەهایەکی بەرزتری دەبێت.«
مامۆستاکە لە دواهەمین پشوودا سۆفیای کەمێک هێنایە لاوە و گوتی؛
ـ وەڵامەکانتم خوێندەوە. کەوتبووە بەشی سەرەوەی وەڵامی قوتابیەکانی دیەوە.
ـ هیوادارم بەدڵت بووبێت.

- منیش ویستم دەربارەی وەڵامەکانت پێکەوە کەمێک قسە بکەین. لە زۆر لایەنەوە وەڵامەکانت کاملانەیە. هەر زۆر کاملانە و سەربەخۆیە. بەڵام ئایا وانەکانت ئامادەکردبوو؟

سۆفیا کەمێک خۆی تووڕەکرد؛

- تۆ خۆت گوتت گرنگی بە هەڵسەنگاندنی تایبەتی قوتابییەکان دەدەیت.

- بەڵێ، بەڵێ ... بەڵام دەشێ سنوورێکیشمان هەبێت.

سۆفیا ڕێک تەماشای ناوچاوی مامۆستاکەی کرد. پاش ئەو چەند شتەی ڕۆژانی پێشوو بەسەریدا هاتبوو، ئیتر وایدەزانی بۆی هەیە هەموو شتێک بکات، پاشان گوتی؛

- دەستم بە خوێندنی فەلسەفە کردووە، ئەمەش بنەمایەکی باشی بیرورا دەربڕینی تایبەت بە خۆمم پێ دەبەخشێت.

- بەڵام بۆم سەختە بڕیاربدەم... نازانم چ نمرەیەکت بدەمێ... یان دەبێت زۆر زۆر باشە وەرگریت، یان دەبێت نمرەیەکی زۆر کەمت بدەمێ.

- لەبەرئەوەی وەڵامەکانم یان تەواو ڕاستن یان تەواو هەڵەن؟ مەبەستت لەوەیە؟

- باشە... با بڵێین زۆر زۆر باشە وەردەگریت، بەڵام جارێکی تر دەشێ وانەکانیشت ئامادەبکەیت!

سۆفیا پاش نیوەڕۆ گەیشتە ماڵەوە. جانتاکەی لەسەر پێپلیکانەکان فرێدا و یەکسەر بەرەو کوخەکەی ڕایکرد. لەوێدا زەرفێکی زەردیان لەسەر ڕەگە ئەستورەکە بۆ دانابوو. هەموو قەراغەکانیشی ووشک بوون، دیابوو هێرمس دەمێک بوو دایینابوو.

زەرفەکەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و چووە ماڵەوە. لە پێشدا خواردنی گیانەوەرەکانی ڕۆکرد و پاشانیش چووە ژوورەکەی خۆی. لەسەر جێگاکەی ڕاکشا، نامەکەی ئەلبێرتۆ کنۆکسی کردەوە و دەستیکرد بە خوێندنەوە؛

## هیللینیزم *Hellenism*

ئەم کاتەت شاد سۆفیا! لەوەوپێش باسی فەیلەسوفە سروشتیەکان و سوکرات و پلاتۆن و ئەریستۆتالیسمان کرد. بەم شێوەیەش شارەزای بنچینەی فەلسەفەی ئەوروپی بوویت. لەمڕۆ بەدواوە ئیتر واز لە ڕاهێنانە فیکریەکان دەهێنین، کە لە دووتوێی نامە سپیەکاندا بۆم دەناردیت. پێم وابێت خۆت لە قوتابخانەدا زیاد لە پێویست ڕاهێنان و تاقیکردنەوەت هەیە.

ئێستاکە دەمەوێت باسی ئەو ماوە دورودرێژە بکەم کە لە ئەریستۆتالسەوە (لە کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش مەسیحەوە) دەست پێدەکات و هەتا سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست (نزیکەی ساڵی 400ی پاش مەسیح) درێژ دەبێتەوە. سەرنج بدە ئێستا دەنووسین پێش مەسیح و پاش مەسیح، لەبەرئەوەی یەکێک لە هەرە گرنگترین (وە سەرسوڕهێنەرترین) ڕووداوی ئەم ماوەیە، سەرهەڵدانی ئاینی مەسیحی بوو.

ئەریستۆتالیس لە ساڵی 322ی پێش مەسیحدا مرد. لەو کاتەدا ئەسینا ڕۆڵی پێشەوایی خۆی لەدەست دابوو. هۆکەشی بەتایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانکاریە ڕامیاریە مەزنانەی کە لە پاش داگیرکردنەکانی ئەلێکساندەری گەورەدا (356 تا 323 ی پێش مەسیح) ڕوویاندابوو.

ئەلێکساندەری گەورە پاشای ماکەدۆنیابوو. ئەریستۆتالیسیش خۆی خەڵکی ماکەدۆنیا بوو، لە ڕاستیشدا بۆ ماوەیەک لە کاتی لاوێتی ئەلێکساندەردا، ئەریستۆتالیس مامۆستای ئەو بووە. ئەلێکساندەر دواهەمین شەڕی لەگەڵ فارسەکاندا لابەلا کردەوە و لە دوا ئەنجامدا بەسەریاندا سەرکەوت. بەوەشەوە نەوەستا سۆفیا؛ بە خۆی و سوپا داگیرکەرە گەورەکەیەوە، میسر و ڕۆژهەڵاتی (هەتاوەکو هیندستان) بەشارستانی یۆنانیەوە بەستەوە.

لێرەشەوە سەدەیەکی نوێ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەستی پێکرد. کۆمەڵگایەکی جیهانی سەریهەڵدا کە کەلتور و زمانی یۆنانی ڕۆڵێکی زاڵیان تێیدا دەبینی. ئەم ماوەیە پێی دەگوترێت «هیللینیزم Hellenism»و نزیکەی 300 ساڵێک درێژەی کێشا. زاراوەی هیللینیزم، خودی ئەو ماوەیە و هەروەها زاڵبوونی کەلتوری یۆنانیش دەگرێتەوە کە لە سێ وڵاتی هیللینیستیا (ماکەدۆنیا و میسر و سوریا)دا سەردەستەبوو.

لە نزیکەی ساڵی 50ی پێش مەسیحدا، دەسەڵاتی سوپایی و سیاسی کەوتە دەستی «ڕۆم»ەوە. ئیدی هێواش هێواش ئەم هێزە گەورەیە هەر سێ وڵاتە هیللینیستەکەی داگیرکرد و بەمەش کەلتوری ڕۆمی و زمانی لاتینی بەسەر ناوچەکەدا زاڵبوو، هەر لە ئیسپانیاوە تا قوڵایی ئاسیا. لێرەشەوە سەردەمی ڕۆمەکان دەستی پێکرد؛ کەپێی دەگوترێت سەردەمی کۆنی پێشوو. لێرەدا دەشێت سەرنج بۆ خاڵێکی گرنگ ڕابکێشین؛ پێش ئەوەی ڕۆمەکان بتوانن جیهانی هیللینیستەکان داگیربکەن، خودی ڕۆما خۆی ببووە بەشێک لە کەلتوری یۆنانی. بەم شێوەیەش کەلتور و فەلسەفەی یۆنانی ڕۆڵێکی گرنگیان دەبینی، تەنانەت زۆر پاش ئەوەش کە ناواخنی سیاسەتی یۆنانی وەک

ئەکتەرێکی ئەفسانەیی لێ هاتبوو (*واتە ئەو کاتەی تەنها ناوەکەی مابووەوە.و).

*ئاین و فەلسەفە و زانست*

هیللینیزم مۆرکی توانەوەی سنووری نێوان وڵات و کەلتورە جیاوازەکانی پێوە دیابوو. لەوەوپێش یۆنانیەکان و ڕۆمەکان و میسرییەکان و بابیلۆنیەکان و سوریەکان و پارسەکان، لە چوارچێوەی «ئاینی نەتەوەی»دا خودای خۆیان دەپەرست. بەڵام لەگەڵ هاتنی هیللینیزمدا، هەموو کەلتورە جیاوازەکان لە تێکەڵەیەکی گەورەی وێناکردنی ئاینی و فەلسەفی و زانستیدا توانەوە.

تا ڕادەیەک دەتوانین بڵێین مەیدانێکی جیهانی لەبری گۆڕەپانی شار هاتە کایەوە. بەڵام لە گۆڕەپانی کۆنی شاریشدا کۆمەڵێک دەنگ بەرزدەبووەوە و چەندین بابەتی نوێیان هەڵدەڕشت، چەندین بیرۆکە و بۆچوونی هەمەڕەنگیان دەخستە ڕوو. وەک شتێکی نوێش، گۆڕەپانی شار پڕبوو لە کەرەسە و ئەندێشەی جیهانی. دەنگەکانیش بە زمانی جۆرا و جۆر بەرگوێ دەکەوتن.

لەوەوپێش گوتمان لەسەردەمی هیللینیزمدا بیرکردنەوەی یۆنانی زیاتر بڵاوبووەوە، هەڵبەتە گەر لەگەڵ ئەو کاتەدا بەراوردی بکەین کە لە ناوچەی کۆنی کەلتوری یۆنانیدا باوبوو. بەڵام بەرە بەرە هەموو خواکانی ڕۆژهەڵاتیش لە هەموو ناوچەکانی دەریای ناوەڕاستدا دەپەرستران. هاوکات کۆمەڵێ ئاینی نوێش سەریانهەڵدا، کە خودا و وێناکردنە ئاینیەکانیان لە نەتەوە کۆنەکانەوە سەرچاوەی هێنابوو. بەمەش دەگوترێت «سیونکریتیزم Syncretism» واتە تێکەڵبوونی ئاینی.

لەوەوپێش خەڵکی بە تووندی بە وڵات و ئاینی خۆیانەوە بەسترابوونەوە. بەڵام لەگەڵ تواندنەوە و فەوتاندنی سنوورەکاندا، خەڵکانێکی زۆر دونیا بینینی خۆیان بە چاوێکی پڕ لە گومانەوە دەبینی. بەشێوەیەکی گشتی لەسەردەمی کۆنی پێشوودا (*سەردەمی ڕۆمەکان.و)، وێنەی گومانی ئاینی و هەڵوەشاندنەوەی کەلتوری و ڕەشبینی دەبینرا، تەنانەت دەیانگوت «جیهان کۆنە.«
خاڵێکی هاوبەشی ناواخنی ئاینە نوێکانی سەردەمی هیللینیزم، باسی چۆنیەتی ڕەهابوونی مرۆڤی دەکرد لە مردن. زۆر جاریش ئەو فێرکردنە بە شێوەیەکی نهێنی ڕوویدەدا. لە ڕێگەی فێربوونی زانستێکی نهێنی ئاوها و جێبەجێکردنی سروتی ئاینی تایبەتیەوە، خەڵکی ئومێدی بەدەستهێنانی ڕۆحێکی نەمر و ژیانێکی هەتاهەتایی بوون. بەڵام پێدەچێت بینینێکی ڕوونی سروشتی ڕاستەقینەی گەردوون، بە هەمان شێوەی ئەو سروتە دینیانە بۆ ڕەهاکردنی ڕۆح بەنرخ بێت.
ئەمە دەربارەی ئاینە نوێکان، سۆفیا. بەڵام لەلایەکی ترەوە فەلسەفەش زیاتر و زۆرتر بەرەو ئاڕاستەی «ڕەهابوون» و هێمنکردنەوەی ژیان دەڕۆیشت. بینینی فەلسەفی چیتر تەنها لە خودی خۆیدا نرخێکی وای نەبوو، بەڵکو دەبوایە مرۆڤی لە دڵەڕاوکێی مردن و ڕەشبینیش ئازاد بکردایە. بەم جۆرەش سنووری نێوان ئاین و فەلسەفە توایەوە .
بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین فەلسەفەی هیللینیزمی ڕەسەنایەتیەکی چکۆلەی هەبوو. پلاتۆنێک یان ئەریستۆتالیسێکی نوێ سەریهەڵنەدا. بە پێچەوانەوە، هەر سێ فەیلەسوفە مەزنەکەی

ئەسینا بوونە سەرچاوەی سروشی چەندەها ڕێبازی فەلسەفی. لە ماوەی داهاتوودا بە کورتی لەسەریان دەدوێم.
بە هەمان شێوەش زانستی هیللینیزمیش بەوە جیادەکرایەوە کە ببووە تێکەڵەیەکی ئەزموونی کەلتورە هەمەڕەنگەکان. لەو کاتەدا شاری ئەسکەندەریەی میسر ڕۆڵێکی گرنگی دەبینی، شارەکە ببووە شوێنی کۆبونەوەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا. لە کاتێکدا شاری ئەسینا، بە هەموو قوتابخانە فەلسەفیەکانی پاش پلاتۆن و ئەریستۆتالیسەوە، وەک پایتەختێکی فەلسەفی مایەوە و بەردەوام ڕۆڵی خۆی دەبینی، لە هەمان ئەو کاتەدا شاری ئەسکەندەریەش ببووبە سەنتەرێکی زانستی. ئەو شارە بە کتێبخانە گەورەکانیەوە، وەک چەقێکی زانستی ماتماتیک و ئەستێرەناسی و بایۆلۆجی و زانستی پزیشکی لێهاتبوو.
دەتوانین کەلتوری هیللینیزمی بە کەلتوری جیهانی ئەمڕۆکە بشوبهێنین. سەدەی بیستەمیش مۆرکی کۆمەڵگای کراوەی جیهانی پێوەیە. تەنانەت لە کاتی ئێستاشماندا ئەم جۆرە تێکەڵبوونە گۆڕانکاریەکی گەورەی بەسەر ئاین و جۆری دونیا بینینماندا هێناوە. هەروەک چۆن کاتی خۆی لە ڕۆمادا مرۆڤ دەیتوانی پەرستگای یۆنانی و میسرِی و ڕۆژهەڵاتی ببینێت، بە هەمان شێوەش لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا لە هەموو شارە گەورەکانی ئەوروپادا کەم تا زۆر ئاینی وڵاتە جیاوازەکان بەدی دەکرێت.
لە کاتی ئێستاشماندا دەبینین تێکەڵبوونی ئاینی کۆن و نوێ و فەلسەفە و زانست، بنچینەی نوێی «بازاڕی تێڕوانین» دادەمەزرێنێت. زۆرینەی ئەو جۆرە «زانیاریە نوێیانەی» ئەمڕۆکە، لە ڕاستیدا جۆرە بیرکردنەوەیەکی کۆنن، بۆ نمونە ڕەگەکانیان دەگەڕێتەوە سەر هیللینیزم.

هەروەک لەوەوپێش باسمانکرد، فەلسەفەی هیللینیزمی درێژەی بەو کێشانە دا کە لە لایەن پلاتۆن و سوکرات و ئەریستۆتالیسەوە خرانەڕوو. خاڵی هاوبەشی هەمووشیان دۆزینەوەی باشترین شێوەی ژیان و مردنی مرۆڤ بوو. کەواتە ئیتیک بابەتی گرنگی سەردەمەکەیان بووە. هەر ئەمەش بووبە گرنگترین پرۆژەی فەلسەفەی کۆمەڵگای نوێی جیهان. گرنگترین بابەت ئەوە بوو کە بزانن بەختیاری ڕاستەقینە لە چ شتێک پێکهاتووە و چۆن چۆنی مرۆڤ دەتوانێت پێی بگات. وا لێرەدا باسی چوار جۆری ئەو ڕێبازە فەلسەفیانە دەکەین؛

**«سینیکەکان ‹Cynic**

دەگێڕنەوە دەڵێن جارێکیان سوکرات لەبەردەم مێزی دوکانێکدا وەستاوە و تەماشای شتەکانی کردووە. پاش ماوەیەک گوتوویەتی؛ «چەندە شتی زۆر لێرەدا هەن کە من پێویستم پێیان نیە.»!

دەکرێت ئەم گوتەیەی سوکرات بکرێتە ناونیشانی فەلسەفەی سینیکەکان، کە «ئانتیستێنیس «Antistenes لە نزیکەی ساڵی 400ی پێش مەسیحدا لە شاری ئەسینادا بنچینەکەی دامەزراند. ئەوخۆی قوتابی سوکرات بوو و بەپلەی یەکەمیش پابەندی بیروڕاکانی ئەو بوو.

بەختیاری ڕاستەقینە لەلای سینیکەکان نەبەستراوەتەوە بە شتە دەرەکیەکانی وەک شتی مەتریاڵی و دەسەڵاتی سیاسی و لەش ساغییەوە. ئەوان دەیان گوت بەختیاری ڕاستەقینە پەیوەستی جۆرە شتێکی ڕێکەوت نیە کە دێت و دەڕوات. هەر ڕێک لەبەر ئەو هۆیەش، بەختیاری شتێکە کە هەموو کەسێک دەتوانێت پێیبگات. هەر کاتێکیش

مرۆڤ بەختیاری ڕاستەقینەی بەدەست هێنا، ئیدی ڕێی تێناچێت لەدەستی بدات.

بەناوبانگترین فەیلەسوفی سینیک «دیۆجێنیس «Diogenes بوو کە قوتابی ئانتیستێنیس بوو. دەڵێن لەناو بەرمیلێکدا ژیاوە و جگە لە پاڵتۆیەک و گۆچانێک و کیسەیەکی نان زیاتر، خاوەنی هیچ شتێکی تر نەبووە. (بێگومان بەم شێوەیەش ئاسان نەبووە بەختیاری لێبسەندنەوە!). ڕۆژێکیان دیۆجێنیس لەبەر خۆردا لە تەنیشت بەرمیلەکەیەوە دانیشتبوو، لەو کاتەدا ئەلێکساندەری گەورە دێتە میوانی. لەبەردەم ئەو پیاوە دانایەدا دەوەستێ و لێی دەپرسێ؛ «هیچ شتێک دەخوازیت بۆت جێبەجێ بکەم؟» دیۆجێنیسیش لەوەڵامدا دەڵێ؛ «بەڵێ، دەخوازم هەنگاوێک بڕۆیتە ئەولاوە، چونکە بەری خۆرەکەت لێگرتووم.«!

بەو جۆرەش دیۆجێنیس نیشانیدا کە مرۆڤێکی دەوڵەمەند تر و بەختەوەرتریشە لە سەرکردەی سوپا گەورەکە، چونکە ئەو هەموو شتێکی هەبووە کە خوازیاری بێت.

سینیکەکان پێیان وابوو مرۆڤ پێویستی بەوە نەبێت کە نیگەرانی لەشساغی خۆی بێت. دەیانگوت تەنانەت پێویست ناکات لە ئازار و مردنیش بترسین. بەهەمان شێوەش پێویست ناکات خەمخۆری ئازاری خەڵکانی دی بین.

ئەمڕۆکە زاراوەی «سینیک» و «سینیسیزم «Cynicism بە کەسێک دەگوترێت کە هەست بە ئازاری خەڵکانی تر نەکات. بەڵام لە ڕەچەڵەکدا مانایەکی تەواو جیاوازی هەیە؛ «سیۆن «Cyon وشەیەکی یۆنانییە و مانای سەگ دەبەخشێت. لەو کاتەدا بە ئانتیستێنیس و

دیۆجێنیس و ئەوانی تریان دەگوت سینیکەکان، لەبەرئەوەی وەک سەگ دەژیان؛ بە شتێکی کەم قایل بوون و بێ پیلان و بێ شەرم بوون.

## ستۆیکەکان «Stoic»

سینیکەکان پاشتر کاریگەرییان لەسەر فەلسەفەی ستۆیکی جێهێشت، کە لە نزیکەی ساڵی 300ی پێش مەسیحدا لە ئەسینادا سەریهەڵدا. دامەزرێنەری ئەم ڕێبازەش زینۆن «Zenon» بوو. ئەم لە بنەڕەتدا خەڵکی قوبروس بوو، بەڵام پاش ڕووداوی کەشتی شکاندنەکەی، خۆی گەیاندە سینیکەکانی ئەسینا. زینۆن زیاتر شاگردەکانی لە بەردەم پایەیەکدا کۆدەکردەوە، ناوی «ستۆیک Stoic» لە وشەی «ستۆیا Stoa»ی یۆنانییەوە هاتووە کە ڕێک مانای «بەردەم پایە» دەبەخشێت. دواتریش ستۆیکسیزم کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر کەلتوری ڕۆمی دانا.
ستۆیکەکان، هەروەک هیراکلیتس، لەو بڕوایەدابوون هەموو مرۆڤێک بەشێکی لە ژیریی جیهاندا یان لە «لۆگۆس»دا هەبێت. دەیانگوت هەموو تاکەکەسێک وەک جیهانێکی چکۆلەکراو وایە؛ گەردوونی بچکۆلە بەرپەرچدانەوەی «گەردوونی گەورەیە.»
ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش بوو بە هۆی سەرهەڵدانی جۆرە یاسایەکی گشتی؛ ئەو یاسایەی کە پێی دەڵێن «یاسای سروشتی». دەیانگوت کاتێک کە یاسای سروشتی لەسەر بنەمای ژیرێتی مرۆڤ و گەردوون پێکهاتبێت، کەواتە کات و شوێن ناتوانێت بیگۆڕێت. بەم شێوەیەش، لەم بارەیاندا لایەنی سوکراتیان دەگرت کە دژ بە سۆفیستەکان بوو.
یاسای سروشتی هەموو کەسێک دەگرێتەوە و هەمان شتیشە بۆ کۆیلەکان. ستۆیکەکان یاسا هەمەڕەنگەکانی ناو کتێبەکانیان بە

لاسایی کردنەوەیەکی ناتەواوی «یاسای سروشت» لەقەڵەم دەدا، ئەو یاسایەی کە بەپێی ئەوان لەناو خودی سروشتدا بوونی هەیە.
ستۆیکەکان جیاوازی نێوان مرۆڤ و گەردوونیان دەسڕییەوە، هەر بە هەمان شێوەش نکۆڵییان لە دژایەتی نێوان «ڕۆح» و «مادە» دەکرد. بەبڕوای ئەوان تەنها یەک سروشت بوونی هەیە. بەم جۆرە تێگەیشتنەش دەگوترێت «مۆنیزم «Monism واتە یەکایەتی. (ئەمەش، بۆ نمونە، دژ بە «دوالیزم«Dualism ە ڕوونەکەی پلاتۆنە کە بوونی بەسەر دوو بەشدا دابەشدەکرد.)
ستۆیکەکان وەک ڕۆڵەیەکی ڕاستەقینەی سەردەمەکەی خۆیان، ڕەنگدانەوەیەکی «کۆسمۆپۆلیتان«Cosmopolitan یان پێوە دیاربوو (*واتە کەسێکی جیهانی؛ کەسێک کە جیهان بە وڵاتی خۆی بزانێت، یان کەسێک کە لە نەریتی ناوچەگەری و وڵات پەرستی دورەپەرێز بێت.و). بەم شێوەیەش بە بەراورد کردنیان لەگەڵ «فەیلەسوفی بەرمیلەکان _سینیکەکان»دا کراوەتربوون بەرامبەر کەلتورەکانی سەردەمیان. هەروەها ئاماژەشیان بۆ پێکەوە هەڵکردنی مرۆڤایەتی دەکرد. ستۆیکەکان خولیای ڕامیاری بوون و زۆربەشیان چالاکانە لەسەر ئاستی وڵاتدا ڕۆڵیان دەبینی، بۆ نمونە «مارکۆس ئاورێلیوس «Marcus Aurelius(ساڵی 121 تا 180) ئیمپراتۆری ڕۆمەکان بوو. بەدەر لەمانەش ستۆیکەکان یاریدەی پێشخستنی کەلتور و فەلسەفەی یۆنانییان دەدا، لەم بوارەشدا دەتوانین وەک نمونەیەک ناوی «سیسیرۆ «Cicero ( 106تا 43ی پێش مەسیح) بهێنین کە ڕەوانبێژ و سیاسی و فەیلەسوفیش بوو. ئەم بوو کە زارەوەی «هیومانیزم «Humanismی داهێنا واتە مرۆڤ دۆستی، دیسانەوە واتە جۆرە تێڕوانین و فەلسەفەی ژیانێک کە تاکەکەس دەکاتە چەق یان

سەنتەر. «سێنیکا Seneca» (4ی پێش مەسیح تا 65ی پاش مەسیح) کە فەیلەسوفێکی ستۆیکی بوو، چەند ساڵێک دواتر گوتی؛ «مرۆڤ شتێکی پیرۆزە بۆ مرۆڤ»، ئەم گوتەیەی لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا مایەوە و دواتر بووبە دروشمی هەموو مرۆڤ دۆستێک.
جگە لەمانەش ستۆیکەکان جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە هەموو پرۆسێسێکی سروشت (بۆ وێنە نەخۆشی و مردن) بەپێی یاسای نەگۆردراوی سروشت دەڕوات بەڕێوە. لەبەرئەمەش دەیانگوت دەبێت مرۆڤ بەناچاری لەگەڵ چارەنووسیدا هەڵبکات. بە بڕوای ئەوان هیچ شتێک بە ڕێکەوت ڕونادات، بەڵکو هەموو شتێک بەپێی پێویستی ڕوودەدات؛ لەبەرئەوە کاتێک چارەنووس لەدەرگا دەدات، ئەو کاتە گلەیی کردن هیچ سوودێک نابەخشێت. وەکی تریش دەیانگوت مرۆڤ دەشێ ڕووداوە خۆشەکانی ژیانیش بە هێمنی وەرگرێت. لێرەدا جۆرە نزیکیەک لەگەڵ سینیکەکاندا بەدیدەکرێت، کە دەیانگوت؛ هەموو شتێک کە لە دەرەوەڕا دێت، هیچ گرنگیەک و نرخێکی وای نیە. ئەمرۆکە زاراوەی «هێمنی ستۆیکی» بە کەسێک دەگوترێت کە ڕێگە نەدات هەستەکانی بەسەریدا زاڵبن.

### ***«ئێپیکوریانیەکان Epicurean»***

هەروەک لەوەوپێش بینیمان، سوکرات وێڵی دۆزینەوەی شێوە ژیانێکی باش بوو. هەم سینیکەکان و هەم ستۆیکەکانیش بەم جۆرەی خوارەوە ڕاڤەی ناواخنی فێرکردنەکانی سوکراتیان دەکرد؛ دەشێ مرۆڤ خۆی لە خۆشی مادی ڕەهابکات. بەڵام سوکرات قوتابیەکی تریشی بەناوی «ئاریستیپۆس Aristippos»ەوە هەبوو. بەبڕوای ئەو ئامانجی ژیان لەوەدایە کە گەورەترین چێژی هەستی بەدەستبهێنین. ئەو دەیگوت؛

«چێژ، باڵاترین باشەیە و ئازاریش خراپترین شتە». (لە کاتێکدا پەسەندکردنی هەموو جۆرە ئازارێک، ئامانجی سینیک و ستۆیکەکان بوو. ئەمەش شتێکی تەواو جیاوازترە وەک لەوەی بە هەموو شێوەیەک هەوڵبدەیت ئازار نەچێژیت).
نزیکەی ساڵی 300ی پێش مەسیح، «ئێپیکور Epicur» ( 341تا 270ی پێش مەسیح) قوتابخانەیەکی فەلسەفی لە ئەسینادا دامەزراند. ئەو گەشەی بە تیۆری چێژەکەی ئاریستیپۆس دا و لەگەڵ تیۆری ئەتۆمەکەی دیمۆکریتسدا گرێیدا.
دەڵێن ئێپیکورەکان لە باخچەیەکدا کۆدەبوونەوە، لەبەرئەوە پێیان دەگوترێت «فەیلەسوفەکانی باخچە». لەسەر دەرگای چوونە ژوورەوەی ئەو باخچەیەش، ئەم چەند وشەیە هەڵکەندرابوو؛ «ئەی نامۆکان، لێرەدا بە باشی مامەڵە دەکرێن، لێرەدا چێژ ترۆپکی باشییە.«
ئێپیکور خاڵێکی گرنگی دوپات دەکردەوە و دەیگوت نابێت تێرکردنی ئارەزوو کاریگەری لاوەکیمان لە بیربەرێتەوە. ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان شیرینیەکی زۆرت خواردبێت، ئەوا دەزانیت مەبەستم چیە. ئەگەر نا، ئەوا ئەم تاقیکردنەوەیەی خوارەوە ئەنجام بدە؛ لەو پارانەی پاشەکەوتت کردووە، بڕۆ بایی 200 کرۆن شیرینی بکڕە (وایدادەنێین کە حەزت لە شیرینییە). لەم تاقیکردنەوەیەدا گرنگە هەموو شیرینییەکە بەیەک جار بخۆیت. ئەوجا پاش نیو سەعاتێک تێدەگەیت ئێپیکور مەبەستی لە «کاریگەری لاوەکی» چیە.
مرۆڤ لە ڕوانگەی ئێپیکورەوە دەبێت تێرکردنی ئارەزووی کاتیی خۆی لەگەڵ ئارەزووی گەورەتر و بەردەوامتردا، کە پاشان دێت، بگۆڕێتەوە. (لەوانەیە بۆ ماوەی شەش مانگێک نەتەوێت شیرینی بخۆیت، چونکە

دەتەوێت پارەکەت پاشەکەوت بکەیت و پاسکیلێکی نوێی پێبکڕیت، یان گەشتێکی دەرەوەی وڵاتی پێبکەیت). مرۆڤ بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە، توانای پیلان دانانی ژیانی هەیە، توانای «بەرنامە ڕێژی» ئارەزووەکانی هەیە. شیرینی خۆش باشە، بەڵام پاسکیلێکی نوێ باشترە، یان گەشتێکی بەریتانیا خۆشترێکە.
لەم ڕوانگەیەشەوە ئێپیکور دەیگوت مەرج نیە «ئارەزوو» و چێژی هەستی (بۆ نمونە شیرینی) هەمان شت بن. بە هەمان شێوەش بەهای دیکەی وەک هاوڕێیەتی و چێژی هونەریش. لەسەرو ئەمانەشەوە ئیدیالە کۆنەکانی یۆنانیەکانیان (بۆ نمونە سنووربەندی و مام ناوەندێتی و هێمنی مێشک) ببوونە شتێکی بنچینەیی و پێویستی چێژ وەرگرن لە ژیان. دەیانگوت دەشێ بەسەر ئارەزووەکانماندا زاڵبین، بەم جۆرەش مێشکی هێمن یاریدەی بەرگەگرتنی ئازارمان دەدات.
زیاتر ئەو کەسانە دەهاتنە باخچەکەی ئێپیکور، کە ترسی دینییان لە دڵدا بوو. لێرەشدا تیۆری ئەتۆمەکەی دیمۆکریتسیان وەک ئامێرێکی بەسوود دژ بە ئاین و خورافیات بەکاردەهێنا. بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت ژیانێکی باش بژی، دەبێت بەلایەنی کەمەوە بەسەر ترسی مردندا زاڵبێت. لەوێدابوو کە ئێپیکور تیۆری «ئەتۆمی ڕۆحی»ەکەی دیمۆکریتسی بەکاردەهێنا. گەر لە یادت مابێت، بەپێی دیمۆکریتس لەدوای مردنەوە ژیان بوونی نیە، چونکە بە بڕوای ئەو کاتێک کە دەمرین، «ئەتۆمە ڕۆحی»یەکان پەرش و بڵاو دەبنەوە.
ئێپیکور زۆر بەساکاری دەیگوت؛ «مردن پەیوەندی بە ئێمەوە نیە. چونکە هەتاوەکو بژین، مردن بوونی نیە. کاتێکیش کە مردین، ئەوسا چیتر ئێمە بوونمان نیە». (لە ڕاستیشدا هەرگیز هیچ مرۆڤێکی مردوو، گلەیی لەوە نەکردووە کە مردووە!).

ئێپیکور فەلسەفەی ڕەهاکردنەکەی خۆی ناو نابوو «چوار گژوگیای چاکبوونەوە» و ئەو خۆی بەم شێوەیەی خوارەوە کورتی کردبووەوە؛

»خواکان جێگەی ترسمان نین.
مردن ئەوە ناهێنێت نیگەرانی ببین.
ئاسانە باشی بەدەست بهێنین.
ئاسانە بەرامبەر ترس خۆڕاگربین.«

لە سەردەمی یۆنانیەکاندا شتێکی ئاسایی بوو گەر ئەرکی فەیلەسوفێک لەگەڵ هونەری پزیشکێکدا بەراوردبکەن. مەبەستی سەرەکیشیان لەوەبوو کە مرۆڤ دەشێ «دەرمانخانەیەکی فەلسەفی سەفەری» پێبێت و ئەو چوار دەرمانەی سەرەوەی تێدا بێت.
ئێپیکوریەکان بە پێچەوانەی ستۆیکەکانەوە، بایەخێکی زۆر کەمیان بە ڕامیاری و ژیانی کۆمەڵگا دەدا. ئێپیکور وەک ئامۆژگاریەک دەیگوت؛ «لە نهێنیدا بژی!». لەوانەیە بتوانین باخچەکەی ئەو لەگەڵ ماڵی بە کۆمەڵی (*مەبەست لە جۆرێکی تایبەتی ماڵە کە زیاتر لە ئەوروپادا دەبینرێت، لەو ماڵانەدا خەڵکانێکی جیاواز جیاواز لەبەر هۆی هەمەڕەنگ کۆدەبنەوە و پێکەوە دەژین.و) سەردەمی ئێستاکەماندا بەراورد بکەین. لە کاتی ئەمڕۆشماندا خەڵکانێکی زۆر لە کۆمەڵگای گەورە هەڵدێن و پەنا بۆ «باخچەیەکی هێمن» دەبەن.
لەپاش ئێپیکور، زۆربەی ئێپیکوریەکان بوونە لایەنگری تێرکردنی ئارەزوەکانیان و دروشمەکەشیان بوو بە «لە کاتی ئێستادا بژی».
ئەمڕۆکە وشەی ئێپیکوری بەمانای نرخ کەمکردنەوەی کەسێک بەکاردێت، بۆ نمونە بۆ هێماکردنی دەوڵەمەندێکی بەتاڵ.

**پلاتۆنیزمی نوێ**

لەماوەی ڕابوردوودا بۆمان دەرکەوت کە ڕیشەی سینەکەکان و ستۆیکەکان و ئێپیکوریەکان دەچنەوە سەر سوکرات و فەیلەسوفە پێش ـ سوکراتیەکانی وەک هیراکلیتس و دیمۆکریتس. بەڵام دیارترین ڕێبازی فەلسەفی سەردەمی کۆنی پێشوو، سروشی لە تیۆری «بیر»ەکەی پلاتۆنەوە وەرگرتووە. هەر لەبەر ئەم هۆیەش پێی دەگوترێت پلاتۆنیزمی نوێ.

بەناوبانگترین فەیلەسوفی ئەم ڕێبازە، «پلۆتین «Plotin بوو (نزیکەی ساڵی 205 تا 270) ئەم خوێندنی فەلسەفەی لە ئەسکەندەریە تەواوکرد و پاشانیش لە شاری ڕۆمادا نیشتەجێبوو. لێرەدا گرنگە سەرنج بدەین کە پلۆتین خەڵکی شاری ئەسکەندەریە بووە، ئەو شارەی کە سەدان ساڵ بوو ببووە جێگەی کۆبوونەوە و پێگەیشتنی فەلسەفەی یۆنانی و ڕۆحانیەتی ڕۆژهەڵاتی. پلۆتین لەگەڵ خۆیدا تیۆریەکی ڕەهاکردنی گەیاندە ڕۆما و لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحیدا ململانێیەکی بەهێزی ئاینی مەسیحی پێدەکرد. بەڵام پاشتر پلاتۆنیزمی نوێ کاریگەرییەکی هەست پێکراوی لەسەر تیۆلۆژی (لاهوت) ئاینی مەسیحی بەجێهێشت.

بێگومان سۆفیا تیۆری «بیر»ەکەی پلاتۆنت لە یادە؛ ئەو بیرۆکەیەی کە جیهانی «بیر» و جیهانی «هەستی» لەیەک جودا دەکردەوە، هەروەها جیاوازیەکی ئاشکرای نێوان ڕۆحی مرۆڤ و لەشی مرۆڤ دەخستە ڕوو. لەو ڕوانگەیەشەوە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی دوولایەنی تەماشادەکرا؛ لەش، کە وەک هەموو شتێکی تری جیهانی هەست لە خاک و گەرد پێکهاتووە. دووهەمیشیان ڕۆح، کە نەمرە. لە نێو

یۆنانیەکاندا ئەم جۆرە مەزەنەکردنە زۆر لەپێش پلاتۆنەوە باو بوو. جگە لەمانەش پلۆتین ئاشنای بیرکردنەوەی ئاسیایی نزیک بەو بابەتە بووە.
بەپێی پلۆتین جیهان کەوتۆتە نێوان دوو جەمسەرەوە؛ لەو پەڕی جەمسەرێکیانەوە، ڕووناکی خوایانەمان هەیە، کە ناوی نابوو «تەنها یەک»، جارجارێکیش پێی دەگوت «خودا». لەوپەڕی جەمسەرەکەی ترەوە، تاریکی پڕوپڕمان هەیە و هیچ ڕووناکیەکی لە «تەنها یەک»ەکەوە پێ ناگات. بەڵام پلۆتین دەیگوت ئەو تاریکیە پڕاوپڕە لە ڕاستیدا هیچ بوونێکی نیە و تەنها ئەوەندەیە کە ڕووناکی پێ ناگات، یان بە جۆرێکی تر بیڵێین؛ بوونی نیە. تەنها شت کە بوونی هەیە، «تەنها یەک»ە یان «خودا»یە، بەڵام هەروەک چۆن سەرچاوەی ڕووناکیەک هێدی هێدی لەناو تاریکیدا ون دەبێت، بە هەمان شێوەش شوێنێک هەیە کە سنوورێک بۆ پێگەیشتنی ڕووناکی خوایانە دادەنێت.
لە ڕوانگەی پلۆتینەوە، ڕۆح بە ڕووناکی «تەنها یەک» دەدرەوشێتەوە و مادەکەش ئەو تاریکیەیە کە لە ڕاستیدا هیچ بوونێکی نیە. بەڵام فۆڕمەکانی سروشت بەرپەرچدانەوەیەکی لاوازی خوایانەیان لەسەرە.
سۆفیای ئازیز، دیمەنی ئاگرێکی گەورە بهێنەرە بەرچاوت کە لە شەوێکدا کراوەتەوە. پریشکی ئاگرەکە بەهەر چوارلادا بڵاودەبێتەوە. شەو، بەهۆی ڕووناکی ئاگرەکەوە، لە چوارچێوەیەکی بەریندا ڕووناک بۆتەوە؛ تەنانەت لە دوری چەند کیلۆمەترێکیشەوە ڕووناکیەکی کزی ئاگرەکە دەبینرێت. بەڵام ئەگەر لە ئاگرەکە دورتر بکەوینەوە، ئەوسا تەنها خاڵێکی چکۆلەی ڕووناکی دەبینین کە هەروەک چرایەکی کزی شەو دێتە بەرچاو. بەڵام ئەگەر بەردەوام لە ئاگرەکە دورکەوینەوە، ئەوا لە دوا ئەنجامدا دەگەینە خاڵێک کە چیتر ڕووناکیمان پێ ناگات.

واتە لە شوێنێکدا ڕووناکی لەناو تاریکی شەودا خۆی لەدەست دەدات و کاتێکیش تەواو تاریک دەبێت، ئەوساکە ئیدی هیچ شتێک نابینین. لەوێدا هیچ سێبەرێک و وێنەیەک بەدی ناکەین.
ئێستاکە مەزەنەی ئەوە بکە کە هەقیقەت ئاگرێکی ئاوها بێت. خودا ئەو شتەیە کە دەسوتێت. تاریکیەکەی دەرەوەش، ئەو مادە ساردەیە کە مرۆڤ و ئاژەڵی لێ درروست کراوە. لەنزیک خوداوە، هەموو ئەو «بیر»ە نەمرانەی لێیە کە فۆڕمی بنەڕەتی هەموو بوونەوەرێکن. لە پێش هەموو شتێکیشەوە ڕۆحی مرۆڤ دێت، کە وەک «پریشکی ئاگرەکە» وایە. بەڵام لە هەموو شوێنەکانی تری سروشتدا کەمێک لە ڕووناکی خوایانە هەڵدێت. دەتوانین ئەم ڕووناکیە لە هەموو بوونەوەرێکی زیندوودا ببینین... بەڵێ، تەنانەت لە گوڵەباخێدا و لە گوڵە نێرگزێکیشدا ئەم جۆرە تیشکە خوایانەیە دەبینین. دور لە خودای زیندووشەوە زەوی و بەرد و ئاوی لێیە.
کەمێک لە نهێنی خوایانە بوونی لە هەموو شتێکی چواردەورماندا هەیە. لەناو گوڵەبەڕۆژەیەکدا یان لەناو گوڵە خەشخاشێکدا دەیبینین کە دەدرەوشێتەوە. کەمێک زیاتری ئەم نهێنیە خوایانەیەش لەناو پەپولەیەکدا دەبینین کە لەسەر گوڵێک دەنیشێتەوە، یان لە ماسیە زەردەیەکدا بەدیدەکەین کە مەلە دەکات. بەڵام مەزنترین نهێنی خوایانە لە ڕێگەی ڕۆحی خۆمانەوە لێی نزیک دەبینەوە. تەنها لەوێدا دەتوانین لەگەڵ نهێنی گەورەی ژیاندا ببینە یەک... بەڵێ، لە چەند ساتێکی دەگمەنیشدا لەوانەیە هەستکەین خۆمان ئەو نهێنیە خوایانەیە بین.
ئەو وێنانەی پلۆتین بەکاریدەهێنێت، چیرۆکی ئەشکەوتەکەی پلاتۆنمان دێنێتەوە یاد؛ هەتاوەکو زیاتر لە دەمی ئەشکەوتەکە نزیک

ببینەوە، زیاتر و زۆرتر سەرچاوەی بوونەکانمان بۆ دەردەکەوێت و زیاتریش دەزانین لە چ شوێنێکەوە هەڵدەقوڵێن. بەڵام بە پێچەوانەی هەقیقەتە دوو بەشکراوەکەی پلاتۆنەوە، بیرکردنەوەی پلۆتین هەستێکی یەکبوون دەبەخشێت. هەموو شتێک یەکە، چونکە هەموو شتێک خودایە. تەنانەت سێبەرەکانی خواری خوارەوەی ئەشکەوتەکەی پلاتۆنیش تیشکێکی لاوازی «خوایانەیان» بەردەکەوێت.

پلۆتین لە درێژایی تەمەنیدا، چەند جارێک هەستی بە توانەوەی ڕۆحی خۆی کردووە لەگەڵ خودادا. ئێمە بەو هەستکردنە دەڵێین «ئەزموونی پەنهانی یان ڕۆحانی». پلۆتین تەنها کەس نیە کە ئەو جۆرە هەستکردنەی تاقیکردبێتەوە. ئەمە شتێکە کە هەموو مرۆڤایەتی لە هەموو سەردەمەکان و لە هەموو کەلتورە جیاوازەکاندا باسیان کردووە. پێدەچێت بە شێوەی جیاواز جیاواز باسیان کردبێت، بەڵام خاڵی سەرەکی باسەکانیان هەر هەمان شتە. وا لە خوارەوە هەندێک لەو باسە هاوبەشانە دەخەینە ڕوو.

### ڕۆحانیەت

ئەزموونی ڕۆحانی واتە هەستکردن بە یەک بوون لەگەڵ خودادا، یان لەگەڵ «ڕۆحی گەردووندا». زۆربەی ئاینەکان بۆشاییەک لە نێوان خودا و بوونەوەردا دادەنێن. بەڵام لە ڕوانگەی کەسێکی ڕۆحانییەوە ئەو بۆشاییە بوونی نیە. ئەو چ پیاو بێت و چ ئافرەت، هەست بە «یەک بوون لەگەڵ خودا»دا دەکات، هەست دەکات «بۆ لای خوا سەردەکەوێت» یان پێی وایە لەگەڵ «خودادا دەتوێتەوە.«

بیرۆکەکە لەوەدایە کە ئەو «خود»ەی بە ڕۆژانە خۆمانی پێ دەناسێنین، نوێنەری «خود»ی ڕاستەقینەی ئێمە نیە، چونکە پێدەچێت لە ساتێکی کورتدا هەستبکەین هاوتای «خود»ێکی گەورەتربین. هەندێ لە ڕۆحانیەکان بەوە دەڵێن خودا، هەندێکی تر ناوی دەنێن «ڕۆحی جیهان» یان «سەرتاپای سروشت» یان «کۆی جیهان». کەسە ڕۆحانیەکە لە کاتی ڕوودانی توانەوەکەدا هەست دەکات خۆی «ون» دەکات... لەناو خودادا ون دەبێت، یان دەتوانین بڵێین لەناو خودادا دیار نامێنێت. هەروەک چۆن دڵۆپە ئاوێک کاتێک تێکەڵ بە دەریایەک دەبێت، «خۆی ون دەکات». جارێکیان ڕۆحانیەکی هیندی بەم شێوەیە دەریبڕی؛ «کاتێک کە من هەبووم، خودا بوونی نەبوو. ئێستاکە خودا بوونی هەیە و چیتر من بوونم نیە». سیلینسیۆس «Silensius»( 1624تا 1677) ڕۆحانیەکی مەسیحی بوو، ئەو بەم شێوەیە باسی ئەزموونەکەی دەکرد؛ «هەموو دڵۆپە ئاوێک کە دەگاتە دەریا، دەبێتە دەریا. بە هەمان شێوەش کە ڕۆح بۆ لای خوا سەرکەوت، دەبێتە خودا.«

سۆفیای ئازیز، تێدەگەم گەر بڵێیت «خۆ ونکردن» لەوانەیە هەستێکی ناخۆش ببەخشێت. بەإم خاڵە گرنگەکە لەوەدایە کە ئەو شتەی ونی دەکەیت زۆر زۆر گچکە ترە لەوەی کە دەستت دەکەوێت. تۆ لەو فۆڕمەی لەکاتی ئێستادا لەبەرچاوتایە وندەبیت، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆت دەردەکەوێت کە لە ڕاستیدا زۆر زۆر مەزنتریت. تۆ کۆی جیهانیت... بەڵێ، تۆ خودی ڕۆحی جیهانیت سۆفیای ئازیز... تۆ خودایت. ئەگەر خۆتت وەک سۆفیا ئامۆنسن بەدەستەوە دا، ئەوا زۆر نیگەران مەبە، چونکە لە هەموو بارێکدا ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر دەبێت «ئەو خودی ڕۆژانەیەت» لەدەست بدەیت. خودی ڕاستەقینەت (کە

تەنها ئەو کاتە هەستی پێدەکەیت کە وازت لە خۆت هێنابێت) بەپێی ڕۆحانیەکان وەک ئاگرێکی سەیروسەمەرە وایە، کە بۆ هەتاهەتایە هەر بە سوتاوی دەمێنێتەوە.

بەڵام ئەزموونی ڕۆحانی هەموو کاتێک خۆی بۆ خۆی نایەت. کەسەکە دەبێت لەپێشدا بە ڕێگەی «پاکبوونەوە و ڕووناکبوونەوە»دا بڕوات، ئەوجا دەتوانێت بە خودا بگات. ئەم ڕێگایەش پێویستی بە تەرزە ژیانێکی ساکار و چەند تەکنیکێکی جیاواز جیاوازی خەڵوەتگرتن هەیە. هەتا ڕۆژێک لە پڕێکدا کەسەکە هاواردەکات و دەڵێت؛ «من خودام» یان «من تۆم.«

ڕێبازی ڕۆحانیەت، لە هەموو ئاینە گەورەکانی جیهاندا بەدیدەکرێت. هەرچەندە ڕۆحانیەکان لە چەند کەلتورێکی جیاوازەوە باسی ئەزموونی نهێنی خۆیان دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێکچوونێکی گەورە لەنێو وەسفەکانیاندا بەدیدەکرێت. کاتێکیش ڕۆحانیەکان لێکدانەوەیەکی ئاینی یان فەلسەفی ئەزموونەکەیان دەخەنەڕوو، تەنها ئەو کاتە باسی ڕابووردوی کەلتوریان دێتە پێشەوە.

لە ڕۆحانیەتی ڕۆژئاوادا (واتە لەناو ئاینی جولەکە و مەسیحی و ئیسلامدا) ڕۆحانیەکان جەخت لەسەر گەیشتن بە خوایەکی تایبەتی دەکەن. ئەوان دەڵێن هەرچەندە خودا لە سروشت و ڕۆحی مرۆڤدا بوونی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خودا لەسەرو هەموو جیهانیشەوەیە. بەڵام لە ڕۆحانیەتی ڕۆژهەڵاتدا (واتە لەناو ئاینی هیندۆیزم و بودیزم و چینیدا) زیاتر وا باوە کە جەخت لەسەر توانەوەی تەواوەتی لەگەڵ خودادا یان لەگەڵ «ڕۆحی گەردوون»دا بکەن. ڕۆحانیەکان دەڵێن؛ «من ڕۆحی گەردوونم» یان دەڵێن «من

خودام». چونکە ئەگەر خودا لە جیهاندا بوونی نەبێت، ئەوا لە هیچ شوێنێکی تریشدا بوونی نیە.
زۆر لەپێش سەردەمی پلاتۆنەوە، بەتایبەتیش لە هیندستاندا، تەوژمێکی گەورەی ڕۆحانی باو بوو. یەکێک لەو هیندیانەی کە بیری هیندۆیزمی بە ڕۆژئاوا ناساند «سوامی ڤیڤیکانانادا Swami Vivikananada»بوو، ئەو جارێکیان گوتی؛
«هەروەک چۆن هەندێک ئاینی جیهانی دەڵێت؛ ئەو کەسە بێ بڕوایە کە لەدەرەوەی خۆیدا باوەڕی بە خوایەکی تایبەتی نەبێت، ئێمەش دەڵێین؛ ئەو مرۆڤەی باوەڕی بەخۆی نەبێت ، بێ بڕوایە. بێ بڕوایی ئەوەیە کە باوەڕت بە پیرۆزی ڕۆحی خۆت نەبێت.»
پێدەچێت ئەزموونی ڕۆحانی لەسەر ئیتیکیش کاریگەری خۆی هەبێت. سەرۆکێکی پێشووتری هیندستان، ڕادها کریشنە، جارێکیان گوتی؛ «دەبێت بەرامبەرەکەتت وەک خۆت خۆشبوێت، لەبەرئەوەی خۆت بەرامبەرەکەتیت. تەنها خەیاڵی خاو وات لێدەکات کە باوەڕکەیت بەرامبەرەکەت جگە لە خۆت، شتێکی ترە.»
خەڵکانی ئەمڕۆکەش، ئەوانەی سەر بە هیچ ئاینێک نین، باس لە ئەزموونی پەنهانی دەکەن. لەوانەیە لە پڕێکدا هەستیان بە شتێک کردبێت کە بە «ئاگایی گەردوونی» دابنێن، یان وەک «هەستێکی ئۆقیانوسی» ببینن. ئەوان هەستیان کردووە کە لە بازنەی کات ڕەهابوون و جیهانیان «لە ڕوانگەیەکی هەتاهەتاییەوە» بینیووە.

سۆفیا لە جێگاکەیدا ڕاست بووەوە. تەنها بۆ ئەوەی دڵنیابێت کە هێشتام خاوەنی جەستەیەتی، زوو زوو دەستی لە لەشی دەدا...

پاش ئەوەی دەربارەی پلاتۆن و ڕۆحانیەکانی خوێندەوە، بەرە بەر هەستی دەکرد بە ئاسمانی ژوورەکەیدا بەرزدەبێتەوە و دەخولێتەوە، لە پەنجەرەکەوە دێتە دەرەوە و بەرز بە ئاسمانی شارەکەیاندا دەفرێت. هەموو مرۆڤەکانی خوارەوەی ناو گۆڕەپانەکەی دەبینی، بەڵام بەردەوام دەفڕی... بەسەر ئەو شوێنانەدا کە لێی دەژیا، بەسەر دەریای باکور و ئەوروپادا، بەسەر بیابانەکاندا هاتە خوارەوە و خۆی گەیاندە دەشتە بەرینەکانی ئەفریقا.

هەموو ئەو زەویە مەزنە وەک یەک مرۆڤی مەزنی لێهاتبوو، سۆفیاش هەستی دەکرد ئەو مرۆڤە خۆی بێت. لە دڵی خۆیدا دەیگوت؛ «من جیهانم». هەموو ئەو گەردوونە گەورەیەش کە زۆر جار هەستی دەکرد بێپایان و سامناکە، ببووبە خودی خۆی. هێشتام گەردوون مەزن و قەشەنگ دەهاتە پێش چاو، بەڵام ئێستا خودی خۆشی هێندەی گەردوون مەزن بوو.

پاش ساتێک هەستە سەیرەکانی ون بوون، بەڵام سۆفیا دڵنیابوو کە هەرگیز لە یادی ناکات. لەوە دەچوو شتێک لە ناوەوەیدا لە ڕێگەی ناوچەوانیەوە هاتبێتە دەرەوە و خۆی لەگەڵ هەموو شتێکی تردا تێکەڵکردبێت، هەر ڕێک لە ڕەنگدانەوەی دڵۆپێک ڕەنگ دەچوو، کاتێک کە دەیکەیتە ناو سوراحیەک ئاوەوە.

کە هەموو شتێک تەواو بوو، هەستی دەکرد بەدەم سەرئێشەی پاش خەوێکی خۆشەوە خەبەری بۆتەوە. سۆفیا ویستی لە جێگاکەیدا هەستێت، بەڵام بەرامبەر بوونی جەستەی هەستی بە سوکە نائومێدییەک دەکرد. پشتی دەئێشا، چونکە لەسەردەم ڕاکشابوو و ئەو لاپەڕانەی دەخوێندەوە کە ئەلبێرتۆ کنۆکس بۆی ناردبوو. بەڵام ئەو تاقیکردنەوەی بینی بۆ هەتاهەتایە لە یادی ناچێت.

دواجار هێزی دایە بەر خۆی و هەستا. یەکەمین شت لاپەڕەکانی کونکرد و بەڕێک و پێیکی لە مەلەفەکەدا لە پاڵ پەڕەکانی ترەوە دانیان. پاشان بەرەو باخچەکەیان ڕۆیشت.
لەوێدا بولبوولەکان بە جۆرێک دەیانخوێند، دەتگوت تازە جیهان ئافەریدە کراوە. دارە بێتوولاکانی پشت کولانە کۆنەکەی کەروێشکەکانیش، بەڕەنگە سەوزە کاڵەکانیانەوە هێندە دیاربوون، دەتگوت هێشتام خولقێنەرەکەی بەتەواوەتی ڕەنگەنگەکانی تێکەڵ نەکردووە.
بڵێیت بە ڕاستی پێی وابێت هەموو شتێک یەک «خود»ی خوایانە بێت؟ بڵێیت هەستکات، کە ڕۆحی «پریشکێک لە ئاگرەکە» بێت؟ ئەگەر وابێت، کەواتە خۆی بوونەوەرێکی خوایانەیە.

## پۆست کارتەکان

## ...من سانسۆرێکی تووندم خستۆتە سەر خۆم...

چەند ڕۆژێک ڕابوورد و سۆفیا هیچ نامەیەکی نوێی لە مامۆستای فەلسەفەکەوە پێ نەگەیشت. ڕۆژی پێنج شەممە، 17ی مانگی پێنج، ڕۆژی نەتەوەیی نەرویجە، بەم بۆنەیەوە لە قوتابخانەکەیاندا 18ی مانگیشیان وەک ڕۆژێکی پشوو ڕاگەیاند.

سۆفیا و یۆرون بەرەوماڵەوە دەگەڕانەوە، لە پڕێکدا یۆرون گوتی؛

ـ دەڵێیت چی گەشتێکی دارستانەکە بکەین و خێمە هەڵبدەین؟

سۆفیا یەکسەر بیری لەوە کردەوە کە ناتوانێت بۆ ماوەیەکی دورودرێژ لە ماڵەوە دورکەوێتەوە. بەڵام پاشان گوتی؛

ـ بۆ نا، گەر حەز بکەیت.

پاش یەک دوو کاتژمێر، یۆرون بە خۆی و کۆڵە پشتێکی گەورەوە خۆی گەیاندە لای سۆفیا. سۆفیاش خۆی کۆکردبووەوە و خێمەکەشی پێچابووەوە. هەردووکیان کیسەی خەو و جلی گەرمیان ئامادەکردبوو، جگە لەوەش لایتی دەستی و تەرمۆزەیەکی گەورەی چا و کۆمەڵێ خواردنی خۆشیان پێچابووەوە .

دایکی سۆفیا نزیکەی کاتژمێری پێنج هاتەوە و یەکسەر دەستیکرد بە ئامۆژگاریکردنیان، جگە لەوەش دەیویست بزانێت لە چ شوێنێکی دارستانەکەدا خێمەکەیان هەڵدەدەن.

ئەوانیش پێیانگوت؛ دەمانەوێت خێمەکەمان لە نزیک «شیروتۆپ» هەڵدەین، بەڵکو لەوێدا بەختمان یاربێت و گوێمان لە خوێندنی بولبوولەکان بێت کاتێک دەمەوبەیانی جوت دەبن.

سۆفیا بەڕێکەوت ئەو شوێنەی هەڵنەبژاردبوو، ئەو دەیزانی کوخەکەی مێجەر لەوێوە نزیکە. شتێک هەبوو دیسانەوە بەرەو ئەوێی ڕادەکێشایەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دڵنیابوو کە هەرگیز جارێکی تر ناوێرێت بە تەنها بچێتەوە ئەوێ.

کچان لەماڵەوە هاتنە دەرەوە و ملی ڕێگایان گرتە بەر. باسی شتی هەمەڕەنگیان دەکرد. سۆفیاش پێیخۆش بوو بۆ ماوەیەک لە هەموو باسێکی فەلسەفی دورکەوێتەوە.

نزیکەی کاتژمێری هەشت، خێمەکەیان لە ناو ڕووبەری شوێنی دیاریکراودا هەڵدا. جێگەی شەویان ڕاخست و کیسە خەوەکانیان لە شوێنی خۆیدا دانا. پاش ئەوەی نانیان خوارد، سۆفیا لە یۆرونی پرسی؛

ـ تۆ کوخەکەی مێجەرت بیستووە؟

ـ کوخی مێجەر؟

ـ لەو سەری دارستانەکەدا کوخێکی لێیە... لە تەنیشت دەریاچەیەکی بچکۆلەوەیە. کاتی خۆی مێجەرێکی سەیری تێدا ژیاوە، هەر لەبەرئەوەشە کە پێی دەڵێن کوخی مێجەر.

ـ ئێستا کەسی تێدا دەژی؟

ـ نازانم، بچین سەیر کەین؟

ـ بەڵام لەکوێی دارستانەکەدایە؟

سۆفیا پەنجەی بۆ ناو دارەکان ڕاکێشا.

یۆرون زۆر بە پەرۆش نەبوو، بەڵام هەرچۆنێک بێت بڕیاریان دا بکەونە ڕێ. ئەو کاتە خۆر گەیشتبووە ئاسۆ.

کچان لە پێشدا بەناو دار سنەوبەرەکاندا ڕۆیشتن و پاشانیش ناچاربوون بە ناو پەرژین و دەوەنەکاندا بڕۆن. لە کۆتایشدا گەیشتنە سەر ڕێگایەک.
بڵێیت هەمان ئەو ڕێگایە بێت کە سۆفیا سەر لەبەیانی یەکشەممەی پێشوو پیایدا ڕۆیشت؟ تەواوە... پاش ماوەیەک سۆفیا لە بەری ڕاستی ڕێگاکەدا پەنجەی بۆ پانتاییەکی نێو دارەکان ڕاکێشا و گوتی؛
ـ لە وێدایە.
پاش کەمێک لەبەردەم دەریاچە چکۆلەکەدا وەستان. سۆفیا پەنجەی بۆ کوخەکە ڕاکێشا... ئێستاکە پەنجەرەکانی گیرابوون و کوخە سوورەکەش لە شوێنێکی چۆڵ و وێڵکراو دەچوو.
یۆرون تەماشایەکی ئەملاولای کرد و پرسی؛
ـ باشە، بەسەر ئاوەکەدا بڕۆین؟
ـ بێگومان نا... بە بەلەم دەڕۆین.
سۆفیا دەستی بۆ ناو قامیشەکانی خوارەوە ڕاکێشا. بەلەمەکە ڕێک لە هەمان شوێنی جاری پێشوودا بەسترابووەوە.
ـ تۆ پێشتر هاتوویت بۆ ئێرە؟
سۆفیا سەرێکی ڕاوەشاند. سەخت بوو دەربارەی هاتنی پێشووتری بۆ باس بکات. گەر بۆی بگێڕایەتەوە، ئەوسا بێگومان نەیدەتوانی باسی ئەلبێرتۆ کنۆکس و کۆرسی فەلسەفەکەی وەک نهێنیەک لای خۆی بهێڵێتەوە.
بەدەم نوکتە و پێکەنینەوە بە سەوڵ لێدان پەڕینەوە ئەو بەر ئاوەکە. سۆفیا ئەم جارەیان بەلەمەکەی بە تەواوەتی ڕاکێشایە قەراغ ئاوەکەوە... پاش کەمێک گەیشتنە بەردەم کوخەکە. یۆرون دەسکی دەرگاکەی بادا؛ بە ئاشکرا دیاربوو کەسی تێدا نەدەژیا.

ـ داخراوە... خۆ پێت وانیە کرابێتەوە؟
ـ لەوانەیە کلیلەکە بدۆزینەوە، سۆفیا هێندەی گوت و لەنێو بەردی دیوارەکاندا بەدوای کلیلەکەدا دەگەڕا.
پاش چەند خولەکێک یۆرون گوتی؛
ـ پێت باشتر نیە گەر بگەڕێینەوە بۆ خێمەکەمان؟
پاش کەمێک سۆفیا هاوارێکی لێ بەرزبووەوە؛
ـ دۆزیمەوە!
بە پێکەنین و خۆشیەوە کلیلەکەی هەڵگرت، کردیە قفڵی دەرگاکەوە و کردیەوە.
هەروەک دوو دز چوونە ژوورەوە. لە ناوەوە، سارد و تاریک بوو. یۆرون گوتی؛
ـ خۆ هیچ شتێک نابینین.
سۆفیا بیری لەوەش کردبووەوە، پاکەتێک شقارتەی لە گیرفانیدا دەرهێنا و تاڵێکی داگیرساند. تەنها فریای ئەوەندە کەوتن کە ژوورێکی چۆڵ و هۆڵ ببینن و هیچی تر. سۆفیا تاڵێکی تری داگیرساند، ئەم جارەیان چاوی بە مۆمێک کەوت، کە لە ناو مۆمدانێکی ئاسندا لەسەر ئاگردانەکە دانرابوو. مۆمەکەی داگیرساند، ئەوجا ژوورەکە ڕووناک بووەوە و بە ئاسانی دەیانتوانی هەموو لایەک ببینن. پاشان سۆفیا گوتی؛
ـ سەیر نیە کە ڕووناکیەکی کەمی ئاوها، ئەو هەموو تاریکیە ڕووناک دەکاتەوە؟
یۆرون سەرێکی لەقاند. ئەوجا سۆفیا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛

ـ بەڵام لە شوێنێکدا ڕووناکی لەناو تاریکیدا ون دەبێت. لە ڕاستیدا تاریکی خۆی لە خۆیدا بوونی نیە، بەڵکو تەنها ئەوەندیە کە ڕووناکی ناگاتە ئەویٚ.
ـ ئەم باسە ناخۆشە، با بڕۆین...
ـ بەڵام با لە پێشدا تەماشایەکی ئاوێنەکە بکەین.
سۆفیا پەنجەی بۆ ئاوێنەکە ڕاکێشا، هەر وەک جاری پێشوو لە سەروی کۆمۆدییەکەوە هەڵواسرابوو.
ـ چەند جوانە...
ـ بەڵام ئاوێنەیەکی ئەفسوناویە!
ـ ئەفسوناویە؟ ئاوێنەکە؛ پێم بڵیٚ جوانترین کەس لەم شارەدا کێیە؟
ـ گاڵتە ناکەم، یۆرون. لەو بڕوایەدام کاتێک تەماشای ناو ئەم ئاوێنەیە دەکەیت، بتوانیت شتەکانی دیوی ناوەوەی ببینیت.
ـ باشە تۆ نەتگوت هەرگیز نەهاتووم بۆ ئێرە؟ بە ڕاست، چ خۆشیەک دەبینی گەر بم ترسێنیت؟
سۆفیا نەیتوانی وەڵامی ئەو پرسیارەی بداتەوە و گوتی؛
ـ بەڕاستی داوای لێبووردن دەکەم!
ئەوجا یۆرون لە پڕێکدا شتێکی لە سوچێکی ژوورەکەدا بینی. قووتیلەیەک بوو، لەگەڵ کردنەوەیدا گوتی؛
ـ پۆست کارتی تێدایە.
ـ دەستیان لیٚ مەدە!... گوێت لێمە، دەڵێم دەستیان لیٚ مەدە!
یۆرون داچڵەکی و هەروەک ئەوەی دەستی بسووتیٚ، قووتیلەکەی فڕێدا.
پاش چەند چرکەیەک دەستی کرد بە پێکەنین.
ـ تەنها پۆست کارتی تێدایە.

یۆرون لەسەر زەویەکە دانیشت و کارتەکانی کۆکردەوە، پاشان سۆفیاش دانیشت.
ـ لوبنان... لوبنان... لوبنان... هەموو کارتەکان لە لوبنانەوە هاتوون، یۆرون گوتی.
ـ دەزانم. سۆفیا بەدەم هەناسە هەڵکێشانێکەوە وەڵامی دایەوە.
ـ کەواتە لەوەوپێش هاتوویت بۆ ئێرە.
ـ بەڵێ...
سۆفیا لە دڵی خۆیدا گوتی «گەر تەنها دان بەوەدا بنێم کە لەوەوپێش هاتووم بۆ ئێرە، ئەوسا هەموو شتێک ئاسانتر دەبێت. خۆ هیچ زیانێکیشی نیە گەر برادەرکەم کەمێک دەربارەی ڕووداوە سەرسوڕهێنەرەکانی چەند ڕۆژی ڕابووردوم بزانێت.»
ـ ئاخر ویستم بێینە ئێرە، ئەوجا پێت بڵێم.
یۆرون دەستی بە خوێندنەوەی کارتەکان کردبوو.
ـ هەمووی بۆ کەسێک نێردراوە کە ناوی هیلدە میوللە کنەیە.
ـ بە چ ئەدرێسێک نێردراون؟
ـ نووسراوە؛ هیلدە میوللە کنەی، لە ڕێگەی ئەلبێرتۆ کنۆکسەوە، لیللەساند، نەرویج.
سۆفیا لە خۆشیدا هەناسەیەکی هەڵکێشا. لەوە دەترسا لەسەر کارتەکان ناوی ئەویش نووسرابێت. پاشان ئەویش دەستی کرد بە تەماشاکردنی کارتەکان.
28ی چوار... 4ی پێنج... 6ی پێنج... 9ی پێنج... هەمووی چەند ڕۆژێک دەبێت مۆریان لێدراوە.
ـ بەڵام شتێکی تریش... تەماشاکە، هەموو مۆرەکان نەرویجین. نووسراوە؛ «نەتەوە یەکگرتووەکان». پولەکانیش هەمووی نەرویجین...

ـ پێم وابێت ئاساییە. هەروەک چۆن دەڵێیت... دەبێت بێ لایەن بن. هەر لەبەر ئەوەشە پۆستی تایبەتی نەرویجییان لەگەڵ خۆیاندا بردووە.
ـ ئەی باشە پۆستەکەیان چۆن ڕەوانەی ئێرە دەکەن؟
ـ لەوانەیە بەهۆی فڕۆکەیەکی سەربازییەوە بینێرن.
سۆفیا مۆمدانەکەی لەسەر زەویەکە دانا، ئەوجا کچان دەستیان کرد بە خوێندنەوەی کارتەکان. یۆرون کارتەکانی بەپێی بەروارەکانیان ڕیزکرد و هەر خۆشی یەکەم کارتی خوێندەوە؛

هیلدە گیان، نازانیت چەندەم پێ خۆشە بگەڕێمەوە لیللەساند. وا چاوەڕوانم فڕۆکەکەم سەر لە ئێوارەی سانکتهانس، (*24ی مانگی شەش، یەکەم ڕۆژی جەژنی یۆحەنایە.و) لە فڕۆکەخانەی کیڤیک بنیشێتەوە. چەندە ئارەزووم دەکرد لە جەژنی لەدایک بوونی 15 ساڵیتدا لەوێ بوومایە، بەڵام منیش وەک دەزانی لەژێر فەرمانی سەربازیدام. بەهەرحاڵ، هەرچەندە ناتوانم لە ئاهەنگەکەتدا بەشداربم، بەڵام پەیمانت دەدەمێ دیاریەکی گەورەت لە ڕۆژی لەدایک بوونەکەتدا بۆ بنێرم. سڵاوی خۆشەویستانەی باوکێکت لێ بێت کە بەردەوام بیر لە پاشە ڕۆژی کچەکەی دەکاتەوە...
تێبینی؛ کۆپیەکی ئەم کارتە، بۆ ناسیاوێکی هەردوولامان دەنێرم. خۆ تێدەگەیت، گیانەکەم؟ دەزانم ئێستاکە پڕ لە نهێنیم، بەڵام پاشان بەتەواوەتی لێم تێدەگەیت.

سۆفیا دەستی دایە کارتی دووهەم؛

ڕۆڵە شیرینەکەم؛
پێم خۆش بوو گەر وشەکانم بە کۆترێکی سپیدا بۆ ڕەوانە بکردیتایە، بەڵام لە لوبناندا کۆتری سپی بەخێو ناکەن. لە ڕاستیدا گەر شتێک لەم وڵاتی پڕ شەڕەدا پێویست بێت، کۆتری سپییە. خۆزگە نەتەوە یەکگرتووەکان، یەکجار بە ڕاستی ئاشتیان لە جیهاندا دەخوڵقاند...
تێبینی؛ لەوانەیە بتوانیت دیاری ڕۆژی لەدایک بوونەکەت لەگەڵ کەسانی تردا دابەشبکەیت؟ بەڵام کە گەیشتمەوەماڵەوە باسی ئەمە دەکەین، خۆ تۆ هێشتام هەر لە مەبەستم تێناگەیت!
سڵاوی باوکێک کە کاتێکی باشی لەبەردەستایە بۆ ئەوەی بیر لە هەردووکمان بکاتەوە.

کچان بە پەرۆشەوە بەردەوامبوون لەسەر خوێندنەوە و هیچ کامێکیشیان نەیان دەوێرا وشەیەک دەربپەڕێنن. کارتێکی تریان خوێندەوە؛
(*نازانم بۆچی ئەم کارتەی خوارەوە لە دەقی دانیمارکیەکەدا پشتگوێ خراوە، بەڵام من بەپێویستم زانی بنووسرێتەوە.و)

هیلدە گیان؛
ئێمە لێرەدا ڕۆژ بە ڕۆژ دەژین. ئەم چەند مانگەی پێشووی لوبنان، فێری چاوەڕوانی بەردەوامی کردم. بەڵام دڵنیابە، لە ڕۆژی لەدایک بوونەکەتدا هەوڵدەدەم جوانترین دیاریت بۆ ڕەوانەبکەم. ئێستاکە لەمە زیاترت بۆ نادرکێنم، چونکە من سانسۆرێکی توندم خستۆتە سەر خۆم.
دونیایەک ماچی بابەت پێشکەش بێت.

لەپاش خوێندنەوەی شەش کارت، تەنها یەک کارت مابووەوە. لەسەری نووسرابوو؛

هیلدە گیان؛
ئەم هەموو نهێنییەی سەبارەت بە ڕۆژی لەدایک بوونەکەت، تەواو بێزاری کردووم. وام لێهاتووە ڕۆژانە چەند جارێک دژ بە ویستی خۆم دەوەستمەوە و زۆر لە خۆم دەکەم، نەبا تەلەفونت بۆ بکەم و هەموو شتێکت بۆ باس بکەم. ئەمە شتێکە کە گەورەتر و گەورەتر دەبێت. کاتێکیش شتێک لە ناوەوەماندا هەر گەورەتر ببێت، ئیدی سەختە بتوانین دەستی بەسەردا ڕابگرین.
سڵاوی بێ پایانی بابەت پێشکەش بێت.
تێبینی؛ ڕۆژێک کچێک دەناسیت کە ناوی سۆفیایە. من کۆپییەکی هەموو ئەو کارتانەی بەدەستت گەیشتوون، بۆ ئەویشم ناردووە. بەم جۆرەش هەردووکتان، پێش ئەوەی یەکتر ببینن، کەمێک یەکتری دەناسن. هیلدە گیان، تۆ بڵێیت بەم زوانە بۆی ڕوون ببێتەوە؟ هەتاوەکو ئێستاکە لە تۆ زیاتر زانیاری لا نیە. برادەرێکی هەیە ناوی یۆرونە، لەوانەیە ئەو بتوانێت یارمەتی بدات.

پاش ئەوەی دواهەمین کارتیان خوێندەوە، هەر بە دانیشتووی مانەوە و هەردووکیان تەماشای نێو چاوی یەکتریان دەکرد. پاشان یۆرون دەستی سۆفیای گوشی و گوتی؛
ـ دەترسم.
ـ منیش.

ـ مۆری چ ڕۆژێک لەسەر دواهەمین کارت دراوە؟
سۆفیا جارێکی تر تەماشای کارتەکەی کردەوە و گوتی؛
ـ لە 16ی پێنجدا نێردراوە... بەڕاست، بەرواری ئەمڕۆی لەسەرە!
دیسانەوە بەوردی تەماشای مۆرەکەیان کردەوە، تەواو بوو... زۆر بە ڕوونی نووسرابوو؛ «1990-5-16» پاشان یۆرون بە دەنگێکی زۆر دڵنیاییانەوە گوتی؛
ـ نە ڕێی تێدەچێت، نە تێشدەگەم کێ نووسیویەتی. بێگومان کەسێکە کە هەردووکمان دەناسێت... بەڵام چۆن زانی کە ئێمە ڕێک ئەمڕۆ دێین بۆ ئێرە؟
یۆرون زیاتر دەترسا. لەلای سۆفیاش هەرچۆنێک بێت، هیلدە بابەتێکی نوێ نەبوو.
ـ پێم وابێت ئەمە پەیوەندی بە ئاوێنە بڕۆنزیەکەوە هەیە.
دیسانەوە دڵی یۆرون ڕاچڵەکایەوە.
ـ ناشێت مەبەستت ئەوە بێت کە پاش ئەوەی کارتەکان لە لوبنان مۆریان لێدەدرێت، یەکسەر لێرەوە لە ئاوێنەکەوە بێنە دەرەوە؟
ـ هیچ لێکدانەوەیەکی باشترت لایە؟
ـ نەخێر.
ـ لەم کوخەدا شتێکی سەیری تریش هەیە.
سۆفیا هەستا و مۆمەکەی لەبەردەم تابلۆکانی دیوارەکەدا ڕاگرت. یۆرونیش لە تابلۆکان نزیک بووەوە.
ـ «بارکێلی» و «بیرکێلی»؟ مانای ئەو ناوانە چیە؟
ـ نازانم.
خەریک بوو مۆمەکە تەواو دەبوو، کە یۆرون گوتی؛
ـ با بڕۆین... بڕۆ!

ـ کەمێک بوەستە، دەمەوێت ئاوێنەکەش بهێنم.
هەرچەندە یۆرون ناڕازی بوو، بەڵام سۆفیا ئاوێنەکەی هەر لە دیوارەکە کردەوە.
کە هاتنە دەرەوە، دونیا بە چەشنی شەوێکی ئاسایی جۆزەردان تاریک بوو. ئاسمانیش هێندە ڕووناکی دەبەخشی کە بتوانن دەوەن و دارەکان ببینن. دەریاچە چکۆلەکە وێنەی ئاسمانی سەرەوەی گرتبووە خۆ.
کچان هێواش هێواش بە بەلەمەکە پەڕینەوە ئەو بەر.
لە کاتی گەڕانەوەیاندا بەرەو خێمەکەیان، هیچ شتێکی تایبەتی وایان باس نەکرد. بەڵام هەردووکیان دەیانزانی کە ئەوی تر بە قوڵی بیر لە بەسەرهاتەکەی ئەم شەویان دەکاتەوە. جار جارێکیش دەنگی باڵندەیەک ڕایدەچڵەکانن، یەک دوو جارێکیش گوێیان لە کونە پەپویەک بوو.
هەر کە گەیشتنەوە خێمەکەیان، خێرا خۆیان خزاندە ناو کیسەی خەوەکانیانەوە. یۆرون بە هیچ جۆرێک ڕازی نەبوو کە ئاوێنەکە لەناو خێمەکەدا دانێن. نەشیان دەویست ڕێک لەبەردەم خێمەکەدا داینێن، بەڵام پێش ئەوەی بخەون، بڕیاریاندا ئاوێنەکە کەمێک لە دوری خێمەکەوە دانێن. سۆفیا پۆست کارتەکانیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، پاشان خستنیە ناو گیرفانی کۆڵە پشتەکەیەوە.
ڕۆژی دواتر زوو خەبەریان بووەوە. سۆفیا لە پێش یۆروندا لە کیسە خەوەکەی هاتە دەرەوە. جزمەکانی لەپێ کرد و چووە دەرەوەی خێمەکە. بەرەو ئاوێنەکە ڕۆیشت، شەونم ڕووپۆشی کردبوو. سۆفیا ئاوێنەکەی بە بلوسەکەی پاککردەوە و تەماشایەکی خۆی کرد. لەوەدەچوو بە وردی لە خۆی و ناو ئاوێنەکە بڕوانێت، بەڵام خۆش بەختانە هیچ نامەیەکی نوێی لە لوبنانەوە بەدینەکرد.

لە پانتاییەکەی سەرو خێمەکەوە، گەردی تەمی ئەو بەیانیە وەک سەرینێکی لۆکە بە ئاسمانەوە بوو. باڵندە چکۆلەکانیش بەدەنگی بەرز دەیانخوێند، هەندێ باڵندەی گۆشخۆریشی لێبوو، بەڵام سۆفیا نە دەیتوانی بیانبینێ و نە دەشیتوانی گوێی لە دەنگیان بێت.

یەکی بلوسێکێکی تریان لەبەرکرد و لەدەرەوەی خێمەکەدا نانی بەیانیان خوارد. پاش ئەوە کەوتنە گێڕانەوەی باسی کوخەکەی مێجەر و کارتە سەیرەکان.

لە پاش نانخواردن، خێمەکەیان کۆکردەوە و ملی ڕێگای ماڵەوەیان گرتەبەر. سۆفیا ئاوێنە گەورەکەی لە ژێر باڵیدا هەڵگرتبوو. تاو نا تاوێک دەبوایە پشووی بدایە، چونکە یۆرون بەهیچ جۆرێک نەیدەویست دەست لە ئاوێنەکە بدات.

لەگەڵ نزیکبوونەوەیاندا لە یەکەمین بینا، گوێیان لە دەنگی چەند تەقینەوەیەک بوو. سۆفیا یەکسەر وتەکانی باوکی هیلدەی هاتەوە خەیاڵ، کە باسی شەڕ و شۆڕی لوبنانی دەکرد. ئەوجا تێگەیشت چەندە بەختەوەرە کە لە وڵاتێکی پڕ لە ئاشتیدا دەژی. دەنگەکانیش، تەنها دەنگی تەقینەوەی چەند دەمەقاچانێکی خۆشی بوو.

کاتێک گەیشتنە ماڵەوە، سۆفیا میوانداری یۆرونی کرد و داوای لێکرد کوپێک کاکاوی گەرمی لەگەڵدا بخواتەوە. دایکیشی بە وردی کەوتە لێکۆڵینەوەی ئاوێنەکە و لە سۆفیای پرسی؛

ـ ئەم ئاوێنەیەتان لەکوێ بوو؟

ـ لەدەرەوەی کوخەکەی مێجەردا دۆزیمانەوە.

ـ بەڵام چەندین ساڵە هیچ کەسێک لەو کوخەدا نەژیاوە.

پاش ئەوەی یۆرون ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، سۆفیا کراسێکی سووری لەبەرکرد. دواتریش ئێوارەی جەژنی نەتەوەیی نەرویجیان بە شێوەیەکی ئاسایی بەسەربرد. لە دەنگ و باسیشدا، ڕاپۆرتێکیان دەربارەی سەربازە نەرویجیەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان نیشاندا. ئەوانیش لە لوبناندا جەژنی نەتەوەییان دەگێڕا. سۆفیا چاوی بڕیبووە شاشەکە، لەوانەیە یەکێک لەو پیاوانە باوکی هیلدە بێت. دواهەمین شت کە سۆفیا ئێوارەی ڕۆژی حەڤدەی پێنج کردی، هەڵواسینی ئاوێنە گەورەکەبوو لە ژوورەکەیدا. پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، نامەیەکی زەردی نوێی لە کوخەکەدا بینییەوە، بەپەلە زەرفەکەی دڕاند و کەوتە خوێندنەوەی.

# دوو بازنەی کەلتوری

## ...تەنها بەو جۆرە خۆت لە خولانەوە بە ئاسمانی بەتاڵدا لادەدەیت...

ئازیزم سۆفیا، هێندەی نەماوە ڕاستەوخۆ چاومان بەیەک بکەوێت. بەمەزەنەی من، جارێکی تریش دەگەڕێیتەوە بۆ ژوورەکەی مێجەر. هەر لەبەر ئەوەش هەموو ئەو کارتانەی لە باوکی هیلدەوە هاتبوون، لەوێدا بۆم دانایت. تەنها بەم جۆرە دڵنیا دەبین کە بگەنە دەستی هیلدە. زۆر بیر لەوە مەکەرەوە بە چ شێوەیەک کارتەکانی پێبگەێنیت. لە ئێستاوە تا 15ی شەش چەندەها شتی تر ڕووندەبێتەوە.

لەماوەی پێشوودا باسی فەیلەسوفەکانی هیللینیزممان کرد و بۆمان دەرکەوت کە هەمان بیری فەیلەسوفەکانی پێشووتریان تاوتوێدەکرد. لەهەمان کاتیشدا هەوڵیان دەدا فەیلەسوفەکانی پێش خۆیان وەک دامەزرێنەری ئاین بناسێنن. پلۆتین هێندەی نەمابوو کە پلاتۆن وەک ڕزگارکەی مرۆڤایەتی بناسێنێت.

بەڵام وەک دەزانیت، ڕزگارکەرێکی دی لەناوەندی هەمان سەروەختدا کە باسمان کرد، لەدایک بوو. بەڵام لە دەرەوەی ناوچەی «یۆنانی–ڕۆمی»دا بوو، مەبەستم لە مەسیحە. لەم بەشەدا باسی ئاینی مەسیحی دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە کە بە چ شێوەیەک نەختە نەختە چووە ناو جیهانی «یۆنانی-ڕۆمی»یەوە. «هەروەک چۆن جیهانی هیلدە خەریکە هێدی هێدی دێتە ناو جیهانەکەمانەوە.»

مەسیح جولەکە بوو، جولەکەکانیش سەر بە بازنەی کەلتور و زمانی سامین. بەڵام ڕۆمیەکان و یۆنانیەکان سەر بە هیندۆ ئەوروپیەکانن. واتە دەتوانین بڵێین شارستانی ئەوروپی ڕەگی لە هەردوو لادا هەیە.

پێش ئەوەی باس لەوە بکەین کە ئاینی مەسیحی چۆن هاتە ناو کەلتوری «یۆنانی- ڕۆمیەوە»، بەکورتی تەماشایەکی هەریەک لەو ڕەگانە دەکەین.

### هیندۆ ئەوروپیەکان

زاراوەی هیندۆ ئەوروپی، سەرتاپای ئەو وڵات و کەلتورانە دەگرێتەوە کە زمانی هیندۆ ئەوروپی بەکاردەهێنن. ئەمەش هەموو وڵاتە ئەوروپیەکان دەگرێتەوە، هەڵبەتە جگە لەو نەتەوانەی کە بە زمانە باسکییەکان «Basque» دەدوێن (*چەند نەتەوەیەکن کە ڕەچەڵەکیان بە تەواوەتی ڕوون نیە، بەڵام لە ڕۆژئاوای فەرەنسا و ئیسپانیادا دەژین.و)، هەروەها ئەو وڵاتانەش ناگرێتەوە کە بە زمانی فینلەندی-ئۆگریکی «Finno-Ugric» قسەدەکەن (واتە زمانی فینلەندی و لاپیی و ئیستۆنی و هەنگاری). لەلایەکی تریشەوە زۆربەی زۆری زمانە هیندی و ئێرانیەکان سەر بە خێزانی هیندۆ ئەوروپین.

هیندۆ ئەوروپیە سەرەتاییەکان نزیکەی 4000 ساڵ لەمەوبەر، لە ناوچەی دەریای ڕەش و دەریای خزردا دەژیان. پاشان بە شەپۆلی گەورە گەورە دەستیان بە کۆچکردن کرد؛ بەرەو باشوری ڕۆژهەڵات، بۆ ئێران و هیندستان. بەرەو باشوری ڕۆژئاوا، بۆ یۆنان و ئیتالیا و ئیسپانیا. بەرەو ڕۆژئاوا و بەناو ئەوروپای ناوەڕاستدا، بۆ فەرەنسا و بەریتانیا. بەرەو باکوری ڕۆژئاوا، بۆ باکوری ئەوروپا. بەرەو باکور بۆ ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ڕوسیا. هیندۆ ئەوروپیەکان بەرەو هەر شوێنێک کۆچیان دەکرد، لەگەڵ کەلتوری ناوچەکەدا تێکەڵ دەبوون، بەڵام زمان و ئاینی هیندۆ ئەوروپی خۆیان لە هەموو شوێنێکدا ڕۆڵێکی زاڵی دەبینی.

بەم شێوەیەش نووسراوە کۆنەکانی ڤیدا«Veda» ی هیندی و فەلسەفەی یۆنانی و ئەفسانەی ئەسکەندەنافیاش، بە زمانێکی نزیک بەیەک نووسراونەتەوە. بەڵام لێرەدا تەنها زمانەکان نزیک نەبوون، بەڵکو لەگەڵ زماندا بیرکردنەوەش نزیک کەوتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە باس لە «بازنەی کەلتوری» هیندۆ ئەوروپی دەکەین.
کەلتوری هیندۆ ئەوروپی، بەر لە هەموو شتێک، بە باوەڕکردنیان بە فرە خودایی ناسراون. بەمەش دەگوترێت پۆلیسیزم «Polytheism».
هەروەها دەبینین ناوی خواکان و چەندەها وشەی ئاینی گرنگیش، لەناو ڕووبەری هیندۆ ئەوروپیدا دوبارە دەبنەوە. پێم خۆشە لەم بارەیەوە هەندێ نمونەت بۆ بهێنمەوە؛
هیندیە کۆنەکان دیۆس«Dyaus» ی خودای ئاسمانیان دەپەرست. بە یۆنانی پێی دەڵێن زیۆس «Zeus» بەلاتینی پێی دەڵێن «جۆپیتەر «Jupiter(لە ڕاستیدا، لۆو-پاتەر، واتە "یاسای باوک")، بەنەرویجی کۆنیش پێی دەڵێن «تۆر «Tyr. بەم شێوەیەش ناوی دیۆس و زیۆس و جۆپیتەر و تۆر، هەموویان چەند ناوێکی دیالێکتی ناوچەیی هەمان وشەن.
بێگومان لەیادتە کە چەتە دەریاییەکانی باکور بڕوایان بە چەند خوایەک هەبوو و پێیان دەگوتن «ئاسەر «Aser. دیسانەوە ئەم وشەیەش، کە ناوی خودایە، لەناو هەموو ناوچەی هیندۆ ئەوروپیدا دبینینەوە. بە زمانی هیندی کۆن (زمانی سانسکریتی) ناوی خواکان بە «ئاسورا«Asura دێت. بەپارسیش پێی دەڵێن «ئاهورا «Ahura. ناوێکی تری خوداش بە سانسکریتی «دیڤا«Deva یە، بە پارسی «دایڤا«Daeva یە، بەلاتینی «دیۆس«Deus ە، بەنەرویجی کۆنیش پێی دەڵێن «تیڤور «Tivurr.

جگە لەمانەش لە باکوردا بڕوایان بە کۆمەڵێ خودای پیت و فەڕ هەبووە (بۆ نمونە نیرۆد «Njord» و فرای «Frej» و فرایا .(«Freja» ناوێکی تایبەتیشیان بۆ ئەم خودایانە دانابوو و پێیان دەگوت «ڤانەر Vaner». بەلاتینیش بە خودای پیت و فەڕ دەڵێن «ڤینۆس «Venus ، بەرامبەری بە سانسکریتیش وشەی «ڤانی «Vani هەیە، کە مانای «حەز» یان «ویست» دەبەخشێت.

هەروەها لە ناواخنی ئەفسانە ساکارەکانی سەرتاپای ناوچە هیندۆ ئەوروپییەکانیشدا، خزمایەتیەکی گەورەی تێدا دەبینرێت. بۆ نمونە هەندێک لە ئەفسانەکانی «سنۆرە»، کە باسی خواکانی نەرویج دەکات، ئەو ئەفسانە هیندیانەمان دەهێنێتەوە بەرچاو کە دوو سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر هیندیەکان دەیانگێڕایەوە. بێگومان ئەفسانەکانی «سنۆرە» مۆرکی سروشتی باکوری پێوەیە و ئەفسانە هیندیەکانیش باسی سروشتی هیندی پێوە دەبینرێت. بەڵام زۆربەی ئەو ئەفسانانە یەک ناوەڕۆکیان هەیە و بەئاشکرا دیارە کە لە یەک سەرچاوەوە هاتوون. یەکێک لەو ناوەڕۆکە هاوبەشانەی کە زۆر بە ڕوونی لە ئەفسانەکاندا دەبینرێت، دەربارەی خواردنەوەی شەرابی نەمرییە، هەروەها خاڵێکی هاوبەشی تریش باسی ململانێی خواکان دەکات لەگەڵ هێزی گێرەشێوێنەکاندا.

تەنانەت لە تەرزی بیرکردنەوەشدا، لێکچوونێکی ئاشکرا لە نێو خەڵکانی کەلتوری هیندۆ ئەوروپیدا بەدی دەکرێت. خاڵێکی باوی ئەو هاوبەشیەش، لە شێوەی بینینی جیهاندا دێتە پێش چاو؛ جیهانیان وەک درامایەکی بەردەوامی هێزی باشە و خراپە دەدی. بەم شێوەیەش هیندۆ ئەوروپیەکان هەمیشە هەوڵی «لێکۆڵینەوەی» "یان زانینی" پاشەڕۆژی جیهانیان دەدا.

دەتوانین ڕێگە بە خۆمان بدەین و بڵێین فەلسەفەی یۆنانی بە ڕێکەوت لە ناوچەی هیندۆ ئەوروپیدا سەریهەڵنەدا، چونکە لەڕاستیدا میتۆلۆژیای هیندی و یۆنانی و باکور، یاریدەدەرێکی باشی سەرهەڵدانی بنەمایەکی فەلسەفی و «ئەندێشەیی» بوو.

هیندۆ ئەروپییەکان هەوڵی دۆزینەوەی «زانیاری»یەکیان دەدا کە دەربارەی ڕێڕەوی جیهان بێت. بەڕاست، هەر ئێستاکە دەتوانین لە کەلتورێکەوە بۆ کەلتورێکی تری هەموو ناوچەی هیندۆ ئەوروپی، دوای وشەی «زانیاری» یان «زانین» بکەوین. ئەم وشەیە بە سانسکریتی پێی دەگوترێت «ڤیدیا» .«Vidya ڤیدیا»ش ڕێک بەرامبەری وشەی «ئیدیە»Idea ی یۆنانی دێت، کە ڕۆڵێکی گرنگی لە فەلسەفەی پلاتۆندا بینی. لە لاتینیشدا وشەی «ڤیدیۆ»Video دەبینین، بەڵام لە ناوچەی ڕۆمدا ڕێک مانای «بینین» دەبەخشێت. (تەنها لە ڕۆژانی ئێمەدایە کە «ڤیدیۆ، واتە "بینین"» بەستراوەتەوە بە بینینی تەلەفیزۆنەوە). لە زمانی ئینگلیزیشەوە وشەی «وایز Wise» و «ویزدەم Wisdom» دەبینین، بە ئەڵمانیش «وایزن .«Wissen واتە وشەی «ڤید»Vide ی نەرویجی و دانیمارکیش هەروەک وشەی «ڤیدیا»ی هیندی و «ئیدیە»ی یۆنانی و «ڤیدیۆ»ی لاتینی، لە هەمان ڕەگەوە هاتووە.

دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی بیسەلمێنین کە «بینین» گرنگترین هەستی هیندۆ ئەوروپییەکان بووە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە لەناو ئەدەبیاتی پارسی و گرمانی و هیندیدا، مۆرکێکی گەورەی دیدەیی (ڤیژن Visin) گەردوونی بەدی دەکرێت. (دیسانەوە وشەکە هاتەوە سەر باس؛ وشەی «ڤیژن، "دیدە"» ڕێک لە فەرمانی وشەی «ڤیدیۆ»ی لاتینییەوە هاتووە).

دروستکردنی پەیکەر و وێنە کێشانی خوداکان و ئەفسانەکانیش، تایبەتمەندێتیەکی تری کەلتوری هیندۆ ئەوروپی بووە.
لە کۆتایشدا، هیندۆ ئەوروپیەکان بەشێوەیەکی بازنەیی تەماشای مێژوویان دەکرد. واتە جۆرە تێگەیشتنێکی مێژوو، کە بە بازنەدا یان بە «چەرخ»دا دەڕوات —هەروەک چۆن وەرزەکانی ساڵ یەک بەدوای یەکدا دێن. بەم شێوەیەش مێژوو نە سەرەتای هەیە و نە کۆتایی، بەڵکو زیاتر باس لە جیهانی جیاواز دەکرێت کە لەناو بازنەی هەتاهەتای لەدایک بوون و مردندا دەردەکەون و دەفەوتێن.
هەردوو ئاینە گەورەکەی ڕۆژهەڵات، «هیندۆیزم «Hinduism و «بودیزم«Buddhism ، ڕچەڵەکیان لە هیندۆ ئەوروپیەوە هاتووە — هەمان شت فەلسەفەی یۆنانیش دەگرێتەوە- جگە لەوەش چەندەها خاڵی هاوبەش لە نێوان ئەو دوو ئاینە لەلایەک و فەلسەفەی یۆنانی لەلایەکی ترەوە، بەدی دەکەین. تەنانەت ئەمڕۆکەش خاسیەتێکی گەورەی فەلسەفی لە ناو هەردوو ئاینی هیندۆیزم و بودیزمدا بە دیدەکرێت.
زۆر جار لە ئاینی هیندۆیزم و بودیزمدا جەخت لەسەر بوونی خوایەتی لە هەموو شتێکدا دەکەن «پانتیزم» (*واتە یەکیەتی بوون، ئەو مەزهەبەی دەڵێت خودا و سروشت یەک شتن وە گەردوونی مادی و مرۆڤیش دیاردەیەکی خوایانەیە.و)، هەروەها دەڵێن مرۆڤ لە ڕێگەی ڕوون بینینی ئاینییەوە دەتوانێت لەگەڵ خودادا ببێتە یەک. (پلۆتین بهێنەرەوە یادت، سۆفیا!). بۆ ئەوەی یەک بوون لەگەڵ خودادا ڕووبدات، دەشێ مرۆڤ بچێتە ناو قولایی بوونی خۆیەوە، یان خەڵوەت بکات. لەبەر ئەم هۆیەش لەوانەیە ناچالاکی و خۆدابڕاندن لە ڕۆژهەڵاتدا وێنەیەکی ئاینی بێت. هەروەها لە ناوچە یۆنانیەکانیشدا،

خەڵکانێکی زۆر دەیانگوت دەبێت مرۆڤ لە دونیا نەویستیدا بژی -یان لە خۆدابڕانی ئاینیدا بژی، بۆ ئەوەی بتوانێت ڕۆحی ئازاد بکات. چەندەها بیرکردنەوە و بۆچوونی بەم جۆرەی جیهانی یۆنانی-ڕۆمی، لە بەردی بناغەی ژیانی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەدی دەکرێت.
لە سەرو ئەمانەشەوە، لە زۆرینەی کەلتورەکانی هیندۆ ئەوروپیدا، باوەڕکردن بە کۆچکردنی ڕۆح و لەدایک بوونەوەی، بابەتێکی بنچینەییە. 2500 ساڵە (بگرە زیاتریش) ڕزگاربوون لە کۆچکردنی ڕۆح و لە دایکبوونەوەی، ئامانجی هەموو تاکەکەسێکی هیندیە. پلاتۆنیش باوەڕی بە کۆچکردنی ڕۆح و لەدایک بوونەوەی هەبووە.

### سامییەکان «Semite»

ئەوجا با بچینە سەر باسی سامییەکان، سۆفیا. لێرەدا باس لە جۆرە کەلتورێک و زمانێکی تەواو جیاواز دەکەین. سامیەکان لە ڕەچەڵەکدا لە نیمچە دوورگەی عەرەبیەوە هاتوون، بەڵام بازنەی کەلتوری سامیەکانیش بە چەندەها بەشی گەورەی جیهاندا بڵاوبۆتەوە. دوو هەزار ساڵ زیاترە کە جولەکەکان دور لە وڵاتی خۆیان دەژین. ئاین و مێژووی سامی، بە پلەی یەکەم بە هۆی ئاینی مەسیحیەوە بوو کە لە ڕەگە جوگرافیاکەی خۆی دوورکەوتەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا لە ڕێگەی ئیسلامیشەوە، کەلتوری سامی تەواو بڵاوبووەوە.
هەر سێ ئاینە ڕۆژئاواییەکان -یەهودی، مەسیحی، ئیسلام- پاشینەیەکی سامیان هەیە. کتێبی قورئانی موسڵمانان و پەیمان نامەی کۆن «The Old Testament» بە زمانی سامی نزیک بەیەک نووسراونەتەوە. یەکێک لەو وشانەی کە لە پەیمان نامەی کۆندا بۆ

خودا بەکاردێت، ڕێک هەمان ڕەگی زمانەوانی وشەی خودا «اللـه»ی موسڵمانەکانی هەیە.
بەڵام کاتێک باس لە ئاینی مەسیحی دەکەین، ئەوسا کارەکەمان کەمێک ئاڵۆزتر دەبێت. بێگومان ئاینی مەسیحیش پاشینەیەکی سامی هەیە. بەڵام «پەیمان نامەی نوێ» بە زمانی یۆنانی نووسرایەوە، کاتێکیش کە تیۆلۆژی مەسیحی یان باوەڕی مەسیحی کۆکرایەوە، هەموو کارەکە کەوتە ژێر کاریگەری زمانی یۆنانی و لاتینی و لێرەشەوە کاریگەری فەلسەفی هیللینیزمیشی پێوە دیارە.
لەوەوپێش گوتمان هیندۆ ئەوروپیەکان باوەڕیان بە خودای جۆراوجۆر دەکرد. بەڵام جێگەی سەرنجە کە سامیەکان هەر لە کۆنەوە لە دەوری یەک خودا کۆدەبوونەوە و باوەڕیان پێ دەکرد. بەمەش دەگوترێت «مۆنۆتیزم .Monotheism» هەبوونی یەک خودا، کۆڵەکەیەکی گرنگی بیری ئیسلام و مەسیحی و یەهودیە.
بینینی مێژووش وەک هێڵێک، خاسیەتێکی هاوبەشی تری سامیەکانە. واتە مێژوو وەک هێڵێک تەماشا دەکرێت، دیسانەوە واتە ڕۆژێک لە ڕۆژان خودا جیهانی ئافەریدە کردووە، مێژووش لەو ڕۆژەوە دەستی پێکردووە. بەڵام دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان کۆتایی بە مێژوو بێت؛ ئەو ڕۆژەش لە ڕۆژی «لێپرسینەوەدا -حەشردا» دەبێت، کە خودا لە زیندوو و مردووەکان دەپرسێتەوە.
ئەو ڕۆڵەی کە مێژوو دەیبینێ، خاسیەتێکی گرنگی هەر سێ ئاینە ڕۆژئاواییەکانە. لەوێدا خودا دەست لە مێژوو وەردەدات، بەڵکە وردتر بیڵێین؛ لە ڕاستیدا مێژوو بۆیە بوونی هەیە، چونکە خودا دەیەوێت ویستی خۆی لە جیهاندا بەدی بهێنێت. هەروەکو چۆن جارێکیان ئەبراهامی بەرەو «وڵاتی پەیمان دراو» برد، بەهەمان شێوەش ڕێڕەوی

مرۆڤایەتی بەرەو ڕۆژی لێپرسینەوە دەبات. ئەو کاتەش هەموو خراپەکاریەکی جیهان دەفەوتێنێت.

بە بڕوای سامیەکان، خودا ڕۆڵێکی گرنگی لە مێژوودا هەیە، لەبەرئەوە هەزارەها ساڵە خەریکی نووسینەوەی مێژوون. لە ڕاستیدا هەر ئەو ڕەگە مێژووییانەشە کە بوونەتە ناوەڕۆکی کتێبە پیرۆزەکانیان.

ئەمڕۆکە شاری قودس، سەنتەرێکی ئاینی گرنگی یەهودی و مەسیحی و موسڵمانانەکانە. دیسانەوە ئەمەش شتێکمان دەربارەی پاشینەی مێژووی هاوبەشی ئەو سێ ئاینە پێ دەڵێت. لەو شارەدا پەرستگا و مزگەوت و کڵێسەی گرنگی هەر سێ ئاینەکەی لێیە. لەبەر ئەوە کارەساتێکی دڵتەزێنە، کە ڕێک ئەو شارە بۆتە ناوچەی ململانێ و شەڕ. بەڵێ، خەڵکی لە شەڕدان و بە هەزاران لە یەک دەکوژن، چونکە ناتوانن تەبابن لەسەر ئەوەی چ لایەنێک دەسەڵاتی بەسەر ئەو «شارە پیرۆزە»دا هەبێت. بەڵکو ڕۆژێک لە ڕۆژان نەتەوە یەکگرتووەکان بتوانێت قودس بکاتە شوێنێک بۆ کۆکردنەوەی ئاینی هەر سێ دینەکە.

(لێرەدا لەمە زیاتر باسی لایەنی کردەنی ئەم بەشەی کۆرسی فەلسەفەکەمان ناکەین. تەواوی ئەم بەشە بۆ باوکی هیلدە جێدەهێڵین. بێگومان دەزانیت کە ئەو چاودێریکەرێکی نەتەوە یەکگرتووەکانە لە لوبنان. زیاتریشت بۆ ڕوونبکەمەوە، پلەی مێجەری هەیە. ئەگەر هێدی هێدی خەریکە تێدەگەیت، ئەوا خراپ نیە و لە شوێنی خۆیدایەتی... بەڵام لە لایەکی تریشەوە نامانەوێت پەلە لە ڕووداوەکاندا بکەین).

لەوەوپێش گوتمان گرنگترین هەست لای هیندۆ ئەوروپیەکان بینین بووە. بەڵام لەلای سامیەکان، بەڕاستی جێگەی سەرنجە، دەبینین

«گوێگرتن» ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. ڕێکەوت نیە کە باوەڕی یەهودی بەم وشانە دەست پێدەکات؛ «ئیسرائیل، گویّ بگرە!». لە پەیمان نامەی کۆنیشدا مرۆڤ «گوێی» بۆ وشەی خودا شلکردووە. هەروەها پێخەمبەرە جولەکەکانیش ڕاگەیاندنە ئاینیەکانیان بەم شێوەیە دەست پێدەکرد؛ «پاشان یەهوە "خودا" فەرمووی». مەسیحیەتیش بە هەمان شێوە، بایەخێکی زۆر بە «گوێگرتن» لە وشەکانی خودا دەدات. لە سەرو هەموو شتێکیشەوە، سروتی بڵاوی ئاینی هەر سێ دیانەتی یەهودی و مەسیحی و ئیسلام، خوێندنەوەی تێکستی ئاینییە.

پێشتر گوتم، هیندۆ ئەوروپییەکان هەمیشە وێنە و پەیکەریان بۆ خواکان و کەسە پیرۆزەکانیان دروست دەکرد. سامیەکان بە پێچەوانەوەن، ئەوان هاتن و وێنە و پەیکەری خواکانیان «قەدەغە کرد». واتە، بە هیچ جۆرێک ڕێگە نادەن کە وێنە و پەیکەری خودا و کەسە پیرۆزەکان دروستبکرێت. لە پەیمان نامەی کۆندا بە مانای وشەیی هاتووە کە مرۆڤ بەهیچ جۆرێک بۆی نیە وێنەی «خودا» بکێشێت. تەنانەت ئەمڕۆکەش، ئەم بابەتە لەلای یەهودی و ئیسلام هەر قەدەغەیە. موسڵمانەکان هەر بەشێوەیەکی گشتی ڕقیان لە فۆتۆگراف و وێنە کێشانی هونەریە. مەبەستیان لەوەیە کە مرۆڤ بۆی نیە بەربەرەکانیّ لەگەڵ خودادا بکات و شتێک «بخوڵقێنێت.«

لەوانەیە ئێستاکە بڵێیت؛ بەڵام کڵێسە مەسیحیەکان پڕن لە وێنەی مەسیح و خوداش. لەوەدا ڕاست دەکەیت سۆفیا، بەڵام ئەمەش دیسانەوە نمونەیەکی تری کاریگەری جیهانی یۆنانی-ڕۆمی یە لەسەر ئاینی مەسیحی. (تا ئێستاکەش لە کڵێسەی ئەرتۆدۆکسی ڕوسیا و یۆناندا، وێنە کێشان و پەیکەر تاشینی چیرۆکەکانی کتێبی پیرۆز قەدەغەیە).

بە پێچەوانەی ئاینەکانی ڕۆژهەڵاتەوە (*واتە هیندۆیزم و بودیزم و ئاینی چینی.و) ئاینەکانی ڕۆژئاوا (*واتە ئیسلام و یەهودی و مەسیحی.و) باوەڕیان بە بۆشاییەک لە نێوان خودا و ئافەریدەکانیدا هەیە. ئامانجی ژیانیش لەلایان ڕزگارکردنی ڕۆح نیە لە بازنەی کۆچکردن و لەدایک بوونەوە، بەڵکو پاککردنەوەی گوناحە. ژیانی ئاینیشیان، بە پێچەوانەی خەڵوەت و خۆدابڕاندنەوە، پڕە لە نوێژکردن و وتاردان و خوێندنەوەی تێکستە دینییەکان.

### *ئیسرائیل*

نامەوێت لەگەڵ مامۆستای ئاینەکەتدا بەربەرەکانێ بکەم، سۆفیا. بەڵام با کورتەیەکی ڕابووردوی جولەکەکان بۆ مەسیحیەکان بخەینە ڕوو.

خودا جیهانی ئافەریدە کرد، لێرەوە هەموو شتێک دەستی پێکرد. دەشتوانیت چۆنیەتی ئافەریدەکردنەکەی لە لاپەڕەکانی سەرەتای ئینجیلدا بخوێنیتەوە. پاشان مرۆڤ لە خودا هەڵگەڕایەوە. سزاکەشی، تەنها دەرکردنی ئادەم و حەوا نەبوو لە باخچەی عەدەندا، بەڵکو مردنیشی هێنایە جیهانەوە.

یاخیبوونی مرۆڤیش لە خودا وەک هێڵێکی سوور لە سەرانسەری ئینجیلدا دەبینرێت. وردترش تەماشاکەین، لە کتێبی یەکەمی موسادا باسی زریانی گوناح و کەشتیەکەی نوحمان بەرچاو دەکەوێت. پاشان خودا پەیمان نامەیەک لەگەڵ ئیبراهیم و نەژادەکەیدا دەبەستێت. ئەم پەیمان نامەیە –یان ڕێک کەوتنە- لەسەر ئەوە بوو کە ئیبراهیم بە خۆی و نەژادەکەیەوە، پەیامی خودا بپارێزن. لە بەرامبەریشدا خودا پەیمانی دا کە نەوەکانی دوای ئیبراهیم بپارێزێت. پاشانیش

پەیمان نامەکە نوێکرایەوە، لەو کاتەدا بوو کە موسا لەسەر شاخی سینا لەوحە خواییەکانی بۆ هاتە خوارەوە (لەوحەکانی موسا). ئەم ڕووداوەش لە نزیکەی ساڵی 1200ی پێش مەسیحدا ڕوویداوە. لەو کاتەشدا یەهودیەکان دەمێک بوو وەک کۆیلەیەک لە میسردا دەست بەسەربوون، بەڵام بە یاریدەی خودا خەڵکەکە کۆبوونەوە و بەرەو ئیسرائیل بەرێخران.

نزیکەی ساڵی 1000ی پێش مەسیح –واتە زۆر پێش ئەوەی شتێک هەبێت کە ناوی فەلسەفەی یۆنانی بێت- باسی سێ پاشای گەورەی ئیسرائیلی دەبیستین. یەکەمیان ساوڵ«Saul» ، ئەوجا دەیڤید «David»، پاشانیش سەلەمون«Salomon» ، لەو کاتەشدا هەموو ئیسرائیلیەکان لە ژێر ئالای یەک پاشادا کۆبوبوونەوە. بە تایبەتیش لە سەردەمی دەیڤیددا گەشەیان بەلایەنی ڕامیاری و سەربازی و کەلتوری دا.

کاتێک کە پاشایەکیان دادەنا، دەبوایە لەلایەن خەڵکەوە پیرۆز بکرایە (*ئەمەشیان لە ڕێگەی چەورکردنی سەری پاشاکەوە دەکرد، لەو کاتەدا ڕۆنی زەیتون بە شتێکی زۆر گرنگ و پیرۆزی ژیان دادەنرا، بگرە وەک سیمبولی نەمریش دەبینرا. بۆ نمونە لەو سەردەمەدا کە کەسێک ژنی دەهێنا، خێرا دار زەیتونێکی دەڕواند، بۆ ئەوەی ئەگەر لە ناکاودا مرد، خێزانەکەی سەرچاوەیەکی ژیانیان هەبێت .و). بەم جۆرەش ناونیشانی «مەسایا»ی پێدەبەخشرا، واتە «ڕزگارکەر». لەسەر ئاستی ئاینیش، پاشاکان وەک کەسێکی نێوان خودا و خەڵک لەقەڵەم دەدران. لەبەر ئەم هۆیەش بە پاشاکانیان دەگوت؛ «کوڕی خودا» یان «جیهانی خودا.«

بەڵام پاش ماوەیەکی کەم وڵاتی ئیسرائیل لاواز بوو، پاشانیش بوو بە دوو بەشەوە؛ وڵاتی باکور (ئیسرائیل) و وڵاتی باشور (یەهوا). لەساڵی 722ی پێش مەسیحدا ئاشوریەکان وڵاتی باکوریان داگیرکرد و بەم جۆرەش هەموو کاریگەریەکی ئاینی و ڕامیاریان لەدەستدا. وڵاتی باشوریش باشتری بەسەر نەهات، لە ساڵی 586ی پێش مەسیحدا بابلیەکان داگیریان کرد. پەرستگاکەیان ڕوخاند و هێندێکی زۆری خەڵکەکەیان بەرەو بابل فڕاند. ئەم «زیندانکردنە بابلیە» هەتاوەکو ساڵی 539ی پێش مەسیح درێژەی کێشا. ئەوجا ڕێگەیان بە خەڵکیدا بگەڕێنەوە بۆ قودس، پاشانیش سەر لەنوێ پەرستگا گەورەکەیان بنیات نایەوە. بەڵام هەتاوەکو سەرهەڵدانی ئاینی مەسیحی، جولەکەکان لە ژێر دەسەڵاتی بێگانەدا دەژیان.

بەڵام بۆچی مەملەکەتەکەی دەیڤید پاشا هەڵوەشایەوە و یەک لە دوای یەک نەهامەتی بەسەر خەڵکەکەیدا دەهات، ئەمە پرسیارێک بوو کە جولەکەکان لە خۆیانیان دەکرد. خۆ خودا خۆی پەیمانی دا کە دەستی پارێزگاری بەسەر ئیسرائیلدا بکێشێت، بەڵام خەڵکەکەش پەیمانی ئەوەیان دابوو کە پارێزگاری پەمانی خودا بکەن. پاشانیش بەرە بەرە تێگەیشتنێکی بەم جۆرە بڵاو بووەوە؛ ئیسرائیلیەکان بەهۆی یاخیبوونیان لە خودا، سزای خۆیان وەرگرت.

لە نزیکەی ساڵی 750ی پێش مەسیحەوە، کۆمەڵێک پێغەمبەر دەرکەوتن، کە پێشبینی سزادانی ئیسرائیلیان دەکرد، لەبەرئەوەی خەڵکەکەی پەیمانی خودایان نەپاراست. ئەوان دەیانگوت؛ ڕۆژێک دێت کە خودا ڕۆژی دادوەری خۆی بەسەر ئیسرائیلیەکاندا دەستپێبکات. ئێمە بەم جۆرە پێشبینیانە دەڵێین؛ «پێشبینیکردنی ڕۆژی دادوەری.»

پاش ماوەیەک چەند پێغەمبەرێکی تریش دەرکەوتن، کە دەیانگوت خودا کۆمەڵێک لەم گەلە ڕزگاردەکات و «ئەمیرێکی ئاشتی» یان «پاشایەکی ئاشتی دەنێرێت، کە لە نێوان نەژادی دەیڤیددایە. ئەو پاشایەش هەڵدەستێ بە ئاوەدانکردنەوەی مەملەکەتی دەیڤید و خەڵکیش لە پاشە ڕۆژێکی ڕووندا دەژین.
جەسایەس«Jesaias» ی پێغەمبەر دەیگوت؛ «ئەو خەڵکانەی لە تاریکیدا کۆچ دەکەن، چاویان بە ڕووناکیەکی مەزن دەکەوێت. ئەوانەش کە لە وڵاتی سێبەردا دەژین، ڕووناکیەکی گەورە بەسەریاندا دەدرەوشێتەوە». بەم جۆرە پێشبینیکردنانەش دەڵێین؛ «پێشبینیکردنی ڕزگارکەر.«
بەکورتی؛ خەڵکی ئیسرائیل لە ژێر دەسەڵاتی دەیڤید پاشادا بە ئاسودەیی دەژیان. وردە وردەش کە ژیانی ئیسرائیلیەکان خراپتر و خراپتر دەبوو، پێغەمبەرەکان پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە ڕۆژێک پاشایەکی نوێ لە نەژادی دەیڤیدەوە لەدایک ببێت. ئەم «مەسایا»یە یان ئەم «کوڕی خوایە»، خەڵکی ڕزگاردەکات و دیسانەوە ئیسرائیل وەک هێزێکی گەورە ئاوەدان دەکاتەوە و «جیهانی خودا» دادەمەزرێنێت.

**مەسیح**

باشە، سۆفیا. وای دادەنێم کە هێشتام لەگەڵ باسەکەمدا دەڕۆیت. وشە سەرەکیەکانمان؛ «کوڕی خودا» و «ڕزگارکەر» و «جیهانی خودا»ن... لە سەرەتادا هەموو ئەمانە بە شێوەیەکی ڕامیاریانە تەماشادەکران. لەسەردەمی مەسیحیشدا خەڵکانێکی نوێ لەو بڕوایەدابوون کە «ڕزگارکەرێکی» نوێ دەرکەوێت، کە بە هەمان

شێوەی دەیڤید پاشا ببێتە سەرکردەیەکی ڕامیاری و سەربازی و ئاینی. بەم جۆرەش ئەم «ڕزگارکەرەیان» وەک پاڵەوانێکی نەتەوەیی تەماشادەکرد، کە کۆتایی بە ئازاری جولەکەکان بهێنێت، چونکە لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمیەکاندا دەیان ناڵاند.

بەڵام هاوکات کۆمەڵێکی تر هەبوون کە کەمێک دورتر دەیانڕوانی. نزیکەی دوو سەد ساڵێک لەپێش لەدایکبوونی مەسیحدا، چەند پێخەمبەرێک لەو بڕوایەدابوون کە «ڕزگارکەری» چاوەڕوانکراو، ببێتە ڕزگارکەری هەموو جیهان. ئەو نەک تەنها جولەکەکان لەژێر دەسەڵاتی بێگانەدا ڕزگاردەکات، بەڵکو هەموو مرۆڤایەتی لە گوناح و هەڵەکانیان پاک دەکاتەوە —تەنانەت لە مردنیش سەربەستیان دەکات. هیوای «ڕزگارکەرێکی» ئاوها لە سەرانسەری جیهانی هیللینیزمیشدا بڵاوبوو.

پاشان مەسیح هات، بەڵام ئەو تەنها کەس نەبوو کە وەک «ڕزگارکەری» چاوەڕوانکراو دەرکەوت. ئەویش وشەی وەک «کوڕی خودا» و «جیهانی خودا» و «مەسایا» و «ڕزگارکەر»ی بەکاردەهێنا. بەم شێوەیەش خۆی بە پێشبینیەکانی پێشتریەوە بەستەوە. هاتە ناو قودس و خەڵکیش وەک ڕزگارکەرێک ئاهەنگیان بۆ گێڕا. ئەویش بەهەمان شێوەی پاشاکانی پێشووی، کە لە ڕێگەی «سروتی تایبەتیەوە» دەگەیشتنە سەر تەختی پاشایی، هەمان ڕێگەی گرتە بەر. خەڵکی پیرۆزیانکرد و گوتی؛ «ئێستا کاتی خۆیەتی و جیهانی خودا نزیکە.«

ئەمانە هەمووی شایانی سەرنجن، بەڵام لێرەوە بەوردی بڕوانە؛ مەسیح خۆی لە هەموو ڕزگارکەرەکانی تر بەوە جودا دەکردەوە کە ئەو خۆی بە هیچ جۆرە سەرکردەیەکی سەربازی یان ڕامیاری لەقەڵەم

نەدەدا. ئەركی سەرشانی ئەو زۆر گەورەتر بوو؛ ڕاگەیاندنی ڕزگاری و لێبووردن بوو بۆ هەموو مرۆڤایەتی. لەبەرئەوە بەناو خەڵكیدا دەڕۆیشت و دەیگوت «لە گوناحەكانت پاك بوویتەوە.«
لەوەوپێش بەهیچ جۆرێك نەبیسترابوو، كە «گوناح پاككردنەوە» بەو شێوەیە ببەخشرێتەوە. لەوەش خراپتر، ئەو ناوی خوای نابوو «باوك». لە ژینگەی جولەكەكانی ئەو كاتەدا، كەس ئەمەی نەبیستوو. لەبەرئەوە هێندەی نەبرد، لەلایەن ئەو كەسانەی تەوراتیان دەنووسیەوە، دژایەتییەكی گەورەیان نیشاندا. پاشانیش هەر ئەوانە هێدی هێدی خۆیان ئامادەكرد بۆ ئەوەی بەدادگای بگەێنن و حوكمی كوشتنی دەبكەن.
بە كورتی؛ لە سەردەمی مەسیحدا، خەڵكانێكی زۆر چاوەڕوانی «ڕزگاركەرێك» بوون كە بە زەبری هێز (واتە بە شمشێر و تیر)، «جیهانی خودا» دابمەزرێنێتەوە. خودی زاراوەی «جیهانی خودا»ش بە ئاشكرا لەناو وتەكانی مەسیحدا دێت، بەڵام بەمانایەكی جیاوازتر و زۆر فراوانتریش گوزارشتی لێدەكات. مەسیح دەیگوت؛ «جیهانی خودا» واتە خۆشەویستی یەكتری، واتە نیشاندانی سۆز و بەزەیی بەرامبەر بە كەسە لاواز و هەژارەكان، واتە لێبووردنی ئەوانەی كە هەڵەیان كردووە.
بەم شێوەیەش، ئەو زمانە شەڕانگیزییە كۆنە، مانایەكی تەواو نوێی وەرگرت و گۆڕانكاریەكی مەزنی بەسەردا هات. خەڵكی چاوەڕوانی سەركردەیەكی سەربازی بوون، كە بانگەواز بۆ دامەزراندنی «جیهانی خودا» بكات. بەڵام مەسیح بە جلوبەرگێكی ساكار و جوتێ سەرپاییەوە دێت و دەڵێت؛ «جیهانی خودا» -یان پەیمان نامەی نوێ- ئەوەیە كە «تۆ خەڵكانی ترت وەك خۆت خۆشبووێت». لەوەش زیاتر

دەڕوات سۆفیا. ئەو دەڵێت؛ دەبێت دوژمنەکانمان خۆشبوێت و کاتێکیش لێمان دەدەن، نابێت بە هەمان جۆر وەڵام بدەینەوە... نا، نا، گەر زللەیەکیان لە ڕومەتی ڕاستمان دا، دەبێت ڕومەتی چەپیشمان وەرچەرخێنین بۆیان. هەروەها دەبێت لێیبوورین –نەک تەنها حەوت جار، بەڵکو پەنجا کەڕەت حەوت جار.

لە ڕێگەی ژیانی مەسیحەوە دەبینین کە ئەو لەگەڵ ئافرەتانی سۆزانی و کەسانی گومرگچی و دوژمنی سیاسی وڵاتەکەدا دەدوا. تەنها بەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو لەوەش دورتر دەڕویشت؛ ئەو دەیگوت کوڕێکی سەرەڕۆ، کە هەموو سامانی باپیرانی بە فیڕۆ داوە –یان گومرگچیەکی بەد کە پارەی بۆ خۆی لاداوە- ئەگەر تەنها ڕووبکەنە خودا و داوای لێبووردنی لێبکەن، ئەوا لەبەر چاوی خودادا بە باشی دەبینرێن، چونکە دەیگوت خودا یەکجار دڵئاوا و بەخشندەیە.

هێشتام دورتریش دەڕوات، لێرەدا دەشێ ئاگاداربیت، سۆفیا؛ مەسیح دەیگوت؛ ئەو جۆرە «گوناحبارانە» لەبەرچاوی خودادا باشترن لەو بێگوناحە فەراسیانەی (*فەراسی؛ تیرەیەکی جولەکەن، لە کاتی مەسیحدا بە کردنی سروتی ئاینی خودا پەرستی بە ڕووکەش ڕاست و بە ناواخن درۆ بە ناوبانگبوون.و) کە دەژین و شانازی بە بێ هەڵەیی خۆیانەوە دەکەن –واتە زۆر زیاتر شایانی لێبووردن و بەخشینی خودان.

مەسیح دەیگوت ئێمە ناتوانین خۆمان ڕزگاربکەین و هیچ کەسێکیش شایانی بەزەیی خودا نیە. (لەو کاتەدا خەڵکانێکی زۆری یۆنانی پێیان وابوو کە بتوانن خۆیان ڕزگاربکەن!). ڕاستە مەسیح چەند داخوازیەکی ئاکاریی سەخت لە «ئامۆژگاری چیا»دا دەخاتە ڕوو، بەڵام ئەم داخوازیانەی تەنها لەبەر ئەوە نیە کە ویستی خوامان پێ

بناسێنێت، بەڵکو لەهەمان کاتیشدا دەیەوێت پێمان بڵێت کە هیچ مرۆڤێک لەبەرچاوی خودادا دادوەر نیە. دڵئاوایی خودا بێسنوورە، بەڵام دەبێت ئێمەش بە نوێژەوە ڕوی تێبکەین و داوای بەخشینی لێبکەین.

من نامەوێت لەمە زیاتر بچمە قوڵایی کەسایەتی و پەیامی مەسیحەوە، ئەم بابەتە بۆ مامۆستای ئاینەکەت جێدەهێڵم. مامۆستاکەت ئەرکێکی سەختی لەسەر شانە، بەڵام هیوادارم بۆتان بسەلمێنێت کە مەسیح چ مرۆڤێکی بێ هاوتا بووە. ئەو وەک بلیمەتێک زمانی سەردەمەکەی بەکاردەهێنا و لە هەمان کاتیشدا مانا و ناواخنی زۆر قوڵتر و جیاوازتری بە زاراوە کۆنەکان دەبەخشی. لەبەرئەمە هیچ مایەی سەرسوامان نیە کە لە کۆتایدا گەیشتە سەر خاچ. پەیامی ڕزگارکردنە ڕیشەییەکەی، هێندە بەرامبەر بەرژەوەندی و تاقمی دەسەڵاتدار وەستایەوە، کە دەبوایە یەکسەر لەناویان ببردایە.

لە باسی سوکراتەوە فێربووین کە چەندە ترسناکە گەر هانا بۆ ژیریێتی مرۆڤ ببردرێت. مەسیحیش خاڵێکی ترمان نیشان دەدات؛ ترسناکە گەر داوای خۆشەویستی بێمەرج و بەخشینی بێمەرج بکەین. تەنانەت لە کاتی ئێستاشماندا وەڵاتە گەورەکان بە شەرمەزاری دەبینین، کاتێک دەخرێنە بەر داوای ساکاری وەک ئاشتی و خۆشەویستی و خواردن بەخشین بە هەژاران و لێبووردنی دوژمنانی وڵات.

لە یادتە کە پلاتۆن چەندە توڕەبوو کاتێک کە مرۆڤێکی دادپەروەری «وەک سوکرات» دەبوایە ژیانی لەدەست بدایە؟

بەپێی ئاینی مەسیحی، مەسیح دادپەروەرترین مرۆڤە کە لەسەر ئەم زەویە ژیابێت. لەگەڵ ئەوەشدا حوکمی کوشتنی دەرکرا، وە بەبڕوای

ئاینی مەسیحی، ئەو لەبەر خاتری مرۆڤایەتی مرد. لەبەر ئەمەیە کە دەڵێن مەسیح «هەڵگری ئازارە». مەسیح ئەو «خزمەتکارە پڕ لە ئازارەیە» کە هەموو گوناحەکانی مرۆڤایەتی خستە سەر شانی خۆی، هەتا بەم جۆرەش لەگەڵ خودادا «تەبا»بین و لە سزای خودا ڕزگارمان بێت.

### پاولۆس «Paulus»

چەند ڕۆژێک دوای ئەوەی مەسیح لەخاچ درا و نێژرا، ورتەورتێک لە ناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە کە زیندووبۆتەوە. بەم جۆرەش مەسیح نیشانیدا کە لە مرۆڤێکی ئاسایی زۆرترە و بە ڕاستی «کوڕی خودا»یە. دەتوانین بڵێین کڵێسەی مەسیحی سەر لەبەیانی جەژنی هەستاندنەوەیان (*زیندووبوونەوەی مەسیح.و) لەگەڵ دەنگوباسی زیندووبوونەوەی مەسیحدا دەستپێکرد. لەوێدا پاولۆس گوتی؛ «ئەگەر مەسیح زیندوو نەبوایەتەوە، ئەوا پەیامەکەمان هیچ دەبوو و بڕواکەشمان بێمانا دەکەوتەوە.»

لەو کاتەوە هەموو کەسێک دەیتوانی هیوای «زیندووبوونەوەی جەستەیی» هەبێت، لەبەرئەوەی مەسیح لەبەر خاتری ڕەهابوونی ئێمە لە خاچ درا. لێرەدا سۆفیای ئازیز دەشێ سەرنجی ئەم خاڵە بدەیت؛ جولەکەکان بڕوایان بە «نەمری ڕۆح» و هیچ جۆرە «کۆچکردن و لەدایکبوونەوەیەکی ڕۆح» نەبوو. ئەمە شێوە بیرکردنەوەیەکی یۆنانییە، واتە تەرزی بیرکردنەوەیەکی هیندۆ ئەوروپیە. بەڵام بە پێی ئاینی مەسیحی هیچ بەشێکی مرۆڤ –بۆ نمونە ڕۆحی- خۆی لە خۆیدا نەمر نیە. ڕاستە مەسیحیەکان باوەڕیان بە «زیندووبوونەوەی جەستە و ژیانی هەتاهەتایی» هەیە، بەڵام دەڵێن ئەمە موعجیزەیەکی

خودایە کە ئێمە لە مردن و «ئازاری هەتاهەتایی» ڕزگار دەکرێین. ئێمە خۆمان نە توانامان هەیە بەوە بگەین و نە خاسیەتێکی زگماکی واشمان هەیە کە گرێدراوی ئەو بابەتە بێت.

لە سەرەتادا مەسیحیەکان بڵاوکردنەوەی «پەیامی خۆشی» ڕزگاربوونیان لە ڕێگەی باوەڕپێکردن بە کەسی مەسیحەوە دەستپێکرد. بەهۆی باوەڕی ڕزگارکردنەکەشیەوە، «جیهانی خودا» بەرە بەرە سەریهەڵدا. لێرەشەوە خۆشەویستی "کڕایست «Christ» " (*مەسیح.و) چووە ناو دڵی خەڵکانی جیهانەوە. (وشەی «کڕایست» لە بنەڕەتدا وشەیەکی وەرگێردراوی یۆنانیە کە لە وشەی «مەسایا «Messias»ی عیبرییەوە وەرگیراوە و مانای «کەسی ڕزگارکەر» دەبەخشێت).

پاش چەند ساڵێک لە دوای مردنی مەسیح، "پاولۆس"ی فەراسی هاتە ناو ئاینی مەسیحییەوە. پاولۆس لە ڕێگەی گەشتە ئاینییە زۆرەکانیەوە بەناو جیهانی یۆنانی-ڕۆمیدا، توانی ئاینی مەسیحی بکاتە ئاینێکی جیهانی. ئەمەشمان لە بەشی «دوانزە پەیامنێرەکان»دا بەرچاو دەکەوێت کە لە ئینجیلدا هاتووە. لە ڕێگەی نامە زۆرەکانی پاولۆسیشەوە، کە بۆ کۆمەڵە مەسیحیە سەرەتاییەکانی دەنارد، زیاتر دەربارەی پەیام و ڕێنومایی مەسیحی پاولۆس شارەزا دەبین.

پاشان خۆی گەیاندە ئەسینا. ڕێک بەلای گۆڕەپانەکەی پایتەختی فەلسەفەدا دەڕوات. دەگێڕنەوە دەڵێن؛ «بینینی ئەو هەموو وێنە و پەیکەری خوایانەی کە لە هەموو لایەکی شارەکەدا دانرابوون، زۆر بە قوڵی دەیهەژێنێت». ئەوجا بە میوانی دەچێتە پەرستگای جولەکەکان، پاشان لەگەڵ فەیلەسوفە ئێپیکوری و ستۆیکەکاندا دەدوێ، ئەوانیش

دەیبەنە سەر لوتکەی شاخی ئاریۆپاگۆس و لەوێدا لێی دەپرسن؛ «دەتوانیت باسی ئەم بڕوا نوێیەمان بۆ بکەیت کە تۆ لەگەڵ خۆتدا هێناوتە؟ ئێمە شتی سەیر سەیرمان بەر گوێ دەکەێت و دەخوازین بزانین ڕاست و دروستی باوەڕەکەت چیە؟

دەتوانیت ئەو دیمەنە بهێنیتە بەرچاوت سۆفیا؟ لەوێدا لە گۆڕەپانی ئەسینادا جولەکەیەک دەردەکەوێت و باسی ڕزگارکەرێک دەکات، کە لە خاچ دراوە و پاشانیش زیندوو بۆتەوە. هەر لەکاتی میوانداریەکەی پاولۆسدا (بۆ ئەسینا)، دەتوانین هەست بە پێکدا هەڵچوونێکی نێوان فەلسەفەی یۆنانی و بڕوای ئاینی مەسیحی بکەین. بەڵام وەک ئاشکرایە پاولۆس بڕوا بە ئەسیناییەکان دەهێنێت. لەسەر شاخی ئایۆپاگۆسەوە –لەژێر پەرستگا گەورەکانی ئەکرۆپۆلیسەوە- وتارێکی بۆ خوێندنەوە و بەم جۆرە دەستی پێکرد؛

»پیاوانی ئەسینا!، لە هەموو بارێکەوە دەتان بینم کە ئێوە زۆر ئاینین. بەڵام کاتێک بە شارەکەتاندا سوڕامەوە و تەماشای شوێن و شتە پیرۆزەکانتانم کرد، لەسەر میحرابی پەرستگایەک بینیم نووسرابوو؛ «بۆ خودایەکی نە ناسراو». وا من ئەوەتان پێ دەناسێنم، کە ئێوە دەیپەرستن و نازانن کێیە. خودا، جیهان و هەموو شتێکی ناو جیهانی ئافەریدە کردووە. ئەو، کە دەسەڵاتی بەسەر زەوی و ئاسماندا هەیە، لەناو پەرستگایەکدا ناژی کە بەدەستی مرۆڤ دروستکرابێت. نە پێویستیشی بە هیچ شتێکی دەستی مرۆڤە کە خزمەتی ئەوی پێبکرێت. چونکە خودا ژیان و ڕۆح بە هەموو شتێک دەبەخشێت. ئەو لە یەک مرۆڤەوە هەموو نەژادی مرۆڤی خوڵقاندووە و ڕێگەی پێداون لە سەرانسەری جیهاندا بژین، هەر ئەویش کاتی دیاریکراوی بۆ داناون و ناوچەکانیانی سنووربەند کردووە. بەڵکو بەم شێوەیە

سۆراخی خودا بکەن، هەستی پێبکەن و بیبیننەوە. هەرچەندە لە ڕاستیدا ئەو لە هیچ کەسێکمانەوە دور نیە. لەبەرئەوەی ئێمە لەناو ئەودا دەژین و دەجولێینەوە و هەر لەناو ئەویشدا بوونمان هەیە. هەروەک چۆن هەندێک لە شاعیرەکانتان دەڵێن؛ «ئێمەش نەوەی خوداین». هەر لەبەر ئەم هۆیەش نابێت وا مەزەنەبکەن کە خودای پیرۆز لە پەیکەرێکی ئاڵتون بچێت، یان لە پەیکەرێکی زیو یان بەرد بچێت کە بە هونەری مرۆڤ یان لە خەیاڵی مرۆڤەوە داتاشرابێت. خودا ئەو سەردەمە تاریک و پڕ نەزانینەی لێبوورد و ئێستاش فەرمانی دەرکردووە کە هەموو مرۆڤێکی سەرانسەری جیهان ڕووی تێبکاتەوە. لەبەرئەوەی خودا ڕۆژێکی داناوە کە تێیدا دادپەروەری خۆی بەسەر جیهاندا دەسەپێنێت. بۆ ئەم مەبەستەش پەیام نێرێکی نارد، وەک نیشانەی ڕاستگۆیش لەناو مردووەکاندا زیندووی کردەوە، بۆ ئەوەی هەمووان بڕوای پێبکەن.

پاولۆس لە ئەسینادا سۆفیا!... لەناو جیهانی یۆنانی-ڕۆمی دا، ئاینی مەسیحی هێواش هێواش تەشەنەی کرد. بەڵام وەک شتێکی تر بڵاوبووەوە، وەک شتێکی تەواو جیاوازتر لە فەلسەفەی ئێپیکوری و ستۆیکی و پلاتۆنیزمی نوێ پەرەی سەند. جگە لەوەش پاولۆس خاڵێکی گرنگی لە کەلتوری سەردەمەکەیدا بەدیکرد، لەو خاڵەشەوە توانی باوەڕە نوێکەی لەناو خەڵکیدا بڵاوبکاتەوە؛ ئەو دەیگوت گەڕان بەدوای خودادا، لەناو قوڵایی هەموو مرۆڤێکدایە. ئەم بابەتەش بەلای یۆنانیەکانەوە شتێکی نوێ نەبوو. بەڵام پاولۆس وەک شتێکی نوێ لە پەیامەکەیدا دەیگوت؛ خوا خۆی بۆ مرۆڤ ئاشکراکرد و بەرەوڕوویان هاتووە. واتە ئەو تەنها «خوایەکی فەلسەفی» نیە کە مرۆڤ بتوانێت لە ڕێگەی ژیرێتییەوە لێی نزیک ببێتەوە، وە دەیگوت بە هیچ

جۆرێکیش لە پەیکەری ئاڵتون و زیو و بەرد ناچێت. (لەو کاتەدا پەیکەر و وێنەیەکی یەکجار زۆری لەو بابەتە لە ئەکرۆپۆلیس و لەناو گۆڕەپانەکەشدا دروست کرابوون). خودا «لەناو پەرستگایەکدا ناژی کە بەدەستی مرۆڤ دروست کرابێت». بەڵکو ئەو، خودایەکە کە وەک کەسێک دێتە ناو مێژووەوە، هەر لەبەر خاتری ڕزگاربوونی مرۆڤیش بە خاچەکەوە دەمرێت.

لە ئینجیلدا باسێک هاتووە و دەڵێت پاش ئەوەی پاولۆس وتارەکەی لەسەر ئاریۆپاگۆسەوە خوێندەوە، هەندێ لە ئەسینابیەکان گاڵتەیان بە خۆی و بە باسی زیندووبوونەوەی مەسیحەکەی کردووە. بەڵام تاک و تەرای گوێگران گوتویانە «پێمان خۆش دەبێت گەر کەرەتێکی تر زیاترمان دەربارەی باوەڕەکەت بۆ باس بکەیت». جگە لەمانەش کۆمەڵێکی تر ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە پاولۆسەوە گرتووە و برِوایان بە ئاینی مەسیحی هێناوە. یەکێک لەوانە ئافرەتێک بوو بە ناوی «داماریس» Damaris ەوە. ئەمەش شایانی سەرنجە، چونکە بەتایبەتی ئافرەتان دەچوونە ناو ئاینی مەسیحیەوە.

بەم شێوەیەش پاولۆس لەسەر گەشتە دینییەکانی بەردەوام بوو. نزیکەی چەند دە ساڵێک پاش مردنی مەسیح، چەندین گروپی ئاینی مەسیحی لەناو شارە گرنگەکانی یۆنانی-ڕۆمی دا سەریانهەڵدا؛ لە ئەسینا و ڕۆما و ئەسکەندەریە و ئیفیسوس و کۆرینتدا. پاش سێ چوار سەدەش، هەموو جیهانی هیللینیستی بوون بە مەسیحی.

**باوەڕ**

پاولۆس تەنها وەک گەشتیارێک و بڵاوکەرەوەیەکی ئاینی ڕۆڵی گرنگی لە دامەزراندنی ئاینی مەسیحیدا نەبینی، بەڵکو ئەو لەناو گروپە

مەسیحیەکانیشدا کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو. لەو کاتەدا گروپە ئاینییەکان پێویستیەکی گەورەیان بە ڕێنیشاندەرێکی ڕۆحی هەبوو.
بەڵام پرسیارێکی گرنگ چەندساڵێک پاش مردنی مەسیح سەریهەڵدا؛ ئایا کەسێک کە جولەکە نەبێت و بڕوای بە یەهودیەت نەبێت، بۆی هەیە ببێتە مەسیحی یان نا؟ بۆ نمونە ئایا یۆنانیەک دەتوانێت پەیڕەوی یاسای موسا بکات. بە بڕوای پاولۆس ئەوە شتێکی گرنگ نەبوو، چونکە بەپێی ئەو، ئاینی مەسیحی لە مەزهەبێکی یەهودی مەزنتربوو. هەروەها دەیگوت پەیامێکی ڕزگارکردنی گشتی بۆ هەموو مرۆڤێک هێناوە. «پەیمانە کۆنەکە»ی نێوان خودا و ئیسرائیل لابرا و لەبری ئەو «پەیمانی نوێ» دانرا، هەڵبەتە لێرەدا باسی ئەو پەیمانە دەکەین کە مەسیح لە نێوان خودا و هەموو مرۆڤایەتیدا بەستی.
بێگومان ئاینی مەسیحی لەو سەردەمەدا تەنها ئاین نەبوو. هەروەک بینیمان هیللینیزم خاسیەتی تێکەڵبوونی ئاینی تێدا باو بوو. لەبەرئەوە بەلای کڵێسەی مەسیحیەوە گرنگبوو کورتەیەک و پوختەیەکی ئاینەکەی دەربخات. گرنگی ئەمەش لەلایەکەوە لەوەدابوو کە خۆی لە ئاینەکانی تر جیابکاتەوە و لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی نەهێڵێت جیابوونەوە لەناو کڵێسەی مەسیحیدا دروست ببێت. ئا بەم جۆرە یەکەمین «بڕواکەر» سەریهەڵدا. مرۆڤی «بڕواکەر» کەسێکە کە گرنگترین «دۆگما» یان «بنچینە سەرەکیەکانی» ئاینی مەسیحیەت کورت و پوخت دەکاتەوە.
یەکێک لەو بنچینە سەرەکیانە ئەوە بوو کە دەیانگوت مەسیح هەم خودا و هەم مرۆڤیشە. واتە تەنها لە ڕێگەی کارەکانیەوە «کوڕی خودا» نیە، بەڵکو ئەو خودی خودایە. بەڵام مەسیح «مرۆڤێکی

ڕاستەقینە» بوو، بەشداری ژیانی مرۆڤی کرد و کاتێکیش لە خاچ درا، بە ڕاستی ئازاری چەشت.
لەوانەیە ئەمە وەک پێچەوانەگیرییەک بێتە بەر گوێ، بەڵام پەیامی کڵێسە ڕێک بەم شێوەیە بوو؛ خودا بوو بە مرۆڤ. مەسیح «نیوە خودا» نیە (کە نیوەی مرۆیی و نیوەکەی تریشی خوایانە بێت). بڕواکردن بەو جۆرە «نیو خودا»یانەش بەتەواوەتی لەناو ئاینەکانی هیللینیستیدا بڵاو بوو. بەڵام کڵێسە دەیگوت؛ «مەیسح "خودای پڕاوپڕ و مرۆڤی پڕاوپڕە.«"

پەراوێزی نامە
سۆفیای ئازیز، هەوڵدەدەم کەمێک زیاتر بابەتەکانت بۆ ڕوونبکەمە؛ کاتێک ئاینی مەسیحی دێتە ناو جیهانی یۆنانی-ڕۆمی یەوە، لێرەدا باس لە تێکهەڵچوونێکی مەزنی دوو کەلتور دەکەین. بەڵام لە هەمان کاتیشدا باسی گۆڕانکاریەکی گەورەی مێژوو دەکەین.

وا هێدی هێدی لە سەدەکانی کۆن دەردەچین. لەدوای سەرهەڵدانی یەکەمین فەیلەسوفی یۆنانییەوە، نزیکەی هەزارساڵێک تێپەڕیوە. لە بەردەمیشماندا، سەدەکانی ناوەڕاستی مەسیحیەت چاوەڕوانە، ئەمیش نزیکەی هەزار ساڵێک درێژەی کێشا.
جارێکیان گۆتەی شاعیری ئەڵمانی گوتی؛ «ئەو کەسەی لە مێژووی سێ هەزار ساڵەی مرۆڤ بەئاگا نەبێت، تەنها بۆ ورگی دەژی». بەڵام من پێم خۆش نیە تۆ لە نێوان ئەو کەسانەدا بیت. من هەرچیەکم لە تواناداا بێت پێشکەشتی دەکەم، تەنها بۆ ئەوەی ڕەگی مێژوویی خۆت بناسیت. تەنها بەو جۆرە دەبیتە مرۆڤ... تەنها بەو جۆرە لە

مەیمونێکی ڕووت زیاتر دەبیت... تەنها بەو جۆرە خۆت لە خولانەوە بە ئاسمانی بەتاڵدا لادەدەیت.

»تەنها بەو جۆرە دەبیتە مرۆڤ... تەنها بەو جۆرە لە مەیمونێکی ڕووت زیاتر دەبیت...«
بۆ ماوەیەک سۆفیا وشکبوو بوو. لە کونە چکۆلەکانی پەرژینەکەوە تەماشای باخچەکەی دەکرد. هێدی هێدی تێگەشت کە ناسینی ڕەگی مێژوویی خۆی بابەتێکی زۆر گرنگە. بەلایەنی کەمەوە بەلای خەڵکی ئیسرائیلەوە گرنگە کە مێژووی خۆیان بناسن.
هەرچەندە سۆفیاش لە مرۆڤێکی بەڕێکەوت هەڵکەوتووی سەر ئەم زەویە زیاتر نیە، بەڵام ئەگەر ئاشنای ڕەگی مێژوویی خۆی بێت، ئەوا کەمتر هەست بەوە دەکات کە بەروبوومی ڕێکەوتێکە.
ئەو لە چەند ساڵێک زیاتر لەسەر ئەم زەویە نازی. بەڵام ئەگەر مێژووی مرۆڤایەتی، مێژووی تایبەتی ئەو بێت، کەواتە بەشێوەیەک لە شێوەکان تەمەنی هەزارەها ساڵە.
سۆفیا هەموو پەڕەکانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و لەکوخەکەی هاتە دەرەوە. لە باخچەکەدا چەند جارێک لە خۆشیدا هەڵبەزییەوە و دواتر بەرەو ژوورەکەی ڕایکرد.

# سەدەکانی ناوەڕاست
# ...بڕینی کەمێکی ڕێگاکە، مانای ئەوە نیە ڕێگای هەڵەت گرتبێت...

هەفتەیەک ڕابوورد بەبێ ئەوەی سۆفیا هیچ نامەیەکی نوێی لە ئەلبێرتۆ کنۆکسەوە بۆ بێت. هیچ پۆستکارتێکی نوێشی لە لوبنانەوە پێ نەگەیشت، بەڵام هێشتام لەگەڵ یۆروندا باسی ئەو پۆستکارتانەی دەکرد کە لە کوخەکەی مێجەردا دۆزیانەوە. یۆرون زیاتر دەترسا، بەڵام کاتێک هیچ شتێکی نوێ لەمەڕ ئەو بابەتەوە ڕوویندەدا، ئیدی ترسەکەی ڕەویەوە و کاتی خۆی بە وانەکان و یاریکردنی ڕیشەوە بەسەردەبرد.

سۆفیا بەو ئومێدەی شتێکی وا بدۆزێتەوە کە پەیوەندی بە هیلدەوە بێت، چەندین جاری دی نامەکانی ئەلبێرتۆی خوێندەوە. لەسەرێکی تریشەوە، خوێندنەوەکان بواریدا زیاتر لە فەلسەفەی سەدەکانی کۆن تێبگات. ئێستاکە بە بێ هیچ کێشەیەک دەیتوانی دیمۆکریتس و سوکرات و پلاتۆن و ئەریستۆتالیس لەیەکدی جودا بکاتەوە.

ڕۆژی هەینی 25ی مانگ، سۆفیا لە چێشتخانەکەیاندا سەرقاڵی ئامەدەکردنی خواردنی ئێوارە بوو. دەبوایە تا ئەو کاتەی دایکی لە کار دەهاتەوە، خواردنەکەی ئامادەبکردایە. ئێوارەیەک لە ئێوارە ئاساییەکانی ڕۆژی هەینی بوو. ئیمڕۆ شۆربای ماسی لێدەنا، کە زۆر ساکارانە تەنها لە ماسی و گوێزەر پێکهاتووە.

لە دەرەوەڕا، خەریک بوو ڕەشەبا هەڵیدەکرد. سۆفیا بەدەم تێکدانی خواردنەکەوە، تەماشای دارە بێتوولاکانی دەرەوەی دەکرد... وەک گوڵە گەنم دەشنانەوە.

لە پڕێکدا گوێی لە شتێک بوو کە بەر پەنجەرەکە کەوت. سۆفیا دیسانەوە سەیری پەنجەرەکەی کردەوە و پاچە کارتۆنێکی بینی کە بە شوشەکەوە نووسابوو .
پۆست کارتێک بوو. لە پەنجەرەکەوە خوێندیەوە؛ «هیلدە میوللە کنەی، لە ڕێگەی سۆفیا ئامۆنسنەوە...»
بە ڕاستی بیری بۆ شتی ئاوها نەدەچوو! پەنجەرەکەی کردەوە و دەستی دایە کارتەکە. بڵێیت ڕەشەبا لە لوبنانەوە بۆ ئێرەی هێنابێت؟ دیسانەوە ئەم کارتەش بەرواری 15ی شەشی لێدرابوو.
سۆفیا مەنجەڵەکەی لەسەر ئاگرەکە لادا، لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانیشت و کەوتە خوێندنەوەی کارتەکە؛

هیلدە گیان! نازانم لە کاتی خوێندنەوەی ئەم کارتەدا ڕۆژی لەدایک بوونتە یان نا. هەرچۆنێک بێت هیوادارم زۆری بەسەردا تێنەپەڕیبێت. خۆت دەزانیت، کاتێک لای سۆفیا یەک دوو هەفتە تێدەپەڕێت، ئیتر مەرج نیە لای ئێمەش هەمان کات ڕابوورێت. خۆشم ئێوارەی جەژنی یۆحەنا دەگەمەوە ماڵەوە. ئەوجا هیلدە گیان لەسەر جۆلانەی ناو باخەکە دادەنیشین و تەماشای دەریا دەکەین. وەک دەزانیت باسی زۆرمان هەیە تاوتوێیان بکەین.
لەگەڵ سڵاو و خۆشەویستی باوکت، کە جارجارێک ئەو شەڕە هەزار ساڵەییەی نێوان یەهودی و مەسیحی و ئیسلام، زۆر دڵتەنگی دەکات. لێرەدا دەشێ ئەوە بڵێم کە ڕەگی هەر سێ ئاینەکە دەچنەوە سەر ئەبراهام. بەڵام گەر وابێت، ئەوا دەبوایە هەر هەمان خوداشیان بپەرستایە؟ بەڵام هێشتام لەم شوێنەدا هابیل و قابیل لە کوشتنی یەکتری نەبوونەتەوە.

تێبینی؛ دەتوانیت سڵاوم بە سۆفیا بگەیێنیت؟ ئەو نەگبەتە هێشتام تێنەگەیشتووە، بەڵام لەوانەیە تۆ تێبگەیت... وایە؟

سۆفیا بە ماتیەوە سەری بەسەر مێزەکەدا چەمانەوە. بێگومان هیچ شتێک تێنەدەگەیشت. بەڵام هیلدە تێدەگەیشت !
باوکی هیلدە داوا لە کچەکەی دەکات کە سەلام لە سۆفیا بکات، کەواتە سۆفیا کەمتر دەربارەی هیلدە دەزانێت و هیلدە زیاتر دەربارەی سۆفیا دەزانێت. ئاڵۆزی بابەتەکە وای لە سۆفیا کرد بچێتەوە بەلای شۆربا لێنانەکەیەوە.
هەرگیز دیوتە پۆستکارتێک هەر لە خۆیەوە بە پەنجەرەیەکەوە بنووسێت! پۆستی هەواییە —بەمانای وشە هەوایی.
لەو کاتەدا کە جارێکی تر مەنجەڵەکەی خستەوە سەر ئاگرەکە، زەنگی تەلەفون لێیدا.
خۆزگە بابە دەبوو! گەر دەهاتەوە ماڵەوە... ئەوسا سۆفیا هەموو ئەو شتانەی چەند هەفتەیەک لەمەوبەر بەسەریدا هاتبوو، هەمووی بۆ دەگێڕیەوە. بەڵام یان یۆرونە یان دایەیە... سۆفیا تەلەفونەکەی هەڵگرت؛
ـ سۆفیا.
ـ خۆمم... دەنگێک لە لاکەی ترەو هات.
سۆفیا لە سێ شت دڵنیابوو؛ باوکی نەبوو، بەڵام دەنگی پیاوێک بوو. هەروەها تەواو دڵنیابوو کە ئەو دەنگەی لەوەوپێش بیستبوو. پاشان سۆفیا پرسی؛
ـ کێ قسە دەکات؟
ـ منم... ئەلبێرتۆ.

ـ ئممم...
سۆفیا نەیدەزانی چی وەڵام بداتەوە. بەڵام بۆی دەرکەوت کە هەمان دەنگی پیاوەکەی ناو کاسێتی ڤیدیۆکە بوو.
ـ باشیت؟
ـ بەڵێ، سوپاس.
ـ لەئێستا بەدواوە چیتر نامە نانێرم.
ـ بۆ؟ هیچ شتێکی خراپم کردووە؟
ـ دەبێت ڕاستەوخۆ یەکتر ببینین، سۆفیا. دەشێ پەلە بکەین، تێدەگەیت؟
ـ بۆچی؟
ـ باوکی هیلدە خەریکە هەرچوارلامان لێدەگرێت.
ـ چۆن چۆنی چواردەورمان دەگرێت؟
ـ لە هەر چوارلاوە، سۆفیا. دەبێت ئیتر هاریکاری یەکتر بکەین.
ـ چۆن...
ـ بەڵام ئەگەر لەپێشدا باسی سەدەکانی ناوەڕاستت بۆ نەکەم، ئەوا زۆر سوودت لێنابینم. دەبێت هەوڵیش بدەین کە بگەینە ڕێنیسانس و سەدەی شانزە. بارکێلی ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو...
ـ ئەوە وێنەیەکی ئەو نەبوو کە لە کوخەکەی مێجەردا هەڵواسرابوو؟
ـ بەڵێ ڕێک خۆیەتی. لەوانەیە لەسەر فەلسەفەکەی ئەو پێکدادانەکە دەست پێبکات.
ـ زیاتر وا دێتە بەر گوێم کە باسی شەڕ بکەیت؟
ـ پێم خۆشە زیاتر ناوی بنێم شەڕی فیکری. دەبێت هەوڵدەین پێش ئەوەی مێجەر بگەڕێتەوە لیللەساند، سەرنجی هیلدە ڕاکێشین و بیهێنینە ڕیزی خۆمان.

ـ هیچ شتێک تێناگەم.
ـ بەڵام لەوانەیە فەیلەسوفەکان چاوت بکەنەوە. بەیانی زوو کاتژمێری چوار وەرە بۆ کڵێسەی ماریا، لەوێ دەتوانین یەکتری ببینین، بەڵام بە تەنها وەرە.
ـ نیوەشەو بێم؟
ـ ...تریک!
ـ ئەلو؟
زۆرزان! دایخستەوە! سۆفیا گەڕایەوە سەر شۆربا لێنانەکەی. خەریک بوو هەڵدەچوو، پاشان ماسی و گوێزەرەکانی تێکرد و ئاگرەکەی بۆ کز کرد.
کڵێسەی ماریا؟ کڵێسەیەکی کۆنی بەردینە، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دروستکراوە. سۆفیا وایدەزانی تەنها بۆ ئاهەنگ گێڕان و نوێژ و دوعای بەکۆمەڵ بەکاردەهێنرێت. جارجاریش لە هاویناندا کڵێسەکەیان بۆ گەشتیاران دەکردەوە. بەڵام خۆ لە نیوە شەودا نایکەنەوە؟
تا ئەوکاتەی دایکی هاتەوە، سۆفیا کارتەکەی لوبنانی خستبووە دۆڵابەکەوە و لەگەڵ شتەکانی تری ئەلبێرتۆ و هیلدەدا داینابوو. پاش نان خواردنیش، چوو بۆ لای یۆرونی هاوەڵی. هەر کە دەرگاکەی لێکردەوە، پێی گوت؛
ـ دەبێت لەسەر شتێکی کەمێک تایبەت ڕێکبکەوین.
هەتا ئەو کاتەی نەچوونە ژوورەکەی یۆرون و دەرگاکەیان دانەخست، هیچی تری لەدەم نەهاتە دەرەوە.
ـ گرفتێکی بچکۆلەم هەیە...
ـ فەرموو بیڵێ!
ـ ناچارم دەبێت بە دایکم بڵێم کە ئەم شەو لای تۆ دەمێنمەوە.

- جا لەوە خۆشتر دەبێت!
- بەڵام تەنها بەدایکم وا دەڵێم، تێدەگەیت؟ دەمەوێت بچمە شوێنێکی تەواو جیاواز.
- خراپە... چیە؟ پەیوەندی بە کوڕانەوە هەیە؟
- نەخێر پەیوەندی بە هیلدەوە هەیە.
یۆرون فیکەیەکی هێواشی لێدا، سۆفیاش ڕێک تەماشای ناو چاوی کرد و گوتی؛
- ئێوارە دێم، بەڵام نزیکی کاتژمێری سێی شەو دەبێت بچمە دەرەوە. دەبێت وریا بیت و تا دێمەوە بۆم بپۆشیت.
- بەڵام بۆ کوێ دەچیت؟ دەبێت چی بکەیت سۆفیا؟
- بەداخەوە، فەرمانم پێکراوە و ناتوانم پێت بڵێم.
هەرگیز مانەوە لە لای برادەر گرفتێک نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە، جارجارێک سۆفیا هەستی دەکرد کە دایکی دەیەوێت بە تەنها لە ماڵەکەدا بێت. پێش ئەوەی بڕواتە دەرەوە، دایکی گوتی؛
- کەواتە بەیانی درەنگانێک پێکەوە نانی بەیانی دەخۆین، وایە؟
- ئەگەر نەهاتمەوە، ئەوا دەزانیت لە کوێم.
بۆچی ئەو پرسیارەی کرد؟ ڕێک پەنجەی خستە سەر خاڵە لاوازەکەی.
شەو هات و تا نیوە شەو کچان باسی شتی هەمەڕەنگیان کرد... وەک هەموو شەوێکی تر کە پێکەوە دەبوون. بەڵام ئەم شەو یەک جیاوازی هەبوو؛ پێش ئەوەی بخەون، سۆفیا زەنگی کاتژمێرەکەی خستە سەر سێ و چارەک.
پاش دوو سەعاتێک سۆفیا زەنگی کاتژمێرەکەی وەستاند، لەو کاتەدا یۆرون کەمێک چاوی هەڵهێنا و بەدەم خەوەوە گوتی؛
- ئاگات لە خۆت بێت.

سۆفیا کەوتە ڕێ. لەوێوە تا کڵێسەی ماریا چەند کیلۆمەترێک دور بوو. هەرچەندە تەنها دوو سەعاتێک خەوتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستی دەکرد تەواو بە خەبەرە. لە ڕۆژهەڵاتیشەوە، خەتێکی سوور کەمێک سەرو ئاسۆی نەخشاندبوو.
نزیکەی کاتژمێری چوار سۆفیا گەیشتە بەردەم کڵێسە بەردینەکە. دەستێکی لە دەرگا قورسەکەدا... کرابووەوە!
خامۆشی و چۆڵی ناو کڵێسەکە، وەکو تەمەنی کڵێسەکە هەستی پێدەکرا. لە پەنجەرەکانیشەوە ڕوناکیەکی شینباو پەخش دەبووەوە و هەزارەها گەرد و خۆڵی ناو کڵێسەکەی دەخستە ڕوو. خەستی ئەو گەرد و خۆڵە، شێوە کۆڵەکەیەکی بە چەپ و ڕاستی بنمیچی کڵێسەکەدا دروستکردبوو. سۆفیا لە جێگەیەکی ناوەڕاستدا لەسەر کورسیەک دانیشت. بە سەرنجەوە تەماشای میحرابی کڵێسەکە و خاچە ڕەنگ ماتەکەی دەکرد .
چەند خولەکێک تێپەڕی و لە پڕێکدا دەنگ لە ئۆرگەکانەوە بەرز بووەوە. سۆفیا نەیدەوێرا ئاوڕ بداتەوە. ئاوازەکە لە گۆرانیەکی کۆنی ئاینی دەچوو... بە دڵنیاییەوە تایبەت بوو بە سەدەکانی ناوەڕاست.
دیسانەوە بێدەنگی، بەڵام پاش کەمێک گوێی لە تەپەی پێی کەسێک بوو، هێواش هێواش لێی نزیک دەبووەوە... ئاوڕ بداتەوە؟ نەخێر، وای بە باش دەزانی چاوی لەسەر مەسیحی سەر خاچەکە لانەبات. تەپەی پێی هەنگاوەکانی کەسەکە بەلایدا تێپەڕین و بەناوەندی کڵێسەکەدا ڕۆشتە سەرەوە، ئەوجا سۆفیا قەشەیەکی جل و بەرگ قاوەیی بینی، دەیتوانی سوێند بخوات کە یەکێک لە قەشەکانی سەدەکانی ناوەڕاستە.

دەترسا بەڵام ترسەکەی هێندە زۆر نەبوو. لەبەردەم میحرابەکەدا، قەشەکە بەدەوری خۆیدا خولایەوە و بەرەو کورسی وتار خوێندنەوەکە سەرکەوت. چەمایەوە و تەماشایەکی سۆفیای کرد، ئەوجا بەلاتینی چەند دێڕێکی گوت.

ـ بە نەرویجی بدوێ هەی بێ ئەقڵ... سۆفیا هاواری کرد.

وشەکانی لەناو کڵێسە کۆنە بەردینەکەدا دەنگی دەدایەوە.

دەیزانی قەشەکە ئەلبێرتۆ کنۆکسە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەشیمان بووەوە کە ئەو وشە ناشیرینانەی لەناو کڵێسەیەکی کۆندا گوت. بەڵام کەمێک دەترسا، کاتێکیش مرۆڤ دەترسێت، شکاندنی تابۆکان کەمێک دڵنەوایی دەداتەوە.

ـ ششششش!

ئەلبێرتۆ دەستێکی بەرزکردەوە، هەروەک چۆن کاتێک قەشەکان ئاماژە بۆ خەڵکانی نوێژکەر دەکەن کە دابنیشن.

ـ ڕۆڵەکەم، کاتژمێر چەندە؟

ـ پێنج خولەکی دەوێ بۆ چوار، سۆفیا وەڵامی دایەوە و ترسەکەشی ڕەویبووەوە.

ـ کەواتە ئێستاکە کاتی خۆیەتی. ئێستا سەدەکانی ناوەڕاست دەست پێدەکات.

ـ سەدەکانی ناوەڕاست کاتژمێری چوار دەست پێدەکات؟ سۆفیا بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی.

ـ بەڵێ، تا ڕادەیەک... پاشان کاتژمێر بوو بە پێنج و شەش و حەوت، بەڵام لەوە دەچوو کات وەستابێت. کاتژمێر بوو بە هەشت و نۆ و دە، بەڵام هێشتام هەر سەدەکانی ناوەڕاستە. لەوانەیە وا بیربکەیتەوە کە ئیتر کاتی هاتنی ڕۆژێکی نوێ هاتبێت. لەمەبەستت تێدەگەم، بەڵام

هێشتام ڕۆژی پشوو هەر بەردەوامە، پشوویەکی یەک بە دوای یەک. کاتژمێر بوو بە یانزە و دوانزە و یەکی پاش نیوەڕۆ. ئەمە ئەو ماوەیەیە کە پێی دەڵێن سەدەکانی ناوەڕاستی پاشینە. لەم کاتەدا بوو کە کڵێسە کاتیدراڵیە گەورەکانی ئەوروپا بنیات نران. کاتێکیش کاتژمێر نزیکەی دووی پاش نیوەڕۆ بووەوە، ئەوسا یەک دوو کەڵەشێر قوقاندیان. تەنها ئەو کاتەش، سەدە دورودرێژەکانی ناوەڕاست هێدی هێدی بەرەو نەمان چوون.

- کەواتە سەدەکانی ناوەڕاست نۆ کاتژمێر بەردەوام بوو... سۆفیا گوتی.

ئەلبێرتۆ سەرێکی بۆ دواوە ڕاوەشاند و کڵاوی بەرگە قاوەییەکەی لەسەر لاچوو. پاشان تەماشای کۆمەڵی نوێژکەرانی کرد، کە تەنها لە کچێکی چواردە ساڵان پێکهاتبوو.

- بەڵێ، هەڵبەتە ئەگەر هەر کاتژمێرێک بە سەدەیەک دابنێین! دەتوانین بڵێین مەسیح نیوە شەو لەدایک بوو. کەمێک پێش دوانزە و نیو، پاولۆس گەشتە ئاینیەکانی دەستپێکرد و چارەکێ پاشتر لە ڕۆمادا مرد. هەتا نزیکەی کاتژمێری سێ، کڵێسەی مەسیحی کەم تازۆر قەدەغە بوو. بەڵام لەلایەن قوستەنتینی ئیمپڕاتۆری ڕۆم، لە ساڵی 313دا وەک ئاینێکی باوەڕپێکراوی ئیمپێراتۆری ڕۆم، دانیان بە ئاینی مەسیحیدا هێنا. خۆشی پاش چەند ساڵێک، لە کاتی سەرەمەرگیدا، بوو بە مەسیحی. لە ساڵی 380شەوە ئاینی مەسیحی بووبە ئاینی ڕەسمی ئیمپڕاتۆری ڕۆمی.

- بەڵام ئیمپڕاتۆری ڕۆمی هەڵنەوەشایەوە؟

- وردە وردە شکستی هێنابوو. لەو کاتەدا گرنگترین گۆڕانکاری مێژوویی کەلتوری ڕوویدا. لە سەدەی چواردا لە دوو لاوە هەڕەشە لە ڕۆم دەکرا؛

لەلایەکەوە هەڕەشەی گەلەکانی باکور و لەلایەکی تریشەوە لەناوەوە هەڵدەوەشایەوە. قوستەنتین لەساڵی 330دا پایتەختی ئیمپڕاتۆری لە شاری ڕۆماوە گوێزایەوە بۆ قوستەنتینیە، ئەو شارەی کە خۆی لەوەوپێش لەدەم چوونە ژوورەوەی دەریای ڕەشدا بنیاتی نابوو. زۆربەی خەڵکیش ئەم شارە نوێیەیان وەک «ڕۆمای دووهەم» دەبینی. ئیمپڕاتۆری ڕۆمی لە ساڵی 395دا بوو بە دوو بەشەوە ـبەشی ڕۆژئاوا، کە ڕۆما پایتەختی بوو. هەروەها ڕۆژهەڵات، کە شاری نوێی قوستەنتینیە بووبە پایتەختی. لە ساڵی 410دا بەربەرەکان ڕۆمایان تالان کرد، وە لە ساڵی 476دا هەموو بەشی ئیمپڕاتۆری ڕۆژئاوا داگیرکرا. ئیمپڕاتۆری ڕۆژهەڵاتیش هەتا ساڵی 1453 مایەوە، هەر لەو ساڵەدا تورکەکان داگیریان کرد.

ـ ئەو کاتە بوو کە ناوی شارەکەیان نا ئەستەنبوڵ؟

ـ بەڵێ ڕاستە! ساڵێکی تریش کە جێگەی سەرنجە، ساڵی 529یە. کڵێسە لەو ساڵدا ئەکادیمیاکەی پلاتۆنی لە شاری ڕۆمادا داخست. لە هەمان ساڵیشدا یاسای «بێنەدیکتاین Benedictine» دامەزرێنرا (*یەکەمین یاسای گەورەی قەشەکان بوو.و). ساڵی 529 تایبەتە، چونکە لەو ساڵەدا بوو کە کڵێسەی مەسیحی دەستی بە سەر فەلسەفەی یۆنانیدا گرت. لەو کاتەش بەدواوە، قەشەکان دەستیان بەسەر خوێندن و بیرکردنەوە و ڕاڤەکردندا گرت. کاتژمێر بەرەو پێنج و نیو دەڕوات...

ئەوجا سۆفیا لە مانای کاتژمێرەکانی ئەلبێرتۆ تێگەیشت؛ نیوەشەو، ساڵی سفر بوو. کاتژمێری یەک، سەد ساڵ پاش مەسیح بوو. کاتژمێری شەش، شەش سەد ساڵ پاش مەسیح بوو. کاتژمێری دووی پاش نیوەڕۆ، هەزارو چوار سەد ساڵ پاش مەسیح بوو...

ئەلبێرتۆ لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛
- مەبەست لە «سەدەکانی ناوەڕاست «Middel Ages» ئەو ماوە دورودرێژەیە کە کەوتۆتە نێوان دوو قۆناغەوە. زاراوەکە لەسەردەمی ڕێنیسانسدا «Renaissance» دەرکەوت. سەدەکانی ناوەڕاست وەک شەوێکی هەزار ساڵەیی دورودرێژ هەستی پێدەکرا و لە نێوان سەدەکانی کۆن و ڕێنیسانسدا خۆی بەسەر ئەوروپادا کێشابوو. ئێستاکەش زاراوەی سەدەکانی ناوەڕاست وەک نرخ کەمکردنەوەیەک بەکاردەهێنرێت، بۆ نمونە دەربارەی هەموو شتێک کە نیشانەی دیکتاتۆری و دواکەوتوویی بێت. بەڵام کەسانێکیش هەن کە سەدەکانی ناوەڕاست وەک کاتێکی هەزار ساڵەیی گەشەکردن و بەخەبەربوونەوە دەبینن. بۆ نمونە، ڕژێمی قوتابخانە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بوو کە دامەزرێنرا. هەر لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستیشدا بوو کە یەکەمین قوتابخانەی قەشەکان سەریهەڵدا. لە ساڵی 1100وە قوتابخانەی کاتیدرالی دەرکەوت، وە لە نزیکەی ساڵی 1200دا بوو کە یەکەمین دانیشگا دامەزرێنرا. تەنانەت ئەمڕۆکەش بابەتەکان وەک سەدەکانی ناوەڕاست بەسەر گروپی جیاوازدا یان «کۆلیجی» جیا جیادا دابەشکراوە.
- هەزار ساڵیش ماوەیەکی یەکجار دورودرێژە.
- بەڵام ئاینی مەسیحی بۆ ئەوەی بتوانێت بچێتە ناو قوڵایی خەڵکەوە، پێویستی بە کات بوو. لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا چەندەها گەلی هەمەڕەنگ سەریان هەڵدا، بە شار و خەڵکەکانیانەوە، بە مۆسیقا و شیعری فۆلکلۆرییانەوە. بەبێ سەدەکانی ناوەڕاست، چیرۆک و گۆرانی فۆلکلۆری چ دەبوون؟ بەڕاست، ئەی ئەوروپا بەبێ سەدەکانی ناوەڕاست چی دەبوو، سۆفیا؟ وەک هەرێمێکی ڕۆمانی دەمایەوە؟

تەنانەت ئەو بنەما زمانەوانیەی لەگەڵ ناوی نەرویج و ئینگلتەرا یان ئەڵمانیادا دەردەکەوێت، لە قوڵایی سەدەکانی ناوەڕاستەوە سەرچاوەی گرتووە. چەندەها ماسی ڕەنگاوڕەگ لە قوڵاییی ئاودا مەلە دەکەن، هەرچەندە هەمیشە بوارمان نیە کە بیانبینین. بەڵام سنۆرە «Snorre»و ساکسۆ «Saxo» مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست بوون. ئۆلاڤی «Olav» خواپەرست و پیرۆزیش هەروەها. بێگومان کارڵی مەزنیش .«Charlemagne» بۆ ئەوەی بیرمان نەچێت، ئەبسالۆن «Absalon»ی قەشەی گەورە و نیلس ئیبسنیش«Nils Ebsen» ، هەروەها ڕۆمیۆ و جولێت «Romeo & Juliet» یان ئاگنێتا و هاڤمان «Agneta & Havman»ئەمانە و کۆمەڵێکی زۆری تری ئەمیر و بەگزادە و پاشای مەزنیش. جگە لەمانەش چەندەها سوارەی جەربەزە و کچۆڵەی ناسک و وێنەکێشی نەناسراوو و ئۆرگ دروستکەری بلیمەتیش. هێشتام ناوی برایانی خانەی قەشە و سەلیبیەکان و ژنە زیرەکەکانیشم نەبردووە.

ـ ناوی قەشەکانیشت نەبرد.

ـ ڕاست دەکەیت. هەتا ساڵ 1000 نەگەیشتە ئاینی مەسیحی نەگەیشتە باکور. ڕاستیش نیە گەر بڵێین باکور یەکسەر لەپڕێکدا هەموویان بوون لە مەسیحی، چونکە بیرکردنەوەی بۆ دینە کۆنەکان بەردەوام لە ژێر ڕووکەشی ئاینی مەسیحیدا هەر دەژیان. پاشانیش زۆرینەی بابەتەکانی پێش ئاینی مەسیحی لەگەڵ مەسیحیەتدا تێکەڵبوون. بۆ نمونە دابوونەریتی مەسیحی و باکوری کۆن لە ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیحدا تێکەڵ بە یەک بوون، تەنانەت تاوەکو ئەمڕۆکەش هەر بەردەوامە. هەروەها یاسا و دەستوری ژن هێنان و شووکردنی کۆن و مەسیحیش لەیەک دەچن. بەم جۆرەش

پێدەچێت بەرە بەرە کێک و بەراز خواردن و بیرە خواردنەوەی تایبەت بە ڕۆژی لەدایک بوونی مەسیح، لەگەڵ سێ پیاوی زانای ڕۆژهەڵات (*سێ پیاوە زاناکەی کە هاتن و دیاریان بە بۆنەی لەدایک بوونی مەسیحەوە هێنا.و) و گەورەکەی «بیت لحم»دا (*شوێنی لە دایک بوونی مەسیح.و) بتوێنەوە. بەڵام دەبێت بڵێین کە بۆچوونی ئاینی مەسیحی هێدی هێدی زاڵبوو. هەر لەبەر ئەمەشە کە دەڵێین سەدەکانی ناوەڕاست دەکەونە ژێر «کەلتورێکی یەکگرتووی مەسیحی»یەوە.

ـ کەواتە تەنها تاریک و غەمگین نەبوو؟

ـ بە ڕاستی سەدەی یەکەمی دوای ساڵی 400، سەردەمی لێژبوونەوەیەکی کەلتوری بوو. سەردەمی ڕۆمەکان زەمەنێکی «بەرزی کەلتوری» بوو، شارە گەورەکانیان خانەی قەشەی گشتی و گەرماوی گشتی و کتێبخانەی تێدابوو، بێگومان خاوەنی هونەرێکی بیناسازی مەزنیش بوون... هەموو ئەو کەلتورە لە سەد ساڵی یەکەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا لەناو چوو، هاوکات بازرگانی و ئابووریش فەوتان. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خەڵکی گەڕانەوە سەر ئابووری خێزانی و ئاڵوگۆڕکردنی شتومەک. ڕژێمی ئابووریش ڕەنگدانەوەکی دەرەبەگایەتی بەخۆوە گرت. واتە کۆمەڵێک دەرەبەگی گەورە خاوەنی ئەو زەویانە بوون کە جوتیارە کۆیلەکان دەبوایە کاریان تێدا بکردایە و نانی دەمیان پەیدا بکردایە. ژمارەی دانیشتوانیش لە ماوەی سەد ساڵی یەکەمدا یەکسەر دای لە کزی. بۆ نمونە ڕۆما، لە کاتی ڕۆمەکاندا ملیۆنێک کەسی تێدا دەژیا. بەڵام لە دەوروبەری ساڵی 600دا ئەو شارە کۆنەی جیهان تەنها 40 هەزار کەسی تێدا دەژیا، واتە تەنها بەشێکی بچکۆلەی مابووەوە. بەو شێوەیەش خەڵکانی

ئاسایی دەیانتوانی لە نێوان پاشماوەی بینا مەزنە کۆنەکاندا بسوڕێنەوە. هەر کاتێکیش پێویستیان بە کەرەسەی بینا هەبوایە، لە نێو پاشماوە کۆنەکاندا چەندەها کەرەسەیان دەدۆزییەوە. بێگومان ئەمەش لای دێرین ناسەکانی ئەمڕۆکەدا جێگەی داخە، چونکە جێگەی خۆش حاڵیان دەبوو گەر خەڵکی سەدەکانی ناوەڕاست پاشماوە کۆنەکانیان بپاراستایە .

ـ بێگومان لەپاش ڕووداو، ئاسانە زیرەکانە بیربکەینەوە.

ـ لە ڕوانگەیەکی ڕامیاریەوە، لەگەڵ تەواوبوونی سەدەی چوارەمدا، کاتی ڕۆمیەکانیش بەسەرچوو. بەڵام پاشان قەشەکانی ڕۆما سەرۆکایەتی هەموو کڵێسەی کاتۆلیکی ڕۆمییان گرتە دەست و ناوی «پاپا» یان «باوک»یان لێنرا. پاش ماوەیەکیش وەک جێگری مەسیحی سەر زەوی تەماشا دەکران. بەم شێوەیە ڕۆما بە درێژایی هەموو سەدەکانی ناوەڕاست، وەک پایتەختی کڵێسە مایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێواش هێواش ئەمیر و پاشای ولایەتە نوێکان، هێندە بەهێز بوون، کە هەندێکیان دەیانتوانی بەرامبەر هێزی گەورەی کڵێسە بوەستنەوە...

ـ تۆ گوتت کڵێسە ئەکادیمیاکەی پلاتۆنیان لە ئەسینادا داخست، ئایا پاشان هەموو فەلسەفەی یۆنانی لە یادکرا؟

ـ تەنها بەشێکی کەمی لە یادکرا. تاکوتەرای خەڵکی شارەزای نووسینەکانی ئەریستۆتالیس و پلاتۆن بوون. بەڵام ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی نەختە نەختە بەسەر سێ بەشی جیاوازی کەلتوریدا دابەشبوو؛ لە ڕۆژئاوای ئەوروپادا کەلتورێکی مەسیحی بە زمانی لاتینی سەریهەڵدا و پایتەختەکەشی ڕۆما بوو. لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپادا کەلتورێکی مەسیحی بە زمانی یۆنانی سەریهەڵدا و پایتەختەکەی قوستەنتینییە

بوو. پاشانیش ناوی یۆنانی بێزەنتەیان لێنا. ئێمە دەڵێین «سەدەی ناوەراستی بێزەنتی»، تەنها بۆ ئەوەی لە « سەدەکانی ناوەڕاستی ڕۆمی-کاتۆلیکی» جودا بکرێتەوە. بەڵام باکوری ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش سەر بە ئیمپڕاتۆری ڕۆمی بوون، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەو ناوچانەدا کەلتورێکی ئیسلامی بە زمانی عەرەبی گەشەی کرد. پاش مردنی محەمەد لە ساڵی 632دا، ئیسلام دەسەڵاتی بەسەر باکوری ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گرت. کەمە کەمە ئیسپانیاش بووبە بەشێکی ناوچەی کەلتوری ئیسلامی. پاشان شارە پیرۆزەکانی ئیسلام سەریان هەڵدا –وەک مەکە و مەدینە و قودس و بەغداد. لێرەدا لە ڕوانگەیەکی مێژوویی کەلتوری پەتییەوە، گرنگە ئامارژە بۆ ئەوە بکرێت کە عەرەبەکان شارێکی کۆنی هیللینیستی وەک ئەسکەندەریەشیان داگیرکرد. بەم شێوەیەش زۆربەی زۆری زانستی یۆنانی وەک میراتێک بۆ عەرەبەکان مایەوە. لێرەشەوە و بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست عەرەبەکان ڕۆڵێکی پێشەوایان لە زانستی وەک ماتماتیک و کیمیا و ئەستێرەناسی و دەرمانسازیدا بینی. ئەمڕۆکەش «ژمارە عەرەبیەکان» بەکاردەهێنین. واتە لە زۆر بارەوە کەلتوری عەرەبی لە کەلتوری مەسیحی باشتر جێگای خۆی کردەوە.

ـ من گوتم فەلسەفەی یۆنانی چی بەسەرهات؟

ـ دەتوانیت دەریایەک بهێنیتە بەرچاوت کە بەسەر سێ بەشدا دابەش ببێت و پاشانیش ببێتەوە بە یەک دەریا؟

ـ بەڵێ زۆر بە باشی دەتوانم.

کەواتە دەشتوانیت لە چۆنیەتی دابەشبوونی کەلتوری یۆنانی-ڕۆمی تێبگەیت، بەڵام لە نێو هەر سێ کەلتورەکەشدا دەمێنێتەوە؛ ڕۆمی-کاتۆلیکی لە ڕۆژئاوا، ڕۆمی-ڕۆژهەڵات لە ڕۆژهەڵاتەوە و دواجاریش

ڕۆمی-عەرەبی لە باشورەوە. بە شێوەیەکی ئاسانتر دەتوانین بڵێین؛ پلاتۆنیزمی نوێ لە ڕۆژئاوادا مایەوە، لە ڕۆژهەڵاتیشدا پلاتۆن، دواجاریش ئەریسۆتالیس لەلای عەرەبەکانی باشور مایەوە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا بەشێک لە گشت، لەناو هەریەکێک لەو بەشی دەریایانەدا جێگەی خۆی کردبووەوە. بە پوختی؛ لەگەڵ کۆتایی هاتنی سەدەکانی ناوەڕاستدا، هەرسێ بەشی دەریاکان لە باکوری ئیتاڵیادا کۆبوونەوە. کاریگەری عەرەبی لە عەرەبەکانی ئیسپانیاوە هات و کایگەری یۆنانیش لە یۆنان و بێزەنتینەوە هات. لەوێوە ئیدی «ڕێنیسانس» دەست پێدەکات، لەوێوە «لەدایک بوونەوەی» کەلتوری کۆن دەست پێدەکات. بە شێوەیەک لە شێوەکان، کەلتوری کۆن بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕست خۆی پاراست.

ـ تێدەگەم.

ـ بەڵام با پەلەپەل لە باسکردنی بابەتەکاندا نەکەین. لە پێشدا کەمێک دەربارەی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست باس دەکەین و چیترش نامەوێت لێرەوە قسەت بۆ بکەم... دێمە خوارەوە بۆلات.

سۆفیا بە کزانەوەی چاویدا هستیدەکرد تەنها دوو سەعاتێک خەوتووە. لەبەرچاویدا کاتێک قەشە سەیرەکە لە مینبەری کڵێسەکەوە هاتە خوارەوە وەک خەونێک وابوو. ئەلبێرتۆ بەرەو میحرابەکە ڕۆیشت و تەماشایەکی خاچە کۆنەکەی کرد. پاشان بەرەو ڕووی سۆفیا وەرچەرخایەوە، بە هێواشی بەرەو کورسیەکەی سۆفیا هەنگاوی نا و لە تەنیشتیەوە دانیشت.

چ هەستێکی سەیرە کە هێندە لێوەی نزیک بێت. لە ژێر کڵاوەکەیەوە سیمای پیاوێکی تەمەن مامناوەندی بەدیکرد، بە خۆی و دوو چاوی قاوەیی و قژێکی ڕەش و ڕیشی سەر چەناگەیەوە.

سۆفیا لە دڵی خۆیدا دەیگوت؛ تۆ کێیت؟ بۆچی هاتیتە ناو ژیانمەوە؟
- لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا یەکتری باشتر دەناسین، ئەلبێرتۆ ئەوەی گوت و پێدەچوو بیرکردنەوەکانی سۆفیای خوێندبێتەوە.
لەو کاتەدا هێواش هێواش ڕووناکی لە پەنجەرەکانی کڵێسەکەوە زیاتر و زۆرتر ناو کڵێسەکەی ڕووناک دەکردەوە، ئەلبێرتۆش دەستی بە باسکردنی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست کرد؛
- فەیلەسوفەکانی سەدەکانی ناوەڕاست تا ڕادەیەک گریمانەی ئەوەیان دەکرد کە ئاینی مەسیحی ڕاستی بڵێت... بەڵام خاڵە سەرەکیەکە لێرەدایە؛ ئایا دەبێت هەروا بە ئاسانی بڕوا بە سروشی ئاینی مەسیحی بکەین، یان دەشکرێت بە هۆی ژیرێتیمانەوە لە ڕاستیەکانی ئاینی مەسیحی نزیک ببینەوە؟ پەیوەندی نێوان فەیلەسوفەکانی یۆنان و ناواخنی ئینجیل چیە؟ ئایا دژایەتیەک لە نێوان ئینجیل و ئەقڵدا هەیە؟ یان ئایا بڕوا و زانست دەبنە یەک؟ تا ڕادەیەک هەموو فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست دەربارەی ئەم پرسیارانە بوون.
سۆفیا بە بێتاقەتیەوە سەرێکی لەقاند، ئەو لەوەوپێش لە تاقیکردنەوەی ئایندا وەڵامی بڕوا و زانستی دابووەوە.
- ئەم بابەتە لە ڕوانگەی دوو فەیلەسوفی گرنگی سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەخەینە ڕوو. دەتوانین لە «ئاوگوستین Augustin» ەوە دەست پێبکەین، کە لەساڵی 354 تا 430 ژیا. لە ڕێگەی ژیانی ئەم تاکە کەسەوە دەتوانین وەرچەرخانی سەدەکانی کۆنی پێشتر بۆ سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست ببینین. ئاوگوستین لە شاری تاگستای (*شاری سوق عراسی ئەمڕۆکەی جەزائیر.و) باکوری ئەفریقادا لەدایک بوو، بەڵام لە تەمەنی 16 ساڵیدا بۆ خوێندن خۆی گەیاندە شاری

کارتەگۆ. پاشانیش بەرەو ڕۆم و میلانۆ کۆچیکرد. دواهەمین ساڵی ژیانیشی وەک قەشەیەک لە شاری «هیپۆ»ی ڕۆژئاوای کارتەگۆدا بەسەربرد. بەڵام ئاوگوستین بەدرێژایی ژیانی مەسیحی نەبوو، بەڵکو چەندەها ڕێبازی ئاینی و فەلسەفی تاقیکردەوە، ئەوجا بووبە مەسیحی.

ـ دەتوانیت زیاترم بۆ باس بکەیت؟

ـ بۆ ماوەیەک «مانیکەیی Manichanaean» بوو. مانیکەیی مەزهەبێکی ئاینیە، کە لە سەدەکانی کۆنی پێشتردا زۆر باو بوو. جۆرە تیۆریەکی ڕەهابوونی نیوە فەلسەفی و نیوە ئاینیە. بەبڕوای ئەوان جیهان بەسەر دوو بەشدا دابەشکراوە؛ باشە و خراپە، تاریکی و ڕووناکی، ڕۆح و مادە. مرۆڤیش بە هۆی ڕۆحیەوە دەتوانێت بەسەر دونیای مادیدا زاڵ بێت و بەو جۆرەش بنەمای ڕەهاکردنی خۆی دامەزرێنێت. بەڵام ئەو جیاکردنەوە ئاشکرایەی نێوان باشە و خراپە، ئارامی بە ئاوگوستین نەبەخشی. ئەو بە شێوەیەکی گشتی گرنگی بە «کێشەی خراپە» دەدا، واتە بابەتی دۆزینەوەی سەرچاوەی خراپە. بۆ ماوەیەکیش سەربە فەلسەفەی ستۆیکەکان بوو، چونکە بەپێی ستۆیکەکان جیاکردنەوەیەکی ئاشکرا لە نێوان باشە و خراپەدا بوونی نیە. لە سەرو هەموو شتێکیشەوە ڕێبازە فەلسەفیەکانی سەدەکانی کۆنی پێشتر –بەتایبەتیش پلاتۆنیزمی نوێ- کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر ئاوگوستین هەبوو. لێرەشەوە ئاشنای ئەو بیرکردنەوەیە بوو کە دەڵێت هەموو بوون سروشتێکی خوایانەی هەیە.

ـ بەم جۆرەش بووبە قەشەیەکی پلاتۆنیزمی نوێ؟

ـ بەڵێ، لەوانەیە وا دابنرێت. لەپێش هەموو شتێکدا بوو بە مەسیحی، بەڵام مەسیحیەتی ئاوگوستین تا پلەیەکی زۆر مۆرکێکی بیرکردنەوەی

پلاتۆنی پێوە دیارە. سۆفیا، گرنگە تێبگەین کە فەلسەفەی یۆنانی یەکسەر لەگەڵ سەرهەڵدانی مەسیحیەتی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەتەواوەتی نەفەوتا. زۆربەی فەلسەفەی یۆنانی لە ڕێگەی قەشەیەکی وەک ئاوگوستینەوە گوێزرایەوە بۆ ناو سەدەی نوێ.
- مەبەستت لەوەیە کە ئاوگوستین لە سەدا پەنجای مەسیحی و لە سەدا پەنجاکەی تریشی پلاتۆنی نوێ بوو؟
- بێگومان خۆی لەو بڕوایەدابوو کە لە سەدا سەد مەسیحی بێت. بەڵام ئەو هیچ جۆرە دژایەتیەکی فراوانی لە نێوان ئاینی مەسیحی و فەلسەفەی پلاتۆنیدا نەدەبینی. بە پێچەوانەوە، لە نێوان فەلسەفەی پلاتۆن و فێرکردنەکانی ئاینی مەسیحیدا، هەستی بە نزیکایەتیەکی هێندە گەورە دەکرد، هەتا گەیشتە ئەو ڕادەیەی لەلای ببووە پرسیارێکی مەزن، ئەو دەیگوت بڵێیت پلاتۆن شارەزای هەندێ بەشی پەیمان نامەی کۆن نەبووبێت؟ بێگومان ئەمەش زۆر گوماناویە. باشتر وایە بڵێین ئاوگوستین پلاتۆنی «کردە مەسیحی.»
- بەلایەنی کەمەوە نەهات ڕاستەوخۆ پشت لە فەلسەفە هەڵماڵێت، تەنها لەبەرئەوەی بڕوای بە ئاینی مەسیحی هێنابوو.
- نەخێر، بەڵام بەئاشکرا دەیگوت بابەتە ئاینیەکان سنووری خۆی هەیە و ئەقڵ ناتوانێت بیانشکێنێت. دەبێت لە یادیشمان بێت کە ئاینی مەسیحی نهێنیەکی خوایانەیە و تەنها لە ڕێگەی بڕواوە دەتوانین لێی نزیک ببینەوە. بەڵام ئەگەر بڕوامان بە ئاینی مەسیحی هەبێت، ئەوا خوا ڕۆحمان «ڕووناک دەکاتەوە و ئەو کاتەش، سەبارەت بە خودا، دەگەینە جۆرە زانیاریەکی سەروسروشتی. ئاوگوستین خۆی هەستی بە سنووربەندی فەلسەفە دەکرد و دەیزانی تا چ ئاستێک دەتوانێت بەهێز بێت. تەنها ئەو کاتەش کە بووە مەسیحی، هەستی

بە ئارامی ڕۆحی کرد. ئەو دەیگوت؛ «دڵمان تەنها ئەو کاتە ئارامە، کە لەناو تۆدا –خودادا- پشوو دەدات.»

- من تەواو تێناگەم، چۆن تیۆری «بیر»ی پلاتۆن و ئاینی مەسیحی دەبنە یەک؟ ئەی «بیر»ە نەمرەکان؟

- بە بڕوای ئاوگوستین خودا جیهانی لە نەبوونەوە ئافەریدەکردوە، ئەمەش بیرکردنەوەیەکی ئینجیلییە. لە کاتێکدا بە بڕوای یۆنانیەکان جیهان هەمیشە بوونی هەر هەبووە. ئەو دەیگوت؛ خودا پێش ئەوەی جیهان بخوڵقێنێت، «بیر»ە کانی لەناو ویژدانیدا هەبووە. واتە «بیر»ەکانی خستە پاڵ خودا و بەم جۆرەش بۆچوونەکانی پلاتۆنی – سەبارەت بە «بیرە» نەمرەکان- ڕزگارکرد.

- زیرەکانە بیری کردۆتەوە.

- بەڵام لێرەدا دەبینین ئاوگوستین و قەشەکانی تری کڵێسە، زۆریان لە خۆیان دەکرد بۆ ئەوەی ڕێڕەوی بیرکردنەوەی یۆنانی و یەهودی بگەیەنن بە یەک. دەتوانین بڵێین ئەوان بە جۆرێک لە جۆرەکان لە دوو کەلتوردا دەژیان. لەلایەکی تریشەوە ئاوگوستین لە بینینی خراپەکاریشدا دیسانەوە دەگەڕێتەوە سەر پلاتۆنیزمی نوێ. بەبڕوای ئەو، هەروەک پلۆتین، هۆی خراپە دەگەڕێتەوە بۆ «بزر بوونی خودا». واتە خراپە خۆی لە خۆیدا بوونێکی سەربەخۆی نیە، چونکە کارەکانی خودا لە ڕاستیدا هەمووی تەنها باشەن. لە ڕوانگەی ئەوەوە خراپە دەگەڕێتەوە بۆ سەرکەشی مرۆڤ، یان هەر وەک خۆی دەیگوت؛ «ویستی باشە، کاری خودایە و ویستی خراپەش لە کاری خوداوە دورە.»

- ئایا ئەویش لەو بڕوایەدا بوو کە ڕۆحی مرۆڤ خوایانە بێت؟

ـ دەتوانین بڵێین بەڵێ پێی وابوو و دەشتوانین بڵێین نەخێر پێی وانەبوو. ئاوگوستین دەیگوت لە نێوان خودا و جیهاندا بۆشاییەک هەیە کە مرۆڤ ناتوانێت بیبڕێت یان بیگاتێ. لێرەدا پەنا دەباتە بەر بنچینەی ئینجیل و دژ بە تیۆری پلۆتین دەوەستێتەوە کە دەیگوت هەموو شتێک یەکە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە بڕوای ئەو مرۆڤ بوونەوەرێکی ڕۆحانییە؛ ئێمە خاوەنی لەشێکی مادین –جەستەمان سەر بە جیهانی فیزیاویە و ملکەچی نەمان و فەوتانە- بەڵام هاوکات خاوەنی ڕۆحێکیشین کە دەتوانێت درک بە خودا بکات و بیناسێت.

ـ ئەی کاتێک کە دەمرین ڕۆحمان چی بەسەر دێت؟

ـ بەپێی ئاوگوستین هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتی لەپاش گوناحە گەورەکەوە، ون بووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خودا بڕیاری داوە هەندێ مرۆڤ لەو ون بوونە هەتاهەتاییە ڕزگاربکات.

ـ کەواتە بە بڕوای من دەیتوانی بڕیاری ئەوەش بدات کە هەر لەسەرەتاوە هیچ کەسێک ون نەبێت.

ـ لەو خاڵەدا ئاوگوستین دژی ئەوە دەوەستایەوە کە مرۆڤ ڕێگە بە خۆی بدات و ڕەخنە لە خودا بگرێت. لەمەشدا دەگەڕێتەوە بۆ سەر نامەکەی پاولۆس کە کاتی خۆی بۆ ڕۆمەکانی نووسیبوو؛

»مرۆڤ تۆ کێیت، کە بەرپەرچی خودا دەدەیتەوە؟ ئایا فۆڕمێک دەتوانێت بە فۆڕم خوڵقێنەرەکە بڵێت بۆچی منت بەو جۆرە ئافەریدەکردووە؟ مەگەر گۆزە دروستکەرێک بەسەر قوڕەکەیدا زاڵ نەبێت؟ ئەو دەتوانێت لە قوڕێک گۆزەیەکی قەشەنگ دروستبکات و لە هەمان کاتیشدا گەر بیەوێت دەتوانێت گۆزەیەکی ساکاری لێ دروست بکات.«

- کەواتە خوا لە ئاسماندا دانیشتووە و یاری بە مرۆڤ دەکات؟ هەر کاتێکیش کە شتێک لە ئافەریدەکانی خۆی بە دڵ نەبێت، ڕاستەوخۆ فرێی دەدات.
- مەبەستی ئاوگوستین ئەوەیە کە هیچ مرۆڤێک شایانی ئەوە نیە خودا ڕزگاری بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خودا هەندێ مرۆڤی هەڵبژاردووە کە لە ون بوون و تاریکی ڕزگاریان دەکات. لەبەرئەوەی ئەو زۆر بە ڕوونی دەزانێت چ مرۆڤێک ڕزگاری دەبێت و چ کەسێکیش دەفەوتێت. ئەمە شتێکە کە لەوەوپێش دانراوە، واتە ئێمە بە تەواوەتی بە بەزەیی خواوە بەستراوینەتەوە.
- کەواتە بە شێوەیەک لە شێوەکان گەڕایەوە سەر بڕواکردنە کۆنەکەی چارەنووس.
- شتێک لەو بابەتە. بەڵام ئاوگوستین نکۆڵی لە بەرپرسیاری مرۆڤ بەرامبەر بە ژیانی خۆی ناکات. ئەو وەک ئامۆژگاریەک دەیگوت؛ دەبێت بە شێوەیەک بژین کە واهەست بکەین سەربە کۆمەڵی هەڵبژێردراوەکانین. ئەو نکۆڵی لەوە نەدەکرد کە ئێمە خاوەنی ویستێکی ئازادین، بەڵام دەیگوت خودا «هەر لە سەرەتاوە شێوەی ژیانی ئێمەی بینیوە.«
- پێت وانیە ئەمە کەمێک ناهەقانە بێت؟ بە بڕوای سوکرات هەموو کەسێک هەمان بواری هەیە، چونکە هەموو کەسێک خاوەنی هەمان ژیرێتیە. بەڵام ئاوگوستین دێت و مرۆڤ دەکات بە دوو گروپەوە، یەکێکیان ڕزگاری دەبێت و ئەوی تریان لە تاریکیدا دەمێنێتەوە.
- بەڵێ، تیۆلۆژی ئاوگوستین کەمێک لە مرۆڤدۆستی ئەسینای دور خستینەوە. بەڵام خۆ لە ڕاستیدا ئاوگوستین مرۆڤی نەکرد بە دوو گروپەوە، لەوێدا ئەو پشت بە تیۆری «ڕزگاربوون و فەوتاندنی»

ئینجیل دەبەستێت. ئەو لە دوو توێی کتێبێکی گەورەدا، کە ناوی نابوو «سەبارەت بە وڵاتی خودا»، زیاتر دەچێتە فولایی بابەتەکەوە.

ـ بۆم باسبکە!

ـ زاراوەی «وڵاتی خودا» یان «جیهانی خودا» لە ئینجیل و ڕاگەیاندنەکانی مەسیحەوە هاتووە. بە بڕوای ئاوگوستین، مێژوو لە ململانێی نێوان «وڵاتی خودا» و «وڵاتی سەر زەوی»دا دەبینرێت. ئەو دوو وڵاتە وەک دوو وڵاتی ڕامیاری نین کە تەواو جیاواز بن، بەڵکو لە ناو هەموو تاکە کەسێکدا لە سەر دەسەڵات شەڕدەکەن. کەم تا زۆریش وێنەی «وڵاتی خودا» لەناو کڵێسەدا بوونی هەیە و «وڵاتی سەر زەویش» لەناو ڕێکخراوە ڕامیاریەکاندا دەبینرێت ـبۆ نمونە، لە ئیمپڕاتۆری ڕۆمدا کە ڕێک لە سەردەمی ئاوگوستیندا هەڵوەشایەوە. وردە وردەش لەگەڵ بەردەوامبوونی ململانێی نێوان کڵێسە و دەوڵەت لەسەر دەسەڵات، ئەم جۆرە تێگەیشتنە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست زیاتر و زۆرتر ڕووندەبووەوە. ئەوان دەیان گوت « هیچ جۆرە ڕزگاربوونێک لەدەرەوەی کڵێسەدا بوونی نیە»». واتە لە دواجاردا «وڵاتی خودا»ی ئاوگوستین وەک ڕێکخراوێک بووبە پێناسەیەکی کڵێسە. یەکەم جاریش لە سەردەمی چاکسازیدا بوو، لە سەدەی شانزەدا، کە ناڕەزاییان دەربڕی و دژ بەوە وەستانەوە کە هەموو کەسێک ناچارانە دەبوایە لە ڕێگەی کڵێسەوە ڕزگاربوونی خودایی بەدەست بهێنایە.

ـ کەمێک دوا کەوت!

ـ وەک سەرنجێک دەتوانین بڵێین ئاوگوستین یەکەم فەیلەسوف بوو کە «مێژووی» هێنایە ناو فەلسەفەوە. ململانێی نێوان باشە و خراپە بە هیچ جۆرێک بابەتێکی نوێ نەبوو، بەڵام ڕوودانی ئەو ململانێیە لە

ناو مێژوودا خۆی بۆ خۆی شتێکی نوێ بوو. لە وێدا لەلای ئاوگوستین هیچ جۆرە کاریگەرییەکی پلاتۆنیزمی نامێنێتەوە. ئەو، ڕێک وەک پەیمان نامەی کۆن، مێژوو بە شێوەی هێڵێک دەبینێت؛ واتە بۆ ئەوەی خودا بتوانێت «وڵاتە خودا»ییەکەی خۆی بە هەقیقەت بگەێنێت، پێویستی بە هەموو مێژوو هەیە. مێژوو گرنگە بۆ پەروەردەکردنی مرۆڤ و فەوتاندنی خراپە. یان هەر وەک ئاوگوستین خۆی دەیگوت «پەروەردەکردنی خوداییانە، مێژووی مرۆڤایەتی هەر لە ئادەمەوە هەتا کۆتایی مێژوو بەڕێوە دەبات، وە بە شێوەیەک کە هەر لە مێژووی تاکە کەسێک دەچێت کە لە منداڵییەوە هێدی هێدی بەرەو پیرێتی گەشە دەکات.»
سۆفیا تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد و گوتی؛
ـ کاتژمێر بووە بە هەشت، دەشێ من کەمێکی تر بڕۆم.
ـ بەڵام پێش ئەوەی بڕۆیت دەمەوێت باسی فەیلەسوفە مەزنەکەی تری سەدەکانی ناوەڕاستت بۆ بکەم. دەڵێیت چی بچینە دەرەوە دابنیشین؟
ئەلبێرتۆ لەسەر کورسیەکەی هەستا. هەردوو لەپی دەستی پێکەوە نووساند و بەناوەڕاستی کڵێسەکەدا بەرەو دەرەوە کەوتە ڕێ. لەوە دەچوو لە خودا بپاڕێتەوە، یان بە قوڵی بیر لە ڕاستیە ڕۆحانیەکان بکاتەوە. سۆفیاش ناچارانە دوای کەوت.
لەدەرەوەدا هێشتام توێژێکی چڕی تەم باڵی بەسەر زەویدا کێشابوو. دەمێک بوو خۆر هەڵهاتبوو، بەڵام هێشتام تەمی بەیانی نەبڕیبوو. کڵێسەی ماریا کەوتبووە بەشی ئەوبەری شارەکە، پێشیان دەگوت گەڕەکی کۆنی شار.
ئەلبێرتۆ لەسەر کورسیەکی بەردەم کڵێسەکەدا دانیشت. سۆفیاش لە دڵی خۆیدا دەیگوت «چی ڕوودەدات گەر ئێستاکە کەسێک بەوێدا

تێپەڕێت؟» خۆی لە خۆیدا سەیر بوو گەر کاتژمێری هەشتی بەیانی لەسەر کورسیەکی ئاوها دانیشیت، سەرباری ئەوەش لەگەڵ قەشەیەکی سەدەکانی ناوەڕاستدا بیت... ئەلبێرتۆ دەستی بە باسکردن کرد؛

ـ کاتژمێر هەشتە، وا نزیکەی چوار سەد ساڵ بەسەر مردنی ئاوگوستیندا تێپەڕیووە، لە ئێستاشەوە ئیدی ڕۆژی قوتابخانە دەست پێدەکات. قوتابخانەی قەشەکان هەتاوەکو کاتژمێری دە، دەستیان بەسەر فێرکردندا گرتووە. لە نێوان کاتژمێری دە و یانزەدا، یەکەمین قوتابخانەی کاتیدرالی دادەمەزرێنرێت. نزیکەی کاتژمێری دوانزەش یەکەمین دانیشگا دەردەکەوێت. لێرەدا کە کاتیدرالیە «گۆتیک «Gothicە مەزنەکان (*گۆتیک؛ ئەڵمانی کۆن، خاسیەتی هونەری بینا سازی کۆن کە لە ساڵەکانی سەدەی دوانزەدا باو بوو.و) دروستدەکرێن. ئەم کڵێسەیەش لە ساڵەکانی 1200دا دروستکرا –یان ئەو کاتەی کە پێی دەگوترێت سەدەی ناوەڕاستی دواتر. لەم شارەدا بەهۆی گرفتی داراییەوە توانای دروستکردنی کاتیدرالی گەورەتریان نەبووە.

ـ لەوانەیە پێویستیش نەبووبێت. من کڵێسەی چۆڵم پێ خۆش نیە.

ـ بەڵام کاتیدرالیە گەورەکان تەنها لەبەر کۆکردنەوەی گروپە ئاینیەکان دروست نەدەکران، بەڵکو لەبەر ڕێز لێنانی خودا بوو، جگە لەوەش وەک خزمەتکردنێکی خودا دادەنرا. بەڵام لە سەدەکانی ناوەڕاستی دواتردا، شتێکی تریش ڕوویدا کە بەتایبەتی بەلای ئێمەی فەیلەسوفەوە جێگەی مەبەستە.

ئەلبێرتۆ بەردەوامبوو؛

ـ لێرەدا کاریگەری عەرەبەکانی ئیسپانیا سەرهەڵدەدات. عەرەبەکان بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست داب و نەریتێکی زیندووی

ئەریستۆتالیسییان هەبوو. ئەمیرەکان لە کۆتایی سەدەی دوانزەدا، ڕووناکبیرە عەرەبەکانیان بۆ باکوری ئیتاڵیا بانگکرد. بەو جۆرەش زۆربەی نووسینەکانی ئەریستۆتالیس بڵاوبووەوە و پاش ماوەیەکیش وەرگێڕدرانە سەر لاتینی... ئەم کارەش بایەخ پێدانێکی نوێی بە زانستە سروشتیەکان بەخشییەوە، جگە لەوەش پەیوەندی نێوان بڕوای مەسیحی و فەلسەفەی یۆنانی زیندووکردەوە. واتە کاتێک باسی بابەتی زانستە سروشتیەکان دەهاتە پێشەوە، چیتر بۆیان نەدەلوا کە بیروڕاکانی ئەریستۆتالیس پشتگوێ بخەن. بەڵام چ کاتێک مرۆڤ دەبێت گوێ بۆ «فەیلەسوفێک» شلکات و چ کاتێکیش دەبێت پەیوەستی ئینجیل بێت؟ تێدەگەیت؟

سۆفیا سەرێکی لەقاند و قەشەکەش بەردەوام بوو؛

- مەزنترین و گرنگترین فەیلەسوفی سەدەکانی ناوەڕاستی دواتر، تۆماس ئەکویناس «Thomas Aquinas» بوو، کە لە نێوانساڵەکانی 1225 بۆ 1274دا دەژیا. لە شاری چکۆلەی «ئەکوینۆ»ی نێوان ڕۆما و ناپۆلیدا لەدایک بوو، بەڵام وەک مامۆستایەکی زانکۆ لە شاری پاریسدا کاریدەکرد. من ناوی «فەیلەسوف»ی لێدەنێم، بەڵام هاوکات زانایەکی تیۆلۆژیش بوو. لەو سەردەمەدا جیاوازیەکی ڕاستەقینە لە نێوان «فەیلەسوف» و «زانای تیۆلۆژی»دا نەبوو. زۆر بەکورتی دەتوانین بڵێین تۆماس ئەکویناس، ئەریستۆتالیسی «کردە مەسیحی»، هەروەک چۆن ئاوگۆستین لەسەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا پلاتۆنی «کرد بە مەسیحی.»

- کەمێک بەلاتەوە سەیر نیە ئەو فەیلەسوفانەی چەند سەد ساڵێک پێش مەسیح ژیاوون، بە کەسێکی «مەسیحی بوو» لەقەڵەم بدەین؟

ـ بەڵێ ڕاستە، بەڵام مەبەستمان لە «کردنە مەسیحی» ئەو دوو فەیلەسوفە یۆنانیە مەزنە ئەوەیە کە بیروڕاکانیان بە شێوەیەک تەماشا دەکران و لێی تێدەگەیشتن کە چیتر وەک هەڕەشەیەک دژ بە فێرکردنەکانی ئاینی مەسیحی نەدەبینران. دەڵێن تۆماس ئەکویناس « شاخی گای گرتووە.«
ـ نەمدەزانی فەلسەفە پەیوەندی بە ڕاهێنانی گاشەوە هەیە.
ـ تۆماس ئەکویناس لەو کەسانە بوو کە هەوڵی تەباکردنی ئاینی مەسیحی و فەلسەفەی ئەریستۆتالیسی دەدا. لەبەر ئەمەیە کە دەڵێین ئەو بڕوا و زانستی بە شێوەیەکی فراوان بەیەکەوە گرێدەدا. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش، ڕێک پشتی بە فەلسەفەی ئەریستۆتالیس دەبەست .
ـ یان بە شاخەکانی گاکە!... ببوورە دوێنێ شەو باش نەخەوتووم، لەبەرئەوە تکات لێدەکەم زیاترم بۆ ڕوونبکەرەوە.
ـ تۆماس ئەکویناس دەیگوت «مەرج نیە دژایەتی لە نێوان بیروڕای فەلسەفی یاخود ژیریێتی و ئاینی مەسیحیدا هەبێت. زۆر جاران فەلسەفە و ئاینی مەسیحی هەمان شتمان پێ دەڵێن. لەبەرئەوە بە یاریدەی ژیریێتیش دەتوانین بگەینە هەمان ئەو ڕاستیانەی کە لە ئینجیلدا بەرچاومان دەکەون.
ـ چۆن ئەمە ڕێی تێدەچێت؟ ئایا ژیریێتی دەتوانێت پێمان بڵێت کە خودا لەماوەی شەش ڕۆژدا گەردوونی خوڵقاندووە؟ یان کە مەسیح کوڕی خوایە؟
ـ نەخێر، ئەو جۆرە «ڕاستیە ئاینیانە» تەنها لە ڕێگەی بڕواکردنەوە پێیان دەگەین و بەهۆی ئیمانی مەسیحیەوە هەستیان پێدەکەین. بەڵام بە بڕوای تۆماس ئەکویناس کۆمەڵێ «ڕاستی سروشتی

تیۆلۆژی»ش بوونیان هەیە. ئەو ڕاستیانەی کە هەم دەگونجێت لە ڕێگەی بڕواکردن بە ئاینی مەسیحیەوە پێیان بگەین و هەم لە ڕێگەی ژیریێتی زگماکی «سروشتی»شمانەوە دەتوانین پەییان پێبەرین. بۆ نمونە یەکێک لەو ڕاستیانە بوونی خودایە. لە ڕوانگەی تۆماسەوە دوو ڕێگا بۆلای خودا دەڕوات؛ یەکەمیان لە ڕێگەی سروش و بڕواکردنی ئاینییەوەیە و دووهەمیشیان لە ڕێگەی ژیریێتی و هەستەکانەوەیە. ئاشکرایە کە ڕێگەی بڕوا و سروش، دڵنیاترین ڕێگەیە. چونکە گەر تەنها پشت بە ژیریێتی ببەستین، ئەوا بە ئاسانی تووشی ون بوون دەبین. بەڵام تۆماس خاڵێکی دووپات دەکردەوە و دەیگوت مەرج نیە دژایەتی لە نێوان فەیلەسوفێکی وەک ئەریستۆتالیس و فێرکردنەکانی ئاینی مەسیحیدا هەبێت.

- کەواتە پشت بەستن بە ئەریستۆتالیس یان بە ئینجیل هیچ جیاوازیەکی نیە؟

- نەخێر، نەخێر. ئەریستۆتالیس تەنها بەشێکی ڕێگاکەی بڕی، لەبەرئەوەی بڕوای ئاینی مەسیحی نەدەزانی. بەڵام بڕینی کەمێکی ڕێگاکە، مانای ئەوە نیە کە ڕێگای هەڵەت گرتبێت. بۆ نمونە هەڵە نیە گەر بڵێین ئەسینا کەوتۆتە ئەوروپاوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا زۆر ورد نابین. ئەگەر لە کتێبێکدا تەنها ئەوەندە بگوترێت کە ئەسینا کەوتۆتە ئەوروپاوە، ئەوا ناچاردەبیت لە کتێبی جوگرافیادا بەدوای شاری ئەسینادا بگەڕێیت. لەوێدا تەواوی هەموو ڕاستیەکەت (بەنزیکەیی!) بۆ دەردەکەوێت؛ ئەسینا پایتەختی یۆنانە، یۆنانیش وڵاتێکی چکۆلەیە و کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی خوارووی ئەوروپاوە. ئەگەر بەختیشت هەبێت، ئەوا کەمێک دەربارەی ئەکرۆپۆلیسیش شارەزا

دەبیت، لەوانەشە شتێک دەربارەی سوکرات و پلاتۆن و ئەریستۆتالیسیش باس بکات!
- بەڵام یەکەمین زانیاریش دەربارەی ئەسینا ڕاستە.
- تەواوە! بەلای تۆماسەوە گرنگ بوو بڵێت کە تەنها یەک ڕاستی هەیە. کاتێک ئەریستۆتالیس ئاماژە بۆ شتێک دەکات و دەڵێت ئێمە بە هۆی ژیرێتیمانەوە دانی پێدا دەنێین کە ڕاستە، ئەو کاتە دژ بە فێرکردنەکانی ئاینی مەسیحی ناوەستێتەوە... ئێمە بە یاریدەی هەستەکانمان و ژیرێتیمانەوە دەتوانین بەشێکی تەواوی ڕاستی درک پێبکەین، بۆ نمونە کاتێک ئەریستۆتالیس باس لە ڕاستی جیهانی ئاژەڵ و ڕووەک دەکات، بەڵام خوداش بەشەکەی تری ڕاستیمان لە ڕێگەی ئینجیلەوە بۆ دەردەخات. بێگومان لە زۆر خاڵی گرنگیشدا هەردوو بەشی ڕاستیەکە تێکەڵ بەیەک دەبن. لە زۆر بابەتدا ئینجیل و ژیرێتی کتومت باسی هەمان شت دەکەن.
- بۆ نمونە بوونی خودا؟
- بەڵێ... فەلسەفەی ئەریستۆتالیسیش گریمانەی بوونی خودا دەکات (یان یەکەمین هۆ) کە هەموو پڕۆسێسی سروشتی دەست پێکردبێت. بەڵام ئەو هیچ جۆرە وەسفێکی فراوانی خودا باس ناکات. لەوێدا دەبێت بە تەواوەتی بگەڕێینەوە سەر ئینجیل و ڕاگەیاندنەکانی مەسیح.
- ئایا بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین خوا هەیە؟
- بێگومان ئەمە جێگەی مشت و مڕە. بەڵام ئەمڕۆکەش زۆربەی خەڵکی تەبان لەسەر ئەوەی کە ژیرێتی مرۆڤ بەلایەنی کەمەوە ناتوانێت پێچەوانەکەی بسەلمێنێت (واتە نەبوونی خودا). تۆماس لەمەش زیاتر

دەڕۆیشت، ئەو دەیگوت بەهۆی فەلسەفەی ئەریستۆتالیس دەکرێت بوونی خودا بسەلمێنرێت.
ـ خراپ نیە!
ـ ئەو دەیگوت بەهۆی ژیرێتیمانەوە دەتوانین بڵێین هەموو شتێکی چواردەورمان دەبێت «هۆیەکی سەرەتایی» هەبێت. کەواتە خودا لە ڕێگەی ژیرێتی و ئینجیلەوە خۆی بۆ مرۆڤ ئاشکراکردووە. واتە «تیۆلۆژی بڕوا» و «تیۆلۆژی سروشتی»مان هەیە. تاڕادەیەک هەمان شتیشە کاتێک کە باسی مۆراڵ دەکەین. دەتوانین لە ئینجیلدا ئەو شێوەی ژیانە ببینین کە خودا داوامان لێدەکات، بەڵام لە سەرو ئەوەشەوە خودا ویژدانیشی پێ بەخشیوین کە لە ڕێگەیەوە دەتوانین بە شێوەیەکی «سروشتی» ڕاست و هەڵەی پێ جودا بکەینەوە. واتە دەربارەی ژیانی مۆراڵیش دیسانەوە دوو ڕێگەمان هەیە، ئێمە بەبێ ئەوەی ئینجیل بخوێنینەوە دەزانین کە ئازاردانی خەڵکانی تر کارێکی هەڵەیە. لە ئینجیلیشدا دەڵێت؛ «هەر بە هەمان ئەو شێوەیەی کە دەتەوێت خەڵکی ڕفتارت لەگەڵدا بکات، ڕەفتاریان بەرامبەر بکە»، بەڵام دیسانەوە لێرەشدا دڵنیاترین ڕێگا پەیڕەویکردنی پەیامەکانی ئینجیلە.
ـ پێم وابێت ئێستا تێدەگەم. وەک ئەوە وایە پێشبینی ڕەهێڵەیەک بە بینینی هەورە بروسکەکەیدا بکەین، یان بە گوێلێبوونی هەورە گرمەکەیدا.
ـ ڕاستە! ئەگەر کوێریش بین، دەتوانین گوێمان لە هەورە گرمەکە بێت، وە هەرچەندە کەڕیش بین، دەتوانین هەورە بروسکەکە ببینین. بێگومان باشترین شت ئەوەیە کە هەم بیبینین و هەم گوێشمان لێی بێت. بەڵام ئەو کاتە هیچ جۆرە «دژایەتیەک» لە نێوان بینین و

بیستنەکەدا نیە. بە پێچەوانەوە، هەردوو هەستەکە دەبنە تەواوکەری یەکتری. با نمونەیەکی ترت بۆ بهێنمەوە... کاتێک ڕۆمانێک دەخوێنیتەوە، بۆ نمونە ڕۆمانی «فیکتۆریا»ی کنوت هامسۆن «Knut Hamsun»...

ـ لە ڕاستیدا ئەو ڕۆمانەم خوێندۆتەوە!

ـ ئایا تەنها بە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە، کەمێکت دەربارەی نووسەرەکە بۆ دەرناکەوێت؟

ـ بەلایەنی کەمەوە وای دادەنێم کە نووسەرێک هەیە و کتێبەکەی نووسیوە.

ـ هیچ شتێکی تریش دەربارەی شارەزا نابیت؟

ـ خۆشەویستی لە ڕوانگەیەکی ڕۆمانسیەوە دەبینێت.

ـ لەگەڵ خوێندنەوەی ڕۆمانەکەدا –کە شاکاری هامسۆنە- کەمێکت دەربارەی بیرکردنەوەی هامسۆن بۆ دەردەکەوێت، بەڵام ناتوانیت پێشبینی چۆنیەتی کەسایەتی نووسەرەکە بکەیت، بۆ نمونە؛ ئایا لە دوای خوێندنەوەی فیکتۆریاوە، دەتوانیت تەمەنی نووسەرەکە بزانیت کاتێک کە ڕۆمانەکەی نووسیوە؟ ئایا دەزانیت لە چ شوێنێک ژیاوە یان بۆ نمونە چەند منداڵی هەبووە؟

ـ نەخێر بێگومان ناتوانم.

ـ بەڵام هەموو ئەو جۆرە زانیاریانە دەتوانیت لە بیۆگرافی کنوت هامسۆندا بدۆزیتەوە. تەنها لە ڕێگەی بیۆگرافیەکی ئاوهاوە –یان لە ڕێگەی بیۆگرافیەکی خۆییەوە- دەتوانیت زیاترت دەربارەی کەسایەتی نووسەرەکە بۆ دەرکەوێت.

ـ بێگومان ئاشکرایە.

- تا ڕادەیەک هەمان شتیشە کاتێک کە باس لە پەیوەندی نێوان ئینجیل و ئافەریدەکانی خودا دەکەین. کاتێک بەناو سروشتدا دەڕۆین، بۆمان دەردەکەوێت کە خودا هەیە. بێگومان دەشبینین کە دڵی بە گوڵ و ئاژەڵ خۆشە؛ گەر وا نەبێت، ئەوا نەیدەخولقاندن. بەڵام زانیاری دەربارەی کەسی خودا، تەنها لە ئینجیلدا دەیبینین ـیان لە «بیۆگرافی خوادا» دەتوانین بیدۆزینەوە.

- نمونەی باش دەهێنیتەوە.

- ئممم...

بۆ یەکەم جار ئەلبێرتۆ بەبێ ئەوەی وەڵام بداتەوە، بەبێدەنگی دانیشتبوو و بیری دەکردەوە... لە پڕێکدا سۆفیا گوتی؛

- ئەم بابەتانە هیچ پەیوەندییەکی بە هیلدەوە هەیە؟

- ئێمە لە بوونی «هیلدە» تەواو دڵنیا نین.

- بەڵام دەزانین کەسێک بە دەستی ئانقەست لێرە و لەوێ شوێنەواری ئەومان بۆ جێدەهێڵێت... پۆسکارت و دەسرە ئاوریشمیەکە، جزدانە سەوزەکە و گۆرەویەکە...

ئەلبێرتۆ سەرێکی ڕاوەشاند؛

- لەوەش دەچێت باوکی هیلدە هەموو کارەکە بەڕێوە بەرێت. بەڵام تا ئێستا تەنها ئەوەندە دەزانین کە کەسێک ئەو هەموو پۆستکارتانەمان بۆ دەنێرێت. خۆزگە کەمێکیشی دەربارەی خۆی دەنووسی، بەهەرحاڵ پاشان دێینەوە سەر ئەم بابەتە.

- کاتژمێر دوانزەیە، دەشێ پێش ئەوەی سەدەکانی ناوەڕاست تەواو بێت، هێواش هێواش بەرەو ماڵەوە بڕۆمەوە.

- پێش ئەوەی کۆتایی بە باسەکەم بهێنم، دەمەوێت بەکورتی بڵێم تۆماس ئەکویناس فەلسەفەی ئەریستۆتالیسی لە هەموو ئەو

لایەنانەوە وەرگرت کە دژ بە ئاینی مەسیحی نەبوون... ئەو بابەتانەش هەموو لۆژیک و فەلسەفەی مەعریفی ئەریستۆتالیس و فەلسەفە سروشتیەکەی دەگرێتەوە. لەیادتە ئەریستۆتالیس چۆن باسی پلەی پێشکەوتنی ژیانی دەکرد و دەیگوت لە ڕووەک و ئاژەڵەوە سەرکەوتووە تا مرۆڤ؟

سۆفیا سەرێکی لەقاند و ئەلبێرتۆش لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛

ـ هەر لە سەرەتاوە ئەریستۆتالیس دەیگوت ئەو پلەی پێشکەوتنە بە خودایەک کۆتایی پێدێت، کە لە سەرو هەموو بوونێکەوەیە. ئەم وێنەیەش بە ئاسانی لەگەڵ تیۆلۆژی ئاینی مەسیحیدا دەگونجا. بەپێی تۆماس، پلەی بوون لە ڕووەک و ئاژەڵەوە بەرەو مرۆڤ بەرزدەبێتەوە. لە مرۆڤیشەوە بۆ فریشتە، لە فریشتەشەوە بۆ خودا. مرۆڤ هەروەک ئاژەڵ خاوەنی لەش و هەستە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ژیرێتی هەیە، وە بەهۆیەوە دەتوانێت بیربکاتەوە و کێشەکان هەڵبسەنگێنێت. فریشتەکان خاوەنی لەش و هەستێکی بەو جۆرە نین، بەڵام زیرەکیەکی تیژ و ڕاستەوخۆیان هەیە. ئەوان پێویستیان بەوە نیە وەک مرۆڤ «بیربکەنەوە»؛ واتە پێویستیان بەوە نیە بەدوای دەرئەنجامی بابەتەکاندا بگەڕێن. ئەوان هەموو ئەو شتانە دەزانن کە مرۆڤ دەیانزانێت. بەبێ ئەوەی پێویست بکات بەرە بەرە وەک ئێمەی مرۆڤ بە ئەنجام بگەن. جگە لەوەش فریشتەکان لەشیان نیە، هەر لەبەرئەوەش هەرگیز نامرن و نەمرن. بەڵام وەک خودا هەتاهەتایی نین، چونکە ئەوانیش لە کاتێکی دیاریکراودا لەلایەن خوداوە ئافەریدەکراون. بەڵام لەشێکیان نیە کە ڕۆژێک لێی جودا ببنەوە، لەبەرئەوە هەرگیز نامرن.

ـ جوانە!

ـ بەڵام خودا لەسەرو فریشتەکانیشەوەیە، سۆفیا. ئەو لە بینینێکی پڕاوپڕدا دەتوانێت هەموو شتێک ببینێت و لێشیان تێبگات.
ـ کەواتە ئێستاکە دەمان بینێت.
ـ بەڵێ، لەوانەیە بمان بینێت، بەڵام نەک «ئێستا!». بوونی کات لەلای خودا و ئێمە وەک یەک نیە. «ئێستای» ئێمە وەک «ئێستای» خودا نیە. کاتێک چەند هەفتەیەک لەلای ئێمە تێدەپەڕێت، ئیتر مەرج نیە هەمان ماوەش لەلای خودا ڕابووڕێت.
لێرەدا سۆفیا هاوارێکی کرد و گوتی؛
ـ بەڕاستی ناخۆشە!
بەدەستێکی باوێشکەکەی دەمی داپۆشی. ئەلبێرتۆ تەماشەیەکی کرد و سۆفیاش بەردەوامی بە قسەکانی دا؛
ـ پۆستکارتێکی نوێم لە باوکی هیلدەوە پێگەیشت، لەوێدا نووسیبووی؛ کاتێک لای سۆفیا یەک دوو هەفتە تێدەپەڕێت، ئیتر مەرج نیە لای ئێمەش هەمان کات ڕابووڕێت. ئەمەش نزیکەی هەمان شتە کە تۆ دەربارەی خودا باست کرد!
سۆفیا لە ژێر کڵاوە قاوەییەکەوە، سیمای گرژی قەشەکەی بینی.
ـ بەڕاستی شەرم بکات باشترە!
سۆفیا بەتەواوەتی لە مەبەستی تێنەگەیشت، لەوانەیە تەنها قسەیەکی ئاسایی بێت. ئەوجا ئەلبێرتۆ بەردەوام بوو؛
ـ بەداخەوە تۆماس ئەکویناسیش دەربارەی ئافرەت، هەمان هەڵوێستی ئەریستۆتالیسی وەگرت. لەوانەیە لە یادت بێت، ئەریستۆتالیس تا ڕادەیەک پێی وابوو ئافرەت "پیاوی ناتەواو" بێت. جگە لەمەش دەیگوت منداڵ تەنها خاسیەتی پیاو وەردەگرێت، لەبەرئەوەی ئافرەت ناچالاک و وەرگرە، لە کاتێکدا پیاو چالاک و خوڵقێنەری فۆڕمە. بەپێی

تۆماسیش ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لەگەڵ وشەکانی ئینجیلدا هاوئاهەنگە –بۆ نمونە کاتێک کە دەڵێت ئافرەت لە پەراسوی پیاوەوە دروستکراوە.

- قسەی بێ مانا!

- لێرەدا گرنگە بڵێین، بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1827دا بوو کە بوونی هێلکەی شیردەرەکان سەلمێنرا. لەبەر ئەوە تاڕدەیەک زۆر سەیر نیە، کە خەڵکی لەو بڕوایەدابوون، پیاو ژیان ببەخشێت و لە هەمان کاتیشدا خوڵقێنەری فۆڕم بێت. جگە لەمەش گرنگە سەرنج بدەین، کە ئافرەت بەلای تۆماسەوە تەنها وەک بوونەوەرێکی سروشتی پلەی لە پیاو کەمترە. بەڵام ئەو دەیگوت ڕۆحی ئافرەت هەمان نرخی ڕۆحی پیاوی هەیە. لە ئاسماندا هەردوو ڕەگەزەکە یەکسانن، لەبەر ئەوەی لەوێدا هەموو جیاوازیەکی ڕەگەزیی کە پەیوەندی بە لەشەوە هەبێت، بوونی نیە.

- دڵدانەوەیەکی بێ مانایە. باشە ئەی هیچ فەیلەسوفێکی ئافرەت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نەبوو؟

- لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پیاو دەسەڵاتی بەسەر ژیانی کڵێسەدا گرتبوو، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە هیچ بیرمەندێکی ئافرەت نەبووبێت. یەکێک لەوانە هیلدەگاردی بینجین «Hildegard Of Bingen»بوو .

سۆفیا هەردوو چاوی زەق کردەوە و پرسی؛

- ئەو هیچ پەیوەندیەکی بە هیلدەوە هەیە؟

- چ پرسیارێک دەکەیت! هیلدەگارد لە نێوان ساڵەکانی 1098 بۆ 1179دا وەک ڕاهیبەیەک لە شاری ڕایندالندا دەژیا. هەرچەندە ئافرەتیش بوو، بەڵام وەک مژدەبەری ئاینی و پزیشک و نووسەر و

ڕووەکناس و لێکۆڵەرەوەیەکی سروشت ڕۆڵی خۆی دەبینی. دەکرێت وەک سمبولێکی ئافرەتی ڕاستخواز (واقیعی) لەقەڵەم بدرێت، چونکە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە زۆربەی زانستەکاندا زیاتر ئافرەتان ڕاستخواز بوون.
- پرسیاری ئەوەم کرد کە هیچ پەیوەندیەکی بە هیلدەوە هەیە؟
- بەپێی تێگەیشتنی کۆنی یەهودی و مەسیحیش، خودا تەنها پیاو نیە. بەڵکو لایەنێکی مێینە یان «سروشتێکی دایکانەشی» هەیە. چونکە ئافرەتیش لە وێنەی خودا خوڵقێنراوە. بە یۆنانی بەو لایەنە مێینەیەی خودا دەگوترێت سۆفیا... «سۆفیا «Sophia مانای حیکمەت دەبەخشێت.
سۆفیا بە بێزاریەکەوە سەرێکی ڕاوەشاند؛ بیری لەوە دەکردەوە بۆچی لەوەو پێش کەس باسی ئەوەی بۆ نەکردبوو؟ ئەی بۆچی خۆی هەرگیز پرسیاری نەکردبوو؟ ... ئەوجا ئەلبێرتۆ بەردەوام بوو؛
- «سۆفیا» یان «سروشتی دایکانەی خودا» بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست لەلای یەهودیەکان و ئۆرتۆدۆکسی یۆنانی کەم تا زۆر گرنگی خۆی هەبوو. بەڵام تا ئەو کاتەی هیلدەگارد هات، لە ڕۆژئاوادا لە یاد کرابوو. هیلدەگارد دەیگوت «لەدیدەکانمدا سۆفیا خۆی نیشان داوم، جل و بەرگی ئاڵتونی لەبەردا بووە و بە خشڵ و مرواری گرانبەها خۆی ڕازاندبووەوە...»
سۆفیا لەسەر کورسیەکە بەرزبووەوە. سۆفیا لە دیدەکانی هیلدەگاردا خۆی نیشان داوە...
- لەوانەیە منیش خۆم نیشانی هیلدە بدەم.
دیسانەوە دانیشتەوە. بۆ جاری سێهەم ئەلبێرتۆ دەستێکی خستەوە سەر شانی سۆفیا.

ـ دەبێت خۆمان بیدۆزینەوە، بەڵام وا کاتژمێر دەبێتە یەک. دەبێت بگەڕێیتەوە ماڵەوە و نان بخۆیت. پاشانیش خەریکە وا لە سەردەمێکی نوێ نزیک دەبینەوە. لە دوایدا بانگت دەکەم و باسی ڕێنیسانس دەکەین. هێرمس دێتە باخچەکە و ئاگادارت دەکاتەوە .
قەشە سەیرەکە ئەمەندەی گوت و بەرەو کڵێسەکە کەوتە ڕێ. سۆفیا دانیشتبوو و بیری لە سۆفیا «سروشتی دایکانەی خودا» و هیلدەگارد دەکردەوە، سۆفیا و هیلدە. لە پڕێکدا موچوڕکەیەکی پێدا هات، هەستا و هاوارێکی لە مامۆستای فەلسەفەکەی کرد؛
ـ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کەس هەبوو ناوی ئەلبێرتۆ بێت؟
ئەلبێرتۆ کەمێک هەنگاوەکانی هێواش کردەوە، ئاوڕێکی دایەوە و گوتی؛
ـ تۆماس ئەکویناس مامۆستایەکی بەناوبانگی فەلسەفەی هەبوو، پێیان دەگوت ئەلبێرتۆی گەورە...
دیسانەوە بەرەو کڵێسەی ماریا ڕووی وەرچەرخاندەوە و خۆی کرد بە ژووردا.
سۆفیا وەڵامەکەی بەدڵ نەبوو... ئەویش خۆیکرد بە کڵێسەکەدا، بەڵام کە چووە ژوورەوە کەسی بەرچاو نەکەوت... چی لێهات؟ زەوی هەڵی لوشی؟
لە ڕێگەی هاتنە دەرەوەیدا سەرنجی چووە سەر وێنەیەکی ماریا. بەتەواوەتی لە وێنەکە نزیک بووەوە و تەماشایەکی کرد. لە پڕێکدا دڵۆپێک ئاوی لە ژێر چاوێکی ماریادا بینی... بڵێیت فرمێسک بێت؟
سۆفیا بە پەلە کڵێسەکەی بەجێهێشت و بە ڕاکردن گەڕایەوە ماڵی یۆرون.

## ڕێنیسانس «Renaissance»

## ...ئەی ڕەگەزی خودایی کە لە پێستی مرۆڤدا شاراویتەوە، خۆت بناسە...

نزیکەی کاتژمێری یەک و نیو سۆفیا بە هەناسە بڕکێ گەیشتە بەردەمی ماڵی یۆرون، ئەویش لە باخچەی خانووە زەردەکەیاندا چاوەڕوانی بوو. هەر کە چاوی بە سۆفیا کەوت، هاواری لێ بەرزبووەوە؛

ـ لەو کاتەوەی کە ڕۆیشتوویت، زیاتر لە دە کاتژمێر تێپەڕیووە.

سۆفیا سەرێکی ڕاوەشاند؛

ـ لەو کاتەوەی کە ڕۆیشتووم، زیاتر لە هەزار ساڵ تێپەڕیووە.

ـ لە کوێ بوویت؟

ـ چاوپێکەوتنێکی گەورەم لەگەڵ قەشەیەکی سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوو. لەگەڵ پیاوێکی سەرنجڕاکێشدا!

ـ تۆ بەتەواوەتی شێت بوویت. نیو سەعات لەمەوبەر دایکت زەنگی لێدا؟

ـ ئەی گوتت چی؟

ـ گوتم ڕۆیشتوە بۆ دوکانەکە.

ـ ئەی ئەو گوتی چی؟

ـ گوتی هەر کاتێک گەڕایەوە، با زەنگێکم بۆ لێبدات. دایک و باوکیشم لەولاوە بوەستێت...

ـ ئەوان چی؟

ـ کاتژمێری دە کاکاوی گەرم و کێکیان بۆ هێناین، بەڵام جێگا چۆڵەکەتیان بینی!

ـ ئەی چیت پێ گوتن؟
ـ زۆر شەرمەزاربووم، گوتم لە یەکتری زیز بووین و ڕۆشتەوە بۆ ماڵی خۆیان.
ـ کەواتە باشتر وایە بە پەلە ببینەوە بە برادەر. دەشبێت کارێکی وا بکەین کە دایک و باوکت بۆ چەند ڕۆژێک لەگەڵ دایکمدا قسە نەکەن. پێت وایە بتوانین؟
یۆرون شانێکی هەڵتەکاند. لەو کاتەدا باوکی یۆرون بە خۆی و عەرەبانە دەستیەکەیەوە دەرکەوت. جلوبەرگی کاری لەبەرکردبوو و خەریکی کۆکردنەوەی گەڵا وەریوەکانی پایز بوو.
ـ هێی... دەستە خوشک دیسانەوە بوونەتەوە بە برادەر؟ دەی... بۆتان دەرکەوت خەتای کامتان بوو؟
ـ نەخێر، یەکێکمان کاربرێتەرەکەی پیس بوو بوو، ئەوی تریش کەمێک تەختەکانی سەری شل بووبوەوە. کەواتە وەک یەکین.
باوکی بە شێوەیەکی ناسروشتیانە پێکەنی. پێکەنینەکەی خورپەیەکی بە دڵی یۆروندا هێنا... هەمیشە بابەتەکان بە شێوەیەکی سروشتی تر و کراوەتر لە ماڵی سۆفیادا ڕویان دەدا، نەک لە ماڵی یۆروندا .
ئەوجا سۆفیا وەک ئەکتەرێک گوتی؛
ـ داوای لێبووردنت لێدەکەم یۆرون. هەستم دەکرد دەبوایە بەشداری ئەو یاریە بکەم.
ـ کەمێکیم بۆ باس دەکەیت؟
ـ بۆ نا، ئەگەر بێیت بۆ ماڵی ئێمە. بەهەرحاڵ، ئەم بابەتە بەلای ڕاوێژکارە داراییەکان و بووکە شوشە پیرەکانیانەوە هیچ گرنگیەکی نیە.

ـ چەند ناخۆش قسە دەکەیت! مەگەر خێزانێکی لاوازت بەلاوە باشتربێت کە هەمیشە یەکێکیان ئەوی تریان ڕاودەنێت؟
ـ نەخێر، بێگومان نا. بەڵام ئەم شەو نەخەوتووم و جگە لەوەش بیر لە هیلدە دەکەمەوە، بڵێیت بتوانێت هەموو ئەو شتانە ببینێت کە دەیانکەین؟
کچان بەرەو کۆڵانی کلۆیڤە کەوتبوونە ڕێ.
ـ مەبەستت لەوەیە کە توانای بینینی شتی سەرو ئاسایی هەبێت؟
ـ ڕێی تێدەچێت... لەوانەشە وا نەبێت.
ئاشکرا دیابوو کە یۆرون دڵی بەو هەموو نهێنیکاریانە خۆش نەبوو.
ـ بەڵام هێشتام نهێنیەک هەر دەمێنێتەوە؛ بۆچی باوکی پۆستکارتە شێتانەکانی ڕەوانەی کوخێکی چۆڵکراوی ناو دارستانەکە دەکات.
ـ بێگومان ئەوەش خاڵێکی لاوازە.
ـ بەڵام هێشتام پێت نەگوتم لە کوێ بوویت؟
ئەوجا هەمووی بۆ گێڕایەوە. سۆفیا دەربارەی کۆرسی فەلسەفە نهێنیەکەشی باسکرد، بەڵام لە پێشدا سوێنی پێ خوارد کە لای هیچ کەسێک نەیدرکێنێت .
بۆ ماوەیەک بە بێدەنگی دەڕۆیشتن. کاتێکیش لە کۆڵانی کلۆیڤەی ژمارە سێ نزیک بوونەوە، یۆرون گوتی؛
ـ من ئەم بابەتەم پێ خۆش نیە.
لەبەردەم بەردەرگای ماڵی سۆفیادا وەستا و وای نیشاندا کە دەیەوێت بگەڕێتەوە.
ـ کەسیش داوای ئەوەی لێ نەکردوویت. بەڵام فەلسەفە یاریەکی کۆمەڵایەتی بێ مەترسی نیە، باس لەوەدەکات کە ئێمە کێین و لە

کوێوە هاتووین؟ لەو بڕوایەدایت لە قوتابخانە فێری ئەو بابەتانە ببین؟
- هەرچۆنێک بێت کەس نیە کە بتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە.
- بەڵام تەنانەت فێری ئەوەش نابین کە چۆن ئەو پرسیارانە بکەین؟
سۆفیا خۆی کرد بە ژووردا، لەو کاتەدا نانی نیوەڕۆ لەسەر مێزی نانخواردنەکە ئامادە بوو. هیچ شتێکیش دەربارەی تەلەفون نەکردنی لە ماڵی یۆرونەوە باس نەکرا.
پاش نانخواردن، سۆفیا ویستی سەرخەوێک بشکێنێت. دانی پێدا نا کە لە ماڵی یۆرون زۆر کەم خەوتووە، بەڵام ئەوەش شتێکی ئاسایی و باو بوو کاتێک کە لە ماڵی یۆرون دەمایەوە.
پێش ئەوەی بخەوێت تەماشایەکی ئاوێنە زیوینیەکەی کرد. یەکەمجار تەنها دەموچاوە بێڕەنگ و هیلاکەکەی خۆی دی. بەڵام پاشان... لە پڕێکدا لە پشت دەموچاوی خۆیەوە، سیمای دەموچاوێکی تر بە تەڵخی دەرکەوت. سۆفیا هەتا دەیتوانی بە هێواشی هەناسەی هەڵدەکێشا. دەبوایە بە هێمنی و ئارامی بمایەتەوە.
زۆر بە ڕوونی سیمای بێڕەنگی خۆی دەدی، کە بە قژە ڕەشەکەی چواردەوری گیرابوو. ئەو قژە لوسەی کە تەنها سروشت دەیتوانی بۆی دابهێنێت. بەڵام لە ژێر دەموچاوی خۆیەوە وێنەی کچێکی تری تێدا بوو.
لە پڕێکدا کچەکەی تر بەو پەڕی ووزەوە هەردوو چاوی بەیەکەوە داگرت. لەوە دەچوو نیشانی بدات کە بە ڕاستی لەناوەوەدایە و بوونی هەیە. هەمووشی تەنها چەند چرکەیەکی خایاند و پاشان بزربوو.

سۆفیا لەسەر جێگاکەی دانیشت. هیچ گومانێکی لە دڵدا نەبوو، ئەو سیمایەی کە بینی هیلدە بوو. لەوەوپێش لە کوخەکەی مێجەردا ، بۆ ماوەی چەند چرکەیەک وێنەیەکی ئەوی لەسەر پێناسی قوتابخانەکە بینی. کچەکەی ناو ئاوێنەکەش هەمان سیمای هەبوو، هەمیش ئەو کاتانەی کە زۆر هیلاک دەبوو، ئەو جۆرە شتانەی بەسەردا دەهات... سەیر نیە؟ هەمیشەش لە کۆتایدا بە ناچاری دەیگوت؛ بڵێیت ئەمەش تەنها فەنتاسیای خۆم نەبێت؟

سۆفیا جلەکانی لەسەر کورسیەکە دانا و خۆی خزاندە جێگاوە. یەکسەر خەوی لێکەوت و خەونێکی سەیر و ئاشکرای بینی.

لە خەونیدا لە باخچەیەکی گەورەدا وەستابوو، کە بەسەر خانەیەکی سووری کەشتی ڕاگرتندا دەیڕوانی. لەسەر پردی میناکە، کچێکی قژ زەرد دانیشتبوو و تەماشای ئاوەکەی بەردەمی دەکرد. سۆفیا بەرەو ڕووی ڕۆیشت و لەتەنیشتیەوە دانیشت. بەڵام لەوە دەچوو کە کچەکەی تر هەست بەوە نەکات کە سۆفیا لەوێدایە... سۆفیا خۆی پێ ناساند؛ «من ناوم سۆفیایە». بەڵام لەوە دەچوو کچەکەی تر نە بیبینێت و نە گوێشی لە دەنگی بێت. ئەوجا سۆفیا گوتی؛ «لەوانەیە کەڕ و کوێر بێت». کچەکەش بە ڕاستی لە ئاستی قسەکانی سۆفیادا کەڕبوو. لە پڕێکدا سۆفیا گوێی لە دەنگێک بوو کە هاواریکرد و گوتی؛ «هیلدە گیان!» کچەکە یەکسەر لەسەر پردی میناکە هەستا و بەرەو خانووەکە کەوتە ڕێ. کەواتە نە کوێرە و نە کەڕیشە! لە خانووەکەوە پیاوێکی تەمەن مام ناوەندی، بە جلوبەرگە ڕەسمەیەکەی بەری و کڵاوە شینەکەی سەریەوە بەرەو ڕووی کچەکە ڕایکرد. کچەکە دەستی کردە ملی پیاوەکە و ئەویش چەند جارێک باوەخولەی پێکرد. دواتر سۆفیا لەسەر پردەکەدا، لەو جێگایەی کچەکەی لێ دانیشتبوو، چاوی بە

زریزەیەک کەوت کە خاچێکی ئاڵتونی پێوە بوو. هەڵیگرت و خستیە مشتیەوە... پاش ئەوە ئیدی خەبەری بووەوە.
سۆفیا تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد، دوو سەعاتێک خەوتبوو، ئەوجا لەسەر جێگاکەی دانیشت و بیری لە خەونە سەیرەکەی دەکردەوە. خەونەکەی هێندە بەهێز و ڕوون بوو، وای هەست دەکرد بە ڕاستی هەمووی بەسەردا هاتبێت. سۆفیا دڵنیابوو کە خانوو و پردەکەی ناو خەونەکەی لە شوێنێکدا بە ڕاستی هەن... زیاتر لەوێنەی ناو کوخەکەی مێجەر دەچوو. هەرچۆنێک بێت دڵنیابوو کچەکەی ناو خەونەکەی هیلدە میوللە کنەی بوو. پیاوەکەش باوکی بوو و لە لوبنانەوە هاتبووەوە. لە خەونەکەیدا کەمێک لە ئەلبێرتۆ دەچوو...
سۆفیا لە جێگاکەیدا هاتە دەرەوە و خەریکی ڕێکخستنی جێگاکەی بوو. لەژێر سەرینەکەیدا چاوی بە زریزەیەکی ئاڵتونی کەوت، کە خاچێکی پێوە بوو. لە پشتی خاچەکەوە هەرسێ پیتی «ه.م.ک» هەڵکەندرابوون.
ئەمە یەکەم جار نەبوو سۆفیا لە خەونیدا شتێکی بە نرخ بدۆزێتەوە، بەڵام ئەمە یەکەمین جارە کە خەبەری ببێتەوە و بە ڕاستی بیبینێت. بەسەرسوڕمانەوە هاواری کرد؛
ـ مەحاڵە!
لە توڕەیدا دۆڵابەکەی کردەوە و زریزەکەی فڕێدایە لای دەسڕە ئاوریشمی و گۆرەوی و پۆستکارتەکانی لوبنانەوە.

بۆ بەیانی یەک شەممە، دایکی نانێکی بەیانی خۆشی ئامادەکردبوو. نانی گەرم و هێلکە و شەربەتی پرتەقاڵی لە سەر مێزەکەدانابوو. دواتریش سۆفیای خەبەرکردەوە. کەم ڕێدەکەوت دایکی لە ڕۆژی یەک

شەممامندا لە پێش سۆفیادا هەڵبسێت. بەڵام ئەو جارانەی زووتر خەبەری دەبووەوە، خواردنێکی خۆشی ئامادە دەکرد، ئەوجا سۆفیای بەخەبەردەهێنایەوە.
لە کاتی نانخواردندا دایکی گوتی؛
- سەگێکی نەناسراو لەناو باخچەکەدایە. بەدرێژایی پێش نیوەڕۆ بەردەوام بەدەوری پەرژینە کۆنەکەدا دەخولێتەوە. خەیاڵت بۆ هیچ شتێک دەچێت کە بۆی هاتبێت؟
- بەڵێ! سۆفیا وەڵامی دایەوە و لە هەمان کاتیشدا گازی لە لێوی خوارەوەی گرت.
- لەوەوپێش هاتووە بۆ ئێرە؟
سۆفیا چووە لای پەنجەرەکەوە و تەماشایەکی باخچە گەورەکەی کرد. ڕێک وەک ئەوە بوو کە بیری لێدەکردەوە؛ هێرمس لە بەردەم دەرگا نهێنیەکەی پەرژینە کۆنەکەدا پاڵکەوتبوو.
چی بڵێت؟ فریا نەکەوت بیر لە هیچ شتێک بکاتەوە، دایکیشی خێرا گەیشتە سەری و لەلایەوە وەستا.
- گوتت لەوەوپێش هاتووە بۆ ئێرە؟
- لەوانەیە ئێسقانێکی شاردبێتەوە و ئێستاکەش گەڕابێتەوە سەری. سەگیش دەتوانێت شتی لە یادبێت...
- لەوانەیە وابێت. لە ماڵەکەدا تۆ پزیشکی دەروونی ئاژەڵانیت.
سۆفیا بەباشی بیری کردەوە و ئەوجا گوتی؛
- دەیگەیەنمەوە ماڵەوە.
- کەواتە دەزانی لە کوێ دەژی؟
سۆفیا شانێکی هەڵتەکاند و گوتی؛
- بێگومان ناونیشانەکەی لەسەر پەتەکەی ملی نووسراوە .

پاش چەند خولەکێک سۆفیا خۆی گەیاندە ناو باخچەکە. هێرمس هەر کە چاوی پێکەوت، بەڕاکردن بەرەوڕووی ڕایکرد، کلکی بۆ ڕاوەشاند و بە چواردەوریدا سەمای دەکرد.

ـ ئافەرین، سەگە زیرەکەکە.

سۆفیا دەیزانی دایکی لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەکات. خۆزگەی دەخواست سەگەکە بەرەو کوخە نهێنییەکە نەڕوات! بەڵام سەگەکە بەرەو ڕاڕەوە چەوینەکە ڕایکرد، باخچەکەی بڕی و بەسەر دەرگاکەیدا خۆی هەڵدا.

پاش ئەوەی سۆفیا دەرگاکەی لەپاش خۆی داخست، هێرمس ڕێگای گرتە بەر و بەردەوام یەک دوو هەنگاو لە پێش سۆفیاوە دەڕۆیشت. ئەوجا چووە سەر کۆڵانە دوور و درێژەکەی ڤێلاکان. سۆفیا و هێرمس لە پیاسەی یەک شەممەیاندا تەنها نەبوون. چەندەها خێزانی تریش هاتبوونە دەرەوە و پیاسەیان دەکرد، سۆفیاش کەمێک بەخیلی پێدەبردن.

جارجارێک هێرمس دەڕۆیشتە لای سەگێکی ترەوە و بۆنی پێوە دەکرد، یان بۆ شتێک بەرەو قەراخی ڕێگاکە دەڕۆیشت، بەڵام هەر کە سۆفیا پێی دەگوت «وەرەوە شوێنی خۆت!»، یەکسەر دەگەڕایەوە لای سۆفیا.

پاش کەمێک بەلای پشتێرێک و گۆڕەپانێکی وەرزشی گەورە و شوێنێکی یاریکردنی منداڵاندا ڕۆیشتن. ئەوجا هاتنە سەر شوێنێکی قەرەباڵختر و بەناو شەقامێکی پاندا تێپەڕین، پردێکی شەمەنەفەری بەسەرەوە بوو، پاشان بەرەو شار شۆڕبوونەوە.

هەر کە گەیشتنە ناو شار، هێرمس بە گۆڕەپانە گەورەکەدا تێی تەقاند و بەرەو شەقامی کڵێسە کەوتە ڕێ. گەیشتنە گەڕەکە کۆنەکەی

شار، لەوێدا پڕبوو لەو بینایانەی لە سەدەی پێشوودا دروستکرابوون. کاتژمێر لە یەک و نیو نزیک دەبووەوە.
ئێستاکە لەوپەڕی شاردا بوون. سۆفیا بەدەگمەن ڕێی دەکەوتە ئەوێ، بەڵام یەک جار لەوەوپێش لە کاتی منداڵیدا لە یەکێک لەو شەقامانەدا سەردانی پورێکی پیری کردبوو.
لە کۆتایدا گەیشتنە گۆڕەپانە چکۆلەکەی نێو خانووە کۆنەکانی شار. هەرچەندە هەموو شتێکی ئەو ناوە کۆن بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێیان دەگوت «گۆڕپانی نوێ». لە ڕاستیدا شارەکە خۆی کۆن بوو و تەمەنی دەگەڕایەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست.
هێرمس بەرەو بینای ژمارە چواردە ڕۆیشت و لەوێدا وەستا، چاوەڕوانی سۆفیا بوو دەرگاکە بکاتەوە. سۆفیاش تەواو شەکەت بوو بوو.
لە ناو دالانی بیناکەدا سۆفیا دەستەیەک سندوقی پۆستی سەوزی بینی. لە ڕیزی خواری خوارەوەدا، بەیەکێک لە سندوقەکانەوە چاوی چووە سەر پۆستکارتێک. پۆستەچیەکە تێبینیەکی لەسەر کارتەکە نووسیبوو؛ «ناونیشانەکە نەناسراوە». ناونیشانی سەر کارتەکەش؛ «هیلدە میوللە کنەی، ژمارە چواردەی گۆڕەپانی نوێ»ی لێ نووسرابوو... مۆری پازدەی شەشی لێدرابوو، هێشتام زیاتر لە دوو هەفتەی مابوو بۆ ئەو بەروارە، بەڵام وادیارە پۆستە چیەکە بەهەڵەدا چووە.
سۆفیا کارتەکەی لێکردەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوە؛

ئازیزم هیلدە؛ ئێستاکە سۆفیا دێتە ماڵی مامۆستای فەلسەفەکەوە. بەم زوانە تەمەنی ئەو دەبێتە پانزە ساڵ، بەڵام تۆ دوێنێ بوویتە پانزە ساڵ هیلدە گیان... یان ئەمڕۆ دەبیت؟ ئەگەر ئەمڕۆیە، ئەوا

بەلایەنی کەمەوە ئێستاکە دەبێت ئێوارە درەنگانێک بێت لای ئێوە، خۆت دەزانیت کاتژمێرەکانمان وەک یەک ڕانابوورن. نەوەیەک پیر دەبێت و نەوەیەکی تر سەر دەردەهێنێت، مێژووش لە نێوان کاتەکانیاندا بە ڕێڕەوی خۆیدا دەڕوات. هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە کە مێژووی ئەوروپا دەکرێت لەگەڵ ژیانی مرۆڤێکدا بەراوردبکرێت؟ سەدە کۆنەکان بەرامبەر منداڵی ئەوروپا دەوەستێتەوە، ئەوجا سەدە درێژەکانی ناوەڕاست دێت —ئەوەش ڕۆژی درێژی قەتابخانەی ئەوروپایە. ئەوجا ڕێنیسانس دێت! لەوێدا ڕۆژی درێژی قوتابخانە کۆتایی پێدێ و ئەوروپای گەنج بەوپەڕی کوڵپی خۆشی و بێ ئارامیەوە، خۆی فڕێ دەداتە باوەشی بوونەوە. لەوانەیە بتوانین بڵێین ڕێنیسانس جەژنی لەدایک بوونی پانزە ساڵەی ئەوروپایە. کچە شیرینەکەم، ئێستاکە ناوەڕاستی مانگی شەشە —چەندە خۆشە لەم کاتەدا بوونمان هەیە و ژیانیش چەندە شیرینە!
تێبینی؛ پێم ناخۆشبوو کە خاچە ئاڵتونیەکەت ونکردوە. لە ئێستا بەدواوە ئیتر دەبێت فێر بیت پارێزگاری شتەکانت بکەیت!
خۆشەویستی زۆری بابە —کە کاتی هاتنەوەی بۆماڵەوە نزیک بۆتەوە.

هێرمس بەسەر پلیکانەکاندا هێدی هێدی سەردەکەوت، سۆفیاش پۆستکارتەکەی هەڵگرت و دوای کەوت. بۆ ئەوەی پێیبگاتەوە، ناچابوو بە ڕاکردن دوای بکەوێت؛ ئەو زۆر بە دڵخۆشیەوە کلکی بەملاولادا ڕادەوەشاند. قاتی یەکەم و دووهەم و سێهەم و چوارەمیان بڕی، ئەوجا گەیشتنە سەر پلیکانەیەکی باریک. بڵێیت بەرەو سەربانی بیناکە بڕوات؟ هێرمس بەسەر پلیکانە بچکۆلەکاندا سەرکەوت. لە کۆتایدا

لەبەردەم دەرگایەکی تەنگدا وەستا و بە نینۆکەکانی چنگی لە دەرگاکە گرت.
پاش کەمێک سۆفیا گوێی لە دەنگی پێی کەسێک بوو، لە ناوەوەدا هێواش هێواش لە دەرگاکە نزیک دەبووەوە. دەرگاکە کرایەوە و ئەلبێرتۆ کنۆکس دەرکەوت. ئەمڕۆ جلوبەرگێکی تری پۆشیبوو؛ جوتێ گۆرەوی سپی و پانتۆڵێکی سووری فشەڵ و چاکەتێکی زەردی فشی لەبەردابوو. بەلای سۆفیاوە بەم جلوبەرگەیەوە لە جۆکەری یاری کاغەز دەچوو. بەڵام ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبێت، ئەوە جلوبەرگی سەردەمی ڕێنیسانس بووە .
ـ لە قۆشمەبازی سێرک دەچیت! سۆفیا ئەوەی گوت و بە هێواشی پاڵێکی پێوەنا، هەتا بتوانێت بڕواتە ژوورەوە.
جارێکی تریش مامۆستا هەژارەکەی کردە قوربانی تێکەڵەیەک لە ترس و شەرمی خۆی. پۆست کارتەکەی خوارەوە مێشکی ورووژاندبوو.
ـ یەکجار واش نا کچەکەم، هێمن بە. ئەلبێرتۆ ئەمەندەی گوت و دەرگاکەی لەپاش خۆی داخست.
ـ فەرموو، ئەمە پۆستی ئەمڕۆیە؛ سۆفیا بەجۆرێک کارتەکەی دایە دەست، وەک ئەوەی ئەو بەرپرسیاربکات.
ئەلبێرتۆ کارتەکەی خوێندەوە و سەرێکی ڕاوەشاند .
ـ بە ڕاستی خەریکە بێ شەرم دەبێت. خەریکە دەمانکاتە مەزەیەکی خۆشی جەژنی لەدایک بوونی کچەکەی.
هێندەی گوت و کارتەکەی بەلەت و پەتکراوی فڕێدایە ناو تەنەکەی خۆڵەکەوە. ئەوجا سۆفیا گوتی؛
ـ نووسیویەتی هیلدە خاچێکی ئاڵتونی ونکردوە.
ـ بەڵێ خوێندمەوە.

- منیش ڕێک هەمان خاچم لە ماڵی خۆماندا لەناو جێگاکەمدا دۆزیەوە. دەتوانیت بۆم ڕوونکەیتەوە کە چۆن گەیشتە ئەوێ؟
بۆ ماوەیەکی دور و درێژ تەماشای چاوەکانی سۆفیای کرد؛
- لەوانەیە سەیر بێتە پێش چاوت، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها فێڵکردنێکی چەپەڵە و کردنی شتێکی ئاوها بۆ ئەو هیچی تێ ناچێت. بەهەرحاڵ با لەبری ئەوە سەرنج بدەینە کەروێشکە گەورەکەی کە لە کڵاوە درێژەکەی گەردوونەوە دەهێنرێتە دەرەوە.

پاشان ڕۆیشتنە ژووری دانیشتن. سۆفیا هەرگیز لە ژیانیدا ژوورێکی هێندە سەیری نەدیبوو.
ئەلبێرتۆ لە ئەپارتمانێکی سەری سەرەوەدا دەژیا و شوێنەکەی سەربانێکی لاری هەبوو. ڕووناکی تیژ ڕێک لە ئاسمانەوە بە ناو پەنجەرەکاندا دەهاتە ژوورەوە. بەڵام پەنجەرەیەکی تریشی هەبوو کە بەسەر شارەکەدا دەیڕوانی. سۆفیا لەو پەنجەرەیەوە دەیتوانی سەربانی هەموو خانووە کۆنەکانی شار ببینێت.
بەڵام سەرنجڕاکێشەرترین شت بەلای سۆفیاوە، هەموو ئەو شتانە بوون کە لە ژوورەکەدا دانرابوون. ژوورەکە پڕبوو لە کەلوپەل و قەنەفە، تەمەنی هەر یەکەیان بۆ قۆناغێکی جیاوازی مێژوو دەگەڕایەوە؛ قەنەفەیەکی ساڵی سیەکان، مێزێکی نووسین کە دەگەڕایەوە بۆ سەدەی نۆزدە، هەروەها یەکێک لە کورسیەکان تەمەنی چەند سەد ساڵێک دەبوو. بەڵام تەنها قەنەفە و کورسیەکان سەیر نەبوون، بەڵکو لەسەر ڕەفە و تاقەکانیش چەندەها شتی کۆن و نوێ دانرابوون؛ گۆزە، کاتژمێری کۆن، دەسکەوان، شوشەی ملخوار، چەقۆ، بووکە شوشە، پەڕی نووسین، ئامێری هەمەڕەنگ، قیبلەنوما و بارۆمیتەر. یەک دیواری

ڕێکیش بە کتێب داپۆشرابوو. بەڵام نەک وەک ئەو کتێبانەی لە کتێبخانەکاندا بەرچاو دەکەون. کتێبە کۆکراوەکان، وەک بەرهەمی گەنجینەی کتێبی چەند سەدەیەک وابوو. بە دیوارەکانی تریشەوە، چەندین تابلۆ و هێڵکاری هەڵواسرابوون. هەندێکیان هونەری نوێ بوون و هەندێکی تریشیان یەکجار کۆن دەهاتنە پێش چاو. جگە لەوانەش چەند نەخشەیەکی کۆن بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون. لەیەکێک لە نەخشەکاندا شوێنی چەند شارێک بە ئاوەژوویی دانرابوون.

سۆفیا بۆ ماوەی چەند خولەکێک بە پێوە وەستابوو بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بڵێت. تەنها سەیری چواردەورەکەی دەکرد، ئەوجا کە چاوی بە هەموو سوچێکی ژوورەکەدا خشاند، گوتی؛

ـ چەندە شتی کۆنی بێمانات کۆکردۆتەوە.

ـ بەڵام بیر لەو چەند سەدەیەی مێژووەش بکەرەوە کە لەم ژوورەدا پارێزراوە. من پێم خۆش نیە ناوی بنێم «بێ مانا».

ـ دوکانی ئەنتیک... یان شتێک لەو بابەتەت هەیە؟

ئەمجارەیان کەمێک خەمباری لەسەر دەموچاوی ئەلبێرتۆ دەرکەوت و گوتی؛

ـ ناکرێت هەروا بەئاسانی ڕێگەبەین ڕووباری مێژوو لەگەڵ خۆیدا بمانبات سۆفیا. کەسانێک دەبێت بوەستن و هەوڵی کۆکردنەوە و پاراستنی ئەو شتانە بدەن کە لە قەراغی ڕووبارەکەدا جێدەمێنن.

ـ بە جۆرێکی سەیر دەڕوانیتە شتەکان.

ـ بەڵێ، بەڵام لە ڕاستیشدا بەو جۆرەیە. ئێمە تەنها لە کاتی خۆماندا ناژین، بەڵکو مێژووشمان لەگەڵ خۆماندا هەڵگرتووە. گرنگە ئەوەندە بزانیت کە هەموو شتێکی ئەم ژوورە ڕۆژێک لە ڕۆژان تەواو نوێ بوون

و دەدرەوشانەوە... لەسەدەی شانزەدا ئەو بووکە شوشەیە بۆ دیاری پێنج ساڵەی کچێک دروستکراوە. لەوانەیە بەدەستی باپیرە گەورەیەکی دروستکرابێت، سۆفیا... پاشان کچەکە بۆتە هەرزەکار و گەورەتر بووە و شوویکردوە. دواتر لەوانەیە خۆی کچێکی بووبێت و وەک میراتیەک پێی بەخشیبێت. ئەوجا پیربووە و ڕۆژێک لە ڕۆژان مردووە. بێگومان ژیانێکی دورودرێژ ژیاوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەمردن کۆتایی هاتووە، هەرگیزیش لەوێوە ناگەڕێتەوە. لەبنەڕەتدا تەنها سەردانێکی کورتی ژیانی کردووە، بەڵام بووکە شوشەکەی... بەڵێ، ئەوەتا لەناو ئەو تاقەدایە.

ـ کە لەم ڕوانگەیەوە باس لە شتەکان دەکەیت، هەموو شتێک ناخۆش و خەمگین دێتە پێش چاو.

ـ بەڵام لە ڕاستیدا ژیان هەم ناخۆشیشە و هەم خەمگینیشە. ئێمە دەهێنرێینە ناو ژیانێکی جوانەوە، بەیەکتری دەگەین و یەکتر دەناسین... بۆ ماوەیەکی کەم ڕێگایەک پێکەوە دەبڕین. پاشان هەر بە هەمان شێوەی نارەوایی و بە هەمان خێرایی یەکەمجار کە هاتینە ناو دونیاوە، لەیەکتر دور دەکەوینەوە و ون دەبین.

ـ دەتوانم پرسیارێکت لێبکەم؟

ـ چیتر چاوشارکێ لەگەڵ یەکتردا ناکەین سۆفیا!

ـ بۆچی گواستتەوە بۆ کوخەکەی مێجەر؟

ـ بۆ ئەوەی هێندە لەیەک دور نەبین. لەو کاتەدا تەنها لە ڕێگەی نامەوە یەکتریمان دەدوان، لەهەمان کاتیشدا دەمزانی کوخەکە کەسی تێدا ناژی.

ـ تۆش هەروا بە ئاسانی گواستتەوە؟

ـ بەڵێ، هەروا بە ئاسانی گواستمەوە.

ـ ئەی باوکی هیلدە لە کوێوە بەوەی زانی، دەتوانیت ئەوەم بۆ ڕوون بکەیتەوە؟
ـ پێم وابێت ئەو زۆربەی شتەکان دەزانێت.
ـ تێناگەم چۆن وا لە پۆستە چیەکە دەکات کە نامەکان بگەیێنێتە ناو قوڵایی دارستانەکە؟
ئەلبێرتۆ وەک مرۆڤێکی دوربین دەستی بە پێکەنین کرد؛
ـ باوکی هیلدە ئەو جۆرە کارانەی زۆر بە ئاسانی بۆ هەڵدەسوڕێت. ئەو شتانە تەنها کارێکی چەپەڵی جادووگەرانەیە و هیچی تر. لەوانەیە من و تۆ لە ژێر سەختترین چاودێریدا بین.
سۆفیا لە تورەیدا گوتی؛
ـ ئەگەر بەرێکەوت بیبینم، هەردوو چاوی دەردەهێنم!
ئەلبێرتۆ بەرەو قەنەفەکە ڕۆیشت و دانیشت. سۆفیاش بەدوایدا لەسەر کورسیەکی باش جێگەی خۆی کردەوە. پاشان ئەلبێرتۆ گوتی؛
ـ تەنها فەلسەفە دەتوانێت لە باوکی هیلدەمان نزیک بکاتەوە... ئەمڕۆ باسی ڕێنیسانست بۆ دەکەم.
ـ کەواتە با دەست پێبکەین.
ـ پاش ڕابووردنی چەند ساڵێک بەسەر تۆماس ئەکویناسدا، کەلتوری مەسیحی بەرە بەرە بەش بەش بوو. فەلسەفە و زانست زیاتر و زۆرتر خۆیان لە تیۆلۆژی ئاینی مەسیحی جیادەکردەوە. وەک ئەنجامێکی ئەمەش، ژیانی ئاینی پەیوەندیەکی ئازادتری لەگەڵ ژیرێتیدا وەدەست کەوت. خەڵکیش هێواش هێواش، زیاتر و زۆرتر بڕوایان بەوە دەکرد کە مرۆڤ ناتوانێت لە ڕێگەی ئەقڵەوە لە خودا نزیک ببێتەوە. لەبەرئەوەی مرۆڤ بە هیچ جۆرێک لە ڕێگەی بیرکردنەوەوە ناتوانێت لە خودا تێبگات. لەم ڕوانگەیەشەوە تێگەیشتن لە نهێنی ئاینی

مەسیحی گرنگ نەبوو، بەڵکو خۆ خستنە ژێر ویستی خواوە بەلایانەوە گرنگتر بوو.

- تێدەگەم.

- ئازادبوونی پەیوەندی نێوان ژیانی ئاینی و زانست، لەلایەکەوە میتۆدێکی زانستی نوێی خوڵقاند و لەلایەکی تریشەوە بڕوایەکی ئاینی نوێی هێنایە کایەوە. بەم جۆرەش بنچینەی دوو وەرچەرخانە گرنگەکانی سەدەکانی پانزە و شانزە دامەزرێنرا، واتە ڕێنیسانس و چاکسازی.

- یەکە یەکە باسی ئەو دوو وەرچەرخانانە دەکەین، وانیە؟

- مەبەستمان لە ڕێنیسانس ئەو سەرهەڵدانە کەلتوریە مەزنەیە کە لە کۆتایی سەدەی چواردەدا دەرکەوت. لە باکوری ئیتالًیاوە دەستی پێکرد، بەڵام بە خێرایی لە سەدەکانی پانزە و شانزەدا بەرەو باکور تەشەنەی کرد.

- تۆ نەتگوت «ڕێنیسانس» مانای «لەدایک بوونەوە» دەبەخشێت؟

- بەڵێ، ئەو شتەش کە لە دایک بووەوە هونەر و کەلتوری سەدەکانی کۆن بوو. لێرەدا بێگومان «مرۆڤ دۆستی ڕێنیسانس»یش دەگرێتەوە، لەبەرئەوەی لەپاش سەدە دور و درێژەکانی ناوەڕاست، کە هەموو لایەنەکانی ژیانیان لە ژێر ڕووناکی خوداییدا دەبینی، لە ڕێنیسانسدا دیسانەوە لە مرۆڤەوە دەستی پێکردەوە. گەڕانەوە بۆ «سەرچاوەکان»، وەک دروشمێک بەرزکرایەوە، بەپلەی یەکەمیش گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی مرۆڤ دۆستی سەدەکانی کۆن. زیندووکردنەوە و هێنانە پێشەوەی پەیکەر و دەستنووسەکانی سەدە کۆنەکان، زیاتر وەک وەرزشێکی نەتەوەیی تەماشا دەکرا. فێربوونی زمانی یۆنانیش، بووبە حاڵەتێکی باوی سەردەم، ئەمەش سەرلەنوێ زەمینەیەکی بۆ خوێندنی

کەلتوری یۆنانی کردەوە. خوێندنی هیومانیزمی (مرۆڤدۆستیی) یۆنانیش بە تایبەتی ئامانجێکی پەروەردەیی هەبوو. جگە لەوەش خوێندنی بابەتی هیومانزمی «پەروەردەی کلاسیکی» هێنایە ئاراوە وە گەشەی بە لایەنێکی تایبەتی دا کە دەتوانین ناوی «خاسیەتی مرۆڤی» لێ بنێین. ئەوان دەیانگوت؛ «ئەسپەکان ئەسپیان دەبێت، بەڵام مرۆڤ مرۆڤی نابێت، بەڵکو مرۆڤ دەبێت پەروەردەبکرێت.»

ـ مەبەستت ئەوەیە بە پەروەردەکردن دەبینە مرۆڤ؟

ـ بەڵێ، بەو جۆرە بیریان دەکردەوە. بەڵام پێش ئەوەی بێینە سەر باسکردنی بیری مرۆڤدۆستی ڕێنیسانس، پێم خۆشە کەمێک دەربارەی ڕابووردوی ڕامیاری و کەلتوری ڕێنیسانس بدوێم.

ئەلبێرتۆ لەسەر کورسیەکە هەستا و بە ژوورەکەدا دەگەڕا. پاش کەمێک پەنجەی بۆ ئامێرێکی زۆر کۆن ڕاکێشا و پرسی؛

ـ ئەوە چیە؟

ـ لە قیبلەنومایەکی کۆن دەچێت؟

ـ زۆر ڕاستە.

ئەوجا پەنجەی بۆ تفەنگێکی کۆن ڕاکێشا، کە بەدیواری سەر قەنەفەکەوە هەڵواسرابوو.

ـ ئەی ئەوە چیە؟

ـ تفەنگێکی سەردەمی کۆنە.

ئەلبێرتۆ کتێبێکی گەورەی لە کتێبخانەکەدا دەرهێنا و گوتی؛

ـ ئەمە کتێبێکی کۆنە. وردتریش پێی دەگوترێت «ئینکونەیبڵ Incunabel».

ـ ئینکونەیبڵ چیە؟

- لە بنەڕەتدا مانای «سەردەمی مندالّی» دەبەخشێت، بەڵام وشەکە بەو کتێبانە دەگوترێت کە لە سەرەتای هونەری چاپکردنی کتێبدا چاپکراون. واتە پێش ساڵی 1500.
- بە ڕاستی هێندە کۆنە؟
- بەڵێ، هەر ئەو سێ شتەش، کە کەمێک لەمەوبەر باسمانکرد – قیبلەنوما و تفەنگ و چاپکردنی کتێب- بنچینەی گرنگی ئەو سەردەمە نوێیە دەنوێنن کە پێی دەڵێن ڕێنیسانس.
- دەتوانیت کەمێک زیاتر باسیان بکەیت؟
- کەشتیوانی بەهۆی قیبلەنوماوە ئاسانتر بوو. یان بەشێوەیەکی تر بیڵێین؛ قیبلەنوما بنچینەیەکی گرنگی گەشتی دۆزینەوەکان بوو. باڕووتیش بە هەمان شێوە... ئەوروپیەکان بەهۆی چەکە نوێکانەوە، لەلایەنی سەربازیەوە لە کەلتوری ئەمریکی و ئاسیایی باشتربوون. جگە لەمەش تەنانەت لەناو ئەوروپاشدا باڕووت ڕۆڵێکی گرنگی دەبینی. گرنگی هونەری چاپکردنیش یاریدەی بڵاوبوونەوەی بیری نوێی دەدا، ئەو بیرەی لەگەڵ هیومانیزمی ڕێنیسانسدا سەری هەڵدا. ئەم بڵاوبوونەوەیەش وای لە کڵێسە کرد کە دەست لە مۆنۆپۆڵە کۆنەکەی هەڵگرێت، چونکە تا ئەو کاتە وەک خاوەنێکی تەنهای زانست خۆی دەبینی. پاشانیش داهێنانی ئامێری جۆراوجۆر هاتە ئاراوە. تەلیسکۆبیش یەکێک بوو لەو ئامێرە هەرە گرنگانە و گوڕێکی مەزنی بە زانستی ئەستێرەناسی دا.
- دوا جاریش موشەک و کەشتیە ئاسمانیەکان داهێنران؟
- نەخێر، هێندە بەپەلە ڕووی نەدا. دەتوانین بڵێین ڕێنیسانس پڕۆسەیەکی وای دەست پێکرد کە پاشان مرۆڤی گەیاندە سەر مانگ. یان لەلایەکی ترەوە مرۆڤی گەیاندە هێرۆشیما و تشێرنۆبڵ. بەڵام

هەموو ئەمانە لە پاش زنجیرەیەک گۆڕانکاری یەک لەدوای یەکی بارودۆخی کەلتوری و ئابووریدا ڕوویاندا. یەکێک لەو گۆڕانە گرنگانە، گۆڕانی ئابووری خێزانی بوو بۆ ئابووری پارەیی (*نەقدی.و)... لەگەڵ کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا کۆمەڵێ شاری گەورە دروستبوون، کە پڕبوون لە کرێکاری لێهاتوو و بازرگانی شمەکی نوێ و ئابووری پارەیی و ڕێکخراوی بانکی. هێدی هێدیش چینێکی بۆرژوا سەریهەڵدا، کە تا رادەیەک بەهۆی کارەکەیەوە، لە دەسەڵاتی سروشتی ئازادبوو. هەموو پێداویستیەکی ژیانیش دەکرا بە پارە بکڕێت. ئەم گەشە کردنەش لەلایەکەوە بووە هۆی پێشخستنی هەوڵ و فەنتاسی و توانای تاکەکەس، لەلایەکی تریشەوە فشاری نوێی خستە سەر.
ـ کەمێک لە چۆنیەتی سەرهەڵدانی شارە یۆنانیەکان دەچێت، کە بەر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر ڕوویدا.
ـ بەڵێ تێبینیەکی جوانە. لەوەوپێش باسی فەلسەفەی یۆنانیم کرد و بۆم ڕوونکردیتەوە کە بە چ شێوەیەک خۆی لە تێگەیشتنی ئەفسانەیی جیهان ڕزگارکرد، ئەو تێگەیشتنەی کە بە کەلتوری لادێوە بەسترابووەوە. بە هەمان شێوەش بۆرجوازیەکانی سەردەمی ڕێنیسانس خۆیان لە دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی و هێزی کڵێسە ڕزگاردەکرد. لە هەمان کاتیشدا کەلتوری یۆنانی سەریهەڵدایەوە، ئەمەش بەهۆی تێکەڵبوونی بەهێزی عەرەبەکانی ئیسپانیا و کەلتوری بێزەنتینیەکانی ڕۆژهەڵاتەوە ڕوویدا.
ـ سێ ڕووبارە جیابووەوەکەی سەدەکانی کۆن، دیسانەوە دەڕژێنەوە ناو یەک ڕووباری گەورە.

- قوتابیەکی بە ئاگایت. بەڵام چیتر باسی ڕابووردوی ڕێنیسانس ناکەین. ئێستاکە دەمەوێت باسی ئەندێشە نوێکانی ئەو سەردەمەت بۆ بکەم .
- فەرموو دەست پێبکە، بەڵام دەبێت بۆ کاتی نانخواردن بگەڕێمەوە ماڵەوە.
ئەوجا ئەلبێرتۆ لەسەر قەنەفەکە دانیشتەوە و ڕێک تەماشای چاوانی سۆفیای کرد.
- بەر لە هەموو شتێکی تر ڕێنیسانس بینینێکی نوێی مرۆڤانەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. مرۆڤ دۆستەکانی ڕێنیسانس باوەڕێکی نوێیان بەرامبەر مرۆڤ و نرخی مرۆڤ لەلا گەڵاڵەبوو. بڕوایەک بەتەواوەتی دژی بۆچوونە نەگۆڕەکانی سەدەکانی ناوەڕاستبوو، کە هەمیشە لایەنی خراپی سروشتی مرۆڤیان دەبینی. بەڵام لە ڕێنیسانسدا مرۆڤ وەک شتێکی تەواو گەورە و بەنرخ تەماشا دەکرا. یەکێک لە کەسایەتیە گەورەکانی ڕێنیسانس ناوی «فیسینۆ Ficino» بوو. ئەو دەیگوت؛ «ئەی ڕەگەزی خودایی کە لە پێستی مرۆڤدا شاراویتەوە، خۆت بناسە!». لە هەمان بواریشدا «پیکۆ دیللا میراندۆلا Pico della mirandola» کتێبێکی بە ناونیشانی «گوتارنامەیەک دەربارەی نرخی مرۆڤ» نووسی. هەرگیز لە سەدەکانی ناوەڕاستدا شتێک لەم بابەتە دەرنەدەکەوت. بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست، هەموو ڕوانگەکانی مرۆڤ لە خوداوە سەرچاوەی وەردەگرت. بەڵام هیومانزمەکانی ڕێنیسانس دەگەڕانەوە سەر خودی مرۆڤ.
- بەڵام فەیلەسوفەکانی یۆنانیش هەمان شتیان دەکرد.
- زۆر ڕاستە. لەبەرئەوەیە کە باس لە "لەدایک بوونەوە"ی هیومانیزمی سەدەکانی کۆن دەکەین. بەڵام لە ڕێنیسانسدا، بە

بەراوردکردنی لەگەڵ سەدەکانی ناوەڕاستدا، زۆر بەهێزتر بایەخ بە تاکە کەسی "Individualism" دەدرا؛ ئێمە تەنها مرۆڤ نین، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا تاکە کەسی بێ وێنەشین. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش پێیدەچێت دەرگای بە بلیمەتبوون بکاتەوە. ئیدیال، بوو بەو شتەی کە پێی دەڵێن "مرۆڤی ڕێنیسانس"، واتە مرۆڤێک کە هاوبەشی هەموو لایەنە هونەری و زانستیەکانی ژیان دەکات. بینینی نوێی مرۆڤ، لە بایەخدانی بە ئەناتۆمی لەشی مرۆڤیشدا دەردەکەوت. هەر بەهەمان شێوەی سەدەکانی کۆن، دیسانەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەناتۆمی لەشی مرۆڤ دەکرد، بۆ ئەوەی بزانن لەشی مرۆڤ لە چی پێکهاتووە. ئەم کارەش هەم بۆ زانستی پزیشکی و هەم بۆ هونەریش گرنگ بوو. لە بواری هونەردا، دیسانەوە ئاسایی بوو گەر وێنەی لەشی ڕووت نیشان بدەن. دەتوانین بڵێین ئەم کارە پاش هەزار ساڵی شەرمکردن هاتەوە کایە. ئەوجا مرۆڤ جارێکی تر دەیوێرا خۆی ببێتەوە بە خۆی، چیتر هیچ شتێکیان نەبوو شەرمی لێبکەن.

ـ ئەم باسەت زیاتر وەک مەستبوون دێتە بەر گوێ، وا نیە؟

سۆفیا ئەمەی گوت و بەسەر مێزە چکۆلەکەی نێوان خۆی و مامۆستای فەلسەفەکەیدا، خۆی چەماندەوە.

ـ بێگومان... بینینی نوێی مرۆڤ، شێوازێکی ژیانی تەواو نوێی لەگەڵ خۆیدا هێنا. دەیانگوت مرۆڤ تەنها لەبەر خاتری خودا نەهاتۆتە دونیاوە، بەڵکو پێیان وابوو خودا مرۆڤی لەبەر خاتری خودی مرۆڤیش ئافەریدەکردبێت. واتە خودا دەیەوێت مرۆڤ چێژ لە کاتی ژیانی ئێستا و ئێرەیدا ببینێ. کاتێکیش دەرگای ڕزگاربوون و ئازادی تەواو لە مرۆڤ دەکرێتەوە، ئەوساکە خاوەنی بواری بێسنوور دەبێت. دیسانەوە ئەمەش، بە بەراوردکردنی لەگەڵ هیومانیزمی سەدەکانی

کۆندا، شتێکی نوێ بوو. هەروەک دەزانیت هیومانیزمی سەدەکانی کۆن دەیانگوت دەبێت مرۆڤ مێشکی ئارام بێت و هاوسەنگی نیشان بدات و خاوەنی سنووربەندی خۆی بێت.

ـ مەبەستت لەوەیە هیومانیزمی ڕێنیسانس سنووربەندی خۆیان لەدەستدا؟

ـ هەرچۆنێک بێت سنووری خۆیان زۆر دیاری نەکردبوو. زیاتر وا هەستیان دەکرد جیهان سەر لەنوێ لە پاش خەونێکی دورودرێژ خەبەری بووبێتەوە و تەواو بەئاگابوون لە قۆناخەکەیان. لەو کاتەدا بوو کە ناوی "سەدەکانی ناوەڕاست"یان بەکار دەهێنا، ئەوەش بۆ ئاماژەکردنی هەموو سەدانە بوو کە کەوتبوونە نێوان خۆیان و سەدە کۆنەکانەوە. لە هەموو لایەنێکەوە، گەشەکردنێکی مەزن لە سەرهەڵداندا بوو، بۆ نمونە؛ لە بوارەکانی هونەر و هەندەسەی بینا و ئەدەب و مۆسیقا و فەلسەفە و زانستدا. لێرەدا پێم خۆشە نمونەیەکی دیاریکراو بهێنمەوە؛ لەوەوپێش باسی شاری ڕۆمامان کرد، کە پێیان دەگوت "شاری شاران" و "ناوکی جیهان". لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا کەوت و لاوازبوو، لە ساڵی 1417دا ئەو شارە ملیۆنیە تەنها 17 هەزار دانیشتوانی مایەوە.

ـ ئەوەش نزیکەی ژمارەی دانیشتوانی لیللەساندە.

ـ بەڵام بەلای هیومانیزمی ڕێنیسانسەوە، بوژاندنەوە و دروستکردنەوەی ڕۆما، وەک ئامانجێکی کەلتوری و ڕامیاری تەماشا دەکرا. بەر لە هەموو شتێک لەسەر قەبرەکەی پیتەر، کڵێسە مەزنەکەی پیتەریان دروستکرد. بێگومان کاتێکیش باسی کڵێسەکەی پیتەر دەکرێت، ئەوا ناکرێت ناوی سنووربەندی بێتە ناو ناوانەوە. زۆربەی بیناساز و هونەرمەندانی گەورەی ڕێنیسانس لەو پڕۆژە

مەزنەدا بەشداریانکرد، کە لەو سەردەمەدا بە گەورەترین پڕۆژەی بیناسازی جیهانی لەقەڵەم دەدرا. لەساڵی 1506ەوە دەستیان بە کارکردن کرد و بە درێژایی 120 ساڵ بەردەوامبوون، پاشانیش 50 ساڵی تری پێچوو هەتاوەکو گۆڕەپانە گەورەکەی پیتەریان تەواوکرد.
ـ کەواتە دەبێت کڵێسەیەکی یەکجار مەزن بێت؟
ـ زیاتر لە 200 مەتر درێژیەتی و 130 مەتریش بەرزە، پانتاییەکەشی زیاتر لە 16 هەزار مەتر دوجا دەبێت. بەڵام با ئەمە وەک ئازایەتیەکی هیومانیزمی ڕێنیسانس تەماشابکەین. لەلایەکی تریشەوە، ڕێنیسانس "بینینێکی نوێی سروشت"ی لەگەڵ خۆیدا هێنا. خەڵکی هەستیان دەکرد بوونێکیان لە ژیاندا هەیە -واتە ژیانی سەر زەویان تەنها بەو شێوەیە نەدەبینی کە وەک خۆئامادەکردنێک بێت بۆ ژیانێکی ئاسمانی -ئەمەش خۆی لە خۆیدا جۆرە تێگەیشتنێکی نوێی بەرامبەر بە جیهانی مادی خوڵقاند. ئەوان بە شێوەیەکی گەشبینانە تەماشای سروشتیان دەکرد. زۆرینەی خەڵکیش لەو بڕوایەدابوون خودا لەناو سروشتدا بوونی هەبێت. بەم جۆرە تێگەیشتنەش دەگوترێت "پانتیزم ."Panteism لە کاتێکدا فەیلەسوفەکانی سەدەکانی ناوەڕاست جەختیان لەسەر بوونی بۆشاییەک دەکرد کە لە نێوان خودا و شتە خوڵقێنراوەکاندا هەیە. لە کاتی ڕێنیسانسدا دەیانگوت؛ سروشت خوایانەیە -بەڵێ، دەیانگوت "سروشت نیشانە و پیشاندانی خودایە". ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش هەمیشە بەلای کڵێسەوە بە چاوێکی بەخشندانەوە تەماشا نەدەکرا. چارەنووسی جیۆردانۆ برونۆ "Giordano Bruno"ش باشترین نمونەی دڵتەزێنی ئەو بابەتە دەخاتە ڕوو. ئەو نەک تەنها دەیگوت خودا بوونی لە سروشتدا هەیە،

بەڵکو لەو بڕوایەشدابوو کە گەردوون بێپایان بێت. لەسەر ئەوەش زۆر بە توندی سزایاندا.
- چۆن سزا درا؟
- لە ساڵی 1600 دا لە گۆڕەپانی گوڵی ڕۆمادا سوتاندیان...
- زۆر ترسناک و ... بێ ئەقڵیشە! ئەمەیە کە تۆ ناوی دەنێیت هیومانیزم؟
- نەخێر، برونۆ خۆی هیومانیست بوو، نەک جەلادەکانی. لە کاتی ڕێنیسانسدا، بزوتنەوەیەکی "دژ بە هیومانیزم"یش سەریهەڵدا. مەبەستیش لە دەسەڵاتی کڵێسە و هێزی دەوڵەتە. هاوکات لە سەردەمی ڕێنیسانسدا چەندەها پرۆسەی جادووگەری و هەڵخڵەتاندن و خورافیات و لادان لە ئاین و شەڕی ئاینیش نەشونمایکرد –بەتایبەت شەڕە خوێناویەکەی داگیرکردنی ئەمریکا. بەڵام هیومانیزم هەمیشە ڕابووردویەکی تاریکی هەر هەبووە. ئێمە هیچ قۆناخێکمان نیە کە هەمووی باشبووبێت یان هەمووی خراپ. خراپە و باشە وەک دوو پەت وان کە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی پێکەوە دەڕۆن. زۆرجاریش پێکەوە دەچنرێن. ئەمەش ڕێک بەسەر خاڵی داهاتوودا دەچەسپێ، کە ئێستاکە دێمە سەر باسی؛ ڕێنیسانس "میتۆدێکی نوێی زانستیانەشی" لەگەڵ خۆیدا هێنا.
- ئەو کاتەبوو کە یەکەمین کارگە دامەزرێنرا؟
- نەخێر، هێشتام بە تەواوەتی نا. بەڵام ڕێبازی نوێی زانستی، بواری پێشخستنی تەکنەلۆجی پاش ڕێنیسانسی هێنایە کایەوە. مەبەستم لە شێوە تێڕوانینێکی تەواو نوێی پێناسەکردنی زانستیە، بەڵام تەنها پاش ماوەیەک هێواش هێواش بەرهەمی ئەو میتۆدە نوێیە خۆی نیشاندا.

ـ نمونەی ئەو میتۆدە نوێیە لە چ شتێکدا دەبینرا؟
ـ بە پلەی یەکەم لە بەکارهێنانی هەستەکاندا دەبینرا، بە تایبەتیش لە بواری لێکۆڵینەوەی سروشتدا. هەر لە سەدەی چواردەوە خەڵکانێک هەبوون کە دژ بە بڕوای کوێرانەی دەسەڵاتدارە کۆنەکان بوون و لەم لایەنەوە خەڵکیان ئاگادار دەکردەوە. ئەو هێز و دەسەڵاتە کۆنانەش دەکرا هەم وانەکانی کڵێسە بێت و هەم فەلسەفەی سروشتی ئەریستۆتالیسیش بێت. لەو بڕوایەش دورەپەرێزبوون کە دەیگوت؛ دەکرێت گرفتێک تەنها بەهۆی بیرکردنەوەوە چارەسەربکرێت. ئەم جۆرە بڕوا زیادەڕۆییەش بە ئەقڵ، بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست گرنگی خۆی هەبوو. بەڵام لە ڕێنیسانسدا دەیانگوت؛ هەموو جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی سروشت دەبێت لەسەر چاودێریکردن و ئەزمون و تاقیکردنەوە بنیات بنرێت. ئێمە ناوی "میتۆدی ئیمپریکی "Empiric لەمە دەنێین.
ـ واتە؟
ـ واتە مرۆڤ زانستی خۆی دەربارەی شتەکان لەسەر ئەزمونی خۆی هەڵدەچنێت –نەک لەسەر ڕێگەی کۆن و خەیاڵ. ڕاستە لە سەدەکانی کۆنیشدا زانستیەکی ئیمپریکی دەناسرا، بەڵام تاقیکردنەوەی بە دەستور و بەرنامە شتێکی تەواو نوێ بوو.
ـ بەڵام وەک ئەمڕۆکە ئامێرە تەکنیکیەکانیان نەبوو، وا نیە؟
ـ بێگومان نە ئامێری ژماردن و نە تەرازوی ئەلەکترۆنیشیان هەبوو. بەڵام خاوەنی ماتماتیک و تەرازوی ئاسایی بوون. پاشان بە تایبەتی جەختیان لەسەر گرنگی چاودێریە زانستیەکان دەکرد کە بەزمانێکی ماتماتیکی ورد دەردەبڕان. گالیلۆ گالیلی "Galileo Galilei" کە بە گرنگترین زانای زانستی سەدەی هەڤدە دادەنرێت، دەیگوت؛ "پێوانەی

ئەو شتە بکە کە دەپێورێ، ئەو شتەش کە ناپێورێت، وای لێبکە کە بپێورێت". هەر ئەویش دەیگوت؛ "کتێبی سروشت بە زمانێکی ماتماتیکی نووسراوە."

- بە ئەنجامدانی ئەو هەموو تاقیکردنەوە و پێوانکاریەش، دەرگای داهێنانی نوێ کرایەوە، وا نیە؟

- قۆناخی یەکەم میتۆدێکی زانستی نوێ بوو، کە ڕێگای خودی شۆڕشی تەکنیکی کردەوە. پێشکەوتنی تەکنیکیش دەرگای لەسەر هەموو ئەو داهێنانانە کردەوە کە دواتر دۆزرانەوە. دەتوانین بڵێین مرۆڤ بەرە بەرە خۆی لە دەسەڵات و هەلومەرجی سروشت ڕزگارکرد. واتە چیتر سروشت شتێک نەبوو کە مرۆڤ تەنها بەشێکی پێک بهێنێت، بەڵکو سروشت شتێک بوو کە بەکاردەهێنرا و سوودبەخش بوو.

فرانسیس بەیکۆن"Francis Bacon" ی فەیلەسوفی ئینگلیزی دەیگوت؛ "زانین دەسەڵاتە"، ئەو بەم جۆرە سوودی زانستی دەردەبڕی –ئەوەش خۆی لە خۆیدا شتێکی نوێ بوو. ئەوجا مرۆڤ بە گوڕ هاتە ناو سروشتەوە و دەسەڵاتی بەسەردا گرت.

- بەڵام نەک تەنها بە شێوەیەکی سوود بەخشانە؟

- نەخێر، لەوەوپێش باسی باشە و خراپەمان کرد و گوتمان بەردەوام گرێدراوی هەموو شتێکن کە پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەبێت. پێشکەوتنی تەکنیکی –کە لە ڕێنیسانسدا سەریهەڵدا- بووە هۆی داهێنانی ئامێری ڕستن و لەهەمان کاتیشدا بێکاری هێنایە کایەوە، بووە هۆی دۆزینەوەی دەرمان و لە هەمان کاتیشدا بووە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشی نوێ، کشتوکاڵی زۆرکرد و لە هەمان کاتیشدا پیت و فەڕی سروشتی کەمکردەوە، بووە هۆی داهێنانی ئامێری ناوماڵ وەک یەخچاڵ و ئامێری جلشۆرین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا پیسکردنی

ئاووهەوا و گرفتی پاشماوەی خوڵقاند. لە ڕوانگەی هەموو ئەو هەڕەشە گەورانەی ئەمڕۆکە لە ژینگە دەکرێت، خەڵکانێکی زۆر وایدادەنێن کە خودی پێشکەوتنی تەکنیکی لادانێکی ترسناکی دۆخی سروشت بێت. دەڵێن مرۆڤ پڕۆسەیەکی وەهای دەستپێکردووە، کە چیتر ناتوانێت دەسەڵاتی بەسەردا هەبێت. خەڵکانی گەشبینیش وایدادەنێن کە ئێمە هێشتام لە سەردەمی منداڵی تەکنیکیدا دەژین. بێگومان شارستانیەتی تەکنیکی نەخۆشیەکانی سەردەمی منداڵی خۆی گرتووە. بەڵام مرۆڤ هێواش هێواش فێری ئەوە دەبێت کە بە چ شێوەیەک دەسەڵات بەسەر سروشتدا بگرێت و بەبێ ئەوەی لە هەمان کاتدا هەڕەشەی فەوتاندنی لێبکات.

ـ تۆ خۆت چۆنی دەبینیت؟

ـ لەوانەیە بڕێک لە ڕاستی لە هەردوو ڕوانگەکەدا هەبێت. لە هەندێ بواردا، دەشێ مرۆڤ چیتر دەست لە سروشت وەرنەدات. لە هەندێ بواری تریشدا بە سەرکەوتوییەوە دەتوانین خۆمان لە سروشت هەڵقورتێنین. هەرچۆنێک بێت، ناتوانین بگەڕێینەوە سەر سەدەکانی ناوەڕاست. هەر لە سەردەمی ڕێنیسانسەوە چیتر مرۆڤ تەنها بەشێکی سروشت نیە، بەڵکو چالاکانە کار لە سروشتدا دەکات و بەپێی بیرکردنەوەکانی دەیگۆڕێت. ئەمەش شتێکمان دەربارەی سەیری مرۆڤ، وەک بوونەوەرێک، بۆ دەردەخات.

ـ ئێمە توانیمان بگەینە سەر مانگ. من پێم وانیە هیچ کەسێکی سەدەکانی ناوەڕاست لەو بڕوایەدا بووبێت کە شتێک لەو بابەتە ڕۆژێک لە ڕۆژان بگونجێت؟

ـ نەخێر، دەتوانیت بەو پەڕی دڵنیاییەوە ئەوە بڵێیت. ئەم باسە دەمانباتە سەر وێناکردنە نوێکەی جیهان. بە درێژایی سەدەکانی

ناوەڕاست، مرۆڤ بە بەردەوامی تەماشای مانگ و خۆر و ئەستێرەکانی ئاسمانی دەکرد، بەڵام هیچ مرۆڤێک گومانی لەوە نەدەکرد کە زەوی ناوەڕاستی گەردوونە. هیچ جۆرە سەرنجدانێک لەو گومانەدا نەبوو کە زەوی لە شوێنی خۆیدا وەستاوە و "تەنە ئاسمانیەکانی" تر بەدەوریدا دەخولێنەوە. بەپێی مەزەنەی کڵێسەش خودا لەسەرو هەموو تەنە ئاسمانیەکانەوە وەستاوە، ئەمەش یاریدەی بەردەوامبوونی ئەو جۆرە بۆچوونانەی دەدا.

ـ خۆزگە هێندە ئاسان بوایە.

ـ بەڵام لەساڵی 1543 دا کتێبێکی چکۆلە بە ناوی "دەربارەی جوڵانەوەی تەنە ئاسمانیەکان"ەوە چاپکرا. کتێبەکە کۆپرنیکۆس "Copernicus"ی ئەستێرەناسی پۆڵۆنی نووسی، خۆشی لە هەمان ڕۆژی چاپکردنیدا مرد. کۆپرنیکۆس دەیگوت، خۆر بە چواردەوری زەویدا ناخولێتەوە، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوەیە. ئەو لە ڕێگەی چاودێریکردنی تەنە ئاسمانیەکانەوە گەیشتە ئەو بڕوایە و دەیگوت؛ کاتێک خەڵکی بڕوا بە پێچەوانەکەی دەکەن، ئەوا تەنها لەبەرئەوەیە کە زەوی بەدەوری تەوەرەی خۆیدا دەخولێتەوە. زیاتریش دەیگوت؛ دەکرێت هەموو چاودێریکردنێکی تەنە ئاسمانیەکان، ئاسانتر تێبگەین، گەر خولانەوەی بازنەیی زەوی و ئەستێرەکانی دی بەدەوری خۆردا بهێنینە بەرچاو. ئێمە بەمە دەڵێین "جیهان بینین لە ڕوانگەی چەقی خۆرەوە"، واتە هەموو شتێک بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە.

ـ ئەو جۆرە دیدەیەش ڕاست بوو؟

ـ بە تەواوەتی نا، خاڵە سەرەکیەکەی ـکە زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە- بێگومان ڕاست بوو. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو دەیگوت خۆر چەقی گەردوونە. ئێمە ئەمڕۆکە ئەوەندە دەزانین کە خۆر تەنها

ئەستێرەیەکە لە نێو ژمارەیەکی بێپایانی ئەستێرەی تردا و هیچی تر —دەشزانین کە زەوی و ئەستێرەکانی چواردەوری تەنها یەک گەلەهەسارەی "*مەجەڕەی" نێوان ملیۆنەها گەلەهەسارەی تری گەردوونە. کۆپرنیکۆس لەو بڕوایەشدابوو کە زەوی و ئەستێرەکانی تر بە شێوەی جوڵەیەکی بازنەیی بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە.

- بەڵام ئایا ئەوە ڕاست نیە؟

- نەخێر، بیرۆکەی خولانەوەی بازنەیی، لە جۆرە تێگەیشتنێکی کۆنەوە هاتووە کە دەیگوت هەموو تەنە ئاسمانیەکان خڕن و بە شێوەیەکی بازنەیی دەخولێنەوە، تەنها لەبەرئەوەی کە "ئاسمانین". هەر لە کاتی پلاتۆنەوە، خڕی و بازنەیی وەک دوو شێوەی هەندەسی پڕاوپڕ و بێ کەموکوڕی تەماشا دەکران. بەڵام لە سەرەتای سەدەی هەڤدەدا، جۆهانس کیپلەر "Johannes Kepier" ی ئەستێرەناسی ئەڵمانی ئەنجامی چاودێریکردنە دورو درێژەکانی خستەڕوو؛ لەوێدا سەلماندی کە ئەستێرەکان بە شێوەیەکی هێلکەیی —یان بادەمی- دەخولێنەوە و هەروەها سەلماندیشی کە خۆر چەقی لایەکیان پێکدەهێنێت. جگە لەوەش دەیگوت، ئەستێرەکان لەو کاتەدا دەگەنە ئەو پەڕی خێراییی کە لە خۆرەوە نزیک دەبنەوە و بە پێچەوانەشەوە (واتە هەتا لە خۆر دور بکەونەوە، خێراییەکەیان کەمتر دەبێتەوە). دواتر لە سەردەمی کیپلەردا بە دڵنیایی تەواوەوە دەگوترا زەوی ئەستێرەیەکە وەک هەموو ئەستێرەکانی دی. لە سەرو ئەمەشەوە، کیپلەر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە هەمان یاسای فیزیاوی بەسەر هەموو گەردووندا بچەسپێت.

- چۆن دەیتوانی هێندە دڵنیا بێت؟

ـ لەبەرئەوەی بەهۆی هەستەکانی خۆیەوە لە جوڵەی ئەستێرەکانی دەکۆڵیەوە و کوێرانە پشتی بە بۆچوونی سەدەکانی کۆن نەدەبەست.
لە نزیکەی هەمان کاتی کیپلەردا، گالیلۆ گالیلی زانای ئیتاڵی دەژیا. ئەمیش هەروەها بۆ لێکۆڵینەوەی تەنە ئاسمانیەکان، سوودی لە تەلیسکۆب وەردەگرت. لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر خاسیەتەکانی مانگ کرد و گوتی؛ هەروەک چۆن لەسەر زەویدا شاخ و دۆڵ هەیە، لەسەر مانگیشدا هەمان شێوەیە. هەروەها نیشانیدا کە ئەستێرەی جوپیتەر چوار مانگی هەیە. کەواتە زەوی تاقانە نیە لە هەبوونی مانگدا. هەرە گرنگترین زانیاریش کە گالیلۆ دەریخست، یاسای سستێتی یان یاسای بەردەوامی دۆخی تەنەکان بوو.
ـ ئەی ئەو یاسایە چی دەڵێت؟
ـ گالیلۆ بەم شێوەیە دایڕشت؛ "ئەگەر تەنێک هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی لەسەر نەبێت، کە خاوتر یان خێراتری بکات، ئەوا بەتەواوەتی لە هەمان بارودۆخی جوڵەی خۆیدا دەمێنێتەوە."
ـ بەڵێ، بەڵێ!
ـ بەڵام ئەمە لە ڕاستیدا سەرنجدانێکی گرنگە. لە سەردەمی سەدەکانی کۆنەوە، گرنگترین مشتومڕ دژ بە تیۆری خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا، ئەوە بوو کە دەیانگوت؛ ئەگەر زەوی بەخێرایی بخولێتەوە، کەواتە ئەو بەردەی کە بە شاقوڵی فڕێ دەدرێت بۆ ئاسمان، دەبێت چەندین مەتر دورتر لە شوێنی فڕێدانەکەیەوە بکەوێتە خوارەوە.
ـ ئەی بۆچی ئەوە ڕوونادات؟
ـ گریمان لە فارغۆنی شەمەنەفەرێکدا دانیشتویت. ئەگەر سێوێکت لەدەست بکەوێتە خوارەوە، ئەوا ڕێک بەردەبێتەوە؛ هەرچەندە

شەمەنەفەرەکە دەجوڵێتەوە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا سێوەکە ناکەوێتە پشتی ژوورەکەوە. ئەمەش بەهۆی یاسای بەردەوامی دۆخی تەنەکانەوە ڕوودەدات. کێشی سێوەکە، سێوەکە ڕادەکێشێتە خوارەوە و هەمان خێراییش دەپارێزێت –ڕێک هەروەک ئەو کاتەی کە هێشتام لەدەستدا بوو.
- پێم وابێت تێدەگەم.
- لە کاتی گالیلۆدا هێشتام شەمەنەفەر نەبوو، بەڵام ئەگەر لەناو ئەم ژوورەدا تۆپێک خلبکەیتەوە و دەستی لێیەربدەیت...
- ئەوا تۆپەکە بەردەوام دەڕوات...
- ...لەبەرئەوەی هەمان خێرایی دەپارێزێت، تەنانەت پاش ئەوەی کە دەستیشی لێبەردەدەیت.
- بەڵام ئەگەر ژوورەکە بەپێی پێویست درێژ بێت، ئەوا لە کۆتایدا هەر دەوەستێت.
- بەڵێ ڕاستە، چونکە هێزێکی تر خێراییەکەی کەم دەکاتەوە. لەپێش هەموو شتێکدا زەویەکە، بەتایبەتیش ئەگەر چاڵ و چۆڵی زۆری تێدا بێت. هەرچۆنێک بێت، درەنگ یان زوو هێزی ڕاکێشانی زەوی هەر دەیوەستێنێت. بەڵام بە یارمەتیت... دەمەوێت شتێکت نیشان بدەم.
ئەلبێرتۆ هەستا و بەرەو لای دۆڵابە کۆنەکە ڕۆیشت، شتێکی لە یەکێک لە چەکمەجەکاندا دەرهێنا و خستیە سەر مێزەکەی بەردەمیان. پارچەیەک تەختە بوو، لە سەرێکیانەوە چەند ملیمەترێک ئەستور و لەلاکەی تریشیەوە تەواو تیژ بوو. لە تەنیشت پارچە تەختەکەوە، کە نزیکەی هەموو مێزەکەی داگیرکردبوو، تۆپێکی سەوزی مەڕمەڕی دانا. پاشان گوتی؛

ـ بەمە دەگوترێت ڕووی خوار. بە بڕوای تۆ چی ڕوودەدات ئەگەر تۆپەکە لە لا ئەستورەکەوە بەربدەم؟

سۆفیا بە بێزاریەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا.

ـ لەسەر دە کرۆن گرەوت لەگەڵدا دەکەم، کە تۆپەکە خلدەبێتەوە بۆ سەر مێزەکە و دواجاریش دەکەوێتە سەر زەویەکە.

ـ با بزانین...

ئەلبێرتۆ تۆپەکەی بەردا و ڕێک پێشبینیەکەی سۆفیا هاتەدی. تۆپەکە خل بووەوە سەر مێزەکە و کەوتە سەر زەویەکە، پاشانیش بەردەوام خل بووەوە و لەبەردەم دەرگای ژوورەکەدا گیرسایەوە.

ـ سەرسوڕهێنەرە! سۆفیا گوتی.

ـ بەڵێ، وا نیە؟ گالیلۆ ڕێک ئەم جۆرە تاقیکردنەوانەی دەکرد، تێدەگەیت؟

ـ بەڕاستی هێندە بێ مێشک بوو؟

ـ ئارام بە! ئەو دەیویست هەموو شتێک لە ڕێگەی هەستەکانیەوە تاقیبکاتەوە، ئەمەش تەنها سەرەتایەک بوو. بەڵام ئایا دەتوانیت پێم بڵێیت بۆچی تۆپەکە لەسەر ڕووە خوارەکەوە خلبووەوە خوارەوە؟

ـ چونکە کێشی هەیە... بۆیە خلبووەوە.

ـ بەڵێ، بەڵێ. ئەی کێش چیە، کچە بچکۆلانەکەم؟

ـ بەڕاستی پرسیاری بێمانا دەکەیت.

ـ بێ مانا نیە... هەر بەوەدا کە ناتوانیت وەڵامی بدەیتەوە. بۆچی تۆپەکە خل دەبێتەوە سەر زەویەکە؟

ـ بەهۆی هێزی ڕاکێشانی زەویەوە.

- تەواوە، بەهۆی هێزی ڕاکێشانی زەویەوە. کەواتە کێش پەیوەندی بە هێزی ڕاکێشانی زەویەوە هەیە. ڕێک ئەو هێزەش بوو کە تۆپە مەڕمەڕەکەی خستە جوڵە.
ئەو کاتە ئەلبێرتۆ تۆپەکەی لەسەر زەویەکە هەڵگرتبووەوە، بەڵام دیسانەوە بەسەر پارچە تەختەکەدا خۆی چەماندەوە.
- ئێستاکە دەمەوێت بە پێچەوانەی لا لارەکەوە پاڵی پێوە بنێم... بە وردی ئاگاداربە، بزانە چی ڕوودەدات.
ئەلبێرتۆ زیاتر خۆی چەماندەوە و تۆپەکەی فڕێدا. سۆفیا تۆپەکەی بینی کەمە کەمە لاردەبێتەوە و پاشانیش بەلایە لارەکەدا شۆڕبووەوە... ئەوجا ئەلبێرتۆ پرسی؛
- چی ڕوویدا؟
- بەلاری خل بووەوە، چونکە ڕووبەرەکە لارە.
- ئێستا بە قەڵەمێکی ڕەش تۆپەکە ڕەنگ دەکەم... ئەوسا لەوانەیە باشتر لە مەبەستی "لاریەکەت" تێبگەین.
ئەلبێرتۆ قەڵەمێکی ڕەشی هێنا و سەرتاپای تۆپەکەی ڕەشکرد. پاشان سەرلەنوێ تۆپەکەی بەردایەوە. ئەوجا سۆفیا بەجوانی جێ شوێنی تۆپەکەی دەبینی، چونکە تۆپەکە خەتی ڕەشی بەدوای خۆیدا جێدەهێشت. ئەلبێرتۆ پرسی؛
- چۆن چۆنی جوڵەی تۆپەکە وەسف دەکەیت؟
- خەتێکی لارە... لە بەشێکی بازنەیەک دەچێت.
- ڕاستە.
ئەلبێرتۆ تەماشایەکی سۆفیای کرد و برۆکانی بەرزکردەوە.
- هێڵێکی بازنەیی تەواو نیە. بەم شێوەیە دەگوترێت پاراپۆلا.
- چۆنت پێخۆشە ئاوها ناوی بنێ.

ـ بەڵام بۆچی تۆپەکە ڕێک بەو شێوەیە دەجوڵێتەوە؟
سۆفیا باش بیریکردەوە و پاشان گوتی؛
ـ لەبەر لاری پارچە تەختەکە، تۆپەکە بەهۆی هێزی ڕاکێشانەوە بەرەو زەویەکە ڕۆیشت.
ـ ڕاستە! بەڕاستی ئەمە هەست دەبزوێنێت. بەڕێکەوت کچێک دەهێنمەوە ماڵەوە و تەنها لە پاش یەکەمین تاقیکردنەوە، وەک گالیلۆ دەگاتە هەمان ئەنجام!
ئەوجا دەستیکرد بە چەپڵە لێدان. بۆ ساتێکی کەم سۆفیا لەوە دەترسا کە تەواو شێت بووبێت... بەڵام ئەلبێرتۆ بەردەوام بوو؛
ـ ئێستاکە بە چاوی خۆت بینیت چی ڕوودەدات گەر لە هەمان کاتدا دوو "هێز" لەسەر یەک تەن کاریگەربن. گالیلۆش سەلماندی کە هەمان یاساش، بۆ نمونە بەسەر تۆپی مەدفەعێکدا دەچەسپێت. تۆپەکە بەرەو ئاسمان دەتەقێنرێت، بەسەر زەویدا بەردەوام دەڕوات، بەڵام لە دواجاردا بەرەو زەوی ڕادەکێشرێتەوە. بەم شێوەیەش هێڵێک دروست دەکات، کە وەک هەمان هێڵی تۆپە مەڕمەڕەکە وایە کە لەسەر تەختە لارەکە بینیمان. لە کاتی گالیلۆدا، ئەمە خۆی لە خۆیدا دۆزینەوەیەکی نوێ بوو. بە بڕوای ئەریستۆتالیس کاتێک تەنێک بۆ ئاسمان هەڵدەدرێت، لە پێشدا بە هێڵێکی لاری لاوازدا دەڕوات و لە کۆتایشدا بە شێوەیەکی شاقوڵی دێتە خوارەوە. بەڵام لە ڕاستیدا بەم جۆرە نیە، کەسیش نەیدەتوانی بیسەلمێنێت کە ئەریستۆتالیس هەڵەیە، هەتاوەکو ئەو کاتەی گالیلۆ نیشانیدا و سەلماندی.
ـ ئایا ئەم بابەتە گرنگە؟

ـ گرنگ؟ بێگومان گرنگە! مانایەکی یەکجار گەورەی هەیە کچەکەم. لە نێو هەموو دۆزینەوە زانستیەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەم یەکەیان هەرە هەرە گرنگترینیانە.
ـ کەواتە بۆم باسبکە، بۆچی هێندە گرنگە.
ـ دواتر زانای فیزیاوی ئینگلیزی "ئیساک نیوتن "Isaac Newton هات، کە لە نێوان ساڵەکانی 1642 تا 1727 دا دەژیا. ئەم بوو کە دواترین وەسفی سیستمی کۆمەڵەی خۆر و جوڵەی ئەستێرەکانی کرد. نیوتن نەک تەنها وەسفی شێوەی خولانەوەی ئەستێرەکانی دەکرد بەدەوری خۆردا، بەڵکو زۆر بەوردی هۆکەشی ڕوونکردەوە. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش، لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تردا، پەناییبردە بەر دینامیکی گالیلۆ.
ـ باشە ئایا ئەستێرەکان وەک تۆپی سەر ڕووبەرێکی لار وان؟
ـ بەڵێ، بەڵێ، شتێکە لەو بابەتە. بەڵام کەمێک ئارامت بێت سۆفیا.
ـ پێم وابێت هیچ چارەیەکی ترم نیە.
ـ کاتی خۆی کیپلەر گوتی؛ دەبێت هێزێک هەبێت کە وا لە تەنە ئاسمانیەکان بکات بەلای یەکتردا ڕابکێشرێن. بۆ نمونە خۆر، ئەو دەبێت هێزێکی وای هەبێت کە بتوانێت خولگەی ئەستێرەکان بەدەوری خۆیدا ڕابگرێت. هەمان هێزیش هۆی هێواشی ئەستێرەکانمان بۆ لێکدەداتەوە کاتێک کە لە خۆر دوردەکەونەوە. جگە لەمەش بە بڕوای کیپلەر هەڵکشان و داکشانی ئاو –ئەو دیاردەیەی کە ئاوی دەریا بەرز و نزم دەبێتەوە- پەیوەندی بە هێزی ڕاکێشانی مانگەوە هەیە.
ـ بەڵام ئەمەیان ڕاستە، وا نیە؟
ـ بەڵێ وایە، بەڵام گالیلۆ نکوڵی لێدەکرد. ئەو گاڵتەی بە کیپلەر دەکرد، کە "وا بیردەکاتەوە مانگ دەسەڵاتی بەسەر ئاودا هەبێت".

چونکە گالیلۆ بڕوای نەدەکرد کە هێزی ڕاکێشان لە ماوەیەکی هێندە دورەوە کاریگەری هەبێت، واتە "لە نێوان" دوو تەنی ئاسمانی جیاوازدا.

ـ لەوێشدا بەهەڵەدا چوو.

ـ بەڵێ ڕێک لەو خاڵەدا هەڵە بوو. تا ڕادەیەکیش سەیرە، چونکە ئەو بایەخێکی زۆری بە هێزی ڕاکێشانی زەوی و کەوتنە خوارەوەی تەنەکان دەدا. جگە لەمەش سەلماندی کە کۆمەڵێک هێز بە چ شێوەیەک جوڵەی تەنێک دیاریدەکەن.

ـ بەڵام تۆ شتێکت دەربارەی نیوتن باسکرد.

ـ بەڵێ، پاشان نیوتن هات و ئەو یاسایەی دارشت کە پێی دەڵێن "هێزی ڕاکێشانی گەردوونی". ئەم یاسایە دەڵێت؛ "هەموو تەنێک، تەنێکی تر بەهۆی هێزێکەوە ڕادەکێشێت، هەتا تەنەکانیش گەورەتر بن، هێزەکەش زۆرتر دەبێت، وە هەتاوەکو ماوەی نێوان تەنەکان زۆرتر بێت، هێزەکەش کەمتر دەبێتەوە.

ـ وا بزانم تێدەگەم... بۆ نمونە، هێزی ڕاکێشانی نێوان دوو فیل لە هێزی ڕاکێشانی نێوان دوو مشک زیاترە. هەروەها هێزی ڕاکێشانی نێوان دوو فیلی هەمان باخچەی ئاژەڵ، لە هێزی ڕاکێشانی نێوان دوو فیل زیاترە کە یەکێکیان لە هیندستان بێت و ئەوی تریان لە ئەفریقا.

ـ کەواتە تێی گەیشتیت. ئێستاش دێینە سەر خاڵە گرنگەکە؛ بەپێی نیوتن، ئەو "هێزی ڕاکێشانە"، گەردوونییە... واتە هەمان یاسا لە هەموو شوێنێکدا وەک یەک دەچەسپێت، تەنانەت بەسەر تەنە ئاسمانیەکانی گەردوونیشدا. دەگێڕنەوە دەڵێن ئەو "بیر"ەی کاتێک بۆ هاتووە کە لەژێر دار سێوێکدا دانیشتووە. سێوێکی بینیوە کەوتۆتە خوارەوە و لە خۆی پرسیوە؛ بڵێیت مانگیش بە هۆی هەمان هێزی

ڕاکێشانی زەوییەوە، بەرەو زەوی ڕابکێشرێت؟ ئایا هەر لەبەر هەمان هۆیە کە مانگ لە خولگەی هەتاهەتایی خۆیدا بەدەوری زەویدا بەردەوامە؟
- زیرەکانەیە و بەڵام لە هەمان کاتیشدا زۆر نا.
- بۆ نا سۆفیا؟
- ئەگەر مانگ لە ژێر هەمان کایگەری هێزی ڕاکێشانی زەویدا بێت، کە وا لە سێوێک دەکات بکەوێتە خوارەوە، کەواتە لە دوا ئەنجامدا لەبری ئەوەی مانگ بە دەوری زەویدا بخولێتەوە، مانگیش دەکەوێتە سەر زەوی.
- ئێستاکە لە یاسای جوڵانەوەی ئەستێرەکانی نیوتن نزیک بووینەوە. لە سەدا پەنجا ڕاست دەکەیت، ئەوەش ئەو کاتەیە کە باس لە کاریگەری هێزی ڕاکێشانی زەوی لەسەر مانگ دەکەیت. بەڵام لە سەدا پەنجاش هەڵەیت... بۆچی مانگ ناکەوێتە سەر زەوی سۆفیا؟ ڕاستە کە مانگ لە لایەن هێزێکی یەکجار گەورەی زەویەوە ڕادەکێشرێت. بەڵام تەنها بیر لەوە بکەرەوە، کە چ هێزێک پێویستە بۆ ئەوەی لە کاتی ئاو کشاندا، ئاوی دەریا مەترێک یان دوو مەتر بەرزببێتەوە.
- تەواو تێناگەم.
- بیر لە ڕووبەرە لارەکەی گالیلۆ بکەرەوە... چی ڕوویدا کاتێک ویستم بە پێچەوانەی لا ئەستورەکەوە تۆپەکە فڕێبدەم؟
- ئایا دوو هێزی جیاواز کاریگەری لە مانگ دەکەن؟
- ڕێک تەواوە. ئەو کاتەی سیستەمی کۆمەڵەی خۆر دروست بوو، هێزێکی یەکجار گەورە مانگی لە زەوی جیاکردەوە —واتە لە زەوی دور خستەوە. ئەو هێزەش بۆ هەتا هەتایە هەر کاریگەر دەبێت،

لەبەرئەوەی مانگ بەبێ هیچ بەرەنگاریەک لە بۆشاییەکی بێ هەوادا دەجوڵێتەوە...
- بەڵام بەهۆی هێزی ڕاکێشانی زەویشەوە بەرەو زەوی ڕادەکێشرێت؟
- ڕاستە، بەڵام ئەو دوو هێزە نەگۆڕن ـوە هەردوو کیشیان لە هەمان کاتدا کاریگەرن. لەبەرئەوە مانگ بە بەردەوامی بە دەوری زەویدا لەسەر خولەکی خۆی دەمێنێتەوە.
- بەڕاستی هێندە ئاسانە؟
- بەڵێ هەر زۆر ئاسانە و هەر ڕێک ئەو "ئاسانی"یەش مەبەستی بنچینەیی نیوتن بوو. ئەو سەلماندی کە چەند یاسایەکی کەم بەسەر هەموو گەردووندا دەچەسپێت. بەڵام دەربارەی جوڵەی ئەستێرەکان گەڕایەوە سەر هەمان دوو یاسا سروشتیەکەی گالیلۆ، کە هەر لە مێژەوە ئاماژەی بۆ کردبوون. یەکەمیان یاسای سستێتی بوو، کە نیوتن بەم شێوەیە دەریبڕی؛ " هەموو تەنێک وەستابێت یان لە جوڵەدا بێت، ئەگەر هیچ هێزێکی دەرەکی ناچاری نەکات بارەکەی بگۆڕێت، ئەوا بە هێڵێکی ڕاست لەسەر بارەکەی خۆی بەردەوام دەبێت". یاسای دووهەمیش گالیلۆ بە تۆپ و پلێتە لارەکەی سەلماندی؛ "کاتێک دوو هێز لە هەمان کاتدا لەسەر تەنێک کاریگەر دەبن، ئەوا تەنەکە بە شێوە خولانەوەیەکی هێلکەیی دەجوڵێتەوە."
- بەم شێوەیەش نیوتن هۆی خولاندنەوەی هەموو ئەستێرەکانی بەدەوری خۆردا بۆ ڕوونکردینەوە. ئەمەیە مەبەستت؟
- تەواوی مەبەستم. هەموو ئەستێرەکان لە دەرئەنجامی دوو جوڵەی جیاوازەوە بە شێوەیەکی هێلکەیی بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە. یەکەمین جوڵە؛ ئەو هێڵە ڕاستەیە کە هەریەک لە ئەستێرەکان لە سەرەتای دروستبوونی سیستمی کۆمەڵەی خۆرەوە دەستیان کەوتووە.

دووهەمیش، جوڵەی ئەستێرەکانە بەرەو خۆر، کە بە هۆی هێزی ڕاکێشانەوە دروست بووە.
ـ بە ڕاستی بلیمەتییە.
ـ ڕاست دەکەیت. نیوتن نیشانیدا کە هەمان یاسای جوڵەی تەنەکان، بەسەر هەموو گەردووندا دەچەسپێت. بەم شێوەیەش هەموو وێناکردنێکی کۆنی سەدەکانی ناوەڕاستی سڕییەوە کە پێیان وابوو یاساکانی سەر زەوی و "ئاسمان" جیاوازبن. بەم شێوەیەش لە کۆتایدا وێناکردنی بە چەق بوونی خۆر ڕوونکرایەوە و بە تەواوەتی دانی پێدا نرا.
ئەلبێرتۆ لێرەدا وەستا و پارچە تەختە لارەکەی خستەوە ناو چەکمەجەکە. دانەوەیەوە و تۆپە مەڕمەڕەکەی لەسەر زەویەکە هەڵگرتەوە، پاشان لەسەر مێزەکەی نێوان خۆی و سۆفیادا داینا.
سۆفیاش سەری لەو هەموو زانیاریە سوڕدەما کە لە پارچە تەختەیەکی لار و تۆپێکەوە فێر بوو. کاتێکیش بەردەوام تەماشای تۆپە سەوزەکەی دەکرد ـکە هێشتام کەمێک ڕەنگی ڕەشی پێوە مابوو- خەیاڵی چووە سەر گۆی زەوی و پرسی؛
ـ ئەی مرۆڤ؟ ئایا توانیان بەو بیرکردنەوەیە قایل بن، کە لەسەر ئەستێرەیەکی بە ڕێکەوت هەڵکەوتووی ناو ئەم گەردوونە گەورەیەدا دەژین؟
ـ بەڵێ، بەڵام لە زۆر لایەنەوە وێناکردنی جیهانیی نوێ جێگەی سەرسوڕمان بوو. دەتوانین بەو کاتە بەراوردی بکەین کە داروین گوتی مرۆڤ لە ئاژەڵەوە گەشەیکردووە. لە هەردوو بارەکەدا مرۆڤ هەستیدەکرد شتێک لە بوونە تایبەتیەکەی لە دەست دەدات لەناو

بوونەوەرەکانی دیدا... لە هەردوو بارەکەشدا کڵێسە بە توندی دژیان وەستایەوە.

ـ سەیر نیە بەلامەوە، چونکە لە نێو ئەو هەموو شتە نوێیەدا، دەبێ خودا چی بمێنێتەوە؟ کاتی خۆی ساکارتربوو کە زەوی وەک چەقێک دادەنرا و خودا و تەنە ئاسمانیەکانیش لە سەرەوەی ئاسماندا، لە قاتی سەروتردابوون.

ـ بەڵام هەرچۆنێک بێت، ئەمە جێگەی ڕق هەستانێکی گەورە نەبوو. کە نیوتن گوتی هەمان یاسای فیزیایی بەسەر هەموو گەردووندا دەچەسپێت، خەڵکانێک چاوەڕوانبوون کە گومانی لە مەزنی خودا هەبێت. بەڵام بڕوای خودی نیوتن بە خودا هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نەهات. ئەو، یاسای سروشتی وەک بورهانێکی مەزن و دەسەڵاتێکی گەورەی خودا دەبینی. بەڵام خراپترین شت لەوانەیە ئەو وێنەیە بێت کە مرۆڤ بەرامبەر خۆی هەیبوو.

ـ مەبەستت چیە؟

ـ هەر لەکاتی ڕێنیسانسەوە دەبوایە خەڵکی لەسەر ئەو بیرۆکەیە خۆیان ڕابهێنایە کە لەسەر ئەستێرەیەکی ونی گەردوون دەژین. نازانم ئەگەر ئێستاکەش بە تەواوەتی لەسەر ئەوە خۆمان ڕاهێنابێت! بەڵام هەر لە کاتی ڕێنیسانسدا خەڵکانێک دەیانگوت هەموو تاکە کەسێک شوێنێکی گرنگتری وەک لە سەردەمی پێشوودا هەیە.

ـ تێناگەم.

ـ لەوەوپێش خەڵکی پێیان وابوو زەوی چەقی گەردوون بێت. بەڵام کە ئەستێرە ناسەکان سەلماندیان گەردوون چەقێکی دیاریکراوی نیە، ئەوسا ژمارەی چەقەکان هێندەی ژمارەی مرۆڤەکان زۆر بوون.

ـ ئێستاکە تێدەگەم.

- ڕێنیسانس پەیوەندیەکی نوێشی لەگەڵ خودادا دامەزراند. کاتێک فەلسەفە و زانست هێدی هێدی خۆیان لە تیۆلۆجی جیاکردەوە، ئەوسا کۆمەڵەیەکی ئاینیی مەسیحی نوێ سەریهەڵدا. ڕێنیسانس لە ڕوانگەی تاکە کەسیەوە مرۆڤی دەدی، ئەمەش کاریگەری لەسەر ژیانی ئاینی هەبوو. لێرەشەوە پەیوەندی تایبەتی تاکە کەس لەگەڵ خودادا گرنگتربوو لەو پەیوەندییەی کە خەڵکی لەگەڵ ڕێکخراوی کڵێسەدا هەیبوو.

- بۆ نمونە مەبەستت لە نوێژی ئێوارانی تایبەتی تاکە کەسێکە؟

- بەڵێ ئەوەش. لە کڵێسە کاتۆلیکیەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا کردەوە و ئادابی ئاینی، کە بەزمانی لاتینی بوو، لەگەڵ سروتی نوێژکردنی کڵێسەدا بە کۆڵەکەی خزمەتکردنی خودا دادەنرا. تەنها قەشەکان دەیانتوانی کتێبی پیرۆز (*ئینجیل.و) بخوێننەوە، چونکە تەنها بە زمانی لاتینی هەبوو. بەڵام لە ڕێنیسانسدا ئینجیلیان لە یۆنانی و عیبرییەوە وەرگێڕایە سەر زمانە نەتەوەییەکان. ئەم کارەش گرنگی خۆی لەسەر چاکسازی ئاینی (*بزوتنەوەی چاککردنی ئاینی.و) بینی.

- مارتین لۆسەر"Martin Luther" ...

- بەڵێ، لۆسەر گرنگ بوو، بەڵام ئەو تەنها چاککارێکی ئاینی نەبوو. چەندین چاککاری تر هەبوون، کە وایان بەباش دەزانی لە ناو کڵێسەی ڕۆمی-کاتۆلیکیدا بمێننەوە. یەکێک لەوانە ئیراسمۆسی ڕۆتردام "Rotterdam Erasmus" بوو .

- لۆسەر نەیدەویست پارە لەبری بەخشینی گوناح بدات، ئایا لەسەر ئەوە لە کڵێسەی کاتۆلیکی جیابووەوە؟

ـ بەڵێ، بەڵام بابەتەکە لە بنەڕەتدا لەوە گرنگتربوو. بەپێی لۆسەر مرۆڤ پێویستی بەوە نیە بڕوات لە ڕێگەی قەشەکانی کڵێسەوە بە بەخشینی خودا بگات. هەروەها دەیگوت بەخشینی خوداش نەبەستراوەتەوە بەوەی کە مرۆڤ پارە بە کڵێسە بدات یان نەیدات. ئەوەی کە پێیان دەگوت "بازرگانی پارەی بەخشین"، لە ناوەڕاستی سەدەی شانزەدا لە کڵێسە کاتۆلیکیەکانیشدا قەدەغەکرا.

ـ بێگومان خودا ئەوەی پێخۆشبووە.

ـ بەشێوەیەکی گشتی لۆسەر لە زۆرینەی ئەو دۆگما و سروتە ئاینیانە دورەپەرێزبوو کە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست هاتبوونە ناو مێژووی ئاینی مەسیحیەوە. ئەو دەیویست بگەڕێتەوە سەر ڕەچەڵەکی ئاینی مەسیحی، هەروەک ئەوەی کە لە پەیماننامەی نوێدا بەرچاودەکەوێت، یان هەروەک خۆی دەیگوت "تەنها نووسراوەکان". لۆسەر بەم دروشمەوە گەرەکی بوو بگەڕێتەوە سەر "سەرچاوەی ئاینی مەسیحی"، هەروەک چۆن هیومانیزمەکانی ڕێنیسانس دەیانویست بەرەو سەرچاوە کۆنەکانی هونەر و کەلتور بگەڕێنەوە. ئەو ئینجیلی وەرگێڕایە سەر زمانی ئەڵمانی و بەم شێوەیەش خودی بنچینەی زمانی نووسراوی ئەڵمانی دامەزراند، لێرەشەوە دەرگای خوێندنەوەی لە هەموو کەسێک کردەوە، لەم ڕوانگەیەشەوە تاکەکەس تا ڕادەیەک دەیتوانی ببێتە قەشەی خۆی.

ـ قەشەی خۆی؟ ئایا ئەمە زیادە گوتن نیە؟

ـ بەپێی دونیا بینینی ئەو، قەشەکان هیچ پەیوەندیەکی تایبەتی و دیاریکراویان لەگەڵ خودادا نیە. هەر لەبەر ئەم هۆیەش، لە نێو کۆمەڵە لۆسەریەکاندا قەشەیەکیان دادەنا، کە تەنها ئەرکی ڕۆژانەی کڵێسە و خوێندنەوەی نوێژەکانی لەسەرشان بوو. بەڵام لۆسەر لەو

بڕوایەدا نەبوو مرۆڤ لە ڕێگەی سروتی ئاینییەوە بتوانێت بەخشینی خودا بەدەست بهێنێت و لە گوناحەکانی پاکبێتەوە. ئەو دەیگوت؛ ڕزگاربوون بە "بێ پارەیە" و تەنها لە ڕێگەی بڕواوە مرۆڤ دەتوانێت پێی بگات. لۆسەر لە ڕێگەی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ئینجیلەوە گەیشتە ئەم دەرئەنجامە.

ـ کەواتە لۆسەر نمونەی کەسێکی ئاسایی سەردەمی ڕێنیسانس بوو؟

ـ هەم ئاسایی بوو و هەم ئاسایش نەبوو. بایەخدانی لۆسەر بە پەیوەندی تایبەتی نێوان تاکەکەس و خودا، خاسیەتێکی باوی سەردەمی ڕێنیسانس بوو. لۆسەر لە تەمەنی 35 ساڵیدا خۆی فێری یۆنانی کرد و دەستیکرد بە کاری سەختی وەرگێڕانی ئینجیل بۆ سەر زمانی ئەڵمانی. هەروەها لە سەردەمی ڕێنیسانسدا باوبوو کە زمانی نەتەوەیی لە زمانی لاتینی باشتر تەماشابکەن. بەڵام لۆسەر هەروەک فیسینۆ "Ficino" یان لیۆناردۆ دافینشی"Leonardo da Vinci" ، هیومانیست نەبوو. بەڵکو لەلایەن هیومانیستی وەک ئیراسمۆسی ڕۆتردامەوە بەربەرەکانێ دەکرا، لەبەرئەوەی بە بڕوای ئەوان لۆسەر دیدەیەکی ڕەشبینی بەرامبەر مرۆڤ هەبوو. لۆسەر جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە مرۆڤ هەر لەکاتی گوناحە گەورەکەوە بەتەواوەتی تێکشکاوە وە تەنها دڵاوایی و بەزەیی خودا دەتوانێن گوناحەکانی مرۆڤ پاکبکاتەوە، لەبەرئەوەی بە بڕوای ئەو مردن ئەو نرخەیە کە دەبێت لەبری گوناح بدرێت.

ـ باسەکەت کەمێک خەمگینانە دێتە بەرگوێ...

ئەلبێرتۆ کنۆکس لەسەر کورسیەکە هەستا. تۆپە سەوزەکەی هەڵگرت و خستیە گیرفانیەوە. لە پڕێکدا سۆفیا هاواریکرد؛

ـ کاتژمێر لە چوار لایداوە!

ـ قۆناغی دواتری مێژووی مرۆڤایەتی سەردەمی بارۆکەکانە "Baroque Period". بەڵام ئەم باسە بۆ ڕۆژێکی تر هەڵدەگرین هیلدە گیان.
ـ چیت گوت؟ سۆفیا لەسەر کورسیەکەی بەرزبووەوە. گوتت "هیلدە گیان؟"
ـ لە زمانم دەرچوو، هەڵەم کرد و هیچی تر.
ـ بەڵام هیچ شتێک هەروا بە ڕێکەوت لە زمان دەرناچێت.
ـ لەوانەیە ڕاست بکەیت! لەوانەشە باوکی هیلدە وشەکان بخاتە سەر زمانمان. پێم وابێت هەر کە هەستبکات هیلاکین و ناتوانین بەباشی بەرەنگاری ببینەوە، خێرا دێت و زەفەرمان پێدێنێت.
ـ تۆ وتت کە تۆ باوکی هیلدە نیت. سوێند دەخۆیت کە ئەمە ڕاست بێت؟
ئەلبێرتۆ سەری بۆ خوارەوە ڕاوەشاند و ئەوجا سۆفیا گوتی؛
ـ بەڵام من هیلدەم، وا نیە؟
ـ ئێستاکە هیلاکم سۆفیا. دەشێ لەوە تێبگەیت. زیاتر لە دوو کاتژمێر دەبێت پێکەوە دانیشتووین و زیاتریش هەر من قسە دەکەم. بڵێیت کاتی ئەوە نەهاتبێت بگەڕێیتەوە ماڵەوە و نان بخۆیت؟
سۆفیا تاڕادەیەک هەستیدەکرد ئەلبێرتۆ دەیەوێت پاڵی پێوە بنێت. بەرەو دەرگاکە دەڕۆیشت و بەردەوام بیری لە مامۆستاکەی دەکردەوە؛ بۆچی زمانی تەتەڵەی کرد و بەهەڵە ناوی هیلدەی بەسەر زماندا هات. ئەلبێرتۆش لە بەڕێکردنیدا بوو.
هێرمس لەژێر تەختەی جل هەڵواسینەکەدا خەوتبوو... جلەکانیش زۆر سەیر بوون، زیاتر لە جلی شانۆ دەچوون. ئەلبێرتۆ سەیرێکی سەگەکەی کرد و گوتی؛
ـ دیسانەوە دێتەوە بە شوێنتا.

- سوپاس بۆ وانەکەی ئەمڕۆت. سۆفیا ئەمەی گوت و باوەشێکی بە ئەلبێرتۆدا کرد، پاشانیش گوتی؛
- تۆ باشترین و زیرەکترین مامۆستای فەلسەفەیت کە لە ژیانمدا هەمبووبێت.
دواتر دەرگاکەی کردەوە و بەرەو قادرمەکان ڕۆیشت. لەو کاتەدا کە خەریکبوو دەرگاکە دابخات، ئەلبێرتۆ گوتی؛
- بەم زوانە یەکتری دەبینینەوە هیلدە.
سۆفیا لەگەڵ ئەو وشانەدا بە تەنها جێما.
سەرلەنوێ لە زمانی دەرچووەوە... ترسنۆک! سۆفیا ویستی سەرلەنوێ بچێتەوە ژوورەوە، بەڵام لەبەر هۆیەکی نادیار پەشیمان بووەوە.
کە گەیشتە سەر شەقامەکە، ئەوجا بیریکەوتەوە کە پارەی لەگەڵ خۆیدا هەڵنەگرتووە. کەواتە دەبێت هەموو ئەو ڕێگا دور و درێژەی ماڵەوەی بەپێ بکوتێت. بەڕاست! ئەی دایکی؟ ئەگەر سۆفیا نزیکەی کاتژمێری شەش نەگاتەوە ماڵەوە، دایکی توڕەش دەبێت و دەشترسێت.
چەند مەترێک ڕۆیشت و لە پڕێکدا دە کرۆنیەکی لە سەر شۆستەکە دۆزیەوە. پارەی سواربوونی پاسیش، ڕێک دە کرۆن بوو.
سۆفیا شوێنی وەستانی پاسێکی بینیەوە کە بۆ گۆڕەپانە گەورەکە دەڕۆشت. لەوێشەوە بە هەمان بلیت دەیتوانی سواری پاسێکی تربێت کە ڕێک تا ماڵەوەی بباتەوە.
گەیشتە گۆڕەپانی گەورەی شار و ئەوجا زانی چەندە بەختەوەرە... دە کرۆنیەکی ڕێک لەو کاتەدا دۆزیەوە کە زۆر پێویستی پێبوو.
ناشێت باوکی هیلدە ئەو دە کرۆنیەی لەوێدا دانابێت؟ ئەو بە ڕاستی دەستێکی باڵای لە دانانی شتی جۆراوجۆردا هەیە و بەتایبەتیش لە شوێنی گونجاودا.

بەڵام ئەی ئەگەر بەڕاستی لە لوبنان بێت، کەواتە چۆن دەیتوانی ئەو کارانە لەوێدا بکات؟ ئەی ئەلبێرتۆ؟ بۆچی ناوەکەی بەهەڵە گوت؟ نەک تەنها جارێکیش، بەڵکو دوو جار!

موچوڕکەیەک بەلەشی سۆفیادا هات...

## سەردەمی بارۆک"Baroque Period"

## ... ئێمە لە هەمان ئەو قوماشە چنراوین کە خەونی لێ چنراوە ...

چەند ڕۆژێک تێپەڕی بەبێ ئەوەی سۆفیا هیچ شتێک دەربارەی ئەلبێرتۆ ببیستێت، بەڵام ڕۆژانە چەند جارێک تەماشای باخچەکەی دەکرد و چاوی بۆ هێرمس دەگێڕا. لەلایەکی تریشەوە بەدایکی وت سەگەکە خۆی ڕێگەیماڵەوەیانی دۆزیەوە. هەروەها پێیگوت خاوەنی سەگەکە، کە مامۆستایەکی کۆنی فیزیایە، بانگی کردۆتە ماڵەوە و باسی سیستمی کۆمەڵەی خۆر و زانستی نوێی سەدەکانی شانزەی بۆ کردووە.

سۆفیا کەمێک زیاتری بۆ یۆرون گێڕایەوە... باسی هەموو میوانداریەکەی لای ئەلبێرتۆی بۆ کرد، بەسەرهاتی پۆستکارتی ناو دالانەکەشی بۆ گێڕایەوە، دەربارەی دۆزینەوەی دە کرۆنەکەشی بۆ گێڕایەوە کە لە ڕێگای هاتنەوەیدا دۆزیەوە. بەڵام هیچ وشەیەکی نەدرکاند دەربارەی خەونەکەی کە بە هیلدەوە بینی. بابەتی خاچە ئاڵتونیەکەشی وەک نهێنیەک لای خۆی هێشتیەوە.

ڕۆژی سێشەمەی 29 ی مانگی پێنج، سۆفیا لە چێشتخانەکەیاندا قاپەکانی وشکدەکردەوە، لەو کاتەدا دایکی لە ژوورەوە دانیشتبوو و چاوەڕێی دەستپێکردنی هەواڵەکانی دەکرد. ئاوازی تایبەتی دەنگوباس لێدرا و سۆفیا لە چێشتخانەکەوە گوێی لە هەواڵێک بوو کە باسی کوژرانی مێجەرێکی نەرویجی سەربە بەتالیۆنی نەتەوە یەککگرتووەکانی دەکرد.

سۆفیا پەڕۆکەی لەسەر مێزی نانخواردنەکە فڕێدا و بەپەلە خۆی گەیاندە ژوورەوە. بۆ چەند چرکەیەک فریاکەوت وێنەی سەربازە کوژراوەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان ببینێت، پاشان هەواڵەکان چووە سەر بابەتێکی تر و سۆفیا هاواری لێبەرزبووەوە؛

ـ ئای... نا، نا!

دایکی ئاوڕێکی لێدایەوە.

ـ بەڵێ ڕاستە، شەڕ بەدکارییە...

سۆفیا دایە پڕمەی گریان.

ـ سۆفیا! هێواش کچەکەم، یەکجار هێندەش سەخت نیە.

ـ گوتیان ناوی چی بوو؟

ـ بەڵێ... بەڵام بیرم نایەتەوە... پێموابێت خەڵکی گریمستادە.

ـ مەگەر گریمستاد و لیللەساند هەمان شوێن نەبن؟

ـ تەواو... لێرەوە ئیتر خەریکە بێئەقڵ دەبیت!

ـ بەڵام لەوانەیە خەڵکی گریمستادیش بۆ قوتابخانە بچنە لیللەساند، وا نیە؟

سۆفیا ژیر بۆوە. ئەوجا نۆبەی دایکی بوو دەست پێبکات. لەسەر کورسیەکەی هەستا و تەلەفیزۆنەکەی کوژاندەوە.

ـ ئەم قسە بێمانایانە چیە سۆفیا؟

ـ هیچ نیە...

ـ بەڵێ شتە! دەستگیرانت هەیە و خەریکە دێمە سەر ئەو بڕوایەش کە زۆر لە تۆ پیرتر بێت. کەس دەناسیت کە لە لوبنان بێت؟ لەگەڵ تۆمە سۆفیا، وەڵامم بدەوە.

ـ نەخێر ڕێک بەو شێوەیە نا...

ـ ئەی کوڕی هیچ کەسێک دەناسیت کە لە لوبنان بێت؟

- نەخێر... گوێت لێیە! تا ئێستا کچەکەشیم نەدیوە.
- کچی "کێ"؟
- ئەوە پەیوەندی بە تۆوە نیە.
- پەیوەندی بە منەوە نیە؟
- لە بری تۆ، باشترە من پرسیارت لێبکەم؛ بۆچی باوکم هەرگیز ناکەوێتە ماڵەوە؟ مەگەر لەبەرئەوە نەبێت کە هەردووکتان ترسنۆکن و ناوێرن لەیەک جیاببنەوە؟ لەوانەشە لە ژێرەوە دڵدارێکت هەبێت و نە من و نە باوکیشم پێمان نەزانیبێت، کێ دەزانێ؟ چەندەها و چەندەها پرسیاری تریشم هەیە... دەبینی، منیش دەتوانم پرسیار بکەم.
- بەهەرحاڵ، وابزانم پێویستیمان بە دانیشتنێکی بچکۆلە هەیە.
- لەوانەیە، بەڵام ئێستاکە هێندە ماندوو و شەکەتم، ڕێک دەچمە ناو جێگاوە و دەخەوم. لەسەرو ئەوەشەوە خوێنم هەیە.
ئەمەی گوت و بەدەم گریانەوە ڕایکردە سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆی.
کەمێک پاش تەواوبوونی کاری تەوالێت، سەری خنیە ژێر سەرینەکەی و دایکی هاتە ژوورەکەیەوە.
هەرچەندە سۆفیا دەیزانی کە دایکی باوەڕی پێناکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی کردبوو بە خەوتوو. لەلایەکی تریشەوە، دایکی دەیزانی کە سۆفیا دەزانێ کە ئەو باوەڕی پێناکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دایکی وا خۆی نیشاندا کە بڕوای پێدەکات. لەسەر قەراغی جێگاکەی دانیشت و دەستی بەسەریدا دەهێنا.
سۆفیا لە دڵی خۆیدا دەیگوت؛ چەندە سەختە گەر لە هەمان کاتدا لە دوو ژیاندا بژین. بەڵام لەلایەکی ترەوە خۆشبەختانە چاوەڕوانی کۆتایی کۆرسی فەلسەفەکەی دەکرد... کێ دەزانێ، لەوانەیە تا ڕۆژی

جەژنی لەدایک بوونەکەی تەواوبێت، یان لە جەژنی یۆحەنادا، چونکە باوکی هیلدە لەو ڕۆژەدا لە لوبنانەوە دەگەڕێتەوە... لە پڕێکدا گوتی؛
- پێم خۆشە ئاهەنگێک بە بۆنەی ڕۆژی لەدایک بوونمەوە بگێڕم.
- بیرێکی باشە، دەتەوێت کێ بانگ بکەیت؟
- زۆر کەس... بۆم هەیە؟
- بێگومان. باخچەیەکی گەورەمان هەیە و ... لەوانەشە وەک ئەمڕۆ ئاووهەوا خۆش بێت.
- بەڵام پێم خۆشە لە ڕۆژی جەژنی یۆحەنادا بێت.
- بۆ نا، هەر چۆنێکت پێ خۆش بێت وا دەکەین.
- ڕۆژێکی گرنگە، سۆفیا ئەمەی گوت و چیتریش تەنها بیری لە ڕۆژی لەدایکبوونەکەی نەدەکردەوە.
- بەڵێ...
- هەستدەکەم لەم ماوەیەی دواییەدا زۆر گەورەبووم.
- شتێکی نایابە... پێت وا نیە؟
- بەڕاستی نازانم...
هەتا ئێستاکە کە ئەم قسانەی دەکرد، سۆفیا سەری هەر لە ژێر سەرینەکەدا بوو. ئەوجا دایکی گوتی؛
- بەڵام پێم خۆشە پرسیارێکت لێبکەم... بۆچی لەم دواییانەدا هێندە سەیر ڕەفتار دەکەیت؟
- تۆش کە پانزەساڵان بوویت، هەر ئاوها نەبوویت؟
- بێگومان منیش وابووم، بەڵام خۆ لە مەبەستم تێدەگەیت؟
سۆفیا ڕوویکردە دایکی و گوتی؛
- سەگەکە ناوی هێرمسە.
- بەڵێ.

ـ خاوەنەکەشی ناوی ئەلبێرتۆیە.
ـ باشە.
ـماڵیان لە گەڕەکە کۆنەکەی شارە.
ـ هێندە دور دوای سەگەکە کەوتیت؟
ـ هیچ شتێکی ترسناکی تێدا نیە!
ـ بەڵام تۆ گوتت زۆر جاری تریش، هەر هەمان سەگ هاتۆتە ئێرە.
ـ شتی وام گوت؟
کەمێک بیریکردەوە... ئەو دەیویست زۆربەی زۆری بەسەرهاتەکەی بۆ باس بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی هەموو شتێکی پێبڵێت.
ئەوجا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛
ـ تۆ کەم دەکەویتە ماڵەوە.
ـ ڕاست دەکەیت، سەرم زۆر قاڵە.
ـ ئەلبێرتۆ و هێرمس زۆر کەڕەت هاتونەتە ئێرە.
ـ بۆ چ شتێک هاتوون؟ هاتووشنەتە ژوورەوە؟
ـ ناتوانیت یەکە یەکە پرسیاربکەیت؟ نەخێر نەهاتوونەتە ژوورەوە، بەڵام زۆر جاران پیاسەی ناو دارستانەکە دەکەن... ئەمەشت بەلاوە سەیرە؟
ـ بە هیچ جۆرێک.
ـ هەروەک هەموو کەسێکی دی، بە بەردەمی ماڵی ئێمەدا تێدەپەڕین. ڕۆژێکیان لە قوتابخانە هاتمەوە و چاوم بە هێرمس کەوت، منیش دەستێکم بەسەریدا هێنا. ئا بەم شێوەیە ئەلبێرتۆم ناسی.
ـ ئەی کەروێشکە سپیەکە و شتەکانی تر چی؟
ـ ئەوە شتێک بوو کە ئەلبێرتۆ گوتی. ئەو بەڕاستی فەیلەسوفێکی ڕاستەقینەیە. باسی هەموو فەیلەسوفەکانی بۆ کردوم.

ـ هەروا لەسەر پەرژینی باخچەکەوە؟
ـ نەخێر دادەنیشین. بەڵام تا ئێستا چەندەها نامەشی بۆ نووسیوم، لە ڕاستیدا زۆر زۆر. جارجارێک بە پۆستدا دەینارد و جارجارێکیش کە لەگەڵ سەگەکەیدا دەهاتن بۆ پیاسەی دارستان، بەدەستی دەیخستە ناو سندوقی پۆستەکەوە.
ـ کەواتە ئەوە، ئەو "نامە دڵداریانە" بوون کە باسمان دەکردن، وا نیە؟
ـ بەڵێ، بەڵام نامەی دڵداری نەبوون.
ـ تەنها لەسەر فەلسەفە شتی بۆ دەنووسیت؟
ـ بەڵێ... پێت سەیرە، ها! ئەوەندەی لەوەوە فێربووم، لە هەشت ساڵی قوتابخانە زۆر زیاترە. بۆ نمونە، تۆ هەرگیز ناوی جیۆردانۆ برونۆت بیستووە، کە لە ساڵی 1600دا بە ئاگر سوتاندیان؟ یان هیچت دەربارەی یاسای هێزی کێشکردنی گەردوونی نیوتنت بیستووە؟

ـ نەخێر، زۆر شت هەن کە من نایانزانم...
ـ ئەگەر باشت بناسم... تەنانەت ناشزانیت بۆچی زەوی بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە، هەرچەندە زەوی ئەو ئەستێرەیەیە کە خۆتی لەسەر دەژیت!
ـ تەمەنی چەند دەبێت؟ ...هەروا بە نزیکەیی.
ـ نازانم، بێگومان پەنجا دەبێت.
ـ بەڵام پەیوەندی ئەو بە لوبنانەوە چیە؟
ئەوجا شێوا، سۆفیا لە یەک کاتدا بیری لە دە شت دەکردەوە. لە هەموویان باشتری هەڵبژارد و گوتی؛

ـ ئەلبێرتۆ برایەکی هەیە، مێجەری هێزی نەتەوە یەکگرتووەکانە و خەڵکی لیللەساندە. لەوانەیە ئەو بووبێت کە کاتی خۆی لە کوخەکەی مێجەردا دەژیا.
ـ ناوی ئەلبێرتۆت بەلاوە سەیر نیە؟
ـ لەوانەیە.
ـ لە ناوێکی ئیتاڵی دەچێت.
ـ بەڵێ، بەڵام تا ڕادەیەک هەرچی شتێک کە مانای هەبێت، یان لە یۆنانەوە هاتووە یان لە ئیتاڵیاوە.
ـ بەڵام خۆ هیچ نەبێت نەرویجی دەزانێت.
ـ وەک من و تۆ قسە دەکات.
ـ دەزانی چیم بە خەیاڵدا هات، سۆفیا؟ ...بەڕای من دەبێت ڕۆژێک بانگی بکەیتەماڵەوە. لە ڕاستیدا من لە ژیانمدا فەیلەسوفی ڕاستەقینەم نەدیوە.
ـ با بزانین چۆن دەبێت.
ـ دەتوانین بۆ ڕۆژی لەدایکبوونەکەت بانگی بکەین؟ لەوانەیە خۆش بێت گەر چەند نەوەیەک تێکەڵبێت. ئەوسا لەوانەیە ڕێگەی منیش بدەن بەشداربم. بەلایەنی کەمەوە دەتوانم خزمەتتان بکەم، بیرێکی باش نیە؟
ـ ئەگەر بیەوێت. هەرچۆنێک بێت لەگەڵ ئەودا قسە بکەیت سوودی زیاترە و گرنگتریشە وەک لەوەی لەگەڵ کوڕێکی پۆلەکەدا دانیشیت، بەڵام...
ـ بەڵام چی؟
ـ بێگومان ئەوسا هەمووان وا دەزانن ئەلبێرتۆ دڵداری نوێی منە.
ـ تۆش ڕاستیەکەیان پێدەڵێیت و هیچی تر.

ـ با بزانین چۆن دەبێت.
ـ با بزانین. بە ڕاست، شتێکم بیرکەوتەوە سۆفیا... ڕاستە هەموو کاتێک پەیوەندی من و باوکت باش نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز خیانەتم لێ نەکردووە و بیرم لە هیچ پیاوێکی تر نەکردۆتەوە...
ـ بە ڕاستی ئێستا حەز ئەکەم بخەوم. سکم زۆر دێشێ.
ـ حەبێکت بۆ بێنم؟
ـ بەڵێ سوپاس.
کاتێک دایکی بە حەبێک و پەرداخێک ئاوەوە گەڕایەوە، سۆفیا خەوی لێکەوتبوو.

ڕۆژی 31ی پێنج، پێنج شەممە بوو. سۆفیا لە دواهەمین کاتژمێری قوتابخانەدا تەواو بێزابووبوو. لەو کاتەوەی دەستی دابووە کۆرسی فەلسەفەکە، لە زۆر بابەتدا زیرەکتر بووبوو. جاران لە هەموو بابەتەکاندا نمرەکانی لە نێوان "باشە" و "زۆر باشە"دا بوو. بەڵام مانگی پێشوو، هەم لە دارشتن و هەم لە کۆمەڵناسیشدا "زۆر باشە"ی وەرگرت. وانەی ماتماتیکیش زیاتر هەر وەک خۆی مایەوە.
دواهەمین وانە، داوایان لێکرا بە ئارەزوی خۆیان دارشتنێک بنووسن. سۆفیاش بابەتی "مرۆڤ و تەکنەلۆجیا"ی هەڵبژارد. بەڕاشکاوی لەسەر ڕێنیسانس و پێشکەوتنی زانستی نووسی، دەربارەی بینینی نوێی سروشت و دەربارەی فرانسیس بەیکۆنشی نووسی کە کاتی خۆی گوتی "زانین دەسەڵاتە". هەروەها شتێکیشی سەبارەت بە میتۆدی نوێی زانستیش باس کرد. زۆر بە وردیش باسی میتۆدی ئیمپیریکی کرد و ڕونیکردەوە کە بە چ شێوەیەک لە پێش دۆزینەوە زانستیەکانەوە

هاتووە. پاشانیش بەپێی خەیاڵی خۆی، چەند شتێکی جیاوازی دەربارەی لایەنە خراپەکانی تەکنەلۆجیا نووسی. لە کۆتایشدا نووسی؛ هەرچی شتێک کە مرۆڤ دەیکات، دەکرێت هەم بە باشە و هەم بە خراپەش بەکاربهێنرێت، چونکە باشە و خراپە وەک دوو پەتی چنراوی ڕەش و سپی وان. هەندێ جاریش هێندە نزیکی یەک دەبنەوە، کە سەختە لە یەکتر جودابکرێنەوە.

ماموستاکە کاتێک دەفتەرەکانی گەڕاندەوە، بە چاوێکی سەیر و پڕ گومانەوە تەماشای سۆفیای کرد.

"زۆر زۆر باشە"ی وەرگرت و لەسەر دەفتەرەکەشی نووسرابوو؛ "ئەم هەموو زانیاریانەت لە کوێوە هێناوە؟"

سۆفیا قەڵەمەکەی دەرهێنا و بە خەتێکی گەورە لەسەری نووسی؛ "فەلسەفە دەخوێنم."

لە کاتی داخستنی دەفتەرەکەیدا، شتێک لەناو پەڕەکانیەوە کەوتە خوارەوە. پۆستکارتێکی لوبنان بوو. سۆفیا بەسەر مێزەکەیدا چەمایەوە و دەستیکرد بە خوێندنەوەی کارتەکە؛

هیلدە گیان؛ کاتێک ئەم وشانەم دەخوێنیتەوە، هەروەک لە تەلەفونەکەدا باسمانکرد، هەواڵی مردنە دڵتەزێنەکەی ئێرە بڵاوبۆتەوە... من زۆر جاران لە خۆم دەپرسم؛ چی ڕوودەدات ئەگەر مرۆڤ کەمێک باشتر بیربکاتەوە... بڵێیت ئیتر بتوانێت بەو شێوەیە ڕێگەی ڕوودانی شەڕ و زەبروزەنگ بگرێت؟ لەوانەیە باشترین ڕێگە دژ بە شەڕ و زەبروزەنگ، کۆرسێکی بچکۆلەی فەلسەفە بێت. ڕات چیە گەر "کورتەیەیەکی فەلسەفی" لە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ هەموو مرۆڤێکی سەر زەوی ڕەوانە بکرێت و هەریەکەیان بە زمانی خۆیان

بیخوێننەوە. من ئەم بیرۆکەیە بۆلای سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرزدەکەمەوە.
لە تەلەفونەکەتدا گوتت، ئێستاکە باشتر ئاگاداری شتەکانت دەکەیت. زۆرم پێ خۆشە، چونکە تۆ بێ سەروبەرترین مرۆڤی کە لە ژیانمدا بینیبێتم. گوتت لەو کاتەوەی کە دواجار بە تەلەفون پێکەوە قسەمان کرد، تەنها دە کرۆنیەکت ون کردووە. هیلدە گیان، من هەوڵدەدەم بۆت بدۆزمەوە. وەک دەزانی خۆم لەماڵەوە دورم، بەڵام هێشتام دەستێکی یارمەتیم لەوێ هەر ماوە. "ئەگەر دە کرۆنەکەم دۆزیەوە، ئەوا دەیخەمە ناو دیاری ڕۆژی لەدایکبوونەکەتەوە". لەگەڵ خۆشەویستی بابەدا، کە وا هەست دەکات لە ئێستاوە پێی خستۆتە سەر ڕێگای گەڕانەوە.

زەنگی تەواوبوونی دواهەمین وانە، لەگەڵ تەواوبوونی خوێندنەوەکەی سۆفیادا لێدرا. دیسانەوە چەندەها و چەندەها پرسیاری تری بە مێشکدا دەهات و دەچوو.
هەروەک هەموو جارێک، لە حەوشەی قوتابخانەکەدا چاوی بە یۆرون کەوت. سۆفیا لە ڕێگەی ماڵەوەدا جانتاکەی کردەوە و پۆستکارتە نوێکەی نیشانی برادەرەکەی دا. پاشان یۆرون پرسی؛
ـ مۆری چ ڕۆژێکی پێوەیە؟
ـ بێگومان 15ی شەش...
ـ نا، نا، بوەستە... نووسراوە 1990/5/30.
ـ دوێنێیە... واتە تەنها یەک ڕۆژ لەدوای ڕوداوەکەی لوبنانەوە گەیشتووە.
ـ گومانم هەیە پۆستکارتێک لە لوبنانەوە بە یەک ڕۆژ بگاتە نەرویج.

ـ بەتايبەتيش گەر ئەم ناونيشانە نائاساييە ڕەچاوبكەين. "هيلدە ميوللە كنەی، لە ڕێگەی سۆفيا ئامۆنسنەوە، قوتابخانەی فۆروليای گەنجان..."
ـ لەو بڕوايەدايت بە پۆستدا هاتبێت؟ پاشانيش مامۆستا لەناو دەفتەرەكەتدا داينابێت؟
ـ نازانم، پێشم وا نيە بوێرم پرسياربكەم.
لەمە زياتر لەسەر پۆستكارتەكە نەڕۆيشتن. پاش ماوەيەك سۆفيا گوتی؛
ـ دەمەوێت لە ڕۆژی جەژنی يۆحەنادا ئاهەنگێكی گەورە سازبكەم.
ـ كوڕانيش دێن؟
سۆفيا شانێكی هەڵتەكاند.
ـ پێويست ناكات بێ ئەقڵترين كوڕ بانگبكەين، خۆت دەزانيت.
ـ بەڵام يۆرگين بانگ دەكەيت؟
ـ ئەگەر پێت خۆش بێت، بۆ نا. بە ڕاست... لەوانەيە ئەلبێرتۆ كنۆكسيش بانگ بكەم.
ـ وا بزانم تەواو شێت بوويت.
ـ دەزانم.
هێندە فريا كەوتن پێكەوە بدوێن و ئيدی لەلای بازاڕەكەوە لێك جيابوونەوە.
سۆفيا هەر كە گەيشتەماڵەوە، يەكسەر لە باخچەكەدا چاوی بۆ هێرمس گێڕا. بە ڕاستيش بينی؛ لەناو دار سێوەكاندا دەخولايەوە.
ـ هێرمس!
سەگەكە نزيكەی چركەيەك ڕێك لە شوێنی خۆيدا وەستا. سۆفياش دەيزانی لە ماوەی ئەو چركەيەدا چی ڕوويدا؛ سەگەكە گوێی لە

دەنگەکە بوو... ناسیەوە، ئەوسا بۆ ئەوەی بزانێت کە ئەو لە وێدایە، بڕیاریدا بەرەوپیری دەنگەکە بڕوات. هەرکە چاویشی بە سۆفیا کەوت، بەڕاکردن بەرەوڕوی هات. لە دواجاریشدا هەر چوار پەلی وەک داری تەپڵ بەڕێوە دەڕۆیشتن.

بەڕاستی ئەو هەمووە زۆرە لە ماوەی یەک چرکەدا ڕوودات.

بە ڕاکردن بەرەوڕووی هات و کلکی بۆ ڕاوەشاند، پاشانیش خۆی بۆ سۆفیا هەڵدا.

- هێرمس، سەگە زیرەکەکە! هێواش، هێواش... مەملێسەرەوە. لە شوێنی خۆت دانیشە... ئافەرم، ئاوها.

سۆفیا دەرگای ماڵەوەی کردەوە، لەو کاتەدا شێریکانیش لە نێوان پەرژینەکانەوە هاتە دەرەوە... کەمێک بە گومانەوە لە سەگەکەی دەڕوانی. بەڵام سۆفیا خواردنی بۆ دانا و تۆویشی بۆ تووتیەکانی ڕۆکرد، پاشانیش گەڵایەکی کاهوی خستە بەردەمی کیسەڵەکەی، دواجار پەڕەیەکی چکۆلەی بۆ دایکی جێهێشت و لەسەری نووسی؛ هێرمس دەبەمەوە ماڵەوە و ئەگەریش تا کاتژمێری حەوت نەهاتمەوە ، ئەوا تەلەفونێکت بۆ دەکەم.

پێکەوە بەناو شاردا ڕۆیشتن، ئەمجارەیان سۆفیا لەبیری بوو پارە لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێت. بیری لەوە دەکردەوە لەگەڵ هێرمسدا بە پاس بڕوات، بەڵام وای بەباش زانی لە پێشدا پرس بە ئەلبێرتۆ بکات.

سۆفیا کاتێک لە پشت هێرمسەوە دەڕۆیشت، بیری لە سروشتی گیانەوەر دەکردەوە. جیاوازی سەگ و مرۆڤ چیە؟ وتەکانی ئەریستۆتالیسی هاتەوە خەیاڵ، ئەو دەیگوت؛ هەم ئاژەڵ و هەم مرۆڤیش هەردووکیان بوونەوەری زیندووی سروشتین و چەندەها خاڵی

گرنگی هاوبەشیان لە نێواندایە. بەڵام جیاوازیەکی بنەڕەتی نێوانیان ئەوەیە کە مرۆڤ خاوەنی ژیرێتییە.
چۆن دەیتوانی هێندە لەو جیاوازیە دڵنیابێت؟
لە لایەکی تریشەوە بەپێی دیمۆکریتس، مرۆڤ و گیانلەبەر هەر زۆر لەیەکەوە نزیکن، چونکە هەردوولا لە ئەتۆم پێکهاتوون. جگە لەمەش بە بڕوای ئەو ڕۆحی مرۆڤ و ڕۆحی ئاژەڵیش نەمر نیە. بەپێی دیمۆکریتس، ڕۆحیش لە ئەتۆمی چکۆلە پێکهاتووە و کاتێکیش مرۆڤ دەمرێت، بە هەموو لایەکدا بڵاودەبێتەوە. لە ڕوانگەی ئەوەوە، ڕۆح بە شێوەیەک بە مێشکەوە نووساوە کە بە هیچ جۆرێک بواری لێک جیابوونەوەی نیە.
بەڵام چۆن ڕێی تێدەچێت ڕۆح لە ئەتۆم پێکهاتبێت؟ خۆ ڕۆح وەک بەشەکانی تری لەش نیە کە دەستی لێبدەین و هەستی پێبکەین... بەڵکو ڕۆح شتێکی "ڕۆحانیە."
گۆڕەپانە گەورەکەیان بڕی و لە گەڕەکە کۆنەکە نزیک بوونەوە. کاتێک گەیشتنە سەر ئەو شۆستەیەی دە کرۆنەکەی تێدا دۆزیەوە، بەخۆی نەبوو، یەکسەر بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی تەماشایەکی قیرەکەی کرد. ئێستاکە لەوێدا، ڕێک لەو شوێنەدا کە دانەویەوە و دە کرۆنەکەی هەڵگرتەوە، پۆستکارتێک بە ڕووی وێنەکەیدا کەوتبوو. وێنەکەش باخێکی دارخورما و دار پرتەقاڵی تێدابوو.
سۆفیا دانەویەوە و کارتەکەی هەڵگرتەوە، لەهەمان کاتیشدا هێرمس مرخە مرخی دەکرد. لەوە دەچوو پێی خۆش نەبێت سۆفیا کارتەکە هەڵگرێتەوە.
لەسەر پۆستکارتەکە نووسرابوو؛

هیلدە گیان؛ ژیان زنجیرە ڕێکەوتێکی دورودرێژە... دور نیە ئەو دە کرۆنەی کە تۆ ونتکرد، لێرەدا نەدۆزرابێتەوە. لەوانەیە پیرێژنێک کە کاتێک چاوەڕوانی پاسی کریستیانساندی کردووە، لە گۆڕەپانەکەی لیللەساندا دۆزیبیەتەوە. لەوانەیە لەوێشەوە بە شەمەندەفەر چووبێت بۆ سەردانی کچەکەی، ئەوجا پاش چەندین کاتژمێر، هاتبێتەوە و لێرەدا لە گۆڕەپانی نوێدا دە کرۆنەکەی ونکردبێتەوە. پاشانیش زۆر ڕێی تێدەچێت کچێک هەمان ئەو دە کرۆنەی لەو کاتەدا دۆزیبێتەوە کە زۆر پێویستی پێ بووە، بۆ ئەوەی سواری پاس بێت و بگەڕێتەوەماڵەوە. لەوانەیە وابووبێت هیلدە گیان، کێ دەزانێت؟ بەڵام ئەگەر بە ڕاستی ڕوداوەکە وابووبێت، ئەوا بەلایەنی کەمەوە دەبێت ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین؛ بڵێیت جۆرە چاودێریکردنێکی خوایانە بوونی نەبێت؟
لەگەڵ خۆشەویستی بابەدا، کە بەخەیاڵ لەسەر پردی بەندەرەکەی لیللەساند دانیشتووە.
تێبینی؛ وەک بیرتە لەوەوپێش بۆم نووسیت یاریدەت دەدەم دە کرۆنەکەت بۆ بدۆزمەوە!

لە شوێنی ناو نیشانەکەشدا نووسرابوو "هیلدە میوللە کنەی، لە ڕێگەی ڕێبوارێکی ڕێکەوتەوە..." کارتەکە لە ڕۆژی 6/15دا مۆری لێدرابوو.
سۆفیا بە سوکە ڕاکردنێک بەسەر قادرمەکاندا دوای هێرمس کەوت. هەر کە ئەلبێرتۆ دەرگاکەی کردەوە، سۆفیا گوتی؛
ـ خۆت لە بەرپرسیاری قورتارکە پیرە. فەرموو پۆستەچیەکە هات.

سۆفیا هەستیدەکرد لەسەر هەقە و ئاساییە گەر کەمێک تورە ببێت، بەڵام ئەلبێرتۆ ڕێگەی پێدا بێتە ژوورەوە و هێرمسیش هەروەک جاری پێشوو لەژێر تەختەی جل هەڵواسینەکەدا پاڵکەوت.
- چیە کچەکەم، سەرلەنوێ مێجەر کارتی تری ناردووە؟
سۆفیا تەماشایەکی کرد... ئەوجا بینی کە ئەمڕۆکە جلوبەرگێکی تری پۆشیووە. یەک و دوو سەرنجی چووە سەر بارۆکەکەی سەری، لول و درێژ هاتبووە خوارەوە. پاشان جلوبەرگە پان و فشەکەی بینی، سەرتاپا بە قەیتانی نەخشدار داپۆشرابوو. ڕەفتەیەکی ئاوریشمی لە ملەوە پێچابوو و چاکەتێکی سووریشی بەسەر هەموو جلەکانیدا لەبەرکردبوو. جوتێ پێڵاوی ناسکی بریقەدار و دوو گۆرەوی سپی تەسکی لە پێدابوو. هەموو ئەمانە پێکەوە، وێنەی لویسی چواردەی دەخستەوە بیری سۆفیا.
- بڕۆ هەی گاڵتەجار! سۆفیا ئەمەی گوت و کارتەکەی دەستی بۆ درێژکرد.
- ئمم... تۆش بە ڕاستی دە کرۆنت لەهەمان شوێنی کارتەکەدا دۆزیەوە؟
- بەڵێ، ڕێک لەوێدا.
- کەمە کەمە خەریکە زیاترو زۆرتر بێشەرمانە دێتە پێشێ، بەڵام لەوانەیە ئەمە شتێکی باش بێت.
- چۆن چۆنی؟
- بەم شێوەیە دۆزینەوەی ئاسانترە، بەڵام لەلایەکی ترەوە کارەکەی هەم جوان دێتە بەرچاو و هەم بۆگەنیشی لێدێت. هەست دەکەم بۆگەنی عەترێکی ناخۆشی لێدێت.
- عەتر؟

ـ بەڕواڵەت قەشەنگ و جوان دیارە، بەڵام لە ڕاستیدا هەمووی فێڵ و تەڵەکەیە. نابینیت... خۆی هەمیشە چاوێکی لەسەرمانە و دەخوازێت چاودێریە پیسەکانی خۆیمان لەگەڵ چاودێری خودادا بەراوردبکات.
پەنجەی بۆ کارتەکە ڕاکێشا و پاشان هەروەک جاری پێشوو لەت وپەتی کرد. سۆفیاش بۆ ئەوەی لەوە زیاتر مەزاجی ئەلبێرتۆ تێکنەدات، بە هیچ جۆرێک باسی کارتەکەی تری نەکرد کە لە دەفتەری داڕشتنەکەیدا بۆی دانرابوو.
ـ لە ژوورەوە دادەنیشین. ئێستا کاتژمێر چەندە؟
ـ چوارە.
ـ ئەمڕۆ باسی سەدەی حەڤدە دەکەین.
پێکەوە چوونە ناوەوە و هەروەک جاری پێشوو دانیشتن. سۆفیا سەرنجیدا کە ئەلبێرتۆ هەندێ لە شتەکانی جاری پێشووی لابردووە و لەجیاتی وان شتی تری داناوە.
لەسەر مێزەکە هەندێ چاوی چاویلکەی لەنێو سندوقێکی کۆنی خشڵدا دانابوو. لەتەنیشتیشیەوە کتێبێکی یەکجار کۆنی کردبووەوە.
ـ ئەوە چیە؟
ـ چاپی یەکەمی کتێبە بەناوبانگەکەی دیکارتە"Descarte" ، کە ناوی نا "دەربارەی میتۆد". ئەم کتێبە لە ساڵی 1637دا چاپکرا و یەکێکە لە شتە هەرە گرانبەهاکانم.
ـ سندوقەکەش...
ـ ...هەندێ هاوێنەی دەگمەنی تێدایە. لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەدا لە لایەن سپینۆزا "Spinoza" ی فەیلەسوفی هۆڵەندیەوە دروستکراون. پەیداکردنیان یەکجار گران کەوت لەسەرم، بەڵام ئەمانەش بەشێکن لە کۆکراوە بەنرخەکانم.

- ئەگەر بزانم دیکارت و سپینۆزا کێن، ئەوا بێگومان باشتر لە بەهای ئەم شتە بە دەگمەنانەت تێدەگەم.
- بێگومان، بەڵام با لە پێشدا هەوڵدەین کەمێک لەو سەردەمە شارەزا ببین کە ئەوانی تێدا دەژیان. فەرموو با لێرەدا دابنیشین.
هەروەک جاری پێشوو دانیشتن؛ سۆفیا لەسەر کورسیە کۆنەکە و ئەلبێرتۆش لەسەر قەنەفەکە. لەنێوانیشیاندا مێزەکەی کە سندوقە بچکۆلەکە و کتێبە کراوەکەی لەسەربوو. پێش ئەوەی دابنیشن ئەلبێرتۆ بارۆکەکەی داکەند و لەسەر مێزی نووسینەکە داینا.
- لەماوەی داهاتودا باسی سەدەی حەڤدە دەکەین، یان ئەو ماوەیەی کە پێی دەگوترێت "سەردەمی بارۆک."Baroque Period
- سەردەمی بارۆک؟ چ ناوێکی سەیرە!
- وشەی "بارۆک" لە وشەیەکەوە هاتووە کە لە بنەڕەتدا مانای "مرواری نارێک" دەبەخشێت. هونەری سەردەمی بارۆک چەواشەتر و دژوارتربوو لە هونەری ڕێنیسانس، کە زیاتر ساکاری و هاوئاهەنگی پێوە دەبینرا. بەشێوەیەکی گشتی لە سەدەی حەڤدەدا، بەئاشکرا جۆرە گرژییەکی نێوان دژایەتییە نەگۆڕەکان دەردەکەوت؛ لەلایەکەوە نەشئەی پڕ لەژیانی ڕێنیسانس بەردەوامی پێدەدرا و لەلایەکی تریشەوە خەڵکانێک نکۆڵییان لەم ژیانە دەکرد و هەوڵیان دەدا لە گۆشەنشینی ئاینیدا بژین. هەم لە هونەر و هەم لەژیانی ڕاستەقینەی ئەم سەردەمەدا، جۆرە کرانەوەیەک بەڕووی ژیانێکی نایاب و قەشەنگدا بەرچاو دەکەوێت. بەڵام لە هەمان کاتیشدا بزووتنەوەیەکی کڵێسەیی وا سەریهەڵدا کە پشتی لە هەموو جیهان کرد.
- بەشێوەیەکی تر بیڵێین، هەم قەڵای بەشکۆ و لەبەرچاو و هەم کڵێسەی دور لە ژیان و شاراوەش.

- بەڵێ، دەتوانین بەو شێوەیە دەریببڕین. یەکێک لە دروشمەکانی سەردەمی باڕۆک، گوزارەی لاتینی "Carpe diem" بوو (واتە ڕۆژەکە بقۆزەرەوە). گوزارەیەکی تری لاتینیش کە ببووە دروشمێکی تری سەردەمەکە، "Memento mori"بوو، واتە "لەیادت بێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر دەمریت". لە هونەری وێنە کێشاندا، تابلۆیەک چەندین لایەنی چاوتێری ژیانی دەردەخست، بەڵام لە سوچێکیشەوە پەیکەری ئێسکی مرۆڤێکیان دەکێشا. سەردەمی باڕۆک لەزۆر لایەنەوە خاسیەتی ڕواڵەت پەرستی و ڕووکەشێتی لەخۆگرتبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خەڵکانێک هەبوون کە دیوی ئەو دیوی ژیانیان دەدی و بەتەواوەتیش لە ڕووکەشی هەموو شتەکان بەئاگابوون. واتە دەیانزانی شتە جوانەکانی چواردەورمان، ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت بفەوتێن و نەمێنن.

- بەڵام ئەمە ڕاستیەکە و لەو بڕوایەشدام گەر بەو شێوەیە بیربکەینەوە کە هیچ شتێک بۆ هەتاهەتایە نامێنێتەوە، ئەوا بێگومان هەست بە دڵتەنگی دەکەین.

- لێرەدا ڕێک وەک زۆرینەی خەڵکی سەدەی حەڤدە بیردەکەیتەوە. لەلایەنی ڕامیاریشەوە، سەردەمی باڕۆک سەردەمی ململانێ مەزنەکان بوو. ئەوروپا بەهۆی شەڕەوە لەتوپەت بووبوو. نالەبارترین شەڕیش ئەو شەڕی سیساڵیە بوو کە ناوچەیەکی گەورەی گرتەوە و لەساڵی 1618وە تا 1648 درێژەی خایاند. لە ڕاستیدا کۆمەڵێ شەڕی یەک بەدوای یەک ڕوویاندا و بەتایبەتیش بەسەر ئەڵمانیادا شکایەوە. یەکێک لەو ئەنجامانەش کە بەدوای شەڕی سی ساڵیدا هات، ئەوە بوو کە فەڕەنسا بووە هێزێکی سەردەستی ئەوروپا.

- لەسەر چی شەڕیان دەکرد؟

ـ بەپلەی یەکەم، شەڕی نێوان پرۆتستاند و کاتۆلیک بوو، بەڵام بێگومان مەغزای بەدەست هێنانی هێزی ڕامیاریشی لەناودا هەبوو.
ـ هەروەک لوبنان.
ـ جگە لەمانەش، جیاوازی چینایەتی خاسیەتێکی تری سەدەی حەڤدە بوو. بێگومان بەگزادە فەڕەنسیەکان و دارودەستەی شایانەی فێرسای "Versailles"ت بیستووە. نازانم ئەگەر بە هەمان شێوەش دەربارەی هەژاری خەڵکەکەی شارەزابیت. بەڵام هەموو دەرکەوتنێک گرێدراوی دەرکەوتنی دەسەڵاتە. دەڵێن باری ڕامیاری سەردەمی بارۆک دەکرێت لەگەڵ هونەر و بیناسازی سەردەمەکەیاندا بەراورد بکرێت. بیناکانیان پڕبوون لە گۆشەی پێچاوپێچ و ئاڵۆز و نادیار، بە هەمان شێوەش لایەنی ڕامیاریان پڕبوو لە کوشتنی لابەلا و فێڵ و پیلان و دەسیسە نانەوە.
ـ پاشایەکی سویدیش لە شانۆیەکدا نەکوژرا؟
ـ مەبەستت لە گۆستاڤی سێهەمە"Gustav.3" ، بەڵێ، نمونەیەکی زۆر باشت هێنایەوە. هەرچەندە گۆستاوی سێهەم لە ساڵی 1792دا کوژرا، بەڵام بارودۆخی کوشتنەکەی بە هەمان شێوەی سەردەمی بارۆک بوو. ئەو لە ئاهەنگێکی گەورەی ڕووبەند پۆشیدا کوژرا (*ئەو ئاهەنگەی کە بەشداران دەموچاوی خۆیان بە دەموچاوێکی دەستکرد هەڵدەپێچن.و).
ـ وام دەزانی لە شانۆدا کوژرا.
ـ ئاهەنگی ڕووبەند پۆشینەکە لە ئۆپێراکەدا سازکرا. دەتوانین بڵێین لەگەڵ کوشتنی گۆستاوی سێهەمدا، سەردەمی بارۆکی سویدی کۆتایی هات. لە کاتی فەرمانڕەوایدا ئەودا، خۆی وەک "تاکە کەسێکی ستەمکار" دەسەڵاتی لەدەستدا بوو، هەروەک لویسی چواردەی فەڕەنسا کە سەد ساڵ لەپێش ئەودا دەسەڵاتی هەبوو. گۆستاوی سێهەم

مرۆڤێکی ڕواڵەت پەرستبوو و حەزی لە هەموو جۆرە ئاهەنگێکی شێوە فەڕەنسیانەی دەکرد. دەشتوانیت وەک تێبینیەک لای خۆت بینووسیت کە ئەو حەزی لە شانۆ بوو...

ـ هەر بەوەش کۆتایی هات.

ـ بەڵام لە سەردەمی بارۆکدا تەنها وەک شێوە دەربڕینێکی هونەری تەماشای شانۆیان نەدەکرد، بەڵکو لە هەمان کاتدا وەک سیمبولێکی هەرە بەکارهێنراوی ئەو سەدەیەش دەیانبینی.

ـ سیمبولی چی بوو؟

ـ ژیان، سۆفیا. نازانم لەسەدەی حەڤدەدا چەند کەڕەت گوتویانە "ژیان شانۆیە". بەڵام هەرچۆنێک بێت زۆر کەڕەت ئەمەیان دوپات دەکردەوە. ڕێک لەسەردەمی بارۆکدا بوو کە شانۆی مۆدێرن سەریهەڵدا، بە هەموو پەردە جیاوازاکان و ئامێرە شانۆییەکانەوە. لەسەر تەختەی شانۆدا نمایشێکی خەیاڵیان پێشکەشدەکرد، تەنها بۆ ئەوەی دەریخەن کە شانۆ خەیاڵێکەو هیچی تر. بەم شێوەیەش بەرە بەرە شانۆ وێنەیەکی ئاسایی ژیانی مرۆڤی دەخستەڕوو. بۆ نمونە لەڕێگەی شانۆوە بابەتی وەک لوتبەرزیان ڕوون دەکردەوە و نیشانیان دەدا کە ڕووخان و کەوتنی بەدوادادێت، یان وێنەی مرۆڤێکیان دەخستەڕوو کە مایەی بەزەیی پیاهاتنەوە و خەملێخواردن بێت.

ـ شکسپیر لەکاتی بارۆکدا دەژیا؟

ـ شانۆگەریە گەورەکانی لە نزیکەی ساڵی 1600دا نووسی. دەتوانین بڵێین نیوەی ژیانی لە ڕێنیسانسدا و نیوەکەی تریشی لە سەردەمی بارۆکدا بردەسەر. بەڵام هەر لەسەرەتاوە کارەکانی پڕبوون لەو ڕستانەی کە دەڵێت ژیان وەک شانۆیەکە وایە. دەتەوێت نمونەت بۆ بهێنمەوە؟

ـ بەخۆشیەوە گوێت بۆ شلدەکەم.
ـ لە شانۆگەری "چۆنت پێ خۆشە"As you like it دا دەڵێت؛

هەموو جیهان شانۆیەکە،
کە پیاو و ئافرەت تێیدا تەنها ئەکتەری چکۆلەن و هیچی تر
ئەکتەرێکن دێن و دەڕۆن.
تاکە کەسیش دەشێ لە ژیانیدا چەندەها دەور ببینێت.

لە "ماکبێت"Macbeth یشدا دەڵێت؛

سێبەرێکی بێ ئارام و کورتە ئەم ژیانە
هونەرمەندێکی نەگبەت
بۆ ماوەی کاتژمێرێک لەسەر شانۆ خۆی دەنوێنێ
پاشانیش لەیاد دەکرێت
چیرۆکێکە،
گەمژەیەک بەوشەی گەورە و
لەخۆباییبوونەوە بۆمان دەگێڕێتەوە،
بەڵام هیچ مانایەکی نیە.

ـ زۆر ڕەشبینانە دەڕوانێ.
ـ بەڵام زۆر بەئاگابوو لە کورتی ژیان. لەوانەیە گوتە هەرە بەناوبانگەکەیت بیستبێت...
ـ "بوونم هەبێت یان نەبێت... ئەمەیە پرسیارەکە."

ـ بەڵێ، ئەوە هاملێت گوتی. ئەمڕۆ لەسەر زەویدا دەژین و سبەینێش جێیدەهێڵین.
ـ سوپاس، سوپاس، خەریکە هێواش هێواش تێدەگەم.
ـ کاتێکیش نووسەرەکانی سەردەمی باڕۆک ژیانیان لەگەڵ شانۆدا بەراورد نەدەکرد، دەهاتن و لەبەرامبەر خەوندا دایاندەنا. بۆ نمونە شکسپیر دەیگوت؛ "ئێمە لە هەمان ئەو قوماشە چنراوین کە خەونی لێ چنراوە، خەون چواردەوری ژیانە چکۆلەکەمانی تەنیووە..."
ـ ئەمەیان شاعیرانە بوو.
ـ کالدەرۆن"Calderon" ی شاعیری ئیسپانی، کە لەساڵی 1600دا لەدایک بوو، شانۆگەریەکی نووسی و ناوی نا "ژیان خەونێکە"، لەوێدا دەڵێت؛
"ژیان چیە؟ شێتێتیە.
ژیان چیە؟ سێبەرێکە، سەرابێکە، خەیاڵێکە،
پێیدەچێ باڵاترین باشەش هێندە نرخی نەبێت،
چونکە هەموو ژیان تەنها خەونێکە و هیچی تر..."
ـ لەوانەیە ڕاست بکات... ئێمە لە قوتابخانە شانۆگەری "جێپەی سەر شاخەکە"مان خوێند.
ـ لە نووسینی لودفی هۆلبێرگ "Ludvig Holberg". لە باکوردا کەسایەتیەکی گەورەبوو، ئەو لە کاتی سەردەمی باڕۆک و سەردەمی ڕۆشنگەریدا دەرکەوت.
ـ جێپە لە ئەشکەوتێکدا دەخەوێت... کە خەبەری دەبێتەوە لە جێگەی بارۆندایە. لەمەوە وا هەست دەکات لە خەونیدا جوتیارێکی هەژار بووە. پاشان سەر لەنوێ بە خەوتوویی دەیبەنەوە ئەشکەوتەکە.

کاتێک خەبەری دەبێتەوە، دیسانەوە وا هەست دەکات لە خەونیدا لە جێگای بارۆندا بووە.
- هۆلبێرگ ئەو بیرۆکەیەی لە کالدەرۆنەوە وەرگرتووە، ئەویش لە چیرۆکێکی کۆنی "هەزار و یەک شەو"ی عەرەبیەوە وەریگرتووە. بەڵام لە مێژووی زۆر کۆنیشدا بەراوردکردنی ژیان بە خەونێک دەبینینەوە، بەتایبەتی لە چین و هیندستاندا. بۆ نمونە چووانگ تسو "Chuang tsu"ی دانای چینی دەڵێت؛ "جارێکیان لە خەونمدا پەپولەیەک بووم، ئێستاکەش بە ڕاستی چیتر نازانم؛ یان من چووانگ تسوم و لە خەونمدا پەپولەیەک بووم؟ یان پەپولەیەکم و لە خەونمدا چووانگ تسو بووم؟
- بە لایەنی کەمەوە مەحاڵە ڕاستیەکەی بسەلمێنرێت.
- لە نەرویجیشدا پیتەر داس"Petter Dass" ، شاعیرێکی نمونەیی سەردەمی بارۆک بوو، لە نێوان ساڵی 1647 وە بۆ 1707دا ژیا. ئەو لە لایەکەوە وەسفی ژیانی ئێستا و ئێرەی دەکرد و لە لایەکی تریشەوە باسی نەمری و نەگۆڕی خودای دەکرد.
- " خودا هەر خودایە، ئەگەر هەموو زەویش بیابان بێت. ئەگەر هەموو مرۆڤەکانیش بمرن، خودا هەر خودایە..."
- بەڵام لە هەمان قەسیدەشدا وەسفی سروشتی نەرویج دەکات، باسی جۆرەکانی ماسی دەکات. ئەمەش خاسیەتێکی تایبەتی سەردەمی بارۆکە، کە لە هەمان تێکسدا هەم وەسفی شتی مادی و کاتی و دونیاوی دەکرێت و هەم وەسفی شتی ڕۆحی و هەتاهەتایش دەکرێت. لەوانەیە هەموو ئەمانە پلاتۆنمان بێنێتەوە یاد، کە جیاوازی نێوان جیهانی هەستی دیاریکراو و جیهانی ئەندێشەی نەگۆڕی دەخستە ڕوو.
- ئەی دەربارەی فەلسەفە چی؟

- بیرکردنەوەی فەلسەفیش بە هەمان شێوە، زۆر بە توندی خاسیەتێکی ناتەبایی نێوان ڕێبازە جیاوازەکانی پێوە دیاربوو. هەروەک کەمێک لەوەوپێش باسمان کرد، هەندێکیان لەو بڕوایەدابوون کە بوون بە مانا قوڵەکەی سروشتێکی ڕۆحی هەبێت. ئەم جۆرە ڕوانگەیەش ناو دەنێین "ئایدیالیزم Idealism" بەڕوانگەی پێچەوانەشی دەگوترێت "مەتریالیزم"Materialism ، مەبەستیش لەو فەلسەفەیەیە کە هەموو دیاردەکانی بوون دەگەڕێنێتەوە بۆ هۆکاری مادی دیاریکراو. نمونەی هەڵگری فیکرەی مەتریالیزم لە سەدەی حەڤدەدا زۆر بوون. لەوانەیە کاریگەرترینیان تۆماس هۆبیس"Thomas Hobbes" ی فەیلەسوفی ئینگلیزی بێت. بە بڕوای ئەو هەموو دیاردەکان و بوونەوەرەکان، مرۆڤ و ئاژەڵیش، تەنها لە گەردیلەی مادی پێکهاتوون. تەنانەت دەیگوت ویژدان یان ڕۆحی مرۆڤیش، بەهۆی گەردیلەی چکۆلەوە بوونی هەیە کە لە مێشکدا دەجولێنەوە.

- کەواتە هەمان بڕوای دیمۆکریتسی هەبوو کە دوو هەزار ساڵ لەوەوبەر باسی دەکرد.

- "ئایدیالیزم" و "مەتریالیزم" وەک دوو پەتی سوور، بەدرێژایی مێژوو هەبوون. بەڵام بە دەگمەن لە هەمان کاتدا، وەک لە سەردەمی بارۆکدا، هێندە بە ڕوونی و ئاشکرایی پێکەوە ژیاون. مەتریالیزم خۆراکی نوێی لە زانستی نوێی سروشتەوە وەردەگرت... نیوتن ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە هەمان یاسای جوڵە بەسەر هەموو شوێنێکی گەردووندا دەچەسپێت. بە بڕوای ئەو هەموو گۆڕانکاریەکانی سروشت، چ لەسەر زەوی و لە ئاسمانیشدا، بەهۆی یاسای ڕاکێشان و یاسای جوڵەی تەنەکانەوە ڕوودەدەن. واتە هەموو شتێک بەپێی هەمان یاسای نەگۆڕ بەڕێوە دەڕوات، یاخود بەپێی هەمان میکانیک.

لەبەرئەوە بەشێوەیەکی مەبدەئی، دەکرێت هەموو گۆڕانکاریەکی سروشت بەوردی بەهۆی پێوانەی ماتماتیکەوە بپێورێت. بەم شێوەیەش نیوتن دواهەمین بەشی ئەو وێنەیەی دارشت کە ئێمە پێی دەڵێین "وێنەی میکانیکی جیهان."
- جیهان وەک وێنەی ئامێرێکی مەزن دادەنێت؟
- بەڵێ، ڕێک وای دادەنێت... وشەی "میکانیکی" لە وشەی "میچانە "Mechaneی یۆنانیەوە هاتووە کە واتای ئامێر دەبەخشێت. جێگەی سەرنجە کە نیوتن و هۆبیسیش هیچ جۆرە دژایەتیەکیان لە نێوان وێنەی میکانیکی جیهان و بڕواکردن بە خودادا نەدەدی. بەڵام هەمیشە لە نێو مەتریالیستەکانی سەدەی هەژدە و نۆزدەدا بەو جۆرە نەبوو. لامێتری"La Mettrie" ی پزیشک و فەیلەسوفی فەڕەنسی، لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا کتێبێکی نووسی و ناوی نا "مرۆڤ ئامێرێکە"، لەوێدا دەڵێت؛ هەروەک چۆن قاچ ماسولکەی هەیە، بۆ ئەوەی پێی بڕوات، بە هەمان شێوەش مێشک "ماسولکە"ی هەیە بۆ ئەوەی بیری پێبکاتەوە. پاشانیش لاپلاس"Laplas" ی زانای ماتماتیکی فەڕەنسی، بیرۆکەیەکی یەکجار میکانیکی خستە ڕوو و بەم شێوەیە گوزارشتی لێدەکرد؛ ئەگەر زیرەکی بتوانێت لە کاتێکی دیاریکراودا لە شوێنی هەموو گەردیلەکان بەئاگا بێت، ئەوا ئەو کاتە "هیچ گومانێکی نامێنێتەوە و بەم جۆرەش پاشەڕۆژ و ڕابووردو لەبەرچاویدا دەکرێتەوە". بیرۆکەی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بڕوایەی کە دەڵێت ڕوودانی هەموو شتێک، لەپێش ڕوودانیدا نەخشەی کێشراوە؛ ئەوەی کە ڕوودەدات لە "کارتەکاندایە، یان لە چارەتدا نووسراوە". بەم جۆرە ڕوانگەیەش دەگوترێت "دێتەرمینیزم "Determinisim (*بە زمانی عەرەبی واتە الحتمیە یان الجبریە؛ دیسانەوە مەبەست لەو

تێڕوانینەیە کە دەڵێت هەموو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ و گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکان، بەروبوومی چەند هۆکارێکە کە مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەردا نیە.و).

ـ کەواتە مرۆڤ هیچ ویستێکی ئازادی نیە؟

ـ نەخێر، کەواتە هەموو شتێک بەرهەمی پڕۆسەی میکانیکیە، تەنانەت بیرکردنەوە و خەونەکانیشمان. چەند مەتریالیستێکی ئەڵمانی لەسەدەی نۆزدەدا دەیانگوت؛ هەروەک چۆن میز بە گورچیلەوە و زراویش بە جگەرەوە بەستراوەتەوە، بە هەمان شێوەش پڕۆسیسی بیرکردنەوە بە مێشکەوە بەستراوەتەوە.

ـ بەڵام هەم میزیش و هەم زراویش شتێکی مادین، لە کاتێکدا بیرکردنەوە مادی نیە.

ـ لێرەدا پەنجە دەخەیتە سەر شتێکی گرنگ. دەتوانم چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە کە هەمان شت دەردەبڕێت. جارێکیان ئەستێرەناسێکی ڕوسی و پزیشکێکی مێشکی ڕوسی مشتومڕی ئاینیان دەکرد. ئەستێرە ناسەکە مەسیحی نەبوو، بەڵام پزیشکەکە مەسیحی بوو. ئەستێرە ناسەکە بە شانازیەوە گوتی؛ "من زۆر کەڕەت چوومەتە ئاسمان، بەڵام هەرگیز نە خودام بینی و نە فریشتەش". ئەوجا پزیشکەکە وەڵامی دایەوە و گوتی؛ "منیش نەشتەری چەندەها مێشکی زیرەکم کردووە، بەڵام هەرگیز یەک "بیر"یشم نەبینیووە."

ـ ئاخر ئەوە مانای ئەوە نیە کە بیرکردنەوە بوونی نەبێت.

ـ بەڵام دەیسەلمێنی کە بیرکردنەوە شتێکی تەواو جیاوازترە لەو شتانەی کە دەتوانین دابەشیان بکەین بەسەر بەشی وردتردا. بۆ نمونە ناتوانین لە ڕێگای نەشتەرکاریەوە "وەهم"ی کەسێک بسڕینەوە، چونکە لە قوڵایی مێشکدایە. یەکێک لە فەیلەسوفە گرنگەکانی سەدەی

حەڤدە ناوی لایبنیز "Leibniz" بوو، ئەو دەیگوت؛ گەورەترین جیاوازی شتی مادی و شتی ڕۆحی ئەوەیە کە شتی مادی بەردەوام وردتر و وردتر دەکرێتەوە، بەڵام ناتوانین ڕۆح بکەین بە دوو بەشەوە.
ـ نەخێر بە چ جۆرە چەقۆیەک؟
ئەلبێرتۆ تەنها سەرێکی ڕاوەشاند، پاش کەمێک پەنجەی بۆ مێزەکەی نێوانیان ڕاکێشا و گوتی؛
ـ دوو فەیلەسوفی گرنگی سەدەی حەڤدە دیکارت و سپینۆزا بوون. هەردووکیشیان بایەخیان بە دیاریکردنی پەیوەندی نێوان "ڕۆح" و "لەش" دەدا، ئێستاکەش کەمێک دەربارەیان دەدوێم.
ـ فەرموو، بەڵام ئەگەر تا کاتژمێری حەوت تەواو نەبووین، ئەوا دەبێت تەلەفونێک بۆ دایکم بکەم.

## دیکارت"Descartes"

## ...دەیویست تەواوی هەموو کەرەسە کۆنەکانی شوێنی کارەکە لابەرێت...

ئەلبێرتۆ لەسەر جێگاکەی هەستا، چاکەتەکەی داکەند و لەسەر کورسیەک داینا، پاشان گەڕایەوە و لەسەر قەنەفەکە بەڕاشکاوی دانیشت.

- ڕینیێ دیکارت "Rene`Descartes" لە ساڵی 1596دا لە دایک بوو. ژیانێکی کۆچەریانەی لەناو ئەوروپادا بەسەربرد. هەر لەسەردەمی گەنجیەوە، زۆر بەقوڵی حەزیدەکرد ئاشنای سروشتی مرۆڤ و گەردوون بێت. بەڵام پاش ئەوەی دەستی بە خوێندنی فەلسەفە کرد، زیاتر و زۆرتر دانی بە نەزانینی خۆیدا نا.

- هەروەک سوکرات؟

- بەڵێ، تاڕادەیەک وەک ئەو. هەروەک سوکراتیش پێی وابوو تەنها ژیرێتی بتوانێت زانیاری یەقین و ڕوونمان پێببەخشێ. بەپێی ئەو هەرگیز ناتوانین متمانە بەو شتانە بکەین کە لەناو کتێبە کۆنەکاندا هاتوون. تەنانەت ناشتوانین پشت بە هەستەکانیشمان ببەستین.

- پلاتۆنیش هەمان بڕوای هەبوو؛ ئەو دەیگوت تەنها ژیرێتی زانستی یەقینمان پێدەڵێت.

- تەواوە، لە ڕاستیدا هێڵێکی فیکری لە سوکرات و پلاتۆنەوە و بە ڕێگەی ئاوگوستیندا بەرەو دیکارت دەچێت. هەر هەموویان خاسیەتێکی ڕاشیۆنالیستیان (*ئەقڵانیان) هەبووە و لەو بڕوایەدابوون کە تەنها ژیرێتی سەرچاوەی یەقینی دڵنیا بێت. دیکارت پاش لێکۆڵینەوەیەکی قوڵ، ئەوجا گەیشتە ئاکامێک و گوتی نابێت پشت بە

زانیاریە بۆماوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ببەستریێت. دەکرێت لەگەڵ سوکراتدا بەراوردی بکەین، کاتێک کە پشتی لە تێگەیشتنە کۆنەکانی گۆڕەپانەکەی ئەسینا کرد. ئەی لەو کاتانەدا دەبێت چی بکرێت، سۆفیا؟ دەتوانیت وەڵامم بدەیتەوە؟

ـ ئەوسا خۆمان دەکەوینە فەلسەفە کردن.

ـ ڕێک تەواوە. دیکارت بڕیاریدا بە هەموو ئەورووپادا کۆچ بکات – هەروەک سوکرات، کە هەموو ژیانی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەسینایییەکاندا تەرخانکرد... هەروەک خۆی دەیگوت، دەمەوێت تەنها بەدوای ئەو زانیاریەدا بگەڕێم کە یان لەناو خۆمدا دەتوانم بیدۆزمەوە یان لەناو "کتێبی مەزنی جیهان"دا دەیبینمەوە. هەر بۆ ئەو ئەنجامەش، پەیوەندی بە سەربازیەوە گرت و بەو جۆرەش توانی لە زۆر شاری جیاوازی ئەورووپای ناوەڕاستدا بمێنێتەوە. پاشانیش چەند ساڵێک لە پاریسدا ژیا، بەڵام لە ساڵی 1629دا بەرەو هۆڵەندا کۆچی کرد و لەوێدا بۆ ماوەی 20 ساڵ مایەوە و لەسەر نووسینە فەلسەفیەکانی کاریدەکرد. لە ساڵی 1649دا لەلایەن کریستینای شاژنی سویدەوە بانگکرا. بەڵام مانەوەی، هەروەک خۆی دەیگوت "لە وڵاتی ورچ و بەفر و بەردەڵاندا" توشی ئیلتیهابی سی کرد و لە زستانی 1650دا مرد.

ـ کەواتە تەنها 54 ساڵ ژیا.

ـ بەڵام تەنانەت پاش مردنیشی کاریگەری خۆی لەسەر فەلسەفە جێهێشت. هیچ زیادە ڕۆییەک ناکەین گەر بڵێین دیکارت بنچینەی فەلسەفەی مۆدێرنی دامەزراند. هەر لەپاش سەرهەڵدانەوەی بەنەشئەی مرۆڤ و سروشت لەسەدەی ڕێنیسانسدا، پێویستیەکی نوێ هاتە کایەوە، کە هەموو بیرکردنەوەکانی سەردەم کۆبکاتەوە و لە

سیستمێکی پێکەوەگرێدراوی فەلسەفیدا جێگایان بکاتەوە. یەکەمین بنیاتنەری سیستمیش دیکارت بوو، پاش ئەویش سپینۆزا و لایبنیز و لۆک "Locke" و بارکێلی "Berkeley" و هیوم "Hume" و کانت "Kant" بەدوایدا هاتن.

ـ مەبەستت لە "سیستمی فەلسەفی" چیە؟

ـ مەبەستم لەو فەلسەفەیەیە کە لە سەرەتای سەرەتاوە دەست پێبکات و هەوڵی دۆزینەوەی وەڵامی هەموو پرسیارە فەلسەفیە گەورەکان بدات. سەدە کۆنەکان سیستم دانەری وەک پلاتۆن و ئەریستۆتالیسیان هەبوو. سەدەکانی ناوەڕاستیش خاوەنی تۆماس ئەکویناس بوون کە دەیویست پردێک لە نێوان فەلسەفەی ئەریستۆتالیس و تیۆلۆجی مەسیحیەتدا دروستبکات. پاشانیش ڕێنیسانس هات، بەخۆی و تێکەڵەیەکی شپرزەی بیرکردنەوەی کۆن و نوێ؛ دەربارەی سروشت و زانست، دەربارەی خودا و مرۆڤ. بەڵام کۆکردنەوەی هەموو بیرکردنەوە نوێکان لە سیستمێکی ڕوونی فەلسەفیدا، یەکەمجار لەسەدەی حەڤدەدا ڕوویدا و ئەویش لەسەر دەستی دیکارتدا بوو. ئەو، کاریگەری خۆی لەسەر دیاریکردنی پرۆژەی فەلسەفی نەوەکانی داهاتوو دانا. لەپێش هەموو شتێکدا، دەیویست بزانێت کە ئێمە دەتوانین چ شتێک بزانین، واتە سەرقاڵی بابەتی زانیاری یەقین بوو. پرسیاری دووهەمیش کە سەرقاڵی کردبوو، پەیوەندی نێوان لەش و ڕۆح بوو. ئەم دوو بابەتەش، بە درێژایی 150 ساڵی دواتر بوونە خاسیەتی مشتومڕی فەلسەفی.

ـ کەواتە زۆر پێش سەردەمی خۆی کەوتبوو.

ـ بەڵام لە هەمان کاتیشدا پرسیارەکان بابەتی سەردەم بوون. لەو کاتەدا زۆرینەی خەڵکی، هەڵوێستێکی فەلسەفی تەواو ڕەشبین و

گوماناویان دەربارەی زانیاری یەقین دەردەبڕی. ئەوان دەیانگوت؛ ئێمە دەبێت بە نەزانینی خۆمان ڕازیبین. بەڵام دیکارت ڕازی نەبوو و لە هەمان کاتیشدا شێوەی بیرکردنەوەی ئەوان ئارامی نەکردەوە. ئەگەر ئارام بوایە، ئەوا نەدەبووە فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە. لێرەدا دیسانەوە دەتوانین لەگەڵ سوکراتدا بەراوردی بکەینەوە، کە بە بیروڕا ڕەشبینەکانی سۆفیستەکان ڕازی نەبوو. ڕێک لەسەردەمی دیکارتدا، زانستی سروشت گەشەی بە میتۆدێک دا کە دەبوایە وەسفێکی تەواو و ورد و دڵنیای پڕۆسیسی سروشتی پێبکردایە.

دیکارتیش پرسیاری لە خۆی دەکرد و دەیگوت؛ ئەی بۆچی بە هەمان شێوەش میتۆدێک نەبێت کە بە وردی و دڵنیاییەوە بتوانێت بیرکردنەوەی فەلسەفی دەرببڕێت؟

ـ تێدەگەم.

ـ ئەمە هەمووی لەلایەک، بەڵام لەلایەکی ترەوە فیزیکی نوێ، بابەتی سروشتی مادەی هێنایە سەر باس و خواس... واتە دۆزینەوەی ئەو شتانەی کە پڕۆسیسە فیزیاویەکانی سروشت پشتی پێدەبەستن و دەستنیشانیان دەکەن. خەڵکی هێدی هێدی زیاتر بڕوایان بە جۆرە لێکدانەوەیەکی میکانیکی سروشت دەکرد. هەتاوەکو ئەم بینینە میکانیکیەی جیهانیش بەهێزتر دەبوو، بابەتی پەیوەندی نێوان ڕۆح و لەش زیاتر و زۆرتر دەهاتە پێشەوە. وەک شتێکی باو لە پێش سەدەی حەڤدەدا، ڕۆحیان وەک جۆرە "قویەکی ژیان" دەبینی و دەیانگوت وزە بە هەموو بوونەوەرە زیندووەکان دەبەخشێت. مانای ڕەسەنی وشەی "ڕۆح" و "ڤیکر"، "ڤوکردن" و "هەناسەدانە" و ئەمەش لە نزیکەی هەموو زمانە ئەوروپیەکاندا دەبینرێت. بە بڕوای ئەریستۆتالیس، ڕۆح وەک "مەبدەئێکی ژیان" لەناو هەموو بوونەوەرێکی زیندوودا بوونی

هەیە. واتە شتێکە کە مەحاڵە لە لەش جودا بکرێتەوە. هەر لەبەرئەمەش بوو کە باسی "ڕۆحی ڕووەک" و "ڕۆحی گیانەوەری" دەکرد. بەم شێوەیەش بۆ یەکەم جار لەسەدەی حەڤدەدابوو کە فەیلەسوفەکان لە ڕەگەوە جیاوازی نێوان "ڕۆح" و "لەش"یان دیاریکرد. هۆکەشی ئەوە بوو کە هەموو تەنە فیزیاویەکانیان، بە لەشی ئاژەڵ و لەشی مرۆڤیشەوە، وەک شێوە پڕۆسیسێکی میکانیکی لێکدەدایەوە. بەڵام خۆ ناکرێت ڕۆحی مرۆڤیش بەشێکی ئەم "ئامێری لەش"ە بێت. ئەی کەواتە ڕۆح چیە؟ ئەی چۆن شتێکی "ڕۆحی" دەتوانێت پڕۆسیسێکی میکانیکی دەستپێبکات؟

ـ بەڕاستی سەیرە بیر لەوە بکرێتەوە.

ـ مەبەستت چیە؟

ـ من بڕیار دەدەم دەستێکم بەرزبکەمەوە... پاش کەمێک دەستم لە ڕاستیدا بەرز دەبێتەوە. یاخود بڕیاردەدەم بەڕاکردن بەرەو پاسەکە بڕۆم و پاش چەند چرکەیەک قاچەکانم وەک داری تەپڵ بەپەلە دەیدەن بە ئەرددا. لەوانەشە دانیشتبم و بیر لە شتێکی دڵتەنگ بکەمەوە؛ لە پڕێکدا فرمێسکەکانم بە چاوانمدا دێنە خوارەوە. کەواتە دەبێت بە شێوەیەک لە شێوەکان، پەیوەندیەکی پەنهان لە نێوان لەش و ئاگایدا هەبێت.

ـ ڕێک ئەم گرفتەبوو کە بیرکردنەوەکانی دیکارتی هەژاند. دیکارت، هەروەک پلاتۆن، لەو بڕوایەدا بوو کە "ڕۆح" و "مادە" دوو شتی تەواو جیاوازن، بەڵام پلاتۆن سەبارەت بە چۆنیەتی کاریگەری ڕۆح لەسەر لەش ـیان کاریگەری لەش لەسەر ڕۆح- هیچ جۆرە وەڵامێکی پێنەبوو.

ـ منیش هیچ وەڵامێکم پێ نیە، بەڵام زۆر بە پەرۆشم بزانم دیکارت گەیشتە چی.

ـ با تەماشای ئەندێشەی تایبەتی خۆی بکەین.
ئەلبێرتۆ پەنجەی بۆ کتێبەکەی سەر مێزەکە ڕاکێشا و بەردەوام بوو؛
ـ "دەربارەی میتۆد" کتێبێکی بچکۆلەیە و لەوێدا دیکارت ئەو میتۆدی فەلسەفەیە دەخاتە ڕوو کە لە کاتی ڕوونکردنەوەی هەر گرفتێکی فەلسەفیدا، دەبێت بەکاربهێنرێت. هەروەک دەزانیت، زانستی سروشت بووە خاوەنی میتۆدێکی نوێ...
ـ بەڵێ، باسی ئەوەت کرد.
ـ لەپێش هەموو شتێکدا، دیکارت وەک خاڵێکی گرنگ دەیگوت هەتا زۆر بە ڕوونی و تەواوەتی بۆمان دەرنەکەوێت کە شتێک ڕاستە، نابێت دان بە ڕاستی هیچ شتێکدا بنێین. بۆ ئەوەی بگەینە ئەم ئەنجامەش، پێیدەچێت پێویست بێت تەواوی گرفتە لێکدراوەکە بەش بەش بکەین —واتە هەتا ئەو ڕادەیەی دەگونجێت وردتر و وردتری بکەینەوە. پاشان دەتوانین لە سادەترین بیرکردنەوەوە دەست پێبکەین. بە شێوەیەکی تر بیڵێین، هەموو تاکە "بیر"ێک دەبێت "بکێشرێت و ئەندازەی بگیرێت". هەروەک چۆن گالیلۆ دەیویست ئەندازەی هەموو شتێک بگرێت و گەر شتێکیش ئەندازەی نەبوایە، ئەوا دەبوایە بۆی دروستبکردایە. بەبڕوای دیکارت فەلسەفە دەبێت لە سادەوە بەرەو دژوار بڕوات. بەم شێوەیەش دەگونجێت زانیاری نوێ هەڵبچنین. لە کۆتایشدا، گرنگە تەماشایەکی هەموو بەشەکان بکەینەوە و خۆمان تەواو دڵنیابکەین کە هیچ شتێکمان لەیادنەکردووە. ئەوجا دەتوانین دەرئەنجامێکی فەلسەفی بخەینەڕوو.
ـ زیاتر لە ڕاهێنانێکی ماتماتیکی دەچێت.
ـ بەڵێ، تەنانەت لە بیرکردنەوەی فەلسەفیشدا دەیویست سوود لە "میتۆدی ماتماتیکی" وەربگرێت. گەرەکی بوو هەقیقەتە فەلسەفیەکان

بە هەمان شێوەی سەلماندنی بابەتە ماتماتیکیەکان بسەلمێنێت. هەروەک چۆن کاتێک لەگەڵ ژمارەکاندا کاردەکەین ناچاردەبین بگەڕێینەوە سەر ئەقڵ، ڕێک بە هەمان شێوەش دەیویست هەمان ئامرازی "ئەقڵ" بەکاربهێنێت. لەبەرئەوەی تەنها ئەقڵ دەتوانێت زانیاری دڵنیامان پێ ببەخشێت، چونکە بێسوودە گەر پشت بە هەستەکانمان ببەستین. لێرەشدا دیسانەوە لەگەڵ هەمان بڕوای پلاتۆندایە، ئەویش لەو بڕوایەدابوو کە ماتماتیک و پەیوەندیە ژمارەییەکان، بەبەراورد کردنیان لەگەڵ هەستەکانماندا، زانیاریەکی دڵنیاترمان پێ دەبەخشن.

ـ بەڵام ئایا دەگونجێت پرسیارێکی فەلسەفی بەو شێوەیە شیبکرێتەوە؟

ـ باشتر وایە دیسانەوە بگەڕێینەوە سەر ئەندێشەی خۆی... ئەو وەک ئامانجێک دەیویست بە زانیاریەکی یەقینی سروشتی بوون بگات. پێشنیارەکەشی ئەوە بوو کە دەیگوت وەک سەرەتایەک دەشێ گومان لە هەموو شتێک بکەین. لە ڕاستیدا ئەو نەیدەویست سیستمە فەلسەفیەکەی لەسەر بناغەیەکی لاوازی وەک لم هەڵبچنێت.

ـ ئەگەر بنچینەکە لاوازبێت... ئەوا هەمووماڵەکە بەسەریەکدا دەتەپێت...

ـ سوپاسی هاریکاریەکەت دەکەم، سۆفیا. دیکارت نەیدەگوت شتێکی باشە گەر گومان لە هەموو شتێک بکرێت، بەڵکو دەیگوت بە شێوەیەکی مەبدەئی دەگونجێت گومان لە هەموو شتێک بکرێت. بۆ نمونە بە خوێندنەوەی پلاتۆن و ئەریستۆتالیس، ناتوانین بە دڵنیاییەکی زۆرەوە بڵێین لە گەڕانە فەلسەفیەکانماندا پێشدەکەوین. بێگومان زانیاریە مێژووییەکانمان گەشە پێدەدەین، بەڵام زانیاریمان دەربارەی جیهان وەک خۆی دەمێنێتەوە. دیکارت پێشئەوەی بێت و

لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکانی تایبەت بە خۆی دابمەزرێنێت، بە گرنگی دەزانی هەموو جۆرە بیرکردنەوەیەکی کۆنی بسڕێتەوە.

ـ ئەو پێش ئەوەی خانووە نوێکەی دروستبکات، دەیویست تەواوی هەموو کەرەسە کۆنەکانی شوێنی کارەکە لابەرێت.

ـ بەڵێ، تەنها کەرەسەی نوێی بەکارئەهێنا، بۆ ئەوەی تەواو دڵنیابێت کە بینا فیکریەکەی بەرگە دەگرێت. بەڵام گومانی دیکارت قوڵتریش دەڕوات، ئەو دەیگوت تەنانەت ناتوانین پشت بەو شتانەش ببەستین کە هەستەکانمان پێمان دەڵێت. کێ دەزانێ، لەوانەیە ببینە گاڵتەجاری هەستەکانمان.

ـ چۆن ئەمە ڕێی تێدەچێت؟

ـ بۆ نمونە لە کاتی خەوندا، لەو بڕوایەداین کە شتێکی ڕاستەقینە تاقیدەکەینەوە. ئایا بەشێوەیەکی گشتی، هیچ شتێک هەیە کە هەستی بەخەبەربوونمان لە خەوبینین جودا بکاتەوە؟ دیکارت دەڵێت؛ "کاتێک بەقوڵی بیر لەمە دەکەمەوە، هیچ خاسیەتێک نابینم کە بەتەواوەتی حاڵەتی بەخەبەربوون و خەوبینین جودابکاتەوە"... ئەوجا بەردەوام دەنووسێت؛ "چۆن دەتوانیت دڵنیابیت کە هەموو ژیان خەونێک نیە؟"

ـ جێپە لەسەر شاخەکە بوو، بەڵام وایدەزانی لە خەونیدا لە جێگای باروندا خەوتووە.

ـ کاتێکیش لە جێگای باروندا بوو، وایدەزانی ژیانی ڕاستەقینەی خۆی وەک جوتیارێکی هەژار، تەنها خەونێک بووە. بەم جۆرەش دیکارت لە کۆتایدا گومانی لە سەرتاپای هەموو شتێک دەکرد. ئا لێرەدا تێڕوانینی زۆرینەی فەیلەسوفەکانی پێش خۆی دەوەستا.

ـ کەواتە زۆری وا نەڕۆشتوون.

ـ بەڵام دیکارت دەیویست لەو خاڵی سفرەوە دەست پێبکات. گومانی لە هەموو شتێک دەکرد، گومانیش تەنها شتبوو کە دڵنیابوو لێی. واتە بەلایەنی کەمەوە پەیوەندیەک هەیە کە دەتوانێت دڵنیابێت لێی، ئەویش ئەوەیە کە گومان دەکات. بەڵام کاتێک گومان دەکات، کەواتە دەبێت دڵنیابێت کە بیرییش دەکاتەوە. کاتێکیش کە بیردەکاتەوە، کەواتە دەبێت دڵنیابێت کە بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە. یان هەروەک خۆی دەیگوت؛ "من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم."
ـ زۆر بەلامەوە سەیر نیە کە لە کۆتایدا گەیشتە ئەو دەرئەنجامە.
ـ باشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرنجبدە، کە بە چ جۆرە دڵنیاییەکی ڕاستەوخۆوە لە پڕێکدا خۆی بە خودێکی بیرکەرەوە دادەنێت. لەوانەیە لەیادت بێت، کاتێک کە پلاتۆن دەیگوت؛ بوونی ئەو شتەی بەهۆی ئەقڵمانەوە لێی تێدەگەین و دەیگەینێ، ڕاستی ترە لەو شتەی بەهۆی هەستەکانمانەوە دەیگەینێ. بەلای دیکارتیشەوە هەمان شتە، ئەو تەنها پەی بەوە نابات کە خودێکی بیرکەرەوەیە، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا ئەو خودە بیرکەرەوەیە بوونێکی زۆر ڕاستەقینەتری هەیە وەک لەو جیهانە فیزیاویەی کە بە هۆی هەستەکانمانەوە لێی تێدەگەین. پاشانیش لەم خاڵەوە بەردەوام دەبێت. لێرەدا بە هیچ جۆرێک هێشتام لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکانی تەواو نەکردووە.
ـ کەواتە باشتر وایە تۆش بەردەوام بیت.
ـ پاشان دیکارت لە خۆی دەپرسێت، ئایا هیچ شتێکی تر هەیە کە بتوانێت پەی پێبەرێت، بەڵام بە هەمان هەستی دڵنیاییەوە وەک ئەو کاتەی کە بۆی دەرکەوت بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە. پاشان گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە وێنایەکی ڕوون و ئاشکرای دەربارەی بوونەوەرێکی بێ کەموکوڕی (*پێرفێکت) هەیە. دیکارت هەمیشە خاوەنی ئەو

وێناکردنە بوو، لەبەرئەوە بەلای ئەوەوە بەڵگەنەویست بوو کە جۆرە وێنایەکی ئاوها خۆی لە خۆیەوە دروست نابێت. ئەو دەیگوت؛ وێناکردنی بوونەوەرێکی بێ کەموکوڕی، ناکرێت لە بوونەوەرێکەوە سەرچاوە وەربگرێت کە خۆی ناتەواو بێت. کەواتە دەبێت لە خودی بوونەوەرە بێ کەموکوڕەکەوە بێت ـیان بە شێوە دەربڕینێکی تر، دەبێت لە خوداوە بێت. لەم ڕوانگەیەشەوە، بەلای دیکارتەوە هەبوونی خودا بەڵگەنەویستە، وە هەروەک ئەو حاڵەتە بەلایەوە ڕوون و ئاشکرایە کە دەڵێین کەسێک بیردەکاتەوە، کەواتە دەبێت خودێکی بیرکەرەوەش هەبێت.

ـ ئێستاکە پێم وابێت ئەمیش لە دەرئەنجامەکانیدا پەلە دەکات. لە سەرەتادا زۆر وریاتر بوو.

ـ بەڵێ خەڵکانێکی زۆریش لەو بڕوایەدان ئەمە خاڵی لاوازی دیکارت بێت. بەڵام تۆ دەڵًێیت دەرئەنجام... لە ڕاستیدا لێرەدا باس لە هیچ جۆرە سەلماندنێک ناکەین. دیکارت زۆر بە ساکاری دەیگوت، ئێمە هەموومان وێنای بوونەوەرێکی بێ کەموکوڕی دەکەین، کەواتە دەبێت ئەو بوونەوەرە بێ کەموکوڕیە لەناو خودی ئەو وێناکردنەدا، بوونی هەبێت. لەبەرئەوەی جۆرە بوونەوەرێکی ئاوها، ئەگەر بوونی نەبێت، ئەوا نابێتە بوونەوەرێکی بێ کەموکوڕی. جگە لەوەش، ئەگەر جۆرە بوونەوەرێکی ئاوها بێ کەموکوڕی بوونی نەبێت، ئەوا ناتوانین وێناشی بکەین. وە لەبەرئەوەی خۆمان ناتەواوین، کەواتە ناشێت سەرچاوەی ئەندێشەی بوونەوەری بێ کەموکوڕی لە خۆمانەوە هەڵقوڵێت. بەپێی دیکارت، ئەندێشەی خودا بیرێکی زگماکە و هەر لەکاتی لە دایکبوونمانەوە لەگەڵماندایە، "هەروەک چۆن وێنەکێشێک ئیمزای خۆی لەسەر کارەکانی دادەنێت."

ـ لەگەڵ ئەوەشدا کە دەتوانم وێنای "تیمیل"ێک (*تێکەڵەی ناوی تیمساح و فیل.و) بکەم، بەڵام ئیتر ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە جۆرە بوونەوەرێکی ئاوها لەڕاستیدا بوونی هەبێت.
ـ ئەوسا دیکارتیش وەڵامی دەدایتەوە و دەیگوت لە ڕاستیشدا بوونی گیانەوەرێکی ئاوها لەناو بیرۆکەی "تیمیل"دا نیە. بەڵام لەناو زاراوەی "بوونەوەرێکی بێ کەموکوڕی"دا بوونی هەیە و بەپێی دیکارت شتێکی تەواو بێگومانە ، هەروەک چۆن هیچ گومانێک لە فیکرەی بازنەیەکدا نیە، کە هەموو خاڵەکانی بازنەکە وەک یەک لەچەقەکەیەوە دورن. واتە ئەگەر ئەم مەرجەی تێدا نەبێت، ئەوا ناتوانین بڵێین بازنەیەکمان هەیە. بە هەمان شێوەش ناتوانین باس لە "بوونەوەرێکی بێ کەموکوڕی" بکەین، ئەگەر گرنگترین خاسیەتی تێدا نەبێت، کە بوونیەتی.
ـ ئەمە شێوە بیرکردنەوەیەکی تەواو تایبەتە.
ـ ئەمە، جۆرە بیرکردنەوەیەکی ئاشکرا و تایبەت بە ڕاشیونالیزمە. دیکارت، هەروەک سوکرات و پلاتۆن، لەو بڕوایەدا بوو کە پەیوەندیەک لە نێوان بیرکردنەوە و بووندا هەبێت. واتە هەتاوەکو "شتێک" لە فیکردا ڕوونتر بێت، ئەوا زیاتر لە بوونی دڵنیا دەبین.
ـ هەتاوەکو ئێستا گەیشتە ئەوەی کە خۆی بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە و بوونەوەرێکی بێ کەموکوڕیش بوونی هەیە.
ـ بەڵێ، وە لەم بنچینەیەشەوە بەردەوام دەبێت و دەڵێت؛ دەکرێت وا بیربکرێتەوە کە وێنە دەرەکیەکانی جیهانمان –بۆ نمونە وەک مانگ و خۆر- هەموویان وێنەی خەیاڵی بن. بەڵام وێنە دەرەکیەکانی جیهانیش، خاوەنی چەند خاسیەتێکن کە بەهۆی ئەقڵەوە دەتوانین بیان ناسین. خاسیەتەکانیش پەیوەندیە ماتماتیکیەکانن، واتە ئەو

شتانەی کە پێوانە دەکرێن، وەک درێژی و پانی و قوڵی... ڕوونی ئەم خاسیەتە "چەندایەتیانە" بەلای ئەقڵمەوە، هەروەک ڕوونی بوونم وەک بوونەوەرێکی بیرکەرەوە وایە. لەلایەکی تریشەوە، خاسیەتە "چۆنایەتیەکان"ی وەک ڕەنگ و بۆن و تام، پەیوەستی ئەندامە هەستیەکانمانن و لەڕاستیدا وەسفی ڕاستیە دەرەکیەکان ناکەن.

ـ کەواتە سروشت خەونێک نیە؟

ـ نەخێر، دیسانەوە لەم خاڵەشدا دیکارت سەرنجمان ڕادەکێشێتەوە سەر بوونەوەرە بێ کەموکوڕیەکە. دیکارت دەڵێت کاتێک ئەقڵمان دەگاتە تێگەیشتنێکی تەواو ڕوون و ئاشکرای شتێک —هەروەک لە حاڵەتی پەیوەندیە ماتماتیکیە دەرەکیەکاندا- ئەوا ئەو کاتە دەبێت ڕاستیەکەشی هەر بەو جۆرە بێت، لەبەرئەوەی خودایەک کە بێ کەموکوڕە هەڵمان ناخڵەتێنێت. کاتێکیش بەهۆی ئەقڵمانەوە دەگەینە دەرککردنی شتێک، ئەوسا دیکارت "گەرانتیەکی خودایانە" دەبەخشێت کە ڕاستی بێت.

ـ باشە... هەتا ئێستا گەیشتە ئەوەی کە بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە و خودا بوونی هەیە و هەقیقەتێکی دەرەکیش بوونی هەیە.

ـ بەڵام هەقیقەتە دەرەکیەکان و هەقیقەتی بیرکردنەوە جیاوازن. لێرەدا دیکارت جەخت لەسەر بوونی دوو شێوەی جیاوازی هەقیقەت دەکات، یان دوو جۆر "مادە"؛ یەکەمیان "بیرکردنەوە"یە یان "ڕۆح"ە و دووهەمیش "درێژبوونەوەیە" یان "مەتریاڵ"ە. ڕۆح تەنها ئاگاییە و هیچ شوێنێکیش لە بۆشایدا داگیرناکات، لەبەرئەوە ناکرێت بەسەر بەشی بچکۆلەتردا دابەشبکرێت. لە کاتێکدا مەتریاڵ بە پێچەوانەی ڕۆحەوەیە، درێژدەبێتەوە و شوێنیش لە بۆشایدا دەگرێت، لەبەرئەوە هەمیشە بەسەر بەشی بچکۆلەتر و بچکۆلەتردا دابەشدەکرێت —بەڵام

مەتریاڵ بەئاگا نیە. بەپێی دیکارت هەردوو مادەکە لە خوداوە دێن، چونکە تەنها خودا خۆی بەشێوەیەکی سەربەست لە هەموو شتێکی تر بوونی هەیە. هەرچەندە هەردوو مادەکە –ڕۆح و مەتریاڵ- لە خوداوە دێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەواو سەربەستن لەیەکتری. بیرکردنەوە سەربەستە لە مەتریاڵ و بە پێچەوانەشەوە، واتە پێیدەچێت پرۆسیسە مادیەکان، بەبێ ئەوەی پشت بە بیرکردنەوە ببەستن، ڕووبدەن.

ـ کەواتە ئافەریدەکانی خودا دەکات بە دوو بەشەوە.

ـ ڕێک وایە. ئێمە دەڵێین دیکارت "دوالیست"ە. واتە بەئاشکرا هەقیقەتی ڕۆحی و هەقیقەتی مادی جودا دەکاتەوە. تەنها مرۆڤ ڕۆحی هەیە، کەواتە ئاژەڵەکان بەتەواوەتی دەکەونە ژێر هەقیقەتی مادییەوە، لەبەرئەوەی جوڵانەوە و ژیانیان کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی یاسا میکانیکیەکانەوە. دیکارت گیانەوەری وەک ئامێرێکی ئاڵۆز تەماشا دەکرد. کەواتە ئەمیش کاتێک دێتە سەر هەقیقەتی مادی، هەروەک مەتریالیزمەکان جۆرە تێگەیشتنێکی میکانیکی دەبینێت.

ـ من زۆر گومانم هەیە، کە هێرمس تەنها ئامێرێک بێت. دیارە دیکارت هەرگیز لە ژیانیدا هیچ گیانەوەرێکی خۆش نەویستووە. ئەی خۆمان چین؟ ئایا ئێمەش ئامێرین؟

ـ هەم ئامێریشین و هەم ئامێریش نین. دیکارت گەیشتە ئەو بڕوایەی کە مرۆڤ "بوونەوەرێکی دوولایەنیە"، کە هەم بیردەکاتەوە و هەم شوێنێکیش لە بۆشایدا داگیردەکات. واتە مرۆڤ هەم خاوەنی ڕۆحە و هەم خاوەنی لەشێکی مادیشە. هەر لە مێژەوە ئاوگوستین و تۆماس ئەکویناس شتێکیان لەو بابەتەوە گوتبوو. بەبڕوای ئەوان مرۆڤ هەروەک گیانەوەر لەشی هەیە و لە هەمان کاتیشدا وەک پەری ڕۆحی هەیە. بەپێی دیکارتیش، لەشی مرۆڤ ئامێرێکی نایابە. بەڵام مرۆڤ

خاوەنی ڕۆحێکیشە کە دەتوانێت چالاکانە بژی، وە بەبێ ئەوەی پشت بە لەش ببەستێت. لە کاتێکدا پڕۆسیسە لەشیەکان هەمان سەربەستیان نیە، بەڵکو ملکەچی یاساکانی خۆیانن. بەڵام بیرکردنەوەی ئەقڵ لە لەشدا ڕوونادات، بەڵکو لە ڕۆحدا ڕوودەدات و تەواو سەربەستە لە هەقیقەتی مادی درێژبووەوە. دەبێت ئەوەش بڵێم کە دیکارت بەدوری دانەدەنا کە ئاژەڵیش ڕۆحی هەبێت. بەڵام دەیگوت ئەگەر ئەو توانایەیان هەبێت، کەواتە هەمان دوو بەشکردنی نێوان "بیرکردنەوە" و "مادە" بەسەر ئەوانیشدا دەچەسپێت.

- لەوەوپێش باسی ئەوەمان کرد... ئەگەر بڕیاربدەم بەرەوڕووی پاسەکە ڕابکەم، ئەوا یەکسەر بەشە "ئۆتۆماتیکیەکەم" دەستدەکات بە جوڵانەوە و ئەگەر فریای پاسەکەش نەکەوم، ئەوا فرمێسکەکانم دێنە خوارەوە.

- تەنانەت دیکارتیش نەیدەتوانی نکۆڵی لەوە بکات، کە ڕۆح و لەش بەردەوام کاریگەری خۆیان لەنێوان یەکتریدا ئاڵوگۆڕ دەکەن. ئەو دەیگوت هەتاوەکو ئەو کاتەی ڕۆح لە لەشدا بێت، بەلەشەوە بەستراوەتەوە. ئەمەش لە ڕێگەی ئەندامێکی تایبەتی مێشکەوە ڕوودەدات کە پێی دەگوترێت "گلاند" یان "لوو". لەوێدا ئاڵوگۆڕی بەردەوامی کاریگەریی نێوان "ڕۆح" و "مادە" ڕوودەدات. بۆ نمونە ئەو هەست و هەڵچوونانەی گریدراوی پێویستی لەشن، بەردەوام کاریگەریان لەسەر ڕۆح هەیە و سەری لێدەشێوێنن. بەڵام ڕۆح دەتوانێت لەو بیرکردنەوە "نزمانە"ی لەش خۆی ڕەهابکات و بە شێوەیەکی سەربەست لە لەش، چالاکانە هەڵسوکەوت بکات. ئامانجەکە ئەوەیە کە ئەقڵ جڵەو بگرێت بەدەستەوە. هەرچەندە بەردەوام سکم نائێشێت، بەڵام هەتاهەتایە کۆی گۆشەکانی

سێگۆشەیەک دەکاتە 180 پلە. بەم شێوەیەش ئەقڵ دەتوانێت بەسەر پێویستی لەشیدا تێپەڕێت و "ئاقڵانە" ڕەفتاربکات، لەم ڕوانگەیەشەوە ڕۆح دەسەڵاتی خۆی بەسەر لەشدا دەچەسپێنێت. گومانی تێدا نیە کە ڕۆژێک قاچەکانمان پیر و چرچ دەبن، پشتمان دەچەمێتەوە و دانەکانمان دەکەون، بەڵام هەتا ئەو کاتەی ئەقڵمان هەبێت، 2+2 هەمیشە هەر دەکاتە چوار، لەبەرئەوەی ئەقڵ وەک لەشمان نە دەچەمێتەوە و نە پیریش دەبێت. "ڕۆح"، بەلای دیکارتەوە خودی ئەقڵە. هەستی نزمی وەک بزواندنی هەوەس و ڕق هەستانیش بە قوڵی بەستراوەتەوە بە خاسیەتەکانی لەشەوە، لێرەشەوە بە هەقیقەتی مادیەوە.

ـ هێشتام بە تەواوەتی تێناگەم کە دیکارت بە چ شێوەیەک لەشی لەگەڵ ئامێرێک یان شتێکی ئۆتۆماتیکیدا بەراورد دەکرد.

ـ خەڵکی لەسەردەمی دیکارتدا سەریان لەو هەموو ئامێر و کاتژمێرانە سوڕمابوو، کە وا دەردەکەوتن لە خۆیانەوە کاربکەن، هۆی ئەو بەراوردکردنەش ئەو دیاردەیەبوو. وشەی ئۆتۆمات "Automat" ڕێک مانای شتێک دەبەخشێت کە خۆی لە خۆیەوە بجوڵێتەوە. بێگومان "لەخۆ جوڵانەوەکەی" تەنها شتێکی خەیاڵیە. بۆ نمونە کاتژمێرێکی ئەستێرەناسی لەلایەن مرۆڤەوە بەستراوە و دروستکراوە. دیکارت گەرەکیەتی بڵێت ئەو ئامێرە دروستکراوانە لە چەند پارچەیەکی کەم پێکهاتوون و زۆر ساکارترن لەو هەموو ئێسقان و ماسولکە و خانەی دەمار و شادەمارانەی کە لەشی مرۆڤ و گیانەوەر پێکدەهێنن. بەڵام ئەی بۆچی خودا نەتوانێت لەسەر بنچینەی یاسا میکانیکیەکان لەشی گیانەوەرێک یان مرۆڤێک دروست بکات؟

ـ ئەمڕۆکە خەڵکانێکی زۆر باس لە "زیرەکی دروستکراو" دەکەن.

ـ کەواتە بیر لە ئۆتۆماتەکانی سەردەمی ئێستامان دەکەنەوە. ئێمەی مرۆڤ چەندین ئامێرمان خوڵقاندووە، جارجارێک هەڵمان دەخڵەتێنن و وامان لێدەکەن بڕوابکەین کە بەڕاستی زیرەکن. ئەگەر ئەو ئامێرانە لەسەردەمی دیکارتدا هەبوونایە، ئاوا بێگومان بەتەواوەتی دەیانترساند. ئەوساکە لەوانەیە گومانی هەبوایە کە ئەقڵی مرۆڤ، هەروەک ئەو بۆی دەچوو، هێندە سەربەست و ئازادبێت. چونکە چەند فەیلەسوفێک لەو بڕوایەدان کە ژیانی فیکری مرۆڤ هەروەک ئەو پرۆسیسانەی لە جەستەدا ڕوودەدەن، سەربەستبن. بێگومان ڕۆحی مرۆڤ لە پرۆگرامێکی کۆمپیوتەر هەر زۆر ئاڵۆزترە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانێک لەو بڕوایەدان کە ئێمە بە شێوەیەکی مەبدەئی هەروەک ئەو پرۆگرامانە بەستراوینەتەوە. بەڵام تەماشای ئێرە بکە، سۆفیا... دەمەوێت شتێکت نیشانبدەم.

ئەلبێرتۆ پەنجەی بۆ مێزێکی نووسینی گەورە ڕاکێشا، کە لەوسەری ژوورەکەوە بوو. کۆمپیوتەرێکی چکۆلەی لەسەر دانرابوو. ئەلبێرتۆ بەرەولای مێزەکە ڕۆیشت و سۆفیاش دوایکەوت.

ئەلبێرتۆ ئامێرەکەی داگیرساند و پاش کەمێک پیتی "C" لەسەروی شاشەکەوە دەرکەوت، ئەوجا نووسی "لایلا" و گوتی؛

ـ بەرنامەیەکی گفتوگۆکردنی پێشکەوتووە.

پاش کەمێک تێکستێک لەسەر شاشەکە دەرکەوت؛

"من ناوم لایلایە. باش دانیشتوویت؟"

سۆفیا چوار پیتی نووسی؛

"بەڵێ"، هەرچەندە هێشتام دانەنیشتبوو، بەڵام ئەلبێرتۆ کورسیەکی بۆ هێنا و لەسەر شاشەکە نووسرا؛

"تۆ ناوت چیە؟"

"سۆفیا ئامۆنسن"، سۆفیا ئەمەی نووسی و ئامێرەکەش وەڵامی دایەوە؛
"کۆلانی کلۆیڤەر، ژمارە سێ. پێخۆشحاڵم بەناسینت سۆفیا. دڵت بە ڕۆژی لەدایکبوونی پانزە ساڵەت خۆشە؟"
سۆفیا داچڵەکی، بەڵام ئەلبێرتۆ دەستێکی خستە سەرشانی و گوتی؛
ـ من ناو و ڕۆژی لەدایک بوون و ناونیشانی تۆم داوەتێ. هەروەک چۆن کاتێک خۆمان بە کەسێکی نوێ دەناسێنێن، خۆشە گەر کەمێک دەربارەی یەکتری بزانین.
"خراپ نیم" سۆفیا نووسی.
"خۆ خراپ نیت سۆفیا؟ تکایە هەوڵبدە لە ڕێگەی ڕستەی تەواوەوە بمدوێنیت"
"سوپاس، من زۆر زۆر باشم. دەتوانم پرسیارێکت ئاڕاستە بکەم؟"
"پێم خۆشە کە زۆر باشیت، فەرموو بە ئارەزووی خۆت پرسیار بکە"
"تەمەنت چەندە؟"
"لە 1988/8/8دا لە "ئەتلانتا" داڕێژرام و لە 1990/3/28دا لە قوتابخانەی تەکنیکی نەرویجیدا، وەرگێردرامە سەر زمانی نەرویجی."
"Gosh"(*بەزمانی بازاڕی واتە وای خوایە گیان.و).
"گوتم ڕستەی تەواوم بۆ بنووسە."
"تەنها گوتم گۆش."!
"من لە زمانی بەزم و گاڵتەجاڕی تێناگەم. زیاتر لە 100000 وشە دەزانم، نزیکترین وشەش لە"Gosh" ەوە وشەی"Gospel" ە.
"گۆسپڵیش مانای ئینجیل دەبەخشێت."
"سۆفیا تۆ مەسیحیت؟"
"نازانم"
"زۆرجار –نازانم- هەنگاوێکە بەرەو ڕێگای تێگەیشتنێکی نوێ"

"دیکارت و سوکراتیش هەمان شتیان دەگوت"
"سوکرات فەیلەسوفێکی یۆنانی بوو، لەساڵی 470 تا 399 ی پێش مەسیحیدا ژیا. ئەگەر دەتەوێت زیاتر دەربارەی بزانیت، ئەوا پەنجە بنێ بە"F7" دا. دیکارت فەیلەسوفێکی فەڕەنسی بوو، لە ساڵی 1596 وە تا 1650 ژیا، ئەگەر ئەتەوێت زیاتری دەربارە بزانیت، ئەوا پەنجە بنێ بە."F8"
"سوپاس، تەنها ئەوەندەم بەسە. دەتوانم پرسیارێکی ترت لێبکەم؟"
"پێم خۆشە ئەگەر ئەوەندەت بەس بێت. فەرموو بە ئارەزوی خۆت پرسیاربکە"
ئەلبێرتۆ پێکەنینێکی شێتانەی شاردەوە و سۆفیا نووسی؛
"هیلدە میوللە کنەی کێیە؟"
"هیلدە میوللە کنەی لە لیللەساند دەژی و ڕێک هاوتەمەنی سۆفیا ئامۆنسنە"
"ئەمە لە کوێوە دەزانیت؟"
"نازانم لە کوێوە دەیزانم. تەنها ئەوەندیە کە لەناو مەلەفێکمدا ناوی ئەوم دۆزیەوە"
سۆفیا هەستیکرد ئەلبێرتۆ دەستێکی لەسەر شانی دانا... ئەوجا ئەلبێرتۆ گوتی؛
ـ هەموو ئەو زانیاریە کەمانەی دەربارەی هیلدە هەمانە، من خستومەتە ناو کۆمپیوتەرەکەوە.
"هیچی تر دەربارەی هیلدە دەزانیت؟"
"باوکی چاودێریکەرێکی نەتەوە یەکگرتووەکانە لە لوبنان. پلەی مێجەری هەیە و هەمیشە پۆستکارت بۆ کچەکەی دەنێرێت"
"پێم خۆشە گەر بیدۆزیتەوە"!

"ناتوانم، چونکە لە فایلەکانمدا نیە و منیش بە هیچ کۆمپیوتەرێکی ترەوە نەبەستراومەتەوە"

"من گوتم؛ بیدۆزەرەوە!!!!!"1!!!!

"تورە بوویت سۆفیا؟... بەلایەنی کەمەوە ئەو هەموو نیشانەی سەرسوڕمانانە نیشانەی هەڵچوونی هەستتە"

"دەمەوێت لەگەڵ باوکی هیلدەدا قسە بکەم"!

"دەسەڵاتت بەسەر خۆتدا نیە. ئەگەر ئەتەوێت باسی منداڵیت بکەیت، ئەوا پەنجە بنێ بە"F9" دا.

ئەلبێرتۆ دەستێکی خستە سەر شانی سۆفیا.

ـ ئەو ڕاستدەکات، خۆ تۆپی کریستاڵ نیە. "لایلا" تەنها پرۆگرامێکە و هیچی تر.

"دەمت داخە!" سۆفیا نووسی.

"هەروەک پێت خۆشە، سۆفیا. ناسینمان تەنها 13 خولەک و 52 چرکەی خایاند. هەموو شتێکیش کە باسمانکرد لەیادم دەبێت. ئێستاکەش پرۆگرامەکە دەوەستێنم."

پیتی "C" هاتە سەر شاشەکە و ئەوجا ئەلبێرتۆ گوتی؛

ـ ئێستا دەتوانین دیسانەوە دابنیشینەوە.

بەڵام ئەو کاتە سۆفیا چەند پیتێکی تری نووسیبوو؛

نووسیبووی "کنەی"

پاش کەمێک ئەم وەڵامە هاتە سەر شاشەکە؛

"لێرەدام"

ئەمجارەیان ئەلبێرتۆ ڕاچڵەکی، بەڵام سۆفیا بۆی نووسیەوە؛

"تۆ کێیت؟"

"مێجەر ئەلبێرت کنەی لە خزمەتدایە، ڕاستەوخۆ لە لوبنانەوە هاتووم. فەرمانەکەتان چیە؟"
ـ تا ئێستا شتی وا خراپم نەدیوە، ئەو ترسنۆکی بۆگەنە هاتۆتە ناو "هارد دیسکەکەمەوە". ئەلبێرتۆ ئەمەی گوت و داوای لە سۆفیا کرد کورسیەکەی بۆ جێبهێڵێت. ئەوجا لەبەردەم کۆمپیوتەرەکەدا دانیشت و نووسی؛
"بە چ شێوە شەیتانیەک توانیت بێیتە ناو کۆمپیوتەرەکەمەوە؟"
"فێڵێکی ئاسانە، برادەرە ئازیزەکەم. من دەتوانم لەو شوێنەدا بم کە دەخوازم."
"ڤایرۆسی پیسی کۆمپیوتەر"!
"باشە، باشە! ئێستاکە وەک ڤایرۆسی ڕۆژی لەدایکبوون دەردەکەوم. ڕێگەم پێدەدیت نامەیەکی تایبەتی بنێرم؟"
"سوپاس، نامەکانت خەریکە بێزارمان دەکات"
"بەڵام زۆر بەپەلە دەینووسم؛ هەمووی لەبەر ڕێز لێنانی تۆیە هیلدە گیان. دیسانەوە لە کانگای دڵمەوە پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایک بوونت لێدەکەم. ببوورە بارودۆخەکە نالەبارە، بەڵام پێم خۆشە لە هەر شوێنێک بیت، پیرۆزباییت لێبکەم. سڵاوی بابە، کە لە دڵەوە حەز دەکات باوەشێکت پێدا بکات"
پێش ئەوەی ئەلبێرتۆ فریابکەوێت هێچ شتێکی تر بنووسێت، دیسانەوە نیشانەی "C" هاتەوە سەر شاشەکە.
ئەلبێرتۆ نووسی "زانیاری کنەی" و ئەم پەیامە هاتە سەر شاشەکە؛

12.57 15/06/90 174.643 Knag.lib

22.34 23/06/90 326.439 Knag.lil

ئەلبێرتۆ نووسی؛ "کنەی بسڕەوە" و پاشان کۆمپیوتەرەکەی کوژاندەوە و گوتی؛

ـ تەواو سڕیمەوە. بەڵام مەحاڵە بزانین کەی دەردەکەوێتەوە.

هەر بەدانیشتنەوە تەماشای کۆمپیوتەرەکەی دەکرد و ئەوجا گوتی؛

ـ ناوەکەی لە هەموو شتێک خراپتربوو... ئەلبێرت کنەی...

سۆفیا تەنها ئێستاکە لێکچوونی ناوەکانی بۆ دەرکەوت. ئەلبێرت کنەی و ئەلبێرتۆ کنۆکس، بەڵام لەبەر توڕەیی ئەلبێرتۆ، نەیدەوێرا هیچ بڵێت. دیسانەوە بەرەو کورسی و قەنەفەکە ڕۆیشتنەوە و لە جێگەی پێشویاندا دانیشتنەوە.

# سپینۆزا"Spinoza"
# ...خودا قەرەقۆز ناجوڵێنێت...

بۆ ماوەیەکی زۆر بە بێدەنگی دانیشتن، هەتا لە پاشاندا سۆفیا، تەنها بۆ ئەوەی سەرنجی ئەلبێرتۆ بخاتە سەر شتێکی دی، گوتی؛
ـ دەبێت دیکارت مرۆڤێکی سەیر بووبێت. بەناوبانگ بوو؟
ئەلبێرتۆ یەک دوو هەناسەی قوڵی هەڵکێشاو و پاشان وەڵامی دایەوە؛
ـ کاریگەریەکی مەزنی هەبوو، لەوانەیە گرنگترینیان ئەو ڕۆڵە مەزنە بێت کە لەسەر بیرکردنەوەی فەیلەسوفێکی گەورەی تردا بینی، مەبەستم لە باروخ دی سپینۆزا"Barouch de Spinoza" ی فەیلەسوفی هۆڵەندیە، ئەو لە ساڵی 1632 وە هەتا 1677 ژیا.
ـ باسی ئەویشم بۆ دەکەیت؟
ـ وام دانابوو... هەرچۆنێک بێت، با نەهێڵین یەخەگرتنی سەربازی مێجەر کارەکەمان بوەستێنێت.
ـ منیش بە ئاگاداریەوە گوێدەگرم.
ـ سپینۆزا سەر بە گروپی ئاینی جولەکەی ئەمستردام بوو، بەڵام هەر زوو لە پەرستگا بێ بەشیانکرد و دەریشیانکرد. کەم فەیلەسوفی سەدەی نوێ، ئاوها وەک ئەم فەیلەسوفە سوکایەتی پێکراوە و ڕاونراوە. تەنانەت گەیشتە ئەوەی هەوڵی کوشتنیشیاندا. هەموو ئەمانەش لەبەرئەوە بوو کە ڕەخنەی لە ئاینی ڕەسمی دەگرت. ئەو دەیگوت هەم ئاینی مەسیحی و هەم ئاینی یەهودیش تەنها لە چەند سروتێکی دەرەکی و بڕوایەکی وشک پێکهاتوون و هیچی تر. سپینۆزا یەکەم فەیلەسوف بوو کە لە ڕوانگەیەکی "ڕەخنەی مێژوویی"یەوە لە ئینجیلی دەڕوانی.

- چۆن چۆنی؟
- ئەو نکۆڵی لەوە دەکرد کە سەراپای سروشی ئینجیل لەلایەن خوداوە هاتبێت. بە بڕوای ئەو کاتێک کە ئینجیل و تەورات دەخوێنینەوە، دەبێت هەمیشە ئەو کاتە ڕەچاوبکەین کە تێیدا نووسراونەتەوە. جۆرە خوێندنەوەیەکی ڕخنەیی ئاوهاش، کۆمەڵێ ناتەبایی نێوان نووسراوەکان ڕووندەکاتەوە. بەڵام لە ژێر ڕووکەشی نووسراوەی پەیمان نامەی نوێشدا، مەسیح دەبینین و دەتوانین بە قسەکەرێکی خودا لە قەڵەمی بدەین، لەبەرئەوەی پەیامەکانی مەسیح کتومت بانگەوازێکن بۆ ڕزگاربوون لە وشکی ئاینی یەهودی. مەسیح پەیامی "ئاینی ئەقڵ"ی بڵاوکردەوە، کە لە ناواخنیدا خۆشەویستی لەسەرو هەموو شتێکەوە دادەنا. مەبەستی سپینۆزا لێرەدا خۆشەویستی بۆ خودا و خۆشەویستی مرۆڤیشە بۆ یەکتری. بەڵام هەر زوو ئاینی مەسیحییش کەوتە نێو چوارچێوەی دۆگمای وشک و سروتی دەرەکی بێماناوە.
- بێگومان جۆرە بیرکردنەوەیەکی بەو شێوەیەش، سەخت بوو بەلای کڵێسە و قەشەکانەوە هەزمبکرێت.
- سەختترین ئازاریش کە بەسەر سپینۆزادا هات، ئەو کاتە بوو کە خێزانەکەی خۆی پشتیان لێهەڵمالی. هەر بەهۆی نەگونجانیان لەگەڵ شێوەی بیرکردنەوەیدا، هەوڵیاندەدا لە میراتی خێزانەکەیان بێبەریبکەن. بەڵام ئەو شتەی لێرەدا سەیر و سەمەرەیە، ئەوەیە کە کەم کەس هەبووە وەک سپینۆزا هەوڵی بۆ ئازادی بیروڕا دەربڕین و لێبووردنی ئاینی دابێت. هەموو ئەو بەرەنگاریکردن و دژایەتیەش، وایلێکرد ژیانێکی خامۆش و دابڕاو بژی و بووە هۆی ئەوەی هەموو کاتێکی بۆ فەلسەفە تەرخانبکات. نانی ژیانیشی بە دروستکردن و

فرۆشتنی چاوی چاویلکەی تایبەتی پەیدا دەکرد، ئەمەش هەندێک لەو چاوانەیە کە ئێستاکە هاتوونەتە سەر سامانی من.

ـ جێی سەرسوڕمانە!

ـ شێوەی ژیانیشی لەسەر چاویلکە، شێوە سیمبولیەتێکی تێدا دەبینرێت. وەک دەزانیت فەیلەسوفەکان یاریدەی خەڵکی دەدەن کە ژیان و بوون لە ڕوانگەیەکی نوێوە ببینن. بەشێک لە جەوهەری فەلسەفەی سپینۆزاش، کتومت بینینی شتەکانە لە "ڕوانگەیەکی هەتاهەتاییەوە."

ـ لە ڕوانگەیەکی هەتاهەتاییەوە؟

ـ بەڵێ سۆفیا. لەو بڕوایەدایت بتوانیت ژیانی خۆت لەسەر ئاستێکی گەردوونی ببینیت؟ ئەوساکە بۆ ئەوەی بتوانیت سەرنجت بخەیتە سەر خۆت و ژیانت لە ئێستا و ئێرەدا ببینیت، ناچاردەبیت بە شێوەیەک لە شێوەکان چاوت بنوقێنیت...

ـ ئمم... هێندە ئاسان نیە.

ـ بەڵێ، لەو کاتەشدا دەشێ لەیادت بێت کە تۆ تەنها بەشێکی چکۆلەی هەموو ژیانی سروشت دەژیت. واتە تۆ سەر بە شتێکی یەکجار گەورەتریت.

ـ پێم وابێت لە مەبەستت تێدەگەم.

ـ دەتوانیت هەستیشی پێبکەیت؟ دەتوانیت لە یەک بینیندا هەموو سروشت، هەموو گەردوون درک پێبکەیت؟

ـ گومانم هەیە. لەوانەیە پێویستیم بە هەندێ چاویلکەی تایبەتی بێت.

ـ لێرەدا تەنها مەبەستم لەو بۆشاییە بێسنوورە نیە، بەڵکو بیر لەو کاتە بێسنوورەش دەکەمەوە. ڕۆژێک لە ڕۆژان، سی هەزار ساڵ

لەمەوبەر، کوڕێکی بچکۆلە لە دۆڵی "ڕاین"دا دەژیا. ئەو بەشێکی زۆر بچکۆلەی سروشت بوو، دڵۆپە ئاوێکی دەریایەکی بێسنوور بوو. بەم شێوەیەش سۆفیا... تۆش بە هەمان شێوە بەشێکی بچکۆلەی سروشت دەژیت. هیچ جۆرە جیاوازیەک لە نێوان ئەو کوڕە چکۆلەیەو تۆدا نیە.

ـ بەڵام بەهەرحاڵ من لە ئێستادا دەژیم.

ـ زۆر باشە، بەڵام ڕێک بەو مەبەستە چاوت نوقاند، کە ئەو هەستەت لا دروست ببێت. ئاخۆ سی هەزارساڵێکی تر تۆ دەبیتە چ کەسێک؟

ـ بیرکردنەوە ڕوخێنەرەکانی بەم شێوەیە بوون؟

ـ بەتەواوەتی نا... سپینۆزا نەک هەر دەیگوت هەموو شتێک کە هەیە سروشتە، بەڵکو لەسەرو ئەوەشەوە خودای بە هاوتای سروشت دادەنا. ئەو خودای لە هەموو بوونێکدا دەبینی و لە هەموو بوونێکیشدا خودای دەبینی.

ـ کەواتە "پانتیست" بووە.

ـ پڕاوپڕ ڕاستە. بەلای سپینۆزاوە، خودا شتێک نیە کە جیهانی خوڵقاندبێت و خۆشی لەدەرەوەڕا وەستابێت و تەماشای مەخلوقەکانی بکات. نەخێر، ئەو دەیگوت خودا جیهانە. جارجارێکیش کەمێک جیاوازتر دەریدەبڕی و دەیگوت؛ جیهان لە خودادایە. لێرەدا دەگەڕێتەوە سەر پاولۆس کە لەسەر لوتکەی ئاریۆپاگۆسەوە قسەی بۆ ئەسینابییەکان دەکرد و دەیگوت؛ "ئێمە لەناو ئەودا دەژین و دەجوڵێینەوە و هەر لەناو ئەویشدا بوونمان هەیە". بەڵام با بگەڕێینەوە سەر بیرکردنەوەی خودی سپینۆزا خۆی. گرنگترین کتێبی ناونا "زانستی ئیتیک، زانستێک کە لەسەر میتۆدی ئەندازە گەشەیکردووە."

ـ زانستی ئیتیک... و میتۆدی ئەندازە؟

- لەوانەیە کەمێک سەیر بێتە بەر گوێمان. بەڵام مەبەستی فەیلەسوفەکان لە ئیتیک، چۆنیەتی گوزەراندنی ئەو ژیانەیە کە دەمانگەیێنێتە ژیانێکی ئاسودە. بێگومان بە هەمان مەبەستیش باس لە ئیتیکی ئەریستۆتالیس یان سوکرات دەکەین. تەنها لە کاتی ئێستاماندایە کە ئیتیک بووە بە هەندێ یاسا، کە چۆنیەتی هەڵسوکەوتمان نیشاندەدات، هەڵبەتە بەبێ ئەوەی پێ لە کەسی تر دابگرین (*واتە بەبێ ئەوەی هەقی کەسی تر بخۆین.و).

- ئەی ئەگەر بیر لە ئاسودەیی تایبەتی خۆت بکەیتەوە، ئایا ئەمە بە خۆپەرستی لە قەڵەم دەدرێت؟

- بەڵێ شتێکە لەو بابەتە. بەڵام کاتێک سپینۆزا وشەی ئیتیک بەکاردەهێنێت، ئەوا دەتوانین بە وشەی ڕەوشت یاخود بە هونەری ژیان وەریگێڕین.

- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا... "هونەری ژیان، زانستێک کە لەسەر میتۆدی ئەندازە گەشەی کردووە"؟

- مەبەست لە میتۆدی ئەندازە، خودی زمانە یان ئەو شێوە داڕشتنەیە کە بەکاریدەهێنێت. بێگومان دیکارتت لەیادە کە دەیوست تەنانەت بۆ بیرکردنەوە فەلسەفەکانیشی میتۆدێکی ماتماتیکی بەکاربهێنێت. لەوێدا ئەو مەبەستی لە جۆرە بیرکردنەوەیەکی فەلسەفیە کە لەسەر دەرئەنجامێکی پتەوی فیکری هەڵچنرابێت. سپینۆزاش خۆی لەناو هەمان ڕێبازی ڕاشیۆنالیزمدا دەبینیەوە. لە "ئیتیک"ەکەیدا دەیویست ئەو یاسایانەی سروشت نیشانبدات کە چۆنیەتی ژیانی مرۆڤ دەستنیشان دەکەن. لەبەرئەمە بەڕای ئەو دەبێت خۆمان لە هەست و هەڵچوون سەربەستبکەین. بەپێی ئەو، تەنها بەو شێوەیە دەتوانین ئارام و ئاسودە بین.

- بەڵام تەنها یاساکانی سروشت ژیانمان دەستنیشان ناکەن؟
- نا، نا... تێگەیشتنی سپینۆزا هێندە ئاسان نیە، سۆفیا. دەبێت یەکە یەکە باسی شتەکان بکەین. لە بیرتە دیکارت هەقیقەتی بە دوو مادەی جیاواز دادەنا؛ "بیرکردنەوە (ڕۆح)" و "درێژبوونەوە (مادە)"؟
- هەروا زوو چۆن بیرم بچێتەوە؟
- دەکرێت وشەی "مادە" بە چەند جۆرێک لێکبدرێتەوە؛ یان شتێکە کە شتێکی لێ پێکهاتووە، یاخود شتێکە کە شتێکی تری بۆ دەگەڕێنینەوە. بە کورتی دیکارت لەسەر دوو جۆر لەو مادانە کاریدەکرد، ئەو دەیگوت؛ هەموو شتێک یان "بیرکردنەوەیە —ڕۆحە" یان "درێژبوونەوەیە —مادەیە."
- پێویستم بەوە نیە دووبارەی بکەیتەوە.
- بەڵام سپینۆزا بڕوای بەو جیاکردنەوەیە نەبوو. لە ڕوانگەی ئەوەوە تەنها "یەک" مادە بوونی هەیە. ئەو دەیگوت؛ دەتوانین بوونی هەموو شتێک بگەڕێنینەوە بۆ تەنها یەک مادە. هەر خۆشی ناوی نابوو "مادە ڕەسەنەکە"، جارجارێکی تریش ناوی خودا یان سروشتی لێدەنا. کەواتە سپینۆزا وەک دیکارت، جۆرە تێگەیشتنێکی "دوالیستی" نیە. ئێمە دەڵێین ئەو "مۆنیست"Monist ە، واتە تەواوی سروشت و هەموو پەیوەندیەکانی ژیان دەگەڕێنێتەوە بۆ تەنها یەک مادە.
- پێم وانیە بتوانن لەوە زیاتر ناتەبابن.
- لە ڕاستیدا جیاوازی نێوان ئەم دوو فەیلەسوفە، بەو شێوە گەورەیە نیە کە زۆر جار باسی لێدەکرێت. دیکارتیش لەو بڕوایەدا بوو کە تەنها "خودا" لەسەرچاوەی خۆیەوە هاتبێت. سپینۆزا تەنها ئەو کاتە لە دیکارت جودا دەبێتەوە، کە خودا و سروشت یان خودا و

مەخلوقەکانی تر وەک یەک تەماشا دەکات. لێرەشەوە خۆی لە تێگەیشتنی ئاینی جولەکە و ئاینی مەسیحی دووردەخاتەوە.
ـ کەواتە سروشت خودایە و ... تەواو، نوقتە.
ـ مەبەستی سپینۆزا لە وشەی "سروشت" تەنها سروشتی مادی نیە. بەڵکو بەلای ئەوەوە مادە ڕەسەنەکە (یان خودا یان سروشت)، هەموو شتێک دەگرێتەوە کە بوونی هەبێت، تەنانەت شتە ڕۆحیەکانیش.
ـ واتە هەم "بیرکردنەوە" و هەم "درێژبوونەوە"ش، وا نیە؟
ـ بەڵێ ڕاست دەکەیت. بەپێی سپینۆزا ئێمەی مرۆڤ دوو خاسیەتی یان دوو شێوەی نیشاندراوی خودا دەناسین. سپینۆزا ناوی نابوون خاسیتەکانی خودا. ئەم دوو خاسیەتەش، کتومت "بیرکردنەوە" و "درێژبوونەوە"کەی دیکارت بوون. واتە خودا (یان سروشت) یان بەشێوەی بیرکردنەوە خۆی نیشاندەدات، یان بەشێوەی مادەی درێژبووەوە خۆی دەردەخات. لەوانەشە خودا خاوەنی خاسیەتی بێ پایانی تریش بێت، بەڵام مرۆڤ تەنها ئەو دوو خاسیەتەی خودا دەبینێت.
ـ زۆر باشە، بەڵام بە شێوەیەکی سەخت و ئاڵۆز دەرتبڕی.
ـ گەر بمانەوێت بەناو زمانی سپینۆزادا تێپەڕین، دەشێت زۆر بەهێز بین. بەڵام خۆشیشە کە لە کۆتایدا دەگەیتە بیرکردنەوەیەک کە وەک مرواری ڕوون و ڕۆشنە.
ـ بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە چاوەڕوانم.
ـ واتە هەرچی شتێک کە لە سروشتدایە، یان بیرکردنەوەیە یان درێژبوونەوە. هەموو شتەکان و دیاردەکانی ژیانی ڕۆژانەمان (بۆ نمونە گوڵێک یان هۆنراوەیەکی هێنریک وێرگەلاند) شێوازی جیاوازی خاسیەتی بیرکردنەوە یان درێژبوونەوەن. مەبەستیشمان لە شێواز،

ئەو شێوە دیاریکراوەیە کە خودا (یان سروشت یان مادە ڕەسەنەکە) خۆی پێ نیشاندەدات. گوڵێک، شێوازێکە لە خاسیەتی درێژبوونەوە. هۆنراوەیەکیش کە لەسەر هەمان گوڵ داڕێژراوە، شێوازێکە لە خاسیەتی بیرکردنەوە. بەڵام لە ڕەچەڵەکدا هەردوو لایەنەکە دەربڕینێکی خودان (یان دەربڕینێکی مادە ڕەسەنەکەن یان سروشتن).
- چ جۆرە بیر کردنەوەیەکە!
- بەڵام تەنها زمانەکەیەتی کە هێندە سەختە. دەنا لە پشت هەموو ئەو شێوەکاریە ئاڵۆزانەوە، هەقیقەتێکی یەکجار ناسک و جوان حەشاردراوە و لە ڕاستیدا هێندە ئاسانە کە بەزمانی ڕۆژانە دەرنابڕدرێت.
- لەگەڵ ئەوەشدا زمانی ڕۆژانەم پێ باشترە.
- باشە، با لە تۆوە دەست پێبکەم. کاتێک کە سکت دێشێت، ئەو کاتە ئەو شتە چیە کە سکی دێشێت؟
- تۆ خۆت گوتت منم.
- زۆر باشە، پاش ماوەیەک دێیت و بیر لەوەدەکەیتەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان سکت دەئێشا، ئەی ئەو کاتە ئەو شتە چیە کە بیردەکاتەوە؟
- ئەوەشیان هەر منم.
- لەبەرئەوەی تۆ مرۆڤیت و ڕوودەات لە کاتێکدا سکت بئێشێت و دەشکرێت لە کاتێکی تردا تووشی هەڵچوونێکی دەرونی ببیت. بەم شێوەیەش بە بڕوای سپینۆزا هەموو ئەو شتە فیزیاویانەی کە بوونیان هەیە، یان کە لە چواردەورماندا ڕوودەدن، دەربڕینێکی خودان (یان دەربڕینێکی سروشتن). هەموو بیرکردنەوەکانیش بە هەمان شێوەن، تەنانەت بیرکردنەوەی خودا و سروشتیش؛ لەبەرئەوەی هەموو شتێک یەکە. تەنها یەک خودا، یەک سروشت، یەک مادە بوونی هەیە.

ـ بەڵام کاتێک کە بیر لە شتێک دەکەمەوە، ئەوە منم کە بیردەکەمەوە. بە هەمان شێوەش کاتێک کە دەجوڵێمەوە، دیسانەوە ئەوە منم کە بەکردارەکە هەڵدەسم. ئەی بۆچی دەتەوێت خودا تێکەڵی بابەتەکە بکەیت؟

ـ پێم خۆشە بەو جۆرە تێکەڵ بە بابەتەکە دەبیت و لەگەڵمدا دەڕۆیت. بەڵام تۆ کێیت؟ ... تۆ سۆفیا ئامۆنسنیت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەربڕینی شتێکی یەکجار گەورەتری لە خۆت. بێگومان دەتوانیت بڵێیت، منم بیردەکەمەوە، یان منم دەجوڵێمەوە، بەڵام ئەی ناشتوانیت بڵێیت؛ ئەوە سروشتە کە "بیر"ی بیرکردنەوەکانت دەکاتەوە یان ئەوە سروشتە کە لەناوەوەتدا دەجوڵێتەوە؟ لە ڕاستیدا جۆری بینینەکەت پشت بە جۆری ئەو چاویلکەیە دەبەستێت کە لە چاوانتایە.

ـ مەبەستت لەوەیە من بڕیاری هەڵسوکەوتم لە دەستی خۆمدا نیە؟

ـ تا ڕادەیەک نا، لەوانەیە جۆرە سەربەستیەکت هەبێت کە پەنجەت بەو جۆرە بجوڵێنیتەوە کە دەخوازیت، بەڵام پەنجەت تەنها لەسەر سروشتی خۆی دەجوڵێتەوە. بۆ نمونە پەنجەت ناتوانێت لە دەستت جودا ببێتەوە و لە ژوورەکەدا سەمابکات. بە هەمان شێوەش تۆ شوێنێکی تایبەتیت لە گشتدا هەیە. واتە ڕاستە تۆ سۆفیایت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا پەنجەیەکی دەستی خوداشیت.

ـ کەواتە خودا بڕیاری هەموو شتێک دەدات کە من دەیکەم، وا نیە؟

ـ یان سروشت یان یاسای سروشت بڕیاردەدات. بە بڕوای سپینۆزا خودا (یاخود یاسای سروشت) هۆی ناوەکی هەموو شتێکە کە ڕوودەدات. خودا هۆی دەرەکی نیە، لەبەرئەوەی خودا تەنها (وە تەنها) لە ڕێگەی یاسای سروشتەوە خۆی نیشاندەدات.

ـ پێم وانیە بتوانم هێچ جیاوازیەک ببینم.

ـ خودا قەرەقۆز ناجوڵێنێت، پەتەکان ڕاناکێشێت و لێرەشەوە بڕیاری ڕوودانی هەموو شتێکی لەدەستدا بێت. خودایەکی ئاوها لەدەرەوە دەسەڵاتی بەسەر بووکەکاندا هەیە، واتە لێرەوە خودا دەبێتە "هۆکارێکی دەرەکی" جوڵانەوەیەی بووکەکان. بەڵام خودا لە ڕێگەی یاساکانی سروشتەوە ڕۆڵی خۆی دەبینێت، بەم شێوەیەش خودا (یان سروشت) دەبێتە "هۆکارێکی ناوەکی" هەموو ئەو شتانەی کە ڕوودەدەن. واتە هەموو ڕووداوەکانی سروشت، بەپێی پێویستی ڕوودەدەن. سپینۆزا لە ڕوانگەیەکی "دێتەرمینیستیک Deterministic"یەوە (*لە ڕوانگەیەکی حەتمیەوە.و) تەماشای ژیانی سروشتی دەکات.

ـ پێم وابێت لەوەوپێش باسی ئەمەت کرد.

ـ لەوانەیە خەیاڵت بۆ لای ستۆیکەکان بچێت. ئەوانیش جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە هەموو شتێک بەپێی پێویستی ڕوودەدات. لەم ڕوانگەیەشەوە بە گرنگیان دەزانی کە هەموو ڕووداوێک بە "هێمنییەکەی ستۆیکی"یەوە وەرگرین و نەهێڵین هەستەکانمان بەدوای خۆماندا ڕامانکێشن، واتە نەهێڵین ببینە ملکەچی هەستەکانمان. ئەمەش زۆر بە کورتی ئیتیکی سپینۆزا بوو.

ـ لە مەبەستی تێدەگەم، بەڵام ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەم بەلاوە خۆش نیە کە دەڵێت من ناتوانم خۆم بڕیاری کردەوەکانی خۆم بدەم.

ـ با جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر کوڕەکەی چاخە بەردینەکان، ئەو کوڕەی کە نزیکەی سی هەزار ساڵ لەمەوبەر دەژیا. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا گەورەتر بوو و تیری دەگرتە ئاژەڵی کێوی. پاشانیش ژنێکی خۆشویست و دواتر بووە دایکی منداڵەکانی. دەشتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین ئەو کەسانەی کە لەگەڵیاندا دەژیا، خودایەکیان

دەپەرست و کوڕەکەش هەمان خودای دەپەرست... بەڵام ئایا بە ڕاستی لەو بڕوایەدایت هەموو ئەو شتانەی بە بڕیاری خۆی کردبێت؟
- نازانم.
- یان بیر لە شێرێکی ئەفریقا بکەرەوە. لەو بڕوایەدایت خۆی بڕیاریدابێت کە وەک ئاژەڵێکی گۆشت خۆر بژی؟ ئایا هەر لەبەرئەوەیە کە پەلاماری یەکەمین ئاسک دەدات کە دەیبینێت؟ ئایا لەبری ئەوە نەدەکرا بۆ خۆی بڕیاربدات و لەسەر ڕووەک بژی؟
- نەخێر، شێر بەپێی سروشتی خۆی دەژی.
- یان بەپێی یاسای سروشت. تۆش هەمان شت دەکەیت سۆفیا. بێگومان دەتوانیت بە پاڵپشتی دیکارت بڵێیت؛ شێر گیانەوەرە و وەک مرۆڤ نیە کە خاوەنی ئەقڵێکی سەربەست بێت. بەڵام بیر لە کۆرپەیەکی ساوا بکەرەوە. دەقیژێنێت و هاواردەکات؛ کاتێکیش شیری نەدەیتێ، لەبری شیر پەنجەی خۆی دەمژێ. ئایا کۆرپەیەکی ساوا ویستی سەربەستی هەیە؟
- نەخێر.
- ئەی کەنگێ ئەو منداڵە چکۆلەیە دەبێتە خاوەنی ویستی سەربەستی خۆی؟ لە تەمەنی دووساڵیدا منداڵەکە بە هەر چوارلادا دەسوڕێتەوە و بە شێوەیەکی ڕێکەوت پەنجە بۆ هەموو شتێکی چواردەوری ڕادەکێشێت. لە سێ ساڵیدا دایکی ماندوو دەکات و لە پڕێکیشدا لە تەمەنی چوار ساڵیدا لە تاریکی دەترسێت. ئەی ئیتر سەربەستی لە کوێدایە سۆفیا؟
- نازانم.

- کاتێکیش دەبێتە پانزە ساڵ، لەبەردەم ئاوێنەدا دادەنیشێت و ئارایشت تاقیدەکاتەوە. ئایا لێرەدایە کە دەتوانێت بڕیاری کەسایەتی خۆی بدات و ئەو شتە بکات کە دەیخوازێت؟
- دەزانم دەتەوێت بەرەو کوێ بڕۆیت.
- منداڵەکە سۆفیا ئامۆنسنە، ئەمەیان ئاشکرایە. بەڵام ئەویش بەپێی یاسای سروشت دەڕوات. هەموو خاڵەکە لەوەدایە کە خۆی درک بەوە ناکات، لەبەرئەوەی چەندەها هۆی ئاڵۆز ئاڵۆز لە پشت هەموو تاکە شتێکەوە کە دەیکات.
- پێم وانیە لەمە زیاتر حەزبکەم گوێ بۆ ئەم بابەتە شلبکەم.
- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەیتەوە؛ دیمەنی دوو داری میوە بهێنە بەرچاوت، کە لە باخچەیەکی گەورەدا ڕوێنراون. یەکێکیان لە شوێنێکی بەر هەتاودا و لەسەر زەویەکی بەپیت و پڕ ئاودا ڕوێنراوە. دارەکەی تریان لەسەر زەویەکی نالەبار و سێبەردا ڕوێنراوە. بە بڕوای تۆ کام دارەیان گەورەتر دەبێت؟ کام دارەیان میوەی زیاتر دەگرێت؟
- بێگومان ئەو دارەیان کە گونجاوترین هەل و مەرجی گەورەبوونی بۆ ڕوخساوە.
- بەپێی سپینۆزاش ئەو دارەیە کە خاوەنی سەربەستیە، لەبەرئەوەی بە سەربەستیەکی تەواوەوە هەموو تواناکانی ناوەوەی گەشە پێداوە. بەڵام ئەگەر دارەکە داری سێو بێت، ئەوا ناتوانێت هەرمێ یان هەڵوژە بگرێت. بۆ ئێمەی مرۆڤیش هەمان شێوەیە. پێیدەچێت شتێک ببێتە ڕێگری گەشەکردن و پێگەیشتنی کەسایەتیمان، بۆ نمونە بەهۆی بابەتێکی ڕامیاریەوە، یان ڕوودەدات هێزێکی دەرەکی شەلمان بکات. بەڵام تەنها ئەو کاتە وەک مرۆڤێکی سەربەست دەژین، کە بە

"سەربەستی" بتوانین تواناکانی ناوەوەمان گەشە پێبدەین. بەڵام ئێمەش هەروەک کوڕەکەی چاخە بەردینەکان و شێرەکەی ئەفریقا و دارەکەی ناو باخچەکە، بەستراوینەتەوە بە توانای ناوەوە و هەلومەرجی دەرەکیەوە.

ـ خەریکە ئیتر توانام نامێنێت.

ـ سپینۆزا دەیگوت تەنها ئەو بوونەوەرەی کە بە تەواوەتی "هۆکاری خۆیەتی"، دەتوانێت لە ترۆپکی سەربەستیدا هەڵسوکەوتبکات. تەنها خودا و سروشت، نمونەی جۆرە سەربەستیەکی ئاوهان و "بەبێ ڕێکەوت" خۆیان دەکەنەوە. مرۆڤ دەتوانێت هەوڵی سەربەستی بدات و خۆی لە فشاری دەرەکی ڕزگاربکات. بەڵام هەرگیز ناگاتە "ویستی سەربەست". ئێمە دەسەڵاتمان بەسەر ئەو شتانەدا نیە کە بەسەر لەشماندا ڕوودەدەن، ئەو لەشەی کە شێوازێکی خاسیەتی درێژبوونەوەیە (*مادیە.و). بە هەمان شێوەش بڕیاری بیرکردنەوەکانیشمان بەدەست خۆمان نیە. واتە مرۆڤ خاوەنی "ڕۆحێکی سەربەست" نیە، بەڵکو تا ڕادەیەک لەوە دەچێت لە لەشێکی میکانیکیدا زیندانیکرابێت.

ـ تێگەیشتنی ئەمەیان کەمێک سەختە.

ـ مەبەستی سپینۆزا ئەوەیە، کە هەوەس و ئارەزووی مرۆڤ (بۆ نمونە وەک حەز و بەرزخواستن) ڕێگەمان لێدەگرێت و ناهێڵێت بگەینە ئاسودەیی یان هاوئاهەنگی ڕاستەقینە. بەڵام ئەگەر دان بەوەدا بنێین کە هەموو شتێک بەپێی پێویستی ڕوودەدات، ئەوا دەکرێت وەک گشتێک لە سروشت تێبگەین. لێرەشەوە دەتوانین بە ڕوون و ئاشکرایی پەیوەندی و پێکەوە بەسترانی هەموو شتێک ببینین، بەڵێ، دەتوانین هەموو شتێک وەک "یەک" شت ببینین. ئامانجەکە ئەوەیە کە لەیەک

کاتدا، هەرچیەک هەیە ببینرێت، تەنها ئەو کاتە دەگەینە بەرزترین ئاستی ئاسودەیی و هاوئاهەنگی. ئەمە بوو کە سپینۆزا پێی دەگوت "sub specie externitatis".

ـ مانای ئەوە چیە؟

ـ واتە بینینی هەموو شتێک لە "ڕوانگەیەکی هەتاهەتاییەوە"... لێرەوە نەبوو کە دەستمان پێکرد؟

ـ کەواتە لێرەشدا دەبێت کۆتایی پێبهێنین. دەبێت بەپەلە بگەڕێمەوە ماڵەوە.

ئەلبێرتۆ هەستا، قاپێک میوەی گەورەی هێنا و لەسەر مێزەکە داینا.

ـ پێش ئەوەی بڕۆیت، کەمێک میوە ناخۆیت؟

سۆفیا مۆزێکی هەڵگرت و ئەلبێرتۆش سێوێکی سەوز. لەگەڵ پاککردنی مۆزەکەدا گوتی؛

ـ شتێک لێرەدا نووسراوە.

ـ لە کوێدا؟

ـ لێرەدا... لە دیوی ناوەوەی توێکڵی مۆزەکەدا. لەوە دەچێت بە قەڵەمی ڕەش نووسرابێت.

سۆفیا خۆی لە ئەلبێرتۆ نزیککردەوە و توێکڵەکەی نیشاندا، ئەویش بە دەنگێکی بەرز نووسینەکەی خوێندەوە؛

"دیسانەوە هاتمەوە، هیلدە من لە هەموو شوێنێکدام کچەکەم. ڕۆژی لەدایک بوونت پیرۆزبێت"

ـ سەیرە... سۆفیا گوتی.

ـ هەتا بێت زۆرزانتر دەبێت.

ـ بەڵام... ئەمە مەحاڵە؟ وەک بزانیت دار مۆز لە لوبناندا دەڕوێت؟

ئەلبێرتۆ سەرێکی لەقاند.

ـ بەهەرحاڵ من نامەیت بیخۆم.
ـ دای بنێرەوە. یەکێک، کە لەسەر تویکڵی ناوەوەی مۆزێک نامەی ڕۆژی لەدایک بوون بۆ کچەکەی بنووسێت، بێگومان دەبێت مرۆڤێکی سەرلێشێواو بێت. بەڵام دەشێ مرڤێکی یەکجار فێڵبازیش بێت...
ـ هەردووکیانە.
ـ کەواتە لێرەدا ئیسپاتبوو کە هیلدە باوکێکی فێڵبازی هەیە و بە هیچ جۆرێکیش گەمژە نیە.
ـ من هەر زوو گوتم. زۆر ڕێشی تێدەچێت هەر ئەو بووبێت کە جاری پێشوو وای لێکردیت بە هیلدە بانگم بکەیت. لەوانەیە ئەو هەموو وشەکان بخاتە سەر زارمان.
ـ هیچ شتێک بەدور مەزانە، بەڵام دەبێت گومان لە هەموو شتێکیش بکەین.
ـ لەوانەیە هەموو ژیانمان تەنها خەونێک بێت.
ـ بەڵام دەبێت هەڵەشە نەبین، چونکە دەکرێت هەموو شتێکیش لێکدانەوەیەکی زۆر ئاسایی هەبێت.
ـ بەهەرحاڵ من دەبێت بەپەلە بگەڕێمەوە ماڵەوە، دایکم چاوەڕوانمە.
ئەلبێرتۆ هەتا لای دەرگاکە سۆفیای بەڕێکرد و لەو کاتەدا کە ڕۆیشت گوتی؛
ـ تا دیدارێکی تر هیلدەی ئازیز.
چرکەیەک دوای ئەوە دەرگاکەی لەسەر داخرا.

# "Locke"لۆک

## ... ئاگایمان هەر وەک تەختە ڕەشی ئەو پۆلەی پێش ئەوەی مامۆستا پێی تێبخات، بەتاڵ و بێمانایە ...

سۆفیا هەتا کاتژمێری هەشت و نیو نەگەیشتەوە ماڵەوە. ئەو کاتە سەعات و نیوێک بەسەر پەیمانەکەیاندا تێپەڕیبوو، لە ڕاستیشدا پەیمان نەبوو، تەنها ئەوەندە نەبێ کە بۆ نانی ئێوارە لەماڵەوە نەبوو، وە لەسەر پەڕەیەکی چکۆلەش بۆ دایکی نووسیبوو لە کاتژمێری حەوت زیاتر دواناکەوێت.

ـ چیتر بەم جۆرە نابێت، سۆفیا. بە ناچاری تەلەفونم بۆ پرسگە کرد و سۆراغی ئەلبێرتۆ ناوێکم کرد و گوتم لە گەڕەکە کۆنەکەی شار دەژی... بەڵام پێم پێکەنین.

ـ هاتنەوەم لەوێوە هەروا ئاسان نەبوو، جگە لەوەش خەریکە دەگەینە دەرخستنی نهێنیەکی گەورە.

ـ ڕاست ناکەیت!

ـ بەڵێ، ڕاست دەکەم.

ـ ئەی بۆ ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونەکەت بانگت کرد؟

ـ ئۆی... بیرم چوو.

ـ بەڵام من دەمەوێت بە زوترین کات بیبینم... تا سبەینێ مۆڵەتت دەدەمێ. بەلامەوە باش نیە کچێکی گەنجی وەک تۆ، بەو شێوەیە پیاوێکی بەتەمەن ببینێت.

ـ هەرچۆنێک بێت، هیچ پێویست ناکات لە ئەلبێرتۆ بترسیت. زیاتر باوکی هیلدە جێگەی مەترسیە.

ـ کام هیلدە؟

ـ هیلدە کچی ئەو پیاوەیە کە لە لوبنان دەژی. پیاوێکی خراپ دیارە. پێیدەچێت دەسەڵاتی بەسەر هەموو جیهاندا ڕاگرتبێت...
ـ ئەگەر هەر ئێستا ئەو ئەلبێرتۆیەم پێ نەناسێنیت، ئەوا چیتر ڕێگەت پێنادەم بیبینی. هەتاوەکو دەموچاوی نەبینم، هەست بە ئارامی ناکەم.
سۆفیا شتێکی بەخەیاڵدا هات. بەڕاکردن بەرەو ژوورەکەی خۆی ڕۆیشت و دایکیشی بەدوایدا قیژاندی؛
ـ بەڵام... ئەی بۆ کوێ ڕادەکەیت؟
سۆفیا بەپەلە گەڕایەوە.
ـ هەر ئێستا دەتوانیت سیمای ببینیت، ئیتر ئومێدەوارم وازم لێبهێنیت.
کاسێتێکی ڤیدیۆی دەرهێنا و بەرەو ڤیدیۆکە ڕۆیشت.
ـ کاسێتی ڤیدیۆی داویەتێ؟
ـ لە ئەسیناوە...
پاش کەمێک وێنەکانی ئەکرۆپۆلۆس هاتنە سەر شاشەکە، دایکی وشک بووبوو، بەتایبەتی کاتێک ئەلبێرتۆ هاتە پێشەوە و ڕاستەوخۆ قسەی بۆ سۆفیا دەکرد.
سۆفیاش ئەمجارەیان سەرنجی چووە سەر شتێک، کە کەڕەتی پێشوو نەیدیبوو؛ گروپی جیاواز جیاوازی گەشتیاران لە ئەکرۆپۆلیسدا جمەیان دەهات. لەناوەندی یەکێک لە گروپەکانەوە، پۆستەرێکی بچکۆلە بەرزکرابووەوە و لێی نووسرابوو "هیلدە"...
ئەلبێرتۆ بەردەوام بەناو ئەکرۆپۆلیسدا دەگەڕا. پاشان لەدەرگاکەوە چووە ژوورەوە و ڕۆشتە سەر لوتکەی ئاریۆپاگۆس، ئەو شوێنەی کە کاتی خۆی پاولۆس تێیدا وەستاو لەوێوە قسەی بۆ ئەسینابیەکان کرد. دواترش ئەلبێرتۆ بەردەوام باسی گۆڕەپانە کۆنەکەی بۆ سۆفیا دەکرد.

دایکی بە بێدەنگی دانیشتبوو و بە سەختیەکەوە چەند ڕستەیەکی لەدەم بووەوە؛
- باوەڕ بە چاوی خۆم ناکەم... ئەوەیە ئەلبێرتۆ؟ لەوێدا دیسان باسی کەروێشکەکەی کردەوە... بەڵام بەڕاستی لەگەڵ تۆدا قسە دەکات، سۆفیا. من نەمدەزانی پاولۆس لە ئەسیناشدا بووە...
کاسێتەکە خەریکبوو لەو شوێنە نزیکببێتەوە کە ئەسینای کۆن لەنێو پاشماوەکانەوە هەڵدەسێتەوە و لەدواهەمین چرکەدا سۆفیا بەپەلە کاسێتەکەی وەستاند. ئێستاکە ئەلبێرتۆی پێناساند و بەپێویستی نەدەزانی پلاتۆنیش ببینێت.
ژوورەکە تەواو خامۆش بوو، ئەوجا سۆفیا بە گاڵتە پێکردنێکەوە پرسی؛
- پیاوێکی قۆز نیە بەلاتەوە؟
- بەڵێ، بەڵام لە پیاوێکی سەیر دەچێت. دەنا بۆ فلیمیک لە ئەسینادا دەگرێت، تەنها لەبەرخاتری ئەوەی بۆ کچێکی منداڵکاری بنێرێت... کچێک کە هێشتام بە تەواوەتیش نایناسێت! بەڕاست کەی لە ئەسینا بووە؟
- نازانم.
- بەڵام ئەی...
- چی؟
- لەو مێجەرە دەچێت کە کاتی خۆی لە کوخەکەی ناو دارستانەکەدا دەژیا.
- کەواتە لەوانەیە هەر خۆی بێت، دایە.
- بەڵام پانزە ساڵ زیاترە کەس ئەوی نەدیووە.
- لەوانەیە گواستبێتیەوە... بۆ نمونە بۆ ئەسینا.

دایکی سەرێکی ڕاوەشاند.
- بیرمە کەڕەتێکیان لە حەفتاکاندا چاوم پێکەوت، ئەو کاتە لەم ئەلبێرتۆیەی ئێستاکە بینیم، زۆر پیرتر دیاربوو. بیرمە ناوی باوکیشی نەرویجی نەبوو...
- کنۆکس نەبوو؟
- پێی دەچێت، لەوانەیە ناوی کنۆکس بووبێت.
- ئەی ناوی کنەی نەبوو؟
- بەڕاستی بیرم ناکەوێتەوە... بەڵام ئەم کنەی و کنۆکسە کێن؟
- یەکێکیان ئەلبێرتۆیە و ئەوی تریشیان باوکی هیلدەیە.
- بەتەواوەتی سەرت لێ شێواندم!
- هیچ خواردنێک ماوەتەوە؟
- گۆشتمان هەیە و برۆ گەرمی بکەرەوە.
دوو حەفتەی ڕێک تێپەڕی و سۆفیا هیچ شتێکی لە ئەلبێرتۆوە نەبیست. پۆستکارتێکی تریشی بەناوی هیلدەوە پێگەیشت. لەلایەکی تریشەوە ڕۆژی لەدایکبوونی خۆشی نزیک دەبووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ پۆست کارتێک بۆ خۆی نەهات.
پاش نیوەڕۆیەک سۆفیا خۆی گەیاندە گەڕەکە کۆنەکەی شار و لەدەرگای ماڵی ئەلبێرتۆی دا. لە ماڵەوە نەبوو، بەڵام پارچەیەک کاغەزی چکۆلە بەدەرگاکەیەوە هەڵواسرابوو، لەسەری نووسرابوو؛

"جەژنی لەدایک بوونت پیرۆزبێت، هیلدە! خەریکە دەگەینە سەر خاڵی وەرچەرخان؛ کاتی ڕاستی گوتن، کچەکەم. هەموو جارێک کە بیر لەوە دەکەمەوە، هێندە پێدەکەنم خەریکە میز بەخۆمدا بکەم. بێگومان پەیوەندیەکی بە "بارکێلی" یەوە هەیە، باش خۆت ئامادە بکە"

سۆفیا نامە پچکۆلەکەی لێکردەوە و لە کاتی ڕۆشتنە دەرەوەیدا، فرێیدایە ناو سندوقی پۆستەکەی ئەلبێرتۆوە.
شەیتان! ناشێت دیسانەوە سەفەری کردبێت بۆ ئەسینا؟ چۆن دەتوانێت هەروا سۆفیا بەو هەموو پرسیارە بێ وەڵامانەوە جێی بهێڵێت؟
ڕۆژی 14ی شەش لە قوتابخانە هاتەوە و هێرمسی لەناو باخچەکەیاندا بینی دەخولایەوە. سۆفیا بە پەلە بەرەو ڕووی ڕۆشت و ئەویش بە ڕاکردن بەرەو پیری هات، هێرمس خۆی هەڵدەدا و کلکی دەلەقاند. سۆفیاش بەشێوەیەک باوەشی پێداکرد، هەر دەتگوت هێرمس هەموو مەتەڵەکانی بۆ دەردەخات.
دیسانەوە پارچە کاغەزێکی بۆ دایکی جێهێشت، بەڵام ئەم جارەیان ناونیشانی ئەلبێرتۆشی بۆ نووسی. بەناو شاردا بەڕێکەوتن و سۆفیا بیری لە ڕۆژی دواتر دەکردەوە. ئەو زۆر بیری لە ڕۆژی جەژنی لەدایک بوونی خۆی نەدەکردەوە؛ چونکە هەرچۆنچک بێت هەتاوەکو ئێوارەی جەژنی لەدایک بوونی یۆحەنا ئاهەنگی ساز نەدەکرد. بەڵام سبەینێ جەژنی لەدایک بوونی هیلدەشە. سۆفیا تەواو دڵنیبوو کە شتێکی سەیر لەو ڕۆژەدا ڕوودەدات. بەلایەنی کەمەوە لەوە بەدواوە چیتر نامەی پیرۆزبایی جەژنی لەدایکبوونی لە لوبنانەوە پێناگات.
بەناو گۆڕەپانە گەورەکەدا تێپەڕین و بەرەو گەڕەکە کۆنەکە دەڕۆشتن. لەو کاتەدا بەلای باخچەیەکدا تێپەڕین، هێرمس لەبەردەم کورسیەکی ناو باخچەکەدا وەستا؛ لەوە دەچوو بیەوێت سۆفیاش لەوێدا دابنیشێت.

سۆفیا دانیشت و دەستی بەسەر سەری سەگە زەردەکەدا دەهێنا، هاوکاتیش ڕێک تەماشای ناوچاوی دەکرد. لە پڕێکدا سەگەکە بەتەواوەتی پەشۆکا و سۆفیاش پێی وابوو بوەڕێت.
هەردوو چەنەی سەگەکە دەلەرینەوە، بەڵام هێرمس نە مرخە مرخی کرد و نەوەڕیش، بەڵکو دەمی کردەوە و گوتی؛
- ڕۆژی لەدایک بوونت پیرۆزبێت هیلدە!
سۆفیا وەک بەرد لە شوێنی خۆیدا وشک بوو... لەگەڵ ئەوی بوو؟
نەخێر، بێگومان لەخەیاڵی خۆیەوە دروستی کردووە، بەتایبەتیش کاتێک بەردەوام بیری لە هیلدە دەکردەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێک لە ناوەوەیدا پێی دەگوت کە هێرمس بەڕاستی ئەو وشانەی دەرپەڕاند. نەک هەر ئەوەش، بەڵکو بە دەنگێکی قوڵیشەوە گوتی.
پاش کەمێک هەموو شتێک وەک جارانی لێهاتەوە. هێرمس زۆر بەتوندی یەک دوو جار وەڕی، لەوە دەچوو بیەوێت پاکانە لەوەبکات کە کەمێک لەوەوپێش وەک مرۆڤ کەوتە قسەکردن. ئەوجا بەرەوماڵی ئەلبێرتۆ کەوتنە ڕێ. پێش ئەوەی سۆفیا بچێتە ناو دالانەکەی ماڵی ئەلبێرتۆوە، تەماشایەکی ئاسمانی کرد. بەدرێژایی ڕۆژەکە هەمووی هەر خۆش بوو، بەڵام وا خەریکە هەندێ پەڵە هەوری گەورە لە دورەوە کۆدەبنەوە.
هەر کە ئەلبێرتۆ دەرگاکەی کردەوە، سۆفیا کەوتە قسەکردن؛
- بە یارمەتیت هیچ جۆرە قسەیەکی بۆش بە ئەدەبەوە مەکە! کڵاوت لەسەر کراوە و خۆشت باش دەیزانیت.
- ئەوجا چی ڕوویداوە؟
- مێجەر، هێرمسی فێری قسەکردووە.
- هێی، گەیشتە ئەو ڕادەیەش؟

ـ بەڵێ.
ـ ئەی باشە چی وت؟
ـ بێگومان دەتوانیت هەڵیبهێنیت.
ـ وتی "ڕۆژی لەدایکبوونت پیرۆزبێت"، یان شتێک لەو بابەتە؟
ـ ڕێک زانیت.
ئەلبێرتۆ ڕێگەی بە سۆفیادا بێتە ژوورەوە. دیسانەوە ئەم جارەش جلوبەرگێکی تری پۆشیبوو. زۆر جیاواز نەبوو لەکاتی دواجاری، تەنها ئەوەندە نەبێت ئەم جارەیان پاڵتۆکەی سادەتر بوو. پاش تەماشاکردنی، سۆفیا گوتی؛
ـ بەڵام شتێکی تریش ڕوویدا.
ـ چی تریش؟
ـ پارچە کاغەزەکەت لە سندوقی پۆستەکەتدا نەدی؟
ـ نامە پچکۆلەکە؟ بەڵێ، بەڵێ... هەر زوو فڕێمدا.
ـ بەلای منەوە ئاساییە کە هەموو جارێک بیر لە بارکێلی دەکاتەوە، میز بەخۆیدا بکات. بەڵام نازانم ئەو فەیلەسوفە بە چ شێوەیەک وای لێدەکات هێندە پێبکەنێت؟
ـ با چاوەڕوان بین هەتا دەیگەینێ.
ـ بەڵام ئەمڕۆکە دەتەوێت باسی ئەوم بۆ بکەیت، وا نیە؟
ـ بەڵێ، بەڵێ ئەمڕۆ دێینە سەر باسی ئەو.
ئەلبێرتۆ بەڕاشکاوی دانیشت و ئەوجا دەستی پێکرد؛
ـ کە جاری پێشوو لێرەدا دانیشتین، باسی دیکارت و سپینۆزام بۆ کردیت. گەیشتینە ئەوەی کە هەردووکیان لە یەک خاڵی گرنگدا هاوبەشبوون؛ هەردووکیان ڕاشیونالیستانە بیریان دەکردەوە.
ـ ڕاشیۆنالیستیش کەسێکە کە زۆر باوەڕی بە دەسەڵاتی ئەقڵ هەبێت.

- بەڵێ، کەسی ڕاشیونالیست لەو بڕوایەدایە کە ئەقڵ سەرچاوەی زانین بێت. لە هەمان کاتیشدا بە بڕوای ئەو مرۆڤ خاوەنی هەندێ بیری زگماکیشە –واتە ئەو جۆرە بیرانەی لە ئاگایی مرۆڤدا بوونیان هەیە، تەنانەت پێش ئەوەی هیچ ئەزموونێکیشی هەبێت. هەتاوەکو ئەم جۆرە بیرە یان وێناکردنە ڕوونتریش بێت، ئەوا زیاتر و زۆرتر دڵنیا دەبین کە بەرامبەر شتێکی ڕاستی دەوەستێتەوە. بێگومان لەیادتە کاتێک کە دیکارت وێناکردنێکی ڕوون و ئاشکرای دەربارەی "بوونەوەرێکی بێ کەموکوڕی" هەبوو، لەم وێناکردنەشەوە، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە خودایەکی ڕاستی دەبێت بوونی هەبێت.

- هەروا بە ئاسانی شتم بیرناچێتەوە.

- ئەم جۆری بیرکردنەوە ڕاشیۆنالیستیانە، لە نێو فەلسەفەی سەدەی حەڤدەدا باوبوو. لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا، بۆ نمونە لەلای فەلسەفەی سوکرات و پلاتۆندا، بە شێوەیەکی بەهێز دەردەکەوت. بەڵام لەگەڵ هاتنی سەدەی هەژدەدا، بەردەوام کەوتە بەر لێشاوی ڕەخنەیەکی توندوتیژ. لەو سەردەمەدا، کۆمەڵێک لە فەیلەسوفەکان گەیشتنە بڕوایەک و دەیانگوت ئەگەر ئێمەی مرۆڤ ئەزموونی هەستیمان لە پێشدا لەلا گەڵاڵە نەبووبێت، ئەوا بە هیچ جۆرێک ڕێی تێناچێت هیچ جۆرە ناوەڕۆکێکی ئاگاییمان هەبێت. ئێمە بەم جۆرە ڕوانگەیە دەڵێین "ئیمپیریزم Empirism".

- دەتەوێت ئەمڕۆ باسی ئیمپیریستەکانم بۆ بکەیت؟

- هەوڵدەدەم... گرنگترین ئیمپیریست –یان فەیلەسوفە ئەزموونگەریەکان- لۆک "Locke" و بارکێلی "Berkeley" و هیوم "Hume"بوون، هەر سێکیشیان بەریتانی بوون. لە کاتێکدا دیارترین دەنگی ڕاشیونالیستی لە سەدەی حەڤدەدا، دیکارتی فەڕەنسی و

سپینۆزای هۆڵەندی و لایبنیزی "Leibniz" ئەڵمانی بوون. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، کە تا ڕادەیەک ئیمپیریستی بەریتانی و ڕاشیونالیزمی کیشوەری (*مەبەست لە کیشوەری ئەوروپایە.و) جودا دەکەینەوە.

ـ باشە، چ جۆرە ناوێکی درێژ درێژ بەکاردەهێنێت! دەتوانیت دووبارە مانای "ئیمپیریزم"م بۆ ڕوون بکەیتەوە؟

ـ "ئیمپیریست" کەسێکە کە لە ڕێگەی هەستەکانیەوە هەموو زانیاریەکی دەربارەی جیهان هەڵدەچنێت. شێوەی هەڵسەنگاندنی ئیمپیریستی کلاسیکیش، لە ئەرستۆتالیسەوە سەرچاوە دەهێنێت. ئەو دەیگوت؛ "ئەو شتەی کە لە پێشدا لە هەستەکاندا نەبووبێت، لە ئاگایدا بوونی نیە". ئەم ڕوانگەیەش لە لایەن پلاتۆنەوە ڕەخەی لێگیرا، چونکە بە بڕوای ئەو مرۆڤ لەگەڵ لەدایک بوونیدا هەندێ "بیر"ی زگماک لە جیهانی "بیر"ەوە دەهێنێت. لۆکش وشەکانی ئەریستۆتالیسی دووبارە دەکردەوە، بەڵام ئاڕاستەی دیکارتی دەکرد.

ـ ئەو شتەی کە لە پێشدا لە هەستەکاندا نەبووبێت... ئەوا لە ئاگایدا بوونی نیە؟

ـ ئێمە سەبارەت بە جیهان، خاوەنی هیچ جۆرە بیرێک یان وێنایەکی زگماک نین. واتە هەتاوەکو ئەو جیهانە نەبینین کە دێینە ناوی، بە هیچ جۆرێک هیچ شتێک دەربارەی نازانین. ئەگەر جۆرە بیرکردنەوەیەک یان مەزەنەیەکیشمان دەربارەی شتێک هەبێت، کە ئەزموونمان نەکردبێت، ئەوا لەو بارەدا وێناکردنەکەمان هەڵەیە. بۆ نمونە کاتێک وشەی وەک "خودا" یان "نەمری" یان "مادەی ڕەسەن" بەکاردەهێنین، ئەقڵمان لە بەتاڵیدا دەخولێتەوە. لەبەرئەوەی هیچ کەسێک ئەزموونی خودا یان نەمری نەکردووە، کەسیش ئەو "مادە ڕەسەن"ی، هەروەک فەیلەسوفەکان ناویان لێنابوو" تاقی نەکردۆتەوە.

بەم شێوەیەش دەتوانین چەندەها تیزی لێکۆڵینەوەی مەعریفی فراوان بنووسین، بەبێ ئەوەی لە دواهەمین ئەنجامیشدا هیچ جۆرە تێگەیشتنێکی مەعریفی نوێی لە دوتوێ گرتبێت. لەوانەیە ئەم شێوە سیستمە فەلسەفیە وردە، سەرسوڕهێنەر بێتە پێش چاو، بەڵام لە ڕاستیدا لە جۆرە هۆنینەوەیەکی فیکری زیاتر، هیچی تر نیە. فەیلەسوفەکانی سەدەی حەڤدە و هەژدە کۆمەڵێک لەو تیزە زانستیانەیان بە میرات بۆ مایەوە، بەڵام دەبوایە بەوردی بیان خستایەتە ژێر میکرۆسکۆبەوە و لە بیرکردنەوەی بەتاڵ پاککژیان بکردایە. لەوانەیە بتوانین لەگەڵ گەڕان بەدوای ئاڵتوندا بەراوردی بکەین؛ زۆربەی زۆری لم و قوڕە، بەڵام جارجارێکیش دەنکە ئاڵتونێک دەردەکەوێت.

- ئایا دەکرێت ئەو دەنکە ئاڵتونانە بە ئەزموونی ڕاستەقینە لە قەڵەم بدرێت؟

- هەر هیچ نەبێت دەتوانین بڵێین ئەو بیرکردنەوانە شیاوی ئەوەن بە ئەزموونی مرۆڤەوە گرێ بدرێنەوە. ئیمپیریستە بەریتانیەکان بەلایانەوە گرنگبوو کە دووبارە لە هەموو وێناکردنەکانی مرۆڤایەتی بکۆڵنەوە، بۆ ئەوەی دڵنیابن کە بنچینەیەکی ڕاستەقینەی ئەزموونیان هەیە. بەڵام ئێستاکە دەبێت یەکە یەکە بێینە سەر فەیلەسوفەکان.

- کەواتە با دەست پێبکەین!

- یەکەمین فەیلەسوفیان "جۆن لۆک"ی بەریتانی بوو، ئەو لە ساڵی 1632 وەوە تا ساڵی 1704 ژیا. گرنگترین کتێبی ناوی "شیکردنەوەیەک لەسەر تێگەیشتنی مرۆڤایەتی" بوو و لە ساڵی 1690 دا بڵاوکرایەوە. لەو کتێبەدا هەوڵدەدات دوو پرسیار ڕوونبکاتەوە، لە یەکەمیاندا دەڵێت؛ سەرچاوەی وێناکردن و بیرکردنەوەی مرۆڤ لە چ

شوێنێکەوە هەڵدەقوڵێت؟ ئەوجا دەپرسێت؛ ئایا دەکرێت پشت بەو شتانە ببەستین کە هەستەکانمان پێمان دەڵێت؟
ـ پرۆژەیەکی کەمی هەڵنەبژاردووە!
ـ یەکە یەکە دێینە سەر خاڵەکان. لۆک تەواو لەو بڕوایەدابوو کە هەموو بیرکردنەوە و وێناکردنێکمان، تەنها بەرپەرچدانەوەی ئەو شتانەن کە بینیومانن یان کە بەرگوێمان کەوتوون. ئەو دەیگوت پێش ئەوەی هەست بەشتێک بکەین، ئاگایمان وەک "tabula rasa" وایە، واتە وەک "تەختە ڕەشێکی پاک" وایە.
ـ ئەم زمانەی خۆشمان خراپ نیە.
ـ واتە پێش ئەوەی هەست بە شتێک بکەین، ئاگایمان هەر وەک تەختە ڕەشی ئەو پۆلەی پێش ئەوەی مامۆستا پێی تێبخات، بەتاڵ و بێمانایە. لۆک ئاگایی بە ژوورێکی بێ شتومەک بەراورد دەکات. بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا دەست بە هەستکردن دەکەین؛ جیهانی چواردەورمان دەبینین، بۆن دەکەین، تام دەکەین، دەست لە شتەکان دەدەین و گوێمان لە شت دەبێت. هیچ کەسێکیش لە منداڵێکی پچکۆلە بە گوڕتر، بەم کارانە هەڵناسێت. بەم شێوەیەش ئەو شتە سەرهەڵدەدات کە لۆک ناوی دەنێت "بیری هەستی ساکار". بەڵام هاوکات لەناو ئاگایشدا شتێک ڕوودەدات؛ بیرە هەستیە ساکارەکان، لە ڕێگەی ئەندێشە و هۆ هێنانەوەی لۆژیکی و بڕوا و گومانەوە، لێکدەدرێنەوە و ڕێکدەخرێن و کاریان لەسەر دەکرێت. بەم شێوەیەش، هەروەک لۆک دەیگوت، "وێنەدانەوەی بیرەکان" دادەڕێژرێن. وات لۆک "هەستکردن" و "بەرپەرچدانەوە" جیادەکاتەوە. لەبەرئەوەی بە بڕوای ئەو ئاگایی تەنها وەرگرێکی ناچالاک نیە، بەڵکو لەگەڵ هاتنە

ناوەوەی هەر مۆرکێکی هەستیدا، ئاگایی کاری لێکدانەوە و ڕێکخستنی لە ئەستۆ دەگرێت. ئا لێرەشدا دەشێ وریابین.

- وریا بین؟

- لۆک جەختی لەسەر خاڵێک دەکرد و دەیگوت ئەو شتەی لە ڕێگەی هەستەکانمانەوە وەریدەگرین، مۆرکێکی ساکارە. بۆ نمونە کاتێک من سێوێک دەخۆم، ناتوانم لەیەک مۆرکی ساکاردا، تەواوی "سێوەکە" هەست پێبکەم. بەڵکو لە ڕاستیدا زنجیرەیەک لە "مۆرکی ساکار" وەردەگرم؛ شتێکی سەوزە، بۆنێکی تەڕ و تازەی لێدێت و تامێکی کەمێک ترش و ئاوداریشی هەیە. تەنها ئەو کاتەی کە چەند سێوێکم خواردبێت، ئەوسا بیر لەوە دەکەمەوە کە ئێستاکە "سێوێک" دەخۆم. لۆک دەڵێت ئەو کاتە دەربارەی "سێوێک"، جۆرە وێناکردنێکی لێکدراو دروستدەکەین. بۆنمونە کاتێک منداڵ بووین و بۆ یەکەم جار تامی سێوێکمان کرد، ئەو کاتە خاوەنی هیچ جۆرە وێنایەکی لێکدراو نەبووین، بەڵکو ئەو کاتە شتێکی سەوزمان دەبینی و تامێکی تەڕو بەڕیشی هەبوو... ئمم! بەڵێ، تامەکەشی کەمێک ترش بوو. هێدی هێدی دێین و چەندەها شێوەی ئەو هەستانە پێکەوە گرێ دەدەین و زاراوەی وەک "سێو" و "پرتەقاڵ" و "هەرمێ" دروست دەکەین. بەڵام لە بنەڕەتدا هەموو کەرەسەی زانینەکەمان لە ڕێگەی هەستەکانمانەوە دێت. لەبەر ئەوە، ئەو زانیاریەی کە نەتوانین بیگەڕێنینەوە بۆ مۆرکی هەستی ساکار، زانیاریەکی خەیاڵییە و دەشێ فرێبدرێت.

- بەڵام هەرچۆنێک بێت، دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین ئەو شتەی کە دەیبینین و دەستی لێدەدەین و گوێمان لێدەبێت و تامی دەکەین، بەو شێوەیەن کە هەستیان پێدەکەین.

ـ دەتوانین و ناشتوانین. ئەمەیان پرسیاری دووهەمە، کە لۆک هەوڵدەدات وەڵامی بداتەوە. لە پێشدا وەڵامی پرسیاری یەکەمی بۆ ڕوونکردینەوە (بیر و وێناکردنەکانمان لە چ شوێنێکەوە سەرچاوە وەردەگرن؟). بەڵام ئەوجا پرسیاردەکات و دەڵێت ئایا بەڕاستی جیهان بەو شێوەیەیە کە ئێمە هەستی پێ دەکەین؟ لە ڕاستیشدا ئەمەیان زۆر ڕوون و ئاشکرا نیە، سۆفیا... بەڵام نابێت زۆر پەلە پەل بکەین، ئەمەش تەنها شتە کە فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە دەشێ لێوەی دوربێت.
ـ وەک ماسی بێدەنگم.
ـ لۆک جۆریەتی هەستەکانی بەپێی، هەروەک خۆی دەیگوت، "هەستی سەرەکی" و "هەستی لاوەکی" جودا دەکردەوە. لێرەشدا پشت بە فەیلەسوفە گەورەکانی پێش خۆی دەبەستێت، بۆ نمونە بە دیکارت.
مەبەست لە جۆریەتی هەستی سەرەکی، قەبارە و کێش و جوڵە و ژمارەی شتەکانە. کاتێکیش باس لەم جۆرە خاسیەتانە دەکەین، دەتوانین دڵنیابین کە هەستەکانمان سیفەتی ڕاستەقینەی شتەکانمان بۆ دەخەنەڕوو. بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەست بە خاسیەتی تری شتەکانیش دەکەین؛ ئێمە دەڵێین شتێک شیرینە یان ترشە، سەوزە یان سوورە، گەرمە یان ساردە. لۆک بەمانەی دەگوت جۆریەتی هەستی لاوەکی. ئەم جۆرە هەستانەش (وەک ڕەنگ و بۆن و تام و دەنگ) خاسیتی ڕاستەقینەی ناوەوەی شتەکانمان پێ ناڵێن، بەڵکو تەنها کاریگەریەکی دەرەکی لەسەر هەستەکانمان بەرپەرچ دەکەنەوە و هیچی تر.
ـ مشتومڕ لەسەر تام و چێژ ناکرێت.
ـ ڕاست دەکەیت. هەموو کەس دەتوانێت لەسەر خاسیەتە سەرەکیەکان (وەک قەبارە و کێش) تەبا بێت، چونکە لەناو خودی شتەکاندان. بەڵام

دەکرێت خاسیەتە لاوەکیەکان (وەک ڕەنگ و تام) لە گیانەوەرێکەوە بۆ گیانەوەرێکی تر و لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دی جیاوازبێت. لەم بارەدا هەموو تاکە کەس و هەموو تاکە گیانەوەرێک پشت بە جۆریەتی پێکهاتنی ئەندامی هەستی خۆی دەبەستێت.

ـ کاتێک یۆرون پرتەقاڵێک دەخوات، هەروەک چۆن ئێمە کاتێک لیمۆیەک دەخۆین، قاژ قاژ دەیخوات و دەڵێت "ترشە"... بەڵام هەمان پرتەقاڵ بەلای منەوە تامێکی شیرین و خۆشی هەیە.

ـ نە هیچتان ڕاست دەکەن و نە هیچیشتان هەڵەن. ئێوە تەنها وەسفی پرتەقاڵەکە دەکەن و باس لەو شێوەیە دەکەن کە کار لە هەستتان دەکات. بەلایەن ڕەنگەکانیشەوە هەمان شتە. گریمان تۆ ڕەنگی سوورێکی تایبەتیت بەلاوە جوان نیە و ئەگەر یۆرون کراسێکی لە هەمان ڕەنگ کڕی، ئەوا لەوانەیە زیرەکانە بێت گەر ڕای خۆت دەرنەبڕیت، چونکە هەر یەکەتان بە جۆرێک ڕەنگەکە دەبینێت، بەڵام ڕەنگەکە خۆی لە خۆیدا نە جوانە و نە ناشیرینیشە.

ـ بەڵام هەموو کەسێک لەو بڕوایەدایە کە پرتەقاڵ خڕە.

ـ بەڵێ، ئەگەر پرتەقاڵێکی خڕت لە دەستدا بێت، ئەوا بێسوودە گەر بڵێیت "هەستدەکەم" چوارگۆشەیە. دەتوانیت بڵێیت "هەستدەکەم" ترشە یان شیرینە، بەڵام ئەگەر لە کاتێکدا کێشەکەی دووسەد گرام بێت، ناتوانیت بڵێیت "هەستدەکەم" کێشەکەی هەشت کیلۆ دەبێت. بێگومان دەتوانیت "لەو بڕوایەدا بیت" کە چەند کیلۆیەک دەبێت، بەڵام ئەوساکە تەواو بەهەڵەدا دەچیت. هەمان شتیشە کاتێک کە باس لە ژمارەی شتەکان دەکەین؛ یان ئەوەتا 986 دەنکە نۆک لە قاپەکەدایە یان وا نیە. دیسانەوە هەمان شتیش بەسەر جوڵەی شتێکدا دەچەسپێت؛ ئۆتۆمبیلەکە یان لە جوڵەدایە یان وەستاوە.

ـ تەواو تێدەگەم.
ـ بەکورتی؛ هەرچی دەربارەی هەقیقەتی "مادییە"، لۆک و دیکارت یەک بڕوایان هەیە و تەبان لەسەر ئەوەی چەند خاسیەتێکی هەیە و ئێمەی مرۆڤ دەتوانین بە دڵنیاییەوە لە ڕێگەی ئەقڵەوە درکیان پێبکەین.
ـ پێم وانیە تەبابوون لەسەر ئەم خاڵە سەخت بێت.
ـ بەڵام لەلایەکی ترەوە، لۆک دەرگا لەسەر زانینێکی ڕاستەوخۆ یان "ڕوون و ئاشکرا"ش دەکاتەوە. بۆ نمونە بە بڕوای ئەو چەند یاسایەکی بنچینەیی ڕەوشتی هەیە، کە بەسەر هەمووواندا دەچەسپێت. واتە لەگەڵ ئەو شتەدا تەبایە کە پێی دەڵێن "هەقی سروشتی"، ئەمەش خاسیەتێکی ڕاشیونالیستییە. بەهەمان شێوەش کە دەڵێت بوونی خودا لەناو خودی ئەقڵی مرۆڤدا بوونی هەیە، دیسانەوە لەوێشدا خاسیەتێکی تری ڕاشیونالیستی دەردەبڕێت.
ـ لەوانەیە ڕاست بکات.
ـ لە چیدا؟
ـ لەوەدا کە خودا هەیە.
ـ بێگومان ڕێی تێدەچێت. بەڵام ئەم بابەتە بەلای ئەوەوە لە قاڵبێکی بڕوابوون یان بڕوانەبووندا ناوەستێتەوە، بەڵکو بەپێی ئەو درککردنی خودا لە ئەقڵی مرۆڤەوە سەرچاوە دێنێت. "ئەمەش" دیسانەوە خاسیەتێکی ڕاشیونالیستییە. جگە لەمانەش دەبێت بڵێین لۆک باسی سەربەستی بیروڕا دەربڕین و لێبووردنی دەکرد، گرنگی دەدا بە یەکسانی نێوان ئافرەت و پیاو. ئەو دەیگوت؛ دەستکردی مرۆڤ خۆیەتی کە دەبینین ژن ژێردەستەی پیاوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش ڕێی تێدەچێت بتوانین ئەو پەیوەندیە بگۆڕین.

ـ منیش بە تەواوەتی هاوبڕوایم.
ـ لەسەردەمی نوێدا جۆن لۆک یەکەمین فەیلەسوفە کە بایەخی بە ڕۆڵی هەردوو ڕەگەزەکە دەدا. لێرەشەوە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر جۆن ستیوارد میل"John Stuart Mill" ی هاوولاتی خۆی هەبوو، ئەم بوو کە پاشتر ڕۆڵێکی گرنگی لەداواکردنی یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا بینی. لۆک لە زۆر بیرکردنەوەی لیبرالیدا لەپێش سەردەمەکەی خۆیەوە بوو، لەبەرئەوە پاشان لە سەدەی هەژدەدا و لە سەردەمی بزوتنەوەی ڕۆشنگەری فەڕەنسیدا، بیرکردنەوەکانی بە تەواوەتی بوونە باو و بەکاریان دەهێنا. بۆ نمونە ئەو شتەی کە پێی دەگوترێت "مەبدەئی دابەشکردنی دەسەڵات"، ئەو بوو کە یەکەمین جار هێنایە سەر باس و خواس...
ـ واتە دەسەڵاتی وڵات بەسەر چەند دام و دەزگایەکدا دابەش دەکرێت، وا نیە؟
ـ لە یادتە چ دام و دەزگایەکن؟
ـ "دەسەڵاتی یاسا دانەر" یان پەرلەمان و "دەسەڵاتی حوکم دەرکردن" یان دادگا و دواهەمینیش "دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن- وەزیرەکان" یاخود حوکمەت.
ـ ئەم سێ دابەشکردنە لەلایەن مۆنتیسکیو"Montesquieu" ی فەیلەسوفی سەردەمی ڕۆشنگەریی فەڕەنسیەوە هاتووە. بەڵام بۆ ئەوەی ڕژێمێکی ستەمکار سەر هەڵنەدات، لۆک سووربوو لەسەر ئەوەی کە دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی حوکمەت جودا بکرێنەوە. ئەو لە سەردەمی لویسی چواردەدا دەژیا کە لەو کاتەدا هەموو هێزەکانی لەژێر یەک دەستدا کۆکردبووەوە و دەیگوت "من دەوڵەتم". ئێمە دەڵێین لویسی چواردە پاشایەکی تاکە دەسەڵات بووە، لەبەرئەوەی

دەسەڵاتی لەسەر بنچینەیەکی هەقانی بەکارنەدەهێنا. لۆک دەیگوت بۆ ئەوەی دەوڵەتی هەق دابمەزرێنین، دەبێت نوێنەرانی خەڵک یاسا دارِێژن و حوکمەت یان پاشاش بیان چەسپێنێت.

# هیوم"Hume"

## ...کەواتە فڕێی بدەرە ناو ئاگرەکەوە...

ئەلبێرتۆ دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە مێزەکە. پاش کەمێک ئاوڕی دایەوە و لە پەنجەرەکەوە تەماشایەکی دەرەوەی کرد.

ـ خەریکە هەورەکان بەری ئاسمان دەگرن... سۆفیا گوتی.

ـ بەڵێ هەورەکان کۆبونەتەوە.

ـ ئێستاکە باسی بارکێلیم بۆ دەکەیت، وانیە؟

ـ ئەو دووهەمین ئیمپیریستی بەریتانیە، بەڵام لە زۆر بارەوە جودا دەکرێتەوە، لەبەرئەوە دەمەوێت لەپێشدا باسی دەیفید هیوم "David Hume"ت بۆ بکەم. هیوم لە ساڵی 1711 وە تاوەکو ساڵی 1776 ژیا، فەلسەفەی ئەو تا ئێستاکەش لەناو ئیمپیریستەکاندا تایبەتمەندێتی و گرنگی خۆی هەیە. لەلایەکی تریشەوە ڕۆڵێکی گرنگی تریشی هەبوو؛ ئەو بوو کە فەیلەسوفی گەورە "ئیمانوێڵ کانت"ی خستە سەر هێڵی تایبەتمەندی خۆی.

ـ پێم وابێت بە هیچ جۆرێک گوێ نادەیتە ئەوەی کە من زیاتر پەرۆشی فەلسەفەی بارکێلیم؟

ـ نەخێر، بە هیچ جۆرێک گوێ نادەمێ. هیوم لە شاری "ئادینبۆرگ"ی ئیسکوتلەندادا گەورە بوو، خێزانەکەشی دەیانویست یاسای پێبخوێنن. بەڵام خۆی دەیگوت "ناتوانم بەرەنگاری ئەو هەستەم بم کە جگە لە فەلسەفە و ڕۆشنبیری گشتی، دژ بە هەموو شتێکە". ئەو لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا و هاوکات لەگەڵ بیرمەندە مەزنەکانی وەک فۆڵتاری و ڕووسودا دەژیا، گەشتی بە ئەوروپادا دەکرد و پاشان لە کۆتایی ژیانیدا دیسانەوە گەڕایەوە شاری ئادینبۆرگ و لەوێدا نیشتەجێ بوو.

لە تەمەنی بیست و هەشتساڵیدا، گرنگترین کتێبی بە ناوی "تێزێک دەربارەی سروشتی مرۆڤ"وە بڵاوکردەوە. بەڵام خۆی دەیگوت هەر لە تەمەنی پانزە ساڵیەوە بیرۆکەی ئەو کتێبەی لە خەیاڵدا بووە.
ـ ئەگەر باش لە مەبەستت تێبگەم، باشتر وایە منیش پەلە بکەم.
ـ بەڵام تۆ هەر لە ئێستاوە دەستت پێکردووە.
ـ ئاخر گەر بمەوێت فەلسەفەی تایبەت بە خۆم هەڵچنم، ئەوا دەبێت زۆر جیاوازتر بێت لە هەموو ئەو شتانەی هەتا ئێستاکە بەر گوێم کەوتوون.
ـ هیچ شتێکی تایبەتی هەیە تا ئێستاکە باسمان نەکردبێت.
ـ لەپێش هەموو شتێکدا هەموو ئەو فەیلەسوفانەی هەتا ئێستاکە باسمان کردوون، پیاو بوون. پیاوانیش پێم وابێت لە جیهانی تایبەتی خۆیاندا دەژین. من زیاتر بایەخ بە جیهانی ڕاستەقینە دەدەم، بە گوڵ و بە گیانەوەر، بایەخ بە منداڵان دەدەم، کە لەدایک دەبن و گەورە دەبن. بەڵام هەتا ئێستاکە فەیلەسوفەکانت هەمیشە باسی "مرۆڤ" دەکەن، وا دیسانەوە وتارێکی زانستی تر دەربارەی "سروشتی مرۆڤ" دێتەوە پێشەوە. زیاتریش ئەو "مرۆڤ"ە لەوە دەچێت کەسێکی میان تەمەن بێت، لە کاتێکدا ژیان بە سکپڕبوون و لەدایک بوون دەست پێدەکات. بەبڕوای من هەتا ئێستا پەڕۆی منداڵ و قیژەی منداڵ کەم باسکراوە. لەوانەیە کەمیش باسی برادەرایەتی و خۆشەویستیش کرابێت.
ـ بەڵێ ڕاستدەکەیت، بەڵام لەوانەشە هیوم ڕێک ئەو فەیلەسوفە بێت کە لە ڕوانگەیەکی جیاوازترەوە دونیا دەبینێت. ئەو، بە بەراوردکردنی لەگەڵ هەموو فەیلەسوفەکانی تردا، دێت و زیاتر لە ژیانی ڕۆژانەوە دەست پێدەکات. جگە لەوەش پێم وابێت هیوم زۆر بە

ئاسانی دەیتوانی خۆی لە جێگای منداڵان (واتە خەڵکانی نوێی سەر زەوی) دابنێت و لەوێوە تەماشای بوون بکات.
- کەواتە باشتر وایە زۆر بە ئاگادارییەوە گوێت بۆ شل بکەم.
- هیوم وەک ئیمپیریستێک بە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانی کە هەموو تێگەیشتنێک و بیرکردنەوەیەکی ناڕوونی "فەیلەسوفەکانی" پێشوتری ڕێکبخات. چونکە لەسەردەمی ئەودا پاشماوەیەکی بێکەڵکی بیری سەدەکانی ناوەڕاست و فەیلەسوفە ڕاشیونالیستەکانی سەدەی حەڤدە، کەڵەکە بووبوون. هیوم دەیویست بگەڕێتەوە سەر هەستکردنی ڕاستەوخۆی مرۆڤ. ئەو دەیگوت هیچ فەلسەفەیەک "هەرگیز ناتوانێت لە ئەزموونەکانی ڕۆژانە دورترمان ببات، وە هیچ فەلسەفەیەکیش ناتوانێت جۆرە یاسایەکی هەڵسوکەوتمان بۆ داڕێژێت کە جیاوازتربن لەوانەی کە لە کاتی ژیانی ڕۆژانەماندا دەستمان دەکەوێت."
- هەتا ئێستاکە شایانی ئەوەیە گوێی بۆ شل کەین. دەتوانیت چەند نمونەیەک بهێنیتەوە؟
- بوونی فریشتە لە سەردەمی هیومدا وێناکردنێکی زۆر باو بوو. لێرەدا مەبەستمان لە فریشتە، مرۆڤی باڵدارە. هەرگیز بوونەوەرێکی ئاوهات بینیووە، سۆفیا؟
- نەخێر.
- بەڵام خۆ شێوەی مرۆڤت دیووە؟
- پرسیارێکی بێ مانا دەکەیت.
- باڵیشت بینیوە، وا نیە؟
- بێگومان بینیومە، بەڵام نەک بە مرۆڤەوە.
- بەلای هیومەوە "فریشتە"، "بیرۆکەیەکی لێکدراوە" و لە دوو ئەزموونی جیاواز پێکهاتووە کە لە ژیانی ڕاستیدا پێکەوە گرێنەدراون،

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەنتاسیای مرۆڤ بەیەکەوەی لکاندوون. بەشێوەیەکی تر دەریببڕین، وێناکردنێکی خەیاڵییە و دەشێت یەکسەر فڕێ بدرێت. دەبێت بە هەمان شێوەش وێناکردن و بیرکردنەوەکانمان ڕێک بخەین. کتێبەکانیشمان بە هەمان شێوە، لەبەرئەوەی هەروەک هیوم دەیگوت؛ "کاتێک کتێبێک بە دەستمانەوە دەگرین، دەبێت ئەم پرسیارانە بکەین؛ هیچ ئەندێشەیەکی ئەبستراکتی دەربارەی قەبارە و ژمارە تێدایە؟ نەخێر... ئەی هیچ ئەندێشەیەکی ئەزموونی دەربارەی ڕاستی و بوونی لە خۆگرتووە؟ نەخێر... کەواتە فڕێی بدەرە ناو ئاگرەکەوە، لەبەرئەوەی لە تورەهاتی سۆفیستی و وردە فەنتاسی زیاتر، هیچی تری تێدا نیە."

- هەر زۆر توند و دڵ ڕەقە.

- بەڵام جیهان هێشتام هەر بەردەوامە، سۆفیا. وێنەکانیشی لە کاتی پێشتر ڕوونتر و نوێتر دیارن. هیوم دەیەوێت بگەڕێتەوە سەر ئەو شێوەیەی منداڵ جیهانی پێدەبینێت –پێش ئەوەی هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەک و بەرپەرچدانەوەیەک لە ئاگایدا سەقامگیر بووبێت. تۆ نەتگوت زۆرینەی ئەو فەیلەسوفانەی باسمانکردن، لە جیهانی خۆیاندا دەژین و تۆش زیاتر گرنگی بە جیهانی ڕاستەقینە دەدەیت؟

- بەڵێ شتێک لەو بابەتەم گوت.

- هیومیش هەمان شێوەی دەبینی. بەڵام با کەمێک فراوانتر دوای بیرکردنەوەی بکەوین.

- ئامادەم.

- هیوم بە دەرخستنی دوو شێوەی جیاوازی وێناکردن دەست پێدەکات؛ هەست و بیرکردنەوە. مەبەستی لە یەکەمیان ئەو هەستکردنە

ڕاستەوخۆیەی جیهانی دەرەکیە و مەبەستی لە "بیرکردنەوە"ش، یادگاریەکانی ئەو هەستانەیە.
ـ بەیارمەتیت نمونە بهێنەرەوە.
ـ ئەگەر دەستت بە فڕنێکی گەرم بسوتێنیت، ئەوا ڕاستەوخۆ هەستێکت لا دروست دەبێت. پاشانیش بیری لێدەکەیتەوە. هیوم بەمە دەڵێت "فیکرە". جیاوازی نێوانیشیان ئەوەیە کە "هەستەکە" زۆر بەهێزتر و زیندووترە لەو یادەی کە دواتر دێت. دەتوانین بڵێین مۆرکی هەستەکان، شێوە ڕەسەنەکەن و "فیکرەکان" یان یادگاریەکانیش تەنها کۆپییەکی بێڕەنگن، لەبەرئەوەی "هەستەکان" هۆکاری ڕاستەوخۆی ئەو "فیکرانەن" کە لە ئاگایدا حەشاردراون.
ـ هەتا ئێستاکە تێدەگەم.
ـ دواتر هیوم دەڵێت؛ هەردوو "هەست" و "فیکرە"ش یان سادەن یاخود لێکدراون. لەیادتە لەگەڵ باسکردنی لۆکدا باسی سێوێکمان کرد... دەکرێت ئەزموونکردنێکی ڕاستەوخۆی سێوێک بە "هەستێکی لێکدراو" لە قەڵەم بدرێت. بە هەمان شێوەش وێناکردنی سێوەکە لەناو ئاگایدا "بیرکردنەوەیەکی لێکدراوە."
ـ ببوورە باسەکەت پێدەبڕم، بەڵام ئایا ئەمە گرنگە؟
ـ گرنگ؟! بێگومان گرنگە... ئەگەرچی فەیلەسوفەکان گرنگی بە گرفتێکی ئاسانیش بدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک باس لە هەڵچنینێکی لۆژیکی دەکەن، ئەوا نابێت هەر زوو دەست هەڵگریت. هیوم بە دڵنیاییەوە هەقی دەدا بە دیکارت کە دەیگوت گرنگە شێوازی بیرکردنەوەکانمان لە سەرەتاوە هەڵبچنین.
ـ تێناگەم.

ـ مەبەستی هیوم ئەوەیە کە ئێمە هەندێ جار دێین و ئەو جۆرە "فیکرانە" پێکەوە دەلکێنین، بەبێ ئەوەی خۆیان لە ژیانی ڕاستەقینەدا لێکدراوبن. بەم شێوەیەش بیرکردنەوە و وێناکردنی ئاوها هەڵە دێتە کایەوە، کە لە سروشتدا بوونیان نیە. بۆ نمونە فریشتە یان لەوەوپێش باسی "فیساح"مان (*فیل+تیمساح.و) کرد. یان نمونەیەکی تر "پیگاسۆس "Pegasus واتە ئەسپی باڵدار. لە هەموو ئەو نمونانەدا دەبێت دان بەوەدا بنێین کە ئاگایی بە ئارەزووی خۆی شتی بڕیوە و شتی پێکەوە لکاندووە. باڵت لە شوێنێکەوە هێناوە و ئەسپیشت لەلایەکی ترەوە. پاشانیش هەردووکیانت لێکداوە، واتە وەک "هەستێکی" ڕاستەقینەت لێکردووە و هێناوتەتە سەر شانۆی ئاگایی، لە کاتێکدا هیچ بەشێکیان لە خودی ئاگاییەوە نەهاتوون. ئاگایی بڕین و پێکەوە لکانی خۆی کردووە، بەو شێوەیەش "فیکرەیەکی" یان وێنایەکی هەڵەی پێکەوە ناوە.

ـ ئێستاکە تێدەگەم... تەنانەت تێگەیشتنی ئەوەش گرنگە.

ـ باشە. بەم جۆرە هیوم دەیویست لە هەموو وێناکردنەکان ورد ببێتەوە و بزانێت کامیان بە شێوەیەک لێکدراوە کە لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینەدا ناگونجێت. هیوم دەپرسێت؛ ئەم وێناکردنە لە چ هەستێکەوە هاتووە؟ لەپێش هەموو شتێکدا دەیویست بزانێت "تێگەیشتنێکی لێکدراو" لە چ "بیرۆکەیەکی سادە"وە سەرچاوەی هێناوە. بەم شێوەیەش بووە خاوەنی میتۆدێکی ڕەخنەگرانە و وێناکردنەکانی مرۆڤی پێ شیدەکردەوە. لێرەشەوە هیوم گەرەکی بوو بیرکردنەوە و وێناکردنەکانمان ڕێکبخات.

ـ دەتوانیت یەک دوو نمونە بهێنیتەوە؟

ـ خەڵکانێکی زۆر لە سەردەمی هیومدا وێناکردنێکی ڕوونیان دەربارەی "ئاسمان" یان "ئۆرشەلیمی نوێ" هەبوو. لەوانەیە لەیادت بێت کاتێک کە دیکارت دەیگوت "وێناکردنێکی ڕوون و ئاشکرا، خۆی لە خۆیدا دەکرێت ببێتە گەرانتیەک و بڵێین وێناکراوەکە بەرامبەر شتێک دەوەستێتەوە کە لە ڕاستیدا بوونی هەیە."
ـ پێم گوتیت بە ئاسانی شتم بیر ناچێتەوە.
ـ هەر زوو بۆمان دەردەکەوێت کە "ئاسمان" چەند وێناکردنێکی لێکراوە. بۆ نمونە هەندێک لە توخمەکانی دەخەینە ڕوو؛ لە ئاسماندا "دەرگای مرواری" هەیە، "شەقامی ئاڵتونی" هەیە، بە کۆمەڵ "فریشتە"ی لێیە... هتد. بەڵام هێشتام ئەمانەمان هەڵنەوەشاندۆتەوە بۆ توخمە ساکارەکانیان، چونکە "دەرگای مرواری" و "شەقامی ئاڵتونی" و "فریشتە"ش هەموویان مەزەنەکردنێکی لێکدراون. کەواتە لە پێشدا دەبێت وێناکردنی ئاسمانەکەمان وردکەینەوە و وێناکردنی ساکاری وەک "دەرگا"، "مرواری"، "شەقام"، "ئاڵتون"، "بوونەوەری جل سپی"، "باڵ"، جودا بکەینەوە. پاشان دەتوانین پرسیاربکەین و بڵێین؛ ئایا هەموو "هەستە ساکارەکانی" بەرامبەریان لە ڕاستیشدا بوونیان هەیە یان نا.
ـ هەمووشیمان هەیە، بەڵام هەموو "هەستە ساکارەکانمان" بڕیوە و بە جۆرێکی تر بەیەکەوەمان نووساندونەتەوە، هەتا لە دواجاردا بووە بە وێنەیەکی خەیاڵی یان خەونی.
ـ ڕێک مەبەستەکەت دا بەدەستەوە. لەبەرئەوەی بەکارهێنانی "مقەست و سرێش" تەنها شتە ئێمەی مرۆڤ لە کاتی خەونماندا دەیکەین. بەڵام هیوم ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەموو ئەو کەرەسانەی وێنە خەونیەکانمانی لێ دروست دەکەین، دەبێت ڕۆژێک

لە ڕۆژان وەک "هەستێکی ساکار" هاتبنە ناو ئاگایمانەوە. بۆ نمونە ئەگەر کەسێک لە ژیانیدا ئاڵتونی نەدیبێت، ئەوا ناشتوانێت وێنای "شەقامێکی ئاڵتونی" بکات.

- بە ڕاستی زیرەکانە بیردەکاتەوە، بەڵام ئەی چی بە دیکارت دەڵێت... مەبەستم لە وێنا ڕوون و ئاشکراکەیەتی کە دەربارەی خودا هەیبوو؟

- لێرەشدا هیوم دەتوانێت وەڵام بداتەوە. گریمان خودا "بوونەوەرێکی بێپایان زیرەک و دانا و باش"ە. بەڵام لێرەشدا دیسانەوە "بیرکردنەوەیەکی لێکدراومان" هەیە کە لە شتێکی بێپایان زیرەک و بێپایان دانا و بێپایان باش پێک هاتووە. ئەگەر لەوەوپێش هەرگیز دانایی و زیرەکی و باشێتیمان درک پێنەکردبێت، ئەوا نەشمان دەتوانی تێگەیشتنێکی ئاوهامان دەربارەی خودا هەبێت. لەوانەشە بەشێوەیەکی دی وێنای خودا بکەین و بڵێین "باوکێکی دڵڕەقە، بەڵام دادپەروەرە"، واتە وێناکردنێک کە لە "دڵڕەق" و "دادپەروەر" و "باوک" پێکهاتووە. ڕەخنەگرانی ئاین لە پاش هیومەوە لەو بڕوایەدابوون هۆی ئەم جۆرە وێناکردنەی خودا، بگەڕێنرێتەوە بۆ چۆنیەتی بینینی باوکمان لە کاتی منداڵیماندا و دەیانگوت؛ وێناکردنی باوکێک، بووە هۆی وێناکردنی "باوکێک لە ئاسمان."

- لەوانەیە ڕاست بێت، بەڵام من هەرگیز پێم پەسەند نەبووە کە خودا هەر دەبێت پیاو بێت. هەندێ جار دایکم تەنها بۆ ئەوەی هاوسەنگیەک ڕابگرێت بە خودا دەڵێت "دایکی ئاسمانمان."

- واتە هیوم دەیویست هێرش بەرێتە سەر هەموو ئەو بیرکردنەوە و وێناکردنانەی کە ناتوانین بیانگەڕێنینەوە بۆ هەستێک لە بەرامبەریدا. هەروەک خۆی دەیگوت؛ "دەمەوێت هەموو ئەو وتە

بێمانایانە ڕاوبنێم کە ماوەیەکی دورودرێژە دەسەڵاتی بەسەر بیری میتافیزیکیدا گرتووە و خستویەتیە ناو گێژاوەوە". بەڵام لە ژیانی ڕۆژانەشدا چەندەها بیرۆکەی (*یان زاراوەی.و) لێکدراو بەکاردەهێنین، بەبێ ئەوەی بیر لە ڕەسەنایەتیان بکەینەوە. بۆ نمونە وێناکردنی "خود" یان ناوەڕۆکی کەسایەتی. هەروەک دەزانیت، ئەو دوو وێناکردنە بنچینەی فەلسەفەی دیکارت بوو، تەنها ڕوونترین و ئاشکراترین وێناکردن بوون کە تەواوی هەموو فەلسەفەکەی بەدەوریدا هەڵچنیبوو.

- هیوادارم هیوم نکۆڵی لەوە نەکات کە خۆم خۆمم. گەر وابێت، ئەوا ئەویش تەنها زۆر بلێیەکی نوێیە و هیچی تر.

- گوێبگرە سۆفیا، ئەگەر تەنها شتێک هەبێت و من لە ڕێگەی ئەم کۆرسەوە پێم خۆش بێت فێرت بکەم، ئەوا ئەوەیە کە هێندە بەپەلە لە خۆتەوە دەرئەنجام نەدەیت بەدەستەوە.

- بەردەوام بە.

- نەخێر، دەمەوێت هەمان میتۆدی هیوم بەکاربهێنیت و شیکاری ئەو شتەم بۆ بکەیت کە پێی دەڵێیت "خۆم."

- کەواتە لەپێش هەموو شتێکدا دەبێت بزانم وێناکردنی خۆم سادەیە یان لێکدراوە.

- ئەی لێرەوە دەگەیتە کوێ؟

- پێم وابێت دەبێت دان بەوەدا بنێم کە من تێکەڵەیەکی زۆر لێکدراوم. بۆ نمونە مرۆڤێکی زۆر ڕاڕام و بۆم سەختە بڕیار لەسەر شتێک بدەم. جگە لەوەش جاری وا هەیە کەسێکم خۆشدەوێت و لە هەمان کاتیشدا ڕقیشم لێیەتی.

- کەواتە وێناکردنی "خود"ت بیرکردنەوەیەکی لێکدراوە.

ـ تەواوە، ئەوجا دەبێت بپرسم؛ ئایا "هەستێکی لێکدراو"م هەیە کە بەرامبەر "خود"ی خۆم بوەستێتەوە؟... پێم وابێت هەمبێت، بەڵام ئایا هەمیشە هەر هەمان شتە؟

ـ هیچ شتێک هەیە گومان بخاتە مێشکتەوە؟

ـ هەمیشە گۆڕنکاریم بەسەردا دێت. ئەمڕۆکە مرۆڤێکی تەواو جیاوازم لەو کاتەی کە تەمەنم چوار ساڵان بوو. هەم تێگەیشتن و هەم مەزاجیشم لە خولەکێکەوە بۆ خولەکێکی تر دەگۆڕێن. جاری وا هەیە لە پڕێکدا وا هەست دەکەم "تەواو مرۆڤێکی نوێم."

ـ کەواتە هەستکردن بە بوونی جەوهەرێکی کەسایەتی نەگۆڕ، وێناکردنێکی خەیاڵیە. لە ڕاستیدا وێناکردنی "خود" زنجیرە هەستێکی سادەیە، کە هەرگیز "پێکەوە" هەستت پێنەکردووە. هیوم دەڵێت؛ "خود، جگە لە کۆمەڵێک یان کۆکراوەی چەند تێگەیشتنێکی جیاواز زیاتر، هیچی تر نیە. ئەم تێگەیشتنە جیاوازانەش، بە خێراییەکی زۆر مەزن یەک بەدوای یەکدا دێن و هەمیشە لە گۆڕان و جوڵەدان". ئاگایی "جۆرە شانۆیەکە کە تێگەیشتنە جیاوازەکان یەک لەدوای یەکدا خۆیانی لەسەر دەنوێنن، دەڕۆن و دێنەوە، لێک جیادەبنەوە و لەناو چەندەها بارودۆخی جیاواز جیاوازدا دیسانەوە تێکەڵ بەیەک دەبنەوە". مەبەستی هیوم ئەوەیە کە ئێمە هیچ جۆرە "کەسایەتیەکی" بنچینەییمان نیە کە جڵەوی ئەو هەموو تێگەیشتن و هەڵچوونانەی مێشک بگرێت بەدەستەوە، کە بە شێوەیەکی بەردەوام دێن و دەڕۆن. وەک وێنەی فلیمێک وایە؛ وێنەکان بە خێراییەکی مەزن یەک بەدوای یەکدا دێن، لەبەرئەوە هەست بەوە ناکەین کە فلیمەکە "لێکدراوە" و لە چەند تاکە وێنەیەک پێک هاتووە. بەڵام لە بنەڕەتدا

وێنەکان پەیوەندیان بەیەکەوە نیە. لەڕاستیدا فلیمەکە لە کۆمەڵێک چرکە پێک هاتووە.
- پێم وابێت باشترە دەست هەڵبگرم.
- مەبەستت لەوەیە دەست لە وێناکردنی بوونی کەسایەتیە نەگۆڕەکەت هەڵدەگریت؟
- وابزانم بێ چارەم.
- کەمێک لەوەوپێش بڕوایەکی تەواو جیاوازت هەبوو! دەبێت ئەوەش بڵێم کە شیکردنەوەی ئاگایی مرۆڤ و نکۆڵیکردنی کەسایەتی نەگۆڕی مرۆڤ، 2500 ساڵ لە پێش هیومەوە لە شوێنێکی تەواو جیاوازی سەر ئەم زەویە و لەلایەن کەسێکی ترەوە هێنرایە ڕوو.
- لەلایەن کێوە؟
- لە لایەن "بودا"Buddha وە. جێگەی سەرنجە کە دارِشتنی بیری هەردووکیان تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر لەیەک دەچێت. بەبڕوای بودا ژیانی مرۆڤ لە زنجیرەیەکی نەپچڕاوی پرۆسیسی فیزیاوی و ئەقڵی پێکهاتووە، کە وا لە مرۆڤ دەکات بەردەوام لە چرکەیەکەوە بۆ چرکەیەکی تر بگۆڕێت. کۆرپەیەکی ساوا هەمان شت نیە کاتێک کە گەورە دەبێت، منیش هەمان مرۆڤەکەی دوێنێ نیم. بودا دەیگوت ناتوانم باسی شتێک بکەم و بڵێم "ئەمە هی منە"، نە دەشتوانم ئاماژە بۆ شتێک بکەم و بڵێم "ئەمە منم". واتە نە شتێک هەیە کە "من" بێت و نە شتێکیش هەیە کە ناوی "ناوکی کەسایەتی نەگۆڕ" بێت.
- بەڵێ، زۆر لە بیروڕای هیومەوە نزیکە.
- لەلایەکی ترەوە بیرۆکەی خودێکی نەگۆڕ، ببووە هۆی ئەوەی کۆمەڵێک لە فەیلەسوفە ڕاشیونالیستەکان گریمانەی "ڕۆحێکی" نەمر بکەن، واتە وایان دادەنا ڕۆحی مرۆڤ نەمر بێت.

ـ بەڵام لەوانەیە ئەمەش وێناکردنێکی هەڵە بێت، وا نیە؟
ـ بەڵێ، هەم بەپێی بیروڕای بودا و هەم بەپێی هیومیش هەڵەیە. دەزانیت بودا کەمێک پێش مردنی چی بە شاگردەکانی گوت؟
ـ نەخێر، لە کوێوە بزانم؟
ـ گوتی "تەمەنی بوونی هەموو شتێک، کەمخایەنە". لەوانەیە هیومیش بیویستایە هەمان شت بڵێت، یان دیموکریتیش هەروەها. هەرچۆنێک بێت، بە دڵنیاییەوە دەزانین کە هیوم نکۆڵی لە هەموو جۆرە هەوڵدانێک دەکرد کە مەبەستی سەلماندنی ڕۆحێکی نەمر بێت یان بوونی خودا بێت. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە بوونی خودای یان ڕۆحی نەمری بە دور زانیبێت، بەڵکو بە بڕوای ئەو ئیسپاتکردنی بڕوای ئاینی بە هۆی ئەقڵی مرۆڤەوە، قسەیەکی بۆشی ڕاشیونالیستەکانە. هیوم نە مەسیحی بوو، نە بێبڕواش بوو، بەڵکو هیوم ئەو شتە بوو کە پێی دەڵێن "ئەگنۆستیک Agnostic".
ـ ئەگنۆستیک چیە؟
ـ ئەگنۆستیک کەسێکە کە نازانێت خودا بوونی هەیە. لە کاتی سەرەمەرگی هیومدا، برادەرێکی لێی پرسی؛ لەدوای مردن بڕوات بە ژیان هەیە؟ هیومیش لە وەڵامدا گوتی؛ "ڕێی تێدەچێ پارچەیەک خەڵوز بخەینە ناو ئاگرێکە و نەشسوتێت."
ـ ئاوها!
ـ لە ڕێگەی وەڵامەکەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هیوم بە هیچ جۆرێک حوکمدانی لەوەوپێشی قبوڵ نەدەکرد. ئەو تەنها دانی بەو شتەدا دەنا کە بە دڵنیاییەوە بەهۆی هەستەکانیەوە ئەزموونی کردبوون، جگە لەمانەش هەموو بوارەکانی تری بە کراوەیی جێدەهێشت. هیوم نکۆڵی لە ئیمانی مەسیحی و بڕواکردن بە

موعجیزەی نەدەکرد. بەلای ئەوەوە ئەم بابەتانە شتێک نین کە دەربارەی ئەقڵ یان زانین بن، بەڵکو پەیوەندی بە "بڕواکردن"ەوە هەیە. دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین، لەگەڵ هاتنی فەلسەفەی هیومدا دواهەمین پەیوەندی نێوان زانین و بڕوا هەڵوەشایەوە.
ـ تۆ گوتت ئەو نکۆڵی لە موعجیزە نەدەکرد.
ـ بەڵێ، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە بڕوای پێبکات، بەڵکو تا ڕادەیەک بە پێچەوانەوە. ئەو دەیگوت خەڵکی پێویستیەکی بەهێزیان بەو شتەیە هەیە کە ئەمڕۆکە پێی دەڵێن دیاردەی "سەرو سروشتی". ئاشکرایە هەموو ئەو موعجیزانەی باسدەکرێن، هەمیشە لە شوێنێکی دورەوە یان لە سەردەمێکی زۆر زۆر پێشترەوە ڕوویانداوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیوم خۆی نکۆڵی لە بڕواکردن بە موعجیزە دەکات، زۆر بەئاسانی لەبەرئەوەی خۆی ئەزموونی نەکردوون. بەڵام لە هەمان کاتیشدا ناڵێت ڕوودانی موعجیزەیەک ڕێی تێناچێت، دیسانەوە لەبەرئەوەی خۆی ئەزموونی نەکردووە کە ڕوونەدەن.
ـ بە یارمەتیت کەمێک زیاترم بۆ ڕوونبکەرەوە.
ـ بەپێی هیوم، موعجیزە شکاندنی یاسای سروشتە. بەڵام بێ مانایە بڵێین ئەزموونی یاسای سروشتمان کردووە. ئێمە کاتێک دەست لەبەردێک بەردەدەین، دەبینین دەکەوێتە خوارەوە، بەڵام ئەگەر نەکەوتایەتە خوارەوە، ئەوا ئەوساکە ئەوەشمان دەبینی.
ـ ئەو کاتە من پێم خۆشە بڵێم ئەوە موعجیزەیەکە یان ڕووداوێکی سەرو سروشتیە.
ـ کەواتە بڕوات بە دوو سروشت هەیە؛ "سروشت" و "سەرو سروشت". هەست ناکەیت خەریکە بگەڕێیتەوە سەر بڕوای ڕاشیونالیستەکان؟

ـ لەوانەیە، بەڵام لەو بڕوایەدام هەموو جارێک کە دەست لە بەردەکە بەردەدەین، بکەوێتە خوارەوە.
ـ بۆ؟
ـ خەریکە تەواو ناخۆشی دەکەیت.
ـ نەخێر بە پێچەوانەوە سۆفیا، پرسیارکردن بەلای فەیلەسوفێکەوە هەرگیز هەڵە نیە. لەوانەیە لێرەدا باس لە هەرە گرنگترین خاڵی فەلسەفەی هیوم بکەین. وەڵامم بدەرەوە؛ چۆن دەتوانیت هێندە دڵنیابیت کە بەردەکە هەمیشە دەکەوێتە خوارەوە؟
ـ تەواو دڵنیام، لەبەرئەوەی چەندەها کەڕەت بینیومە.
ـ هیوم بوایە دەیگوت، تۆ زۆر کەڕەت بینیوتە کە بەردەکە دەکەوێتە خوارەوە، بەڵام "هەمیشە" ئەزموونی ئەوەت نەکردوە کە بەردەکە دەکەوێتە خوارەوە. ئاساییە بڵێین بەردەکە بەهۆی "یاسای ڕاکێشانەوە" دەکەوێتە خوارەوە، بەڵام هەرگیز یاسایەکی ئاوهامان ئەزموون نەکردووە؛ تەنها ئەوەندەمان بینیووە کە شتەکان دەکەونە خوارەوە و هیچی تر.
ـ بەڵام ئایا ئەوە هەمان شت نیە؟
ـ بەتەواوەتی نا. تۆ گوتت لەو بڕوایەدایت بەردەکە بکەوێتە خوارەوە، لەبەرئەوەی لەوەوپێش ئەو حاڵەتەت زۆر بینیووە. مەبەستی هیومیش ڕێک ئەو خاڵەیە. هێندە ڕاهاتویت کە شتەکان یەک بەدوای یەکدا ڕووبدەن، هێدی هێدی وات لێهاتووە چاوەڕوانی ئەوە بیت کە هەموو کەڕەتێک هەمان شت ڕووبدات کاتێک کە بەردەکە بەردەدەیتە خوارەوە. بەم شێوەیەش ئەو وێناکردنانەی کە پێیان دەگوترێت "یاسای نەشکێنراوی سروشتی" سەرهەڵدێنن.

- بەڕاستی لەو بڕوایەدایە کە ڕێی تێبچێت بەردەکە نەکەوێتە خوارەوە؟
- ئەویش بە هەمان شێوەی تۆ لەو بڕوایەدایە هەموو کەرەتێک کە بەردەکە بەردەدەیت، بکەوێتە خوارەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەڵێت چۆنیەتی کەوتنە خوارەوەی بەردەکەم ئەزموون نەکردووە.
- پێت وانیە دیسانەوە خەریکە لە منداڵەکان و گوڵەکان دور بکەوینەوە؟
- نەخێر، بە پێچەوانەوە. دەتوانیت منداڵان وەک شاهیدێکی هەقیقەتی هیوم بهێنیتە بەرچاوت. ئەگەر تۆ و منداڵێک هەردووکتان بەردێک ببینن کە بە ئاسمانەوە وەستابێت، بە بڕوای تۆ کامتان زیاتر سەری دەسوڕمێت، تۆ یان منداڵەکە؟
- من زیاتر سەرم دەسوڕمێت.
- بۆچی سۆفیا؟
- لەبەرئەوەی من باشتر دەزانم کە ئەوە چەندە پێچەوانەی یاسای سروشتە.
- ئەی منداڵەکە بۆ نازانێت کە ئەوە دژ بە یاسای سروشتە؟
- لەبەرئەوەی هێشتام نازانێت سروشت چیە.
- یان هێشتام سروشت بەلایەوە نەبۆتە خوویەک.
- کەواتە هیوم دەیویست خەڵکی زیاتر هەستیاربن.
- پێم خۆشە ئەم ڕاهێنانەت بدەمێ؛ گریمان تۆ و منداڵێکی چکۆلە کاری جادوگەرێکی گەورە دەبینن _بۆ نمونە کە وا لە شتەکان بکات بە ئاسماندا بخولێنەوە_ بە بڕوای تۆ کامتان زیاتر چێژ لە کارەکەی دەبینن؟
- پێم وابێت من.

- بۆچی؟
- لەبەرئەوەی من دەتوانم هەست بە سەیری کارەکەی بکەم.
- وایە، دەتوانین بڵێین هەتاوەکو منداڵە چکۆلەکە شارەزای یاسای سروشت نەبێت، ئەوا هیچ خۆشیەک لە شکاندنی نابینێت.
- بەڵێ، دەتوانین وا بڵێین.
- هەتاوەکو ئێستاکە بەردەوام خۆمان لەناو خودی ناواخنی فەلسەفەی ئەزموونگەری هیومدا دەبینینەوە. پاشان هیوم دەڵێت، منداڵەکە هێشتام نەبۆتە کۆیلەی چاوەڕوانیکردنی عادەت. بە واتایەکی تر منداڵەکە هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەکی پێشتری لە خەیاڵدا نیە. ئایا منداڵەکەش لێرەدا فەیلەسوفێکی مەزن نیە؟ منداڵەکە لە هەموو بیرکردنەوەیەک و پێشبینیەک تەواو سەربەستە، ئەمەش سۆفیای ئازیز، خاسیەتێکی هەرە گرنگی فەیلەسوفە؛ منداڵەکە جیهان بەو جۆرە دەبینێت کە هەیە، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی زیادەی تری بخاتە سەر.
- هەموو کەڕەتێک کە پێشبینی شتێکم کردبێت، پاشان دڵتەنگی کردووم.
- کاتێک هیوم باسی هێزی عادەت دەهێنێتە سەرباس، ئەوا لە ڕاستیدا بیر لە "یاسای هۆ" دەکاتەوە. ئەو یاسایەی کە دەڵێت هەموو شتێک کە ڕوودەدات، دەبێت هۆیەکی هەبێت. هیوم وەک نمونەیەک، دوو تۆپی بلیارد بەکاردەهێنێت؛ چی ڕوودەدات ئەگەر تۆپێکی ڕەش بگریتە تۆپێکی سپی وەستاو؟
- ئەگەر بەری بکەوێت، ئەوا تۆپە سپیەکە دەجوڵێتەوە.
- باشە ئەی بۆچی دەجوڵێتەوە؟
- لەبەرئەوەی تۆپە ڕەشەکەی بەرکەوتووە.

- ئاساییە لەم بارەدا بڵێین، بەرکەوتنی تۆپە ڕەشەکە بۆتە "هۆی" جوڵەی تۆپە سپیەکە. بەڵام لێرەدا دەبێت خاڵێکمان لە یاد بێت و هەتاوەکو شتێک تاقینەکەینەوە نابێت بەدڵنیاییەوە دەریببڕین.
- لە ژێرخانەکەی ماڵی یۆروندا بلیاردێکی لێیە و لە ڕاستیدا چەندین جار ئەوەم تاقیکردۆتەوە.
- هیوم دەڵێت تەنها شت کە تاقیتکردۆتەوە ئەوەیە کە تۆپە ڕەشەکە لە تۆپە سپیەکە دەدات و پاشانیش تۆپە سپیەکە لەسەر مێزەکە خلۆردەبێتەوە. واتە تۆ خودی ئەو هۆکارەت تاقینەکردۆتەوە کە وا لە تۆپە سپیەکە دەکات بەسەر مێزەکەدا خلبێتەوە. واتە کاتی هەردوو ڕووداوەکە دەبینیت کە یەک بەدوای یەکتردا دێن، بەڵام ئەوە نابینیت کە ڕووداوی دووهەم بەهۆی ڕووداوی یەکەمەوە ڕوودەدات.
- کەمێک سەرلێشێواندنی تێدا نیە؟
- نەخێر، بەڵکو گرنگە. هیوم دەڵێت چاوەڕوانکردنی ڕووداوەکان، کە یەک بەدوای یەکدا ڕوودەدەن، لەناو خودی شتەکاندا نیە، بەڵکو لە ئاگایماندایە. ئەو چاوەڕوانکردنەش، وەک بینیمان، پەیوەندیەکی بە عادەتەوە هەیە. دیسانەوە لێرەشدا منداڵێکی پچکۆلە سەرسام نابێت گەر ببینێت تۆپێکیان بەر ئەوی تریان دەکەوێت و هەردوو تۆپەکە بەوەستاوی بمێننەوە. کاتێکیش باس لە "یاسای سروشت" یان "هۆ و ئەنجام" دەکەین، ئەوا لە ڕاستیدا باس لە عادەتی مرۆڤ دەکەین، نەک لەو شتانەی کە پەیوەندیان بە "ئەقڵەوە" هەیە. یاسا سروشتیەکان نە ئەقڵانین و نە نا ئەقڵانیشن، بەڵکو تەنها وەک خۆیانن و هیچی تر. واتە چاوەڕوانکردنی جوڵەی تۆپە سپیەکە، کاتێک کە ڕەشەکەی بەردەکەوێت، شتێک نیە کە بە شێوەیەکی زگماکانە لەگەڵ لەدایکبوونماندا خاوەنی بین. بە شێوەیەکی گشتیش ئێمە بە

کۆمەڵی چاوەڕوانیکردنەوە لەدایک نەبووین، کە پێمان بڵێت جیهان چۆنە یان شتەکانی جیهان بە چ جۆرێک هەڵسوکەوت دەکەن. جیهان وەک ئەوەیە کە هەیە، شتێکە هێدی هێدی بەهۆی هەستەکانمانەوە ئەزموونی دەکەین.

ـ دیسانەوە وا هەست دەکەم ئەم بابەتە زۆر گرنگ نەبێت.

ـ پێدەچێت گرنگ بێت، بە تایبەتیش ئەگەر چاوەڕوانکردنەکانمان وامان لێبکەن کە دەرئەنجامی خێرا بدەین بەدەستەوە. هیوم نکۆڵی لەوە نەدەکرد کە "یاسای سروشتی" نەشکێنراومان هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی ناتوانین خودی یاسا سروشتیەکان ببینین، ئەوا لەم بارەدا ڕوودەدات بەپەلە دەرئەنجام بدەین بە دەستەوە.

ـ دەتوانیت لەم بارەیەوە هەندێ نمونە بهێنیتەوە؟

ـ بۆ نمونە ڕەوە ئەسپێکی ڕەش دەبینم، ئیتر ئەمە مانای ئەوە نیە کە هەموو ئەسپەکانی دونیا ڕەش بن.

ـ بێگومان ڕاستدەکەیت.

ـ وە هەرچەندە بە درێژایی ژیانم تەنها قەلە ڕەشی ڕەشم دیوە، بەڵام ئیدی ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە قەلە ڕەشی سپی بوونی نەبێت. هەم بەلای فەیلەسوفێک و هەم بەلای زانایەکیشەوە، گرنگە کە نکۆڵی لە ئەگەری بوونی قەلە ڕەشێکی سپی نەکەن. دەتوانین کەم تا زۆر بڵێین، گەڕان بەدوای "قەلە ڕەشی سپی"دا گرنگترین ئەرکی سەرشانی زانستە.

ـ ئێستا تێدەگەم.

ـ دەتوانین هەورە گرمە وەک نمونەیەک سەبارەت بە پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجام بهێنینەوە. لەوانەیە خەڵکانێکی زۆر لەو بڕوایەدابن کە هەورە بروسکە هۆکاری هەورەگرمە بێت، لەبەرئەوەی هەمیشە

هەورەگرمە بەدوای هەورەبروسکەدا دێت. لە ڕاستیدا ئەم نمونەیەش لەگەڵ نمونەی بلیاردەکەدا زۆر جیاوازی نیە، بەڵام ئایا هەورەبروسکە هۆکاری هەورەگرمەیە؟

- بە تەواوەتی نا، لەبەرئەوەی لە ڕاستیدا هەردووکیان لە هەمان کاتدا ڕوودەدەن.

- هەردووکیان بەهۆی پێداکەوتنێکی کارەباییەوە ڕوودەدەن. هەرچەندە هەمیشە دەنگی هەورەگرمە بەدوای هەورەبروسکەدا دەبیستین، ئیدی ئەمە مانای ئەوە نیە کە هەورە بروسکە هۆکاری هەورەگرمە بێت. لە ڕاستیدا هۆکارێکی سێهەم هەیە کە دەبێتە ڕوودانی هەردووکیان.

- تێگەیشتم.

- برتراند ڕاسل "Bertrand Russell" کە ئیمپیریستێکی ئەم سەدەیەی خۆمانە، نمونەیەکی گەورەتر دەهێنێتەوە؛ مریشکێک خاوەنەکەی دەبینێت هەموو ڕۆژێک بەلای کولانەکەیدا تێدەپەڕێت و خواردنی بۆ دادەنێت. ئەو مریشکە دەبێت لە کۆتایدا بگاتە درککردنی پەیوەندیەکی هۆکاری لە نێوان هاتنی خاوەنەکەی و ڕۆکردنی خواردندا بۆی.

- بەڵام ڕۆژێک دێت کە چیتر خواردنی بۆ دانانرێت، وا نیە؟

- نەخێر، ئەو ڕۆژە خاوەنەکەی دێتە کولانەکەوە و سەریدەبڕێت.

- ئای، چ دڵڕەقە!

- واتە کاتێک کە دوو شت بەدوای یەکتردا دێن، مانای ئەوە نیە کە پەیوەندیەکی هۆکاری لە ئارادا بێت. یەکێک لە ئەرکە گرنگەکانی سەرشانی فەیلەسوف ئەوەیە کە خەڵکی ئاگاداربکەنەوە کە بەپەلە

دەرئەنجام نەدەن بەدەستەوە. لە ڕاستیدا ئەو جۆرە بڕیاردانە بەپەلانە دەبنە هۆی چەندین شێوەی بڕواکردن بە خورافات.
- چۆن؟
- بۆ نمونە پشیلەیەکی ڕەش بەبەردەمتا تێدەپەڕێت، پاش کەمێک دەکەویت و دەستێکت دەشکێت. ئەمە مانای ئەوە نیە کە پەیوەندیەکی هۆکاری لە نێوان هەردوو ڕووداوەکەدا هەبێت. لە بواری زانستیشدا هەمان شتە، دیسانەوە لێرەشدا یەکجار گرنگە کە دەرئەنجامی بەپەلە نەدرێت بەدەستەوە. بۆ نمونە هەرچەندە خەڵکانێکی زۆر بە خواردنی دەرمانێکی دیاریکراو چاکدەبنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە بەهۆی دەرمانەکەوە چاکبوونەتەوە. لەبەرئەوە گرنگە کۆمەڵێ مرۆڤ بهێنن و پێیان بڵێن هەمان دەرمان وەردەگرن، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها ئاو و ئاردیان بدەنێ. ئەگەر ئەو کەسانەش چاکبوونەوە، کەواتە دەبێت هۆکارێکی سێهەمیش بوونی هەبێت، کە دەبێتە هۆی چاکبوونەوەیان _بۆ نمونە بڕواکردنیان بەوەی کە دەرمانەکە کاریگەرە.
- پێم وابێت خەریکە لە مەبەستی ئیمپیریزم تێدەگەم.
- هەروەها لە بواری ئیتیک و مۆڕاڵیشدا هیوم هێرش دەباتە سەر شێوەی بیرکردنەوەی ڕاشیۆنالیستی. ڕاشیۆنالیستەکان دەیانگوت توانای جوداکردنەوەی ڕاست و ناڕاست لە ئەقڵی مرۆڤدایە. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەی کە پێی دەگوترێت بیرکردنەوەی هەقانی سروشتی، لەوەوپێش لەلای زۆربەی فەیلەسوفەکان بینیمان، هەر لە سوکراتەوە هەتا لۆک. بەڵام بە پێی هیوم ئەقڵ ئەو شتانە دەستنیشان ناکات کە ئێمە دەیانکەین و دەیانڵێین.
- ئەی چ شتێک ئەوانە دەستنیشان دەکات؟

ـ "هەستەکانمان"ە کە بڕیاردەدەن. کاتێک کە بڕیاری یاریدەدانی یەکێک دەدەیت، ئەوا هەستەکانتە کە بڕیاردەدەن نەک ئەقڵت.
ـ ئەی ئەگەر نەمەوێت یارمەتی بدەم؟
ـ دیسانەوە لەو کاتەشدا پشت بە هەستەکانت دەبەستیت. یارمەتیدانی کەسێک کە پێویستی بە یارمەتیە، نە ئەقڵانیە و نە نائەقڵانیشە، بەڵکو پێدەچێت خۆڕازیکردنێک بێت و هیچی تر.
ـ بەڵام خۆ دەبێت لە شوێنێکدا سنوورێک هەبێت. هەموو کەسێک دەزانێت کە کوشتنی کەسێکی دی هەڵەیە.
ـ بەپێی هیوم هەموو مرۆڤێک هەست بە تاڵ و شیرینی خەڵکانی تر دەکات، واتە توانای ئەوەمان هەیە کە بەزەیی نیشان بدەین، بەڵام هیچ شتێک لەمانە پەیوەندی بە ئەقڵەوە نیە.
ـ من زۆر دڵنیا نیم لەوە.
ـ جاری وا هەیە لابردنی کەسێک لەسەر ڕێگاکەت، سوودبەخشە سۆفیا. لە هەندێ حاڵەتدا دەکرێت زۆر کاریگەربێت، بەتایبەتی گەر بتەوێت بە ئامانجێکی دیاریکراو بگەیت.
ـ بەم جۆرە زۆر دەڕۆیت.
ـ کەواتە لەوانەیە بتوانیت پێم بڵێیت بۆچی نابێت مرۆڤێکی کەللەپوت بکوژین؟
ـ ئەویش دڵی بە دونیا خۆشە. لەبەرئەوە نابێت بیکوژین.
ـ ئایا ئەمە بە شێوەیەکی لۆژیکیانە ئیسپاتکراوە؟
ـ نازانم.
ـ تۆ لە ڕستەیەکی وەسفیەوە "ئەو دڵی بە دونیا خۆشە"، ڕۆیشتیت و ڕستەیەکی ئەنجامیت هەڵچنی "لەبەرئەوە نابێت بیکوژین". ئەمەش گەر بە شێوەیەکی ئەقلانی پەتی تەماشای بکەین، تەواو بێمانایە.

لەبەرئەوەی بەهەمان شێوەش دەتوانین بڵێین؛ "خەڵکانێکی زۆر فرت و فێڵ لە باجدان دەکەن، کەواتە منیش دەبێت هەمان شت بکەم". هیوم دەڵێت؛ هەرگیز نابێت لە ڕستەیەکی وەسفیەوە "شتێک وەک ئەوەی کە هەیە"، ڕستەیەکی دەرئەنجامی "کەواتە دەبێت" هەڵبچنین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حاڵەتە هەر زۆر باوە ـبەتایبەتی لە ڕۆژنامەکان و پڕۆگرامی پارتەکان و پەرلەماندا. پێت خۆشە چەند نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە؟
ـ هەر زۆریش.
ـ "بەردەوام ژمارەی ئەو کەسانەی دەیانەوێت بە فڕۆکە سەفەربکەن، زیاتر و زۆرتر دەبن، کەواتە دەبێت فڕۆکەخانەی نوێ دروستبکرێت". بە بڕوای تۆ ئەمە دەرئەنجامێکی باشە؟
ـ نەخێر بێ مانایە. دەبێت بیر لە ژینگە بکەینەوە. بەلای منەوە باشترە هێڵی زیاتری شەمەنەفەر ڕابکێشرێت.
ـ یان دەڵێن؛ "هەڵکەندنی بیری نەوتی زیاتر، ئاستی ژیانی هاووڵاتیان لە سەدا دە بەرز دەکاتەوە. لەبەرئەوە دەبێت بەزووترین کات بیری نەوتی نوێ لێبدرێت"؟
ـ دیسانەوە بێ ئەقڵییە، لێرەشدا دەبێت بیر لە ژینگە بکرێتەوە. لەسەرو ئەوەشەوە، ئاستی ژیانی نەرویجی خۆی بەرزە و لە هیچی کەم نیە.
ـ هەندێ جاریش دەڵێن؛ "ئەم یاسایە بەپێی پەرلەمان بڕیاری لەسەر دراوە، لەبەرئەوە هەموو هاووڵاتیان دەبێت پەیڕەوی بکەن". بەڵام پەیڕەویکردنی ئەو "یاسا بڕیاردراوە" زۆر جار دژ بە بڕوای تاکە کەسێک دەبێت و پێی خۆش نیە لەسەری بڕوات.
ـ تێدەگەم.

- بە کورتی؛ بە هۆی ئەقڵمانەوە ناتوانین بزانین کە بە چ شێوەیەک دەبێت هەڵسوکەوت بکەین. هەڵسوکەوتی بەرپرسیارانەش، هیچ پەیوەندیەکی بە بەهێزکردنی ئەقڵەوە نیە، بەڵکو بەستراوەتەوە بە تیژکردنی هەستەکانمانەوە، لێرەشەوە دەتوانین باشتر تاڵ و شیرینی خەڵکانی تر هەست پێبکەین. هیوم دەڵێت؛ "بەهیچ جۆرێک ئەقڵ دژی ئەوە نیە کە هەموو دونیا بڕوخێنیت، تەنها لەبەرئەوەی پەنجەیەکت خوێنی لێنەیەت."

- جۆرە بیرکردنەوەیەکی ترسناکانەیە.

- لەوانەیە ئەو کاتە ترسناکتربێت کە کارتەکان تێکەڵدەکەین. خۆت دەزانیت کە نازیستەکان ملیۆنەها جولەکەیان کوشت، باشە بەبڕوای تۆ هەڵە لە ئەقڵیاندا بوو یان هەستەکانیان ناتەواو بوو؟

- بەپلەی یەکەم هەستەکانیان ناتەواو بوو.

- زۆربەیان خاوەنی مێشکێکی تیژبوون. زۆر کەڕەت ڕوودەدات کە پیلان و نەخشەی مێشکێکی سارد، لە پشت بڕیارێکی هەست ساردەوە خۆی حەشاردابێت. زۆربەی نازیەکان لە پاش تەواوبوونی شەڕ زۆر بە توندی سزادران، ئەمەش لەبەرئەوە نەبوو کە "ئاقڵ نەبوون". ڕوودەدات مرۆڤێک لە کارە بەدەکانی ئازادبکرێت، لەبەرئەوەی ئەقڵی تەواو نیە. ئەو کاتەش دەڵێن؛ "لە کاتی ئەنجامدانی تاوەنەکەیدا هۆشی لای خۆی نەبووە". بەڵام هەرگیز ڕووینەداوە کە کەسێک لەبەرئەوەی کە هەستی ساردبووە، ئازادبکرێت.

- نەخێر، بێگومان نا.

- بەهەرحاڵ پێویست ناکات خۆمان بە نمونەی سەیرەوە ببەستینەوە. بە کورتی، ئەگەر خەڵکانێکی زۆر بەهۆی لافاوێکی گەورەوە پێویستیان بە یارمەتی بێت، ئەوا هەستەکانمان بڕیاردەدەن گەر

بمانەوێت یاریدەیان بدەین یان نا. ئەگەریش بڕیارەکە بدەینە دەست ئەقڵ، ئەوا لەوانەیە بڵێین؛ لە ڕاستیدا زۆر خراپ نیە گەر چەند ملیۆنێک لە جیهاندا بمرێت، بە تایبەتیش کاتێک کە هەڕەشەی فرەبوونی مرۆڤی لەسەرە.

ـ تەنها بە بیرکردنەوە لەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت بەم شێوەیە بیربکاتەوە، توڕە دەبم.

ـ وەک دەبینیت، ئەقڵت نیە کە توڕە دەبێت.

ـ سوپاس، تەواو چەقیە مێشکمەوە.

## بارکێلی"Berkeley"
## ..وەک تۆپێک بە ئاسمانەوە بەدەوری خۆرێکی ئاگریندا دەخولێتەوە...

ئەلبێرتۆ هەستا و بەرەو ئەو پەنجەرەیە ڕۆیشت کە بەسەر شاردا دەیڕوانی، پاش کەمێک سۆفیاش هەستا و لەلایەوە وەستا.
لەو کاتەدا فڕۆکەیەکی بچکۆلەیان دی بەسەر سەربانەکاندا دەفڕی و بەیاخێکی درێژی پێوەبوو. بە مەزەنەی سۆفیا نووسراوێکی سەبارەت بە ئاهەنگێگی گەورە یان شتێک لەو بابەتەی لەسەر نووسرابێت. بەڵام کە نزیک بووەوە، ئەوجا بۆی دەرکەوت کە شتێکی تەواو جیاوازی لەسەر نووسراوە؛
"جەژنی لەدایک بوونی 15 ساڵەت پیرۆز بێت هیلدە"!
ـ پێدادەگرێت... تەنها وشەبوو کە لە دەمی ئەلبێرتۆوە هاتە دەرەوە.
هەورە ڕەشەکان لەسەر گردە بەدارستان داپۆشراوەکانی خوارەوە، هێدی هێدی ڕووەو ئاسمانی شار هەڵدەکشان. فڕۆکە چکۆلەکەش لەناو هەورە خەستەکاندا ونبوو، ئەوجا ئەلبێرتۆ گوتی؛
ـ لەوە دەچێت ببێتە ڕەهێڵە.
ـ ئەوسا منیش بە پاس دەڕۆمەوە.
ـ ئومێدەوارم دیسانەوە ئەم ڕەهێڵەیەش بەهۆی مێجەرەوە نەبێت.
ـ پێم وانیە هەموو توانایەکی هەبێت، وا نیە؟
ئەلبێرتۆ وەڵامی نەدایەوە، گەڕایەوە و لەسەر کورسیەکەی تەنیشت مێزەکەوە دووبارە دانیشتەوە. پاش کەمێک گوتی؛
ـ باشتروایە کەمێک دەربارەی بارکێلی بدوێین.

سۆفیا هەر زوو لەسەر کورسیەکەی دانیشتبووەوە، بەڵام بەردەوام گازی لە نینۆکەکانی دەگرت.
- جۆرج بارکێلی "George Berkeley" قەشەیەکی ئێرلەندی بوو، لە نێوان ساڵەکانی 1685 بۆ 1753 ژیا... ئەلبێرتۆ لەمە زیاتری نەگوت.
پاش کەمێک سۆفیا دووبارە گوتیەوە؛
- بارکێلی قەشەیەکی ئێرلەندی بوو...
- بەڵام فەیلەسوفیش بوو...
- بەڵێ، چی تر؟
- هەستیدەکرد فەلسەفە و زانستی سەردەمەکەی، هەڕەشە لە دونیا بینینی ئاینی مەسیحی دەکەن. بەتایبەتیش کە دەیبینی مەتریالیزم زۆر بە توندی و بەردەوام دژی ئەو بڕوایەی ئاینی مەسیحی دەوەستایەوە کە دەڵێت، خودا خوڵقێنەرە و هەموو ژیانی سروشت دەپارێزێت...
- بەڵێ، چی تریش؟
- لە هەمان کاتیشدا بارکێلی گەورەترین ئیمپیریستە، کە لەسەر بڕواکەی خۆی سوور بووبێت.
- بەبڕوای ئەو، ئێمە جگە لەو شتانەی کە هەستەکانمان پێمان دەڵێن، ناتوانین هیچ شتێکی زیاتر دەربارەی جیهان بزانین، وا نیە؟
- زیاتریش دەڕوات. ئەو دەیگوت شتەکانی جیهان کتومت وەک ئەوەن کە ئێمە هەستیان پێدەکەین، بەڵام تەنها ئەوەندەیە کە "شت" نین.
- بە یارمەتیت ئەوەم زیاتر بۆ ڕوونبکەرەوە.
- بێگومان لەیادتە لۆک دەیگوت ئێمە ناتوانین دەربارەی "خاسیەتە دووهەمینیەکان"ی شتەکان بدوێین. بۆ نمونە ناتوانین بڵێین سێوەکە سەوز و ترشە، چونکە تەنها "ئێمە" بەو جۆرە هەستی پێدەکەین.

بەڵام لەلایەکی تریشەوە دەیگوت "خاسیەتە یەکەمینیەکان" ـوەک چڕی و کێش و قەبارە- لە ڕاستیدا سەر بە جیهانی دەرەوەمانن کە لە چواردەورماندایە. واتە جیهانی دەرەوە خاوەنی "مادە"یەکی فیزیاویە.
ـ هێشتام هەر خاوەنی هەمان بیرە تیژەکەی خۆمم. لەسەرو ئەوەشەوە لەو بڕوایەدام لۆک ئاماژەی بۆ جیاوازیەکی گرنگ کردبێت.
ـ بەڵێ سۆفیا، بەڵام خۆزگە هەر بەو جۆرە بەردەوام بوایە...
ـ تکایە بەردەوام بە!
ـ واتە لۆک هەروەک دیکارت و سپینۆزا، پێی وابوو جیهانی فیزیاوی هەقیقەت بێت.
ـ بەڵێ.
ـ بارکێلی وەک ئیمپیریستێکی ڕەسەن، ڕێک ئەو بابەتەش دەخاتە ژێر گومانەوە. ئەو دەیگوت تەنها شت کە بوونی هەیە، ئەو شتەیە کە هەستی پێدەکەین. بەڵام ئێمە هەست بە "مادەکە" یان "توخمەکە" ناکەین، ئێمە هەست بەوە ناکەین کە شتەکان، "شتێک"ن کە بە دەست دەگیرێن. ئەگەر واشدانێین کە "مادە"یەکی شاراوە لەپشت هەموو ئەو شتانەوەیە کە هەستیان پێدەکەین، ئەوا زۆر بە هەڵەدا دەچین، لەبەرئەوەی هیچ بنەمایەکی ئەزموونیمان نیە کە ئەم جۆرە بڕوایەی لەسەر هەڵبچنین.

ـ قسەی بێمانا... بەیارمەتیت تەماشاکە!
ئەوجا سۆفیا بە توندی مشتی کێشا بە مێزەکەی بەردەمیاندا و هاواری لێ بەرزبووەوە؛
ـ ئای!... ئایا ئەمە نایسەلمێنێت کە مێزەکە مێزێکی ڕاستەقینەیە و لە مادە و توخم پێکهاتووە؟

ـ هەستت بەچی کرد؟
ـ هەستم بە شتێکی ڕەق کرد.
ـ ڕاستە هەستت بە شتێکی ڕەق کرد، بەڵام هەستت بە "مادە"ی مێزەکە نەکرد. هەر بە هەمان شێوەی کە خەونێک دەبینیت و لە خەوتا خۆت دەدەیت لە شتێکی ڕەق، بەڵام خۆ لە خەوندا شتی ڕەقی تێدا نیە؟
ـ نەخێر، بێگومان لە خەوندا نا.
ـ جگە لەوەش مرۆڤ شیاوی نواندنی موگناتیسیە و لەو کاتەشدا وای لێدەکرێت هەست بە شتی جۆراوجۆر بکات؛ بۆ نمونە وای لێدەکرێت هەست بە سەرما و گەرما بکات، یان هەستبکات کەسێک دەستێکی نەرم بەسەریدا دەهێنێت، یان لەوەیە پێیوابێت مشتێکی بەر بکەوێت... بەبێ ئەوەی هیچ یەکێک لەو شتانە لە ڕاستیدا بوونیان هەبێت.
ـ بەڵام ئەگەر خودی مێزەکە ڕەق نەبێت، ئەی کەواتە چی بوو کە وای لێکردم بەو جۆرە هەست بە ڕەقی مێزەکە بکەم؟
ـ بە بڕوای بارکێلی، ئەوە "ویستە یان ڕۆحە". بەپێی ئەو، هەموو بیرکردنەوەکانمان هۆیەکیان هەیە کە لە دەرەوەی ئاگایمانەوەیە، بەڵام ئەو هۆیە سروشتێکی مادی نیە، بەڵکو سروشتێکی ڕۆحی هەیە.
دیسانەوە سۆفیا نینۆکەکانی دەقرتاند، بەڵام ئەلبێرتۆ لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛
ـ بەپێی بارکێلی، پێدەچێت ڕۆحم هۆی هەموو وێناکردنەکانم بێت – هەروەک چۆن کاتێک کە خەو دەبینم- بەڵام تەنها ڕۆحێکی تر یان ویستێکی تر دەتوانێت ببێتە هۆی هەموو ئەو بیرکردنەوانەی کە جیهانی "مادی"مان دەستنیشاندەکەن. ئەو دەیگوت؛ "هەموو شتێک لە

ڕۆحەوە دێت، ڕۆحیش سۆنگەی (هۆی) هەموو بوونێکە و لەم ڕوانگەیەشەوە هەموو شتێکی لێ دروست بووە."
- ئاخۆ مەبەستی لە چ جۆرە "ڕۆح"ێک بێت؟
- بێگومان مەبەستی لە خودایە. ئەو دەیگوت؛ "هەستکردن بە بوونی خودا، زۆر ئاشکراترە لە هەستکردن بە بوونی مرۆڤ."
- کەواتە تەنانەت لە بوونیشمان دڵنیا نین؟
- ئمم... بارکێلی دەیگوت؛ "هەموو ئەو شتانەی کە دەیانبینین و هەستیان پێدەکەین، لە ئەنجامی هێز و توانای خوداوە هاتوون، لەبەرئەوەی خودا بە دڵسۆزیەوە لە ئاگایماندایە و لەوێدا چەندەها بیر و هەستی هەمەڕەنگ دەهێنێتە پێشەوە کە بەبەردەوامی ڕووبەڕوویان دەبینەوە". واتە هەموو سروشتی چواردەورمان و هەموو بوونمان لەناو خودادا ئارامە و ئەو تەنها سۆنگەی بوونی هەموو شتێکی ترە.
- دەتوانم بڵێم سەرسامت کردم.
- کەواتە تەواوی پرسیارەکە لەوەدا نیە "کە هەبین یان نەبین"، بەڵکو پرسیارەکە لەوەشدایە کە ئێمە "چی"ن. ئایا بەڕاستی مرۆڤین و لە گۆشت و خوێن پێکهاتووین؟ ئایا جیهانمان لە شتی ڕاستەقینە پێکهاتووە، یان چواردەورمان بەئاگایی گیراوە؟
دیسانەوە سۆفیا نیکۆکەکانی دەقرتاند و ئەلبێرتۆش بەردەوام بوو؛
- بارکێلی نەک تەنها هەقیقەتی مادی دەخاتە ژێر گومانەوە، بەڵکو لەسەرو ئەوەشەوە گومان لە "کات" و شوێن"یش دەکات، کە بوونێکی تەواو سەربەخۆیان هەبێت. لەوەیە بینینمان بۆ کات و شوێنیش شتێک بێت کە تەنها پەیوەستی ئاگایمان بێت و هیچی تر. یەک دوو حەفتە بەلای ئێمەوە، مەرج نیە یەک دوو حەفتە بێت بەلای خوداوە...

ـ گوتت بەلای بارکێلیەوە ئەو ڕۆحەی کە هەموو شتێک تێیدا ئارام دەدات، خودای مەسیح بوو؟
ـ بەڵێ وام گوت، بەڵام بەلایەن ئێمەوە...
ـ بەڵێ؟
ـ ...بەلایەن ئێمەوە ئەو ڕۆحە یان ئەو ویستەی کە "سۆنگەی هەموو شتێکە"، لەوانەیە باوکی هیلدە بێت.
سۆفیا تەواو بە سەرسامیەوە دانیشتبوو، دەم و چاوی ببووە نیشانەیەکی پرسیاری گەورە. بەڵام لە پڕێکدا شتێکی بۆ دەرکەوت.
ـ تۆ خۆت لەو بڕوایەدایت.
ـ من هیچ جۆرە ئەگەرێکی تر نابینم. لەوانەیە ئەمە تەنها لێکدانەوەیەک بێت بۆ هەموو ئەو شتانەی کە بینیمان؛ مەبەستم لەو هەموو پۆستکارت و نووسراوانەیە کە لە هەموو شوێنێکدا بەرەوڕوومان دەبوونەوە. مەبەستم لەو کاتەیە کە هێرمس قسەی کرد، یان کاتێک کە من بەبێ ویستی خۆم زمانم تەتەڵەی کرد و ناوەکانتانم تێکەڵکرد.
ـ من...
ـ بزانە ...دەبوایە بەناوی سۆفیاوە بانگم بکردیتایە، هیلدە! خۆ من هەمیشە دەمزانی کە تۆ ناوت سۆفیا نیە.
ـ ئەم قسانە چیە دەیکەیت؟ لەوە دەچێت تەواو سەرت لێشێوابێت!
ـ بەڵێ، بەڕاستیش دەخولێتەوە و دەخولێتەوە، کچەکەم... وەک تۆپێک بە ئاسمانەوە بەدەوری خۆرێکی ئاگریندا دەخولێتەوە.
ـ ئەو خۆرەش باوکی هیلدەیە، وانیە؟
ـ بەڵێ، دەتوانیت وا بڵێیت.
ـ مەبەستت لەوەیە کە ئەو وەک جۆرە خوایەک وابووە بۆ ئێمە؟

ـ بەڵێ، بەبێ ئەوەی خۆشی بێتاقەت بکات، بەڵام دەبوایە شەرمی بکردایە!
ـ ئەی هیلدە خۆی چی؟
ـ ئەو فریشتەیەکە سۆفیا.
ـ فریشتە؟
ـ هیلدە ئەو کەسەیە کە "ڕۆح" قسەی لەگەڵدا دەکات.
ـ مەبەستت لەوەیە کە ئەلبێرت کنەی باسی ئێمە بۆ هیلدە دەکات؟
ـ بەڵێ، یان دەربارەمان دەنووسێ. لەبەرئەوەی ئێمە خۆمان ناتوانین هەست بەو مادەیە بکەین کە هەقیقەتی لێ دروستبووە... خۆ هەر هیچ نەبێت ئەوەندە فێربووین. ئێمە نازانین هەقیقەتی دەرەوەمان لە شەپۆلی دەنگ پێکهاتووە یان لە پەڕە و نووسین... بەپێی بارکێلی تەنها ئەوەندە دەتوانین بزانین کە لە ڕۆح پێکهاتووین و هیچی تر.
ـ هیلدەش فریشتەیەکە...
ـ بەڵێ، فریشتەیە. با ئیتر واز لەم باسەش بهێنین. ڕۆژی لەدایک بوونت پیرۆزبێت هیلدە!
لێرەدا ژوورەکە پڕبوو لە ڕووناکیەکی شینباو، پاشانیش هەورەگرمەیەکی گەورەی بەدواداهات و هەموو خانوەکەی لەراندەوە.
ئەلبێرتۆش هەر بە دانیشتوویی مایەوە و خەیاڵی تەواو ڕۆیشتبوو.
ـ دەبێت بگەڕێمەوەماڵەوە... سۆفیا ئەمەندەی گوت و بەرەو دەرگای دەرەوە هەنگاوی نا. لەکاتی ڕۆیشتنە دەرەوەیدا هێرمیسی بینی، وەک هەموو جارێکی تر لەژێر جلە هەڵواسراوەکاندا خەوتبوو، خەبەریبووەوە و لەوە دەچوو بڵێت؛
ـ تا دیدارێکی تر هیلدە.

بەپەلە لە پێپلیکانەکان هاتە خوارەوە و خۆی گەیاندە سەر شەقامەکە. هیچ کەسێکی پێوە نەبوو، لەپڕێکدا باران بە لێزمە دایکرد.
یەک دوو ئۆتۆمبیلێک بەسەر شەقامە لوسەکەدا هەڵخلیسکان، بەڵام سۆفیا هیچ پاسێکی بەدی نەکرد. بە ڕاکردن بەرەو گۆڕەپانە گەورەکە کەوتە ڕێ و لەوێشەوە بەرەو ناو شار. لەکاتی ڕاکردنیدا، تەنها یەک بیرکردنەوە بە مێشکیدا دەهات و دەچوو؛
سبەینێ جەژنی لەدایکبوونمە. بەڕاستی سەختە گەر ڕۆژێک لەپێش ڕۆژی لەدایک بوونی پانزە ساڵەتدا، بۆت دەرکەوێت کە ژیان خەونێکە... لەوە دەچێت لە خەونتدا ملیۆنێک ببەیتەوە و لە پڕێکدا لەکاتی وەرگرتنی پارەکەدا، بۆت دەرکەوێت کە خەونە و هیچی تر.
سۆفیا بەرەوڕووی یاریگا تەڕەکە ڕایدەکرد، دوای کەمێک تارمایی کەسێکی بەدیکرد کە بە ڕاکردن بەرەوڕووی دەهات... تارماییەکە دایکی بوو. چەند جارێک لەوە دەچوو شارەکە بە هەورەبروسکە لەت و پەت ببێت.
کە پێک گەیشتن، دایکی باوەشی پێداکرد و گوتی؛
ـ کچە بچکۆلەکەم... ئەمە چیە بەسەرماندا دێت؟
ـ نازانم... لە خەونێکی ناخۆش دەچێت... سۆفیا بەدەم گریانەوە وەڵامی دایەوە.

# بیرکێلی "Birkely"

## ... لە ڕاستیدا ئاوێنەیەکی تەلیسماوی کۆن بوو و داپیرە گەورەکەی کەمێک پێش ئەوەی شوبکات لە ژنە قەرەجێکی کڕیبوو ...

هیلدە میوللە کنەی لە ژوری سەرەوەی خانوە کۆنەکەی لیللەسانددا، خەبەری بووەوە. تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد... شەشی بەیانی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دونیا تەواو ڕوناکبوو. ڕوناکی خۆری بەیانی نزیکەی لایەکی دیواری ژورەکەی گرتبووەوە.

بەپەلە لە جێگاکەیدا هاتە دەرەوە و بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت. لە ڕێگەیدا، بەسەر مێزی نووسینەکەیدا خۆی چەماندەوە و پەڕەیەکی ساڵنامەکەی لێکردەوە؛ ڕۆژی پێنج شەممەی **14**ی شەشی **1990**. لاپەڕە چکۆلەکەی لولکرد و خستیە ناو سەبەتەی خۆڵەکەوە.
ئێستاکە لەسەر ساڵنامەکەی ڕۆژی هەینی **15**ی شەشی ساڵی **1990**ی لەسەر نووسرابوو. ئەو لاپەڕەیە لە بەرامبەریدا دەدرەوشایەوە... ئەو هەر لە مانگی یەکەوە لەسەر لاپەڕەکەی نووسیبوو **"15** ساڵ**"**. لە پانزەی مانگدا ببیتە پانزە ساڵ، هەستێکی تایبەتی دەبەخشێ. هەرگیز ڕۆژێکی تری ئاوها ڕووناداتەوە.
پانزە ساڵ**!** ئایا یەکەمین ڕۆژی "ژیانی گەورەیی" هیلدە لەم ڕۆژەوە دەست پێناکات؟ نەیدەتوانی هەروا بە ئاسانی بگەڕێتەوە ناو جێگاکەی... سەرباری ئەوەش ئەمڕۆ دواهەمین ڕۆژی قوتابخانەیە و بۆ بەیانی پشووی هاوینە دەست پێدەکات. ئەمڕۆ تەنها ئەوەندەیان لەسەرە کە کاتژمێری یەک لە کڵێسە کۆببنەوە. حەفتەیەکی تریش

بابە لە لوبنانەوە دێتەوە! پەیمانی داوە لە ڕۆژی جەژنی یۆحەنادا لە ماڵەوە بێت.
هیلدە لە پەنجەرەکەوە تەماشای باخچەکەی دەکرد، لە خواروشیەوە پردی بەلەم و کەنداوە سوورە چکۆلەکەیانی دەبینی. هێشتام بەلەمە گەورەکەیان بۆ وەرزی نوێ ئامادە نەکردووە، بەڵام بەلەمە بچکۆلەکەیان لە خواروی قەراغ ئاوەکەدا بەستۆتەوە. لەپاش بارانە زۆرەکەی دوێنێ، دەبێت ئاوەکەی ناوی لەیاد نەکات و دەریبهێنێت.
لەگەڵ تەماشاکردنی کەنداوە پچکۆلەکەیاندا، خەیاڵی ڕۆیشتەوە بۆ ئەو کاتەی کە تەمەنی شەش حەوت ساڵان بوو... جارێکیان بە تەنها سواری بەلەمەکە بوو و بەسەوڵ لێدان دورکەوتەوە. پاشان کەوتە ناو ئاوەکەوە و بە هەزار حاڵ خۆی گەیاندەوە وشکانی. بە گیانی سەرتاپا تەڕەوە بەناو پەرژینەکەدا خۆی گەیاندەوە باخچەکەیان و دایکیشی بە ڕاکردن بەرەوڕووی هات. بەلەم و دوو سەوڵەکەش لەناو دەریاچەکەدا مانەوە، هەر لەو شوێنەدا سەرئاوکەوتبوون کە جێیهێشتبوون. ئێستاکەش جارجارێک خەو بەو بەلەمەوە دەبینێت، کە لە ناو ئاوەکەدا جێما. بەڕاستی ڕووداوێکی کاریگەربوو.
باخچە گەورەکەیان هی هیلدەیە، بەڵام نە پڕ گوڵ و گوڵزار بوو و نە باشیش خزمەتیان دەکرد. تەنها دار سێوێک و چەند دار توتڕکێکی باخچەکە، کە تاڕادەیەک هیچیان نەدەگرت، بەسەرسەختی خۆیانەوە بەرگەی سەرما و سۆڵەی زستانی تەڕو تووشیان دەگرت.
لەسەر چیمەنەکەی نێوان بەردی باخچەکە و پەرژینەکەشدا، جۆلانەیەکی کۆنیان بە تەنها دانابوو. لەبەر هەتاوی ئەو بەیانیەدا تەواو پەککەوتە دەهاتە بەرچاو. لەسەرو ئەوەشەوە دایکی لەبەر

بارانەکەی دوێنێ ئێوارە، بەپەلە دۆشەکەکانی لابردبوو، ئەمەش هێندەی تر دیمەنی جۆلانەکەی ناشیرین کردبوو.
تەواوی چواردەوری باخچەکە بە داری بێتوولا گیرابوو (*دارێکە بە قەدی سپی و لقی باریک دەناسرێت و گەڵای ورد دەگرێت لەشێوەی دڵدا)، بەم جۆرەش دارەکان تا ڕادەیەک باخچەکەیان لە ڕەشەبای ڕۆژئاوای دەریاکەی دەپاراست. هەر بەو بۆنەی ئەو دارانەشەوە بوو کە خانوەکە بەر لە سەد ساڵ لەمەوبەر ناوی «بیرکێلی»یان لێنا (بیرکێلی واتە سێبەری داری بێتوولا).
باپیرە هەرە گەورەکەی هیلدە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا ئەو خانوەی دروستکردبوو. ئەو کەپتاینی یەکێک لە پاپۆڕە گەورەکان بووە، لەبەرئەوە ئێستاکەش زۆرینەی خەڵکی بەو خانوە دەڵێن «خانوی کەپتاین.«
ئەمڕۆکەش هێشتام ڕەهێڵەکەی دوێ شەو بەتەواوەتی بە باخچەکەوە دیارە، هیلدە چەند جارێک لە دەنگی هەورە گرمەکان خەبەری بووەوە. ئێستاکەش ئاسمان دەڵێی ڕێوی لێساوێتیەوە.
لەدوای ئەو بارانە هاوینیەوە هەموو شتێک نەشئەیەکی نوێی پێوە دیارە. لەبەر گەرمی و وشکی حەفتەی پێشوو، گەڵا سەروەکانی دار بێتوولاکان خاڵ خاڵی زەردیان تێکەوتبوو. ئێستاکەش دەڵێی جیهان نوێ کراوەتەوە. لەوە دەچێت ئەم بەیانیە هەموو سەردەمی منداڵی هیلدە ڕاگوێزرابێت.
»بێگومان کە چرۆکان دەتەقێن، ئازاریان پێدەگات«... بەڕاست شاعیرێکی سویدی نەبوو کە شتێکی وای گوت؟ یان فنلەندی بوو؟
لەسەرو کۆمیدیە کۆنەکەی نەنکیەوە، ئاوێنەیەکی چوارچێوە بڕۆنزی هەڵواسرابوو، هیلدە لە بەرامبەریدا وەستا.

جوانە؟ بەلایەنی کەمەوە خۆ ناشیرین نیە؟ لەوانەیە شتێک بێت لەو مابەینەدا... قژێکی زەردی درێژی بەسەر شانیدا هێنابووە خوارێ، هیلدە هەمیشە دەیگوت خۆزگە ڕەنگی قژم یان کەمێک کاڵتر دەبوو یان تۆختر، چونکە ڕەنگێکی ئاوها بەم شێوەیە سەرنج ڕاکێشەر نیە. بەڵام لایەنێکی باشی ئەوەبوو کە قژێکی نەرمی لولی هەبوو، زۆربەی برادەرەکانی ئاواتەخوازبوون قژیان وەکو ئەو کەمێک لولی تێبکەوێت، بۆیە بە هەزار شێوە لولیان دەکرد، بەڵام هیلدە هەمیشە بەشێوەیەکی سروشتی قژی لول بوو. چاوە سەوزەکانیشی دەبێت لەسەر لایەنی جوانی دابنرێت، هەمیشە مام و پورەکانی کە دەیبینن و باوەشی پێدا دەکەن، پێی دەڵێن «چۆنە وا چاوەکانی تۆ هێندە سەوزن؟»
هیلدە تەماشای وێنەی ناو ئاوێنەکەی دەکرد و دەیویست بزانێت لە کچ دەچێت یان لە ژنێکی گەنج. لە دواجاردا گەیشتە ئەوەی کە لە هیچیان ناچێت... لەشی تاڕادەیەکی زۆر لە لەشولاری ژنێک دەچێت، بەڵام دەم و چاوی دەڵێی سێوێکی کرچ و کاڵە.
شتێک لە ئاوێنەکەدا بوو کە بەشێوەیەک لە شێوەکان هەمیشە وای لە هیلدە دەکرد، کە بیر لە باوکی بکاتەوە. جاران ئاوێنەکەیان لە ژوری کارکردنەکەی خوارەوە هەڵواسیبوو. ئەو ژورەی کە کەوتبووە سەرو خانەی بەلەمەکانەوە و باوکی وەک کتێبخانەیەک و شوێنی نووسین و پەستی دەرکردن بەکاریدەهێنا. ئەو، کاتێک لە ماڵەوە دەبوو، هیلدە بەناوی ئەلبێرتەوە بانگی دەکرد و هەمیشە بەو ئاواتەوە بوو کە نووسینێکی گەورە بنووسێت. کەڕەتێکیان هەوڵیدا ڕۆمانێک بنووسێت، بەڵام دواتر وازی لێهێنا. جارجارێک وتار و شیعری لە ڕۆژنامەی ناوخۆیدا بڵاودەکردەوە. هیلدەش هەموو جارێک کە شتێکی ئەو بڵاودەکرایەوە، هەروەکو باوکی ئەویش شانازی پێوەدەکرد. بەهەرحاڵ

ناوی ئەلبێرت کنەی لە لیللەساندا شوێنێکی تایبەتی هەبوو، باپیرە گەورەکەشی ناوی ئەلبێرت بوو.
ئاخ، ئەم ئاوێنەیە... باوکی چەند ساڵێک لەمەوبەر بە گاڵتەپێکردنەوە دەیگوت؛ دەتوانین چاوێک دابگرین و لە ئاوێنەکەدا ببینین، بەڵام ڕێی تێناچێت هەردوو چاو بەیەکەوە داگرین و خۆشمان ببینین. تەنها شتێکیش کە تایبەتبوو بە ئاوێنەکە، چوارچێوە برۆنزیەکەی بوو، چونکە ئاوێنەکە لە ڕاستیدا ئاوێنەیەکی تەلیسماوی کۆن بوو و داپیرە گەورەکەی کەمێک پێش ئەوەی شوبکات لە ژنە قەرەجێکی کڕیبوو. زۆر جاران هیلدە بۆ ماوەیەکی دور و درێژ هەوڵیدەدا هەردوو چاوی دابگرێت و لە هەمان کاتیشدا خۆی لە ئاوێنەکەدا ببینێت، بەڵام هەروەک ئەوە وابوو بیەوێت لە سێبەرەکەی هەڵبێت... هەرگیز نەیدەتوانی. لە کۆتایدا ئاوێنە کۆنەکەیان بەخشی بەم. بە درێژایی گەورەبوونیشی، جارجارێک سەر لەنوێ هەوڵیدەدایەوە ئەو وێنە مەحاڵە ببینێت کە باسیاندەکرد.
ئاساییە ئەمڕۆکە هێندە پڕ ئەندێشە بێت و سەرقاڵی ناسینی خۆی بێت... پانزە ساڵ...
تەنها ئێستاکە سەرنجی چووە سەر مێزە پچکۆلەکەی. دیاریەکی پێچراوەی گەورەی لەسەر دانرابوو! بە پارچە کاغەزێکی جوانی شینی ئاسمانی پێچرابووەوە و بە پەتێکی ئاوریشمی سووریش ڕازێنرابووەوە. بێگومان دیاری ڕۆژی لەدایک بوونەکەیەتی!
بڵێیت ئەمە «دیاریەکە» بێت؟ ئەو «دیاریە» گەورەیەی بابە کە چەندین جار باسکرا و پڕبوو لە نهێنی؟ چەندین جاریش لە پۆستکارتەکانیدا ناوی دەبرد، کە لە لوبنانەوە دەیناردن. بەڵام نووسیبووشی «سانسۆرێکی توندم خستۆتە سەر خۆم.»

باوکی لە پۆستکارتێکدا نووسیبووی؛ «دیاریەکە شتێکە هەمیشە گەورەتر و گەورەتر دەبێت». ئامارژەشی بۆ کچێک دەکرد کە پاشان دەیناسێت و دەیگوت کۆپیەکی هەموو پۆستکارتەکانم بۆ ئەویش رەوانەکردووە. هیلدە زۆر هەوڵیدەدا کە دایکی مەبەستی باوکی بۆ ڕوونبکاتەوە، بەڵام ئەویش بە هیچ جۆرێک سەری لێدەرنەدەکرد.
لە هەموو شتێکیش سەیرتر، نووسیبووی؛ «دیاریەکە لەگەڵ خەڵکانی تردا دابەشدەکرێت»... باوکی هەروا بە رێکەوت کاری لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکاندا نەدەکرد. لە ڕاستیدا باوکی چەندین بیروڕای تایبەت بەخۆی هەبوو، یەکێک لەو بیروڕا نەگۆڕانەی ئەوەبوو کە دەیگوت؛ «دەبێت نەتەوە یەکگرتووەکان شێوە بەرپرسیاریەکیان بەسەر هەموو جیهاندا هەبێت». لەسەر یەکێک لە پۆستکارتەکانیشیدا نووسیبووی؛ «دەبێت نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆژێک لە ڕۆژان توانای نزیککردنەوەی هەموو مرۆڤایەتیان هەبێت.«
پڕ بەدڵ حەزی دەکرد دیاریەکە بکاتەوە... بڵێیت ئاسایی بێت گەر تەماشایەکی بکات؟ یان دەبێت بوەستێت هەتاوەکو دایکی دێتە ژورەوە و کێک و ساردی و ئاڵای ڕۆژی لەدایک بوونی بۆ دێنێت؟ بێگومان بۆی هەیە دیاریەکەی بکاتەوە، ئەگەر نا ئەوا لەوێدا دایان نەدەنا.
هیلدە خۆی گەیاندە لای مێزەکە و دەستی دایە دیاریەکەی... قورس بوو! کارتێکیشی لەسەردانرابوو؛ «لە بابەوە بۆ هیلدە، دیاری ڕۆژی لەدایک بوونی پانزە ساڵەتە.«
ئەوجا لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت و بە هێواشی پەتە ئاوریشمیە سوورەکەی لێکردەوە، دواتریش کاغەزە شینەکەی داماڵی؛
فایلێکی گەورەی بینی!

**ئەمەیە دیاریەکە؟ ئەمەیە کە ئەو هەموو باسەی لەسەر دەکرا؟ ئەمەیە ئەو دیاریەی کە «گەورەتر و گەورەتر دەبێت» و جگە لەوەش لەگەڵ خەڵکانی تردا دابەش دەکرێت؟ بە تەماشاکردنێکی بەپەلە، بۆی دەرکەوت کە فایلەکە پڕە لە کاغەزی چاپکراو. هیلدە خەتی چاپەکەی ناسیەوە، هەمان ئەو چاپە بوو کە کاتی خۆی باوکی لەگەڵ خۆیدا بردبووی بۆ لوبنان.**

**بڵێیت کتێبێکی تەواوی بۆ نووسیبێت؟**

**لەسەر یەکەمین لاپەڕە بە دەستوخەتێکی گەورە نووسرابوو؛ جیهانی سۆفیا.**

**کەمێک لە خوارترەوە بە چاپ نووسرابوو؛**

**»ئەو کاتەی مرۆڤ پەی بە ڕاستی دەبات، هەروەکو ئەو کاتە وایە کە خۆر تاریکایی سەر زەوی هەڵدەماڵێت». ن.ف.س. گرۆنتفیک**

**N.F.S. Grundtvig**

**هیلدە لاپەڕەی یەکەمی هەڵدایەوە. لە سەروی لاپەڕەی دووهەمەوە بەشی یەکەم دەستی پێدەکرد. نووسرابوو «باخچەی عەدەن». هیلدە بە باشی لەسەر جێگاکەی دانیشت، مەلەفەکەی لەسەر ڕانی دانا و دەستیکرد بە خوێندنەوە.**

»سۆفیا ئامۆنسن لە قوتابخانەوە بەرەوماڵەوە دەگەڕایەوە. پێکەوە لەگەڵ یۆرونی برادەریدا بەشێکی ڕێگاکەی بڕی. باسی ڕۆبۆتیان دەکرد. یۆرون مێشکی مرۆڤی وەک کۆمپیوتەرێکی ئاڵۆز دەبینی، بەڵام سۆفیا لەگەڵ بۆچوونەکەی یۆروندا تەواو هاویار نەبوو. مەگەر مرۆڤ لە ئامێرێک زیاتر نەبێت؟«

**هیلدە بەردەوامبوو لەسەر خوێندنەوە، پاش کەمێکیش هەموو شتێکی لەیادکرد، تەنانەت ڕۆژی لەدایک بوونەکەشی. جارجارێکیش بیرۆکەیەک لە خەیاڵیەوە دەهاتە نێو ئەو ڕستانەی دەیخوێندەوە.**
**بابە ڕۆمانی نووسیوە؟ بڵێیت دیسانەوە دەستی کردبێتەوە بە ڕۆمانە گەورەکە و لە لوبنان تەواوی کردبێت؟ زۆر جاران دەیگوت کاتێکی بەتاڵی زۆرم هەیە و بێزاریکردووم.**
**باوکی سۆفیاش لەدەرەوەی وڵاتە، پێدەچێت سۆفیا ئەو کچە بێت، کە دواتر هیلدە دەیناسێت...**

»کە زۆر بە قووڵی هەستیدەکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان دەشێ لە ژیاندا نەمێنێت، ئەوسا بە تەواوەتی مانای مەزنی ژیانی بۆ ڕووندەبووەوە... جیهان چۆن دروست بووە؟ ... کەواتە هەرچۆنێک بێت، دەشێت شتێک لە کاتێکی دیاریکراودا لە هیچی ڕووتەوە هاتبێتە بوون. بەڵام ئایا ئەمەشیان ڕێی تێدەچێت؟ ئایا ئەمەش بەهەمان شێوە نەگونجاو نیە؟ ئایا ئەمەش وەک ئەوە نیە کە مەزەنەبکەین جیهان هەمیشە هەر هەبووبێت؟

**هیلدە هەر دەیخوێندەوە و دەیخوێندەوە، کەمێکیش هەستی بەسەرلێشێواندن دەکرد، بە تایبەتی کاتێک گەیشتە ئەوەی کە سۆفیا ئامۆنسن پۆستکارتێکی لە لوبنانەوە پێگەشت؛ «هیلدە میوللە کنەی، لە ڕێگەی سۆفیا ئامۆنسنەوە، کۆڵانی کلۆیڤە، ژمارە سێ...«**

»هیلدە گیان، هەزارجار جەژنی پانزە ساڵەی لەدایکبوونت پیرۆزبێت. هەروەک دەزانیت دەخوازم دیارییەکت پێشکەشبکەم کە پێی

گەورەبیت. ببوورە کارتەکە بۆ سۆفیا دەنێرم. بەم جۆرە کارەکەم ئاسانتر دەبێت... سڵاوی خۆشەویستانەی بابە.«

**زۆرزان! هیلدە دەیزانی کە باوکی فێڵی زۆرە، بەڵام ئەمڕۆکە بەمانای وشە سەلماندی چەندە فێڵبازە، بەتەواوەتی بە جێگاکەوە نووساندوێتی و ناهێڵێت هەستێت. لەبری ئەوەی کارتەکە بنێرێت، چووە تێکەڵی نووسینی ناو دیاریەکەی کردووە.**
**ئای سۆفیای نەگبەت! بەڕاستی دەبێت زۆر سەری لێشێوابێت!**

»بۆچی باوکی هیلدە کارتی پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایکبوونی کچەکەی بۆ سۆفیا دەنێرێت، لە کاتێکدا سوور دەزانێت دەبوایە بۆ شوێنێکی تری بناردایە؟ چ باوکێک بەدەستی ئەنقەست دەخوازێ کچی خۆی هەڵخڵەتێنێت و کارتی ڕۆژی لەدایکبوونەکەی بۆ شوێنێکی تر ڕەوانەبکات؟ پاشانیش نووسیویەتی "بەم جۆرە کارەکەم ئاسانتر دەبێت"، چۆن چۆنی ئاسانتر دەبێت؟ لە سەرو هەموو شتێکیشەوە سۆفیا چۆن هیلدە بدۆزێتەوە؟«

**ڕاستە، چۆن دەتوانێت؟**
**هیلدە لاپەڕەکەی هەڵدایەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی بەشی دووهەم، کە ناوی «کڵاوە درێژەکە» بوو. پاش کەمێک گەیشتە سەر ئەو نامە درێژەی کە کەسە نەناسراوەکە بۆ سۆفیای ناردبوو. هیلدە بە پەرۆشەوە چاوەڕوانبوو بزانێت چی بۆ نووسیوە.**

»واتە کاتێک کە دەمانەوێت بزانین بۆچی دەژین، وەک ئارەزووی "بە ڕێکەوتی" پول کۆکردنەوە نیە. ئەو کەسەی خولیای ئەو جۆرە پرسیارانە بێت، سەرقاڵی شتێکە مرۆڤایەتی بە درێژایی بوونی لەسەر ئەم زەویە گفتوگۆی لەسەر کردووە... سۆفیا تەواو سەری سوڕمابوو«..

**هەروەها هیلدەش. باوکی کتێبێکی ئاسایی بۆ نەنووسیوە و کردبێتیە دیاری پانزە ساڵەی لەدایکبوونی، بەڵکو کتێبێکی تەواو سەیر و پڕ نهێنی بۆ هۆنیوەتەوە.**

»بە پوختی؛ کەروێشکێکی سپی لەناو کڵاوێکی بۆشی درێژەوە دەردەهێنرێت. بەڵام لەبەرئەوەی کەروێشکەکە یەکجار گەورەیە، جادووەکە ملیارد ساڵی پێدەچێت. هەموو منداڵی مرۆڤەکان لە سەری سەرەوەی تاڵە ناسکەکانی فەرووەکەیدا لەدایک دەبن، لەبەرئەوە دەتوانن سەریان لەو جادووە مەحاڵە بسوڕمێت. بەڵام لەگەڵ گەورەبوونیاندا، کەمە کەمە بەرەو قوڵایی ناخی فەرووی کەروێشکەکە دەخشێن و لەوێدا دەمێننەوە«..

**سۆفیا تەنها کەس نەبوو، کە هەستیدەکرد لە شوێنێکی خواروی فەرووی کەروێشکە سپیکەدا گیریخواردووە. هیلدەش ئەمڕۆکە پانزە ساڵ پڕدەکاتەوە. ئەویش هەستیدەکرد کاتی ئەوە هاتبێت ڕێگایەک هەڵبژێرێت و دوای بکەوێت.**
**هیلدە دەربارەی فەیلەسوفە سروشتیکانی خوێندەوە. ئەو دەیزانی باوکی زۆر خولیای فەلسەفە بوو. باوکی کەڕەتێکیان لە ڕۆژنامەدا**

**بابەتێکی دەربارەی فەلسەفە نووسیبوو و داوای ئەوەی کردبوو کە فەلسەفە بکرێتە وانەیەکی ئاسایی قوتابخانە. چەندین جاریش ئەم بابەتەی لە کۆبونەوەی دایکان و باوکانی پۆلەکەی هیلدەدا دەخستەڕوو، ئەمەش هیلدەی تەواو خەجاڵەت کردبوو.**
**ئەوجا تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد... حەوت و نیوی نیشاندەدا. خۆشبەختانە بەلایەنی کەمەوە کاتژمێرێکی تری پێدەچێت هەتاوەکو دایکی بە خۆی و کەرەسەی ڕۆژی لەدایکبوونەوە بێتە سەرەوە. ئەو بەشەی خوێندەوە کە ناوی «دیمۆکریتس» بوو. لە پێشدا پرسیارێک ئاڕاستەی سۆفیاکرابوو و دەبوایە بیری لێبکردایەتەوە؛ «بۆچی یاری لیگۆ بلیمەتترین یاری جیهانە؟» دواتر «نامەیەکی گەورەی زەردی» لەناو سندوقی پۆستەکەیاندا بەدیکرد.**

»فەیلەسوفەکانی پێش دیمۆکریتس دەیانگوت گۆڕانکاریە بینراوەکانی سروشت لە ڕاستیدا بە هۆی «گۆڕانی» شتێکەوە ڕوونادەن، ئەمیش لەگەڵ بڕواکەیاندا تەبایە. لەبەرئەوە دەیگوت دەبێت هەموو شتێک لە بنەڕەتدا لە توخمی بچکۆلە بچکۆلەی نەبینراو پێکهاتبێت و هەر یەک لەو توخمانەش دەبێت هەمیشەیی و نەمربن. ئەم بەشە بچکۆلانەشی ناونابوو ئەتۆمەکان، واتە شتێک کە شیاوی دابەشکردن نیە«

**کاتێک هیلدە گەیشتە ئەو شوێنەی سۆفیا دەسڕە ئاورشمیە سوورەکە لە ژێر جێگاکەی خۆیدا دەدۆزێتەوە، تەواو تێکچوو... ئممم، کەواتە لەوێدا گیرساوەتەوە! ئەی چۆن دەسڕێک هەروا بەئاسانی دەچێتە ناو چیرۆکێکەوە؟ بەڵام لە ڕاستیشدا خۆ هەر دەبێت لە شوێنێکدا "بێت"...**

بەشی سوکرات بەوە دەستی پێکرد کە سۆفیا چەند دێڕێکی لە ڕۆژنامەیەکدا دەخوێندەوە کە دەربارەی سەربازە نەرویجیەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بوو. ئای پیرەی فێڵزان! زۆر جاران باوکی دەیگوت خەڵکی نەرویجی کاری هێزە ئاشتی پارێزەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانیان بەلاوە گرنگ نیە. ئەگەر تائێستاکە هیچ کەسێک بەلایەوە گرنگ نەبووبێت، ئەوا بەلایەنی کەمەوە دەبێت بەلای سۆفیاوە گرنگ بێت. بەم شێوەیەش سەرنجی دامودەزگای ڕاگایەندن ڕادەکێشێت. کاتێکیش تێبینی خوارەوەی نامەی فەیلەسوفەکەی خوێندەوە، لە پێکەنیندا خوێ پێ نەدەگیرا؛

»ئەگەر دەسڕێکی سووری ئاوریشمیت دۆزیەوە، داوات لێدەکەم کە زۆر ئاگاداری بیت. جارجارێک ڕێک دەکەوێت ئەو شتانە بکەونە لای یەکێکی تر. بەتایبەتیش لە قوتابخانە و ئەو جۆرە شوێنانەدا، لە یادیشت بێت ئەمە قوتابخانەی فەلسەفەیە«

هیلدە گوێی لە دەنگی پێی کەسێک بوو بەسەر پلیکانەکاندا سەردەکەوت... بێگومان دایکیەتی و بە خۆی و کەرەسەی ڕۆژی لەدایکبوونەوە بەرەولای ئەو دێتە سەرەوە. پێش ئەوەی دایکی لە دەرگا بدات، هیلدە گەیشتبووە ئەو شوێنەی کە سۆفیا فلیمێکی ڤیدیۆ لە جێگا نهێنیەکەی ناو باخچەکەدا دەدۆزێتەوە.

دایکی هەر لەسەر قادرمەکانەوە دەستی کرد بە گۆرانی گوتن و بەردەوام بوو.

- ئیمڕۆ جەژنی ڕۆژی لەدایکبوونی هیلدەیە، هەر بژی، هەر بژی، هەر بژی...

ـ فەرموو وەرە ژورەوە، هیلدە ئەمەندەی گوت و لەسەر خوێندنەوەکەی بەردەوامبوو. لەوێدا مامۆستای فەلسەفەکە ڕاستەوخۆ لە ئەکرۆپۆلیسەوە قسەی لەگەڵ سۆفیادا دەکرد. ئەلبێرتۆ بە خۆی و ڕیشێکی ڕێککراو و کڵاوە شینەکەی سەریەوە، تا ڕادەیەکی زۆر لە باوکی هیلدە دەچوو.
ـ جەژنی لەدایکبوونت پیرۆزبێت هیلدە!
ـ ئمم...
ـ چیتە هیلدە؟
ـ تکایە شتەکان لەوێدا دابنێ.
ـ پێت خۆش نیە نانی بەیانی لە...
ـ نابینیت سەرم قاڵە.
ـ ئەمڕۆ بوویتە پانزەساڵ، دەزانیت!
ـ دایە، هەرگیز چوویت بۆ ئەسینا؟
ـ نەخێر بۆ؟
ـ زۆر سەیرە ئەو هەموو پەرستگا کۆنانە هەتاوەکو ئێستاکە هەر ماون. لە ڕاستیدا **2500** ساڵ تەمەنیانە و گەورەترینیشیان پێی دەگوترێت «ماڵی کچ.»
ـ دیاریەکەی بابەت کردەوە؟
ـ کام دیاریە؟
ـ هیلدە! کاتێک کە قسەم لەگەڵ دەکەیت، تەماشام بکە! لەوەدەچێت تەواو سەرت لێشێواوبێت.
هیلدە دەستی لە فایلە گەورەکە بەردا و کەوتە ناو کۆشیەوە.
دایکیشی خۆی بەسەر جێگاکەیدا چەماندەوە، لە سینیەکەیدا مۆم و شەربەت و کێک و دیاریەکی بچکۆلەی لەسەربوو. دایکی کەمێک

نالەبارانە چەمابووەوە، چونکە بە دەستەکانی سینیەکەی گرتبوو و لەژێر باڵیشیدا ئالاکانی دانابوو.
- زۆر زۆر سوپاس دایە گیان. بە ڕاستی دایکێکی میهرەبانیت، بەڵام وەک دەبینیت یەکجار سەرم قاڵە.
- بەڵام کاتژمێری یەک دەڕۆیتە کڵێسە، ها؟ ئەمڕۆ کۆبونەوەی دواهەمین ڕۆژی قوتابخانەتانە.
ئەوجا هیلدە بەئاگا هاتەوە، دایکی سینیەکەی لەسەر مێزەکەی تەنیشت جێگاکە دانا.
- ببوورە، بەڵام تەواو چووبومە ناو ئەم بابەتەوە.
هیلدە دەستی بۆ مەلەفەکە ڕاکێشا و بەردەوام بوو؛
- لە بابەوە بۆم هاتووە...
- چی بۆ نووسیویت؟ منیش وەک تۆ بەپەرۆشەوەبووم بزانم چیە. چەند مانگێک زیاترە هیچ وشەیەکی سوودبەخشی نەگوتووە.
هیلدە هەر لە خۆیەوە کەمێک هەستی بە شەرم دەکرد، پاشان گوتی؛
- ئمم... تەنها چیرۆکێکە و هیچی تر.
- چیرۆک؟
- بەڵێ چیرۆکێک و... مێژووی فەلسەفەشە. شتێک لەو بابەتەی نووسیووە.
- ئەی حەز ناکەیت دیاریەکەی من بکەیتەوە.
هیلدە هەستیکرد هیچ چارەیەکی نیە، لەبەرئەوە یەکسەر دیاریەکەی دایکی کردەوە... بازنگێکی ئاڵتون بوو.
- ئای چەندە جوانە! زۆر زۆر سوپاس!
هیلدە هەستا و باوەشێکی بەدایکیدا کرد، ئەوجا گوتی؛

ـ بەیارمەتیت، ئیتر حەز دەکەم بە تەنها بم... ئەو ئێستا لەسەر لوتکەی ئەکرۆپۆلیسدا وەستاوە.
ـ کێ؟
ـ نازانم... سۆفیاش نازانێت. هەموو خۆشیەکە لەو خاڵەدایە.
ـ باشە من دەبێت بچمە سەر کار. لەیادت بێت نان بخۆیت... کراسەکەت لە خوارەوە هەڵواسراوە.
ئەوجا دایکی بەسەر قادرمەکاندا چووە خوارەوە، مامۆستای فەلسەفەکەی سۆفیاش هەروەها؛ لە قادرمەکانی لوتکەی ئەکرۆپۆلیسەوە هاتە خوارەوە و لەسەر بەرزایی ئاریۆپاگۆسدا دانیشت، پاشانیش لە گۆڕەپانە کۆنەکەی ئەسیناوە سەری دەرهێنا.
هیلدە تەواو سەرسام بوو کاتێک کە گەیشتە ئەو شوێنەی کە لە پڕێکدا بینا کۆنەکان لە پاشماوەکانەوە بەرزبوونەوە. یەکێک لە بیرۆکە نەگۆڕەکانی باوکی ئەوە بوو کە دەیگوت؛ دەبێت هەموو وڵاتەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، دروستکردنەوەی کۆپیەکی دەقاودەقی گۆڕەپانە کۆنەکەی ئەسینا، وەک ئەرکێک بخەنە سەر شانی خۆیان. ئەوێش دەبێت بکرێتە شوێنی مامەڵەکردن لەگەڵ پرسیارە فەلسەفیەکاندا، جگە لەوەش دەبێت ببێتە مەڵبەندێک بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کەمکردنەوەی چەک. بە بڕوای ئەو پڕۆژەیەکی ئاوها مەزن، مرۆڤایەتی کۆدەکاتەوە و دەیگوت؛ «ئاشکرایە کە دەتوانین کەشتی ئاسمانی دروستبکەین و بیری نەوتیش لێبدەین.»
ئەوجا گەیشتە سەر پلاتۆن... «ڕۆح بە باڵی خۆشەویستی دەیەوێت بفڕێتەوە بۆ "ماڵەوە"، بۆ جیهانی ئەندێشە و گەرەکیەتی لە زیندانی لەش ڕەهابێت....»

سۆفیا لەنێو پەرژینەکانەوە هاتە دەرەوە و دوای هێرمس کەوت، بەڵام ئەو بە پەلە لەبەر چاویدا ونبوو. پاش ئەوەی دەربارەی پلاتۆنی خوێندەوە، بەردەوام بەناو دارستانەکەدا ڕۆیشت و لە پاشاندا گەیشتە کوخێکی سوور، کە لە پاڵ دەریاچەیەکی چکۆلەدا دروستکرابوو. لەناو کوخەکەدا وێنەیەکی بیرکێلی هەڵواسرابوو. لە وەسفکردنی وێنەکەوە ئاشکرابوو کە باسی ماڵی هیلدە دەکرێت. بەڵام وێنەی پیاوێکی تریش بەناوی «بارکێلی»ەوە هەڵواسرابوو. «سەیر نیە؟ «

هیلدە مەلەفە گەورەکەی لەسەر جێگاکەی دانا و خۆی گەیاندە کتێبخانەکەی. لە فەرهەنگە سێ بەرگیەکەیدا، کە لە جەژنی لەدایک بوونی چواردە ساڵیدا بەدیاری وەریگرت، بەدوای ناوی «بارکێلی»دا دەگەڕا... بارکێلی... ئەوەتا!

بارکێلی، جۆرج **(1753-1685)** فەیلەسوفێکی ئینگلیزی و قەشەی شاری "کلۆین" بوو. بارکێلی نکۆڵی لە بوونی جیهانێکی مادی دەکرد، کە لە دەرەوەی ئاگایی مرۆڤدا هەبێت. ئەو دەیگوت هەستەکانمان لە خوداوە سەرچاوە وەردەگرن. جگە لە مانەش بارکێلی بە ڕەخنەگرتنی بەرامبەر بە هەموو جۆرە وێناکردنێکی ئەبستراکتانە ناسراوە. شاکاری «لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بنەمای مەعریفی مرۆڤایەتی» لە ساڵی «**1710**»دا نووسیوە.

بەڵێ، سەیرە! هیلدە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە ناو جێگاکەی و دەست بکاتەوە بە خوێندنەوە، چەند خولەکێک لە ناوەڕاستی ژورەکەدا وەستا و بیری دەکردەوە.

بێگومان باوکی وێنەکانی هەڵواسیبوو، بەڵام ئایا جگە لە لێکچوونی ناوەکانیان، هیچ پەیوەندیەکی تریان بەیەکەوە هەیە؟
بە کورتی بارکێلی فەیلەسوفێک بووە و نکۆڵی لە بوونی جیهانێکی مادی کردووە کە لە دەرەوەی ئاگایی مرۆڤدا بوونی هەبێت. بە ڕاستی سەیرە گەر بەو شێوەیە بیربکەینەوە. بەڵام هەموو کاتێکیش سەلماندنی پێچەوانەی ئەو بیروڕایانە ئاسان نیە. هەرچی دەربارەی سۆفیایە... ڕاستە تەواو بەسەردا دەچەسپێت، لەبەرئەوەی هەموو «هەستەکانی» سەرچاوەیان لە باوکی هیلدەوە وەردەگرێت!
ئەگەر لەسەر خوێندنەوە بەردەوام بێت، ئەوا لەوانەیە شتی زیاتری بۆ دەرکەوێت. هیلدە گەیشتە ئەو شوێنەی کە سۆفیا لە ئاوێنەکەدا وێنەی کچێک دەبینێت کە هەردوو چاوی پێکەوە دادەگرێت، لەوێدا چاوی لە مەلەفەکە هەڵگرت و پێکەنی.

»لەوە دەچوو کچی ناو ئاوێنەکە چاوی لە سۆفیا داگرتبێت، وەکو ئەوەی پێی بڵێت؛ دەتوانم بتبینم سۆفیا، من لەناوەوەدام و لە دیوەکەی ترەوەم.«

لەوێدا جزدانە سەوزەکەشی دۆزیەوە –بەپارە و هەموو شتەکانی ترەوە! ئەی ئەوەیان چۆن گەیشتە ئەوێ؟
قسەی بێمانا! بۆ چەند چرکەیەک هیلدە بە ڕاستی وایدەزانی کە سۆفیا دۆزیویەتەوە. بەڵام پاشان هەوڵیدا خۆی لە جێگای سۆفیا دابنێت و دەیویست بزانێت هەموو ئەم شتانە چ هەستێک دەبەخشن. بێگومان بەلای ئەوەوە هەموو شتێک وەک مەتەڵێک وەهایە.

**بۆ یەکەمین جار هیلدە بە ڕاستی حەزیدەکرد ڕووبەڕووی سۆفیا ببێتەوە و باسی هەموو شتێکی بۆ بکات.**
**بەڵام ئێستاکە سۆفیا پێش ئەوەی بەسەر تاوانەکەیەوە بگیرێت، دەبوایە کوخەکەی مێجەری جێ بهێشتایە... بێگومان بەلەمەکە بە بەرەڵایی لەناو ئاوەکەدا بوو. باوکی "دەبوایە" کارەساتی بەلەمەکەی بیری هیلدە بخستایەتەوە!**
**هیلدە قومێک شەربەتی خواردەوە و دەستیکرد بە کێک خواردن، لە هەمان کاتیشدا بەردەوامبوو لەسەر خوێندنەوەی نامەکەی ئەریستۆتالیس، پیاوە "ڕێکخەرەکەی" کە ڕەخنەی لە تیۆری ئەندێشەی پلاتۆن دەگرت.**

»بەلای ئەریستۆتالیسەوە هیچ شتێک، ئەگەر لەوەوپێش هەستەکان پەییان پێنەبردبێت، ئەوا لە ئاگایدا بوونیان نیە. گەر پلاتۆن بوایە دەیگوت؛ هیچ شتێک لە سروشتدا بوونی نیە، گەر لەوەوپێش لە جیهانی »بیر«دا بوونی نەبووبێت. پلاتۆن، لە ڕوانگەی ئەریستۆتالیسەوە بەشێوەیەک لە شێوەکان »ژمارەی شتەکان دووجا دەکاتەوە.«

**لە ڕاستیدا هیلدە نەیدەزانی کە ئەریستۆتالیس بۆ یەکەمین جار "جیهانی ڕووەک و جیهانی ئاژەڵ و جیهانی کانزای" داهێناوە.**

»ئەریستۆتالیس گەرەکیبوو لە بنچینەوە ژوری کچی سروشت ڕێکبخات. هەوڵیدەدا بیسەلمێنێت کە هەموو شتەکانی سروشت دەکەونە ژێر گروپی جیاجیاوە.«

**هیلده کاتێک کە گەیشتە سەر دونیادیدەی ئەریستۆتالیس بۆ ئافرەت، تەواو بێتاقەت و نائومێدبوو. بیر لەوە بکەرەوە فەیلەسوفێک هێندە بیرتیژ بێت و لە هەمان کاتیشدا هێندە بێ ئەقڵ بێت!**
**سۆفیا سروشی ڕێکخستنی لە ئەریستۆتالیسەوە وەرگرت و کەوتە ڕێکخستنی "ژوری کچەکە"ی خۆی، لەو کاتەدا لەگەڵ چەندین شتی تێکەڵ و پێکەڵی تردا، گۆرەویەکی سپی درێژی دۆزیەوە، کە مانگێک لەوەوبەر لە دۆلابەکەی هیلدەدا دیار نەمابوو! پاشان سۆفیا هەموو پەڕەکانی ئەلبێرتۆ کۆدەکاتەوە و لە مەلەفێکدا دایاندەنێت، «نزیکەی پەنجا لاپەڕە دەبوون». بەڵام هیلدە گەیشتبووە لاپەڕەی 124، لەبەرئەوەی لەسەرو نامەکانی ئەلبێرتۆ کنۆکسەوە هەموو چیرۆکەکەی سۆفیاشی لەبەردەستابوو.**
**بەشی دوای ئەوە ناوی «هیللینیزم» بوو، ئەم بەشە بەو کۆپلەیە دەستیپێکرد کە سۆفیا پۆستکارتێکی نوێی دۆزیەوە و وێنەی جێبێکی نەتەوە یەکگرتووەکانی لەسەربوو، لە ڕۆژی 6/15دا مۆری «بەتالیۆنی نەتەوە یەکگرتووەکانی» لێدرابوو. دیسانەوە ئەمەش یەکێک بوو لەو کارتانەی کە باوکی بۆی ناردبوو، بەڵام لەبری ئەوەی بە پۆستدا بۆی بنێرێت، خستبوویە ناو چیرۆکەکەیەوە؛**

«گیانەکەم هیلدە، پێم وابێت ئەمڕۆ ئاهەنگی ڕۆژی لەدایک بوونتە، یاخود بەهەڵەدا چووم و هێشتام ڕۆژێکی ماوە؟ بەهەرحاڵ ئەم بابەتە هیچ لە دیاریەکەت ناگۆڕێت... لەبەرئەوەی دیاریەکەت لە هەموو بارێکدا بە شێوەیەک لە شێوەکان بەدرێژایی ژیانت لەلات دەمێنێتەوە. دیسانەوە حەز دەکەم جارێکی تریش پیرۆزباییت لێبکەم.

لەوانەیە ئێستاکە تێبگەیت بۆچی نامەکانت بۆ سۆفیا دەنێرم. من دڵنیام کە ئەو پێتی دەگەیێنێت.
تێبینی؛ دایکت پێی گوتم جزدانەکەت لێ گووم بووە. من پەیمانت دەدەمێ 150 کرۆنەکەت بۆ ببژێرم، بێگومان پێناسی قوتابخانەکەشت، پێش ئەوەی پشووی هاوینە دەست پێبکات، دەتوانیت لە قوتابخانە دەریبهێنیتەوە»

**خراپ نیە! بەلایەنی کەمەوە 150 کرۆنەکەی وەردەگرێتەوە. بێگومان بیری لەوە کردۆتەوە دیاریە دەستکردەکەی کەمێک دەوڵەمەندتر بکات.**
**وادەرکەوت کە 6/15 ڕۆژی لەدایک بوونی سۆفیاش بێت، بەڵام ساڵنامەکەی سۆفیا هەتا پانزەی پێنج بوو. لەوەدەچێت باوکی ڕێک ئەو کاتە ئەو بەشەی نووسیبێت و پاشانیش لەسەر کارتی «پیرۆزباییەکەی» بەرواری ڕۆژی لەدایک بوونی هیلدەی لێدابێت.**
**ئای سۆفیای نەگبەت، وا خەریکە بەرەو بازاڕە گەورەکە ڕادەکات، بۆ ئەوەی چاوی بە یۆرون بکەوێت؛**

»هیلدە کێیە؟ چۆن باوکی هەروا بەئاسانی دڵنیایە کە سۆفیا دەیدۆزێتەوە؟ هەرچۆنێک بێت، بێمانایە کە ئەو لەبری ئەوەی کارتەکانی ڕاستەوخۆ بۆ کچەکەی بناردایە، دەیناردن بۆ سۆفیا«

**ئەوجا گەیشتە سەر «پلۆتین» و لێرەدا هیلدەش هەستیدەکرد بە ئاسماندا دەخولێتەوە؛**

«کەمێک لە نهێنی خوایانە بوونی لە هەموو شتێکی چواردەورماندا هەیە. لەناو گوڵەبەڕۆژەیەکدا یان لەناو گوڵە خەشخاشێکدا دەیبینین کە دەدرەوشێتەوە. کەمێک زیاتری ئەم نهێنیە خوایانەیەش لەناو پەپولەیەکدا دەبینین کە لەسەر گوڵێک دەنیشێتەوە، یان لە ماسیە زەردەیەکدا بەدیدەکەین کە مەلە دەکات. بەڵام مەزنترین نهێنی خوایانە لە ڕێگەی ڕۆحی خۆمانەوە لێی نزیک دەبینەوە. تەنها لەوێدا دەتوانین لەگەڵ نهێنی گەورەی ژیاندا ببینە یەک... بەڵێ، لە چەند ساتێکی دەگمەنیشدا لەوانەیە هەستکەین خۆمان ئەو نهێنیە خوایانەیە بین.»

**هیلدە لە ژیانیدا لەمە سەیرتری نەخوێندبووەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئاسانترین شتیش بوو کە خوێندبێتیەوە. هەموو شتێک «یەک شتە» و ئەو «یەکەش»، ئەو نهێنیە خوایانەیەیە کە هەموو شتێک تێیدا بەشدارە.**

**بەلای هیلدەوە ئەمە شتێک نیە کە مرۆڤ پێویستی پێبێت کە بڕوای پێبکات، بەڵکو ئاوهایە و تەواو. هەموو کەسێکیش دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی وشەی «خوایانە» بەو جۆرە لێکبداتەوە کە لێی تێدەگات.**

**بەپەلە هەڵیدایەوە سەر بەشی داهاتوو. سۆفیا و یۆرون دەبوایە شەوی حەڤدەی پێنج گەشتی ناو دارستانەکەیان بکردایە و لەوێدا خێمەیان هەڵبدایە، پاشانیش دەبوایە بڕۆشتنایەتە ژورەکەی مێجەر...**

**هیلدە کەمێکی خوێندەوە و بە توڕەییەوە لەسەر جێگاکەی هەستا و بە مەلەفەکەی دەستیەوە بە ژورەکەدا دەهات و دەچوو.**

**ئەمەیان زۆرزانترین شتبوو کە لە ژیانیدا بینیبووی. لەوێدا، لە کوخەکەی مێجەردا باوکی کۆپیەکی سەرتاپای هەموو ئەو پۆستکارتانەی نیشاندان کە لە دوو حەفتەی یەکەمی مانگی پێنجدا بۆ هیلدەی ناردبوو. کۆپیەکانیش ڕاست و دروست وەک پۆستکارتە ڕاستەقینەکان وابوون. هیلدە هەریەک لەو کارتانەی باوکی دوو سێ جار خوێندبووەوە و وشە بە وشەی دەناسیەوە؛**

»هیلدە گیان؛
ئەم هەموو نهێنیەی سەبارەت بە ڕۆژی لەدایک بوونەکەت، تەواو بێزاری کردووم. وام لێهاتووە ڕۆژانە چەند جارێک دژ بە ویستی خۆم دەوەستمەوە و زۆر لە خۆم دەکەم، نەبا تەلەفونت بۆ بکەم و هەموو شتێکت بۆ باس بکەم. ئەمە شتێکە کە گەورەتر و گەورەتر دەبێت. کاتێکیش شتێک لە ناوەوەماندا هەر گەورەتر ببێت، ئیدی سەختە بتوانین دەستی بەسەردا ڕابگرین.«

**سۆفیا نامەیەکی نوێی لە ئەلبێرتۆوە پێگەیشت. دەربارەی یەهودیەکان و یۆنانیەکان و بازنەی ئەو دوو کەلتورە گەورەیە بوو. هیلدە شادمان بوو کە مێژوو لە ڕوانگەیەکی تێرو تەسەلەوە ببینێت. هەرگیز لە قوتابخانەدا بەو جۆرە فێرنەدەکران، لەوێدا جگە لە وردەکاری وشک زیاتر، هیچی تریان نەدەخوێند. کاتێکیش لە خوێندنەوە بووەوە، تەواو لە ڕوانگەیەکی ترەوە تەماشای مەسیح و ئاینی مەسیحی دەکرد.**

**وتەکەی گۆتەشی زۆر بەلاوە جوان بوو کە دەڵێت؛ «ئەو کەسەی لە مێژووی سێ هەزار ساڵەی مرۆڤ بەئاگا نەبێت، تەنها بۆ ورگی دەژی.»**
**بەشی دواتر بە پارچەیەک کارتۆن دەستی پێکرد کە بە پەنجەرەی چێشتخانەکەی ماڵی سۆفیاوە نووسا. بێگومان کارتێکی جەژنە پیرۆزەی نوێ بوو کە بۆ هیلدە ڕەوانەکرابوو؛**

»هیلدە گیان! نازانم لە کاتی خوێندنەوەی ئەم کارتەدا ڕۆژی لەدایک بوونتە یان نا. هەرچۆنێک بێت هیوادارم زۆری بەسەردا تێنەپەڕیبێت. خۆت دەزانیت، کاتێک لای سۆفیا یەک دوو هەفتە تێدەپەڕێت، ئیتر مەرج نیە لای ئێمەش هەمان کات ڕابووڕێت. خۆشم ئێوارەی جەژنی یۆحەنا دەگەمەوە ماڵەوە. ئەوجا هیلدە گیان لەسەر جۆلانەی ناو باخەکە دادەنیشین و تەماشای دەریا دەکەین. وەک دەزانیت باسی زۆرمان هەیە تاوتوێیان بکەین.«

**پاشان ئەلبێرتۆ تەلەفونی بۆ سۆفیا کرد؛ ئەوە یەکەمین جار بوو کە سۆفیا گوێی لە دەنگی ئەو بێت.**

»ـ زیاتر وا دێتە بەر گوێم کە باسی شەڕ بکەیت؟
ـ پێم خۆشە زیاتر ناوی بنێم شەڕی فیکری. دەبێت هەوڵدەین پێش ئەوەی مێجەر بگەڕێتەوە لیللەساند، سەرنجی هیلدە ڕاکێشین و بیهێنینە ڕیزی خۆمان.«

بەم جۆرە سۆفیا و ئەلبێرتۆ یەکتر دەبینن، ئەو جل و بەرگی قەشەیەکی سەدەکانی ناوەڕاستی لەبەردایە و لە کڵێسە کۆنەکەدا چاوەڕوانیەتی.
وای، کڵێسە!... هیلدە تەماشای کاتژمێرەکەی کرد، یەک و چارەکە! بە تەواوەتی کاتی لەبیر چوبووەوە.
دەی... ئاساییە گەر لە ڕۆژی لەدایک بوونیدا خۆی لە کڵێسە بدزێتەوە. بەڵام لەلایەکی تریشەوە خەریک بوو شتێک بێزاری دەکرد؛ هیلدە ئەو هەموو پیرۆزبایی کردنەی بەلاوە بێمانا بوو... بەڕاست، خۆ ئەو هەمیش پیرۆزبایی زۆری لێدەکرێت.
پاش کەمێک گەڕایەوە سەر بابەتەکەی و گوێی بۆ گوتارە درێژەکەی ئەلبێرتۆ ڕاگرت. ئەو زۆر بە ئاسانی دەوری قەشەکەی دەبینی.
پاشان گەیشتە سەر ئەو شوێنەی کە سۆفیا خۆی نیشانی هیلدەگارد دەدات، لێرەشدا دیسانەوە ناچاربوو بگەڕێتەوە سەر فەرهەنگەکەی.
بەڵام ئەم جارەیان هیچ شتێکی دەربارەی سۆفیا و هیلدەگارد نەدۆزیەوە. هەروا نەبووە؟ هەموو جارێک کە باس لە ئافرەت دەکرێت یان شتێک کە پەیوەندی بە ئافرەتەوە هەیە، ئیتر فەرهەنگەکەی تەواو لاڵ دەبێت و هیچی پێ ناڵێت. بڵێیت فەرهەنگەکە لەلایەن «کۆمەڵەی پاراستنی پیاوەوە» سانسۆر نەکرابێت؟
«هیلدەگارد بینجین» هەم نووسەر و ڕاهیبە و هەم زانای ڕووەک و لێکۆڵەرەوەی سروشتیش بووە. لە سەرو ئەوەشەوە لەماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا وەک سومبولێک وابووە بۆ ڕۆڵی نزیکی ئافرەت لە سروشتەوە –لە ڕاستیدا لە زۆربەی زانستەکاندا. بەڵام تەنانەت یەک دێڕیشی لە فەرهەنگەکەدا لەسەر نەنووسراوە! جێگەی شەرمە!

**هیلدە هەرگیز نەیبیستبوو کە خودا «لایەنی مێینەشی» هەیە، یاخود خودا خاوەنی «سروشتی دایکانەشە». بە هەرحاڵ پێی دەگوترێت سۆفیا —بەڵام دیسانەوە ئەویش لە فەرهەنگەکەدا تەنانەت دێڕێکیشی پێ ڕەوا نەبینراوە. نزیکترین بابەت کە دەیتوانی بیدۆزێتەوە، کڵێسەی سۆفیا بوو لە شاری قوستەنتینیە، شاری ئەستەمبوڵی ئێستاکە. کڵێسەکە ناوی «ئاجیا سۆفیا»بووە، واتە «حیکمەتی پیرۆز». هەرچەندە پایتەختێک و چەندین شاژن بەناوی ئەو حیکمەتەوە ناو نراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەک دێڕی لە فەرهەنگەکەدا لەسەر نەنووسراوە کە مانای لایەنی مێینەی خودا دەبەخشێت. باشە ئەمە سانسۆری پێ ناگوترێت؟**

**لەلایەکی تریشەوە بەڕاستی سۆفیا خۆی نیشانی «دیدەی ناوەوەی هیلدە» دا. هیلدە هەمیشە هەستیدەکرد ئەو کچە بە خۆی و قژە ڕەشەکەیەوە دەبینێت...**

**پاش ئەوەی سۆفیا نزیکەی هەموو شەوەکەی لە کڵێسەی ماریادا بردەسەر، گەڕایەوە بۆماڵەوە و لەبەردەم ئەو ئاوێنەیەدا وەستا کە پێشتر لە کوخەکەی مێجەرەوە هێنابووی.**

»زۆر بە ڕوونی سیمای بێڕەنگی خۆی دەدی، کە بە قژە ڕەشەکەی چواردەوری گیرابوو. ئەو قژە لوسەی کە تەنها سروشت دەیتوانی بۆی دابهێنێت. بەڵام لە ژێر دەموچاوی خۆیەوە وێنەی کچێکی تری تێدا بوو.

لە پڕێکدا کچەکەی تر بەو پەڕی ووزەوە هەردوو چاوی بەیەکەوە داگرت. لەوە دەچوو نیشانی بدات کە بە ڕاستی لەناوەوەدایە و بوونی هەیە. هەمووشی تەنها چەند چرکەیەکی خایاند و پاشان بزربوو.«

ئەی هیلدە خۆی، چەند جار لەوەوپێش لەبەردەم ئەو ئاوێنەیەدا دادەنیشت و هەوڵی دەدا وێنەی یەکێکی تر لە پشتیەوە ببینێت؟ بەڵام ئەی باوکی چۆن ئەمەی دەزانی؟ ئایا وێنەی ئەو ژنە قژ ڕەشە نەبوو کە بەدوایدا دەگەڕا؟ لە ڕاستیشدا نەنکە گەورەکەی ئەو ئاوێنەیەی لە ژنە قەرەجێک کڕیبوو...

هیلدە هەستیکرد دەستەکانی بە مەلەفەکەوە کەوتنە لەرزین. هەستیدەکرد بەڕاستی سۆفیا «لەدیوی ئەودیوەوە» لە شوێنێکدا بوونی هەیە.

پاشان گەیشتە ئەو شوێنەی کە سۆفیا خەون بە هیلدە و بیرکێلییەوە دەبینێت. لە خەونەکەیدا هیلدە نە دەیتوانی بیبینێت و نە دەشیتوانی گوێی لە دەنگی بێت، بەڵام پاشان سۆفیا لەسەر پردی بەلەمەکە خاچە ئاڵتونیەکەی دۆزیەوە. دواجاریش کە خەبەریبووەوە، بە ڕاستی خاچەکەی -بەپیتی یەکەمی ناوی هیلدە و هەموو شتەکانی ترەوە- لەژێر جێگاکەیدا دۆزیەوە!

ئەمەیان شایانی ئەوەیە بە باشی بیری لێبکاتەوە... بڵێیت خاچە ئاڵتونیەکەشی ون کردبێت؟ خۆی گەیاندە کۆمۆدیەکەی و قتووی مرواریەکانی دەرهێنا. خاچە ئاڵتونیەکەی تێدا نەمابوو! ئەو خاچەی کە لە ڕۆژی ناو لێنانیدا بە دیاری لە نەنکیەوە وەریگرتبوو!!

کەواتە بەڕاستی ونی کردووە! بەڵام ئەی باوکی چۆن بەمەی زانی، لە کاتێکدا خۆی نەیدەزانی؟

لەوەش زیاتر؛ سۆفیا خەونی بەوەوە بینی کە باوکی هیلدە لە لوبنانەوە دەگەڕێتەوە، بەڵام هێشتام حەفتەیەکی ماوە ئەوە ڕووبدات. بڵێیت خەوەکەی سۆفیا پێشبنی بێت؟ یان باوکی مەبەستی

ئەوەیە کاتێک کە دێتەوە، ئەوا سۆفیاش بە شێوەیەک لە شێوەکان لەوێدا دەبێت؟ جارێکیان شتێکی دەربارەی ئەوە نووسیبوو کە لە داهاتوودا کچێکی برادەری نوێ دەناسێ...

لە پڕێکدا زۆر بەڕوونی و بۆ ماوەیەکی کەم، بەتەواوەتی هەستی دەکرد کە سۆفیا لە بوونەوەرێکی لە مەرەکەب و پەڕە دروستکراو زیاترە و بە ڕاستی بوونی هەیە.

## سەدەی ڕۆشنگەری «Age Of Enlightenment»
## ...لە شێوەی دەرزی دروستکردنەوە هەتا شێوەی تۆپ داڕشتن...

هیلدە دەستیکرد بە خوێندنەوەی بەشی ڕێنیسانس، بەڵام لە هەمان کاتدا گوێی لێبوو دایکی لە دەرگاکەی دەرەوەڕا دەهاتە ژورەوە. تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد... چواری نیشاندەدا.

دایکی بەپەلە بەسەر پێپلیکانەکاندا سەرکەوت و دەرگاکەی کردەوە؛

ـ ئەوە نەڕۆشتیت بۆ کڵێسە؟

ـ بەڵێ، ڕۆشتم.

ـ ئەی... ئەی چیت لەبەردابوو؟

ـ وەک ئێستا.

ـ جلی خەو؟

ـ ئمم... ڕۆشتم بۆ کڵێسەی ماریا.

ـ کڵێسەی ماریا؟

ـ کڵێسەیەکی گەورەی بەردینی سەدەکانی ناوەڕاستە.

ـ هیلدە!

مەلەفە گەورەکەی لەسەر کۆشی دانا و تەماشایەکی دایکی کرد؛

ـ کاتم لەبیر چووەوە دایە... بمبوورە، بەڵام شتێکی تەواو سەرنجڕاکێش دەخوێنمەوە.

دایکی ناچارانە پێکەنی و هیلدە لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛

ـ کتێبێکی ئەفسوناویە.

ـ بەڵێ، بەڵێ... جارێکی تریش ڕۆژی لەدایک بوونت پیرۆز بێت هیلدە!

ـ هۆهۆوو... خەریکە ئەم هەموو پیرۆزباییانە بێزارم دەکات.

ـ بەڵام من هێشتام... باشە، من دەڕۆم کەمێک ماندوویی خۆم دەردەکەم و ئەوسا دەستدەکەم بە نان دروستکردن. شلیکی نوێم کڕیووە.
ـ بەڵێ، منیش بۆ خۆم دەخوێنمەوە.
ئەوجا دایکی ونبوو و هیلدەش لەسەر خوێندنەوەکەی بەردەوام بوو.
سۆفیا بەدوای هێرمسدا بەناو شاردا ڕۆشت. لەناو دالانەکەی ماڵی ئەلبێرتۆدا، کارتێکی نوێی لە لوبنانەوە بینی. بەرواری **6/15**ی لێدرابوو.
تەنها ئێستاکە لە سیستمی بەرواردانانی ئەو کارتانە تێگەیشت. ئەو کارتانەی پێش **6/15** نێردرابوون، هەموویان کۆپی ئەو کارتانە بوون کە هیلدەش بەدەستی گەیشتبوو. بەڵام ئەوانەی بەرواری ئەمڕۆیان لێدرابوو، ئەوا لەکاتی خوێندنەوەی فایلەکەدا بەدەستی دەگەیشتن.

»ئازیزم هیلدە؛ ئێستاکە سۆفیا دێتە ماڵی مامۆستای فەلسەفەکەوە. بەم زوانە تەمەنی ئەو دەبێتە پانزە ساڵ، بەڵام تۆ دوێنێ بوویتە پانزە ساڵ هیلدە گیان... یان ئەمڕۆ دەبیت؟ ئەگەر ئەمڕۆیە، ئەوا بەلایەنی کەمەوە ئێستاکە دەبێت ئێوارە درەنگانێک بێت لای ئێوە، خۆت دەزانیت کاتژمێرەکانمان وەک یەک ڕانابوورن.«

هیلدە ڕستەکانی ئەلبێرتۆی خوێندەوە کە بۆ سۆفیای نووسیبوو، لەوێدا باسی ڕێنیسانس و زانستی نوێ و ڕاشیونالیستەکانی سەدەی حەڤدە و ئیمپیریستەکانی بەریتانیای بۆ دەکات.
لەگەڵ بینینی هەموو کارتێکی نوێشدا، کە باوکی تێهەڵکێشی چیرۆکەکەی کردبوو، دادەچڵەکی. بۆ نمونە کاتێک کە دەیخستە ناو

دەفتەری دارِشتنەکەی سۆفیاوە، یان لەناو تویکڵی مۆزێکدا دایدەنا، یان کاتێک خۆی لەناو کۆمپیوتەرەکەدا دەشاردەوە. زۆر بەئاسانیش وای لە ئەلبێرتۆ دەکرد «زمانی تەتەڵە بکات» و لەبری سۆفیا بڵێت هیلدە. لە هەموو شتێک سەیرتریش ئەوە بوو کە وای لە هێرمس کرد بڵێت «ڕۆژی لەدایک بوونت پیرۆزبێت هیلدە.»!

هیلدەش هەمان بڕوای ئەلبێرتۆی هەبوو کە دەیگوت ئەو تەواو زیادەڕۆیی دەکات، کاتێک خۆی لەگەڵ خودا و ئاگاداری خوداییدا بەراورد دەکات. بەڵام ئایا لە ڕاستیدا هیلدە لەگەڵ کێدا تەبابوو؟ ئایا باوکی نیە کە ئەو جۆرە لۆمەکردنانە دەخاتە سەر زاری ئەلبێرتۆ؟ پاشانیش گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بەراوردکردنەکەی بەشێوەیەک لە شێوەکان زۆر خراپ نیە، چونکە باوکی وەک خودایەکی بەتوانا وایە بەسەر جیهانی سۆفیادا.

هیلدەش هەروەک سۆفیا تەواو بە پەرۆش بوو، کاتێک گەیشتە ئەو شوێنەی کە ئەلبێرتۆ دەبوایە باسی بارکێلی بکردایە. ئاخۆ ئێستاکە چی ڕوودات؟ دەمێکە چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە کاتێک دەگەنە سەر ئەم فەیلەسوفە، شتێکی تەواو تایبەتی ڕوودات، بێگومان ئەم فەیلەسوفە نکۆڵی لە بوونی جیهانێکی مادی دەکرد کە لە دەرەوەی ئاگایی مرۆڤدا بوونی هەبێت (وەک دەزانین هیلدە لە فەرهەنگەکەیدا کەمێکی لەسەر خوێندبووەوە!).

بەو جۆرە دەستی پێکرد کە هەردووکیان لەبەردەم پەنجەرەکەدا وەستابوون، فڕۆکەیەکیان بینی کە باوکی هیلدە ناربووی و بەیاخێکی گەورەشی پێوەبوو، لەسەر بەیاخەکە جەژنە پیرۆزەیەکی تری لەسەر نووسرابوو. لە هەمان کاتیشدا «هەورە ڕەشەکان»بەری ئاسمانی شاریان گرتبوو.«

»کەواتە تەواوی پرسیارەکە لەوەدا نیە "کە هەبین یان نەبین"، بەڵکو پرسیارەکە لەوەشدایە کە ئێمە "چی"ن. ئایا بەڕاستی مرۆڤین و لە گۆشت و خوێن پێکهاتووین؟ ئایا جیهانمان لە شتی ڕاستەقینە پێکهاتووە، یان چواردەورمان بەئاگایی گیراوە؟«

**ئاساییە سۆفیا گاز لە نینۆکەکانی بگرێت. هیلدە هەرگیز ئەو خوە خراپەی نەبووە، بەڵام ئێستاکە بەلای ئەوەیشەوە سەیر نیە گەر وەک سۆفیا بکات.**
**لە کۆتایدا ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە؛**

»...بەلایەن ئێمەوە ئەو "ڕۆحە یان ئەو ویستە"ی کە "سۆنگەی هەموو شتێکە"، لەوانەیە باوکی هیلدە بێت«
»ـ مەبەستت لەوەیە کە ئەو وەک جۆرە خوایەک وابووە بۆ ئێمە؟
ـ بەڵێ، بەبێ ئەوەی خۆشی بێتاقەت بکات، بەڵام دەبوایە شەرمی بکردایە!
ـ ئەی هیلدە خۆی چی؟
ـ ئەو فریشتەیەکە سۆفیا.
ـ فریشتە؟
ـ هیلدە ئەو کەسەیە کە "ڕۆح" قسەی لەگەڵ دەکات«

**لەوەبەدواوە سۆفیا ئەلبێرتۆی بەجێهێشت و بەپەلە ڕۆیشتە بەر لێزمەی بارانەکەی دەرەوە. تۆ بڵێیت هەمان باران بێت کە دوێنێ**

**شەو بەسەر بیرکێلیدا باری –تەنها چەند کاتژمێرێک لەپاش ئەوەی سۆفیا بەناو شاردا ڕایکرد؟**

«سبەینێ جەژنی لەدایکبوونمە. بەڕاستی سەختە گەر ڕۆژێک لەپێش ڕۆژی لەدایک بوونی پانزە ساڵەتدا، بۆت دەرکەوێت کە ژیان خەونێکە... لەوە دەچێت لە خەونتدا ملیۆنێک ببەیتەوە و لە پڕێکدا لەکاتی وەرگرتنی پارەکەدا، بۆت دەرکەوێت کە خەونە و هیچی تر.
سۆفیا بەرەوڕووی یاریگا تەڕەکە ڕایدەکرد، دوای کەمێک تارمایی کەسێکی بەدیکرد کە بە ڕاکردن بەرەوڕووی دەهات... تارماییەکە دایکی بوو. چەند جارێک لەوە دەچوو شارەکە بە هەورەبروسکە لەت و پەت ببێت.
کە پێک گەیشتن، دایکی باوەشی پێداکرد و گوتی؛
- کچە بچکۆلەکەم... ئەمە چیە بەسەرماندا دێت؟
- نازانم... لە خەونێکی ناخۆش دەچێت... سۆفیا بەدەم گریانەوە وەڵامی دایەوە»

**هیلدە هەستیکرد چاوەکانی تەڕبوون؛ «پرسیارەکە لەوەدایە؛ بوونم هەیە یان نیمە.»**
**مەلەفەکەی فڕێدایە سەر جێگاکەی و هەستایە سەرپێ. لە ژورەکەدا ماخۆلانی پێکەوتبوو. لە کۆتایدا چووە بەردەم ئاوێنەکە و وەستا، هەر لەوێشدا مایەوە هەتاوەکو ئەو کاتەی دایکی هات و بۆ نانخواردن بانگی کرد... دایکی لەدەرگای دا، ئەو کاتە هیلدە بەهیچ جۆرێک لەیادی نەبوو چەندە لەبەردەم ئاوێنەکەدا مابووەوە. بەڵام دڵنیابوو،**

تەواو دڵنیابوو کە وێنەی ناو ئاوێنەکە هەردوو چاوی بەیەکەوە داگرت.
لەکاتی نانخواردندا، هەوڵیدەدا بەشێوەی منداڵێک ڕەفتاربکات کە دڵی بە جەژنی لەدایک بوونی خۆشە. بەڵام هەمیشە هەر بیری لە سۆفیا و ئەلبێرتۆ دەکردەوە.
ئاخۆ ئێستا چیان بەسەردا بێت، بەتایبەتی پاش ئەوەی کە زانیان هەموو شتێک لە دەستی باوکی هیلدەدایە؟ شتیان زۆر دەزانی، بەڵام خۆ لە ڕاستیدا ئەوەی دەیانزانی هەمووی قسەی قۆڕبوو... چونکە باوکی هیلدە ڕێگەی پێدەدان شتەکان بزانن، وا نیە؟ بەڵام لە هەموو بارێکدا گرفتەکە هەر هەمان شتە؛ ئێستاکە سۆفیا و ئەلبێرتۆ «دەزانن» بابەتەکان بە چ شێوەیەک پێکەوە گرێدراون، کەواتە خەریکە دەگەنە کۆتایی ڕێگاکە.
لە پڕێکدا بە خەیاڵیدا هات کە لەوانەیە بابەتەکە بەلایەن جیهانی خۆشیەوە هەر هەمان شت بێت، ئەو کاتە خەریکبوو پاروی پەتاتەکە لە قوڕگی بگیرێت. مرۆڤایەتی هەمیشە لەگەڵ تێگەیشتنی یاساکانی سروشتدا، بەردەوام هەنگاوێک دەچێتە پێشەوە. بڵێیت پاش ئەوەی کە فەلسەفە و زانست دواهەمین بەردی بیناکە دادەنێن، ئیتر مێژوو هەروا بۆ هەتا هەتایە هەر بەردەوام بێت؟ ئایا پەیوەندیەک نیە لە نێوان پێشکەوتنی فیکر و زانست لەلایەک و کاریگەری خانوی شوشەیی و فەوتاندنی دارستانەکان لەلایەکی ترەوە؟ کەواتە لەوانەیە هێندە بێ ئەقڵی نەبێت کە پەرۆشی بەردەوامی مرۆڤ بۆ زانیاری، ناو بنێین «گوناحە گەورەکە»؟

گەورەیی و ترسناکی پرسیارەکە وای لە هیلدە کرد هەوڵی ئەوەبدات لە بیری خۆی بەرێتەوە. بێگومان گەر لەسەر خوێندنەوەی دیاریەکەی باوکی بەردەوام بێت، ئەوا زیاتر تێدەگات.
پاش خواردنی شلیکی ئیتاڵی، دایکی لەسەر گۆرانی ڕۆژی لەدایک بوون بەردەوامبوو، ئەوجا گوتی؛
ـ ئێستاکەش بەدڵی تۆ دەکەین... چیت پێخۆشە؟
ـ دەزانم کەمێک نائاسایی و سەیرە، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها حەز دەکەم لەسەر خوێندنەوەی دیاریەکەی باوکم بەردەوام بم.
ـ بەڵام وریابە تێکت نەدات.
ـ بە هیچ جۆرێک.
ـ دەتوانین پاشان لەگەڵ تەماشاکردنی تەلەفیزۆندا، پیتزایەکیش بخۆین.
ـ بەڵێ، با بزانین.
هیلدە شێوەی قسەکردنی سۆفیا و دایکی بیرکەوتەوە. بڵێیت باوکی هەندێ شتی لە دایکی هیلدەوە وەرگربێت و لە چیرۆکەکەیدا هۆنیبێتیەوە، پاشانیش بە دایکی سۆفیای چوواندبێت؟ هەرچۆنێک بێت، هیلدە وای بەباش زانی بەلایەنی کەمەوە ئەمڕۆکە باسی ئەو کەروێشکە سپیە نەکات، کە لە کڵاوە درێژەکەی گەردوونەوە دەیهێننە دەرەوە. بەڵام پێش ئەوەی لەسەر مێزی نانخواردنەکەی هەستێت، ڕووی کردە دایکی و گوتی؛
ـ بە ڕاست...
ـ چی؟
ـ نازانم خاچە ئاڵتونیەکەم چی لێهاتووە.
دایکی بە چاوێکی پڕ مەبەستەوە تەماشایەکی کرد.

**ـ چەند حەفتەیەک لەمەوبەر لەسەر پردی بەلەمەکان دۆزیمەوە. دەبێت لێت کەوتبێت، سەرقاڵ!**
**ـ بە باوکمت وتووە؟**
**ـ لەیادم نیە... بەڵێ پێم وابێت...**
**ـ ئەی ئێستا لە کوێدایە؟**
**دایکی هەستا قتووی مرواریەکانی خۆی بهێنێت. کەمێک دواتر هیلدە گوێی لە هاوارێکی گەورەبوو کە لە ژوری نووستنەکەی دایکیەوە دەهات.**
**ـ بە ڕاستی ئا ئێستاکە بۆم نادۆزرێتەوە.**
**ـ هەر خۆم زانیم.**
**هیلدە باوەشێکی بە دایکیدا کرد و بە ڕاکردن گەڕایەوە ژورەکەی خۆی. ئەوجا دیسانەوە لەسەر خوێندنەوەی سۆفیا و ئەلبێرتۆ بەردەوام بوو. هەروەک جاری پێشووش لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت و مەلەفە گەورەکەشی لە باوەشیدا دانا؛**

ڕۆژی دواتر سۆفیا ئەو کاتە خەبەری بووەوە کە دایکی هاتە ژورەکەیەوە. پاکەتێکی گەورەی پڕ لە دیاری بەدەستەوە گرتبوو. لەناو بتڵێکی بەتاڵی ساردیشدا، ئاڵایەکی نەرویجی دانابوو.
ـ جەژنی لەدایک بوونت پیرۆزبێت سۆفیا!
سۆفیا چاوە خەواڵوەکانی کردەوە. دەیویست ڕووداوەکانی دوێنێ شەو بهێنێتەوە یادی خۆی. بەڵام وەک پارچە پارچەی یاریەک دەهاتە بەرچاوی. یەکێک لە پارچەکان ئەلبێرتۆ بوو، یەکێکی تر هیلدە و مێجەربوو. یەکێکی تر بارکێلی و دانەیەکی دی بیرکێلی بوو. لە هەموویان ڕەشتریش هەورەگرمەکان و لێزمەی بارانەکە بوو. بارانەکە

تووشی شێوە دەمار شێواندنێکی کردبوو. دوێنێ، دایکی کەمێک لەشی شێلابوو و وەک منداڵ خستبوویە ناو جێگاوە، کوپێک شیری گەرم و هەنگوینیشی کردبوو بە قوڕگدا. پاش کەمێک یەکسەر خەوی لێکەوتبوو.

ـ پێم وابێت ماوم... بە تێکشکاوی و بە پرتەپرتێکەوە گوتی.

ـ بێگومان ماویت! ئەمڕۆکە تەمەنت پانزە ساڵە.

ـ تەواو دڵنیایت لەوە؟

ـ تەواو دڵنیام. چ دایکێک هەیە ڕۆژی لەدایک بوونی تاقانەکەی لەیاد نەبێت؟ 1975/6/15... کاتژمێری یەک و نیوی بەیانی بوو سۆفیا. بێگومان بەختەوەرترین ساتی ژیانم بوو.

ـ دڵنیایت لەوەی کە هەر هەمووی خەون نیە؟

ـ بەلایەنی کەمەوە دەشێ خەونێکی خۆش بێت... تەماشا کە!

کارتۆنە گەورەکەی بە دیاریەکانەوە لەسەر کورسیەکە دانا و بۆ ماوەیەک ڕۆیشتە دەرەوە. ئەمجارەیان بە سینیەک خواردن و ساردیەوە خۆی کردەوە بەژوردا و لەبەر پێی سۆفیادا داینا.

پاشان وەک هەموو جەژنی لەدایک بوونێک، داب و نەریتی تایبەتی دەستی پێکرد و وەک هەموو جارێکیش دایکی گەڕایەوە سەر ژانەکەی پانزە ساڵ لەمەوبەری... دیاریەکان کرانەوە، دایکی سێتێکی تێنسی سەر زەوی بەدیاری بۆ هێنابوو. سۆفیا هەرگیز تێنسی نەدەکرد، بەڵام یاریگایەکی تێنس چەند خولەکێک لە شەقامەکەیانەوە دوربوو. لە باوکیشیەوە تەلەفیزۆنێکی بە دیاری بۆ هاتبوو کە ڕادیۆی«F.M» ی تێدابوو. شاشەکەی لە ڕووبەری وێنەیەکی ئاسایی گەورەتر نەبوو. ئەوجا دیاری پورەکانی و برادەرە نزیکەکانی خێزانەکەیانی کردەوە.

پاش کەمێک دایکی گوتی؛

- بە بڕوای تۆ باشتر نیە گەر ئەمڕۆ لە ماڵەوە بم و نەڕۆمە سەر کار؟
- نا، بۆ؟
- دوێنێ بە تەواوەتی لەسەر خۆت نەبوویت. ئەگەر هەر بەم جۆرەش بڕوات، ئەوا پێم باشە سۆراغی پزیشکێکی دەروونی بکەین.
- من پێم وانیە پێویست بێت.
- تەنها بە هۆی هەورەگرمەکانەوە بوو، یان بە هۆی ئەلبێرتۆشەوە بوو؟
- ئەی خۆت چی؟ تۆ گوتت «ئەمە چیە بەسەرماندا دێت، کچە بچکۆلەکەم؟»
- بیرم لەوە دەکردەوە کە تۆ دەچیتە ناو شار و لەگەڵ مرۆڤێکی سەیردا دادەنیشیت. لەوانەیە خەتای من بێت کە...
- من لە کاتی بەتاڵیمدا دەمەوێت خولێکی چکۆلەی فەلسەفی بخوێنم، ئەمەش «خەتای» کەس نیە. بڕۆ بۆ سەر کار، ئێمەش دەبێت کاتژمێری دە لە قوتابخانە بین، ئەویش تەنها کارت وەرگرتن و ئاهەنگ گێڕانێکی بچکۆلە دەبێت و هیچی تر.
- دەزانیت چەند وەردەگریت؟
- بەلایەنی کەمەوە لە جاری پێشوو باشتر دەبێت.
کەمێک بەسەر ڕۆیشتنی دایکیدا ڕابوورد و تەلەفونکەیان زەنگی لێدا.
- سۆفیا ئامۆنسنم، بەڵێ.
- ئەلبێرتۆ قسە دەکات.
- ئاه ...
- دوێنێ مێجەر حەشری پێکردین.
- تێناگەم مەبەستت چیە؟
- مەبەستم لە ڕەهێڵەکەیە سۆفیا.

ـ نازانم باوەڕ بە چی بکەم.
ـ ئەوە یەکەمین ئەرکی سەرشانی فەیلەسوفی ڕاستەقینەیە، دەزانیت؟ شانازیت پێوە دەکەم، کە بەماوەیەکی کەم هێندە زۆر فێربوویت.
ـ دەترسم هیچ شتێک ڕاستی نەبێت.
ـ ئەوە پێی دەگوترێت «دڵە ڕاوکێی هەبوون» و زۆر جاریش دەبێتە سەرەتای مەعریفەیەکی نوێ.
ـ پێم وابێت پێویستم بە پشویەک هەیە لە کۆرسەکەدا.
ـ لەم کاتەدا باخچەکەتان بۆقی زۆری لێیە؟
سۆفیا لەبەر پێکەنین خۆی بۆ نەگیرا و ئەلبێرتۆش بەردەوام بوو؛
ـ پێم وابێت باشترە بەردەوام بین. بە ڕاست... پیرۆزە. ناچارین دەبێت پێش جەژنی یۆحەنا کۆرسەکەمان تەواو کردبێت، ئەوە دواهەمین هیوامانە.
ـ دواهەمین هیوا! هیوای چی؟
ـ باش دانیشتوویت؟ وەک دەزانی باسکردنی ئەم بابەتە کاتێکی باشی دەوێت.
ـ بەڵی باش دانیشتووم.
ـ دیکارتت لە یادە؟
ـ «من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم.»
ـ لە ڕوانگەی ئەم میتۆدی گومانەمانەوە، لە کاتی ئێستاکەدا لەسەر ڕێگایەکی داخراوداین. تەنانەت ناشزانین کە بیردەکەینەوە یان نا. لەوەیە ئەمە مانای ئەوە بێت کە ئێمە بریتیبین لە ئەندێشە، ئەمەش لە ڕاستیدا لەگەڵ خودی بیرکردنەوەدا تەواو جیاوازە. بێگومان هەقی خۆمانە لەو بڕوایەدابین کە ئێمە بەرهەمی خەیاڵی باوکی هیلدەین...

بەکورتیەکەی ئێمە جۆرە دیاریەکی خۆشی ڕۆژی لەدایک بوونی کچەکەی مێجەرین، تێدەگەیت؟
- بەڵێ...
- بەڵام لێرەدا حاڵەتێکی دژ بە نووسراوەکانی خۆشیمان نیشان دەدات؛ ئەگەر ئێمە لە خەیاڵ چنرابین، کەواتە بە هیچ جۆرێک هەقی ئەوەمان نیە «باوەڕ» بە هیچ شتێک بکەین. کەواتە ئەم گفتوگۆیەی ئێستاکەش تەنها خەیاڵێکە و هیچی تر.
- کەواتە هیچ جۆرە ویستێکی سەربەستمان نیە! واتە هەرچی شتێک کە دەیکەین و دەیڵێین، بەپێی پیلان و نەخشەی مێجەر دەڕوات بەڕێوە. کەواتە زۆر باشترە گەر تەلەفونکەش دابخەینەوە.
- نەخێر، تۆ بەم جۆرە شتەکان زۆر سادە دەکەیتەوە.
- کەواتە فەرموو بۆم ڕوونبکەرەوە.
- لەو بڕوایەدایت مرۆڤێک بتوانێت نەخشەی هەموو خەونەکانی دابڕێژێت؟ پێدەچێت ڕاستبێت کە باوکی هیلدە ئاگای لە هەموو کردەوەکانمان بێت. لەبەرئەوەی ڕاکردن لە ئاگایی، وەک ڕاکردن لە سێبەرەکەت سەختە. بەڵام لە هەمان کاتدا دڵنیا نین کە مێجەر پێشبینی هەموو ڕووداوەکان بکات، منیش ڕێک لەم خاڵەوە خەریکی دانانی پیلانێکم. چونکە ڕێی تێدەچێت لە دواهەمین چرکەدا بڕیاری ڕووداوەکان بدات —واتە ڕێک لە کاتی دارشتنی چیرۆکەکەیدا. مەبەستم ئەوەیە، ڕێک لەو ساتانەدا دەتوانین وا بیهێنینە بەرچاومان کە تا ڕادەیەک خاوەنی بڕیاری خۆمانین کە چی بکەین و چی بڵێین. بێگومان ئەم دەست پێشکەریەشمان تەنها چەند ئەندێشەیەکە و لەچاو دەسەڵاتی گەورەی مێجەردا، تەواو لاوازە. بە دڵنیاییەوە دەسەڵاتمان بەسەر کاریگەریە دەرەکیەکاندا نیە، بۆ نمونە وەک

قسەکردنی سەگەکە و پەیامی ناو توێکڵی مۆزەکە و بڕیاردانی ڕەهێڵەکە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت نکۆڵی لەو ڕاستیە بکەین، کە لە هەمان کاتیشدا خاوەنی ویستی خۆمانین، ئەگەرچی زۆر لاوازیش بێت.

- چۆن چۆنی ئەمە ڕێی تێدەچێت؟

- بێگومان مێجەر زانیاریەکی تەواوی دەربارەی جیهانە پچکۆلەکەمان هەیە، بەڵام ئیدی ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە توانایەکی پەتی (موتڵەق) هەبێت. دەبێت هەوڵ بدەین ژیانی خۆمان بە شێوەیەک بژین، هەروەک ئەوەی ئەو بوونی نەبێت.

- وابزانم لە مەبەستت تێدەگەم.

- ئەگەر تەنها ئەوەندە بتوانین بەدەستی خۆمان شتێک بکەین، بەمەرجێک نەهێڵین مێجەر هەست بە هیچ بکات، ئەوا بە ڕاستی دەتوانین ناوی بنێین هونەرێکی باڵا.

- کارێکی ئاوها چۆن ڕێی تێدەچێت، بەتایبەتیش ئەگەر لە ڕاستیدا بوونمان نەبێت؟

- کێ دەڵێت بوونمان نیە؟ پرسیارەکە لەوەدا نیە کە هەبین یان نا، بەڵکو لەوەدایە کە ئێمە کێین و چین. ئەگەرچی دان بەوەشدا بنێین کە ئێمە تەنها چەند ئەندێشەیەکی ئاگایی مێجەرین و هیچی تر، بەڵام ئیتر ئەوە مانای ئەوە نیە بوونە چکۆلەکەی خۆمان لێبسندرێتەوە.

- نە ویستی سەربەستیشمان؟

- من لەسەر بابەتەکە کاردەکەم، سۆفیا.

- بەڵام بێگومان باوکی هیلدە ئاگای لەوەیە کە «کاری لەسەر دەکەیت.»

ـ بێگومان، بەڵام ئەو خودی پیلانەکەم نازانێت. هەوڵدەدەم خاڵێکی "ئارکیمیدز"ی بدۆزمەوە.
ـ خاڵی "ئارکیمیدز"ی چیە؟
ـ "ئارکیمیدز" زانایەکی هیللینیسکی بوو. ئەو دەیگوت؛ «خاڵێکی نەگۆڕم بدەرێ، تا من جیهانت بۆ بلەرزێنمەوە». ئێمەش پێویستیمان بە خاڵێکی ئاوهایە تاوەکو لە گەردوونی ناوەوەی مێجەر خۆمان بدزینەوە.
ـ پڕۆژەیەکی ئاسان نیە!
ـ بەڵام ئەو کاتە دەتوانین خۆمان قورتاربکەین، کە کۆرسی فەلسەفەکەمان تەواو کردبێت. تاوەکو ئێستاکە فشارێکی زۆری لەسەرمانە و لەوەش دەچێت بڕیاری دابێت من ئەرکی ڕێنومایییت بگرمە ئەستۆ، هەر لە درێژایی سەدەکانەوە هەتاوەکو کاتی ئێستاکەمان. بەڵام تەنها چەند ڕۆژێکمان بەدەستەوە ماوە، پاش ماوەیەک لە شوێنێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە سواری فڕۆکەیەک دەبێت و دەگەڕێتەوە... ئەگەر پێش گەڕانەوەی بۆ بیرکێلی (*ماڵەوەیان.و) نەتوانین خۆمان لە تۆڕی فەنتاسیای ڕزگاربکەین، ئەوا... بەڵێ، ئەوا وندەبین.
ـ تۆ دەمترسێنیت...
ـ لەپێش هەموو شتێکدا دەبێت گرنگترین زانیاریت سەبارەت بە سەدەی ڕۆشنگەری فەرەنسیت بدەمێ، ئەوجا پێشئەوەی بێینە سەر ڕۆمانتیک، بەکورتی دەست دەکەین بە فەلسەفەی کانت. بەتایبەتی هیگڵ بەلای هەردووکمانەوە دەبێتە جێ پێیەکی گرنگ، لەوێشەوە دەچێنە سەر کیاگەگۆ کە ڕەخنەی لە فەلسەفەی هیگڵ دەگرت. دەبێت چەند وشەیەکیش دەربارەی مارکس و داروین و فرۆید بڵێین. ئەگەر

بشتوانین باسەکەمان بە سارتەر و فەلسەفەی بوونگەری (وجودی) کۆتایی پێ بهێنین، ئەوا پیلانەکەمان سەرکەوتوو دەبێت.
ـ ئەمە بەرنامەیەکی گەورەیە بۆ تەنها حەفتەیەک.
ـ لەبەرئەوە دەبێت هەر ئێستاکە دەستپێبکەین، دەتوانیت ئێستاکە بێیت بۆ ئێرە؟
ـ ناچارم دەبێت سەرێک لە قوتابخانە بدەم. ئەمڕۆکە ئاهەنگێکی بچکۆلەمان هەیە و شەهادەش وەردەگرینەوە.
ـ لێی گەڕێ! ئەگەر ئێمە تەنها ئاگایی پەتی بین، ئەوا تامی شیرینی و ساردی خواردنەوە تەنها خەیاڵێک دەبێت و هیچی تر.
ـ بەڵام شەهادەکەم...
ـ گوێبگرە سۆفیا، یان ئەوەتا لە گەردوونێکی قەشەنگ و لەسەر یەکێک لە ئەستێرەکانی سەدان ملیارد گەلەهەسارەدا (مەجەڕە) دەژیت، یان تەنها چەند ئەندێشەیەکی کەمی ئاگایی مێجەر دەبیت و هیچی تر، تۆش باسی شەهادە دەکەیت! شەرم بکە باشترە.
ـ ببوورە.
ـ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باشتر وایە پێش ئەوەی بێیتە ئێرە، سەرێک لە قوتابخانە بدەیت. ئەگەر دواهەمین ڕۆژی قوتابخانە خۆت بدزیتەوە، ئەوا لەوانەیە کاریگەریەکی خراپی لەسەر هیلدە هەبێت. هەرچەندە ئەمڕۆ ڕۆژی لەدایک بوونیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەچێت بۆ قوتابخانە، چونکە وەک دەزانیت ئەو فریشتەیە.
ـ کەواتە ڕێک دوای قوتابخانە دێم بۆ لات.
ـ دەتوانین لە کوخەکەی مێجەر یەکتر ببینین.
ـ کوخەکەی مێجەر؟
ـ تک!...

هیلدە مەلەفەکەی لەسەر کۆشی دانا. بەم شێوەیە باوکی وایلێکرد هەست بە گوناح بکات، لەبەرئەوەی خۆی لە دواهەمین ڕۆژی قوتابخانە دزییەوە... زۆرزان!
بۆ ماوەیەک بیری لە پیلانەکەی ئەلبێرتۆ دەکردەوە... ئاخۆ چ پیلانێکی ڕزگاربوونی لە خەیاڵدا بێت؟ بۆ تەماشایەکی دواهەمین لاپەڕە نەکات؟ نا، ئەوساکە خۆی دەخڵەتێنێت، باشتر وایە بەپەلە دەست بکاتەوە بە خوێندنەوە.
هیلدە لە خاڵێکی گرنگدا لەگەڵ بڕواکەی ئەلبێرتۆدا بوو؛ ڕاستە باوکی چارەنووسی سۆفیا و ئەلبێرتۆی وەک بیرۆکەیەکی چنراو لە خەیاڵدا هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو کاتەی دادەنیشێت و دەینووسێتەوە بەتەواوەتی پێشبینی هەموو ڕووداوەکان ناکات. لەوانەیە زۆر بە پەلە شتێکی نووسیبێ و پاش ماوەیەکی دورودرێژ ئەوجا هاتبێتەوە سەری و تەماشای کردبێتەوە. ڕێک ئەو کاتانەشە کە تا ڕادەیەک ئازادی بە سۆفیا و ئەلبێرتۆ دەبەخشێت.
دیسانەوە هیلدە هەستیدەکرد کە سۆفیا و ئەلبێرتۆ لە ڕاستیدا بوونیان هەیە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت؛ ڕاستە دەریاکە تەواو هێمنە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە کە لە قوڵایدا هیچ شتێک ڕوونادات.
بەڵام بۆ بیری لەوە دەکردەوە؟
بەلایەنی کەمەوە ئەندێشەیەکی وا نەبوو کە لەسەر ڕووکەشی دەریاکەدا بجوڵێتەوە.

هەروەکو هەموو قوتابیەکی تر کاتێک کە ڕۆژی لەدایک بوونیان دێت، قوتابیەکانی دی پیرۆزباییان لە ڕۆژی لە دایک بوونی سۆفیا کرد.

ئاهەنگ گێڕان و شەهادە دابەشکردنی پۆلیش، هێندەی تر پۆلەکەی خۆشکرد و سەرنجی قوتابیانی بەلای سۆفیادا ڕاکێشا .
هەر کە ئاهەنگ تەواو بوو و مامۆستا گوتی پشووی هاوینێکی خۆشتان بۆ دەخوازم، سۆفیا بەپەلە بۆی دەرچوو. یۆرون هەوڵیدا بیهێڵێتەوە، بەڵام بێسوود بوو. سۆفیا هاواریکرد و گوتی «کارێکی گرنگم هەیە و دەبێت بەپەلە بڕۆم.»
لەناو سندوقی پۆستەکەیاندا دوو کارتی نوێی بەرچاوکەوت کە لە لوبنانەوە هاتبوون. لەسەر هەردوو کارتەکە بە چاپ نووسرابوو؛ «جەژنی لە دایکبوونی پانزە ساڵەت پیرۆزبێت»، لەو جۆرە کارتانە بوو کە لە بازاڕەکاندا هەبوون.
یەکێکیان بۆ «هیلدە میوللە کنەی، لە ڕێگەی سۆفیا ئامۆنسنەوە...» هاتبوو، ئەوی تریشیان بۆ سۆفیا خۆی هاتبوو. هەردوو کارتەکەش بەرواری 6/15ی لێدرابوو، مۆری نەتەوە یەکگرتووەکانیشیان پێوەبوو.
سۆفیا ئامۆنسن، ئەمڕۆکە جەژنی لەدایک بوونی تۆشە، بەم بۆنەیەوە لە دڵەوە پیرۆزبایت لێدەکەم. دونیایەک سوپاس بۆ هەموو ئەو شتانەی تا ئێستاکە بۆ هیلدەت کردووە... لەگەڵ سڵاوی ئازیزانەی مێجەر «ئەلبێرت کنەی»دا.
سۆفیا لە ڕاستیدا نەیدەزانی دڵی بە کارتەکەی باوکی هیلدە خۆشبێت یان نا. چونکە ئەوە یەکەمین جاربوو پۆستکارت بۆ ئەویش بنێرێت.
لەسەر کارتەکەی هیلدەش نووسرابوو؛
کچە نازدارەکەم، نازانم ئێستاکە کاتژمێر چەندە و چ ڕۆژێکیشە لە لیللەساند، بەڵام هەروەک لەوەو پێش گوتم، ئەوە هیچ ڕۆڵێکی گەورە نابینێت. ئەگەر باشت بناسم، هێشتام هەر دەخوێنیتەوە، لەبەرئەوە دەتوانم لێرەوە دواهەمین یان پێش دواهەمین پیرۆزبایت بۆ بنێرم.

بەڵام نابێت تا درەنگانێک دابنیشیت! پاش ماوەیەک ئەلبێرتۆ باسی فیکری سەدەی ڕۆشنگەری فەڕەنسیت بۆ دەکات. لەباسەکەیدا گرنگی بەم حەوت خاڵەی خوارەوە دەدات؛
یەک؛ هەڵگەڕانەوە لە دەسەڵات.
دوو؛ ڕاشیونالیزم.
سێ؛ فیکری سەدەی ڕۆشنگەری.
چوار؛ گەشبینی کەلتوری.
پێنج؛ گەڕانەوە بۆ سروشت.
شەش؛ مرۆڤ دۆستی ئاینی مەسیحی.
حەوت؛ مافەکانی مرۆڤ.

## لەوەدەچێت هێشتام بەردەوام چاویان لێ خافڵ نەکات.

سۆفیا هاتەماڵەوە و شەهادەکەی بە هەموو پلە بەرزەکانەوە لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانا. پاشان لە پەرژینەکەوە تێپەڕی و خۆی کرد بەناو دارستانەکەدا.
دیسانەوە دەبوایە بە بەلەم دەریاچە بچکۆلەکەی ببڕیایە. بەڵام کاتێک گەیشتە ئەوبەر، ئەلبێرتۆ لەسەر قادرمەکانی بەردەرگاکە دانیشتبوو... بەدەستی ئاماژەی بۆ کرد کە لە تەنیشتیەوە دابنیشێت.
ئاو و هەوا خۆش بوو، بەڵام شێیەکی ناخۆش لە دەریاچە بچکۆلەکەوە هەڵدەسا. لەوە دەچوو هێشتام بە تەواوەتی لە پاش ڕەهێڵەکەوە نەهاتبێتەوە سەر باری جارانی.
ـ ڕێک دەچینە ناو بابەتەکەوە... ئەلبێرتۆ گوتی. لە دوای هیومەوە، کانت«Kant» ی ئەڵمانی دووهەمین ڕێبازی گەورەی فەلسەفی بوو.

بەڵام فەرەنساش لە سەدەی هەژدەدا خاوەنی چەندین بیرمەندی گرنگ بوو. دەتوانین بڵێین لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەدا، چەقی سەرەکی فەلسەفەی ئەوروپی لە بەریتانیادا بوو، لە ناوەڕاستی سەدەکەشدا لە فەرەنسادا و لە کۆتایی سەدەی هەژدەشدا لە ئەڵمانیادا بوو.

- بەشێوەیەکی تر بیڵێین، وەک ئاڵوگۆڕیەک لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات دەچوو.

- ڕێک وابوو. دەمەوێت بەکورتی باسی هەندێک لەو فیکرانەت بۆ بکەم کە لە نێو زۆربەی فەیلەسوفە فەرەنسیەکانی سەدەی ڕۆشنگەریدا هاوبەشبوو. لێرەدا مەبەستمان لە ناوە گەورەکانی وەک مۆنتیسکیو "Montesquieu"و ڤۆڵتێر "Voltaire" و ڕوسوو "Rousseau" و چەندەها و چەندەهای تریشە. هەموویانم لە حەوت خاڵی گرنگدا کۆکردۆتەوە.

- سوپاس منیش دەزانم.

سۆفیا کارتەکەی باوکی هیلدەی نیشاندا. ئەلبێرتۆ هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و گوتی؛

- دەیتوانی هەر بۆی نەناردیتایە... بەهەرحاڵ، یەکەمین خاڵ هەڵگەڕانەوەیە لە دەسەڵات. لە سەدەی ڕۆشنگەریدا چەندین فەیلەسوفی فەرەنسی خۆیان گەیاندە بەریتانیا، چونکە لە زۆر لایەنەوە بەریتانیەکان خاوەنی مێشکێکی کراوەتربوون وەک لە وڵاتی خۆیان. لەوێدا بە زانستی سروشتی بەریتانی سەرسامبوون، بەتایبەتی بە نیوتن و فیزیا گەردوونیەکەی. بەڵام لە هەمان کاتیشدا سروشیان لە فەیلەسوفە بەریتانیەکانی وەک لۆک و فەلسەفە ڕامیاریەکەی وەرگرت. لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ فەرەنسا، هێدی

هێدی دژ بە دەسەڵاتی کۆن وەستانەوە. ئەوان لەو بڕوایەدابوون کە گومانکردن لە ڕاستیە بۆماوەکان گرنگ بێت و دەیانگوت؛ «تاکە کەس دەبێت خۆی وەڵامی هەموو پرسیارەکان بدۆزێتەوە». لەوێدا داب و نەریتی فیکری دیکارتیش ڕۆڵی خۆی هەبوو.

- لەبەرئەوەی دیکارت لە بنچینەوە هەموو شتێکی بنیات نایەوە، وانیە؟

- بەڵێ، تەواوە. هەڵگەڕانەوە دژی دەسەڵاتی کۆن، کڵێسە و پاشا و بەگزادەکانیشی گرتەوە. لە سەدەی هەژدەدا و لە فەڕەنسادا ئەم ڕێکخراوانە زۆر بەهێزتربوون لەوانەی کە لە بەریتانیادا هەبوون.

- کەواتە شۆڕش بەرپاکرا.

- بەڵێ، لە ساڵی 1789دا... بەڵام لەپێشدا فیکرە نوێکان سەریان هەڵدا. دووهەمین خاڵ ڕاشیونالیزمە.

- وامدەزانی ڕاشیونالیزم لەگەڵ هیومدا فەوتا.

- هیوم خۆی لە ساڵی 1776دا مرد، نزیکەی بیست ساڵێک پاش مۆنتیسکیو و دوو ساڵیش لەپێش ڤۆڵتێر و ڕوسوودا کە هەردووکیان لە ساڵی 1778دا مردن. بەڵام هەر سێکیان لە بەریتانیادا ژیابوون و ئاشنای فەلسەفەی لۆک بوون. ئەگەر لە یادت بێت، هیوم ئیمپیریستێکی پەتی نەبوو. بۆ نمونە بە بڕوای ئەو ئیمان هێنان بە خودا و هەندێ یاسای ئەخلاقی بەشێوەیەکی سروشتی لە مێشکی مرۆڤدا بوونی هەیە. ئەمەش خودی ناوەڕۆکی فەلسەفەی فەڕەنسیە لە سەدەی ڕۆشنگەریدا.

- تۆ گوتت فەڕەنسیەکان هەمیشە لە بەریتانیەکان ڕاشیونالیزمی تر بوون.

ـ ئەو جیاوازیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست. کاتێک بەریتانیەکان دەڵێن شتێک «بەڵگە نەویستە»، ئەوا فەڕەنسیەکان وای بەباش دەزانن بڵێن «بەئاشکرا دەبینرێت»، واتە ڕوونە لە تێگەیشتنی هزردا.
هاوتا لەگەڵ مرۆڤدۆستانی سەدەی کۆندا ـوەک سوکرات و ستۆیکەکان- زۆرینەی فەیلەسوفەکانی سەدەی ڕۆشنگەریش باوەڕێکی پتەویان بە ئەقڵی مرۆڤ هەبوو. ئاشکرایی ئەم خاڵەش وای لە خەڵکانێکی زۆر کرد کە بە سەدەی ڕۆشنگەری فەڕەنسی بڵێن سەدەی «ڕاشیونالیزم». زانستی نوێی سروشت پێمان دەڵێت سروشت بە شێوەیەکی ئەقلانی ڕێکخراوە. فەیلەسوفەکانی سەدەی ڕۆشنگەریش بە ئەرکی سەر شانی خۆیان دەزانی کە بنچینەی ئیتیک و ئاین و مۆراڵ بە شێوەیەک دابمەزرێنن کە لەگەڵ ئەقڵی مرۆڤدا بگونجێت. ئەمەش بوو کە بەرەو فیکری سەدەی ڕۆشنگەری بردن.
ـ واتە خاڵی سێهەم.
ـ بەڵێ، ئەو کاتە دەبوایە دەستیان بکردایە بە «ڕۆشنکردنەوەی» بەرفراوانترین چینی کۆمەڵ. ئەمەش وەک مەرجێکی بنەڕەتی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی باشتر، تەماشا دەکرا. بە بڕوای ئەوان نەهامەتی و چەوسانەوە، بەهۆی نەزانین و بڕواکردن بە خورافیاتەوە سەرهەڵدەدات. لێرەوە پەروەردەکردنی منداڵ و خەڵکیش کەوتە بەر سەرنجی تیژی فەیلەسوفەکان، لەبەرئەوە ڕێکەوت نیە کە پەروەردەکردن وەک زانستێک دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ڕۆشنگەری.
ـ واتە دامەزراندنی قوتابخانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ناوەڕاست و پەروەردەش بۆ سەدەی ڕۆشنگەری، وانیە؟

- بەڵێ، دەتوانین ئاوها بڵێین. خودی پەیکەری فیکری ڕۆشنگەری لە دووتوێی فەرهەنگێکی گەورەدا دانرا. مەبەستم لەو نووسینەیە کە پێی دەگوترێت «ئینسایکلۆپیدیا Encyclopedia» و لە نێوان ساڵی 1751 و 1772 دا لە 28 بەرگدا بە هاریکاری فەیلەسوفەکانی ئەم سەدەیە دەرچوو. دەیانگوت؛ «لێرەدا هەموو شتێکی تێدایە، هەر لە شێوەی دەرزی دروستکردنەوە هەتا شێوەی تۆپ داڕشتن.»
- خاڵی دوای ئەمە گەشبینی کەلتوریە.
- بەیارمەتیت... دەتوانیت لە کاتی قسەکردنمدا ئەو کارتە بخەیتە ئەولاوە؟
- ببوورە.
- فەیلەسوفەکانی ئەم سەدەیە دەیانگوت، تەنها بڵاوبوونەوەی زانست و ئەقڵ بەسە بۆ ئەوەی پێشکەوتنی گەورە بەدەست بهێنرێت. بەبڕوای ئەوان، گۆڕینی نائاقڵی و نەزانین بۆ مرۆڤایەتیەکی «ڕۆشنفیکر» تەنها مەسەلەیەکە کە پەیوەندی بە کاتەوە هەیە و هیچی تر. تاڕادەیەک لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا و تا چەند دە ساڵێک لەمەوبەر، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە تاقانەبوو. ئەمڕۆکەش چیتر قەناعەتمان بەوە نیە کە هەموو "پێشکەوتنێک" باش بێت. بەڵام ئەم ڕەخنەیەی کە لە "شارستانیەت" دەگیرێت، هەر لە زووەوە لەلایەن فەیلەسوفەکانی سەدەی ڕۆشنگەرییەوە گیرا.
- کەواتە دەبوایە بە گوێمان بکردنایە.
- دروشمی سەردەمیش بەلای هەندێ خەڵکەوە بوو بە گەڕانەوە بۆ سروشت. بەڵام فەیلەسوفەکانی ئەم سەردەمە تا ڕادەیەک «سروشت»یان وەک ئەقڵ دەبینی، چونکە ئەقڵی مرۆڤ لە سروشتەوە هاتووە و بە پێچەوانەی کڵێسە و "شارستانیەت"ەوەیە کە سروشتی

نین. ئەوان دەیانگوت ئەو کەسانەی کە پێیان دەگوترێت «مرۆڤی سروشتی» زۆر جار لە ئەوروپییەکان لەش ساغتر و ئاسودەتر دەژین، لەبەرئەوەی هێشتام نەبوونەتە مرۆڤی "شارستانی". جاک ڕوسووش ئەم دروشمەی بەرزکردەوە؛ «دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سروشت، لەبەرئەوەی سروشت باشە و مرۆڤیش بەشێوە سروشتیەکەی باشە» (*واتە ئەوە سروشتی مرۆڤ خۆیەتی کە باش بێت.و)، هەروەها دەیگوت خراپەکاری لە کۆمەڵگادایە. لەسەرو ئەوەشەوە بە بڕوای ڕوسوو هەتا بوار هەبێت دەبێت ڕێگە بە منداڵ بدرێت کە بە شێوە پاکە «سروشتیکەی» خۆی بژی. دەتوانین بڵێین نرخاندنی تایبەتی سەردەمی منداڵی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ڕۆشنگەری. لەوەوپێش سەردەمی منداڵیان تەنها وەک ئامادەبوونێک بۆ ژیانی گەورەیی دەبینی. بەڵام خۆ لەکاتی منداڵیشماندا هەر مرۆڤین و ژیانمان لەسەر زەوی بەسەر دەبەین.

ـ منیش هەمان بڕوام هەیە!

ـ ئاینیش دەبوایە بکرایەتەوە بە "سروشتی."

ـ مەبەستیان چی بوو لەوە؟

ـ دیانەتیش دەبوایە بخرایەتەوە سەر ئاستی ئەقڵی "سروشتی" مرۆڤ. خەڵکانێکی زۆر تێدەکۆشان بۆ "تێگەیشتنێکی مرۆڤدۆستانەی ئاینی مەسیحی"... ئەمەش شەشەمین خاڵە. لەو کاتەدا چەند مەتریالیستێکی توند و تیژ هەبوون، کە بڕوایان بە هیچ جۆرە خودایەک نەدەکرد و بە ئاشکرا خۆیان لەگەڵ دونیادیدەی بێ ئاینەکاندا گرێدەدا. بەڵام بە بڕوای زۆرینەی فەیلەسوفەکانی سەدەی ڕۆشنگەری، بیرکردنەوە لە جیهان بەبێ خودا، کارێکی نائاقڵانەیە، لەبەرئەوەی جیهان بە شێوەیەکی ئەقڵانی زۆر بەرز هەڵچنراوە.

نیوتنیش، بۆ نمونە، هەمان بڕوای هەبوو. بەم شێوەیەش بڕوایان بە ڕۆحی نەمر دەکرد و بە شتێکی ئەقڵانیان لە قەڵەم دەدا. لێرەشەوە بڕواکردنیان بە نەمری ڕۆحی مرۆڤ –هەروەک بەلای دیکارتەوە- زیاتر پەیوەندی بە ئەقڵەوە هەیە وەک ئەوەی پەیوەندی بە بڕواوە هەبێت.

- بەلای منەوە ئەم جۆرە تێگەیشتنە کەمێک سەیرە، چونکە ئەمە نمونەیەکی ئاشکرای بڕواکردنە بە شتێک و هیچ پەیوەندیەکی بە زانینەوە نیە.

- بەڵام ئێستا تۆ لە سەدەی هەژدەدا ناژیت. بەدرێژایی مێژووی ئاینی مەسیحی، چەندەها بڕوای هەڕەمەکی و نائەقڵییانە خرابووە سەر پەیامە ساکارەکەی مەسیح. فەیلەسوفەکانی سەدەی ڕۆشنگەریش دەیانویست ئاینی مەسیحی لە هەموو ئەو بڕوایانە پاکبکەنەوە.

- لێرەدا لەگەڵیاندام.

- خەڵکانێکی زۆریش بڕوایان بە «دایزم Deism» هەبوو.

- «دایزم» چیە؟

- جۆرە تێگەیشتنێکە کە دەڵێت خودا لە مێژەوە –لەماوەیەکی زۆر زۆر لەمەوبەرەوە- جیهانی خوڵقاندووە، بەڵام پاشان خۆی تێدا نیشان نەداوە. بەم شێوەیەش خودا وەک "بوونەوەرێکی بەرز" تەماشادەکەن و بە بڕوای ئەوان مرۆڤ تەنها لە ڕێگەی سروشت و یاساکانیەوە دەتوانێت بیناسێت –واتە بە شێوەیەکی سەروسروشتی خۆی نیشان نادات. لەلای ئەریستۆتالیسیش ئەم شێوە خودا "فەلسەفیە" دەبینین. بەلای ئەوەوە خودا "یەکەمین هۆکاری" یان "یەکەمین جوڵێنەری" گەردوون بووە.

- ئەوجا تەنها یەک خاڵمان ماوەتەوە، ئەویش مافەکانی مرۆڤە.

- بەڵێ ئەوە دواهەمین خاڵە، بەڵام لەوانەیە لە هەموو خاڵەکانی دی گرنگتربێت. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین فەیلەسوفە فەڕەنسیەکانی سەدەی ڕۆشنگەری لە فەیلەسوفە ئینگلیزیەکان بەکردەوەتر بوون.
- مەبەستت چیە؟ ئایا فەیلەسوفە فەڕەنسیەکان تا ڕادەیەکی زۆر بەپێی تێڕوانینەکانیان دەژیان؟
- بەڵێ، فەیلەسوفە فەڕەنسیەکان نەیان دەویست تەنها بە تیۆری باس لە بیروڕاکانیان بکەن کە سەبارەت بە شوێنی مرۆڤ بوو لە کۆمەڵگادا، بەڵکو چالاکانە تێیان دەکۆشا بۆ ئەو بابەتەی کە پێیان دەگوت «مافە سروشتیەکان»ی هاووڵاتی. یەکەمین شت دژی سانسۆر وەستانەوە، واتە داوای ئازادی دەربڕینی بیروڕایان دەکرد. هەرچی دەربارەی ئاین و مۆراڵ و ڕامیاریشە، داوای ئەوەیان دەکرد کە تاکە کەس بتوانێت بەوپەڕی ئازادیەوە بیربکاتەوە و ڕێگەی پێبدرێت هەموو بیروڕاکانی بەسەربەستی دەرببڕێت. پاشانیش دژی کۆیلەگەری وەستانەوە، لەلایەکی تریشەوە دەیانویست مامەڵەکردنێکی باشتر و مرۆڤانەتر بۆ تاوانباران دابین بکەن.
- پێم وابێت لەگەڵ زۆربەی زۆری ئەمانەدا تەبام.
- پاشان مەبدەئی "نەشکاندنی مافی تاکەکەس" خرایە نێو "بانگەوازی مافی مرۆڤ و هاووڵاتیانەوە" و لەساڵی 1789 دا لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەیی فەڕەنسیەوە دەنگی لەسەر درا و دانی پێدا نرا. پاشانیش ئەم "بانگەوازی مافی مرۆڤە" بووە سەرەتایەکی گرنگ بۆ ئەو بزوتنەوە دیموکراتیانەی کە لە ئەوروپادا سەریان هەڵدا.
- بەڵام هێشتام بەردەوام خەڵکانێک هەن کە ناچاران بۆ ئەو مافانە تێبکۆشن.

ـ بەڵێ بەداخەوە وایە. بەڵام فەیلەسوفەکانی سەدەی ڕۆشنگەری دەیانویست ئەو مافە ڕەوایانە بسەلمێنن کە هەموو مرۆڤێک هەیەتی، زۆر بەئاسانی لەبەرئەوەی وەک مرۆڤ لەدایک بوون. ئەوان مەبەستیان لەمە بوو کە دەیانگوت "مافە سروشتیەکان". تا ئێستاکەش مافی سروشتی زۆرجار دژ بە یاسای باوی وڵاتێک لە وڵاتەکان دەوەستێتەوە. ئێستاکەش بەردەوام تاکەکەس ـیان تەواوی نەتەوەیەک- دەبینین کە هاوار بۆ ئەو "مافە سروشتیانە" دەکەن و دژی نەبوونی دادپەروەری و ئازادی شۆڕش بەرپادەکەن و داوای بنەبڕکردنی چەوسانەوە دەکەن.
ـ ئەی دەربارەی مافی ئافرەتان چی؟
ـ شۆڕشی 1789 زنجیرەیەک مافی بەدەست هێنا، کە دەبوایە هەموو "هاووڵاتیانی" بگرتایەتەوە، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر هاووڵاتی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وەک پیاوێک تەماشادەکرا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێک لەکاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی فەڕەنسیدا یەکەمین خەباتی ئافرەتان دەبینین.
ـ لە کاتی خۆیدا بوو.
ـ لە ساڵی 1787 دا کۆندۆرسێت«Condorcet» ی فەیلەسوف وتارێکی دەربارەی مافی ئافرەتان بڵاوکردەوە. بەبڕوای ئەو ئافرەتانیش وەک پیاوان خاوەنی هەمان "مافی سروشتین". ئافرەتان لە کاتی خودی شۆڕشی 1789دا چالاکانە دژی ڕژێمی دەرەبەگایەتی کۆن خەباتیان دەکرد. بۆ نمونە ئەوان لە پێشەوای ئەو خۆپیشاندانەدابوون کە وای لە پاشاکرد کۆشکی ڤێرسای بەجێبهێڵێت. لە پاریسیشدا کۆمەڵەی ئافرەتانیان دامەزراند، کە جگە لەوەی داوای هەمان مافی سیاسی

وەک پیاوانیان دەکرد، داوای گۆڕینی یاسای شووکردن و ژنهێنان و پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئافرەتانیشیان دەکرد.

ـ ئەی پاشان ئەو مافانەیان بەدەست هێنا؟

ـ نەخێر. هەروەک چەندین جاری تر، لەکاتی بەرپابوونی شۆڕشدا باسی مافی ئافرەتان دێتە ئاراوە، پاشانیش کە هەموو شتێک لە ڕژێمێکی نوێدا هێمن دەبێتەوە، دیسانەوە پیاو هەمان کۆمەڵەی پیاوسالاری دادەمەزرێنێتەوە.

ـ شتێکی نا ئاسایی نیە!

ـ یەکێک لەو ئافرەتە خەباتگێڕانەی کە لە کاتی شۆڕشی فەڕەنسادا بە شێوەیەکی بەردەوام کۆششی بۆ مافی ئافرەتان دەکرد، ناوی «ئۆڵۆمپی دی گۆوجیس Olyompe de Gouges» بوو. لە ساڵی 1791دا ـ واتە تەنها دوو ساڵ لەدوای شۆڕشەوە- بانگەوازێکی دەربارەی مافی ئافرەتان بڵاوکردەوە، چونکە ئەو بانگەوازەی کە دەربارەی "مافی هاووڵاتیان" بوو هیچ بەشێکی تایبەتی دەربارەی "مافی سروشتی" ئافرەتانی تێدا نەبوو. ئۆڵۆمپی لە بانگەوازەکەیدا داوای تەواوی هەمان مافی وەک پیاوانی بۆ ئافرەتان دەکرد.

ـ ئەی پاشان چی ڕوویدا؟

ـ لە ساڵی 1793دا لەسێدارە درا و هەر دوابەدوای ئەوەش هەموو ڕێکخراوەیەکی ڕامیاری ئافرەتان قەدەغەکرا.

ـ مایەی قێزلێکردنەوەیە!

ـ هەتا سەدەی نۆزدە، هەم لە فەڕەنسادا و هەم لە شوێنەکانی تری ئەوروپاشدا، خەباتی ئافرەتان بەتەواوەتی دەستی پێنەکرد. لەو کاتەوە هێواش هێواش خەباتەکەیان ئامانجی بەدەست هانی، بەڵام لە نەرویجدا هەتاوەکو ساڵی 1913 ئافرەتان مافی دەنگدانیان نەبوو،

له دانیمارکدا له ساڵی 1915دا ڕوویدا. ئێستاکەش بەردەوام ئافرەتانی چەندەها وڵات، چەندین شتیان هەیە کە خەباتی بۆ بکەن.
ـ بەلایەنی کەمەوە دەتوانن چاوەڕوانی پشتگیری من ببن.
ئەلبێرتۆ بۆ ماوەیەک هەر تەماشای دەریاچەکەی دەکرد و پاشان گوتی؛
ـ پێم وابێت ویستم هەر ئەمەندەت دەربارەی سەدەی ڕۆشنگەری بۆ باسبکەم.
ـ مەبەستت لە «پێم وابێت» چیە؟
ـ هەستدەکەم لەوەندە زیاتر هیچ شتێکی ترنیە کە شایانی باسکردن بێت.
هاوکات لەگەڵ تەواو بوونی قسەکەی ئەلبێرتۆدا، لەناو ئاوەکەدا شتێک ڕوویدا... لەناوەڕاستی ئاوەکەوە بڵقە بڵقێک سەردەکەوت، بەڵام بە شێوەیەک دەتگوت ئاوی ژێر دەریاچەکە لە پڕێکدا دەیەوێت بە تەوژم بێتە سەرەوە. پاش کەمێک تەنێکی ناشیرین و ڕەش لەسەر ئاوەکەوە دەرکەوت و سۆفیا هاواریکرد؛
ـ ماری ئاوە!
بوونەوەرە ڕەشەکە چەند جارێک هەڵبەز و دابەزی کرد و پاشان چووەوە ناو قوڵایی ئاوەکە، ئەوجا ئاوەکە وەک باری پێشووی هێمن بووەوە.
ئەلبێرتۆ ئاوڕێکی دایەوە و گوتی؛
ـ با بڕۆینە ژورەوە.
پاش کەمێک هەردووکیان چوونە ناو کوخە بچکۆلەکەوە.
سۆفیا لەبەردەم هەردوو وێنەی بارکێلی و بیرکێلیدا وەستا و ئاماژەی بۆ وێنەکەی بارکێلی کرد و گوتی؛

ـ وا بزانم هیلدە لە شوێنێکی ناو ئەو وێنەیەدا دەژی.
ئێستاکە لە نێوان وێنەکاندا پاچە قوماشێکی چنراو هەڵواسرابوو، لەسەری نووسرابوو؛ «سەربەستی، یەکسانی، برایەتی». سۆفیا ئاورێکی لە ئەلبێرتۆ دایەوە؛
ـ تۆ ئەمەت هەڵواسیووە؟
ئەلبێرتۆ بە دەموچاوێکی گرژەوە سەرێکی ڕاوەشاند و هیچی نەگوت.
ئەوجا سۆفیا لەناو کونی ئاگردانەکەدا نامەیەکی دۆزیەوە و لەسەری نووسرابوو «بۆ سۆفیا و هیلدە». سۆفیا یەکسەر تێگەیشت لە چ کەسێکەوە هاتووە، بەڵام وەک شتێکی نوێ مێجەر ناوی سۆفیاشی لەسەر نامەکان دەنووسی.
نامەکەی کردەوە و بەدەنگی بەرز خوێندیەوە؛
ئازیزان؛ دەبوایە مامۆستای فەلسەفەکەی سۆفیا ئەوەشی باسبکردایە کە فەیلەسوفەکانی سەدەی ڕۆشنگەری چەندە گرنگبوون بۆ ئەو بیر و باوەڕ و پرێنسیپانەی کە نەتەوە یەکگرتووەکانی لەسەر دامەزراوە. ئەو شتەی دوو سەد ساڵ لەمەوبەر خەڵکی فەرەنسی کۆکردەوە، دروشمی «ئازادی، یەکسانی، برایەتی» بوو. ئەمڕۆکە دەبوایە هەمان ئەو وشانە هەموو جیهانی کۆبکردایەتەوە. وەک هیچ سەردمێک لەوەوپێش مرۆڤایەتی ئاوها پێویستی بەوە نەبووە کە ببێت بە خێزانێکی گەورە. ئەوانەی لەپاشمان دێن، منداڵەکانمان و منداڵی منداڵەکانمانن... ئەو جیهانە چیە کە بەمیراتی لە ئێمەوە بۆیان دەمێنێتەوە؟

**ئێستاکە دایکی هیلدە هاواریکرد کە فلیمەکە دە خولەکی تر دەست پێدەکات و پیتزایەکیشی خستۆتە فڕنەکەوە. هیلدە لە پاش ئەو هەموو**

خوێندنەوەیە تەواو ماندو بووبوو، بەتایبەتیش لە کاتژمێری شەشی بەیانیەوە هەستابوو.
هیلدە بڕیاریدا لەوە بەدواوەی ئێوارەکە لەگەڵ دایکیدا ئاهەنگی ڕۆژی لەدایک بوونەکەی بەسەربەرێت. بەڵام پێش هەموو شتێک دەبوایە تەماشای فەرهەنگەکەی بکردایە و بابەتێکی بدۆزیبایەتەوە.
گۆوجیس... نەخێر. دی گۆوجیس؟ دیسانەوە نەخێر. ئۆڵۆمپی دی گۆوجیس؟ بە هیچ جۆرێک... ئەو فەرهەنگە گەورەیە تەنها وشەیەکی دەربارەی ئەو ئافرەتە نەگوتووە کە لەسەر بیروڕا سیاسیەکانی دەربارەی مافی ئافرەتان لە سێدارە درا. ئایا ئەمە ئابڕوچوون نیە؟ خۆ باوکی لە خەیاڵی خۆیەوە داینەڕشتووە؟
هیلدە ڕایکردە خوارەوە بۆ ئەوەی فەرهەنگێکی گەورەتر بهێنێت.
- بەدوای بابەتێکدا دەگەڕێم... ئەمەندەی بەدایکە سەرسوڕماوەکەی گوت و بەشی پیتی «گ»ی هەڵگرت و ڕایکردەوە ژورەکەی خۆی.
گۆوجیس... بەڵێ، لێرەدایە!
گۆوجیس ماریا ئۆڵۆمپی **(1748-1793)** ئافرەتە نووسەرێکی فەڕەنسی بوو، لەسەردەمی شۆڕشی فەڕەنسیدا ڕۆڵێکی گرنگی بینی، چەندین بابەتی دەربارەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و چەند شانۆگەرییەکیشی بڵاوکردەوە. یەکێک بوو لەو کەسە بەدەگمەنانەی لە کاتی شۆڕشی فەڕەنسیدا هەوڵیدەدا مافەکانی مرۆڤ، ئافرەتانیش بگرێتەوە. لە ساڵی **1791** دا «بانگەوازی مافی ئافرەتانی بڵاوکردەوە». لە ساڵی **1793**دا لەسێدارە درا، لەبەرئەوەی وێرای بەرگری لە لویسی شانزە بکات و هێرشیش بکاتە سەر ڕۆبیسپیرێ. (سەرچاوە؛ «ل. لاکۆر **L. Lacour**» ڕەسەنی فیمینیزمی هاوچەرخ **1900**).

## کانت «Kant»

## ...ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە لە سەرومەیەوە و یاسای مۆراڵیش لە ناوەوەمدایە...

نزیکەی نیوە شەو مێجەر ئەلبێرت کنەی، بە بۆنەی پیرۆزبایی کردنی ڕۆژی لەدایک بوونی کچەکەیەوە، تەلەفونێکی بۆماڵەوە کرد.

دایکی هیلدە تەلەفونەکەی هەڵگرت.

- بۆ تۆیە هیلدە.

- ئەلو؟

- بابەیە، کچم.

- تێکچوویت بابە؟ کاتژمێر وا دەبێتە دوانزەی شەو!

- ویستم پیرۆزبایی ڕۆژی لە دایک بوونت لێبکەم...

- بەڵام خۆ بە درێژایی ڕۆژەکە بەردەوام هەر پیرۆزبایی تۆم پێدەگەشت. (*مەبەستی لە ڕێگەی کتێبەکەوەیە.و).

- ...ئاخر ویستم ڕۆژەکە تێپەڕێت، ئەوجا بە تەلەفون پیرۆزبایت لێبکەم.

- بۆچی؟

- دیاریەکەت وەرنەگرتووە؟

- ئۆو... بەڵێ، بەڵێ! زۆر سوپاس.

- لەوە زیاتر ئەزیەتم مەدە... بەڕاستی پێم بڵێ، بەدڵتە؟

- هەتا بڵێیت سەرنج ڕاکێشەرە، تەنانت ئەمڕۆ نەمپەرژایە سەر نان خواردنیش.

- باشترە نانیش بخۆیت.

- ئاخر هێندە خۆشە دەمەوێت بزانم پاشان چی ڕوودەدات.

ـ پێم بڵێ، گەیشتویتەتە کوێ؟
ـ گەڕانەوە کوخەکەی مێجەر، چونکە بەهۆی مارە ئاویەکەوە گاڵتەت پێدەکردن...
ـ ئا... سەدەی ڕۆشنگەری.
ـ هەروەها گەیشتومەتە ئۆڵۆمپی دی گۆوجیس.
ـ کەواتە زۆر بەهەڵەدا نەچووبووم.
ـ «هەڵە!»... هەڵەی چی؟
ـ پێم وابێت یەک جاری تریش پیرۆزبایت لێدەکرێت، بەڵام ئەم جارەیان بە مۆسیقاوەیە.
ـ باشتر وایە پێش ئەوەی بخەوم، کەمێکی تریش لەناو جێگادا بخوێنمەوە.
ـ کەواتە هێشتام نەچوویتەتە ناو جێگاوە؟
ـ لە ژیانمدا ئەوەندەی ئەمڕۆم نەخوێندۆتەوە... باوەڕناکەم، هێشتام تەنانەت ڕۆژێکیش تێنەپەڕیوە بەسەر یەکەمین نامەدا کە بەدەستی سۆفیا گەیشت.
ـ سەیرە، جاری وا هەیە تەنها پێویستیمان بەچەند شتێکی کەمە کە...
ـ بەڵام بەڕای من گوناحە و نیگەرانم بۆی.
ـ بۆ دایکت؟
ـ نەخێر، بێگومان بۆ سۆفیا.
ـ ئۆو...
ـ ئەو نەگبەتە تەواو لە گێژاودایە.
ـ بەڵام ئەو تەنها... مەبەستم...
ـ خۆ ناتەوێت بڵێیت سۆفیا تەنها شتێکە کە تۆ نووسیوتە و هیچی تر.
ـ بەڵێ، شتێک لەو بابەتەیە.

**ـ من لەو بڕوایەدام سۆفیا و ئەلبێرتۆ بەڕاستی دەژین.**
**ـ کە گەڕامەوە زیاتر دەربارەی ئەمە دەدوێین، باشە؟**
**ـ باشە.**
**ـ جارێ تەمەنای ڕۆژێکی خۆشت بۆ دەخوازم.**
**ـ بەڵێ؟**
**ـ مەبەستم ئەوەیە، شەو شاد.**
**ـ شەو شاد!**
**هیلدە پاش نیو سەعاتێک چووە ناو جێگاوە، دەرەوە هێشتام هێندە ڕووناک بوو کە بە ئاسانی دەیتوانی باخچەکە و دارەکانی ناوی ببینێت. لەو وەرزەدا هەرگیز بە تەواوەتی دونیا تاریک نابێت.**
**هیلدە پێیخۆش بوو وێنەی خۆی لەناو تابلۆیەکی یەکێک لە دیوارەکانی ناو کوخەکەی دارستانەکەدا بهێنێتە بەرچاوی و بیری لێبکاتەوە... بڵێیت لەناو ئەو تابلۆیەوە بکرێت تەماشای دەرەوە بکرێت و شتەکانی دەرەوە ببینیت؟**
**پێش ئەوەی بخەوێت، دیسانەوە دەستی کردەوە بە خوێندنەوە.**

سۆفیا نامەکەی باوکی هیلدەی خستەوە ناو کونی ئاگردانەکە. ئەوساکە ئەلبێرتۆ گوتی؛
ـ پێدەچێت ئەو شتەی دەربارەی نەتەوە یەکگرتووەکان باسی دەکات یەکجار گرنگ بێت، بەڵام پێم خۆش نیە دەست وەرداتە ناو شێوەی باسکردنەکەی منەوە.
ـ پێم وابێت ئاسان وەربگریت باشترە.
ـ بەلایەنی کەمەوە لە ئێستا بەدواوە هەموو دیاردەیەکی سەیری وەک ماری ئاوەکە و لەو بابەتانە، پشتگوێ دەخەم. دەتوانین هەر لێرەدا

لەبەردەم ئەم پەنجەرەیەدا دابنیشین، دەمەوێت باسی «کانت «Kantت بۆ بکەم.
سۆفیا چاویلکەیەکی لەسەر مێزە چکۆلەکەی نێوان دوو کورسیەکە بەدیکرد. سەرنجیدا چاوەکانی سوور بوون... لەوەیە چاویلکەی خۆری بێت، بۆیە چاوەکانی هێندە تۆخن؟
ـ کاتژمێر خەریکە دەبێت بە دوو... سەعات پێنج دەبێت لەماڵەوە بم، بێگومان دایکم شتێکی بۆ ڕۆژی لەدایک بوونم ئامادەکردووە.
ـ کەواتە سێ سەعاتمان لەبەردەستایە.
ـ فەرموو دەست پێبکە!
ـ باوکی ئیمانوێڵ کانت پیشەی زین دوورین بوو. کانت لە ساڵی 1724دا لە شاری کۆنیگسبێرگی ڕۆژهەڵاتی بروسیادا لەدایک بوو. لەوێدا نزیکەی هەموو ژیانی بەسەربرد، هەتا لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا مرد. لە بنەماڵەیەکی ئاینی توند و تیژدا گەورەبوو. پاشانیش بڕواکردنە ئاینیەکەی بووە بنچینەیەکی گرنگی فەلسەفەکەی. ئەمیش هەروەک بارکێلی، بەلایەوە گرنگبوو بنچینەی ئاینی مەسیحی پاکبکرێتەوە و بپارێزرێت.
ـ سوپاس، بەڵام زۆرم دەربارەی بارکێلی بیست.
ـ لە نێو هەموو ئەو فەیلەسوفانەی تا ئێستاکە باسمان کردوون، کانت یەکەمین فەیلەسوفە کە وەک پرۆفیسۆرێک لە دانیشگایەکدا دامەزرابێت. ئەو، هەروەک ناوی دەنێین، «پیشەی فەیلەسوفی» هەبوو.
ـ پیشەی فەیلەسوفی؟
ـ ئەمڕۆکە وشەی «فەیلەسوف» بە دوو مانای جیاواز بەکاردەهێنرێت. یەکەمیان؛ فەیلەسوف ئەو کەسەیە کە بەدوای وەڵامی پرسیارە

فەلسەفیەکانی خۆیدا دەگەڕێت. دووهەمیشیان؛ ڕێی تێدەچێت فەیلەسوف ئەو کەسە بێت کە تەنها لە مێژووی فیکری فەلسەفیدا تایبەتمەند بێت، واتە مەرج نیە خۆی خاوەنی فەلسەفەی تایبەتی خۆی بێت.

ـ کانتیش یەکێک بوو لەم جۆرە فەیلەسوفانە، وا نیە؟

ـ نەخێر، هەردوو جۆرەکەیان بوو. ئەگەر تەنها پرۆفیسۆرێکی زیرەک بوایە ــواتە تەنها لە فیکری فەیلەسوفەکانی تردا تایبەتمەند بوایە- ئەوا ئەمرۆکە جێگەیەکی لەنێو مێژووی فەلسەفەدا نەدەگرت. بەڵام وەک سەرنجێک، گرنگە بزانین کە کانت شارەزاییەکی فراوانی کەلەپوری فەلسەفی پێش خۆی هەبووە. شارەزای فیکری ڕاشیونالیستەکانی وەک دیکارت و سپینۆزا بووە، هەروەها ئاشنای ئیمپیریستەکانی وەک لۆک و بارکێلی و هیومیش بووە.

ـ گوتم چیتر پێویست ناکات باسی بارکێلی بکەیت!

ـ وەک لەوەوپێش باسمانکرد، بەپێی بڕوای ڕاشیونالیستەکان بنچینەی هەموو زانینی مرۆڤ لەناو ئاگایی مرۆڤدایە... هەروەها لە یادیشمانە کە ئیمپیریستەکان دەیانگوت هەموو زانینێک دەربارەی جیهان، لە ڕێگەی هەستەکانەوە سەرچاوە وەردەگرن. جگە لەوەش بەبڕوای هیوم، هەستەکانمان لە دەرخستنی هەندێک دەرئەنجامدا، سنوورمەندن (*واتە سنوورێک هەیە بۆ ئەو دەرئەنجامانەی کە هەستەکانمان دەتوانن پێمان بڵێن.و).

ـ ئەی کانت لەگەڵ کامیاندا تەبابوو؟

ـ بەبڕوای ئەو هەردوو بەشەکە لە هەندێ لایەندا ڕاستن و لە هەندێ لایەنی تریشدا هەڵەن. ئەو پرسیارەی کە هەمووان مەبەستیان بوو وەڵامەکەی بدۆزنەوە، ئەوە بوو کە دەیگوت؛ ئێمە دەتوانین چ شتێک

دەربارەی جیهان بزانین؟ هەموو فەیلەسوفەکانی پاش دیکارت، لەم پڕۆژە فەلسەفیەدا هاوبەشبوون. ئامارژەشیان بۆ دوو ئەگەر دەکرد و دەیانگوت؛ ئایا جیهان بەو جۆرەیە کە ئێمە هەستی پێدەکەین، یان بەو جۆرەیە کە بە هۆی ئەقلْمانەوە پەی پێ دەبەین؟

- ئەی کانت لە چ بڕوایەکدا بوو؟

- کانت دەیگوت لە کاتی ئەزموونکردنی جیهاندا، هەم "هەستەکانمان" و هەم "ئەقلێشمان" ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن. بەڵام لە هەمان کاتدا بە بڕوای ئەو ڕاشیونالیستەکان زیادەڕۆییان لە بینینی ئەقڵدا کردووە، وە ئیمپیریستەکانیش تەنها گرنگیان بەلایەنی ئەزموونە هەستیکان بەخشیوە.

- ئەگەر بەپەلە نمونەیەک نەهێنیتەوە، ئەوا ئەمەش تەنها وەک وشە دەمێنێتەوە و هیچی تر.

- بەشێوەیەکی گشتی کانت لەگەڵ هیوم و ئیمپیریستەکاندا تەبایە کە هەموو زانیاریەکمان دەربارەی جیهان، لە ئەزموونی هەستەکانمانەوە هەڵدەقولێن. بەڵام ئەقلێشمان -لێرەدایە کە تێکەڵ بە ڕاشیونالیستەکان دەبێت- خاوەنی چەند مەرجێکی گرنگە، کە لە ڕێگەیانەوە چۆنیەتی تێگەیشتنی دونیای دەرەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە. واتە، چەند هەل و مەرجێک لە ئەقلْی مرۆڤدا بوونی هەیە کە هاریکاری تێگەیشتنمان بۆ جیهان دەدەن.

- ئەمە بوو نمونەکەت؟

- باشتر وایە تاقیکردنەوەیەک بکەین... بەیارمەتیت ئەو چاویلکانەی سەر مێزەکە لەچاو بکە.

سۆفیا چاویلکەکانی لە چاو کرد، ئەوجا هەموو شتێکی چواردەوری ڕەنگی سووری گرت. ڕەنگە کاڵەکان بوونەتە سووری کاڵ و ڕەنگە تۆخەکانیش وەرگەڕاونەتە سەر تۆختر.

- چی دەبینیت؟

- تەواوی هەموو شتەکانی پێشووتر دەبینم، بەڵام ئێستاکە هەموو شتێک ڕەنگی سوورە.

- لەبەرئەوەی چاویلکەکە سنووریکی ئاشکرا بۆ چۆنیەتی ئەو هەقیقەتانە دادەنێت کە دەیانبینیت. واتە هەرچی شتێکی چواردەورت کە دەیبینیت، لە جیهانی دەرەوەتەوە هاتووە، بەڵام چۆنیەتی بینینت پەیوەندی بە چاویلکەکەوە هەیە. بەڵام هێشتام ناتوانیت بڵێیت جیهان سوورە، تەنها لەبەرئەوەی تۆ بەو جۆرەی دەبینیت.

- نەخێر بێگومان نا...

- ئەگەر ئێستا پیاسەیەکی ناو دارستانەکە بکەیت -یان بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە- ئەوا هەموو ئەو شتانەی کە دەیانبینیت وەک جاری جارانن، بەڵام بە سووری دەیانبینیت.

- بەڵێ، مەگەر چاویلکەکە لە چاوم داکەنم.

- بەم شێوەیە بوو، سۆفیا... ڕێک بەم شێوەیە بوو کە کانت دەیگوت لەناو ئەقڵماندا چەند توانایەک یان ئامادەگیەک هەیە کە کاریگەری لەسەر هەموو ئەزموونەکانمان دەکەن.

- ئەی ئەو توانایانە چین؟

- ئەو شتانەی هەستیان پێدەکەین هەرچی شتێک بن، لەپێش هەموو شتێکی تردا وەک دیاردەیەکی کات و شوێن لێیان تێدەگەین. کانت بە «کات» و «شوێن»ی دەگوت دوو «شێوەی هەڵسەنگاندن و تێگەیشتن»ی مرۆڤ. ئاماژەشی بۆ ئەوە دەکرد کە لەناو ئاگایماندا ئەم دوو شێوەیە

لەپێش هەموو ئەزموونێکدا دێن. واتە؛ پێش ئەوەی ئەزموونی شتێک بکەین، دەزانین دەکەوێتە ژێر دیاردەی «شوێن» و «کات»ەوە، چونکە ناتوانین چاویلکەی ئەقڵ دابکەنین.

ـ کەواتە پێی وابووە بینینی شتەکان بەپێی کات و شوێن، خاسیەتێکی زگماک بێت، وا نیە؟

ـ دەتوانین وا بڵێین. بەڵام جگە لەوەش ئەو شتانەی کە دەیانبینین بێگومان پشت بەوەش دەبەستێت کە ئێمە لە چ شوێنێکی جیهاندا گەورە دەبین، لە هندستاندا یان لە گرینلاندا. بەڵام لە هەر شوێنێکدا بژین، جیهان وەک پرۆسەیەکی کات و شوێن دەبینین. واتە دەتوانین بەلایەنی کەمەوە پێشبینی ئەمەیان بکەین.

ـ بەڵام ئایا کات و شوێن شتێک نین کە لە دەرەوەماندان؟

ـ نەخێر، کانت سوورە لەسەر ئەوەی کات و شوێن لەنێو بنچینەی پێکهاتەی مرۆڤدان. کات و شوێن لەپێش هەموو شتێکی تردا دوو خاسیەتی مێشکی مرۆڤن، نەک دوو خاسیەتی جیهان.

ـ ئەمە شێوەیەکی نوێی بینینی شتەکانە.

ـ واتە ئاگایی مرۆڤ تەنها «پەڕەیەکی سپی» نیە کە بە شێوەیەکی ناچالاکانە مۆرکە هەستیەکانی دەرەوەی لەسەر دەربکەوێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەر لە سەرەتاوە چالاکانە کاردەکات و بەشدارە لە تێگەیشتنماندا بۆ جیهان. دەتوانیت لەگەڵ پڕکردنی پەرداخێک ئاودا بەراوردی بکەیت؛ ئاوەکە بەپێی شێوەی پەرداخەکە خۆی دەگونجێنێت. بە هەمان شێوەش ڕەنگدانەوەی هەستەکانمان بەپێی دوو «شێوەی هەڵسەنگاندن و تێگەیشتنمان» خۆیان دەگونجێنن.

ـ پێم وابێت خەریکە تێدەگەم.

ـ كانت دەیگوت تەنها ئاگایی بەپێی شتەکان خۆی ناگونجێنێت، بەڵکو شتەکانیش بەپێی ئاگایی خۆیان دەگونجێنن. ئەو دەیگوت ئەمە «وەرچەرخانێکی کۆپرینکییە» لە بواری مەعریفەی مرۆڤدا. لێرەدا مەبەستی لەوەیە کە هەروەک چۆن کۆپرینکۆس سەلماندی کە زەوی بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە نەک پێچەوانەکەی، بە هەمان شێوەش بیرکردنەوەکەی ئەو هێندە نوێیە، وە هێندە لە ڕەگەوە لەگەڵ بیرکردنەوە کۆنەکاندا جیاوازە.

ـ ئێستاکە تێدەگەم مەبەستی چی بوو کە دەیگوت هەم ڕاشیونالیستەکان و هەم ئیمپیریستەکانیش ڕاستدەکەن. ڕاشیونالیستەکان تا ڕادەیەک گرنگی ئەزموونە هەستیەکانیان لەیادکردبوو، هەروەها ئیمپیریستەکانیش تا ڕادەیەک لە ئاستی گرنگی ئەقڵدا چاویان داخستبوو.

ـ تەنانەت خودی «یاسای هۆ»ش (*قانون السببیە) بەلای کانتەوە بەشێکە لە ئەقڵی مرۆڤ، ئەو یاسایەی کە هیوم دەیگوت ناتوانین بەهۆی ئەزموونەوە پەی پێبەرین.

ـ ڕوونتری ناکەیتەوە؟

ـ لەیادتە هیوم دەیگوت، تەنها خوگرتن (عادەتگرتن) وامان لێدەکات کە پەیوەنیەکی پێویستی یەک بەدوای یەکی دیاردەکانی سروشت ببینین. چونکە بەپێی هیوم ناتوانین هەستبکەین کە تۆپی بلیاردە ڕەشەکە، هۆی جولانەوەی تۆپە سپیەکەیە. کەواتە ناشتوانین بیسەلمێنین کە تۆپە ڕەشەکە هەمیشە تۆپە سپیەکە دەخاتە جولە.

ـ بەڵێ باشم لە یادە.

ـ بەلام ڕێک ئەو شتەی کە بەپێی هیوم ناتوانین بیسەلمێنین، کانت دێت و دەیکاتە خاسیەتێکی ئەقڵی مرۆڤ. یاسای"هۆ"ش هەمیشە هەر

دەمێنێتەوە و پەتیشە (موتڵەقە)، زۆر بە ئاسانی لەبەرئەوەی هەموو ئەو شتانەی کە ڕوودەدەن، بەشێوەیەک لە مێشکی مرۆڤدا لێکدەدرێتەوە کە وەک پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجام وابن.
- زیاتر وام پێخۆشە باوەڕ بەوە بکەم کە یاسای "هۆ" لە خودی سروشتدایە و لە ئێمەی مرۆڤدا بوونی نیە.
- کانت هیچ گومانێکی نیە کە ئەو یاسایە لەناو خۆماندایە. تا ڕادەیەکی یەکجار زۆریش لەگەڵ هیومدا تەبایە کە دەڵێت، ناتوانین بە دڵنیاییەوە بزانین جیهان «خۆی لە خۆیدا» بە چ شێوەیەکە. تەنها ئەوەندە دەتوانم بزانم کە جیهان بەلای «من»ەوە چۆنە —یان بەلای هەر مرۆڤێکەوە چۆنە. ئەو جیاوازکاریەی کە کانت دەیخاتە نێوان «das Ding an sich»و«das Ding für mich» ، بە گرنگترین بەشداریکردنی دادەنرێت لە فەلسەفەدا.
- ئەڵمانیەکەم زۆر بەهێز نیە.
- کانت جیاوازیەکی گرنگی لە نێوان «شتێک خۆی لە خۆیدا» و «شتەکە بەلای منەوە»دا دەرخست. هەرگیز بەدڵنیاییەوە ناتوانین بزانین شتەکان «خۆیان لە خۆیاندا» چۆن چۆنین، تەنها ئەوەندە دەزانین کە شتەکان بەلای ئێمەوە بە چ شێوەیەک خۆیان «دەردەخەن». بەڵام لە بەرابەردا دەتوانین لە پێش هەر ئەزموونێکەوە، شتێک دەربارەی ئەوە بڵێین کە ئەقڵی مرۆڤ چۆن چۆنی لێی تێدەگات.
- لەو بڕوایەدایت بتوانین؟
- ناتوانیت بەیانیان پێش ئەوەی لەماڵەوە بێیتە دەرەوە، پێشبینی تەواوەتی هەموو شتێک بکەیت کە ئەو ڕۆژە دێتە ڕێت. بەڵام دەتوانیت بزانیت کە هەموو ئەو شتانەی دەیبینیت، بە جۆرە

ڕووداوێکی نێو کات و شوێن دادەنرێت. لەسەرو ئەوەشەوە دەتوانیت دڵنیابیت کە یاسای "هۆ" هێشتام بەردەوام هەر هەیە، لەبەرئەوەی زۆر بە ئاسانی وەک بەشێکی ئاگایت لەگەڵ خۆتدا دەیگێڕیت.
ـ کەواتە دەکرا بەشێوەیەکی تر ئافەریدە بکرایانایە؟
ـ بەڵێ، دەکرا ئەندامێکی هەستی ترمان هەبوایە، بەم شێوەیەش دەکرا بە جۆرێکی تر هەستمان بە کات و بە جۆرێکی تریش شوێنمان ئەزموون بکردایە. لەسەرو ئەوەشەوە دەکرا بەشێوەیەک ئافەریدە بکرایانایە کە بەدوای هۆی ڕووداوەکانی چواردەورماندا نەگەڕایانایە.
ـ دەتوانیت نمونەیەک بهێنیتەوە؟
ـ وێنای ئەوە بکە پشیلەیەک لە ژورێکدا پاڵکەوتبێت و لە پڕێکدا تۆپێک خلببێتەوە... ئەو کاتە پشیلەکە چی دەکات؟
ـ چەندەها جار ئەوەم تاقیکردۆتەوە. پشیلەکە یەکسەر بەدوای تۆپەکەدا ڕادەکات.
ـ باشە. ئێستا وا مەزەندە بکە کە تۆ لە بری پشیلەکە لە ژورەکەدایت و لە پڕێکدا تۆپێک خلدەبێتەوە، ئایا تۆش یەکسەر دوای دەکەویت؟
ـ نەخێر، لە پێشدا ئاوڕێک دەدەمەوە بۆ ئەوەی بزانم تۆپەکە لە کوێوە هاتووە.
ـ ڕاستە، لەبەرئەوەی تۆ مرۆڤیت و دەتەوێت بە هەموو شێوەیەک هۆی هەموو ڕووداوێک بدۆزیتەوە. واتە یاسای "هۆ" بەشێکە لە پێکهاتەکەت.
ـ بە ڕاست؟
ـ هیوم دەیگوت ئێمە نە دەتوانین هەست بە یاساکانی سروشت بکەین و نە دەشتوانین بیان سەلمێنین، بەڵام کانت بڕوای بەوە نەبوو. ئەو دەیگوت لە ڕاستیدا باس لە یاساکانی مەعریفەی مرۆڤایەتی دەکەین،

وە ئەگەر بتوانین ئەم لایەنە دەربخەین، ئەوا دەکرێت هەتاهەتایی یاساکانی سروشت بسەلمێنین.
- ئایا منداڵێکیش ئاوڕ دەداتەوە بۆ ئەوەی بزانێت تۆپەکە لە کوێوە هاتووە؟
- لەوانەیە ئاوڕ نەداتەوە، بەڵام بە بڕوای کانت منداڵێک هەتا کەرەسەی هەستی نەبێت کە کاری لەسەر بکات، ئەوا ئەقڵی تەواو گەشەی نەکردووە. بە شێوەیەکی گشتیش هیچ مانایەکی نیە گەر باس لە ئەقڵێکی بەتاڵ بکەین.
- نەخێر، ئەوساکە دەبێتە ئەقڵێکی سەیر.
- ئێستاکە دەتوانین بە کورتی بڵێین؛ بەپێی کانت دوو پەیوەندیمان هەیە کە بەشداری چۆنیەتی تێگەیشتنی مرۆڤ دەکەن بۆ جیهان. یەکەمیان ئەو پەیوەندیە دەرەکیەیە، کە پێش ئەوەی هەستی پێنەکەین، ناتوانین هیچ شتێک دەربارەی بزانین، دەتوانین ئەمەیان ناو بنێین «مادەی مەعریفە». دووهەمیشیان پەیوەندیەکانی ناوەوەیە —خودی مرۆڤ- بۆ نمونە کە هەموو ڕووداوەکان لە چوارچێوەی کات و شوێندا دەبینین و لەسەرو ئەوەشەوە وەک پڕۆسەیەک دایدەنێین کە هەمیشە دوای یاسای "هۆ" دەکەوێت. دەتوانین بەمەیان بڵێین «فۆرم یان شێوەی مەعریفە.»

ئەلبێرتۆ و سۆفیا بۆ ماوەیەک بێدەنگ مانەوە و لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەیان دەکرد. لەپڕێکدا سۆفیا چاوی بە کچێک کەوت کە لەنێو دارەکانی ئەو بەر دەریاچەکەوە خۆی نیشاندان.
- تەماشاکە!... سۆفیا هاواریکرد... ئەوە کێیە؟
- بە ڕاستی نازانم کێیە.

کچەکە تەنها چەند چرکەیەک خۆی نیشاندان و لە پڕێکدا ونبوو. سۆفیا سەنجیدا کچەکە لەچکێکی سووری بەسەرەوە بوو.
ـ بەهەرحاڵ، با نەهێڵێین ئەم جۆرە شتانە جاڕسمان بکات.
ـ کەواتە بەیارمەتیت بەردەوام بە.
ـ کانت ئاماژەی بۆ شێوە سنوورمەندییەکی ڕوونی مەعریفەی مرۆڤیش دەکرد. لەوانەیە بتوانین بڵێین «چاویلکەی» ئەقڵ ئەو جۆرە سنوورانە دادەنێت.
ـ مەبەستت چیە.
ـ لەیادتە فەیلەسوفەکانی پێش کانت، پرسیارە فەلسەفیە «گەورەکانیان» دەهێنایە سەر باس و خواس ـبۆ نمونە دەیانپرسی ئایا ڕۆحی مرۆڤ نەمرە یان نا؟ ئایا خودا بوونی هەیە؟ یان ئایا سروشت لە چەند بەشێکی چکۆلەی دابەشنەکراو پێک هاتووە؟ ئایا گەردوون کۆتایی هەیە یان بێ کۆتاییە؟... هتد.
ـ بەڵێ.
ـ بە بڕوای کانت، مرۆڤ ناتوانێت بە دڵنیاییەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بزانێت. ئەمە مانای ئەوە نیە کە نکۆڵی لێدەکردن. بە پێچەوانەوە، ئەگەر کانت نکۆڵی لەو جۆرە پرسیارانە بکردایە، ئەوا پێی نەدەگوترا فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە.
ـ ئەی چی کرد؟
ـ کەمێک ئارامت بێت... بە بڕوای کانت، کاتێک دێینە سەر باسی ئەو پرسیارانە، ئەقڵ لە دەرەوەی بازنەی مەعریفەدا کاردەکات. بەڵام لە هەمان کاتیشدا پێویستیەکی بنچینەیی لە سروشتی مرۆڤدا هەیە ـ یان لە ئەقڵی مرۆڤدا- کە ڕێک هانی وروژاندنی ئەو پرسیارانە دەدات. بەم شێوەیە بۆ نمونە کاتێک دەپرسین ئایا گەردوون کۆتایی

هەیە یان بێکۆتاییە، ئەوا پرسیارێک دەربارەی شتێکی کۆ دەکەین، کە خۆمان بەشێکی پچکۆلەی لێ پێکدەهێنین. لەبەرئەوە هەرگیز ناتوانین بەشێوەیەکی پڕاوپڕ پەی بە شتە «کۆ»کە بەرین.

ـ بۆ نا؟

ـ لەو کاتەدا کە چاویلکە سوورەکەت لەچاوکرد، ئەوا بەپێی کانت دەمانزانی کە زانیاریمان دەربارەی جیهان لە ڕێگەی دوو هۆوە دێت.

ـ بەهۆی ئەقڵمان و ئەزموونی هەستەکانەوە بوو.

ـ بەڵێ، کەرەسەی مەعریفەکەمان لە ڕێگەی هەستەکانەوە دێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەو کەرەسەیە خۆی لەسەر خاسیەتەکانی ئەقڵ دەگونجێنێت. بۆ نمونە کاتێک پرسیاری هۆی ڕووداوێک دەکەین، ئەوا پەیوەندی بە خاسیەتی ئەقڵەوە هەیە.

ـ بۆ نمونە وەک ئەوەی بۆچی تۆپێک بەسەر زەویدا خل دەبێتەوە، مەبەستت ئەوەیە؟

ـ بەڵێ. بەڵام کاتێک بیر لەوە دەکەینەوە کە جیهان چۆن دروست بووە و چەندەها وەڵامی جیاواز جیاواز هەڵدەڕێژین، ئەوا ئەو کاتە ئەقڵ لە شێوە بازنەیەکی بەتاڵدا دەخولێتەوە. لێرەشەوە ئەقڵ لە ڕاستیدا هیچ جۆرە کەرەسەیەکی هەستی نیە کە «کاری لەسەربکات». واتە هیچ جۆرە ئەزموونێکی نیە کە بەکاری بهێنێت، چونکە هەرگیز تەواوی ئەو هەقیقەتە گەورەیەمان ئەزموون نەکردووە، کە خۆمان تەنها بەشێکی بچکۆلەی لێ پێکدەهێنین.

ـ کەواتە تا ڕادەیەک ئێمە خۆمان بەشێکی پچکۆلەی ئەو تۆپەین کەبەسەر زەویەکەدا خلدەبێتەوە. بەم شێوەیەش ناتوانین بزانین لە کوێوە هاتووە.

- بەڵێ، بەڵام «پرسیارکردن» دەربارەی سەرچاوەی ئەو تۆپە، هەمیشە وەک خاسیەتێکی ئەقڵی مرۆڤ دەمێنێتەوە. لەبەرئەوە بەردەوام هەر دەپرسین و هەتا ئەو پەڕی تواناش خۆمان ماندوو دەکەین کە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارە گەورانە بدەینەوە. بەڵام هەرگیز شتێکی دیاریکراو نادۆزینەوە، هەرگیز وەڵامێکی دڵنیامان دەست ناکەوێت، چونکە ئەقڵ لە بازنەیەکی بەتاڵدا دەخولێتەوە.
- سوپاس، تەواو ئاشنام بەو هەستە!
- بەپێی سەرنجی کانت کاتێک ئەو پرسیارە گەورانە دەربارەی هەموو هەقیقەت دەکرێت، ئەوا لە ئەقڵی مرۆڤدا هەمیشە دوو بۆچوونی دژ بەیەک دێنە ئاراوە، کە هەردووکیان لە هەمان کاتدا وەک یەک ڕێیان تێدەچێت و ڕێشیان تێناچێت.
- بەیارمەتیت نمونە بهێنەرەوە!
- بۆ نمونە ئەگەر بڵێین جیهان، وەک کات، سەرەتایەکی هەبووە یان سەرەتای نەبووە، ئەوا لە هەردوو بارەکەدا بۆچوونەکەمان وەک یەک ماناداره. بەڵام مەزەنە کردنی هەردوو بارەکە بەلای ئەقڵەوە وەک یەک نەگونجاوە. دەتوانین بڵێین جیهان هەمیشە هەر بوونی هەبووە، بەڵام ئایا دەگونجێت شتێک هەمیشە هەر بوونی هەبووبێت بەبێ ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرەتایەکی هەبووبێت؟ لێرەدا ناچاردەبین بۆچوونەکەی تر بهێنینە ئاراوە، ئەوسا دەڵێین؛ دەبێت جیهان ڕۆژێک لە ڕۆژان دروست بووبێت «دەشبێت لە هیچەوە دروست بووبێت»، ئەگەر نا، کەواتە تەنها باس لە گۆڕانکاریەک دەکەین لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر. بەڵام ئایا ڕێی تێدەچێت شتێک لە هیچەوە دروست بێت، سۆفیا؟

ـ نەخێر، هەردوو بارەکە وەک یەک نەگونجاوە. بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێت یەکێکیان ڕاست بێت و ئەوی تریان هەڵە بێت.
ـ بێگومان لە یادتە کە دیمۆکریتس و مەتریالیستەکان دەیانگوت دەبێت سروشت لە چەند توخمێکی پچکۆلە پێک هاتبێت کە کۆدەبنەوە و شتەکان دروست دەکەن. بەبڕوای چەند فەیلەسوفێکی تریش ـبۆ نمونە دیکارت- هەقیقەتی درێژبووەوە (مادی) هەمیشە ڕێی تێدەچێت بەسەر بەشی بچکۆلەتردا دابەشبکرێت. بەڵام کام لایان ڕاستیان دەکرد؟
ـ هەردوولا... هیچیان.
ـ پاشانیش کۆمەڵێ فەیلەسوف دەیانگوت یەکێک لە خاسیەتە هەرە گرنگەکانی مرۆڤ سەربەستیە. لە هەمان کاتیشدا چەند فەیلەسوفێکی ترمان ناسی ـبۆ نمونە ستۆیکەکان و سپینۆزا- کە لەو بڕوایەدابوون هەموو شتێک بەپێی یاسای پێویستی سروشت بچێت بەڕێوە. دیسانەوە لێرەشدا کانت لەو بڕوایەدایە کە نەتوانین بە دڵنیاییەوە حوکم بدەین .
ـ بڕواکردن لە هەردوو بارەکەدا وەک یەک ئاقڵانەیە و نائاقڵانەشە.
ـ لەدواجاریشدا گەر بمانەوێت بەهۆی ئەقڵەوە خودا بسەلمێنین، ئەوا دەگەینە ڕێگەیەکی داخراو. لەم بارەیەوە ڕاشیونالیستەکان ـبۆ نمونە وەک دیکارت- هەوڵیان دەدا بەم شێوەیە بوونی خودا بسەلمێنن؛ خودا دەبێت بوونی هەبێت، زۆر بە ئاسانی لەبەرئەوەی وێنای «بوونەوەرێکی پڕاوپڕ» مان هەیە. چەند فەیلەسوفێکی تریش ـ وەک ئەریستۆتالیس و تۆماس ئەکویناس بۆ نمونە- گەیشتنە ئەوەی خودا دەبێت بوونی هەبێت، لەبەرئەوەی دەیانگوت هەموو شتێک دەبێت هۆیەکی یەکەمینی هەبێت.

ـ ئەی کانت لە چ بڕوایەکدا بوو؟
ـ ئەو بڕوای بە هیچ یەکێک لەو سەلماندنانە نەدەکرد. ئەقڵ و هەست بنەمایەکی دڵنیایان نیە کە بتوانێت بڵێت خودا بوونی هەیە. بوون و نەبوونی خودا بەلای ئەقڵەوە وەک یەک ڕێیان تێدەچێت.
ـ بەڵام لە سەرەتادا گوتت کانت دەیویست بنچینەی بڕوای ئاینی مەسیحی بپارێزێت.
ـ بەڵێ، ئەو دەرگای ئەگەرێکی دینی دەکاتەوە؛ لەو شوێنەدا کە ئەقڵ و ئەزموون دەگەنە ڕێگایەکی داخراو، لەوێدا بۆشاییەک دروست دەبێت کە دەکرێت بە «بڕوای» ئاینی پڕ بکرێتەوە.
ـ بەم شێوەیەش مەسیحیەتی ڕزگارکرد، وانیە؟
ـ دەتوانیت وا بڵێیت. بەڵام دەبێت بڵێین کە کانت خۆی پڕۆتستاند بوو. لە سەردەمی چاکسازیەوە، کڵێسەی پڕۆتستاندی وەک بنچینەیەک، تەنها بە ئیمانکردنیان ناسرابوون. لە کاتێکدا کڵێسەی کاتۆلیکی، هەر لەسەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستەوە لەو بڕوایەدابوون کە ئەقڵیش پشتگیری ئیمان بکات.
ـ تێدەگەم.
ـ بەڵام کانت ئەو پرسیارانەی تەنها بۆ ئیمان بەجێ نەدەهێشت، بەڵکو کەمێک قوڵتر دەیڕوانی. ئەو تاڕادەیەک وەک بنچینەیەکی ئەخلاقی دادەنا کە بڵێین مرۆڤ ڕۆحێکی نەمری هەیە، کە خودا بوونی هەیە، کە مرۆڤ خاوەنی ویستی سەربەستە.
ـ کەواتە تا ڕادەیەک وەک دیکارتی دەکرد؛ لەسەرەتادا گومانی لەو شتانە دەکرد کە دەتوانین لێیان تێبگەین، پاشانیش بەدزییەوە خودا و کۆمەڵێ شتی تریشی دەخستە ناو بابەتەکەوە.

ـ بەڵام ئەو بە پێچەوانەی دیکارتەوە، سوورە لەسەر ئەوەی کە ئیمان بەو ئەنجامەی گەیاند نەک ئەقڵ. ئەو خۆی بە بڕواکردن بە ویستی سەربەستی مرۆڤ و ڕۆحی نەمر و بە بوونی خودای دەگوت «گریمانە کرداریەکان.»

ـ ئەی مانای ئەوە چیە؟

ـ «گریمانەکردنی» شتێک، واتە جەختکردن لەسەر ئەو شتە بەڵام بەبێ ئەوەی بسەلمێنرێت. مەبەستی لە گریمانەی کرداریش، ئەو شتەیە کەلەبەر خاتری لایەنی کرداری (پراکتیکی) مرۆڤ دەبێت دووپاتبکرێتەوە، واتە لەبەر خاتری ئەخلاقی مرۆڤ. ئەو دەیگوت؛ «بڕوابوون بە بوونی خودا پێویستیەکی ئەخلاقیە.»

لە پڕێکدا لە دەرگا درا. سۆفیا یەکسەر بەرز بووەوە، بەڵام ئەلبێرتۆ لە شوێنی خۆی نەجوڵایەوە. ئەوجا سۆفیا گوتی؛

ـ باشتر وایە دەرگاکە بکەینەوە، پێت وا نیە؟

ئەلبێرتۆ شانەکانی هەڵتەکاند، بەڵام دواجار ئەویش هەستا. دەرگاکەیان کردەوە و لە دەرەوەڕا کچێکی کراس سپی وەستابوو، کڵاوێکی سووریشی لە سەردا بوو. ئەو کچەبوو کە لەوەوپێش لەو بەری دەریاچەکەوە بینیان. زەمیلەیەکی پڕ لە خواردنیشی بەدەستەوە بوو.

ـ چۆنیت؟ تۆ کێیت؟... سۆفیا لێی پرسی.

ـ نابینیت من «کڵاو سوورەم»؟

سۆفیا سەیرێکی ئەلبێرتۆی کرد و ئەویش سەرێکی لەقاند و گوتی؛

ـ خۆ گوێت لێبوو ئەو وتی چی؟

ـ بەدوای ماڵی نەنکمدا دەگەڕێم. نەخۆش و پیرە، منیش خواردنم بۆ هێناوە.

- ئێرە نیە. بە ڕێگای خۆتا بڕۆی باشترە، دەی!
ئەلبێرتۆ لەگەڵ ئەم قسانەدا بەشێوەیەک دەستی بادەدا، دەتگوت مێشوولە دەردەکات، بەڵام کچە کڵاو سوورەکە درێژەی بە قسەکانی دا؛
- ئاخر دەبوایە نامەیەکیشم بگەیاندایە.
پاش کەمێک کچە کڵاو سوورەکە نامەیەکی دەرهێنا و دایە دەستی سۆفیا. ئەوجا ڕێگەی خۆی گرتە بەر.
- وریای گورگەکە بە... سۆفیا هاواری لێکرد.
پاشان سۆفیا دوای ئەلبێرتۆ کەوت، کە لەپێش ئەودا هاتبووە ژورەوە. لەسەر کورسیەکانیان دانیشتنەوە و سۆفیا بەسەرسوڕمانێکەوە گوتی؛
- کێ کڵاوسوورەی بە خەیاڵدا دەهات.
- سوودیشی نیە پێی بڵێیت وریابە. لەبەرئەوەی دەڕواتە ماڵی نەنکی و گورگەکە دەیخوات. هەرگیزیش فێر نابێت؛ ئەم شتە بۆ هەتا هەتایە دووبارە دەبێتەوە.
- بەڵام هەرگیز نەمبیستووە پێش ئەوەی بگاتە ماڵی نەنکی لە دەرگای هیچ ماڵێکی تر بدات.
- لێی گەڕێ، سۆفیا.
ئەوجا سۆفیا تەماشای نامەکەی کرد، لەسەرەوە نووسرابوو «بۆ هیلدە». نامەکەی کردەوە و بە دەنگی بەرز خوێندیەوە؛
«هیلدە گیان؛ ئەگەر مێشکی مرۆڤ هێندە ساکار بوایە کە بمان توانیبایە لێی تێبگەین، ئەوا ئەو کاتەش هێندە بێ ئەقڵ دەبووین کە نەمان دەتوانی لێی تێبگەین... سڵاوی خۆشەویستانەی بابەت لێبێت.»
ئەلبێرتۆ سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی؛

ـ ڕاست دەکات. پێم وابێت کانتیش بوایە هەر هەمان شتی دەگوت. ناتوانین چاوەڕوانی ئەوە بین کە تێبگەین ئێمە چین. لەوانەیە توانای ئەوەمان هەبێت لە گوڵێک یان لە مێشوولەیەک تێبگەین، بەڵام هەرگیز ناتوانین لە خۆمان تێبگەین. بێگومان هەر زۆر زۆر کەمتریش لە گەردوون تێدەگەین.
سۆفیا ڕستە سەیرەکەی ناو نامەکەی یەک دوو جار خوێندەوە و پاشان ئەلبێرتۆ بەردەوامبوو؛
ـ لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە نەهێڵین ماری ئاوی و ئەو جۆرە شتانە ببنە ڕێگرمان. دەمەوێت پێش ئەوەی بابەتی ئەمڕۆمان تەواو بکەین، باسی زانستی ئیتیکی "کانت"ت بۆ بکەم.
ـ کەواتە کەمێک خێراکە، لەبەرئەوەی پاش ماوەیەک دەبێت بگەڕێمەوە ماڵەوە.
ـ هیوم گومانی لە هەموو شتێک دەکرد کە ئەقڵ و هەستەکانمان پێمان دەڵێن، ئەم گومانەی هیوم، کانتی ناچارکرد سەرلەنوێ بیر لە پرسیارە هەرە گرنگەکانی ژیان بکاتەوە. هەڵبەتە لایەنی مۆراڵیشی دەگرتەوە.
ـ بەڵێ هیوم دەیگوت؛ ناتوانین بیسەلمێنین چی ڕاستە و چی هەڵەیە. لەبەرئەوەی لە «شتێکەوە کە هەیە و وایە –واتە لە ڕستەیەکی وەسفیەوە» ناتوانین دەرئەنجامێک دەربهێنین و بڵێین «کەواتە دەبێت وابێت –واتە ناتوانین بگەینە ڕستەیەکی دەرئەنجامی.«
ـ بەپێی هیوم، نە ئەقڵمان و نە ئەزموونەکانیشمان ڕێگەمان پێدەدەن ڕاست و هەڵە جودا بکەینەوە، بەڵکو زۆر بەئاسانی لە ڕێگەی هەستەکانمانەوە دەتوانین جودایان بکەینەوە. ئەم بنچینەیەش بەلای کانتەوە زۆر لاوازبوو.

ـ بەڵێ تێدەگەم.
ـ کانت هەر لە سەرەتاوە بەقووڵی هەستیدەکرد کە جیاوازی نێوان ڕاست و هەڵە شتێکی تەواو ڕاستی بێت. لێرەدا لەگەڵ ڕاشیونالیستەکاندا تەبایە کە دەیانگوت جیاکردنەوەی ڕاست و هەڵە لە مێشکی مرۆڤدایە. هەموو کەسێک دەزانێت چی ڕاستە و چیش هەڵەیە، ئەمەش نەک تەنها لەبەرئەوەی شتێکە کە فێری بوون، بەڵکو لەبەرئەوەشە کە شتێکە لە مێشکماندا دانراوە و بوونی هەیە. بەپێی کانت هەموو کەسێک «ئەقڵێکی کرداری» هەیە، واتە توانایەکی ئەقڵیمان هەیە کە هەمیشە لەسەر ئاستی مۆراڵدا دەتوانێت پێمان بڵێت چی ڕاستە و چی هەڵەیە.
ـ کەواتە توانایەکی زگماکە؟
ـ توانای جیاکردنەوەی ڕاست و هەڵە، هەر وەک هەموو خاسیەتەکانی تری مێشک، زگماکە. هەروەک چۆن هەموو کەسێک هەمان شێوەی درککردنی هەیە –بۆنمونە ئێمە هەموو شتێک لە ڕێگەی یاسای "هۆ"وە تێدەگەین- بەهەمان شێوەش هەموو کەسێک دەتوانێت بگاتە هەمان «یاسای مۆراڵی» گەردوونی. ئەم یاسای مۆراڵی گەردونیەش، وەک یاسا فیزیاویە سروشتیەکان، هەمان ڕاستی موتڵەقی هەیە. هەروەک چۆن هەموو شتێک دەبێت هۆیەکی هەبێت، یان هەروەک چۆن هاوکێشەی 7+5=12، بەلای تێگەیشتنی ئەقڵمانەوە وەک بنچینەیەک دادەنرێت. ئەم یاسایەش بەهەمان شێوە، وەک بنچینەی ژیانی مۆراڵمان دادەنرێت.
ـ ئەی باشە ئەم یاسا مۆراڵیە چی دەڵێت؟
ـ لەبەرئەوەی ئەم یاسایە لەپێش هەموو شتێکدا دێت، کەواتە «بێ چەندوچوونە». واتە پەیوەندی بە هیچ بارودۆخێکی تایبەتیەوە نیە

کە هەڵبژاردنێکی مۆراڵی تێدا بێت. هەموو مرۆڤێکیش دەگرێتەوە، لە هەر کۆمەڵگایەکدا بن و لە هەر کاتێکیشدا بێت. بەم شێوەیە لە بارودۆخە جیاوازەکاندا پێت نالێت دەبێت چی بکەیت و چی نەکەیت، بەڵکو لە «هەموو» بارودۆخێکدا پێت دەڵێت بە چ شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەیت.

ـ بەڵام یاسایەکی مۆراڵی ئاوها، ئەگەر لەبارودۆخێکی دیاریکراودا پێمان نەڵێت دەبێت چی بکەین و چی نەکەین، ئەوا چ سوودێکی هەیە؟

ـ کانت یاسا مۆراڵیەکەی وەک «فەرمانێکی بێ چەندوچوون» دارشت. مەبەستی لە بێ چەندوچوونی ئەوەیە کە لە هەموو بارودۆخێکدا بەکاردێت و جگە لەوەش «فەرمانیشە» واتە دەبێت بەجێ بهێنرێت.

ـ ئمم، بەم شێوەیە...

ـ کانت یاسا مۆراڵیەکەی بە چەند شێوەیەکی جیاواز دادەڕێژێت. لە سەرەتادا دەڵێت؛ «دەبێت هەمیشە بە شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەیت، کە وا بخوازیت ئەو یاسایەی کە بەپێی هەڵسوکەوت دەکەیت، ببێتە یاسایەکی گشتی.»

ـ کەواتە کاتێک شتێک دەکەم، دەبێت هیواداربم کە هەموو خەڵکانی تر، ئەگەر تووشی هەمان حاڵەت بوون، ئەوا ڕێک وەک من بکەن.

ـ ڕێک تەواوە. تەنها لەم کاتەدا لەگەڵ یاسا مۆراڵیەکەی ناوەوەتدا هاوشان دەڕۆیت و هەڵسوکەوت دەکەیت. کانت یاسا مۆراڵیەکەی بەم شێوەیەش دادەڕێژێت و دەڵێت؛ «هەمیشە وەک ئامانجێک هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤێکی تردا بکە، نەک وەک وەسیلەیەک بۆ ئەوەی شتێکی تر بەدەست بهێنیت.»

ـ کەواتە نابێت خەڵکانی تر بەشێوەیەک «بەکاربهێنین»، تەنها بۆ ئەوەی بە بەرژەوەندی خۆمان بگەین.
ـ نەخێر نابێت، لەبەرئەوەی هەموو کەسێکی تر خۆی لە خۆیدا ئامانجێکە. بەڵام ئەمە تەنها خەڵکانی تر ناگرێتەوە؛ بەڵکو خۆشت دەگرێتەوە. نابێت تەنانەت خۆشت وەک وەسیلەیەک بەکاربهێنیت بۆ ئەوەی بگەیتە شتێک.
ـ ئەمە تا ڕادەیەک لە «یاسا ئاڵتونیەکە» دەچێت کە دەڵێت؛ بە چ شێوەیەک پێت خۆشە خەڵکانی تر لەگەڵتا هەڵسوکەوت بکەن، تۆش بەهەمان شێوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە.«
ـ بەڵێ، ئەمەش دەستورێکی «بێ چەندوچوونە»، کە لە بنچینەدا هەموو لایەنەکانی ئەخلاق دەگرێتەوە. دەتوانیت بڵێیت ئەم «یاسا ئاڵتونیەش» هەمان «یاسا مۆراڵیەکەی»کانت دەردەبڕێت.
ـ بەڵام ئەمانە تەنها گریمانەکردنن. هیومیش ڕاستی دەکرد کاتێک دەیگوت کە ناتوانین بەهۆی ئەقڵەوە بیسەلمێنین چ شتێک ڕاستە و چ شتێکیش هەڵەیە.
ـ بەلای کانتەوە یاسای مۆراڵ بۆ نمونە هەروەک یاسای "هۆ"، گومان هەڵنەگر و گشتیە. ئەم یاسایەش بەهۆی ئەقڵەوە ناسەلمێنرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوەتی نەگۆڕە و هیچ مرۆڤێک ناتوانێت نکۆڵی لێبکات.
ـ هەستدەکەم لە بنەڕەتدا باسی ویژدان دەکەین، پێم وابێت هەموو کەسێک ویژدانی هەیە، وا نیە؟
ـ بەڵێ، کاتێک کانت باس لە یاسای مۆراڵ دەکات، ئەوا لە ڕاستیدا باسی ویژدانی مرۆڤ دەکات. ناتوانین ئەو شتانە بسەلمێنین کە ویژدانمان پێمان دەڵێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاشناین پێیان.

ـ هەندێ جار بە شێوەیەکی جوان ڕفتاردەکەم و یارمەتی خەڵکی دەدەم، بەڵام ئەمە تەنها لەبەرئەوەیە کە دەزانم باشەکەی بۆ خۆم دەگەڕێتەوە –بۆ نمونە لەوانەیە بەم شێوەیە ناوبانگ دەرکەم.
ـ بەڵام ئەگەر هاریکاریەکەت تەنها لەبەرئەوە بێت کە ناوبانگ دەرکەیت، ئەوا بەپێی یاسای مۆراڵ ناجوڵێیتەوە. لەوانەیە هاوشانی یاسای مۆراڵ هەڵسوکەوت بکەیت –ڕێی تێدەچێت ئەمەشیان هەر باش بێت- بەڵام بۆ ئەوەی شتێک پێی بگوترێت هەڵسوکەوتێکی مۆراڵی، ئەوا دەبێت ئەنجامی شێوە زاڵبوونێک بێت بەسەر خۆتدا. تەنها ئەو کاتەی شتێک بە شێوەیەک دەکەیت، کە هەستکەیت ئەرکی سەرشانتە بەپێی یاسای مۆراڵی بجوڵێیتەوە، ئەوا تەنها ئەو کاتە دەکرێت بە هەڵسوکەوتێکی مۆراڵی لەقەڵەم بدرێت. هەر لەبەرئەمەشە کە بەزانستی ئیتیکی کانت دەگوترێت «زانستی ئیتیکی ئەرکی سەرشان.«
ـ هەستدەکەم ئەرکی سەرشانمە پارە بۆ ڕێکخراوی یارمەتی منداڵان و ڕێکخراوە خێرخوازەکانی تر کۆبکەمەوە.
ـ بەڵێ، ئەو شتەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە تۆ لەو بڕوایەدایت شتێکی ڕاست دەکەیت. هەرچەندە ئەو پارەیەی کە کۆی دەکەیتەوە لێشت ون بێت یان نەشگاتە سکە برسیەکان –واتە نەگاتە جێی مەبەست- هێشتام لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی یاسای مۆراڵ هەڵسوکەوتت کردووە. تۆ لەسەر تەرزی بیرکردنەوەیەکی ڕاست ڕەفتارت کردووە و بەپێی کانتیش ئەو تەرزە بیرکردنەوەیەیە کە گرنگە بۆ ئەوەی بە شتێک بگوترێت هەڵسوکەوتێکی مۆراڵی ڕاست، لێرەدا ئەنجامەکە گرنگ نیە. لەبەرئەوە ناوی «ئیتیکی تەرزی بیرکردنەوە»ش لە ئیتیکی کانت دەنرێت.

- بۆچی هێندە بەلایەوە گرنگە کە ڕێک بزانێت کەی مرۆڤ بەپێی یاسای مۆراڵ ڕفتاردەکات یان نایکات؟ ئایا گرنگتریک نیە گەر ئەو شتانەی دەیکەین لە پێناوی باشەی خەڵکانی تردا بێت؟
- بەڵێ، کانتیش لەگەڵ ئەم بڕوایەی تۆدا تەبایە. بەڵام تەنها ئەو کاتە بە «سەربەستی» ڕەفتاردەکەین کە بەپێی یاسای مۆراڵ بجوڵێینەوە.
- تەنها ئەو کاتە بە سەربەستی ڕەفتاردەکەین کە بەپێی یاسایەک بجوڵێینەوە؟ کەمێک بەلاتەوە سەیر نیە؟
- نەخێر بەلای کانتەوە سەیر نیە. لەوانەیە لەیادت بێت کە ناچاربوو «وایدانێت» یان «گریمانەی ئەوە بکات» کە مرۆڤ خاوەنی ویستێکی سەربەست بێت، لەیادتە؟... ئەمە خاڵێکی گرنگە، لەبەرئەوەی بەبڕوای کانت هەموو شتێک بەپێی یاسای "هۆ" دەچێت بەڕێوە، ئەی کەواتە چۆن دەکرێت خاوەنی ویستێکی سەربەست بین؟
- لە من مەپرسە.
- لەوێدا کانت بە شێوەیەک مرۆڤ دەکات بە دوو بەشەوە، کە وەسفکردنەکەی دیکارتمان دێنێتەوە یاد کاتێک کە دەیگوت مرۆڤ «بوونەوەرێکی دووانیە»، لەبەرئەوەی لە لەش و ئەقڵ پێکهاتووە. کانت لەو بڕوایەدایە کە ئێمە وەک بوونەوەرێکی خاوەن هەست، تەواو ملکەچی یاسای نەشکێنراوی "هۆ"بین. ئێمە خۆمان هەستەکانمان هەڵنابژێرین، بەڵکو بمانەوێت و نەمانەوێت مۆرکە هەستیەکان بە پێویستی دێنە ناومانەوە و ڕەنگ دەدەنەوە. بەڵام ئێمە تەنها بوونەوەرێکی خاوەن هەست نین، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا بوونەوەرێکی ئەقڵانیشین.

ئێمە وەک بوونەوەرێکی خاوەن هەست بە تەواوەتی سەر بە ڕژێمی سروشتین و جودا ناکرێینەوە لێی، لەبەرئەوەی ئێمەش لەژێر یاسای "هۆ"داین. بەم جۆرەش لە ڕاستیدا هیچ جۆرە ویستێکی سەربەستمان نیە. بەڵام وەک بوونەوەرێکی ئەقلانی سەر بەو شتەین کە کانت پێی دەڵێت «ئەو بەشەی جیهان کە وەک خۆی هەیە»، واتە ئەو بەشەی جیهان کە پشت بە مۆرکە هەستیەکانمان نابەستێت. تەنها ئەو کاتە ویستی سەربەستمان هەیە، کە بەپێی «ئەقڵی کرداری»مان دەجوڵێینەوە، ئەو ئەقڵەی کە وامان لێدەکات بڕیاری هەڵبژاردنە مۆراڵیەکانمان بدەین. لەبەرئەوەی کاتێک ملکەچی یاسای مۆراڵی دەبین، ئەو کاتە ملکەچی یاسایەکین کە خۆمان بۆ خۆمانمان داناوە و لەسەریشی دەڕۆین.

ـ بەڵێ، تا ڕادەیەک ڕاستە. بێگومان خۆم -یان شتێک لەناو خۆمدا- پێم دەڵێت نابێت بەرامبەر خەڵکانی تر ناشیرینانە ڕەفتار بکەم.

ـ کاتێک بڕیاری ئەوە دەدەیت کە ناشیرینانە ڕەفتار نەکەیت - هەرچەندە پێی دەچێت دژ بە بەرژەوەندی خۆشت بێت- ئەوا ئەو کاتە بەسەربەستی هەڵسوکەوت دەکەیت.

ـ بەڵام بەلایەنی کەمەوە زۆر سەربەست یان سەربەخۆ نابین، ئەگەر تەنها دوای ئارەزووەکانمان بکەوین.

ـ بەڵکو دەبینە کۆیلەی «هەموو» شتێک... بەڵێ، تەنانەت دەکرێت ببینە کۆیلەی خۆپەرستیشمان. ئێمە بۆ ئەوەی بەسەر هەوەس و ئارەزووەکانماندا زاڵ بین، پێویستیمان بە سەربەخۆیی و ئازادییە.

ـ ئەی دەربارەی ئاژەڵ چی؟ خۆ ئەوان تەنها دوای ئارەزوو و پێداویستیەکانیان دەکەون. ئەوان سەربەستیەکی ئاوها پێویستیان نیە کە لەسەر یاسای مۆراڵ ڕەفتاربکەن؟

- نەخێر، ڕێک ئەو سەربەستیەشە کە ئێمە دەکاتە مرۆڤ.
- پێم وابێت ئێستاکە تێدەگەم.
- لە کۆتایی باسەکەماندا دەتوانین بڵێین؛ کانت سەرکەوتوانە لە گێژاوی فەلسەفی نێوان ڕاشیونالیستەکان و ئیمپیریستەکاندا، توانی بێتە دەرەوە. لەبەرئەوە لەگەڵ کانتدا قۆناغێکی تری فەلسەفە تەواو بوو. لەساڵی 1804دا مرد، ڕێک لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو سەردەمەی کە ئێمە پێی دەڵێین ڕۆمانسی "Romance". لەسەر قەبرەکەی لە شاری کۆنیگسبێرگدا، یەکێک لە وتە هەرە بەناوبانگەکانی نووسراوە؛ «هەمیشە دوو شت لە مێشکمدایە و بەڕێز و سەرسوڕمانەوە گەشە دەکەن؛ ئەستێرە گەشەکانی ئاسمان لەسەرومەوەیە و یاسای مۆراڵیش لە ناوەوەمدایە» و دواتریش دەڵێت؛ «بەلای منەوە ئەم دوو شتە بەڵگەیەکن بۆ ئەوەی خودایەک لە سەرومەوە هەیە و خودایەکیش لە ناوەوەمدایە.»
ئەوجا ئەلبێرتۆ پاڵی بە کورسیەکەیەکەوە نایەوە و گوتی؛
- ئیتر لێرەدا دەوەستین، پێم وابێت گرنگترین شتمان دەربارەی کانت باسکرد.
- کاتژمێر چوار و چارەکە.
- شتێکی تریش ماوە، بەیارمەتیت کەمێک بوەستە.
- هەتا مامۆستاکەم نەڵێت وانەکە تەواو بوو، هەرگیز پۆلەکەم بەجێ ناهێڵم.
- پێم گوتیت بە بڕوای کانت ئەگەر ئێمە تەنها وەک بوونەوەرێکی خاوەن هەست بژین، ئەوا هیچ جۆرە سەربەستیەکمان نیە؟
- بەڵێ، شتێکت لەو بابەتەت گوت.

ـ ئەی ئەوەشم گوت ئەگەر بەپێی ئەقڵی گەردوونی بجوڵینەوە، ئەوا سەربەست و سەربەخۆ دەبین؟
ـ بەڵێ، بەڵام بۆ دووبارەی دەکەیتەوە؟
ئەلبێرتۆ خۆی لە سۆفیا نزیککردەوە و بە قوڵی تەماشای نێو چاوی دەکرد، پاشان بە چرپە پێی گوت؛
ـ سۆفیا... باوەڕ بە هەموو ئەو شتانە مەکە کە دەیانبینیت.
ـ مەبەستت چییە؟
ـ تێڕوانینت بخەرە سەر ڕێگایەکی تر، کچەکەم.
ـ بە هیچ جۆرێک تێناگەم مەبەستت چییە.
ـ ئاساییە گەر بڵێین «هەتاوەکو بەچاوی خۆم نەیبینم، باوەڕی پێناکەم»، بەڵام تەنانەت ئەو «کاتەش» باوەڕی پێمەکە.
ـ لەوەو پێشیش شتێکت لەم بارەیەوە گوت.
ـ بەڵێ، دەربارەی پارمێندیس بوو.
ـ بەڵام هێشتام تێناگەم باسی چی دەکەیت.
ـ هێیی... لەیادتە کە لە دەرەوە دانیشتبووین و قسەمان دەکرد... ئەو کاتەی ماری ئاویەکە لە دەریاچەکەوە هاتە دەرەوە و دەجوڵایەوە.
ـ بەڵێ، سەیر نەبوو؟
ـ نەخێر، بەهیچ جۆرێک سەیر نەبوو. پاشانیش کچە کڵاو سوورەکە هات و لەدەرگای دا و گوتی؛ «بەدوای ماڵی نەنکمدا دەگەڕێم». چ نوکتە و شۆخی کردنێکی ناخۆشە، سۆفیا. ئەمانە هەمووی یاریە بێ تامەکانی مێجەرن... هەروەک نامەی ناو توێکڵی مۆزەکە و ڕەهێڵە سەختەکە... لە یادتە؟
ـ تۆ لەو بڕوایەدایت...

ـ بەڵام پێم گوتیت پیلانێکم داناوە... هەتاوەکو بەپێی ئەقڵمان بجوڵێینەوە، ئەوا ئەو ناتوانێت هەڵمان بخلەتێنێت، بەم شێوەیەش تا ڕادەیەک سەربەستین. دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی وامان لێبکات «هەست» بەهەر شتێک بکەینکە دەخوازێت، بەڵام هیچ شتێک سەری من ناسوڕمێنێت. با ئاسمانیش بە فیلی باڵدار ڕەشبکاتەوە، تەنانەت ئەو کاتەش لە بزەیەکی سەر لێوم زیاتر، هیچی تر لەمنەوە نابینێت. بەڵام پێنج و حەوت دەکاتە دوانزە! ئەمە مەعریفەیەکە، کە هەمیشە بەسەر هەموو کاریگەریە کارتۆنیەکانیدا زاڵ دەبێت. فەلسەفەش پێچەوانەی حیکایەتە.

سۆفیا بەبێ دەنگی مایەوە و بەسەرسامیەوە تەماشای دەکرد.

ـ ئێستا دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە. پاشان داوات لێدەکەم بێیتەوە بۆ لام و باسی سەردەمی ڕۆمانسی دەکەین. دواتریش باسی هیگڵ و کیاگەگۆ دەکەین. بەڵام تەنها حەفتەیەکی ماوە تاوەکو مێجەر لە فڕۆکەخانەی "کیفیک" بنیشێتەوە، تاوەکو ئەو کاتەش دەبێت خۆمان لە لینجاوی فەنتاسیای مێجەر ڕزگاربکەین. لەمە زیاتر هیچی تر ناڵێم سۆفیا، بەڵام دەمەوێت ئەوەندە بزانیت کە بۆ خاتری هەردووکمان لەسەر پیلانێکی قەشەنگ کاردەکەم...

ـ کەواتە من دەڕۆم.

ـ بوەستە... وابزانم لە هەموو شتێک گرنگترمان لەبیرچوو.

ـ ئەوجا چی؟

ـ گۆرانی ڕۆژی لەدایک بوون، سۆفیا. ئەمڕۆ هیلدە دەبێتە پانزەساڵ.

ـ منیش هەروەها.

ـ تۆش هەروەها... کەواتە پێکەوە گۆرانی دەڵێین.

پاش ئەوە هەردووکیان هەستانە سەرپێ و دەستیان بە گۆرانی ڕۆژی لەدایک بوون کرد؛
ساڵی نوێت لێ پیرۆز بێت! ساڵی نوێت لێ پیرۆز بێت!...
کاتژمێر بووە چوار و نیو. سۆفیا بەڕاکردن تا لای دەریاچەکە ڕۆیشت و بە بەلەمەکەش لە ئاوەکە پەڕییەوە... بەلەمەکەی تەواو ڕاکێشایە سەر وشکانیەکە و بەڕاکردن بەناو دارستانەکەدا بۆی دەرچوو.
کاتێک گەیشتە سەر ڕێگاکە، لە نێو ڕەگی دارەکانەوە شتێکی بینی دەجوڵایەوە. سۆفیا یەکسەر خەیاڵی بۆ لای کچە کڵاو سوورەکە ڕۆشت، کە بەدوای ماڵی نەنکیدا دەگەڕا، بەڵام ئەم تارماییە زۆر لەو گچکەتربوو.
لێی نزیک بووەوە... بوکێکی قاوەیی بینی، فانیلەیەکی سووری لەبەردابوو. هەر هێندەی یاریەکی منداڵان دەبوو.
سۆفیا لە شوێنی خۆیدا وشکبوو، بەتایبەتیش کە بینی ورچێکی یاریکردنە.
ئاساییە گەر کەسێک ورچێکی یاریکردنی لە دارستانەکەدا لێبکەوێت، بەڵام ئەم ورچەیان زیندووە... بەلایەنی کەمەوە سەرقاڵی شتێکە.
ـ چۆنیت؟... سۆفیا گوتی.
ـ من ناوم "پیتەر پلوس»ە، جێگەی داخە لەم ڕۆژە خۆشەدا لەناو دارستانەکەدا ون بووم... بەڵام من هەرگیز تۆم لەوەوپێش نەدیووە.
ـ لەوانەیە من لەوەوپێش بێرەدا تێنەپەڕیبم... سۆفیا گوتی. بەڵام خۆ تۆ بەئاسانی دەتوانیت لە دارستانە سەد مەترییەکەتدا بێت و بڕۆیت.
ـ نەخێر، ئەو ژمارەیە بەلای منەوە زۆر سەختە. دەبێت ئەوەشت لەیادبێت کە من ورچم و ئەقڵم کەمە.
ـ ناوبانگی تۆم بیستووە.

ـ کەواتە دەبێت ناوت "ئالیس" بێت. جارێکیان "یاکوب" باسی تۆی بۆ کردم. پێم وابێت هەر بەهەمان شێوەش یەکترمان بینی. تۆ هێندەت لە ئاوی بتڵێک خواردەوە، تا پچکۆلەتر و پچکۆلەتر بوویتەوە. بەڵام پاشان لە ئاوی بتڵێکی ترت خواردەوە و دیسانەوە گەورە بوویتەوە. دەبێت ئاگادار بین و بزانین چ شتێک دەخۆین. من خۆم کەڕەتێکیان هێندە زۆرم خوارد کە لە کونە کەروێشکێکدا گیرمخوارد.
ـ بەڵام من ئالیس نیم.
ـ گرنگ نیە ئێمە کێین، لەوە گرنگتر ئەوەیە کە ئێمە «هەین»... کونەپەپوەکە وا دەڵێت و زۆر زیرەکیشە. جارێکی تریشیان لە ڕۆژێکی خۆشدا گوتی حەوت و چوار دەکاتە دوانزە. من و کەرەکەش زۆر شەرمەزاربووین، لەبەرئەوەی ژمارە نازانین. بەلای ئێمەوە پێشبینیکردنی ئاوهەوا ئاسانترە.
ـ من ناوم سۆفیایە.
ـ پێخۆشحاڵ بووم بە ناسینت، سۆفیا. هەروەک گوتم، پێم وابێت تۆ کەسێکی نوێیت لەم ناوچەیەدا. بەڵام ئێستاکە من دەبێت بڕۆم و ناچارم بەچکە بەرازە پچکۆلەکەی هاوڕێم بدۆزمەوە... هەموومان لەلایەن کەروێشک و هاوڕێکانیەوە بۆ ئاهەنگێکی گەورە بانگ کراوین.
دەستێکی بەرزکردەوە و خواحافیزی کرد، ئەوجا سۆفیا لەدەستەکەی تریدا پارچە کاغەزێکی بچکۆلەی بینی.
ـ ئەوە چیە بە دەستتەوە؟... سۆفیا پرسی.
پیتەر پلوس کاغەزەکەی هێنایە پێشەوە و گوتی؛
ـ بەهۆی ئا ئەمەوە لە دارستانەکەدا ون بووم.
ـ بەڵام خۆ ئەوە تەنها پارچە کاغەزێکە و هیچی تر.

ـ نەخێر، تەنها «پارچە کاغەزێک» نیە. نامەیەکە بۆ کچی ناو ئاوێنەکەی هیلدە هاتووە.
ـ ئمم... کەواتە دەتوانیت بیدەیت بە من.
ـ بەڵام خۆ تۆ کچی ناو ئاوێنکە نیت؟
ـ نەخێر، بەڵام...
ـ دوێنێ یاکوب پێی گوتم نامە دەبێت بەدەستی خاوەنەکەی بگات.
ـ بەڵام من هیلدە دەناسم.
ـ ئەوە هیچ گرنگیەکی نیە. هەرچەندە کەسێک باش باشیش بیناسیت، بەڵام هەرگیز نابێت نامەکانی بخوێنیتەوە.
ـ مەبەستم ئەوەیە دەتوانم بیگەیەنمە دەستی هیلدە.
ـ لەم بارەیاندا تەواو شتێکی ترە، فەرموو سۆفیا. من ئەگەر ئەم نامەیەم لە کۆڵ ببێتەوە، بەئاسانی دەتوانم ڕێگاکەی بەرازی هاوڕێم بدۆزمەوە. بەڵام بەلای تۆوە سەخت دەبێت، چونکە لە پێشدا دەبێت ئاوێنەیەکی گەورە بدۆزیتەوە و پاشان وێنەی بەرامبەری هیلدە ببینیت، ئەمەش لەم بەشەی دارستانەکەدا ئاسان نیە.
پاش ئەوە پارچە کاغەزەکەی دا بە سۆفیا و بەناو دارستانەکەدا بۆی دەرچوو. کە تەواو دورکەوتەوە، سۆفیا نامەکەی کردەوە و دەستیکرد بە خوێندنەوەی؛
هیلدە گیان؛ جێگەی شەرمە ئەلبێرتۆ لەیادی چوو بە سۆفیا بڵێت کە کانت بانگەوازی دامەزراندنی «یەکێتی نێونەتەوەیی» کرد. لە نووسینێکدا بەناوی «بۆ ئاشتی هەتاهەتای»دا دەڵێت؛ هەموو وڵاتەکان دەبێت لە یەکێتیەکی نێونەتەوەییدا کۆببنەوە، تا هەوڵی دابینکردنی ئاشتی لەنێو نەتەوەکانی دونیادا بگرنە ئەستۆ. ئەم نووسینە لە ساڵی 1795دا بڵاوکرایەوە، پاش 125 ساڵ و لەدوای

شەڕی جیهانی یەکەمەوە «یەکیەتی نێو نەتەوەیی» دامەزرێنرا. دواتریش لەپاش شەڕی جیهانی دووهەمەوە بوو بە نەتەوە یەکگرتووەکان. بەم شێوەیەش دەتوانین بڵێین، کانت بابە گەورەی بیرۆکەی نەتەوە یەکگرتووەکانە. مەبەستی کانت ئەوە بوو کە «ئەقڵی کرداری» مرۆڤ دەتوانێت وڵاتەکان لەو «بارە سروشتیە»دا بهێنێتە دەرەوە کە بەردەوام دەبێتە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگی نوێ و لە هەمان کاتیشدا دەتوانێت ڕژێمێکی نێونەتەوەیی پێکبهێنێت کە نەهێڵێت چیتر شەڕ هەڵبگیرسێت. هەرچەندە ڕێگای دامەزراندنی یەکیەتی نێونەتەوەیی دورە، بەڵام ئەرکی سەرشانی مرۆڤە کە هەوڵبدات لەسەر ئاستی جیهانیدا «ئاشتی هەمیشەیی» بخوڵقێنێت. ئەمە بەلای کانتەوە ئامانجێکی دور بوو... بەڵێ، دەتوانین بڵێین تا ڕادەیەک بەرزترین ئامانجی فەلسەفە بوو.
ئێستاکە خۆم لە لوبناندام. لەگەڵ سڵاوی بابە.
سۆفیا پاچە کاغەزەکەی خستە گیرفانیەوە و بەرەوماڵەوە کەوتە ڕێ. ئەلبێرتۆ لەم جۆرە بینینانەی ناو دارستانەکە ئاگاداری دەکردەوە. بەڵام خۆ نەیدەتوانی ورچە پچکۆلەکە بەتەنها لە دارستانەکەدا جێبهێڵێت و هەتا هەتایە بەدوای وێنەی ناو ئاوێنەکەی هیلدەدا بگەڕێت.

## ڕۆمانسی «Romance»
## ..ڕێگا پڕ نهێنیەکە بەرەو ناوەوە دەڕوات...

هیلدە دەستی لە فایلە گەورەکە بەردا و خزایە سەر کۆشی، ئەوجا بەتەواوەتی کەوتە سەر زەویەکە.
ئێستاکە ژورەکەی زۆر ڕووناکتربوو لەو کاتەی کە چووە ناو جێگاوە. تەماشای کاتژمێرەکەی کرد، نزیکبووبوەوە لە سێی شەو. ڕووی بەو دیودا وەرگێڕا و ویستی بخەوێت. لەو کاتەدا کە خەریکبوو خەوی لێدەکەوت، بیری لە باوکی دەکردەوە، بۆی پرسیاربوو کە کچە کڵاوسوورەکە و پیتەر پلوسی هێنایە ناو نووسینەکەیەوە...
هەتا کاتژمێری یانزەی سبەینێ لەخەو هەڵنەسا. هەستیدەکرد بە درێژایی شەوەکە خەوی بینیوە، بەڵام هیچ خەونێکی بیر نەدەهاتەوە. لەوە دەچوو لە هەقیقەتێکی تەواو جیاوازتردا ژیابێت.
بۆ ئامادەکردنی نانی بەیانی ڕۆیشتە خوارەوە. دایکی سەرتاپا جلی کاری پۆشیبوو، چونکە دەبوایە لە خوارەوە بەلەمە گەورەکەی پاکبکردایەتەوە و ئامادەی بکردایە. هەرچەندە هێشتام بەکاریان نەدەهێنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە پێش ئەوەی مێجەر لە لوبنانەوە بگەڕێتەوە ئامادەی ناو ئاو بوایە.
ـ بۆ یارمەتیدانم هاتوویتەتە خوارەوە؟
ـ بەڵام لە پێشدا دەمەوێت کەمێک بخوێنمەوە... دواتر نان و چای بەیانیت بۆ بهێنمە خوارەوە؟
ـ نان و چای بەیانی؟

**پاش نانخواردن هیلده گەڕایەوە ژورەکەی خۆی... جێگاکەی ڕێکخست و بەباشی دانیشت، مەلەفەکەی خستەوە سەر کۆشی و دەستیکردەوە بە خوێندنەوە.**

سۆفیا بەنێو پەرژینەکاندا خۆی خزاندە ناو باخچەکەیانەوە، ئەو باخچەیەی ڕۆژێک لە ڕۆژان لەگەڵ باخچەی عەدەندا بەراوردی دەکرد...
سۆفیا تەماشای ناو باخچەکەیانی کرد، بەهۆی ڕەهێڵە و بارانە زۆرەکەی دوێنێوە بە گەڵا و لقی شکاوی دارەکان داپۆشرابوو. هەستیدەکرد پەیوەندیەک لە نێوان ڕەهێڵەکە و لقە شکاوەکان لەلایەک و لەلایەکی ترەوە کچەی کڵاوسوور و پیتەر پلوسدا هەبێت. سۆفیا بەرەو لای جۆلانەکە ڕۆیشت و لە گەڵای وەریوو و لقی شکاوی درەختەکان پاکی کردەوە. پێویستی نەدەکرد لەگەڵ هەموو بارانێکدا دۆشەکەکان بەرنە ژورەوە، چونکە خۆشبەختانە هەموویان نایلۆنیان پێوەبوو .
ڕۆیشتەوە ماڵەوە و دایکیشی کەمێک بوو هاتبووەوە، لەو کاتەدا خەریکبوو هەندێ ساردی دەخستە نێو یەخچاڵەکەوە. کێکێک و هەندێ خواردنیشی لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانابوو.
- چاوەڕوانی میوانیت؟... سۆفیا ئەمەی گوت و تا ڕادەیەک بیری چووبوەوە کە ڕۆژی لەدایکبوونی خۆیەتی.
- دەزانم ئاهەنگە گەورەکە ڕۆژی شەممەی داهاتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆشە ئەمرۆش شتێک بکەین.
- وەک چی؟
- یۆرون و دایک و باوکیم بانگ کردووە.

سۆفیا شانێکی هەڵتەکاند و گوتی؛
- بەلای منیشەوە ئاساییە.
میوانەکان کەمێک پێش سەعات حەوت و نیو گەیشتن. میوانداریەکە تابڵێیت ڕەسمی بوو، چونکە دایکی سۆفیا و دایک و باوکی یۆرون هێندە زوو زوو یەکتریان نەدەبینی.
پاش کەمێک سۆفیا و یۆرون بە بیانوی نووسینەوەی دەعوەت نامەی ئاهەنگەکەوە، ڕۆیشتنە ژورەکەی سۆفیا. دەیانویست ئەلبێرتۆ کنۆکسیش بانگبکەن، ئەمەش وای لە سۆفیا کرد بیرۆکەی «باخچە ئاهەنگێکی فەلسەفی» بە خەیاڵیدا ڕابووری. یۆرون پێشنیارەکەی سۆفیای بەدڵبوو، بەهەرحاڵ ئاهەنگەکە هی سۆفیابوو و هەڵبژاردنی بابەتی ئاهەنگیش لەو کاتەدا باو بوو.
لە کۆتایدا پاش دوو سەعات شێوازی دەعوەتنامەکەیان داڕشت، هەردووکیشیان لەبەر پێکەنین خۆیان بۆ نەدەگیرا؛
ئازیز...
پێخۆشحاڵین بۆ «باخچە ئاهەنگێکی فەلسەفی» بانگتان بکەین. ئاهەنگەکە لە کۆڵانی کلۆیڤە ژمارەی سێ دا، لە کاتژمێری حەوتی ئێوارەی ڕۆژی شەممە، ڕێکەوتی 6/23دا دەستپێدەکات. ئومێدەوارین لەو ئێوارەیەدا نهێنی ژیان دەربخەین. تکایە جل و بەرگی گەرم و ئەندێشەی نایاب لەگەڵ خۆتاندا بهێنن، تا بتوانین مەتەڵە فەلسەفیەکان شیبکەینەوە. جێگای داخە بەهۆی ترسی ئاگر کەوتنەوەوە بۆمان نیە ئاگر بکەینەوە، بەڵام هەموو کەسێک سەربەستە کڵپەی فەنتاسی خۆی بە ئازادی هەڵبگیرسێنێت. دڵنیاتان دەکەین کە بەلایەنی کەمەوە فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە لەنێوان

میوانەکاندا ئامادە دەبێت، لەبەرئەوە ئاهەنگەکە بە تەواوەتی داخراوە (بواری ڕۆژنامە نووس نادرێت!)
لەگەڵ ڕێز و سڵاوی
یۆرون ئینگەبرینگستن (ڕێکخەری ئاهەنگەکە)
سۆفیا ئامۆنسن (خاوەنی ئاهەنگەکە)
ئەوجا کچان چوونە خوارەوە بۆ لای گەورەکان. ئێستاکە هەستیان دەکرد کەمێک سروشتی تر قسە لەگەڵ یەکتریدا دەکەن. سۆفیا لاپەڕەی دەعوەتنامەکەی، کە بە پەڕ نووسیبووی، دایە دەستی دایکی و گوتی؛
ـ بەیارمەتیت هەژدە کۆپیمان بۆ بکە.
ئەوە یەکەمجار نەبوو داوا لەدایکی بکات لەسەر کارەکەی کۆپی شتێکی بۆ بکات. دایکی بەپەلە چاوێکی بەلاپەڕەکەدا خشان و پاشان دایە دەستی باوکی یۆرون؛
ـ فەرموو، بەچاوی خۆتان ببینن... تەواو لەسەر خۆی نیە!
ـ بەڵام بە ڕاستی لەوە دەچێت سەرنجڕاکێشەر بێت... پاش کەمێک پەڕەکەی دا بە خێزانەکەی و بەردەوامی بە قسەکانی دا؛
ـ بە ڕاستی پێم خۆش دەبێت گەر منیش بانگ بکرێم.
ئەوجا نۆبەی خێزانەکەی بوو... کە ئەویش لە خوێندنەوەی بووەوە گوتی؛
ـ بێگومان منیش پێم خۆش دەبێت! ئەی ئێمە بانگ ناکەیت سۆفیا؟
سۆفیا ڕێک بەدوایدا وەڵامی دایەوە؛
ـ کەواتە بەیارمەتیت بیست کۆپیمان بۆ بکە.
ـ شێت بوویت... یۆرون هاواری لێ بەرز بووەوە.

سۆفیا پێش ئەوەی ئەو ئێوارەیە بچێتە جێگاوە، بۆ ماوەیەکی دورودرێژ لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد. تارمایەکەی ئەلبێرتۆی هاتەوە یاد، کە بۆ یەکەم جار بەر لەمانگێک لەمەوبەر لە تاریکاییەکەدا بینی. ئێستاکەش شەوە و درەنگیشە، بەڵام شەوێکی هاوینی ڕووناکە.

هەتاوەکو سەر لەبەیانی ڕۆژی سێشەممە، هیچ هەواڵێک لە ئەلبێرتۆوە نەهات. بەڵام هەر لەگەڵ ڕۆیشتنە دەرەوەی دایکی سۆفیادا بۆ سەر کار، زەنگی تەلەفونەکەیان لێیدا.

ـ بەڵێ... سۆفیا قسە دەکات.

ـ ئەلبێرتۆ کنۆکست لەگەڵدایە.

ـ هەر خۆم زانیم.

ـ ببوورە لەوەوپێش بوارم نەبوو تەلەفونت بۆ بکەم، لەبەرئەوەی بە تەواوەتی سەرقاڵی پیلانەکەی خۆمان بووم. تەنها ئەو کاتانەی مێجەر بە تەواوەتی هەموو سەرنجی دەخاتە سەر تۆ، دەتوانم بەتەنها بم و بەبێ جاڕس کردن کاربکەم.

ـ سەیرە.

ـ مەبەستم لەوەیە لەو کاتانەدا بەهەلی دەزانم خۆم بدزمەوە، تێدەگەیت؟ تەنانەت نایابترین ئامێری چاودێریکردنیش لە جیهاندا، سنووری خۆی هەیە. بە تایبەتیش ئەگەر یەک کەس بەڕێوەی بەرێت... بەڕاست، کارتەکەتم بەدەس گەیشت.

ـ ئا... دەعوەت نامەکە.

ـ دەوێریت شتی وابکەیت؟

ـ بەڵێ، بۆ نا؟

ـ پیاو نازانێت لە دانیشتنێکی ئاوهادا چی ڕوودەدات.

- دێیت؟
- بێگومان دێم، بەڵام لەلایەکی ترەوە بیرت لەوە کردۆتەوە کە هەمان ڕۆژ باوکی هیلدە لە لوبنانەوە دەگەڕێتەوە؟
- نەخێر، بەڕاستی ئەوەم لە خەیاڵدا نەبوو.
- پێم وانیە بە ڕێکەوت ڕێگەت پێبدات لە هەمان ڕۆژی گەڕانەوەیدا، باخچە ئاهەنگێکی فەلسەفی ساز بکەیت.
- هەروەک پێم گوتیت، بیرم لەوە نەکردبووەوە.
- بەڵام ئەو بیری لەوە کردۆتەوە... بە هەرحاڵ، پاشان دەتوانین زیاتری لەسەر بدوێین. دەتوانیت ئێستاکە بێیتە کوخەکەی مێجەر؟
- دەبێت کەمێک باخەکە بژار بکەم.
- کەواتە بابڵێین کاتژمێری دوو... دەتوانیت؟
- بەڵێ باشە.
دیسانەوە ئەمڕۆکەش لە کاتی گەیشتنی سۆفیادا، ئەلبێرتۆ لەسەر قادرمەکان دانیشتبوو.
- لێرەدا دانیشە... هێندەی گوت و یەکسەر چووە ناو بابەتەکەوە... پێشتر باسی ڕێنیسانس و سەردەمی باڕۆک و سەدەی ڕۆشنگەریمان کرد. ئەمڕۆکە باسی «ڕۆمانسی» دەکەین، کە بە دواهەمین قۆناخی کەلتوری گەورەی ئەوروپا دادەنرێت.
کچەکەم، خەریکە لە کۆتایی مێژوویەکی دورودرێژ نزیک دەبینەوە.
- بۆ ڕۆمانسی هێندە درێژ خایەن بوو؟
- لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا دەستی پێکرد و هەتا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەردەوامبوو. بەڵام لەساڵی 1850وە ئیتر بێمانایە باس لە جۆرە «قۆناخێک» بکرێت کە ئەدەب و فەلسەفە و هونەر و زانست و مۆسیقا بگرێتە خۆی.

ـ بەڵام بەهەرحاڵ ڕۆمانسی جۆرێک بوو لەم قۆناخانە، وا نیە؟
ـ ئێمە دەڵێین ڕۆمانسی دواهەمین «شێوە بینینی هاوبەشی» ئەوروپی بوو بۆ ژیان. لە ئەڵمانیادا دەستیپێکرد و وەک بەرپەرچدانەوەیەکی دەسەڵاتی تاکڕەوی ئەقڵانیەتی سەدەی ڕۆشنگەری سەریهەڵدا. لەوە دەچوو لەپاش کانت و فەلسەفە ساردە ئەقڵانیەتەکەیەوە، گەنجەکان پێویستیان بە هەڵمژینی کەمێک هەوای پاک بووبێت.
ـ ئەی لەبری ئەو چیان دانا؟
ـ وشەی نوێی وەک «هەست» و «فەنتاسی» و «تاقیکردنەوە» و «تاسەکردن» یان هێنایە پێشەوە. ڕاستە چەند بیرمەندێکی سەدەی ڕۆشنگەری باسی گرنگی هەستەکانیان دەکرد -بەتایبەتیش ڕوسوو- بەڵام ئەمانەش لەم سەردەمەدا وەک ڕەخنەیەک لە تاکڕەوی ئاشکرای دەسەڵاتی ئەقڵانیەت دەخرایە ڕوو. لێرەشەوە شەپۆلی بیروڕا لاوەکیەکان، بووە خودی بزوتنەوەی گەورەی ژیانی کەلتوری ئەڵمانی.
ـ کەواتە چیتر باوی کانت نەما، وانیە؟
ـ هەم مابوو، هەم نەشمابوو. زۆربەی ڕۆمانسیەکان خۆیان وەک هەڵگری میراتی کانت دەبینی. هەروەک دەزانیت کانت دەیگوت کاتێک ئەقڵ دێتە سەر بینینی «شتەکان کە وەک خۆیانن»، لە سنورێکدا دەوەستێت. لەلایەکی تریشەوە ئاماژەی بۆ گرنگی ڕۆڵی «خود» دەکرد لە بواری مەعریفەدا. واتە لێرە بەدواوە هەموو تاکە کەسێک دەیتوانی بەسەربەستیەوە تێگەیشتنی تایبەتی خۆی بەرامبەر ژیان ، لەسەر بیروڕای تایبەتی خۆی هەڵبچنێت. ڕۆمانسیەکانیش تا ڕادەیەکی زۆر بە خراپی ئەم خاڵەیان وەک «دەسەڵاتی خود» بەکاردەهێنا. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سەرلەنوێ بیرۆکەی بلیمەتی هونەری نرخی پێبدرێتەوە.

- ژمارەی ئەو جۆرە بلیمەتانە زۆر بوون؟
- بۆ نمونە یەکێک لەوانە «بیتهۆفن Beethoven» بوو. لە ئاوازەکانیدا کەسێک دەبینین کە هەست و سۆزی تایبەتی خۆی دەردەبڕێت. بەم شێوەیەش هونەرمەندێکی «ئازاد» بوو –بە پێچەوانەی هونەرمەندانی سەردەمی باڕۆک، وەک «هاندڵ Handel» و «باخ Bach» کە کارە مۆسیقیەکانیان بۆ ڕێزلێنانی خودا دادەنا و زۆر جاریش بە چەندین یاسای توند و تیژەوە بەسترابوونەوە.
- من تەنها «سۆناتەی تریفە» و «سەمفۆنیای چارەنووس»ی شارەزام.
- بەڵام هەست دەکەیت «سۆناتەی تریفە» چەندە ڕۆمانسیە و کاتێکیش گوێ بۆ «سەمفۆنیای چارەنووس» شلدەکەیت، بە ئاسانی شێوەی دەربڕینی غەمگینانەی بیتهۆفنت دێتە بەر گوێ.
- تۆ گوتت مرۆڤدۆستانی ڕێنیسانسیش باوەڕیان بە «تاکە کەسایەتی» هەبووە.
- بەڵێ، زۆر خاڵی هاوبەش لە نێوان سەدەی ڕێنیسانس و ڕۆمانسیدا هەیە، بۆ نمونە لە بواری هونەریدا؛ لە هەردوو قۆناخەکەدا پێیان وابوو هونەر ڕۆڵێکی گرنگ لە بواری مەعریفەی مرۆڤدا ببینێت. دیسانەوە لێرەشدا کانت بەشداری ئەم بڕوایەی دەکرد. لە زانستی جوان ناسیەکەیدا لێکۆڵینەوەی لەسەر کاریگەری شتە جوانەکان دەکرد لەسەرمان، دەیویست بزانێت چی ڕوودەدات کاتێک لە شتێکی جواندا نوقوم دەبین، بۆ نمونە لە کارێکی هونەریدا. کاتێک لەناو کارێکی هونەریدا خۆمان وندەکەین، ئەگەر جگە لە خودی کارە هونەریەکە هیچ مەبەستێکی ترمان لە خەیاڵدا نەبێت، ئەو کاتە زۆر نزیکتر دەبینەوە لە «خودی شتەکە بەو شێوەیەی کە هەیە.»

ـ کەواتە هونەرمەند دەتوانێت شتێک بدات بەدەستەوە کە فەیلەسوف ناتوانێت دەریببڕێت، وا نیە؟
ـ ئەمە تێگەیشتنێکی ڕۆمانسیانە بوو، بەڵام لە ڕوانگەی کانتەوە هونەرمەند توانا مەعریفیەکانی بەسەربەستی بەکاردەهێنێت و هەڵیان دەڕێژێت. «شیللەر«Schiller ی شاعیری ئەڵمانیش گەشەی بە بیرکردنەوەکانی کانت دا. ئەو دەڵێت چالاکی هونەرمەند وەک یاریەک وایە، مرۆڤیش تەنها ئەو کاتە سەربەستە کە یاری دەکات، لەبەرئەوەی لەو کاتانەدا یاسای تایبەتی خۆی دادەڕێژێت. بەبڕوای ڕۆمانسیەکان تەنها هونەرمەندەکان دەتوانن لەو شتەمان نزیک بکەنەوە کە «باس ناکرێت». هەندێ کەسیش لەوە زیاتر دەڕۆیشتن و هونەرمەندیان لەگەڵ خودادا بەراورد دەکرد.
ـ لەبەرئەوەی هەروەک چۆن خودا جیهانی خوڵقاندووە، هونەرمەندیش بە هەمان شێوە هەقیقەتی تایبەت بە خۆی دەخوڵقێنێت.
ـ دەیانگوت هونەرمەند «توانایەکی یان هێزێکی بینینی خوڵقێنەری» هەیە و لەناو خۆشیی مەزنی هونەرەکەیدا دەکرێت بە جۆرێک دونیا ببینێت کە تێیدا سنوری نێوان خەو و ڕاستی ون بووبێت. «نۆفالیس «Novalisیەکێک لەو گەنجە بلیمەتانە بوو و دەیگوت؛ «جیهان دەبێتە خەونێک و خەونیش دەبێتە هەقیقەت». لەپاش مردنی لە ساڵی 1801دا ڕۆمانێکی بە ناوی «هێنریک فان ئۆفتەردینگ «Heinrich von oftterdingenی لەپاش خۆی بەجێهێشت. هەرچەندە ڕۆمانەکەی تەواو نەکردبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەنگێکی گەورەی دایەوە. لەوێدا باسی گەنجێک دەکات بەناوی هێنریکەوە و بەدوای «گوڵێکی شیندا» دەگەڕێت، کە جارێکیان لە خەونیدا بینیویەتی و

لەو کاتەوە تاسەی دۆزینەوەی کردووە. «کۆلیردیج Coleridge»ی ڕۆمانسی ئینگلیزیش هەمان فیکرەی بەم شێوەیە دەربڕی؛
»چی ڕوودەدات ئەگەر خەوتبیت؟ وە چی ڕوودەدات ئەگەر لە خەونتدا خەونێک ببینیت؟ وە چی دەبێت ئەگەر لە خەونتدا بڕۆیت بۆ بەهەشت و لەوێ گوڵێکی سەیر و جوان لێبکەیتەوە؟ وە چی ڕوودەدات ئەگەر کاتێک خەبەرت بووە و گوڵەکەت لە دەستتدا بینی؟ ئای، ئەی پاشان چی دەکەیت؟
- جوانە.
- خودی ئەو تاسەکردنە بەدوای شتێکی دورەدەست و پەیدانەبوودا، سیمایەکی باوی ڕۆمانسیەکان بوو. جارجارێکیش تاسەی گەڕانەوەیان بۆ سەدە کۆنەکان دەکرد -بۆ نمونە سەدەکانی ناوەڕاست، کە لە سەردەمی ڕۆمانسیدا، گەر لەگەڵ سەدەی ڕۆشنگەریدا بەراوردی بکەین، زۆر بەهێزتر نرخیان پێدەدرایەوە. جگە لەوەش ڕۆمانسیەکان تاسەی گەڕانەوەیان بۆ کەلتورە کۆنەکان دەکرد، بۆ نمونە وەک گەڕانەوە بۆ «وڵاتی ڕۆژهەڵات» و نهێنیەکانی. لەسەرو ئەمانەشەوە «شەو» و «کاتی خۆرئاوابوون» و «شوێنەوارە کۆنەکان» و «هەموو شتێکی سەرو سروشتی» سەرنجیانی ڕادەکێشا. بە کورتی خولیای ئەو شتانە بوون کە پێیان دەڵێن «لایەنە تاریکەکانی» ژیان، واتە هەموو شتێک کە نادیار و نهێنی و سەیرە.
- بەلای منەوە سەدەیەکی سەرنجڕاکێشەرە، بەڵام ئەی ڕۆمانسیەکان کێ بوون؟
- ڕۆمانسی بە پلەی یەکەم دیاردەیەکی شارییانە بوو. هاوکات لەگەڵ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا، زۆربەی شارە کەلتوریەکانی زۆرینەی وڵاتە ئەوروپیەکان گەشەی کرد، بەتایبەتیش لە ئەڵمانیادا. شێوەی

باوی «ڕۆمانسیەکان» پیاوە گەنجەکان بوون، زۆربەشیان قوتابی بوون. (زۆر جار ڕوویدەدا کە قوتابیەکان بەو شێوەیە بن). ئەو گەنجانە ڕەنگدانەوەی جۆرە بیرکردنەوەیەکی دژ بە بۆرجوازیان لە ناوەوەدا هەبوو، ڕێشی تێدەچوو پۆلیسێک یان ئەو ئافرەتەی ژورەکەیان بەکرێ لێدەگرت، بە «بۆرجوازیەکی چکۆلەی پیس» لەقەڵەم بدەن، یان ڕوویدەدا زۆر بە ئاسانی ناوی «دوژمن»ی لێبنێن.

- ئەگەر من بوومایە، هەرگیز نەمدەوێرا ژورێک بە ڕۆمانسیەک بەکرێ بدەم.

- لە ساڵی 1800دا یەکەمین نەوەی ڕۆمانسی گەنج بوون و دەشتوانین ناوی ئەو بزوتنەوە ڕۆمانسیە بنێین «یەکەمین شۆڕشی گەنجی ئەوروپا». ئێستاش پاش 150 ساڵ دەتوانین چەندین خاڵی هاوبەش لە نێوان ڕۆمانسیەکان و کەلتوری هیپی«Hippie» دا ببینینەوە.

- گوڵ و قژی درێژ و گیتار لێدان و تەمبەڵی، وا نیە؟

- بەڵێ، دەیانگوت «بەتاڵی نمونەی بلیمەتیە و تەمبەڵیش باشیی ڕۆمانسیە». ڕۆمانسیەکان بەئەرکی سەر شانی خۆیانیان دەزانی کە ژیان تاقیبکەنەوە -یان بەخەو بینین لە دەستی ڕابکەن. ژیانی ڕۆژانەی ئاسایشیان بۆ بۆرجوازیە پچکۆلەکان جێدەهێشت.

باکوری ئەوروپاش شاعیری ڕۆمانسی خۆی هەبوو. لە دانیمارکدا ئادەم ئۆهلینسشلێیە «Adem Oehlinschlager» لە ڕێگەی کارەکانی وەک «شیعرەکانی 1803» و «عەلادین»ەوە دەرگای لەسەر ڕۆمانسیەت کردەوە. لە نەرویجیشدا بۆ نمونە هێنریک وێرگەلاند «Henrik Wergeland»مان هەبوو. وێرگەلاند فیکرەی سەدەی ڕۆشنگەری لەناودا بوو، بەڵام تا ڕادەیەک لە شێوەی ژیانیدا هەموو ئەو خاڵە باوانەی تێدا دەبینرا کە لە ڕۆمانسیەتدا هەبوون. بە تایبەتیش

خۆشەویستیە خەیاڵیەکەی، کە سیمایەکی باوی نێو ڕۆمانسیەکان بوو. پێگەیشتنی بەو «ستێلا»یەی شیعرە خۆشەویستیەکانی بۆ دەنووسی، هەروەک «گوڵە شینەکەی» نۆڤالیس دور و مەحاڵ بوو. نۆڤالیس کچێکی چواردەساڵان نیشانە دەکات. کاتێک تەمەنیشی دەگاتە پانزە ساڵ و چوار ڕۆژ، دەمرێت. بەڵام نۆڤالیس بەردەوام بە درێژایی هەموو ژیانی هەر خۆشی دەوێت.

ـ گوتت پاش ئەوەی تەمەنی گەیشتە پانزە ساڵ و چوار ڕۆژ، مرد؟

ـ بەڵێ...

ـ من ئەمڕۆکە تەمەنم پانزە ساڵ و چوار ڕۆژە.

ـ ڕاست دەکەیت...

ـ ناوی کچەکە چی بوو؟

ـ ناوی سۆفیا بوو.

ـ چیت گوت؟

ـ بەڵێ، ناوی...

ـ بەتەواوەتی دەمترسێنیت! بڵێیت ئەمە تەنها ڕێکەوتێک بێت و هیچی تر؟

ـ نازانم سۆفیا... بەڵام ئەو ناوی سۆفیا بوو.

ـ بەردەوام بە!

ـ نۆڤالیس خۆشی تەنها 29 ساڵ ژیا. یەکێک بوو لەو گەنجانەی کە «بە گەنجی دەمردن». زۆربەی ڕۆمانسیەکان لە تەمەنی گەنجیدا دەمردن، بە تایبەتیش بە نەخۆشی سیل، هەندێکیشیان خۆیان دەکوشت...

ـ ئۆوها!

- ئەوانەش کە بەتەمەنتر دەبوون، لە سی ساڵیدا ئیتر وازیان لە ڕۆمانسیەت دەهێنا. هەندێکیشیان دەبوونە بۆرجوازی یان کۆنسەرڤاتیڤ.
- کەواتە دەرۆشتنە بەرەی دوژمنەوە.
- بەڵێ، لەوانەیە. بەڵام ئێمە باسی خۆشەویستی ڕۆمانسیمان دەکرد... لەوەوپێش لە ساڵی 1774دا گۆتە ڕۆمانی «ئازارەکانی وێرزەری گەنج»ی بڵاوکردەوە، ئەو لە وێدا باس لەو خۆشەویستیە دەستنەکەوتووە دەکات. کتێبە پچکۆلەکەی بەوە کۆتایی دێت کە «وێرزەر» خۆی دەکوژێت، چونکە ناتوانێت ئەو کچە بهێنێت کە خۆشی دەوێت...
- ئایا ئەمە زۆر پێوەنانی تێدا نیە؟
- پاش دەرچوونی ڕۆمانەکە ڕادەی خۆکوشتن بە شێوەیەکی ئاشکرا بەرزبووەوە، لەبەرئەوە بۆ ماوەیەک لە دانیمارک و نەرویجدا قەدەغەکرا. واتە بوون بە ڕۆمانسیش مەترسی خۆی هەبوو، چونکە مامەڵەیان لەگەڵ هەستی قوڵدا دەکرد.
- کاتێک دەڵێیت «ڕۆمانسی»، من تابلۆیەکی سروشتیم دێتە بەرچاو. دەتوانم دارستانە خەیاڵاویەکان و سروشتێکی یاخی ببینم... زیاتریش هەمووی تەماوی دیارە.
- تاسەکردن و نهێنی سروشت، سیمایەکی گرنگی ڕۆمانسی بوو. هەروەک باسیشمان کرد، ئەم جۆرە شتانە لە شارەکاندا بەدەرناکەون! لەوانەیە لەیادت بێت کە ڕوسوو زاراوەی «گەڕانەوە بۆ سروشتی» هێنایە کایەوە، ئەم دروشمەش بە ڕاستی لە سەردەمی ڕۆمانسیدا بەکاردەهێنرا، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی ڕۆمانسیەکان دژی تێگەیشتنە میکانیکیەکەی سەدەی ڕۆشنگەری بوون. دەیانگوت

ڕۆمانسیەکان لە ناوەوەیاندا ئاگاییە گشتیەکەی سەدە کۆنەکانیان زیندوکردۆتەوە.

- چۆن چۆنی؟

- مەبەست لەوەیە سروشتیان وەک «شتێکی کۆ» تەماشادەکرد. لێرەدا ڕۆمانسیەکان نەک هەر دەگەڕانەوە سەر سپینۆزا، بەڵکو دەگەڕانەوە سەر پلۆتین و فەیلەسوفەکانی وەک یاکۆب بیوهمە «Jacob B hme» و جیۆردانۆ برونۆ «Giordano Bruno» ش. خاڵی هاوبەشی هەموو ئەمانەش، ئەوە بوو کە «خود»ێکی خوایانەیان لە سروشتدا دەبینی.

- پانتیست بوون...

- هەم دیکارت و هەم هیومیش جیاوازیەکی گەورەیان لە نێوان «خود» و «درێژبوونەوەی» هەقیقەتدا دادەنا. کانتیش هەروەها جیاوازیەکی مەزنی لە نێوان «من»ی مەعریفی و «خودی سروشت»دا دادەنا. لەم سەردەمەشدا دەیانگوت سروشت تەنها «من»ێکی گەورەیە و هیچی تر. ڕۆمانسیکانیش زاراوەی وەک «ڕۆحی جیهان» و «نەفسی جیهان»یان بەکاردەهێنا.

- منیش لەو خاڵەدا لەگەڵیاندام.

- شێللینگ «Schelling» (1775-1854) بەناوبانگترین فەیلەسوفی ڕۆمانسی بوو. ئەو هەوڵی دەدا جیاوازی نێوان «ڕۆح» و «مادە» لابەرێت و دەیگوت هەموو سروشت –بەڕۆحی مرۆڤ و هەقیقەتی فیزیاویشەوە- دەربڕینی یەک خودای تەنهایە یان دەربڕینی «ڕۆحی جیهانە.»

- بەڕاستی لە بیروڕای سپینۆزا دەچێت.

ـ شێللینگ دەیگوت «سروشت ڕۆحی بینراوە و ڕۆحیش سروشتی نەبینراوە»، لەبەرئەوەی لە هەموو شوێنێکی سروشتدا دەتوانین هەست بە «ڕۆحێکی ڕێکخەر» بکەین. هەروەها دەشیگوت؛ «مادە، زیرەکیەکی خەفەبووە.»
ـ باشتر وایە ئەمەیانم زیاتر بۆ ڕوونبکەیتەوە.
ـ شێللینگ «ڕۆحی جیهانی» لە سروشتدا دەبینی، بەڵام هاوکات هەمان «ڕۆحی جیهان»یشی لە ئاگایی مرۆڤیشدا دەدی. لەم ڕوانگەیەوە سروشت و ئاگایی مرۆڤ لە ڕاستیدا هەمان شت دەردەبڕن.
ـ بەڵێ، بۆنا.
ـ واتە دەتوانین هەم لە سروشتدا و هەم لە مێشکی مرۆڤیشدا (لە ناوەوەماندا) بەدوای «ڕۆحی جیهاندا» بگەڕێین. لەبەرئەمە بوو «نۆڤالیس» دەیگوت «ڕێگا پڕ نهێنیەکە بەرەو ناوەوە دەڕوات». مەبەستی لەوە بوو مرۆڤ هەموو گەردوونی لەناوەوەیدا هەڵگرتووە، چوونە ناو خودیش باشترین ڕێگەیە بۆ ئەوەی لە نهێنیەکانی جیهان بگەین.
ـ بیرکردنەوەیەکی جوانە.
ـ لە ڕوانگەی زۆرینەی ڕۆمانسیەکانەوە هەموو ئەدەب و فەلسەفە و زانستی لێکۆڵینەوەی سروشت، کۆمەڵێ بەشی جیاجیای سەرجەمێکی مەزنترن. چ ئەوەی لە ژورێکدا دانیشیت و شیعرێک بنووسیتەوە یان ئەگەر لە ژیانی گوڵێک بکۆڵیتەوە، یان بۆ نمونە گەرەکت بێت بزانیت بەردێک لە چی پێک هاتووە، ئەوا لە هەردوو بارەکەدا بەڕاستی باس لە دوو لایەنی هەمان بابەت دەکەین... لەبەرئەوەی سروشت میکانیکێکی مردوو نیە، بەڵکو «ڕۆحی جیهانێکی» زیندووە.

- ئەگەر لەسەر باسەکەت بەردەوام بیت، ئەوا پێم وابێت دەبمە ڕۆمانسی.
- هێنریک ستیفینس بەڕەچەڵەک نەرویجی بوو و توێژەرەوەیەکی سروشتیش بوو –ئەو کەسەی کە وێرگەلاند ناوی نابوو گەڵا دورەکەی نەرویج، لەبەرئەوەی لە ئەڵمانیادا دەژیا. هێنریک لەساڵی 1801دا ڕۆشت بۆ کۆبنهاگن بۆ ئەوەی سیمینارێک دەربارەی ڕۆمانسی ئەڵمانی بخوێنێتەوە. ئەو بەم وشانەی خوارەوە وەسفی بزوتنەوەی ڕۆمانسی کرد؛ «ململانێی هەتاهەتایمان لەنێو جیهانی مادی خاودا ماندوویکردین، لەبەرئەوە ڕێگایەکی ترمان هەڵبژارد و ویستمان بەپەلە بگەینە ئەو شتە بێکۆتاییە... بەناو ناخی خۆماندا چووینە ناوەوە و جیهانێکی نوێمان خوڵقاند....»
- چۆن دەتوانیت ئەم هەموو شتانە لەبەر بڵێییت؟
- هێندە گرنگ نیە، کچەکەم.
- تکایە بەردەوام بە.
- شێللینگ جۆرە «گەشەکردنێکی» لە سروشتدا دەبینی، کە لە زەویەوە دەستی پێدەکرد و بۆ بەرد و بۆ ئاگایی مرۆڤ دەڕۆیشت. ئەو ئاماژەی بۆ گۆڕانکاریەکی هێواش دەکرد کە لە سروشتی بێگیانەوە دەستپێدەکات و هێدی هێدی بەرەو فۆڕمی ئاڵۆزتر و ئاڵۆزتر دەڕوات. بەشێوەیەکی گشتی ڕۆمانسیەکان وەک تەنێکی زیندوو تەماشای سروشتیان دەکرد، واتە وەک سەرجەمێک کە بەردەوام ڕێگە بە تواناکانی ناوەوەی دەدات گەشەبکات. سروشت وەک گوڵێک وایە کاتێک کە گەڵا و تۆوەکەی دەکاتەوە، یان وەک شاعیرێکە کە کاتێک شیعر هەڵدەڕێژێت.
- ئەمە کەمێکمان دەربارەی ئەریستۆتالیس ناهێنێتەوە یاد؟

- بەڵێ بێگومان، فەیلەسوفە سروشتیەکانی ڕۆمانسی، سیمای ئەریستۆتالیسی و پلاتۆنیزمی نوێیان پێوە دیاربوو. هەروەک دەزانین ئەریستۆتالیس لەچاو مەتریالیزمە میکانیکیەکاندا زیاتر بە شێوەیەکی ئەندامیانە تەماشای پرۆسێسی سروشتی دەکرد...
- بەڵێ، پێم وابێت...
- هەمان بیرکردنەوەش بەسەر بینینی مێژووشدا دەچەسپێت. ئەو کەسەی لەم بوارەدا لەلای ڕۆمانسیەکان ڕۆڵێکی گرنگی دەبینی، «هێردەر«Herder ی فەیلەسوف بوو، کە تایبەتمەندبوو لەمێژووی فەلسەفەدا. هێردەر لە نێوان ساڵەکانی 1744-1803دا ژیا. ئەو دەیگوت ڕەوڕەوەی مێژووش پەیوەندی بەیەکەوە هەیە، گەشەدەکات و بەرەو ئامانجێک دەڕوات. ئێمە بەم جۆرە تێڕوانینە دەڵێین؛ بینینێکی «دینامیکی «Dynamic مێژوویی. لەبەرئەوەی وەک پرۆسێسێک مێژوو دەبینێت. بەڵام فەیلەسوفەکانی سەدەی ڕۆشنگەری زیاتر دیدەیەکی «ستاتیکی «Static مێژووییان هەبوو، واتە بەلای ئەوانەوە تەنها ئەقڵیەتێکی گشتی یان گەردوونی بوونی هەیە، کە بەپێی هەر سەردەمێک کەم تا زۆرێکی دەردەکەوێت. بەڵام هێردەر جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە هەموو قۆناخێکی مێژوو نرخێکی تایبەتی خۆی هەیە. بە هەمان شێوەش هەموو گەلێک ڕەگەزێکی تایبەتی خۆیان هەیە یان «ڕۆحێکی نەتەوەیی» خۆیان هەیە. گەر بمانەوێت لێیان تێبگەین، دەبێت لەناو کەلتورەکانیاندا بژین.
- هەروەک چۆن گەر بمانەوێت باشتر لە کەسێک تێبگەین، دەبێت خۆمان بخەینە ناو ئەو بارودۆخەوەی کە ئەوی تێدا دەژی، بە هەمان شێوەش بۆ ئەوەی لە کەلتورێکی تر تێبگەین، ئەوا دەبێت لە ناویدا بژین.

- ئەمڕۆکە تا ڕادەیەک گومان لەمە ناکرێت، بەڵام لە سەردەمی ڕۆمانسیدا ئەمە مەعریفەیەکی نوێ بوو. ڕۆمانسیەکان هاریکاری هەموو نەتەوەیەکیشیان دەکرد کە هەستی پێناسەی خۆیان بەهێزتر بکەن. واتە ڕێکەوت نیە کە ڕێک لە ساڵی 1814دا بزوتنەوەی نەتەوەیی سەربەخۆیی نەرویجی گەیشتە ترۆپک و توانیمان لەو ساڵەدا دەستوری خۆمان دابمەزرێنین و لەژێر دەسەڵاتی دانیمارکیدا ڕزگاربین. بەڵام لەبەرامبەردا لەگەڵ سویدیەکاندا یەکمانگرت!

لەلایەکی ترەوە لەبەرئەوەی ڕۆمانسی لەگەڵ خۆیدا و لە چەندەها بواری جیاواز جیاوازدا ڕوونکردنەوە و زانیاری نوێی هێنایە کایەوە، لەبەرئەمە ئاساییە گەر دوو شێوەی ڕۆمانسی جودا بکرێتەوە. یەکەمین بەشیان ئەوانەن کە پێیان دەگوترێت «ڕۆمانسی گەردوونی»، مەبەستیشمان لەو کەسانەیە کە خولیای سروشت بوون، ئەوانەی گرنگیان بە ڕۆحی جیهان و بلیمەتی هونەرمەند دەدا. ئەمەش ئەو جۆرە ڕۆمانسیەبوو کە یەکەم جار سەریهەڵدا و بەتایبەتیش لە نزیکەی ساڵی 1800دا لەشاری «جینا»ی ئەڵمانیادا دەرکەوت.

- ئەی دووهەمین شێوەی ڕۆمانسی چی بوو؟

- دووهەمیان «ڕۆمانسی نەتەوەییە»؛ ئەمەیان کەمێک درەنگتر سەریهەڵدا و بەتایبەتیش لەشاری «هایدلبێرگ»دا بوو. ڕۆمانسیە نەتەوەییەکان گرنگیان بە مێژووی «گەل» و زمانی «گەل» دەدا... واتە بەشێوەیەکی گشتی گرنگیان بە هەموو شتێک دەدا کە پەیوەندی بە کەلتوری «گەل»ەوە هەبێت. لەبەرئەوەی «گەل»یان وەک لەشێک تەماشادەکرد، کە تواناکانی ناوەوەی ڕێک هەروەک سروشت و مێژوو هەڵدەڕێژێت.

ـ پێم بڵێ لە کوێ دەژیت، منیش پێت دەڵێم تۆ کێیت.
ـ ئەو شتەی بەپلەی یەکەم ڕۆمانسی گەردوونی و ڕۆمانسی نەتەوەیی پێکەوە گرێدا، واژەی «لەش یان ئەندام» بوو. هەم ڕووەکێک و هەم نەتەوەیەکیش وەک لەشێکی یان ئەندامێکی زیندوو تەماشادەکرا... زمانیش ئەندامێک بوو، بەڵێ... تەنانەت سەرجەمی هەموو سروشتیش وەک ئەندامێکی زیندوو دادەنرا. لەبەرئەمە جیاوازیەکی یەکجار گەورە لە نێوان ڕۆمانسی گەردوونی و نەتەوەییدا نیە. واتە هەروەک چۆن ڕۆحی جیهان کاریگەری خۆی لەسەر گەل و کەلتورە جیاوازەکان هەبوو، بەهەمان شێوەش لەناو سروشت و هونەریشدا ڕەنگدانەوەی خۆی هەبوو.
ـ واتە دوو لایەنی هەمان بابەت بوون.
ـ هێردەر کۆمەڵێ گۆرانی فۆلکلۆری چەندەها وڵاتی جیاوازی کۆکردەوە و لەژێر ناونیشانی «دەنگی گەل لە گۆرانیدا» بڵاوی کردەوە. بەڵێ، بەشێوەیەکی ئاشکراش نووسینە فۆلکلۆریەکانی وەک «زمانی دایکی گەلێک» دەبینی. لەشاری هایدلبێرگیشدا خەڵکی کەوتنە کۆکردنەوەی گۆرانی و حەکایەتی فۆلکلۆری. حەکایەتی برایانی "گریم " «Grimm»ت بیستووە؟
ـ بەڵێ، بەڵێ... «بەفری سپی» و «سەندرێللا» و «کڵاوسوورە» و «هانس و گرێتە»...
ـ وە چەندەها و چەندەهای تریش. لە نەرویجیشدا کەسانی وەک «ئاسبیۆرنسن» و «مۆوە»مان هەبوو، کە بەملاولای وڵاتدا دەگەڕان و «ئەدەبی فۆلکلۆری خەڵکیان» کۆدەکردەوە. دەتگوت لەپڕێکدا میوەیەکی خۆش و ئاوداریان دۆزیوەتەوە، لەهەمان کاتیشدا پەلەپەلیان بوو، لەبەرئەوەی میوەکە خەریک بوو لەدارەکە دەکەوتە

خوارەوە. تەنانەت ئەفسانە کۆنەکان و حیکایەتی خواکانی سەدە کۆنەکانیش لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا دیسانەوە کۆکرانەوە و خرانەوە ڕوو. جگە لەوەش ئاوازدانەرەکانی هەموو ئەوروپاش بەرە بەرە تۆنی فۆلکلۆریان دەخستە نێو ئاوازەکانیانەوە و بەکاریان دەهێنا. بەم شێوەیەش هەوڵیان دەدا پردێک لە نێوان مۆسیقای فۆلکلۆر و هونەر مۆسیقادا دروستبکەن.

ـ هونەری مۆسیقا؟

ـ مەبەستمان لەو ئاوازەیە کە لەلایەن کەسێکی دیاریکراوەوە دانراوە ـبۆ نمونە لەلایەن بیتهۆفنەوە. وەک دەزانین مۆسیقای فۆلکلۆر لەلایەن کەسێکی دیاریکراوەوە دانەنراوە، بەڵکو لەلایەن خودی خەڵکەوە دانراوە. لەبەرئەوەش ناتوانین بەتەواوەتی بزانین لە چ کاتێکدا گۆرانیەکی دیاریکراوی فۆلکلۆری یان ئاوازێکی فۆلکلۆری دیاریکراو دانراوە. هەروەک چۆن لە جیهانی مۆسیقادا جیاوازی لە نێوان مۆسیقای فۆلکلۆر و هونەری مۆسیقادا هەیە، بەهەمان شێوەش حیکایەتی فۆلکلۆر و هونەری حیکایەت جودا دەکرێتەوە.

ـ مەبەستت لە هونەری حیکایەت چیە؟

ـ حیکایەتێکە کە لەلایەن نووسەرێکی دیاریکراوەوە نووسراوەتەوە، بۆ نمونە لەلایەن «ه. س. ئانەرسن «H.C. Andersenەوە. حیکایەتیش لەسەردەمی ڕۆمانسیدا زۆر بڵاو بەکاردەهێنرا. یەکێک لە مامۆستا ئەڵمانیە گەورەکانیش «هۆفمان «Hoffmann بوو.

ـ شتێکم دەربارەی حیکایەتەکانی هۆفمان بیستووە.

ـ ئەدەبی نمونەیی لەسەردەمی ڕۆمانسیدا حیکایەت بوو ـهەروەک چۆن شانۆ شێوەی باوی هونەری سەردەمی بارۆک بوو. حیکایەت

بوارێکی مەزنی بۆ نووسەرەکە دەکردەوە کە یاری بە هێزی خولْقێنەری خۆی بکات.
ـ دەیاتوانی وەک خوایەک لە حیکایەتەکانیاندا ڕۆڵ ببینێت.
ـ ڕێک ڕاست دەکەیت! ئێستاکەش پێم وابێت ڕێک لە شوێنی خۆیدایە کە کورتەیەکی باسەکەمان بخەینە ڕوو.
ـ فەرمووو!
ـ فەیلەسوفە ڕۆمانسیەکان «ڕۆحی جیهانیان» وەک «خود»ێک دادەنا کە لە حالْەتێکی کەم تا زۆر خەیالاویدا دەیتوانی شتەکانی جیهان بخولْقێنێت. بەپێی فیختە «Fichte» ی فەیلەسوف، ڕەچەلْەکی سروشت لە چالاکی فیکرەیەکی بالای نائاگاوە هاتووە. شێللینگیش ڕاستەوخۆ دەیگوت «جیهان لەناو خودادایە». بەبڕوای ئەو هەندێ شت هەیە کە خودا بەئاگایە لێیان، بەلام چەند لایەنێکی سروشتیشمان هەیە، کە بەشی نائاگایی خودا دەخەنە ڕوو، لەبەرئەوەی خوداش «لایەنی تاریکی شەوی» هەیە.
ـ ئەم بیرکردنەوەیە هەم سەرنجڕاکێشەرە و هەم ترسناکیشە، بارکێلیم دەهێنێتەوە یاد.
ـ ڕێک بە هەمان شێوەش دەیانڕوانیە نووسەران و بەرهەمەکانیان. حیکایەت بواری بە نووسەر دەدا کە یاری بە «فەتناسیای خولْقاندنی جیهانی» خۆیەوە بکات، لێرەشەوە شتە خولْقێنراوەکە زۆر کات لە ئاگایی نووسەر دەردەچوو. نووسەر دەیتوانی بە جۆرێک بەرهەمەکەی ببینێت، وەک ئەوەی لە هێزێکی تایبەتی ناوەوەیەوە هەلْقولابێت... تا ڕادەیەک لە کاتی نووسیندا دەچووە حالْەتێکی خەوی موگناتیسیەوە.
ـ بەڕاستی خەوی موگناتیسی؟

ـ بەڵێ، بەڵام لە پڕێکدا دەیتوانی خەیاڵی خاوی بپچڕێنێت. دەیتوانی بێتە ناو حیکایەتەکەوە و چەند وشەیەکی ئایرۆنی (*گاڵتەجاڕی) خۆی بنووسێت، بەم شێوەیەش خوێنەری ئاگادار دەکردەوە کە نووسینەکەی تەنها حیکایەتێکە و هیچی تر. لەهەمان کاتیشدا بە خوێنەری ڕادەگەیاند کە ژیانی تایبەتی خۆشی جۆرە ژیانێکی حیکایەتانەیە. ئێمە بەم جۆرە بڕینی خەیاڵانە دەڵێین «ئایرۆنی ڕۆمانسی»... بۆ نمونە «ئیبسن» Ibsen ی دراما نووسی نەرویجی لە شانۆگەری «پییەر گیونت»دا ڕێگە بە کەسایەتیەکی شانۆگەریەکەی دەدا کە بڵێت؛ «کەس لە ناوەڕاستی وەرزی پێنجەمدا نامرێت.»

ـ بەڕاستی وتەیەکی پڕ لە گاڵتەجاریە، چونکە لە هەمان کاتدا دەڵێت کە خۆی لە فەنتاسیایەکی پەتی زیاتر، هیچی تر نیە.

ـ پارادۆکسالی وتەکەی وامان لێدەکات بچینە سەر بەشێکی تر.

ـ مەبەستت چیە؟

ـ هیچ سۆفیا... بەڵام لەوەوپێش باسی خۆشەویستەکەی نۆڤالیسمان کرد کە وەک تۆ ناوی سۆفیا بوو و تەنها پانزە ساڵ و چوار ڕۆژیش ژیا...

ـ پێم وابێت دەزانیت کە ئەم باسە دەمترسێنێت!

ئەلبێرتۆ بەبێ ئەوەی چاو بتروکێنێت، بەبێدەنگی لە شوێنی خۆیدا مایەوە، پاشان لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛

ـ بەڵام پێویست ناکات تۆ لەوە بترسیت کەوەک هەمان چارەنووسی خۆشەویستەکەی نۆڤالیست بەسەردابێت.

ـ بۆ نا؟

ـ لەبەرئەوەی هێشتام چەندەها بەشی تر ماوە.

ـ ئەم قسە بێمانایە چیە دەیکەیت؟

- دەڵێم ئەو کەسەی دەربارەی سۆفیا و ئەلبێرتۆ دەخوێنێتەوە، دەتوانێت هەر بەسەری پەنجەکانی هەست بەوە بکات کە نووسینەکە چەندین لاپەڕەی تری ماوە.
- تەواو سەرەخولێم پێدەخەیت.
- لە ڕاستیدا مێجەر دەیەوێت سەری هیلدە گێژبکات... بەلاتەوە کارێکی ناشیرین نیە، سۆفیا؟ بەشێکی نویێ!
هاوکات لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانی ئەلبێرتۆدا، کوڕێک لە دارستانەکەوە بەڕاکردن هاتە دەرەوە. جزداشەیەکی عەرەبی لەبەردابوو، عەگالێکیش بەسەر سەریدا هاتبووە خوارێ. چرایەکی نەوتی بەدەستەوە گرتبوو.
سۆفیا بە توندی قۆڵی ئەلبێرتۆی گوشی و ئەوجا گوتی؛
- ئەوە کێیە؟
بەڵام کوڕەکە خۆی وەڵامی دایەوە؛
- من ناوم عەلادینە و هەر ئێستاکە لە لوبنانەوە هاتووم.
ئەلبێرتۆ زۆر بە توندی تەماشایەکی کرد و لێی پرسی؛
- ئەی چی لەناو چراکەتدایە کوڕی باش؟
کوڕەکە دەستی هێنا بە چراکەدا و تەمێکی زۆری لێهاتە دەرەوە. بەرەبەرە سیمای پیاوێک لەناو تەمەکەوە دەرکەوت. هەروەک ئەلبێرتۆ ڕیشێکی ڕەشی دانابوو و کڵاوێکی شینیشی لەسەردابوو... بەئاسماندا دەخولایەوە و گوتی؛
- گوێت لێمە هیلدە؟ پێم وابێت ئەم جارەیان درەنگە پێت بڵێم جەژنی لەدایک بوونت پیرۆزبێت... بەڵام تەنها دەمەوێت بڵێم بیرکێلی و دوورگەکانی خواروی نەرویج بەلای منەوە وەک جۆرە حیکایەتێک وان... لە چەند ڕۆژێکی کەمی داهاتوودا یەکتر دەبینین.

دیسانەوە سیمای پیاوەکە هاتەوە ناو تەمەکە و هەموو «تەمەکەش» چووەوە ناو چراکە. کوڕەکەش خستیەوە بن دەستی و دووبارە بەرەو دارستانەکە ڕایکرد و ونبوو.
- باوەڕ... باوەڕ بە چاوی خۆم ناکەم... سۆفیا گوتی.
- بێ نرخە، بێ نرخ کچەکەم.
- ڕۆحەکە ڕێک وەکو باوکی هیلدە قسەی دەکرد.
- ئەوە ڕۆحی ئەو بوو.
- بەڵام...
- من و تۆ و هەموو شتێکی چواردەوریشمان، لەناو قوڵایی ئاگایی مێجەردا ڕوودەدات. ئێوارە درەنگانێکی شەوی شەممەی 28ی مانگی چوارە و بە چواردەوری مێجەردا، کە هێشتام بەخەبەرە، هەموو سەربازەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان خەویان لێکەوتووە... خۆشی خەریکە خەو دەیباتەوە... بەڵام دەیەوێت کتێبەکەی تەواو بکات و لە ڕۆژی لەدایک بوونی پانزە ساڵەی هیلدەی کچیدا، وەک دیاریەک پێشکەشی بکات. لەبەرئەمەیە کە خۆی زۆر ماندوو دەکات، سۆفیا... هەر لەبەرئەمەیە کە ئەو پیاوە نەگبەتە خۆی لە ئارامی و پشوودان بێ بەری دەکات.
- پێم وابێت تەواو خۆم دەدەم بەدەستەوە.
- بەشێکی نوێ!
سۆفیا و ئەلبێرتۆ بێدەنگ دانیشتبوون و تەماشای دەریاچەکەیان دەکرد. ئەلبێرتۆ وەک بەرد وشکبووبوو. پاش کەمێک سۆفیا وێرای دەستێک بکێشێت بەشانیدا و لێی بپرسێت؛
- چیە... وابزانم خەیاڵت تەواو ڕۆیشتووە؟

- بەڵێ، ئەم جارەیان باوکی هیلدە بە ڕاستی هاتە ناو بابەتەکەوە. سەرتاپای وشەکانی دواهەمین کۆپلە، هەمووی لەلایەن ئەوەوە گوترا. شەرم بکات باشترە، بەڵام لەلایەکی ترەوە ماسکەکەی دەموچاوی لێکردەوە و تەواو خۆی پێمان ناساند. ئێستاکە دەزانین کە ژیانی ئێمە لەنێو کتێبێکدایە و باوکی هیلدە گەرەکیەتی بیکاتە دیاری ڕۆژی لەدایک بوونی کچەکەی. خۆ گوێت لێمە دەڵێم چی؟ بە ڕاست، خۆ لە ڕاستیدا «من» ئەو قسانەم نەکرد.

- ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئەوا دەمەوێت لە کتێبەکە ڕابکەم و دوای ژیانی خۆم بکەوم.

- پیلانەکەی منیش ڕێک ئاوهایە. بەڵام پێش ئەوەی ئەمە ڕووبدات دەبێت لەگەڵ هیلدەدا قسە بکەین. وەک دەزانیت بەلایەنی کەمەوە هەموو وشەکانمان دەخوێنێتەوە. کاتێکیش بتوانین لێرە دەربچین، ئیتر پەیوەندی پێوەگرتنی زۆر سەخت دەبێت، کەواتە با ئەم هەلەی ئێستاکەمان لەدەست نەدەین.

- بەڵام چی پێ بڵێین؟

- پێم وابێت مێجەر خەریکە بەسەر ئامێری چاپەکەیەوە خەوی لێدەکەوێت —هەرچەندە هێشتام پەنجەکانی بە گوڕەوە بەسەر پیتەکاندا دێن و دەڕۆن...

- چەندە ناخۆشە بیر لەوە بکەینەوە.

- ئا ئێستاکە پێدەچێت شتێک بنووسێت و پاشان لێی پەشیمان ببێتەوە... مەرەکەبی سپیشی لاوە نیە بیکوژێنێتەوە. ئەمەش خاڵێکی گرنگی پیلانەکەی منە. نەخڵەتابیت شوشەیەک مەرەکەبی سپی بدەیتە دەستی مێجەر ئەلبێرت کنەی!

- تەنانەت پارچە تێپێکی پچکۆلەش لە منەوە وەرناگرێت!

ـ هەر ئێستا فەرمان بەو کچە داماوە دەدەم دژی باوکی هەڵگەڕێتەوە. دەبێت هەست بە شەرم بکات، لەبەرئەوەی ڕێگە بەخۆی دەدات چێژ لە یاریە هەژارەکەی باوکی وەربگرێت. ئاخ، ئەگەر باوکی خۆی لێرەدا دەبوو، ئەوسا دەیزانی چیمان لێدەکرد!
ـ بەڵام ئەو لێرەدا نیە.
ـ ئەو بە فیکر و ڕۆح لێرەدایە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خۆی لە لوبنان دانیشتووە. هەموو شتێکی چواردەورمان «خود»ی مێجەرە.
ـ بەڵام ئەو لەو شتانە زێدەترە کە ئێمە دەیانبینین.
ـ ئێمە لە سێبەری ڕۆحی مێجەر زیاتر، هیچی تر نین و ئاسانیش نیە سێبەرێک هێرش بەرێتە سەر خاوەنەکەی، سۆفیا. ئەم کارە پێویستی بە زیرەکی و هەڵسەنگاندنە، بەڵام دەتوانین کاریگەری لە هیلدە بکەین. تەنها فریشتە دەتوانێت لە خودا هەڵبگەڕێتەوە.
ـ دەتوانین داوا لە هیلدە بکەین کە هەر کاتێک باوکی گەڕایەوە ماڵەوە، زمانی لێدەربهێنێت. دەتوانێت پێی بڵێت تۆ لە مرۆڤێکی بەدکار خراپتریت... دەتوانێت بەلەمەکەی بشکێنێت، یان بەلایەنی کەمەوە لایتەکانی وردوخاش بکات.
ئەلبێرتۆ سەرێکی ڕاوەشاند و ئەوجا گوتی؛
ـ جگە لەوانەش هیلدە دەتوانێت بەجێی بهێڵێت. ئەم کارە بەلای ئەوەوە زۆر ئاسانترە لەوەی کە ئێمە بمانەوێت لەدەستی ڕابکەین. ئەو دەتوانێت بۆ هەتاهەتایە ماڵی مێجەر بەجێبهێڵێت و هەرگیز نەگەڕێتەوە. هەقی خۆی نیە بەم جۆرە سزای مێجەرێک بدەین کە لەسەر حسابی ئێمە یاری بە «فەنتاسیای خوڵقێنەری جیهانی خۆی» دەکات؟

ـ دەتوانم هەمووی بهێنمە بەرچاوم... مێجەر بە جیهانی فراواندا وێڵدەبێت و بەدوای هیلدەدا دەگەڕێت. بەڵام هیلدە لە هیچ سوچێکەوە شوێنەواری دیارنیە، لەبەرئەوەی ناتوانێت لەگەڵ باوکێکدا بژی کەلەسەر حسابی من و تۆ خۆی دەکاتە قۆشمەچی.
ـ ڕێک ڕاست دەکەیت... خۆی دەکاتە قۆشمەچی! مەبەستم ئەوەبوو کە گوتم دەمانکاتە جۆرە ڕابواردنێکی ڕۆژی لەدایک بوونی کچەکەی، بەڵام دەشێ ئاگاداری خۆی بێت، سۆفیا. هەروەها هیلدەش دەبێت ئاگاداری خۆی بێت.
ـ مەبەستت چیە؟
ـ باش دانیشتوویت؟
ـ بەڵێ، ئەگەر ڕۆحێکی دوکەڵاوی ترمان لێ پەیدا نەبێت.
ـ مەزەنەی ئەوە بکە هەموو ئەو شتانەی دەیانبینین لە ئاگایی کەسێکی تردا ڕوودەدەن... ئێمە ئەو «ئاگاییەن». واتە ئێمە ڕۆحی تایبەت بە خۆمان نیە، بەڵکو ئێمە ڕۆحی کەسێکی ترین. لە ڕاستیدا تا ئێرە لەلایەن فەلسەفەوە تەواو ئاشناین و هیچ شتێکی سەیری تێدا نیە، بەڵام لێرەدا بارکێلی و شێللینگ زۆر بە ئاگاداریەوە گوێ قوڵاخن.
ـ بە ڕاست؟
ـ کەواتە دەتوانین بڵێین ئەو ڕۆحە باوکی هیلدە میوللە کنەیە، لە لوبنان دانیشتووە و مێژووی فەلسەفە دەنووسێتەوە و دەیکاتە دیاری ڕۆژی لەدایک بوونی کچەکەی. کاتێک بەیانی ڕۆژی 6/15 هیلدە خەبەری دەبێتەوە، کتێبەکە لەسەر مێزی تەنیشت جێگای خەوەکەیەوە دەبینێ، ئەوساکە ئەویش و خەڵکانی تریش دەتوانن

دەربارەی ئێمە بخوێننەوە. وەک دەزانیت هەر لە مێژەوە باسی ئەوە کراوە کە دیاریەکە دەکرێت لەگەڵ کەسانی تردا دابەشبکرێت.
ـ بەڵێ، ئەوەم باش لەیادە.
ـ واتە ئەمەی ئێستاکە پێتی دەڵێم و هیلدە دەیخوێنێتەوە، ڕۆژێک لە ڕۆژان باوکی لە لوبنانەوە مەزەنەی ئەوەی دەکرد، کە من ئێستا پێت دەڵێم کە ئەو لە لوبنان دانیشتووە و ...
سۆفیا تەواو سەری لێشێوا. هەوڵی دەدا باسەکانی بارکێلی و ڕۆمانسیەکان بهێنێتەوە یادی... بەڵام ئەلبێرتۆ بەردەوام بوو؛
ـ بەڵام پێویست ناکات تەنها لەبەر ئەم هۆیە، زۆر دڵی خۆیان خۆشبکەن و بکەونە قاقا لێدان، لەبەرئەوەی ئەم جۆرە پێکەنینانە بە ئاسانی ڕێی تێدەچێت بەسەر ملی ساحێبەکانیدا بشکێتەوە.
ـ ملی کێ؟
ـ بێگومان هیلدە و باوکی... باسی ئەوانمان نەدەکرد؟
ـ بەڵام بۆ دەبێت هێندە دڵیان خۆش نەبێت؟
ـ لەبەرئەوەی زۆر ڕێی تێدەچێت «ئەوانیش» تەنها لە ئاگایی پێکهاتبن.
ـ چۆن ئەمە ڕێی تێدەچێت؟
ـ ئەگەر بەلای بارکێلی و ڕۆمانسیکانەوە ڕێی تێبچێت، کەواتە بەلایەن ئەوانیشەوە ڕێی تێدەچێت. لەوانەیە مێجەر خۆی جۆرە وێنەی سێبەرێک بێت لە کتێبێکدا کە باسی خۆی و هیلدە دەکات، بێگومان باسی من و تۆشی تێدایە، چونکە ئێمەش بەشێکی پچکۆلەی ژیانیان پێک دەهێنین.
ـ ئەوساکە هەر زۆر خراپتر دەبێت، چونکە ئێمە دەبینە وێنەی سێبەری چەند وێنەی سێبەرێکی تر.

- لەوانەیە نووسەرێکی تر لە شوێنێکی ترەوە کتێبێک دەربارەی مێجەر ئەلبێرت کنەی بنووسێت، کە دەیەوێت کتێبێک بۆ کچەکەی بنووسێت. ئەو کتێبەش دەربارەی مێجەر ناوێکە کە لە پڕێکدا وانەی فەلسەفی بۆ سۆفیا ئامۆنسن دەنێرێت... دەینێرێتە کۆڵانی کلۆیڤەی ژمارە سێ.
- لەو بڕوایەدایت؟
- تەنها ئەوەندە دەڵێم کە ئەمە ڕێی تێدەچێت. ئەوساکە ئەو نووسەرە بەلای ئێمەوە وەک خودایەکی شاراوە وایە، سۆفیا. هەرچەندە هەموو شتێک کە دەیڵێین و دەیکەین لەوەوە سەرچاوەی بەستووە، لەبەرئەوەی ئێمە «ئەوین»، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ناتوانین هیچ شتێک دەربارەی بزانین... ئێمە کەوتووینەتە بنی بنی بیرەکەوە.
ئەوجا ئەلبێرتۆ و سۆفیا بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بە بێدەنگی مانەوە... پاشان سۆفیا بێدەنگیەکەی شکاند و گوتی؛
- بەڵام ئەگەر بە ڕاستی نووسەرێکی وا هەبێت کە کتێبێک دەربارەی باوکی هیلدە بنووسێت، کە «ئەویش» لەلای خۆیەوە کتێبێک دەربارەی ئێمە بنووسێت...
- بەڵێ، پاشان چی؟
- ...ئەوا دەتوانین بڵێین کە ئەویش پێویست ناکات زۆر دڵی بە خۆی خۆش بێت.
- مەبەستت چیە؟
- مەبەستم لەوەیە کە ئەو دانیشتووە و من و هیلدەی خستۆتە قوڵایی مێشکیەوە، بەڵام ئایا ڕێی تێناچێت خۆشی لەناو ئاگاییەکی باڵاتردا ژیانی بەسەر بەرێت؟
ئەلبێرتۆ سەرێکی لەقاند؛

ـ بێگومان سۆفیا. ئەوەش ڕێی تێدەچێت. ئەگەر ئەمەشیان ڕاست بێت، ئەوا ڕێک تەنها لەبەر خاتری خستنە ڕووی ئەو بوارە، ئەم هەموو گفتوگۆیە فەلسەفیەی پێکردین. لێرەشەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خۆشی شێوە سێبەرێکی بێ دەسەلاتە و ئەم کتێبەش کە هیلدە و سۆفیای تێدا دەژی، لە ڕاستیدا کتێبێکی فێربوونی فەلسەفەیە.
ـ کتێبی فێربوون؟
ـ لەبەرئەوەی سەراپای هەموو ئەو گفتوگۆیانە، هەموو ئەو دیالۆگانە، سۆفیا...
ـ چین؟
ـ لە ڕاستیدا هەموویان مۆنۆلۆژێکی دورودرێژە.
ـ وا هەست دەکەم هەموو شتێک یەک بەدوای یەکدا دەتوێتەوە و دەبێتە ئاگایی و ڕۆح. دڵیشم زۆر بەوە خۆشە کە هێشتام چەند فەیلەسوفێکی ترمان ماوە، لەبەرئەوەی ئەو فەلسەفە جوانەی لە تالیس و ئێمپیدۆکلس و دیمۆکریتسەوە دەستی پێکرد، پێم وانیە لێرەدا کۆتایی پێبێت.
ـ نەخێر، لێرەدا تەواو نابێت. ئێستاکە حەزدەکەم باسی هیگڵ «Hegel»ت بۆ بکەم، ئەو فەیلەسوفەی، پاش ئەوەی ڕۆمانسیەکان هەموو شتێکیان لە ڕۆحدا تواندەوە، هەوڵی دەدا فەلسەفە ڕزگاربکات.
ـ بەپەرۆشەوە چاوەڕوانم.
ـ دەڕۆینە ژورەوە دادەنیشین، چونکە چیتر نامەوێت هیچ ڕۆحێک یان وێنەیەکی خەیاڵی تر باسەکەمان پێببڕێت.
ـ خەریکە کەمێکیش ساردی دەکات.
ـ بەشێکی نوێ!

## ...تەنها ئەو شتەی کە ئەقڵانی بێت، توانای ژیانی تێدایە...

هیلدە دەستی لە مەلەفە گەورەکە بەردا و کەوتە خوارەوە. لەسەر جێگاکەی ڕاکشا و تەماشای بنمیچەکەی دەکرد. سەری بەتەواوەتی گێژی دەخوارد.
بەڕاستی باوکی وڕوکاسی کردبوو. ناپەسەند! چۆن توانی؟
سۆفیا هەوڵیدا ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵدا بکات. بە ئاشکرا داوای لێکرد لە باوکی هەڵبگەڕێتەوە. لە ڕاستیدا ئەندێشەیەکی خستە مێشکیەوە، پیلانێک...
بێگومان سۆفیا و ئەلبێرتۆ ناتوانن تەنانەت دەست لە تاڵە موویەکی سەری باوکی بدەن، بەڵام هیلدە دەتوانێت. بەم شێوەیەش سۆفیا، لە ڕێگەی هیلدەوە، دەتوانێت لە مێجەر نزیک ببێتەوە.
هیلدە لەگەڵ سۆفیا و ئەلبێرتۆدا تەبابوو کە باوکی لە یاری وێنە سێبەریەکانیدا (*کەسایەتیەکانی چیرۆکەکەیدا.و) زیاد لە پێویست پێی دادەگرت... ڕاستە ئەو کەسایەتی هەردووکیانی داڕشتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت سنوورێک بۆ هەڵسوکەتی دانێت لەگەڵیاندا.
ئای سۆفیای و ئەلبێرتۆی نەگبەت! بە هیچ جۆرێک ناتوانن بەرەنگاری فەنتاسیای مێجەر بن. هەروەک چۆن شاشەیەک ناتوانێت بەرەنگاری ئەو فلیمە بکات کە لەسەری نیشان دەدرێت، ئەوانیش ئاوهابوون.
هیلدە بە ڕاستی دەیویست ئەو کاتەی باوکی دێتەوە، دەرسێکی باشی دابدات! هەر لە ئێستاوە خۆی بۆ ئامادە دەکرد و دەیبینی چ حەشرێکی پێدەکات.

**بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت و تەماشای قەراغ ئاوەکەی دەکرد... کاتژمێر نزیکی دوو بوو. پەنجەرەکەی کردەوە و بەرەو لای بەلەمەکان هاواریکرد؛**

**- دایە!**

**پاش کەمێک دایکی هاتە دەرەوە.**

**- پاش سەعاتێکی تر خواردنت بۆ دەهێنم، باشە؟**

**- باشە، باش...**

**- دەمەوێت لەپێشدا کەمێک دەربارەی هیگڵ بخوێنمەوە!**

ئەلبێرتۆ و سۆفیا لەسەر کورسیەکانیان دانیشتبوون، لەبەردەم ئەو پەنجەرەیەدا بوون، کە بەسەر دەریاچەکەدا دەیڕوانی، ئەلبێرتۆ دەستی بە قسەکرد؛

- جۆرج ولیەم فریدریک هیگڵ «Georg Wilhelm Friedrich Hegel» منداڵی ڕاستەقینەی سەردەمی ڕۆمانسی بوو. تا ڕادەیەک دەتوانین بڵێین ئاگای لە پێشکەوتنی هێواش هێواشی فیکری ئەڵمانی بوو. لە ساڵی 1770دا لە شاری "شتوتگارد"دا لە دایک بوو، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا لە شاری "تیۆبینگن" دەستی بە خوێندنی تیۆلۆجی کرد. لە ساڵی 1779وە لەگەڵ شێللینگدا لە شاری "جینا"دا کاری دەکرد، ئەمەش ڕێک لەو کاتەدابوو کە بزوتنەوەی ڕۆمانسی لەو پەڕی ترۆپکیدا بوو. لە شاری جینادا بووە مامۆستا و پاشانیش لە شاری "هایدلبێرگ"دا بووبە پڕۆفیسۆر، ئەو شارەی کە سەنتەری ڕۆمانسیە نەتەوەییەکانی ئەڵمانیا بوو. دواجاریش لە شاری "بەرلین"دا وەک پڕۆفیسۆر کاری دەکرد، کتومت لەو کاتەدا بوو کە بەرلین خەریکبوو دەبووە چەقی فیکری ئەڵمانی. لە مانگی یانزەی ساڵی 1831دا بە

نەخۆشی کۆلێرا مرد، بەڵام هەر لەپێش ئەو ساڵەوە «هیگڵێنیزم Hegelianism» لە زۆربەی زانکۆکانی ئەڵمانیادا بڵاو بووبووەوە.

ـ بەشێوەیەکی تر بیڵێین، سەرکەوتوو بوو.

ـ بەڵێ، هەروەها فەلسەفەکەشی بە هەمان شێوە سەرکەوتوو بوو. هیگڵ هەموو بزوتنەوە جیاوازەکانی سەردەمی ڕۆمانسی کۆکردەوە و گەشەی پێدان، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ڕەخنەگرێکی توند و تیژبوو، بۆ نمونە ڕەخنەی لە فەلسەفەی شێللینگ دەگرت.

ـ ڕەخنەی لە چی دەگرت؟

ـ شێللینگ و ڕۆمانسیەکانی تر، ڕەگی یان سەرچاوەی بوونیان دەگەڕاندەوە بۆ سەر «ڕۆحی جیهان». هیگڵیش زاراوەی «ڕۆحی جیهان»ی بەکاردەهێنا، بەڵام مانایەکی نوێی پێ بەخشی. کاتێک هیگڵ باسی «ڕۆحی جیهان» یان «ئەقڵی جیهان» دەکات، ئەوا مەبەستی لە کۆی هەموو دیاردە مرۆڤایەتیەکانە، لەبەرئەوەی تەنها مرۆڤ «فیکر»ی هەیە. لەم ڕوانگەیەشەوە لەڕێڕەوی مێژووییەوە باس لە پێشکەوتنی «ڕۆحی جیهان» دەکات. بەڵام لێرەدا دەبێت خاڵێکی گرنگ لە یاد نەکەین؛ ئەو باسی ژیانی مرۆڤ و فیکری مرۆڤ و کەلتوری مرۆڤ دەکات.

ـ بەم شێوەیەش یەکسەر فیکر کەمێک لە تەم و مژێتیەکەی ڕزگاردەکات و چیتر لەناو دار و بەرددا وەک «زیرەکیەکی خەفەبووی خەوتوو» نامێنێتەوە.

ـ بێگومان لەیادتە کاتێک کانت باسی شتێکی دەکرد کە خۆی پێی دەگوت «شتەکان وەک ئەوەی هەن»... هەرچەندە نکۆڵی لەوە دەکرد کە مرۆڤ بتوانێت لە نهێنی قوڵی سروشت بگات، بەڵام لەگەڵ

ئەوەشدا دەیگوت جۆرە «هەقیقەتێک» هەیە کە مرۆڤ ناتوانێت پێی بگات. هیگڵ نکۆڵی لە بوونی هەموو جۆرە «هەقیقەتێک» دەکرد کە لە دەرەوە یان لەسەرو ئەقڵی مرۆڤەوە بێت. هەموو مەعریفەیەک بەبڕوای ئەو مەعریفەی مرۆڤانەیە.

- بەکورتی، دەیویست جارێکی تر فەلسەفە بهێنێتەوە سەر زەوی، وانیە؟

- بەڵێ، تا ڕادەیەک دەتوانین وا بڵێین. بەڵام لەبەرئەوەی فەلسەفەی هیگڵ زۆر فرەلایەن و ئاڵۆزە، ناچارین لێرەدا تەنها خاڵە هەرە گرنگەکانی بخەینە ڕوو. بەشێوەیەکی گشتی جێگەی گومانە بتوانین بڵێین هیگڵ خاوەنی «فەلسەفەی» تایبەتی خۆیەتی، لەبەرئەوەی ئەو شتەی پێی دەڵێن فەلسەفەی هیگڵ، بەپلەی یەکەم جۆرە «میتۆدێک»ە بۆ تێگەیشتنی ڕێڕەوی مێژوو. لەبەرئەمە تا ڕادەیەکی زۆر ئەگەر باس لە مێژووی مرۆڤایەتی نەکەین، ئەوا ناتوانین باسی فەلسەفەی هیگڵ بکەین. فەلسەفەکەی هیچ شتێکمان دەربارەی «ناواخنی بوونی سروشت» پێناڵێت، بەڵام فێرمان دەکات بە شێوەیەکی چالاکانە بیربکەینەوە.

- ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەشێت گرنگ بێت.

- خاڵی هاوبەشی هەموو ڕژێمە فەلسەفیەکانی پێش هیگڵ، هەوڵدانی دۆزینەوەی پێوانەیەک بوو بۆ مەعریفەی مرۆڤ، واتە تا چ ڕادەیەک مرۆڤ دەتوانێت لە جیهان تێبگات. ئەم خاڵەش، هەم دیکارت و سپینۆزا و هەم هیوم و کانتیش دەگرێتەوە. هەریەک لەمانە هەوڵیاندەدا بنچینەی مەعریفەی مرۆڤایەتی دیاری بکەن. بەڵام هەموویان کاتێک دەهاتنە سەر بنچینەی مەعریفەی مرۆڤایەتی سەبارەت بە جیهان، باسی بنچینەیەکی هەمیشەییان دەکرد.

- بەڵام ئایا ئەمە ئەرکی سەرشانی فەیلەسوف نیە؟
- هیگڵ لەو بڕوایەدا نەبوو ئەمە بگونجێت. بە بڕوای ئەو، ئەو شتەی کە بنچینەی مەعریفەی مرۆڤایەتی دادەنێت، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگۆڕێت. لەبەرئەمە هیچ جۆرە «هەقیقەتێکی هەتاهەتایی» بوونی نیە، هیچ جۆرە ئەقڵیەتێکی هەمیشە مۆدێرن بوونی نیە. واتە «خودی مێژوو» تەنها خاڵێکی پتەوە، کە فەیلەسوف دەتوانێت لێوەی دەست پێبکات.
- بەیارمەتیت کەمێک زیاترم بۆ ڕوونبکەرەوە... مێژوو هەمیشە لە گۆڕانکاریدایە؛ ئەی چۆن ڕێی تێدەچێت کە خاڵێکی پتەومان هەبێت؟
- ڕووباریش هەمیشە لە گۆڕانکاریدایە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە نەتوانین باس لە ڕووبار بکەین. بەڵام بێمانایە بپرسین، چ خاڵێکی ڕووبارەکە بە «ڕاستەقینەترین» ڕووبار دادەنرێت.
- نەخێر، لەبەرئەوەی ڕووبارەکە بەدرێژایی ڕۆیشتنی هەر هەمان ڕووبارە.
- مێژوو بەلای هیگڵەوە وەک ڕووبارێکی ئاوها وایە؛ لەبنەڕەتدا و بە درێژایی هەموو ڕووبارەکە، سەرجەمی هەموو جوڵانەوەیەکی چکۆلەی ئێرە و ئەوێی ناو ئاوەکە، پشت بە شێوەی ڕژان و بزوتنەوەی ئاوەکە دەبەستێت. بەڵام لە هەمان کاتیشدا و ڕێک لەو شوێنەوەی کە تۆ وەستاویت و تەماشای ئاوەکە دەکەیت، جۆری بەردەکانی ناو ئاوەکە و چۆنیەتی چەمانەوەی ئاوەکە، جوڵەکەی دیاریدەکات.
- پێم وابێت ئێستاکە تێدەگەم.
- هەروەها مێژووی فیکریش –یان مێژووی ئەقڵیش- وەک شێوە ڕووبارێکی ئاوها وایە. هەموو ئەو فیکرانەی پێش تۆ کە بە «تەوژم» لەگەڵ داب و نەریتی مرۆڤدا هاتوون و هەموو ئەو هەل و مەرجە

مادیانەی لەسەردەمی تۆدا زاڵن، بەشداری دەستنیشانکردنی شێوەی بیرکردنەوەی تۆ دەکەن. لەبەرئەمە ناتوانیت بڵێیت فیکرەیەکی دیاریکراو بۆ هەتاهەتایە ڕاستە، بەڵام دەشێت فیکرەیەک لەو شوێنەی کە تۆی تێدایت، ڕاستبێت.
ـ بەڵام خۆ ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە هەموو شتێک وەک یەک ڕاستن یان وەک یەک هەڵەن؟
ـ نەخێر، بەڵام شتێک تەنها بەپێی حاڵەتێکی دیاریکراوی مێژوویی دەکرێت ڕاستبێت یان هەڵەبێت. بۆ نمونە ئەگەر لە ساڵانی 1990دا پشتگیری فیکرەی کۆیلایەتی بکەیت، ئەوا لە باشترین حاڵەتدا وەک گاڵتەجارێک تەماشات دەکرێت، بەڵام 2500 ساڵ لەمەوبەر یەکجار وا بێئەقڵانە تەماشا نەدەکرا، هەرچەندە ئەو کاتەش چەندین دەنگی پێشکەوتوخواز بەرزدەبوونەوە و داوای لابردنی کۆیلایەتیان دەکرد. بەڵام با نمونەیەکی نزیکتر بهێنینەوە؛ سەد ساڵێک لەمەوبەر بە مەبەستی برەوپێدانی کشتوکاڵ، سوتانی دارستانە گەورەکان بە هەڵە دانەدەنرا، بەڵام ئەمڕۆکە هەر زۆر «هەڵە و نائاقڵانە» تەماشای ئەم کارە دەکرێت، لەبەرئەوەی ئێستاکە لەسەر بنچینەیەکی تەواو جیاوازتر و باشتریش ئەو جۆرە کارانە هەڵدەسەنگێنین.
ـ ئێستاکە تێدەگەم.
ـ هەروەها بەلایەن فیکری فەلسەفیشەوە هیگڵ دەڵێت هزر شتێکی دینامیکیە... بەڵێ، ڕاستەوخۆ دەڵێت پڕۆسێسێکە و «هەقیقەتیش» خودی ئەو پڕۆسێسەیە. لە ڕاستیدا هیچ جۆرە پێوانەیەک لە دەرەوەی خودی ئەو پڕۆسێسە مێژووییەدا نیە، کە بتوانێت «ڕاستترین» و «ئاقڵترین» شتمان بۆ دیاریبکات.
ـ بەیارمەتیت نمونە بهێنەرەوە!

- بۆ نمونە ناتوانین فیکرەی جیاواز جیاواز لە سەدە کۆنەکان و سەدەکانی ناوەڕاست و ڕێنیسانس و سەدەی ڕۆشنگەریەوە دەربهێنین و بلێیین ئەم یەکەیان ڕاستە و ئەم یەکەیان هەڵەیە. نە دەشتوانین بڵێین پلاتۆن بەهەڵەدا دەچوو و ئەریستۆتالیس ڕاستی دەکرد، یان بڵێین هیوم هەڵە بوو بەڵام کانت و شێللینگ ڕاستیان دەکرد. ئەمە شێوە بیرکردنەوەیەکی نامێژوویيانەیە.
- ڕاستدەکەیت، بەو جۆرە ناکرێت.
- بەشێوەیەکی گشتی ناکرێت هیچ فەیلەسوفێک –یان هیچ فیکرەیەک- لە بنچینەی مێژوویی فەیلەسوفەکە یان فیکرەکەی داببڕێت. بەڵام – لێرەدا لە خاڵێکی گرنگ نزیک دەبمەوە؛ هەمیشە شتی نوێ دێتە ئاراوە، کەواتە ئەقڵ شتێکی «پێشکەوتووخوازە». واتە بەپێی هیگڵ مەعریفەی مرۆڤایەتی بەردەوام گەشە دەکات و لەم ڕوانگەیەشەوە «بەرەوپێشەوە دەچێت.»
- کەواتە هێشتام دەتوانین بڵێین فەلسەفەی کانت لە هی پلاتۆن ڕاستترە، وا نیە؟
- بەڵێ، «فیکرەی جیهان» لە پلاتۆنەوە بۆ کانت گەشەی کردووە و پەرەی سەندووە، بێگومان دەبێت هەر ئاوهاش بێت. ئەگەر بشگەڕێینەوە سەر نمونەی ڕووبارەکەمان، ئەوا دەتوانین بڵێین ئاوی زیاتری تێڕژاوە، لەبەرئەوەی دوو هەزار ساڵ زیاتری بەسەردا تێپەڕیووە. کانتیش دەشێ لەو بڕوایەدا نەبێت کە «هەقیقەتەکانی» هەمیشە وەک بەردێکی پتەو و نەجوڵاوی قەراخ ڕووبارەکە بمێنێتەوە، لەبەرئەوەی بیرکردنەوەکانی ئەویش کاریان لەسەردەکرێت و «ئەقڵی کانت»یش دەکەوێتە بەر ڕەخنەی نەوەکانی داهاتووی... ئەمەش ڕێک ئەو شتە بوو کە ڕوویدا.

ـ بەڵام ئەو ڕووبارەی کە باست کرد ...
ـ بەڵێ، چیەتی؟
ـ لە ڕاستیدا بەرەو کوێ دەڕوات؟
ـ هیگڵ دەڵێت «فیکری جیهان»، سەبارەت بە خۆی، بەردەوام بەرەو ئاگاییەکی فراوانتر و فراوانتر گەشە دەکات. ڕێک هەروەک چۆن ڕووبارێک هەتا زیاتر لە ئۆقیانوسێک نزیکتربێتەوە، فراوانتر و فراوانتر دەبێت. مێژوو بەلای هیگڵەوە، بەخەبەربوونەوەیەکی هێواشی «فیکری جیهانە» بۆ ئاگایی خودی خۆی. وەک دەزانین جیهان هەمیشە هەر هەبووە، بەڵام لە ڕێگەی کەلتوری مرۆڤ و پێشکەوتنیەوە، «فیکری جیهان» زیاتر و زۆرتر لە تایبەتمەندێتی خۆی بەئاگا دەبێت.
ـ چۆن دەیتوانی هێندە دڵنیابێت؟
ـ ئەو وەک هەقیقەتێکی مێژوویی ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد، نەک وەک پێشبینی کردنێک. هەرکەسێکیش لە مێژوو بکۆڵێتەوە، دەبینێت کە مرۆڤایەتی بەردەوام بەرەو «مەعریفەیەکی» فراوانتر ڕۆیشتووە، بەرەو «گەشەکردنێکی» گەورەتر هەنگاوی ناوە. بەپێی هیگڵ لێکۆڵینەوەی مێژوو، نیشانمان دەدات کە مرۆڤایەتی بەردەوام بەرەو ئەقڵانیەتێک و سەربەستیەکی گەورەتر گەشەدەکات و دەڕوات. واتە لەگەڵ هەموو بەربەستەکانیشدا ڕێڕەوی مێژوو بەردەوام گەشەدەکات و «بەرەو پێشەوە» دەچێت، لەبەرئەوە دەڵێین مێژوو بەسەر خۆیدا تێدەپەڕێت یان «ڕووەو ئامانج دەچێت.«
ـ باشە... واتە پێشکەوتنێک ڕوودەدات.
ـ بەڵێ، مێژوو وەک زنجیرەیەکی دورودرێژی بیرکردنەوە وایە. هیگڵیش ئامارژە بۆ ئەو یاسایانە دەکات کە ئەو زنجیری بیرکردنەوەیە بەڕێوە دەبەن. ئەگەر بەقوڵی لە مێژوو بکۆڵینەوە، ئەوا دەبینین

بیرکردنەوەیەک لەسەر بنچینەی بیرکردنەوەیەکی پێشتر دادەمەزرێت. بەڵام هەر کە بیرکردنەوەیەک دێتە پێشەوە، بیرکردنەوەیەکی نوێتر بەرەنگاری دەبێتەوە. بەم شێوەیەش جۆرە گرژییەک لە نێوان شێوەی بیرکردنەوە دژەکاندا سەرهەڵدەدات، بەڵام ئەم گرژیەش بەهۆی بیرکردنەوەیەکی سێهەمەوە لادەبرێت، کە باشترین لایەنی هەردوو ڕوانگەکە وەردەگرێت و کۆیدەکاتەوە. هیگڵ بەمە دەڵێت گەشەکردنێکی «دیالێکتیکیانە.» Dialectical

- دەتوانیت نمونەیەک بهێنیتەوە؟

- لەیادتە فەیلەسوفە (پێش-سوکراتیەکان) مشتومڕیان لەسەر مادەی سەرەتایی و گۆڕانکاری دەکرد...

- بەشێوەیەکی گشتی، بەڵێ.

- ئیلیاتەکان دەیانگوت لەڕاستیدا هەموو شێوە گۆڕنکاریەک مەحاڵە. لەبەرئەمە هەرچەندە بەهۆی هەستەکانی خۆیانەوە دەیانبینی گۆڕانکاریەکان ڕوودەدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناچاربوون نکۆڵیان لێبکەن. لێرەشەوە ئیلیاتەکان گریمانەی شتێکیان دەکرد... هیگڵیش بەم جۆرە ڕوانگەیە دەڵێت «هەڵوێستە.»

- بەڵێ!

- بەڵام هەموو کەڕەتێکیش کە گریمانەیەکی ئاوها توند و تیژ سەرهەڵدەدات، لە بەرامبەریشیدا گریمانەیەکی دژ بەو دەردەکەوێت. هیگڵ ئەمەی ناونابوو «نکۆڵیکردن.» Negation نکۆڵیکردنی فەلسەفەی ئیلیاتەکانیش، گریمانەکەی هیراکلیتس بوو کە دەیگوت «هەموو شتێک لە بزاوتندایە». ئێستاکەش جۆرە گرژییەک لە نێوان هەردوو شێوەی بیرکردنەوە جیاوازەکان هاتە کایەوە. بەڵام ئەم گرژیە کاتێک «نەما» کە ئێمپیدۆکلس ئاماژەی بۆ ئەوەکرد کە هەردوو

لایەنەکە کەمێک ڕاستدەکەن و لە هەمان کاتیشدا هەردوو ڕوانگەکە چەند هەڵەیەکیان هەیە.
ـ ئێستاکە خەریکە بۆم ڕووندەبێتەوە...
ـ ئیلیاتەکان ڕاستیان دەکرد کاتێک دەیانگوت هیچ شتێک بە شێوەیەکی جەوهەری ناگۆڕێت، بەڵام بە هەڵدا دەچوون کاتێک لەو بڕوایەدابوون کە نەتوانین پشت بە هەستەکانمان ببەستین. هیراکلیتسیش ڕاستی دەکرد کە دەیگوت دەتوانین پشت بە هەستەکانمان ببەستین، بەڵام بەهەڵدا دەچوو کاتێک کە دەیگوت «هەموو شتێک لە بزاوتندایە.»
ـ لەبەرئەوەی مادەی بنەڕەتی لەیەک دانە زیاترە و تەنها پێکهاتەکەی گۆڕانکاری بەسەردا دێت، نەک خودی مادە بنەڕەتیەکانی.
ـ ڕاستە. ڕوانگەی ئێمپیدۆکلیسیش –کە هەردوو بیرکردنەوە لێکدژەکەی بەیەک گەیاند- هیگڵ پێی دەگوت «نکۆڵیکردنی نکۆڵیکردن.»
ـ چ زاراوەیەکە!
ـ بەسێ قۆناخی مەعریفەکانیشی دەگوت «تێزی زانیاری» و «دژی تێزی زانیاری» و «یەکگرتنی تێزی زانیاری». بۆ نمونە دەتوانیت بڵێیت ڕاشیونالیزمیەکەی دیکارت «تێزێکی زانیاری» بوو، کە لە لایەن هیومی ئیمپیریستەوە بەرەنگاریکرا –لێرەدا هیوم دەبێتە «دژی تێزی زانیاری». بەڵام ئەم دژایەتیەش –خودی ئەو گرژیەی نێوان هەردوو بیرکردنەوە جیاوازەکە- لە لایەن کانتەوە هەڵگیرا، بەمەش دەگوترێت «یەکگرتنی تێزی زانیاری». کانت ڕاشیونالیزمەکانی لە شتێکدا بە ڕاست دادەنا و ئیمپیریستەکانیش لە شتێکی تردا، لە

هەمان کاتیشدا نیشانیدا کە هەردوو لایەنەکە لە هەندێک خاڵی گرنگدا بەهەڵەدا دەچوون. بەڵام مێژوو لەگەڵ کانتدا تەواو نەبوو. ئەوجا «یەکگرتنی تێزی زانیاری» کانتیش بووە سەرەتای زنجیرە بیرکردنەوەیەکی «سێ-لایەنی» نوێ، لەبەرئەوەی دیسانەوە «دژی تێزی زانیاری»یەکی نوێ دژ بە «یەکگرتنی تێزی زانیاری» دەوەستێتەوە.

- تا ڕادەیەکی زۆر تیۆریە.

- بەڵی، لەوانەیە تیۆری بێت. بەڵام هیگڵ نەیدەویست هیچ جۆرە «خشتە یان پیلان نامەیەک» بەسەر مێژوودا بچەسپێنێت. بەبڕوای ئەو دەتوانین جۆرە تەونێکی دیالێکتیکی ئاوها لە مێژوودا ببینین. بەم شێوەیەش دەیگوت پەردەم لەسەر هەندێ یاسای پێشکەوتنی ئەقڵ هەڵماڵی، یان دەتوانین بڵێین هەندێ یاسای «فیکری جیهانی» مێژوویی دەرخست.

- دیسانەوە!

- بەڵام دیالێکتیکی هیگڵی تەنها بەسەر مێژوودا ناچەسپێت. کاتێک کە مشتومڕی شتێک دەکەین، دیسانەوە بەشێوەیەکی دیالێکتیکیانە بیردەکەینەوە. هەوڵدەدەین کەموکوڕی لایەنێکی بیرکردنەوە دەربخەین. هیگڵ بەمەی دەگوت «بیرکردنەوەی نەگەتیفی». بەڵام کاتێک کەموکوڕی شێوەیەکی بیرکردنەوە دەردەخەین، ئەوا لە هەمان کاتدا لایەنە باشەکانی دەهێڵینەوە.

- بەیارمەتیت نمونە بهێنەرەوە!

- بۆ نمونە کاتێک سۆشیالیستێک و کۆنسەرڤاتیڤێک پێکەوە بۆ دۆزینەوەی چارەی گرفتێکی کۆمەلایەتی دادەنیشن، ئەوا یەکسەر گرژبوونێکی ڕوانگەکان دروست دەبێت، واتە جۆرە دژایەتیەک لە

نێوان شێوەی بیرکردنەوەکاندا دەبینین. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە لایەنێکیان لەسەدا سەد ڕاست دەکات و ئەوی تریان لەسەدا سەد هەڵەیە. لە ڕاستیدا دەگونجێت هەردوو لایەنەکە لە هەندێ خاڵدا ڕاست بن و لە هەندێ خاڵی تریشدا بەهەڵەدا بچن. پاش ئەوەش کاتێک هێدی هێدی مشتومڕەکەیان بەردەوام دەبێت، ئەوا زۆر جار باشترین لایەنی هەردوو مشتومڕەکە دەردەکەوێت.

ـ بەڵێ، خۆشبەختانە!

ـ بەڵام کاتێک لە ناوەڕاستی مشتومڕێکی ئاوهادا دەبین، ئەوا هەمیشە ئاسان نیە بڕیاربدەین چ لایەنێک ئەقڵانیترە. بڕیاردانی ڕاست و هەڵە، تا ڕادەیەک کەوتۆتە سەر مێژوو. تەنها ئەو شتەی ئەقڵانی بێت، توانای ژیانی تێدایە.

ـ واتە ئەو شتە دەمێنێتەوە کە ڕاستە.

ـ یان بە پێچەوانەوە؛ ئەو شتەی کە ڕاستە، دەمێنێتەوە.

ـ نمونەکەت زۆر دەوڵەمەند نەبوو.

ـ باشە، کەواتە گوێبگرە؛ 150 ساڵ لەمەوبەر خەڵکانێکی زۆر داوای یەکسانی مافی پیاو و ئافرەتیان دەکرد، بەڵام چەندەها خەڵکی تریش دژی ئەوە بوون. ئەگەر ئەمڕۆکە بێین و نووسراوی وتووێژی هەردوو لایەنەکەی ئەو کاتە بخوێنینەوە، ئەوا بە ئاسانی دەتوانین بڵێین کام لایەنەیان «ئەقڵانیتر» بیری دەکردەوە. بەڵام دەشێت لەیادمان بێت کە ئێمە لە کاتێکدا بڕیار دەدەین کە شتەکان ڕوویداوە. پاشان «وا دەرکەوت» ئەوانەی داوای یەکسانی مافی ئافرەت و پیاویان دەکرد، لەسەر هەق بوون. بێگومان خەڵکانێکی زۆریش ئەمڕۆکە هەست بەشەرم دەکەن، ئەگەر بیروباوەڕی باوباپیرانیان لەم بارەیەوە بۆ بخوێننەوە.

- ئەوە سەرم ناسورمێنێت، بەڵام ئەی هیگڵ خۆی لە چ بڕوایەکدا بوو؟
- دەربارەی یەکسانی پیاو و ئافرەت؟
- بەڵێ، باسی ئەوەمان نەدەکرد؟
- حەزدەکەیت لەم بارەیەوە تێکستێکی هیگڵت بۆ بخوێنمەوە؟
- زۆریشم پێ خۆش دەبێت.
- هیگڵ دەڵێ؛ «جیاوازی نێوان پیاو و ئافرەت وەک جیاوازی نێوان ئاژەڵ و ڕووەک وایە. سروشتی ئاژەڵ زیاتر وەک پیاوە و ڕووەکیش وەک ئافرەت، لەبەرئەوەی ئافرەت وەک ڕووەک بە هێمنی گەشە دەکات، وە بەشێوەیەکی مەبدەئی هەستێکی نادیاریکراوی گشتی هەیە. ئەگەر ئافرەتان وڵات بەرن بەڕێوە، ئەوا دەوڵەت دەکەوێتە مەترسیەوە، چونکە بەپێی پێویستیە گشتیەکانیان هەڵسوکەوت ناکەن، بەڵکو بەپێی حەز و بڕوای ڕێکەوت دەجوڵێنەوە. هەروەها ئافرەت بە جۆرێکی تایبەتی ئاوها دروستدەبێت ـهۆکەشی ڕوون نیەـ کە لەوە دەچێت وێناکردنەکانیان زیاتر لە ڕێگەی ژیانی ڕۆژانەوە هەڵچنن وەک لەوەی هەوڵبدەن بنەمایەکی مەعریفی بۆ خۆیان بەدەست بهێنن. بەڵام پیاو بە پێچەوانەوە لە ڕێگەی ماندووبونێکی گەورەی تەکنیکی و هەوڵوتەقەلای فیکرییەوە دەگاتە شوێنی مەبەستی خۆی.»
- سوپاس، ئەوەندە بەسە! وای بەباش دەزانم لەمە زیاتر گوێ بۆ ئەو تێکستانە شل نەکەم.
- بەڵام ئەم تێکستە نمونەیەکی نایابە؛ لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە تێگەیشتنە «ئەقلانیەکان» بە چ شێوەیەک بەبەردەوامی گۆڕانکاریان بەسەردادێت، هەروەها نیشانیشمان دەدات کە هیگڵیش کوڕی سەردەمەکەی خۆی بووە. ئێمەش هەروەها منداڵی سەردەمەکەی

خۆمانین. تێگەیشتنە «بێگومانەکانی» ئێمەش هەتاهەتایە لەبەردەم مێژوودا بەڕاستی نامێنێتەوە.

ـ دەتوانیت نمونەیەک بهێنیتەوە؟

ـ نەخێر ناتوانم.

ـ بۆ نا؟

ـ لەبەرئەوەی لە هەموو بارێکدا باس لە شتێک دەکەم کە هەر لە ئێستاوە لە گۆڕانکاریەکی بەردەوامدایە. بۆ نمونە ناتوانم بڵێم بەکارهێنانی ئۆتۆمبیل شتێکی بێئەقڵانەیە، چونکە دەبێتە هۆی پیسکردنی ژینگە. چەندەها کەس لە پێش منەوە باسی ئەمەیان کردووە، واتە دیسانەوە ئەمەش دەبێتە نمونەیەکی خراپ. بەڵام مێژوو ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆمان دەسەلمێنێت، کە زۆربەی ئەو شتانەی کە «بە بەڵگەنەویست و بێگومان» لەقەڵەمیان دەدەین، لەبەردەم دادگای مێژوودا خۆیان ناگرن.

لێرەدا دەتوانین سەرنج بۆ شتێکی تەواو جیاواز ڕابکێشین؛ زۆربەی پیاوانی سەردەمی هیگڵ، دەیانگوت دەبێت ئافرەت گوێڕایەڵ بێت و ئەو جۆرە وتانەشیان بە خۆشیەوە دووبارە دەکردەوە، بەڵام ڕێک ئەم هۆیە، بزوتنەوەی ئافرەتانی بەڕووناکی گەیاند.

ـ چۆن؟

ـ ئەو پیاوانە «تێزێک» یان «هەڵوێستەیەک»یان داڕشت. لە ڕاستیشدا بەهۆی ئەوەوە بوو کە بەشێوەیەکی گشتی بزوتنەوەی ئافرەتان دەستی پێکردبوو. وەک دەشزانیت بێسوودە گەر بەرەنگاری لە خاڵێک بکرێت کە هەمووان تەبابن لەسەری. هەتاوەکو باسکردنی پیاوەکان توندوتیژتر دەبوو، «نکۆڵیکردنەکەشی» لەلایەن ئافرەتانەوە بەهێزتر و بەهێزتر دەبوو. واتە دەتوانین بڵێین باشترین شت ئەوەیە کە

بەرامبەرەکەت زۆر بەهێز بێت. هەتاوەکو بەرامبەرەکان زیاتر توندڕەوبن، بەرپەرچدانەوەی کارەکەشیان توندتر و بەهێزتر دەبێت. هەروەک چۆن دەڵێین؛ «وەک ئەوە وایە ئاو بڕژێنیتە ناو ئاشەکەوە.«
- بەهەرحاڵ، ئێستاکە هەستدەکەم ئاشەکەی من خەریکە بەهێزتر بخولێتەوە!
- گەر لە ڕوانگەیەکی لۆژیکی یان فەلسەفی پەتیشەوە تەماشا بکەین، ئەوا زۆر جار گرژیەکی دیالێکتیکی لە نێوان دوو زاراوەدا دەبینین.
- بەیارمەتیت بۆم ڕوون بکەرەوە.
- بۆ نمونە ئەگەر بیر لە زاراوەی «بوون» بکەمەوە، ئەوا ناچاردەبم بیر لە زاراوەی دژەکەشی بکەمەوە، واتە «نەبوون». ئێمە ناتوانین تەنها بیر لەوە بکەینەوە کە هەین، ئەگەر لە هەمان کاتیشدا بیر لەوە نەکەینەوە کە هەمیشە لێرەدا نابین. گرژی نێوان زاراوەی «بوون» و «نەبوون» لەناو زاراوەی «دەرکەوتن لە بووندا یان لە خەلقبوون»دا دەتوێتەوە. لەبەرئەوەی ئەگەر شتێک بخولقێنرێت، ئەوا بەشێوەیەک لە شێوەکان مانای ئەوە دەبەخشێت کە هەم بوونیشی هەیە و هەم بوونیشی نیە.
- تێدەگەم.
- واتە ئەقڵیەتی هیگڵ «ئەقڵیەتێکی دینامیکیە». لە کاتێکیشدا کە هەقیقەت لە دژەکان پێکهاتبێت، کەواتە دەبێت وەسفکردنیشی پڕبێت لە دژایەتی. لێرەدا دەمەوێت نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە؛ دەڵێن زانای فیزیاوی دانیمارکی نیلز بۆهر «Niels Bohr» ناڵێکی ئەسپی بەسەر دەرگاکەی دەرەوەیاندا هەڵواسیبوو.
- ئەوە مانای بەخت دەبەخشێت؟

ـ بەڵام خورافیاتیشە و لە ڕاستیشدا نیلز بۆهر لە هەموو شتێکەوە نزیک بوو تەنها خورافیات نەبێت. ڕۆژێکیان برادەرێکی بە میوانی دەچێت بۆ لای و دەربارەی نالەکە لێی دەپرسێت؛ «خۆ بڕوات بەو جۆرە شتانە نیە؟»، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت؛ «بێگومان نەخێر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیستوومە کاریگەری خۆی هەر هەیە.»
ـ بەلامەوە سەیرە!
ـ بەڵام وەڵامەکەی تا ڕادەیەکی زۆر دیالێکتیکیانەیە؛ لەوانەشە هەندێ خەڵک لەو بڕوایەدابن کە وەڵامەکەی هاودژی خۆی بێت. نیلز بۆهر هەروەک فینیە«Vinje» ی شاعیری نەرویجی بە «دونیابینیەکی دوولایەنی» بەناوبانگ بوو، ئەو کەڕەتێکیان گوتی؛ «دوو جۆر هەقیقەت هەیە، هەقیقەتی ڕووکەش، کە دژەکەی بەتەواوەتی هەڵەیە و هەقیقەتی قوڵیش هەیە، کە دژەکەی هەروەک خۆی ڕاستە.»
ـ ئاخۆ چ جۆرە هەقیقەتێک بن؟
ـ بۆ نمونە ئەگەر بڵێم ژیان کورتە...
ـ لەگەڵتام.
ـ بەڵام لەوانەیە لە بوارێکی تردا دەستم بڵاوبکەمەوە و بڵێم ژیان دورودرێژە.
ـ بەشێوەیەک لە شێوەکان لەسەر هەقیت. بەشێوەیەک لە شێوەکانیش ئەو قسەیە ڕاستە.
ـ بەڵام دژایەتی دیالێکتیکی دەکرێت ببێتە هۆی ئەنجامدانی هەڵسوکەوتێک کە لە پڕێکدا ببێتە هۆی گۆڕانکاریەک، دەمەوێت لە کۆتایدا نمونەیەکت لەم بوارەوە بۆ بهێنمەوە.
ـ فەرموو!

ـ کچێکی گەنج بهێنە بەرچاوت کە هەمیشە بەدایکی دەڵێت؛ «بەڵێ دایە»، «بەسەرچاو دایە»، «چۆنت پێخۆشە ئاوها دەکەم دایە»، «هەر ئێستا ئەوەی دەیڵێیت جێبەجێی دەکەم دایە.»
ـ موچوڕکەم پێدا دێت...
ـ هەتاوەکو ڕۆژێکیان دایکەکە لە گوێڕایەڵی زیاد لە ڕادەی کچەکەی تەواو بێزاردەبێت و هاواری بەسەردا دەکات و دەڵێت؛ بەسە ئیتر ئەم هەموو گوێڕایەڵی و ڕێزە! «کچەکەشی وەڵام دەداتەوە و دەڵێت؛ بەڵێ باشە دایە.»
ـ من بوومایە یەک دوو زلەی باشم لێدەدا!
ـ بەڵێ، هەقی خۆی نیە؟ باشە ئەی ئەگەر لەوەڵامدا بیگوتایە؛ «بەڵام... بەڵام حەز دەکەم گوێڕایەڵبم»، ئەی ئەوساکە تۆ بوویتایە چیت دەکرد؟
ـ وەڵامێکی سەیردەبوو بەلامەوە، بەڵام ئەو کاتەش لەوانەیە گوێیەکیم هەر ڕابکێشایە.
ـ واتە بەشێوەیەکی تر بیڵێین، حاڵەتەکە لەشوێنی خۆیدا چەقیووە. دژایەتیە دیالێکتیکیەکە لەوێدا گەیشتۆتە شوێنێک، کە بەناچاری گۆڕانکاریەک دەخوڵقێنێت.
ـ مەبەستت لە گوێ ڕاکێشانەکەیە؟
ـ دەبێت دواهەمین خاڵی فەلسەفەی هیگڵێش باس بکەین.
ـ هێشتام هەر دانیشتووم.
ـ لە یادتە گوتمان ڕۆمانسیەکان باوەڕیان بە تاکە کەسی هەبوو؟
ـ «ڕێگا پڕ نهێنیەکە بەرەوناوەوە دەڕوات.»
ـ لە فەلسەفەی هیگڵدا ڕێک دژی یان «نکۆڵیکردنی» ئەو تاکە کەسیە بەدی دەکەین. هیگڵ گرنگی بەو شتانە دەدا کە پێی دەگوت «هێزی

بابەتی (*مەوزوعی)» و مەبەستیشی لە خێزان و دەوڵەت بوو. دەکرێت بڵێین هیگڵ بەچاوێکی گومانەوە تەماشای تاکەکەسی دەکرد، بەبڕوای ئەو تاکەکەس بەشێکی ئەندامی گشتە. بەلای ئەوەوە ئەقڵ یان «فیکری جیهان» شتێکە کە زیاتر لە ڕێگەی پەیوەندی مرۆڤەکانەوە دەردەکەوێت.

ـ باشتر بۆم ڕوونبکەرەوە!

ـ بەپلەی یەکەم ئەقڵ لە ڕێگەی زمانەوە خۆی نیشاندەدات. زمانیش شتێکە کە ئێمە تێیدا «لەدایک بووین». زمانی دانیمارکی بەبێ کاکە هانسن بەردەوام دەبێت، بەڵام کاکە هانسن بەبێ زمانی دانیمارکی کارەکانی بەباشی بۆ ناڕوات بەڕێوە. واتە تاکەکەس زمان دروست ناکات، بەڵکو زمان تاکەکەس دروستدەکات.

ـ لەوانەیە بتوانین وا بڵێین.

ـ کاتێک تاکەکەس لە زمانێکدا لەدایک دەبێت، ئەوا بەهەمان شێوەش لە هەلومەرجێکی مێژوویی خۆیدا لەدایک دەبێت. هیچ کەسێکیش لە پەیوەندی ئەو هەلومەرجانە «سەربەست» نیە. کەواتە ئەو کەسەی شوێنی خۆی لە وڵاتدا نەدۆزێتەوە، کەسێکی نامێژووییە. لەوانەیە لەیادت بێت، کە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بەلای فەیلەسوفە گەورەکانی ئەسیناشەوە گرنگ بوو. هەروەک چۆن ناتوانین وێنای وڵاتێک بەبێ هاووڵاتی بکەین، بە هەمان شێوەش ناتوانین وێنای تاکەکەس بەبێ وڵات بکەین.

ـ تەواو ئاشکرایە.

ـ بەپێی هیگڵ، وڵات لە تاکە هاووڵاتیەک «زیاترە»، بەڵێ، بەڵکو لە کۆمەڵێ هاووڵاتیش زیاترە. بەڕای ئەو مەحاڵە بتوانیت لە «کۆمەڵگا بێیتە دەرەوە». ئەو کەسەی کاتێک باسی کۆمەڵگای بۆ دەکەین،

ئەگەر تەنها شانێک هەڵتەکێنێت و وای بەباش بزانێت «تەنها بۆ خۆی بژی»، ناوی کەسێکی گەمژەی لێدەنرێت.
- نازانم ئەگەر بەتەواوەتی لەگەڵ ئەمەیاندا تەبابم یان نا، بەڵام بەهەرحاڵ بەردەوام بە.
- بەپێی هیگڵ ئەوە تاکەکەس نیە کە خۆی دەدۆزێتەوە، بەڵکو «ڕۆحی جیهانە.»
- ڕۆحی جیهان خۆی دەدۆزێتەوە؟
- هیگڵ دەیگوت ڕۆحی جیهان بە سێ قۆناخ دەگەڕێتەوە سەر خۆی. مەبەستیشی لەوەبوو کە بە سێ قوناخ بەئاگا دەبێت لە خۆی.
- قۆناخەکان چین؟
- یەکەم؛ ڕۆحی جیهان لە تاکەکەسدا بەئاگا دەبێت لەخۆی، هیگڵ بەمە دەڵێت «ئەقڵی خۆیی». پاشانیش پلەیەکی بەرزتری ڕۆحی جیهان لە خێزان و کۆمەڵگا و وڵاتدا دەردەکەوێت، هیگڵ بەمەیانی دەگوت «ئەقڵی بابەتی»، لەبەرئەوەی ئەقڵ لە ڕێگەی پەیوەندی مرۆڤەکانەوە دەردەکەوێت. بەڵام هێشتام دواهەمین قۆناخمان ماوە...
- بەپەرۆشەوە چاوەڕوانم...
- ڕۆحی جیهان لەنێو ئەقڵی موتڵەقدا، دەگاتە بەرزترین پلەی مەعریفی بەرامبەر بە خۆی. «ئەقڵی موتڵەق»یش هونەر و ئاین و فەلسەفەیە. لەنێو ئەمانەشدا فەلسەفە بەرزترین شێوەی ئەقڵە، لەبەرئەوەی ئەقڵی جیهان لەناو فەلسەفەدا بیر لە چالاکیە تایبەتیەکانی خۆی دەکاتەوە لەسەر مێژوو. کەواتە ڕۆحی جیهان تەنها لە فەلسەفەدا بە خودی خۆی دەگات. دەتوانیت بڵێیت فەلسەفە ئاوێنەی ڕۆحی جیهانە.

- لەبەر سەختی بابەتەکە، هەستدەکەم پێویستم بەکاتە بۆ ئەوەی هەزمی بکەم.
- من گوتم فەلسەفە ئاوێنەی ڕۆحی جیهانە.
- جوانە. لەو بڕوایەدایت ئەمە هیچ پەیوەندیەکی بە ئاوێنە برۆنزیە کۆنەکەوە هەبێت؟
- بەڵێ، کاتێک کە تۆ دەپرسیت...
- مەبەستت چیە؟
- لەکاتێکدا هەمیشە ئەو ئاوێنە برۆنزیە هەر دێتەوە بەردەممان، ئەوا لەم ڕوانگەیەوە لەو بڕوایەدام مانایەکی تایبەتی هەبێت.
- کەواتە لەوانەیە بشزانیت مانای چیە؟
- نەخێر، نەخێر... من گوتم ئەگەر ئاوێنەکە بەلای هیلدە و باوکی هیلدەوە هێندە مانایەکی تایبەتی نەبوایە، ئەوا هێندە زوو زوو ناوی نەدەهات. بەڵام چ مانایەکی هەیە؟ ئەوە تەنها هیلدە دەتوانێت وەڵامی بداتەوە.
- ئەمەیە کە پێی دەگوترێت ئایرۆنی ڕۆمانسی؟
- پرسیارەکەت بێهودەیە، سۆفیا.
- بۆچی؟
- وەک دەزانیت ئێمە نین کە ئەو جۆرە شتانە دەڵێین. ئێمە تەنها قوربانیەکی بێدەسەڵاتی ئایرۆنیەکی ئاوهاین. ئەگەر منداڵێکی نەخۆش لەسەر پارچە کاغەزێک هێڵکاریەک بکێشێت، ئەوا خۆ ناتوانین لە کاغەزەکە بپرسین هێڵکاریەکە وێنای چی دەبەخشێت.
- لەترسا موچوڕکەم پیادێت...

## کیاگەگۆ «Kierkegaard»

## ...ئەوروپا بەرەو ئیفلاسی دەڕوات...

هیلدە تەماشای کاتژمێرەکەی کرد. مەلەفەکەی لەسەر مێزی نووسینەکەی دانا و بەڕاکردن بەرەو چێشتخانەکەیان ڕۆشتە خوارەوە. دەبوایە پێشئەوەی دایکی ئومێدی لێببڕێت، بەپەلە هەندێک خواردنی بۆ ببردایەتە خوارەوە بۆ لای بەلەمەکە. بەڵام لەسەر ڕێگاکەی، بە خێرایی تەماشایەکی ئاوێنە برۆنزیەکەی کرد.

کتلی ئاوەکەی خستە سەر ئاگر و بەپەلە چەند پارچە نانێکی بەکەرە چەورکرد.

بەڵێ، بێگومان دەبوایە فێڵێکی بۆ باوکی بدۆزیبایەتەوە. هیلدە هەستی دەکرد زیاتر و زۆرتر بەلای سۆفیا و ئەلبێرتۆدا دەیشکاندەوە. هەموو شتێک دبێت لە کۆبنهاگنەوە دەستپێبکات...

پاش کەمێک لەبەردەم بەلەمەکەدا بە خۆی و قاپێکی گەورەی خواردنەوە وەستا.

ـ نانی نیوەڕۆم هینا.

دایکی سمارتەی بەدەستەوە بوو... دەستی لێهەڵگرت و قژی لەسەر ناوچەوانی لادا، کەمێک لمشیی پێوەبوو.

ـ کەواتە واز لە نانی ئێوارە دەهێنین!

پاشان هەردووکیان لەسەر پردی بەلەمەکە دانیشتن و دەستیانکرد بە نانخواردن... پاش ماوەیەک هیلدە لێی پرسی؛

ـ باوکم کەی دێتەوە؟

ـ شەممە، خۆ خۆشت دەزانیت.

ـ بەڵام چ کاتێک؟ گوتت لە پێشدا دەگاتە کۆبنهاگن، وا نیە؟

ـ بەڵێ...
دایکی گازێکی لە پاچە نانەکە گرت، جگەر و خەیاری لەسەردانرابوو... پاشان گوتی؛
ـ ...فرۆکەکەی نزیکەی کاتژمێری پێنج لە فرۆکەخانەی کۆبنهاگن دەنیشێتەوە. فرۆکەی کریستیانساندیش کاتژمێری هەشت و چارەک هەڵدەسێت. پێم وابێت کاتژمێری نۆ و نیو لە فرۆکەخانەی کیڤیک دەنیشێتەوە.
ـ کەواتە چەند کاتژمێرێک لە فرۆکەخانەی کۆبنهاگندا دەمێنێتەوە...
ـ بەڵێ، بۆ؟
ـ هیچ... تەنها دەمەوێت بزانم بە چ شێوەیەک دەگەڕێتەوە.
لەسەر نانخواردن بەردەوامبوون. پاش ماوەیەک هیلدە هەستیکرد کاتی خۆیەتی پرسیارێکی لێبکات؛
ـ لەم دواییانەدا هیچ دەنگوباسێکی "ئانە" و "ئۆللا"ت بیستووە؟
ـ بەڵێ چەند جارێک تەلەفونیان بۆ کردم. لە مانگی حەوتدا بۆ پشووی هاوینە دەگەڕێنەوە.
ـ بەڵام لەپێش مانگی حەوتدا نایەنەوە، وا نیە؟
ـ نەخێر، لەو بڕوایەدا نیم بێنەوە.
ـ کەواتە حەفتەی داهاتووش هەر لە کۆبنهاگن دەبن...
ـ بەڕاستی پێم بڵێ... چیتە هیلدە؟
ـ هیچم نیە... ئێ خۆ دەبێت باسی شتێک بکەین.
ـ بەڵام ئەوە دوو جارە ناوی کۆبنهاگن دەهێنیت.
ـ بە ڕاست؟
ـ گوتمان باوکت لە پێشدا لە کۆبنهاگن دەنیشێتەوە.
ـ ئەوە بۆیە لە پڕێکدا ئانە و ئۆللام هات بە خەیاڵدا.

**پاش نانخواردن هیلدە قاپ و کوپەکانی کۆکردەوە؛**
**ـ دایە، دەمەوێت بڕۆمەوە سەرەوە و دەست بکەمەوە بە خوێندنەوە.**
**ـ بەڵێ، بۆ نا...**
**دایکی بە زمانێکی کەمێک لۆمەکردنەوە وەڵامی دایەوە. لە ڕاستیدا وا ڕێککەوتبوون، کە پێش ئەوەی باوکی بێتەوە هەردووکیان پێکەوە بەلەمە گەورەکە پاکبکەنەوە.**
**ـ باوکم بەشێوەیەک لە شێوەکان وایلێکردم پەیمانی بدەمێ کە تا ئەو کاتەی دێتەوە، من کتێبەکەیم تەواو کردبێت.**
**ـ تا ڕادەیەک بێمانایە... گوێ نادەمێ کە لە ماڵەوە دورە، لەبەرئەوەی ئەمە شتێکی تایبەت بە خۆیەتی. بەڵام پێویست ناکات لەوێوە ماڵ بەڕێوە بەرێت...**
**ـ ئەگەر دەزانیت چی بەڕێوە دەبات و چەندیش چێژی لێدەبینێت...**
**هیلدە بەدەنگێکی پڕ لە نهێنیەوە ئەمەی گوت و ئەوجا ڕۆیشتەوە ژورەکەی خۆی و دەستیکردەوە بە خوێندنەوە.**

لەپڕێکدا سۆفیا گوێی لە یەکێک بوو لە دەرگای دەدا، ئەلبێرتۆش بە چاوێکی توندوتیژەوە تەماشایەکی سۆفیای کرد.
ـ نامانەوێت کەس قسەکانمان پێبڕێت.
توندتر لە دەرگا درا، بەڵام ئەلبێرتۆ لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو.
ـ دەمەوێت باسی فەیلەسوفێکی دانیمارکیت بۆ بکەم، کە زۆر بەتایبەتی قێزی لە فەلسەفەی هیگڵ دەبووەوە.
ئێستاکە هێندە بە توندی لە دەرگا دەدرا، کە دەرگاکەی دەلەراندەوە.
ئەوجا ئەلبێرتۆ گوتی؛

ـ بێگومان ئەوە دیسان مێجەرە و کەسێکی خەیاڵی تر دەکاتە سەرمان، تەنها بۆ ئەوەی سەیربکات و بزانێت دەکەوینە تۆڕەکەوە... وەک دەزانیت ئەم جۆرە شتانە بۆ ئەو هیچی تێناچێت.
ـ بەڵام ئەگەر دەرگاکەی لێنەکەینەوە، لەوانەیە کوخەکەمان بەسەردا بتەپێنێت... خۆ ئەمەشیان هەر هیچی تێناچێت بۆ ئەو.
ـ لەوانەیە ڕاستبکەیت، کەواتە بابیکەینەوە.
بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتن. سۆفیا بەپێی توندی لەدەرگادرانەکە، وایدەزانی کەسێکی یەکجار گەورە لەو دیوەوە وەستاوە... بەڵام لەسەر پلیکانەکانی بەردەرگاکە، کچێکی پچکۆلەی قژ زەرد وەستابوو. ماکسیەکی هاوینەی گوڵ گوڵی لەبەردابوو و دوو شوشەی بەدەستەوە گرتبوو.
ـ چۆنیت؟... تۆ کێیت؟ سۆفیا لێی پرسی.
ـ من ناوم "ئالیس"ە... کچە پچکۆلانەکە وەڵامی دایەوە و بە ڕێزەوە دانەویەوە.
ـ ڕێک وەک ئەوەبوو کە من بیرم لێدەکردەوە... ئەمە ئالیسی وڵاتی حەکایەتە، ئەلبێرتۆ گوتی.
ـ بەڵام ئەی چۆنە وا ڕێی کەوتۆتە ئێرە؟
ئەوجا ئالیس خۆی وەڵامی دایەوە؛
ـ وڵاتی حەکایەت وڵاتێکی تەواو بێسنوورە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە وڵاتی حەکایەت لە هەموو شوێنێکدا هەیە ـتا ڕادەیەک وەک نەتەوە یەکگرتووەکان وایە. لە ڕاستیدا وڵاتەکەم دەبوایە ببوایەتە ئەندامی شەرەفی نەتەوە یەکگرتووەکان. دەبوایە لە هەموو کۆمیتەکاندا نوێنەری تایبەتی خۆمان هەبوایە، لەبەرئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکانیش پەیوەندی بە خەون و خەیاڵی مرۆڤەوە هەیە.

ـ ئیممم... مێجەر... ئەلبێرتۆ منگەمنگێکی کرد.
ـ ئەی چی هێنایتی بۆ ئێرە؟ سۆفیا لێی پرسی.
ـ بۆ ئەوە هاتووم کە ئەم شوشە فەلسەفیانە بدەمە دەستی سۆفیا.
هەردوو شوشەکەی بۆ سۆفیا درێژکرد. شوشەکان ئاوی بوون، بەڵام لەناو یەکێکیاندا شلەیەکی سوور و لەناو ئەوی تریشیاندا شلەیەکی شینی تێدابوو. لەسەر شوشە سوورەکە نووسرابوو «بمخۆرەوە» و لەسەر شوشە شینەکەش نووسرابوو «منیش بخۆرەوە.«
لە هەمان کاتدا کەروێشکێکی سپی بەهەڵبەز و دابەز بەلای کوخەکەدا تێپەڕی. لەسەر دوو قاچ هەڵدەبەزیەوە و چاکەت و هێلەکێکیشی لەبەردابوو. ڕێک لەبەردەم کوخەکەدا، دەستیکرد بەناو گیرفانی هێلەکەکەیدا، کاتژمێرێکی بەرباخەڵی دەرهێنا و گوتی؛
ـ ئۆی... ئۆی، درەنگ دەگەم!
پاشان لەسەر ڕاکردنەکەی بەردەوام بوو، ئالیس خەریک بوو بەدوایدا ڕابکات، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات دانەویەوە و گوتی؛
ـ دیسانەوە وا خەریکە دەست پێدەکاتەوە.
ـ سلاو لە دینا و شاژن بکە... سۆفیا هاواری لێکرد و ئەوجا لەناو دارستانەکەدا ونبوو.
ئەلبێرتۆ و سۆفیا لەسەر پێپلیکانەکان مانەوە و لە شوشەکان ورددەبوونەوە، پاشان سۆفیا نووسراوی سەر شوشەکانی خوێندەوە؛
ـ «بمخۆرەوە» و «منیش بخۆرەوە»... نازانم ئەگەر بوێرم. لەوانەیە ژەهربن.
ئەلبێرتۆ شانێکی هەڵتەکاند و گوتی؛
ـ وەک دەزانیت لە مێجەرەوە هاتووە و هەموو شتێکیش لەوەوە بێت، ئاگاییە. واتە تەنها شەربەتی فیکرە و هیچی تر.

سۆفیا شوشە سوورەکەی کردەوە و بە وریاییەوە خستیە سەر لێوانی. تامەکەی شیرین و سەیر بوو، بەڵام پاش کەمێک... لە پڕێکدا هەموو شتەکانی چواردەوری گۆڕان. لەوە دەچوو دەریاچە و دارستان و کوخەکە هێواش هێواش بچنە ناو یەک. پاش ساتێک هەستیکرد هەموو شتەکانی چواردەوری دەبن بەیەک کەس و کەسەکەش خۆیەتی. تەماشایەکی ئەلبێرتۆی کرد، بەڵام ئەویش لەوەدەچوو کە بووبێتە بەشێکی ڕۆحی سۆفیا. ئەوجا گوتی؛

ـ سەیرە هەموو شتێک وەک پێشوو دەبینم، بەڵام لەوە دەچێت هەموو شتێک پەیوەندی بەیەکەوە هەبێت. هەستدەکەم هەموو شتێک «یەک» ئاگاییە.

ـ ئەوە «پانتیزم»ە، پێشی دەگوترێت "فەلسەفەی سەرجەمی". ئەوە فیکری جیهانی ڕۆمانسیەمانە. ئەوان هەموو شتێکیان وەک «من»ێکی گەورە دەبینی. لە هەمان کاتدا، ئەوە هیگڵیشە کە تاکەکەسی لەیادنەکرد و هەڵیدەسەنگان، بەڵام هاوکات هەموو شتێکی تەنها وەک یەک دەربڕینی ئەقڵی جیهانی دەبینی.

ـ دەبێت ئەوی تریشیان بخۆمەوە؟

ـ لەسەر شوشەکە وا نووسراوە.

سۆفیا سەری شوشە شینەکەی کردەوە و قومێکی گەورەی خواردەوە. ئەم جارەیان تامەکەی ترشتر و خۆشتربوو. دیسانەوە هەموو شتەکانی چواردەوری بەتەواوەتی گۆڕان.

لەماوەی یەک چرکەدا کاریگەری شلە سوورەکە دیارنەما و بەو شێوەیەش هەموو شتێک گەڕایەوە شوێنی جارانی. ئەلبێرتۆ بووەوە بە ئەلبێرتۆ، دارەکانی دارستانەکە وەک جاری جارانی لێهاتەوە و دەریاچەکەش بووەوە بە هەمان دەریاچە کۆنەکەی جاران.

بەڵام هەموو ئەمانە تەنها چرکەیەک بەردەوام بوو. لەپڕێکدا هەموو ئەو شتانەی سۆفیا دەیبینین لەیەکتر جودا دەبوونەوە. دارستانەکە چیتر دارستان نەبوو، هەموو دارێک خۆی بۆ خۆی وەک جیهانێک ڕاوەستابوو. تەنانەت بچوکترین لق، وەک جیهانێکی هێندە قەشەنگ و ئەفسوناوی دەهاتە بەرچاو، کە دەکرا هەزاران حەکایەتی لەسەر دابنرێت.

لەپڕێکدا دەریاچە پچکۆلەکە وەک دەریایەکی بێسنووری لێهات —نەک تەنها لەبەر قوڵی و بەرفراوانی، بەڵکو لەبەر وردەکاریە پرشنگدارەکەی و پێچکردنەوە خەیاڵاویەکانی. سۆفیا هەستیدەکرد کە بتوانێت ژیانێکی دورودرێژ لە تەماشاکردن و تێڕوانینی ئەو دەریاچە چکۆلەیەدا بەرێتە سەر، تەنانەت پێی وابوو پاش مردنیشی هێشتام ئەو دەریاچەیە وەک نهێنیەکی سەیر بمێنێتەوە.

نیگای خستە سەر لقی دارێک، لەوێدا سێ پاساری پچکۆلە یاریان دەکرد. بە شێوەیەک لە شێوەکان سۆفیا دەیزانی پاساریەکان لەوەوپێش هەر لەوێدا بوون، بەڵام ئەو کاتەی کە لە شوشە سوورەکەی خواردەوە و تەماشای چواردەوریکرد، چاوی بە هیچ جۆرە چۆلەکەیەک نەکەوت، لەبەرئەوەی شلە سوورەکە هەموو جیاوازیەکی تاکایەتی و هەموو دژایەتیەکی سڕیبووەوە.

ئەوجا سۆفیا لەسەر بەردە پانەکەی کە لەسەری وەستابوو، هاتە خوارەوە و بەسەر چیمەنەکەدا چەمایەوە. لەوێدا جیهانێکی نوێی دۆزیەوە —ڕێک هەروەک چۆن بۆ یەکەمین جار دەچیتە قوڵایی ئاوێکەوە و چاوت دەکەیتەوە- لەوێدا ژیانێک لەسەر قەوزەی دار و گیاکان جمەی دەهات. سۆفیا سەرنجی چووە سەر جاڵجاڵۆکەیەک، کە بە هێواشی و بە سەختیەوە بەسەر قەوزەکەدا تێدەپەڕی... چاوی بە

ئەسپێی ڕووەکێک کەوت، کە بەسەر لاسکی گیایەکدا ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد... تۆپەڵێک مێروولەی بینی، پێکەوە لەناو گیاکەدا کاریان دەکرد، بەڵام هەر مێروولەیەک بە شێوەیەکی تایبەتی خۆی قاچی بەرزدەکردەوە.
لە هەموو شتێک سەیرتریش ئەوە بوو کاتێک سەری هەڵبڕی و تەماشای ئەلبێرتۆی کرد، کە هێشتام لەسەر پلیکانەکانی بەردەم کوخەکەدا وەستابوو. مرۆڤێکی سەیری لە ئەلبێرتۆدا بەدیدەکرد، ئەو لە مرۆڤێکی سەر زەویەکی تر دەچوو –یان وەک بوونەوەرێکی نێو حەکایەتێکی تر دەهاتە بەرچاوی... لە هەمان کاتیشدا خۆشی بە شێوەیەکی تەواو نوێ دەبینی؛ لە مرۆڤێکی بێ هاوتا دەچوو، نەک تەنها وەک مرۆڤێک، نەک تەنها وەک کچێکی پانزە ساڵان، بەڵکو وەک سۆفیا ئامۆنسنی تاک و بێ وێنە خۆی دەهاتە بەرچاو.
ـ چی دەبینیت؟ ئەلبێرتۆ لێی پرسی.
ـ وەک کەسێکی یەکجار سەیر دێیتە بەرچاوم.
ـ بە ڕاست؟
ـ پێم وابێت هەرگیز تێناگەم مرۆڤ چیە، دوو مرۆڤ نیە لە جیهاندا وەک یەک بن.
ـ ئەی دارستانەکە چۆن دەبینیت؟
ـ چیتر پێکەوە گرێنەدراون. زیاتر لە گەردوونێکی پڕ لە حەکایەتی جیاواز و سەیر و سەمەرە دەچێت.
ـ کەواتە وەک ئەوە بوو کە من بیرم بۆی دەچوو. شوشە شینەکە تاکەکەسیە، بۆ نمونە بەرپەرچدانەوەی «سیۆن کیاگەگۆ Søren Kierkegaard»یە بەرامبەر بە فەلسەفەی گشتی ڕۆمانسیەکان، بەڵام دانیمارکیەکی تریش دەگرێتەوە، کە لە هەمان کاتی کیاگەگۆدا دەژیا،

ئەویش نووسەری بەناوبانگی دانیمارکی «ه.س. ئانەرسن»ە، کە بە چاوێکی ورد و تیژەوە تەماشای دەوڵەمەندی بێسنووری سروشتی دەکرد، لێرەشەوە هەروەک «لایبنیز»Leibniz ی فەیلەسوفی ئەڵمانی بوو، کە سەد ساڵ لەوەوپێش هەمان دیدەی هەبوو. لایبنیز ڕەخنەی لە فەلسەفەی سەرجەمی (*گشتی یان پانتیست.و) سپینۆزا دەگرت، هەروەک چۆن دواتر کیاگەگۆ ڕەخنەی لە فەلسەفەی هیگڵ دەگرت.

- گوێم لێتە دەڵێیت چی، بەڵام سەیرو سەمەرەیی تۆنی دەنگت خەریکە دەمخاتە پێکەنین.

- تێدەگەم، دیسان قومێک لە شوشە سوورەکە بخۆرەوە و ئەوجا لەسەر پلیکانەکان دادەنیشینەوە. پێش ئەوەی ڕۆژەکە تەواو بکەین، دەبێت کەمێک دەربارەی کیاگەگۆ بدوێین.

سۆفیا لەتەنیشت ئەلبێرتۆوە لەسەر قادرمەکان دانیشت. قومێکی چکۆلەی لە شوشە سوورەکە خواردەوە و نەختە نەختە هەموو شتەکان تێکەڵ بەیەکدی بوونەوە. لە ڕاستیدا شتەکان زیاد لە ڕادە تێکەڵی یەکتربوون، چونکە سۆفیا جارێکی تر هەستیدەکرد هیچ جیاوازکاریەک نابینێت، لەبەرئەوە ناچاربوو دیسانەوە کەمێک لە شلە شینەکە بخواتەوە و ئەوسا هەموو شتێک وەک ئەو کاتەی لێهاتەوە کە هێشتام ئالیس نەهاتبوو، ئەوجا لە ئەلبێرتۆی پرسی؛

- بەڵام ئەی ڕاستی چیە؟ ئایا شلە سوورەکە ئەزموونی ڕاستیمان پێ دەبەخشێت یان شینەکە؟

- هەم سوورەکە و هەم شینەکەش سۆفیا. ناتوانین بڵێین لەبەرئەوەی تەنها «یەک» هەقیقەت بوونی هەیە، کەواتە ڕۆمانسیەکان هەڵەبوون. بەڵام لەوانەیە ئەوان تەنها یەک لایەنیان بینیبێت.

- ئەی شوشە شینەکە چی؟

ـ پێم وابێت کیاگەگۆ زۆری لەوە خواردبێتەوە. بەلایەنی کەمەوە بەچاوێکی وردەوە تەماشای گرنگی تاکەکەسی دەکرد. بە بڕوای ئەو، ئێمە تەنها «منداڵی سەردەمەکەمان نین»، بەڵکو لەسەرو ئەوەشەوە هەریەکەمان تاکە کەسێکی بێ هاوتاین و تەنها ئەم کەڕەتە دەژین.

ـ ئەی هیگڵ گرنگی بەم بابەتە نەدەدا؟

ـ نەخێر، ئەو زیاتر سەرقاڵی هێڵە گەورەکانی مێژوو بوو، ڕێک ئەم خاڵەش بوو کە کیاگەگۆی هەژاند و بەرەنگاری بووەوە. بە بڕوای ئەو، «یەک لابینینی» ڕۆمانسیەکان و «مێژوو بینینی» هیگڵ، بەرپرسیاری تاکەکەس بەرامبەر بە ژیانی خۆی بەرەو ونبوون دەبات. لەبەرئەوە بەلای کیاگەگۆوە، هیگڵ و ڕۆمانسیەکانیش هەمان شت بوون.

ـ لە توڕەبوونەکەی باش تێدەگەم.

ـ سیۆن کیاگەگۆ لە ساڵی 1813دا لەدایک بوو و زۆر بە توند و تیژی لەلایەن باوکیەوە پەروەردەکرا. هەروەها هەستێکی ئاینی قوڵیشی بە میراتی لە باوکیەوە بۆ مایەوە.

ـ ئەمەیان زۆر باش نەبوو.

ـ ئەم هەستی ئاینیەشی ناچاریکرد واز لە دەستگیرانەکەی بهێنێت و نیشانەکردنەکەی هەڵبوەشێنێتەوە، بۆرجوازیەکانی کۆبنهاگنیش ئەم کارەیان بەلاوە جوان نەبوو، لەبەرئەوە بووە مایەی گاڵتە پێکردن و ڕەخنە لێگرتنی. بەڵام دواتر فێربوو کە چۆن وەڵامی ڕەخنەگرەکانی بداتەوە و بەرەنگاری لەخۆی بکات. لە دواجاریشدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە «ئیبسن «Ibsen ناوی نا «دوژمنی خەڵک.»

ـ هەموو ئەمانە بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی نیشانەکردنەکەیەوە ڕوویدا؟

ـ نەخێر نەک هەر ئەوە... بەتایبەتی لە کۆتایی ژیانیدا ڕەخنەگرێکی گەورەی لێدەرچووبوو، ئەو دەیگوت؛ «هەموو ئەوروپا بەرەو ئیفلاسی

دەڕوات». ئەو پێی وابوو لە سەردەمێکی بێ هاریکاری و جۆش و خرۆشدا دەژی، بە تایبەتیش ڕەخنەی لە هەڵوێستی ساردەوەبووی کڵێسەی ڕەسمی دەوڵەت دەگرت و بێ بەزەییانە خستبوویە بەر ڕەخنە و ناوی نابوو «مەسیحیەتی ڕۆژی یەکشەممان.»

ـ لە ڕۆژانی ئێستاکەشماندا تا ڕادەیەک لە جێگەی خۆیدایە ناوی بنێین «مەسیحیەتی جەژنی بە مەسیحی بوون»، زۆربەی خەڵکی تەنها لەبەر دیاری وەرگرتن ئەو ڕۆژەیان بەلاوە مەبەستە.

ـ بەڵێ، لێرەدا ڕێک پەنجە دەخەیتە سەر خاڵی مەبەست. ئاینی مەسیحی بەلای کیاگەگۆوە هێندە بەدەسەڵات و دژ بەئەقڵە، کە وا لە دیانەتەکە دەکات ببێتە بابەتێکی وا یان هەڵیببژێریت یان نا. واتە مرۆڤ ناتوانێت «کەمێک» یان تا ڕادەیەک مەسیحی بێت، لەبەرئەوەی مەسیح لە ڕۆژی پاکدا (*لە "ئیستەر"دا.و) یان زیندوو بۆتەوە یان زیندوو نەبۆتەوە. ئەگەر بەڕاستیش لەناو مردووەکاندا زیندوو بووبێتەوە، یان ئەگەر بە ڕاستی لەبەر خاتری ئێمە مردبێت، ئەوا دیاردەیەکی تایبەتە و شایانی ئەوەیە ژیانمان بەڕێوە بەرێت.

ـ بەڵێ...

ـ بەڵام کیاگەگۆ سەرنجی دەدا کە کڵێسە و زۆرینەی خەڵکی وەک شێوە قوتابخانەیەک تەماشای بابەتە ئاینیەکان دەکەن. ئاین و ئەقڵ، بەلای خودی کیاگەگۆوە، وەک ئاو و ئاگر وابوون. تەنها ئەوەندە بەس نیە باوەڕبکەین مەسیحیەت «ڕاستە»، بەڵکو بڕوای ڕاستەقینە لەڕێگەی دواکەوتنی جێپەنگاوی مەسیحەوە دەردەکەوێت.

ـ ئەمە چ پەیوەندیەکی بە هیگڵەوە هەیە؟

ـ هیچ... وابزانم لەلایەکی هەڵەوە دەستمان پێکرد.

ـ کەواتە پێشنیار دەکەم لە سەرەتاوە دەست پێبکەینەوە!

ـ کیاگەگۆ لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا دەستی بە خوێندنی تیۆلۆجی کرد، بەڵام بەرە بەرە خولیای بابەتە فەلسەفیەکان بوو. لە تەمەنی 27 ساڵیدا لەسەر لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی «دەربارەی چەمکی ئایرۆنی»، پلەی ماجستێری لە فەلسەفەدا بەدەست هێنا. لە تێزەکەشیدا هێرش دەباتە سەر خەیاڵی خاو و ئایرۆنی ڕۆمانسی، «ئایرۆنی سوکراتیشی» وەک هۆکارێکی کاریگەر بەکاردەهێنا، بەڵام بۆ ئەوەی نرخی بەرزی ژیانی پێ نیشان بدات. کیاگەگۆ بە پێچەوانەی ڕۆمانسیەکانیشەوە، سوکراتی وەک «بیرمەندێکی وجودی» دادەنا، واتە بیرمەندێک کە سەرتاپای بوونی ڕادەکێشێتە ناو فیکری فەلسەفەکەیەوە.

ـ ئەی پاشان چی ڕوویدا؟

ـ پاش ئەوەی نیشانەکەی هەڵوەشاندەوە و لە ساڵی 1841دا سەفەریکرد بۆ بەرلین، لەوێدا جگە لە کارەکانی تری، ئامادەی وانەکانی شێللینگ دەبوو و گوێی بۆ شل دەکرد .

ـ چاوی بە هیگڵیش کەوت؟

ـ نەخێر، هیگڵ دە ساڵ پێش ئەو کاتە مردبوو، بەڵام فیکری ئەو لە بەرلین و زۆربەی شوێنەکانی تری ئەوروپادا زاڵبوو. ڕێباز و «ڕژێمی» هیگڵی وەک شێوە لێکدانەوەیەکی گەردوونیانە بۆ هەموو جۆرە پرسیارێک بەکاردەهێنرا. بەڵام کیاگەگۆ لەو بڕوایەدابوو کە «ڕاستیە بابەتیەکانی» فەلسەفەی هیگڵی، بە هیچ شێوەیەک بۆ بوونی تاکەکەس گرنگ نەبێت.

ـ ئەی چ جۆرە ڕاستیەک بەلایەوە گرنگ بوو؟

ـ بەپێی کیاگەگۆ دۆزینەوەی ڕاستی بە شێوە گشتیەکەی زۆر گرنگ نیە، بەڵکو گرنگتر ئەوەیە ئەو ڕاستیانە بدۆزینەوە کە بەلای ژیانی

تاکەکەسێکەوە گرنگن. گرنگ ئەوەیە «ڕاستی» بەلای منەوە بدۆزمەوە. بەم شێوەیەش وا لە تاکەکەس دەکات بەرامبەر «ڕێبازەکە» بوەستێتەوە. بە بڕوای کیاگەگۆ، هیگڵ لەبیری چووبووەوە کە خۆشی مرۆڤە. بەم شێوەیەش باسی پڕۆفیسۆرە هیگڵییەکانی دەکرد؛ «لە کاتێکدا جەنابی پڕۆفیسۆری تێگەیشتوو هەموو ژیان لێکدەداتەوە و باسی بوون دەکات، لە هەمان کاتدا و لەبەر بیر بڵاوی، لەبیری دەچێتەوە خۆی ناوی چیە؛ لەیادی نیە کە مرۆڤە، ڕاست و دروست مرۆڤێکە و هیچی تر، نەک بەشێکی پچکۆلەی یاسایەکی قەشەنگ.»

ـ ئەی مرۆڤ بەپێی کیاگەگۆ چیە؟

ـ ناتوانین بە شێوەیەکی گشتی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە. وەسفکردنی سروشتی مرۆڤ یان «بوونەوەری» مرۆڤ بەلای کیاگەگۆوە بە هیچ شێوەیەک گرنگ نیە، بەڵکو «بوونی» تاکەکەس گرنگە. مرۆڤیش لەسەر مێزێکی نووسین ناتوانێت بوونی خۆی ببینێت. ئێمە لە کاتی کرداردا و بە تایبەتیش کە دووچاری هەڵبژاردنێکی گرنگ دەبینەوە، ئەو کاتە بوونی خۆمانمان بۆ دەردەکەوێت. دەکرێت مەبەستی کیاگەگۆ بە هۆی چیرۆکێکەوە بهێنینە بەرچاومان کە دەربارەی بودایە.

ـ دەربارەی بودا؟

ـ بەڵێ، چونکە فەلسەفەی بوداش لە بوونی مرۆڤەوە دەست پێدەکات... قەشەیەکی بودی لەو بڕوایەدابوو کە بودا هەمیشە وەڵامی نادیارانەی سەبارەت بە پرسیارە گرنگەکان دەدایەوە، وەک ئەو پرسیارەی کە دەڵێت جیهان چیە یان مرۆڤ چیە. بوداش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە و گوتی؛ کەسێک تیرێکی ژەهراوی بەردەکەوێت و بریندای دەکات.

بەلای برینداره‌کەوە وە لە ڕوانگەیەکی تیۆری پەتیەوە، بە هیچ جۆرێک گرنگ نیە بپرسێت تیرەکە لە چی دروست کراوە یان چ جۆرە ژەهرێکی پێوە بووە یان لە چ گۆشەیەکەوە تیرەکەیان تێگرتووە.
ـ ئەو کەسێکی دەوێت کە تیرەکەی دەربهێنێت و تیماری بکات.
ـ بەڵێ، وانیە؟ «دەرهێنانی تیرەکە» بەلای بوونی ئەوەوە گرنگە. هەم بوداش و هەم کیاگەگۆش زۆر بە قوڵی هەستیان دەکرد کە تەنها ماوەیەکی کەم دەژین، لەبەرئەوە —هەروەک لەوەوپێش گوتمان- لەسەر مێزی نووسین دانانیشین و بیر لە سروشتی فیکری جیهان بکەینەوە.
ـ بیرکردنەوەیەکی لۆژیکیە.
ـ کیاگەگۆ دەیگوت هەقیقەت شتێکی «خۆییە»، بەڵام لێرەدا مەبەستی لەوە نەبوو کە بیروڕاو و بڕوا جیاوازەکان هەموویان وەک یەکن، بەڵکو مەبەستی لەوە بوو کە ئەو هەقیقەتانەی کە لە ڕاستیدا گرنگن، ڕاستیە «کەسییەکانن، "شەخسیەکانن"». تەنها ئەو جۆرە هەقیقەتانە «بەلای منەوە هەقیقەتی ڕاستن.«
ـ دەتوانیت نمونەیەکی هەقیقەتی «خۆیی» بهێنیتەوە؟
ـ بۆ نمونە یەکێک لە پرسیارە گرنگەکان ئەوەیە کە ئایا ئاینی مەسیحی ڕاستە یان نا، ئەمە پرسیارێکی ئاوها نیە کە بتوانین بە شێوەیەکی تیۆری یان ئەکادیمی وەڵامی بدەینەوە. ئەم پرسیارە بەلای کەسێکەوە کە «خۆی لە بووندا دەبینێت»، بابەتێکی مردن و ژیانە. واتە شتێک نیە کە مرۆڤ دابنیشێت و تەنها لەبەرخاتری گفتوگۆ باسی لەسەر بکات، بەڵکو شتێکە مرۆڤ بەو پەڕی سۆز و دڵسۆزیەوە لێی نزیک دەبێتەوە.
ـ تێدەگەم.

ـ ئەگەر بکەویتە ناو ئاوێکەوە، ئەوا بە شێوەیەکی تیۆری پرسیار لە خۆت ناکەیت ئایا نقوم دەبیت یان نا، بوون و نەبوونی تیمساحیش لە ئاوەکەدا نە «گرنگە» و نە «گرنگیش نیە»، بەڵکو ئەو کاتە زۆر بە ئاسانی بابەتەکە دەبێتە بابەتێکی ژیان و مردن.
ـ سوپاس بۆ ڕوونکردنەوەکەت.
ـ واتە دەبێت پرسیاری فەلسەفی دەربارەی بوون و نەبوونی خودا لەلایەک و هەڵوێستی تاکەکەس بەرامبەر هەمان پرسیار، جودا بکەینەوە. هەموو تاکەکەسێک بە تەنهایی بەرامبەر ئەو جۆرە پرسیارانە دەوەستێت. تەنها «بڕوا-ئیمان» دەتوانێت لەو بابەتە گرنگانەمان نزیک بکاتەوە. بەپێی کیاگەگۆ ئەو شتانەی بەهۆی ئەقڵەوە دەتوانین بیانزانین، بەهیچ جۆرێک گرنگ نین.
ـ تێناگەم، بەیارمەتیت بۆم ڕوونبکەرەوە.
ـ (12=8+4) سۆفیا، دەتوانین ئەمە بەو پەڕی دڵنیاییەوە بزانین... ئەمە نمونەیەکی ئەو جۆرە «هەقیقەتە ئەقڵیانەیە»، کە هەموو فەیلەسوفەکانی پاش دیکارت باسیان دەکرد. بەڵام ئایا لە دوعای ئێوارانداا باسی ئەمە دەکەین؟ ئایا کاتێک کە دەمرین، پاڵدەکەوین و لەم جۆرە هەقیقەتانە ڕادەمێنین؟ نەخێر، ئەم جۆرە هەقیقەتانە هەم «گشتین» و هەم «بابەتیشن»، لەبەرئەوە بوون یان نەبوونیان بەلایەن بوونی تاکەکەسەوە بە هیچ جۆرێک مانای نیە.
ـ ئەی بڕوا چی؟
ـ هەرگیز نازانیت گەر کەسێک لە هەڵەیەکت دەبوورێت یان نا، چونکە وەک شێوەیەکی «بوون» بەلاتەوە گرنگە بزانیت، لەوانەشە بەدرێژایی ژیانت وەک پرسیارێک لەلات بمێنێتەوە. هەروەها ناشتوانیت بزانیت کەسێکی دی خۆشی دەوێیت یان نا، ئەمەش تەنها

شتێکە کە دەتوانیت باوەڕی پێبکەیت یان ئومێدی بیت، بەڵام بەلاتەوە گرنگترە وەک لەوەی بزانیت سەرجەمی گۆشەکانی سێگۆشەیەک سەد و هەشتا پلەیە یان نا. لە کاتێکدا کە یەکەمین ماچ دەکەیت، خۆ بیر لە لەوە ناکەیتەوە «یاسای "هۆ"» یان شێوەی هەڵسەنگاندن» چیە.
ـ نەخێر، ئەگینا ئەوساکە وەک شێتولکەیەک دەبین.
ـ «بڕواکردن» لەپێش هەموو شتێکی تردا بەلای بابەتی ئاینییەوە، گرنگە. دەربارەی ئەمەش کیاگەگۆ دەڵێت؛
»ئەگەر بتوانم بە شێوەیەکی بابەتی خودا بگرم، ئەوا بڕواکەم لەدەست دەدەم... بەڵام ڕێک لەبەرئەوەی کە ناتوانم، کەواتە ناچارم باوەڕبکەم؛ ئەگەر بشمەوێت باوەڕەکەم بەردەوام بێت، ئەوا هەمیشە دەبێت ئاگاداربم کە لە نەزانینی بابەتیدا بمێنمەوە و لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕەکەم بپارێزم.«
ـ تێگەیشتنی ئەمەیان سەختە.
ـ لەوەوپێش خەڵکانێکی زۆر هەوڵیاندەدا بوونی خودا بسەلمێنن، یان بەلایەنی کەمەوە دەیانویست لەڕێگەی ئەقڵەوە لێی تێبگەن. بەڵام ئەگەر ناچارانە سەلماندنی خودا یان بەڵگەهێنانەوەی ئەقڵی بوونی خودا پەسەند بکەین، ئەوا خودی بڕوا لەدەست دەدەین و پاشانیش سۆز و دڵسۆزی ئاینیش وندەکەین. گرنگ نیە بزانین ئاینی مەسیحی ڕاستە یان نا، بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە کە بزانم بەلای منەوە ڕاستە یان نا. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەمان جۆری بیرکردنەوەیان بە گوتەی «Credo quia absurdum» دەدەبڕی.
ـ مانای چیە؟

ـ واتە «بۆیە بڕوادەکەم، چونکە ئەوە دژی ئەقڵە». ئەگەر ئاینی مەسیحی ئاڕاستەی ئەقڵمان بکرایەتەوە –نەک لایەنەکانی تری مرۆڤ- ئەوا ئەوساکە پێویستمان بە بڕواکردن نەدەبوو.
ـ پێم وابێت تێدەگەم.
ـ بەم شێوەیە بینیمان کیاگەگۆ مەبەستی لە «بوون» و «هەقیەقەتی خۆیی» چیە، هەروەها بینیشمان «بڕوا» لەلای ئەو چ شتێک دەگرێتەوە. ئەم سێ بیرۆکەیەشی وەک ڕەخنەیەک بەرامبەر بە داب و نەریتی فەلسەفی وروژاند، بەتایبەتیش دژی هیگڵ. بەڵام لە ناواخنەکەیدا ڕەخنەی بەرامبەر «شارستانیش»ی لەخۆ گرتبوو. بە ڕای ئەو مرۆڤ لە کۆمەڵگای مۆدێرندا وەک «بینەران» یان وەک «شتێکی گشتی»یان لێهاتووە، هەروەها «قسە» کردنێکی هیچی زۆریش بووە بە سیمای باوی زۆرینەی خەڵکی. دەتوانین بڵێین ئەمرۆکە «هاوتایی یان خۆ گونجاندن» باوە، واتە هەمووان بیر لە هەمان شت دەکەنەوە یان هەمووان هەمان بڕوایان دەربارەی شتێک هەیە، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک پەیوەندیەکی ڕاستەقینەی بەو شتەوە هەبێت.
ـ بیر لەوە دەکەمەوە ئاخۆ کیاگەگۆ دەربارەی دایک و باوکی یۆرون چی بگوتایە.
ـ دەتوانین بڵێین هەموو کاتێک بەبەزەییەوە شتەکانی وەسف نەدەکرد، بەڵکو ئەو خاوەنی قەڵەمێکی دلڕەق و ئایرۆنیەکی توندوتیژ و تاڵ بوو، زۆر جاریش دەهات و پەندی خۆی دادەڕشت، بۆ نمونە دەیگوت؛ «زۆرینە، ناڕاستی دەردەبڕن» یان «ڕاستی هەمیشە لەلایەنی کەمایەتیدا دەردەکەوێت». لەسەرو ئەوەشەوە دەیگوت

«زۆربەی خەڵکی بەشێوەیەکی سەرزارەکی یاری لەگەڵ ژیاندا دەکەن.«
ـ کۆکردنەوەی بووکە شوشەی "باربی" (*جۆرە بووکە شوشەیەکی بە ناوبانگە.و) خۆی لە خۆیدا شتێکی خراپە، بەڵام لەوە خراپتر ئەوەیە خۆمان ببینە بووکە شوشەی "باربی"...
ـ ئەمە دەمانباتە سەر باسی تیۆریەکەی کیاگەگۆ کە سەبارەت بە «سێ قۆناخەکەی سەر ڕێی ژیان»ە.
ـ ببوورە؟
ـ بە بڕوای کیاگەگۆ سێ جۆری جیاوازی دونیا بینی یان فەلسەفەی ژیان هەیە. خۆی وشەی «قۆناخەکانی» بەکاردەهێنا و ناویشی نابوون «قۆناخی جوانناسی» و «قۆناخی ئەخلاقی» و «قۆناخی ئاینی». وشەی «قۆناخی» بۆیە هەڵبژاردبوو، چونکە دەیویست بڵێت کە دەکرێت مرۆڤ لە دوو قۆناخەکەی خوارەوەدا بژی و لە پڕێکدا «باز» بداتە قۆناخێکی بەرزترەوە، هەرچەندە زۆربەی خەڵکی بەدرێژایی ژیانیان لە هەمان قۆناخدا دەمێننەوە.
ـ دڵنیام پاش کەمێک زیاتر لەسەر ئەم باسە دەڕۆیت و فراوانتر ڕوونی دەکەیتەوە، بەڵام زۆر بە پەرۆشەوەم بزانم خۆم لە چ قۆناخێکدام.
ـ ئەو کەسەی لە «قۆناخی جوانناسیدا» دەژی، لە ئێستادا دەژی و هەمیشە بەدوای چێژدا دەگەڕێت، هەروەها باشە لە جوانی و قەشەنگی و خۆشیدا دەبینێت. مرۆڤێکی ئاوها بەتەواوەتی لە جیهانی هەستەکاندا دەژی. لەم ڕوانگەیەشەوە کەسەکە وەک تۆپێکی دەستی هەوەس و ئارەزووەکانی مێشکی لێدێت و هەرچی شتێکیش کە بێتاقەتی بکات، ئەوا بە خراپە لە قەڵەمی دەدات.
ـ سوپاس، ئەو جۆرە کەسانە دەناسم.

- کەواتە ڕۆمانسیەکی نمونەیش، جوانپەرستێکی ئاشکرایە. لەبەرئەوەی تەنها چێژی هەستەکان، قۆناخی جوانناسی دیاری ناکات، بەڵکو ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە پەیوەندیەکی یاریانەیان لەگەڵ ژیاندا هەبێت –یان لەگەڵ هونەرو فەلسەفەدا. تەنانەت دڵتەنگی و ئازارچەشتنیش لە ڕاستیدا دەکرێت لە ڕوانگەیەکی جوانناسیەوە «تەماشابکرێن» و لەگەڵیدا بژین. لێرەشەوە ڕواڵەت پەرستی، دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێت. بۆ نمونە "ئیبسن" لە "پییە گیونتدا" وێنەی جوانپەرستێکی باو دەنوێنێت.

- پێم وابێت تێدەگەم.

- دەتوانیت خۆت بناسیتەوە؟

- بەتەواوەتی نا، بەڵام پێم وابێت کەمێک بەسەر مێجەردا دەچەسپێت.

- بەڵێ، لەوانەیە وابێت سۆفیا... هەرچەندە ئەوە نمونەیەکی جوانی ئایرۆنی ڕۆمانسیە، بەڵام دەبوایە دەمت دابخستایە.

- چی؟

- بە ڕاست، خۆ خەتای تۆی تێدا نیە.

- کەواتە بەردەوام بە!

- ئەو کەسەی لە قۆناخی جوانناسیدا دەژی، بەئاسانی تووشی دڵەڕاوکێ دەبێت و هەست بە بەتاڵی دەکات... بەڵام ئەگەر ئەوە ڕوویدات، ئەوا لەم بارەشدا هێشتام هەر هیوایەک هەیە. بەپێی کیاگەگۆ، دڵەڕاوکێ تا ڕادەیەک شتێکی پۆزەتیفە، لەبەرئەوەی مانای ئەوە دەبەخشێت کە مرۆڤ خۆی لە «حاڵەتێکی بووندا» دەبینێتەوە و لێرەوە جوانپەرست دەتوانێت «باز»ە گەورەکە هەڵبژێرێت و بەرەو قۆناخێکی بەرزتر بڕوات. بەڵام ئەمە یان ڕوودەدات یان ڕوونادات.

واتە هیچ یارمەتیەکت نادات کە خەریک بیت «بازە» گەورەکە بدەیت، بەڵکو دەبێت هەمووی تەواو بکەیت. بە واتایەکی تر یان ئەمیان یان ئەوی تریان، بەڵام هیچ کەسێکی تر ناتوانێت بازە گەورەکەت بۆ بدات، بەڵکو دەبێت خۆت هەڵیببزێریت.

ـ ئەمە کەمێک لە بڕیاری واز لێهێنانی مەی خواردنەوە دەچێت، یان جگەرە نەکێشانم دەخاتەوە بیر.

ـ بەڵێ، لەوانەیە. کاتێک کیاگەگۆ باس لەم «بڕیاردانی فەرمانە» دەکات ئەوا دەکرێت سوکراتمان بهێنێتەوە یاد کە دەیگوت هەموو ئاگاییەکی ڕاستەقینە لە ناوەوە دێت. "ئیپسن" لە "پییە گوینت"دا باسی ئەوە دەکات. دیسانەوە دۆستیۆفیسکی «Dostoyevsky» نووسەری ڕوسی لە ڕۆمانە گەورەکەیدا دەربارەی ڕاسکۆلنیکۆڤ «Raskolinkov»، مامۆستایانە باس لەو هەڵبژاردنە دەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە بە چ شێوەیەک لە ئەنجامی ناچاری و گومانی ناوەوەدا هەڵدەقولێت.

ـ واتە لە باشترین حاڵەتدا، مرۆڤ دونیا بینیەکی تر هەڵدەبژێرێت.

ـ ئەوجا لەوانەیە مرۆڤ دەست بکات بەوەی لە قۆناخی ئەخلاقیدا بژی. ئەم قۆناخە، پڕ لە هەڵبژاردنی ڕاستەقینە و ئاکام بەخشە کە لەسەر پێوانەیەکی ئەخلاقی دیاریان دەکەین. دەکرێت ئەم جۆرە فەلسەفەی ژیانە، ئەخلاقی ئەرکی «کانت»مان بهێنێتەوە یاد، کە دەیگوت دەبێت هەوڵبدەین بە پێی یاسای ئەخلاقی ناوەوەمان بژین. کیاگەگۆش هەروەک کانت، لەپێش هەموو شتێکدا سەرنجمان بۆ تەرزی بیرکردنەوەی مرۆڤ ڕادەکێشێت؛ گرنگ نیە بزانین چی ڕاستە و چی هەڵەیە، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی ئەوە گرنگە کە لەسەر ئەو «ڕاست» و «هەڵە» هەڵبژاردراوانە ڕەفتاربکەین. بەڵام وەک بینیمان

جوانپەرستەکان تەنها خۆشی و زەوقیان لە خەیاڵدا بوو و هەموو شتێکی «خوار» و «ناخۆشیان» پشت گوێ دەخست.
- بەڵام ئایا ئەو کاتە زیاد لە پێویست ژیان بە قورسی ناگرین؟
- بەڵێ، بێگومان! قۆناخی ئەخلاقیش بەپێی کیاگەگۆ دڵخۆشکەرانە نیە. مرۆڤێکی خاوەن ئەرکیش لە کۆتایدا هەست بە هیلاکی دەکات، چونکە هەمیشە دەبێت ئاگای لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی بێت و ناچارە بە شێوەیەکی زۆر ورد و پەیوەست بژی. لەوانەیە زیاتر لە تەمەنی گەورەیدا هەست بەو جۆرە هیلاکیە بکرێت. هەندێکیش لەوانەیە بگەڕێنەوە سەر قۆناخی جواننناسی، بەڵام هەندێکیش دەپەڕنەوە بۆ «قۆناخی ئاینی». واتە دەوێرن بازە گەورەکە بدەنە ناو قوڵایی ئیمانەوە، ئەو کاتە ئیمان لە چێژی جوانی و ئەرکی ئەقڵ بە باشتر دەزانن. هەرچەندە هەروەک کیاگەگۆ خۆی دەیگوت لەوانەیە «ترسناک بێت گەر بە زیندوویی بکەوینە بەردەستی خودا»، بەڵام تەنها ئەو کاتە مرۆڤ ئاشتی و تەبایی دەدۆزێتەوە.
- واتە لە ڕێگەی ئاینی مەسیحیەوە؟
- بەڵێ، «قۆناخی ئاینی» بەلای کیاگەگۆوە واتە ئاینی مەسیحی. بەڵام لە هەمان کاتیشدا کاریگەریەکی گەورەی لەسەر بیرمەندە نا مەسیحیەکانیش هەبوو. لە سەدەی بیستەمدا «فەلسەفەی بوونگەری "وجودی «Existentialism "سەریهەڵدا، کە سروشتی لە کیاگەگۆی دانیمارکیەوە وەرگرت.
ئەوجا سۆفیا تەماشای کاتژمێرەکەی کرد.
- خەریکە کاتژمێر دەبێتە حەوت. دەبێت بگەڕێمەوە ماڵەوە، دەنا دایکم تەواو تورە دەبێت.

بەدەستی خواحافیزبوونی لە مامۆستای فەلسەفەکەی کرد و بەرەو بەلەمەکەی قەراخ دەریاچەکە ڕایکرد.

# مارکس «Marx»

## ...تارماییەک بەناو ئەوروپادا دەڕوات...

هیلدە لەسەر جێگاکەی هەستا و لەتەنیشت ئەو پەنجەرەیەوە وەستا کە دەیڕوانیە سەر کەنداوەکە. ڕۆژی شەممەی بە خوێندنەوە دەست پێکرد... دەربارەی جەژنی لەدایک بوونی پانزە ساڵەی سۆفیای دەخوێندەوە. ڕۆژێک پێش ئەویش جەژنی لەدایک بوونی خۆی بوو.
ئەگەر باوکی دەیزانی کە هەر لە ئێستاوە گەیشتۆتە سەر ڕۆژی لەدایک بوونەکەی سۆفیا، ئەوا هەرگیز باوەڕی نەدەکرد، بەڵام خۆ هیلدە بە درێژایی ڕۆژەکە لە خوێندنەوە زیاتر هیچی تری نەدەکرد؛ باوکیشی ڕاستی کرد کە وتی هێشتام جەژنە پیرۆزەیەکی تریش ماوە، ئەوەش لەو شوێنەدابوو کە ئەلبێرتۆ و سۆفیا پێکەوە گۆرانی «ڕۆژی لەدایک بوونیان گوت». هیلدە هەستی دەکرد کە جێگەی شەرم بێت.
ئەوجا سۆفیا، ڕێک لەو ڕۆژەدا کە باوکی هیلدە لە لوبنانەوە دەگەڕێتەوە، هەمووانی بۆ «باخچە ئاهەنگێکی فەلسەفی» بانگ کرد!
هیلدە تەواو لەو بڕوایەدا بوو کە لەو ڕۆژەدا شتێکی سەیر ڕوودات... شتێک کە نە خۆی و نە باوکیشی چاوەڕێی دەکەن.
بەهەرحاڵ بە تەواوەتی لە یەک شت دڵنیابوو؛ دەبوایە پێش ئەوەی باوکی بگەڕێتەوە ماڵەوە، کەمێکی بترساندایە. ئەمە کەمترین شتبوو کە بۆ سۆفیا و ئەلبێرتۆی بکات، ئەوان هانایان بۆ هیلدە برد کە یارمەتیان بدات... دایکی هێشتام هەر لەلای بەلەمەکەوە بوو، هیلدەش بۆ تەلەفونکردن ڕۆیشتە خوارەوە. ژمارەکەی ئانە و ئۆلای دۆزیەوە و تەلەفونی بۆ کۆبنهاگن کرد.
ـ بەڵێ، ئانە قسە دەکات.

ـ چۆنیت، هیلدەت لەگەڵدایە.
ـ ئەم کاتەت باش هیلدە گیان! چەند خۆشە گوێم لە دەنگت بێت، لەگەڵ لیللەساندا چۆنن؟
ـ زۆر باشین، پشووی هاوینە دەستی پێکردووە و باوکیشم حەفتەیەکی تر لە لوبنانەوە دەگەڕێتەوە.
ـ پێت خۆشە؟
ـ بێگومان دڵم بەوە خۆشە... لە ڕاستیشدا هەر لەبەرئەوەیە کە ئێستاکە تەلەفونت بۆ دەکەم.
ـ بە ڕاست!
ـ پێم وابێت ڕۆژی شەممەی **23**ی مانگ، فڕۆکەکەی کاتژمێری پێنجی ئێوارە لە فڕۆکەخانەی کۆبنهاگندا دەنیشێتەوە. دەمەوێت بزانم لەو کاتەدا ئێوە لە کۆبنهاگن دەبن؟
ـ بەڵێ پێم وابێت... بۆ؟
ـ دەتوانم کارێکی پچکۆلەتان پێ بسپێرم؟
ـ فەرموو...
ـ بەڵام کەمێک تایبەتە. دڵنیاش نیم ڕێی تێبچێت.
ـ دەفەرموو بیڵێ... بە ڕاستی حەز دەکەم بزانم چیە...
پاشان هیلدە دەستیکرد بە باسکردنی بابەتەکەی... هەموو شتێکی دەربارەی مەلەفە گەورەکە و ئەلبێرتۆ و سۆفیای بۆ گێڕایەوە. زۆر کەڕەتیش دەبوایە دووبارە شتێکی بگوتایەتەوە، لەبەرئەوەی یان خۆی پێدەکەنی یان پوری، بەڵام هەتاوەکو هەموو پیلانەکەی بە تەواوەتی باس نەکرد، تەلەفونەکەی دانەنایەوە.

**ئێستاکەش دەبوایە چەند شتێکی لەماڵەوەدا ئامادەبکردایە... بەڕاست، هیچ پێویست بە پەلەپەل ناکات، لەبەرئەوەی هێشتام چەند ڕۆژێکی لەبەردەستایە.**

**هیلدە هەموو پاشنیوەڕۆ و ئێوارەی شەممەی لەگەڵ دایکیدا بەسەربرد... هەردووکیان هەستیان دەکرد ڕۆژی پێشووتر، کە ڕۆژی لەدایک بوونی هیلدە بوو، هیچ شتێکی تایبەتیان بەو بۆنەیەوە نەکردبوو، لەبەرئەوە بڕیاریاندا بە ئۆتۆمبیل بچنە کریستیانساند و لەوێوە بچن بۆ سینەما. دواتریش کە بەلای فڕۆکەخانەی کیڤیکدا تێپەڕین، دوا بەشی پیلانەکەی بە خەیاڵدا هات.**

**پاشان نیوەشەو هیلدە چووە ناو جێگاوە و دیسانەوە دەستیکردەوە بە خوێندنەوە...**

سۆفیا کاتژمێری هەشت خۆیکرد بەناو کوخەکەیدا، دایکیشی لەبەردەم دەرگای دەرەوەدا خەریکی بژارکردنی ناو گوڵەکان بوو.

ـ لە کوێوە هاتیتە ناوەوە؟

ـ لە نێو پەرژینەکەوە.

ـ لە نێو پەرژینەکەوە؟

ـ بۆ نازانیت ڕێگایەکی تریش لە دیوی ئەودیوەوە هەیە؟

ـ بەڵام لە کوێ بوویت، سۆفیا؟ ئەمە دووهەم جارە بەبێ ئەوەی پێم بڵێیت، هەروا لە کاتی نانخواردندا دەڕۆیتە دەرەوە.

ـ ببورە، ئاو وهەوا زۆر خۆشبوو و منیش حەزم بە پیاسەیەکی دور و درێژکرد.

ئەوجا دایکی دەستی لە دڕکەکان هەڵگرت و تەماشایەکی کرد.

ـ خۆ دیسانەوە لەگەڵ فەیلەسوفەکەدا نەبوویت؟

- بەڵێ، لەڕاستیدا لەگەڵ ئەو دابووم، بەڵام لەوەوپێش پێم گوتیت کە ئەویش حەزی بە پیاسەکردنە.
- ئەی بۆ ئاهەنگی باخچەکە دێت؟
- بەڵێ، پێشی خۆش دەبێت.
- منیش هەروەها، لە ئێستاوە بە پەنجە ڕۆژەکان دەژمێرم، سۆفیا.
دەنگی دایکی سروشتی نەدەهاتە بەر گوێ، لەبەرئەوە سۆفیا گوتی؛
- باشبوو دایک و باوکی یۆرونشم بانگکرد، دەنا لەوانەیە ببوایەتە جێی شەرم.
- هەرچۆنێک بێت دەمەوێت دوو قسەی تایبەتی لەگەڵ ئەو ئەلبێرتۆیەدا بکەم.
- دەتوانن دوو بە دوو لە ژورەکەی مندا دابنیشن، دڵنیام بە دڵت دەبێت.
- بەهەرحاڵ، نامەیەکت بۆ هاتووە.
- بەڕاست؟
- مۆری نەتەوە یەکگرتووەکانی لێدراوە.
- کەواتە براکەی ئەلبێرتۆ ناردویەتی.
- گوێ بگرە سۆفیا... دەبێت سنوورێک دابنرێت.
سۆفیا بەپەل بیریکردەوە و لە یەک دوو چرکەدا بیرۆکەیەکی باشی بە خەیاڵدا هات. لەوە دەچوو ڕۆحێکی پاک یاریدەی بدات.
- بەڵام من بە ئەلبێرتۆم گوتبوو کە پولی نایاب کۆدەکەمەوە، لەوەش دەچێت بوونی برا سوودی زۆر بێت.
ئەم وەڵامە تا ڕادەیەک هێمنی کردەوە و ئەوجا بە دەنگێکی ئاساییەوە گوتی؛
- نانی ئێوارەت لەناو یەخچاڵەکەدایە.

ـ ئەی نامەکە؟
ـ ئەویش لەسەر یەخچاڵەکەیە.
سۆفیا بەپەلە خۆی کرد بە ژوردا. زەرفەکە بەرواری 1990/6/15ی لێدرابوو، کردیەوە و پارچە کاغەزێکی بچکۆلەی بەدیکرد، لەسەری نووسرابوو؛
»ئەگەر هەموو شتێکی خولٚقێنراو بەرەو فەوتاندن بچێت،
کەواتە مانای خولٚقاندن چیە؟«
نەخێر، سۆفیا هیچ وەڵامێکی ئەو پرسیارەی لا دەست نەدەکەوت. پێش ئەوەی دەست بکات بە نانخواردن، پارچە کاغەزەکەی لەگەڵ هەموو شتەکانی تردا کە حەفتەی پێشووتر جیایکردبوونەوە، خستیە ناو چەکمەجەکەوە و داینا. پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر یۆرون هاتە میوانی. لەپێشدا کەمێک یاری ڕیشەیان کرد و پاشان پیلانی باخچە ئاهەنگی فەلسەفیەکەیان داڕشت. بیریان لەوە دەکردەوە ئەگەر ئاهەنگەکەیان خۆش نەبێت، ئەوا دەبێت بەشتی تر بیرازێننەوە.
تائەو کاتەی دایکی لە کار هاتەوە، ئەوان بەردەوام هەر باسی ئاهەنگەکەیان دەکرد. ئەویش کە هاتەوە بەشداری گفتوگۆکەی کردن و یەک ڕستەی بەردەوام دووپات دەکردەوە؛ »نەخێر، دەبێت ئاهەنگێکی تێروتەسەل بێت و نابێت بە هیچ شێوەیەک ڕەزیلی تێدا بکرێت«، دیارە مەبەستیشی نەبوو بەتەوسەوە ئەم قسەیە بکات!
لەوانەیە دایکی بیری بۆ ئەوە چووبێت کە سۆفیا ڕێک پێویستی بە ئاهەنگێکی فەلسەفی هەبێت، بەڵکو دیسانەوە قاچی لەسەر زەوی دانێتەوە، بە تایبەتیش پاش ئەو چەند حەفتەیەی کە بەچڕی فەلسەفەی دەخوێند و چووبوە ناو دونیای فەلسەفەوە.

پێش ئەوەی ئێوارە دابێت، لەسەر هەموو شتێک ڕێکەوتن، هەر لە شێوەی ڕازاندنەوە و ڕووناکیدانانی باخچەکەوە هەتاوەکو سازدانی پێشبڕکێیەکی فەلسەفی و دیاری بەخشینی براوەش. وایان بە باش دەزانی دیاریەکە کتێبێک بێت لەسەر مێژووی فەلسەفە، کە بۆ گەنجان نووسرابێت، ئەمە لەبارێکدا ئەگەر کتێبێکی ئاوها دەستبکەوێت! بەڵام سۆفیا تەواو دڵنیا نەبوو کتێبێکی ئاوها هەبێت.

پێنج شەممە 21ی 6، تەنها دوو ڕۆژ پێش جەژنی یۆحەننا، ئەلبێرتۆ تەلەفونی کردووە.

- بەڵێ، سۆفیا قسە دەکات.

- ئەلبێرتۆت لەگەڵدایە.

- چۆنیت؟

- بەشێوەیەکی گشتی زۆر باشم. پێم وابێت ڕێگایەکی دەربازبوونی باشم دۆزیوەتەوە.

- دەربازبوون لە چی؟

- خۆت دەزانیت لە چی... بێگومان لەم زیندانە فیکرییەی کە دەمێکە هەردووکمانی تێدا چەقیوین.

- ئاە... ئەوە.

- بەڵام هەتاوەکو پیلانەکەم دەست پێنەکات، ناتوانم هیچ شتێک دەربارەی بڵێم.

- زۆر دوا نەکەوتووین؟ مەبەستم ئەوەیە دەمەوێت بزانم کەوتوومەتە چییەوە!

- نەخێر، چەندە ساویلکەیت. بۆ نازانیت ئێستاکە گوێیان لە هەموو ئەو شتانەیە کە دەیڵێین؟ لەبەرئەوە باشتر وایە بێدەنگ بین.

- بەڕاستی تا ئەو ڕادەیە ترسناکە؟

ـ بێگومان، کچەکەم. گرنگترین شت ئەو کاتانە ڕوودەدات کە ئێمە بێدەنگین.
ـ ئاه...
ـ ئێمە لە هەقیقەتێکی هەڵبەستراودا دەژین، کە لە ڕێگەی وشەکانی ناو چیرۆکێکی دورودرێژەوە داڕێژراوە. هەموو وشەیەکیش لەلایەن مێجەرەوە و بەهۆی ئامێری چاپە هەرزانەکەیەوە دەنووسرێت، لەبەرئەوە هیچ وشەیەکی چاپکراو ناتوانێت لەژێر سەرنجی ئەودا دەرچێت.
ـ نەخێر، تێدەگەم. بەڵام ئەی چۆن بتوانین خۆمانی لێ بشارینەوە؟
ـ ششش، بێدەنگ بە!
ـ چی؟
ـ جگە لە وشەکان، شتێک لەنێوان دێڕەکانیشدا ڕوودەدات. منیش ڕێک لەو شوێنانەدا هەتا بکرێت هەوڵدەدەم ئەو ڕستانەی تێبئاخنم کە پتر لە مانایەکیان هەیە.
ـ بەڵێ، ئەوجا تێدەگەم.
ـ بەڵام دەبێت بە باشی سوود لە کاتی ئەمڕۆ و سبەینێش وەربگرین، شەممە هەموو شتێک دەست پێدەکات! دەتوانیت هەر ئێستاکە بێیت؟
ـ بەڵێ، هەر ئێستاکە دێم.
سۆفیا خواردنی بە بولبول و ماسیەکانی دا، گەڵا کاهویەکی گەورەشی بۆ گۆڤیندا دانا و قتوویەک خواردنیشی بۆ شێریکان هەڵپچڕی. لەکاتی ڕۆیشتنە دەرەوەیدا، خواردنی پشیلەکەی لەسەر قادرمەکان دانا.
پاشان لەنێو پەرژینەکانەوە ڕۆیشت و چووە سەر ڕێگاکەی ئەودیو. لەپاش کەمێک ڕۆیشتن، لەپڕێکدا لەناو گژوگیاکەدا چاوی بە مێزێکی نووسین کەوت. لەپشتی مێزەکەوە، پیاوێکی پیر لەسەر کورسیەکە

دانیشتبوو. لەوە دەچوو خەریکی ژماردنی شتێک بێت. سۆفیا ڕۆیشتە لایەوە و لێی پرسی؛
ـ ناوت چیە؟... پیاوەکە بە بێزاریەکەوە تەماشایەکی کرد و لەوەڵامدا گوتی؛
ـ سکرووج ...«Scrooge» ئەوەندەی گوت و دیسانەوە سەری بەسەر کاغەزەکانیدا شۆڕکردەوە.
ـ من ناوم سۆفیایە... ئایا تۆ خاوەن کارگەیت؟
پیاوەکە سەرێکی لەقاند و ئەوجا گوتی؛
ـ هەتا بشلێیت دەوڵەمەنم. نابێت یەک کرۆن بەفیرۆبدەم، لەبەرئەوە دەبێت سەرنج بخەمە سەر حساباتەکەم.
ـ چەند ناخۆش قسە دەکەیت.
سۆفیا بەدەستی خواحافیزی لێکرد و کەوتەوە ڕێ، بەڵام چەند مەترێک لەولاترەوە چاوی بە کچێکی بچکۆلە کەوت، کە لەسەر ڕەگی دارێک دانیشتبوو. ڕەنگ زەرد و نەخۆش دەهاتە بەرچاو و جل و بەرگێکی شڕی لەبەردابوو. کاتێک سۆفیا بەلایدا تێپەڕی، کچەکە دەستی کرد بە کیسە چکۆلەکەیدا و شقارتەیەکی دەرهێنا، ئەوجا پرسی؛
ـ لێم دەکڕیت؟
سۆفیا لە گیرفانەکانیدا بەدوای پارەدا گەڕا و یەک کرۆنیەکی بەردەست کەوت.
ـ بە چەندە؟
ـ بەیەک کرۆنە.
سۆفیا کرۆنەکەی بە کچەکەدا و شقارتەکەی لێ وەرگرت.

- ماوەی سەد ساڵێک دەبێت کەس هیچ شتێکی لێنەکڕیوم، لەو ساکەوە ئەمە تۆ یەکەم کەسیت. هەندێ جار لەبرساندا دەمرم و جاری واش هەیە لەسەرماندا ڕەق دەبمەوە.
سۆفیا بەلایەوە سەیر نەبوو کە کەس لە ناوەڕاستی ئەو دارستانەدا شقارتەی لێ نەکڕێت، بەڵام پاش کەمێک خاوەن کارگەکەی بیرکەوتەوە کە کەمێک لەوەوبەر بەلایدا تێپەڕی. چ پێویست دەکات ئەو کچە پچکۆلەیە لە برسا بمرێت، لە کاتێکدا ئەو کابرایە کە تەنها چەند مەترێک لێوەی دورە، خاوەنی ئەو هەموو پارەیە بێت. پاشان بە کچەکەی گوت؛
- لەگەڵما وەرە.
دەستی کچەکەی گرت و لەگەڵ خۆیدا بەرەو لای پیاوەکە ڕۆیشتن و گوتی؛
- دەبێت یارمەتی ئەم کچە بدەیت، بۆ ئەوەی ژیانێکی باشتری دەست بکەوێت.
پیاوەکە چاوی لەسەر کاغەزەکانی هەڵبڕی و گوتی؛
- ئەو جۆرە شتانە پارەی تێدەچێت و منیش کەمێک لەمەوبەر پێم گوتیت کە نامەوێت تەنانەت یەک کرۆنیش بە فیڕۆ بدەم.
- بەڵام ناهەقیە تۆ ئەوەندە دەوڵەمەند بیت و ئەو کچەش هێندە فەقیر بێت.
- قسەی بێمانا! هەق تەنها لە نێوان خەڵکانی هاوتای یەکدا بوونی هەیە.
- مەبەستت چیە؟
- من کارم کردووە و ماندووش بووم، خۆ دەبێت هەموو کارێکیش هەقی خۆی هەبێت. بەمەش دەگوترێت «پێشکەوتن.»

ـ قسەی هیچ!
ـ ئەگەر یارمەتیم نەدەیت، دەمرم... کچە پچکۆلەکە گوتی.
پیاوەکە دیسانەوە چاوی لەسەر کاغەزەکانی هەڵبڕییەوە، بەتوڕەییەوە قەڵەمەکەی فڕێدایە سەر مێزەکە و هاواریکرد؛
ـ تۆ بە هیچ جۆرێک لە حساباتی مندا بوونت نیە! لەبەرئەوە فەرموو بەڕێکەوە و بەرەو حەساری هەژاری بڕۆ!
ـ ئەگەر یارمەتیم نەدەیت، دارستانەکە دەسووتێنم... کچەکە گوتی .
ئەوجا پیاوەکە لەسەر مێزەکە هەستا، بەڵام ئەو کاتە کچەکە تاڵە شقارتەیەکی داگیرساندبوو، لە کۆمەڵێ گژوگیای وشکەوە نزیکی کردەوە و کڵپەی لێهەڵساند.
پیاوە دەوڵەمەندەکەش هەردوو دەستی ڕاوەشاند و هاواریکرد؛
ـ خوایە یارمەتیم بدە! ڕەنگ سوورەکان هاتنەوە!
کچەکەش بە گاڵتە پێکردنێکەوە تەماشایەکی کرد و گوتی؛
ـ بۆ نەتدەزانی من کۆمۆنیستم؟
کەمێک پاش ئەوە پیاوە دەوڵەمەندەکە و کچەکە و مێزەکە دیارنەمان. سۆفیا بە تەنها مایەوە و هێشتام ئاگری ناو گیا وشکەکەش هەر پەرەی دەسەند. هێواش هێواش پێی لەسەر ئاگرەکە دانا و پاش کەمێک کوژاندیەوە.
سوپاس بۆ خوا! سۆفیا تەماشای پەڵە ڕەشەکەی ناو گیاکە کرد، شقارتەکەشی هەر بەدەستەوە بوو.
خۆ ئەو ئاگرەکەی نەکردەوە؟
کاتێکیش ئەلبێرتۆی لەبەردەم کوخەکەدا بینی، هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە.

ـ سکرووج، سەرمایەدارێکی بەدی یەکێک لە چیرۆکەکانی «چارلس دیکنس»ە، کە ناوی «حەکایەتێکی شەوی لەدایک بوونی مەسیح»ە، بێگومان کچی شقارتە فرۆشەکەش لە حەکایەتەکانی ھ. س. ئانەرسنەوە دەناسیت.

ـ بەڵام بەلاتەوە سەیر نیە لەناو ئەم دارستانەدا بیانبینم؟

ـ بە هیچ جۆرێک، لەبەرئەوەی ئەم شوێنە دارستانێکی ئاسایی نیە و ئێستاکەش دەمەوێت باسی «کارڵ مارکس«Karl Marx ت بۆ بکەم. بەڵام نمونەیەکی سەدەی نۆزدەت لە شوێنی خۆیدا بینی... خۆ بینیت چ جیاوازیەکی مەزن لە نێوان دوو چینی دژ بەیەکدا هەبوو. فەرموو بابڕۆینە ژورەوە، لەوێدا بەلایەنی کەمەوە کەمێک لەخۆ تێهەڵقورتانی مێجەر دوردەکەوینەوە.

دیسانەوە لەسەر مێزی بەردەم ئەو پەنجەرەیەدا دانیشتنەوە کە دەیڕوانیە سەر دەریاچەکە. سۆفیا هێشتام هەستی بە لەشی دەکرد، کاتێک کە لە شوشە شینەکەی خواردەوە و تەماشای دەریاچەکەی دەکرد.

هێشتام هەردوو شوشەکە، سوورەکە و شینەکەش، هەر لەسەر ڕەفەی ئاگردانەکە بوون. بەڵام ئێستاکە لەسەر مێزەکە کڵێشەی کڵێسایەکی یۆنانی دانرابوو.

ـ ئەوە چیە؟... سۆفیا لێی پرسی.

ـ هەموو شتێک کاتی خۆی هەیە کچەکەم.

ئەوجا ئەلبێرتۆ دەستیکرد بە باسکردنی مارکس؛

ـ لەوانەیە کیاگەگۆ کاتێک لە ساڵی 1841دا بۆ گوێگرتنی وانەکانی شێللینگ چوو بۆ بەرلین، لە تەنیشت کارڵ مارکسەوە دانیشتبێت. کیاگەگۆ نامەی ماجیستێرەکەی لەسەر سوکرات نووسی و لە هەمان

کاتدا مارکس نامەی دکتۆراکەی لەسەر دیمۆکریتس و ئیپیکۆر نووسی ـواتە دەربارەی مەتریالیستەکانی سەدەکانی کۆن. لەپاش ئەوەشەوە هەردووکیان فەلسەفەی تایبەتی خۆیان دەستنیشانکرد.

ـ ئەوجا کیاگەگۆ بووە فەیلەسوفێکی «بوونگەری ـوجودی» و مارکسیش بووە «مەتریالیست»، وا نیە؟

ـ مارکس بووە ئەو فەیلەسوفەی کە پێی دەگوترێت «مەتریالیستی مێژوویی»، بەڵام پاشان دێینەوە سەر ئەم باسە.

ـ بەردەوام بە!

ـ کیاگەگۆ و مارکس هەر یەکەیان بە شێوەی خۆی، لە فەلسەفەی هیگڵەوە دەستیان پێکرد. هەردووکیان ڕەنگدانەوەیەکی فیکری هیگڵیان تێدایە، بەڵام هەردووکیشیان لە «ڕۆحی جیهانی» هیگڵەوە یان لە ئایدیالیستی هیگڵەوە دورەپەرێزبوون.

ـ لەوانەیە کەمێک ناڕوون بووبێت بەلایانەوە.

ـ ڕاستە. دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی بڵێین لەگەڵ هیگڵدا، سەردەمی سیستمی گەورەی فەلسەفیش بەسەرچوو. لەپاش ئەوەوە فەیلەسوفەکان ئاڕاستەیەکی تەواو نوێ دەگرنە بەر. لەوە بەدواوە لەبری سیستمی گەورەی تیۆری، «فەلسەفەی بوونگەری» و «فەلسەفەی کرداری Philosophy of Action» هاتە کایەوە. لێرەشەوە مارکس وەک بنچینەیەکی فەلسەفەکەی دەیگوت؛ «فەیلەسوفەکان هەتاوەکو ئێستاکە تەنها جیهانیان لێکداوەتەوە، بەڵام ئێستاکە گرنگە بیگۆڕین». ڕێک ئەم چەند وشەیەش، وەک خاڵێکی وەرچەرخانی گەورەی مێژووی فەلسەفی تەماشادەکرێت.

ـ بینینی سکرووج و کچە چکۆلانەکەی ناو دارستانەکە، وام لێدەکات هیچ گرفتێکم لە تێگەیشتنی مەبەستی مارکسدا نەبێت.

ـ واتە بیرکردنەوەی مارکس ئامانجێکی کرداری (*عەمەلی) و ڕامیاریشی هەبوو. لەسەرو ئەوەشەوە لەیادمان نەچێت مارکس تەنها فەیلەسوفێک نەبوو، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا زانای ئیکۆنۆمی و سۆسیۆلۆژی و مێژوونووسینیش بووە.
ـ ئایا لە هەموو ئەو بوارانەدا پێشەوا بوو؟
ـ بەلایەنی کەمەوە هیچ فەیلەسوفێک هێندەی مارکس، هەمان ڕۆڵی گرنگی لەسەر ڕامیاری کرداری نەبووە. بەڵام... لەلایەکی تریشەوە دەبێت وریابین، فیکری مارکس خۆی و هەموو ئەو شتانەی کە پێی دەگوترێت «مارکسیزم» تێکەڵ نەکەین. دەربارەی خودی مارکس، دەڵێن خۆی لە ناوەڕاستی ساڵەکانی 1840ەکاندا بووبە «مارکسی»، بەڵام پاش ئەو کاتەش هەستی دەکرد پێویستی بەوەبێت کە نیشانی بدات «مارکسی» نیە.
ـ ئایا مەسیح «مەسیحی» بوو؟
ـ بێگومان ئەوەش شیاوی گفتوگۆکردنە لەسەری.
ـ بەردەوام بە.
ـ هەر لەسەرەتاوە فریدریک ئینجلیسی هاوەڵ و برادەری، هاریکاری هەڵچنینی «مارکسیسمی» کرد. لەم سەدەیەی خۆشماندا لینین و ستالین و ماو و چەندەهای تر بەشداری خۆیان خستە سەر مارکسیزم یان «مارکسیزمی لینینیزم.«
ـ کەواتە من پێشنیار دەکەم بگەڕێینەوە سەر خۆدی مارکس خۆی. تۆ گوتت ئەو «مەتریالیستێکی مێژوویی»بوو، وا نیە؟
ـ ئەو بە هەمان شێوەی فەیلەسوفە «ئەتۆمیەکانی» سەدەکانی کۆن و مەتریالیستە میکانیکیەکانی سەدەکانی حەڤدە و هەژدە، «فەیلەسوفێکی مەتریالیستی» نەبوو. بەڵام دەیگوت بە شێوەیەکی

بنەڕەتی پەیوەندیە مەتریالیەکانی (*مادییەکانی) ناو کۆمەڵگا، شێوازی بیرکردنەوەمان دەستنیشان دەکەن. بە بڕوای ئەو هەمان ئەو پەیوەندیە مەتریالیانەش ڕۆڵی سەرەکی لە گەشەکردنی مێژوودا دەبینین.

ـ ئەمە لە «فیکری جیهانی» هیگڵ تەواو جیاوازترە.

ـ هیگڵ دەیگوت گەشەکردنی مێژوویی لە ئەنجامی گرژبوونی نێوان لێکدژەکان ڕوودەدات، کە لە پڕێکدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی گۆڕانکاریەک. مارکسیش گەشەی بەو بیرکردنەوەیەدا، بەڵام بە بڕوای ئەو شێوەی هەڵچنینەکەی هیگڵ هەڵاوگێڕاوبوو.

هیگڵ بە خودی ئەو هێزەی کە مێژوو بەرەو پێشەوە دەبات، دەڵێت «ڕۆحی جیهان» یان «ئەقڵی جیهان». مارکسیش ڕێک مەبەستی لەمەیە کە دەڵێت دارشتنەکەی هەڵاوگێڕاوە. مارکس خۆی دەیویست بیسەلمێنێت کە گۆڕانکاریە مەتریالیەکان ڕۆڵی سەرەکی و گرنگ دەبینن؛ واتە «هەلومەرجی ڕۆحانی» نیە کە گۆڕانکاریە مەتریالیەکان دەخولقێنێت، بەڵکو ڕێک بە پێچەوانەوەیە، گۆڕانکاریە مەتریالیەکان هەلومەرجی نوێی ڕۆحانی دەخولقێنن. مارکس بە توندی دوپاتی دەکردەوە کە هێزە ئابووریەکانی ناو کۆمەڵگا دەبنە خولقاندنی گۆڕانکاری و بەو شێوەیەش مێژوو بەرەو پێشەوە دەڕوات.

ـ دەتوانیت نمونەیەک بهێنیتەوە؟

ـ فەلسەفە و زانستی سەدەکانی کۆن ئامانجێکی تیۆری پەتیان هەبوو. تا ڕادەیەکی زۆریش بەلایانەوە گرنگ نەبوو کە زانیاریەکانیان بۆ باشکردنی ژیانی ڕۆژانە بەکاربهێنن.

ئەمەش پەیوەندی بە چۆنیەتی ڕێکخستنی ئابووری هەموو ژیانی ڕۆژانەوە هەبوو. هەموو بەرهەم هێنانێک تا ڕادەیەکی زۆر کەوتبووە

سەر کاری کۆیلەکان، لەبەرئەوە هاووڵاتیە ئازادەکانی کۆمەڵگا پێویستیان بەوە نەبوو دۆزینەوە نوێکان بۆ باشکردنی بەرهەم بەکاربهێنن.

- بەڵێ، بەڵێ... بەو شێوەیە...

- مارکس بەو جۆرە پەیوەندیە مەتریالی و ئابووری و کۆمەڵاتیانەی دەگوت «بنەمای یان ژێرخانی» کۆمەڵگا، لە کاتێکدا جۆری بیرکردنەوە لە کۆمەڵگادا و ڕێکخراوە ڕامیاریەکان و یاساکانی کۆمەڵ و ئاین و مۆراڵ و هونەر و فەلسەفە و زانست، هەموو ئەمانەی ناو نابوو «سەرخانی کۆمەڵگا.«

- بە کورتی، ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگا.

- ئێستاکەش بەیارمەتیت ئەو کلێشەی پەرستگا یۆنانیەم بدەرێ!

- فەرموو.

- ئەمە دەقی کۆپیەکی تەواوی پەرستگا کۆنەکەی "پارتینۆنە" کە لە "ئەکریپۆلیسدایە"... بە ڕاست، خۆ خۆشت بینیت.

- مەبەستت لەوەیە لە ڤیدیۆکەدا بینیم.

- وەک دەبینیت بیناکە بە ڕاستی جوان دروستکراوە و سەقفێکی شێوە هونەریشی هەیە، لەوانەشە یەکسەر سەرنجت بچێتە سەر سەقفە سێگۆشەییەکەی. ئەمەیە کە پێی دەڵێین سەرخان، بەڵام خۆ سەرخان بە هەواوە ناوەستێت.

- سەقفەکە بەهۆی پایەکانەوە وەستاوە.

- لە پێش هەموو شتێکدا بیناکە بنچینەیەکی «یان ژێرخانێکی» بەهێزی هەیە کە هەموو بیناکەی ڕاگرتووە. مارکس دەیگوت ڕێک بەم شێوەیە پەیوەندیە مەتریالیەکان هەموو بەرهەمی بیرکردنەوەی

کۆمەڵگایان ڕاگرتووە. لەم ڕوانگەیەشەوە سەرخانی هەر کۆمەڵگایەک، بەرپەرچدانەوەی ژێرخانەکەیەتی.
- دەتەوێت بڵێیت تیۆری فیکرەکانی پلاتۆن، بەرپەرچدانەوەی گوڵدان دروستکردن و بەرهەم هێنانی شەرابە؟
- نەخێر، هەروا ئاسان نیە و مارکسیش بە تایبەتی سەرنجمان بۆ ئەو خاڵە ڕادەکێشێت. کاریگەریەکی ئاڵوگۆڕ لە نێوان بنەما و سەرخانی کۆمەڵگادا هەیە. ئەگەر مارکس نکۆڵی لەم جۆرە کاریگەریە بکردایە، ئەوا ئەو کاتە دەبووە «مەتریالیستێکی میکانیکی». بەڵام چونکە مارکس پەیوەندیەکی دیالێکتیکی لە نێوان ژێرخان و سەرخاندا دەبینێت، لەبەرئەوە پێی دەڵێین مەتریالیستێکی دیالیکتیکیە. هەروەها تەنها بۆ زانینت، حەزدەکەم بڵێم پیشەی پلاتۆن نە ئینجانە دروستکردن بوو و نە ڕەزی مێویشی هەبوو.
- باشە. دەربارەی پەرستگاکە هیچت ماوە باسی بکەیت؟
- بەڵێ کەمێک ماوە... چی دەبینیت ئەگەر بە جوانی لە بنچینەی پەرستگاکە وردبیتەوە؟
- پایەکان لەسەر بنچینەکەیەن، کە لە سێ ئاست یان سێ پلە پێکهاتووە.
- بە هەمان شێوەش دەتوانین سێ ئاست لە ژێرخانی کۆمەڵگادا جودا بکەینەوە. لەپێش هەموو شتێکدا «بنچینەترین»، ئەمەش ئەو شتەیە کە پێی دەگوترێت «هەلومەرجی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگا»، واتە هەموو مەرجە سروشتیەکان یان هەموو ئەو سەرچاوانەی کە لە کۆمەڵگادا هەیە. مەبەستم لە هەموو ئەو شتانەیە کە پەیوەندیان بە ئاو وهەوا و مادەی سەرەتاییەوە هەیە، ئەمە خودی بنچینەی کۆمەڵگایەک پێکدەهێنێت و سنوورێکی ئاشکرا بۆ بەرهەمەکانی ئەو

کۆمەڵگایە دادەنێت. لێرەشەوە سنوورێکی ئاشکراش بۆ چۆنیەتی کۆمەڵگا و جۆری کەلتورەکەی دادەڕێژێت.
- بۆ نمونە نە دەتوانین لە بیاباندا پیشەی ماسیگرتنمان هەبێت و نە دەشتوانین لە باکوری نەرویجدا دار خورما بەرهەم بهێنین.
- پەنجەت خستە سەر مەبەستەکەمان، بەڵام لەوێدا شێوازی بیرکردنەوەی خەڵکەکانیش تەواو جیاوازە و کەوتۆتە سەر ئەوەی ئایا لە کەلتورێکی کۆچەری بیاباندا دەژین یان وەک ماسیگرێکی باکوری نەرویجی.
پلەی دووهەمی بنەمای کۆمەڵگا پەیوەندی بە جۆری «ئامێری بەرهەمهێنانی» کۆمەڵگاوە هەیە. لێرەدا مارکس مەبەستی لەو جۆرە ئامێر و ماشێن و ئەدەواتانەیە کە خەڵکی بەکاریان دەهێنن.
- لە سەردەمی کۆندا خەڵکی بە بەلەمی بچکۆلە ڕاوەماسیان دەکرد و ئەمڕۆکەش پاپۆڕی گەورە و زەبەلاح بۆ کاری ماسیگرتن بەکاردەهێنرێت.
- لێرەدا ڕێک ئاماژە بۆ پلەی سێهەمی بنەمای کۆمەڵگا دەکەیت، ئەویش دەربارەی خاوەنی ئامێری بەرهەمهێنانە، واتە کێ خاوەنیانە. مارکس بە ڕێکخستنی کاری دەگوت «پەیوەندی بەرهەمهێنانی» کۆمەڵگا، واتە کار دابەشکردن و پەیوەندی موڵکایەتی.
- ئاسان نیە، بەڵام پێم وابێت تێدەگەم...
- وەک دەرئەنجامێک، هەتاوەکو ئێستا دەتوانین بڵێین شێوازی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو، شێوەی باری ڕامیاری و ئایدیۆلۆجی ئەو کۆمەڵگایە دیاریدەکات. واتە ڕێکەوت نیە کە ئێمە ئەمڕۆکە کەمێک جیاوازتر بیردەکەینەوە و جۆرە مۆراڵێکی تریشمان لەچاو کۆمەڵگای دەرەبەگیدا هەیە.

ـ کەواتە مارکس باوەڕی بە هەقێکی سروشتی نەبووە کە بۆ هەموو کاتێک بەکاربهێنرێت؟
ـ نەخێر، ڕاست و هەڵەی مۆراڵی بەپێی مارکس بەرهەمێکی ژێرخانی کۆمەڵگایە. بۆ نمونە ڕێکەوت نەبوو لە کاتی کۆمەڵگای کشتوکاڵیدا دایک و باوک بڕیاریان دەدا جوتیارەکان کێ بهێنن و شوو بە کێ بکەن، لەبەرئەوەی ڕێک پەیوەندی بە میراتی و وەرگرتنی کێڵگەکەوە هەبوو. لە کاتێکدا پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەشارە گەورە مۆدێرینەکاندا، تەواو جیاوازە؛ لەوێدا دەکرێت لە ئاهەنگێکدا یان لە بارێکدا بەرامبەرەکەت ببینیت و ئەگەر تەنها بەڕاستیش یەکتریتان خۆش بوێت، ئەوا بە ئاسانی شوێنێک دەدۆزنەوە و تیایدا دەژین.
ـ من ڕازی نابم دایک و باوکم هاوسەرەکەمم بۆ دیاریبکەن.
ـ نەخێر، لەبەرئەوەی تۆش منداڵی سەردەمەکەی خۆتیت... جگە لەوەش مارکس دەیگوت تا ڕادەیەکی زۆر چینی دەسەڵاتداری کۆمەڵگا ڕاست و ناڕاست دیاریدەکات، لەبەرئەوەی هەموو مێژوو، مێژووی ململانێی چینەکانە. واتە بەپلەی یەکەم مێژوو دەربارەی ئەوەیە کە کێ ببێتە خاوەنی ئامێری بەرهەمهێنان.
ـ بەڵام ئەی بیرکردنەوەی مرۆڤیش بەشداری گۆڕانی مێژوو ناکات؟
ـ هەم دەیکات و هەم ناشیکات. مارکس بەئاگابوو لەوەی کە سەرخانی کۆمەڵگا پێیدەچێت کاریگەری لەسەر ژێرخانی کۆمەڵگا هەبێت، بەڵام نکۆڵی لەوە دەکرد کە سەرخانی کۆمەڵگا خاوەنی مێژوویەکی سەربەخۆبێت. هەموو گۆڕانکاریەکانی مێژوو، هەر لە سەدەکانی کۆنەوە هەتا ئێستاکەی کۆمەڵگای پیشەسازی، بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکاریەکانی بنەمای کۆمەڵگا.
ـ بەڵێ، بەڵام لەوەوپێش باسی ئەمەت کرد.

ـ مارکس دەیگوت لە هەموو قۆناخەکانی مێژوودا دژایەتیەک لە نێوان دوو چینی کۆمەڵگادا بوونی هەبووە. لەسەدە کۆنەکانی کۆمەڵگای کۆیلەیەتیدا، دژایەتیەک لە نێوان هاووڵاتی ئازاد و کۆیلەکاندا هەبووە. لە کۆمەڵگای دەرەبەگی سەدەکانی ناوەڕاستدا، دژایەتی لە نێوان دەرەبەگ و جوتیاردا هەبووە، پاشانیش لە نێوان بەگزادە و بۆرجوازەکاندا. بەڵام لەسەردەمی مارکس خۆیدا، کۆمەڵگای ناونابوو بۆرجوازی یان سەرمایەداری، لەوێشدا دژایەتیەک لە نێوان سەرمایەداران و کرێکاراندا یان پڕۆلیتاریادا خۆی نیشان دەدا. بە کورتی، دژایەتیەکمان هەیە لە نێوان ئەوانەی کە خاوەنی ئامێری بەرهەمهێنان و ئەوانەی کە خاوەنی نین، وە لەبەرئەوەی «چینی سەردەستە» نایەوێت دەست لە دەسەڵاتی هەڵبگرێت، کەواتە تەنها لە ڕێگەی شۆڕشەوە گۆڕانکاری بەدەست دەهێنرێت.
ـ ئەی لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا؟
ـ مارکس بە شێوەیەکی تایبەتی گرنگی دەدا بە گۆڕانی کۆمەڵگا لە سەرمایەوە بۆ کۆمۆنیستی. زۆر بە وردەکاریشەوە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری شیکاردەکاتەوە. بەڵام پێش ئەوەی بێینە سەر ئەو باسە، دەبێت لە پێشدا شتێک لە ڕوانگەی مارکسەوە دەربارەی «کار»ی مرۆڤ باسبکەین.
مارکس لە کاتی گەنجیدا و پێش ئەوەی ببێتە کۆمۆنیست، زۆر بایەخی بەوە دەدا بزانێت مرۆڤ لە کاتی کارکردندا چی بەسەردێت. هیگڵیش ئەم لایەنەی شیکار کردبووەوە. ئەو لەو بڕوایەدابوو پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕی یان دیالێکتیکی لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا هەبێت. کاتێک مرۆڤ لەسەر سروشت کاردەکات، ئەوا خودی مرۆڤ خۆشی کاری لەسەر دەکرێت. یان بە شێوەیەکی کەمێک جیاوازتر بیڵێین؛ کاتێک

مرۆڤ کاردەکات، ئەوا دەست لە سروشت وەردەدات و کاریگەری خۆی لەسەر جێدەهێڵێت، بەڵام لەم پرۆسەی کارکردنەدا، سروشتیش لەسەر مرۆڤ کاریگەری دەبێت و مۆرکی خۆی لە ئاگایی مرۆڤدا جێدەهێڵێت.
- پێم بڵێ چ کارێک دەکەیت، منیش پێت دەڵێم تۆ کێیت.
- مەبەستی مارکسیش زۆر بەکورتی هەر ئەمە بوو. شێوەی کارەکەمان ڕەنگدانەوەی لەسەر ئاگاییمان هەیە و ئاگایشمان ڕەنگدانەوەی خۆی لەسەر شێوەی کارەکەمان هەیە. دەتوانین بڵێین پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕی لە نێوان «فیکر» و «دەست»دا هەیە، بەم شێوەیەش مەعریفەی مرۆڤ تا ڕادەیەکی زۆر گرێدراوی کارەکەیەتی.
- ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، کەواتە بێکاری دەبێت زۆر ترسناک بێت.
- بەڵێ، ئەو کەسەی بێکار دەژی، وەک ئەوە وایە وزەی لێبڕابێت. هیگڵ هەر زوو بەئاگابوو لەمە. کارکردن هەم بەلای هیگڵ و هەم بەلای مارکسیشەوە شتێکی پۆزەتیڤە، شتێکە بە توندی بە بوونی مرۆڤەوە وەک مرۆڤێک بەستراوەتەوە.
- کەواتە دەبێت شتێکی پۆزەتیف بێت گەر کرێکار بین.
- لە بنچینەدا بەڵێ، بەڵام ڕێک لێرەدایە کە مارکس ڕەخنە توندوتیژەکانی لە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایە دەگرێت.
- چۆن؟
- لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا کرێکار بۆ کەسێکی تر کاردەکات، بەم شێوەیەش کارەکەی دەبێتە شتێک کە لە دەرەوەی خۆیدایە، شتێک کە خاوەنی نیە... لێرەشەوە کرێکار بە کارەکەی خۆی نامۆ دەبێت -بەڵام وەک ئەنجامێکی ئەمە خۆی بە خۆشی نامۆ دەبێت. هەقیقەتی مرۆڤانەی خۆی لەدەست دەدات. مارکس بە شێوە دەربڕینێکی هیگڵیانە دەڵێت؛ کرێکار دوچاری «بەنامۆ بوون» دەبێت.

ـ پورێکم هەیە وا بۆ بیست ساڵ دەچێت لە هەمان کارگەدا شیرینی دەپێچێتەوە، لەبەرئەوە باش لە مەبەستت تێدەگەم. پورم دەڵێت هەموو بەیانیەک ڕقم لەوەیە بچمە سەر کار.
ـ بەڵام ئەگەر ڕقی لە کارەکەی بێت، ئەوا دەبێت بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕقی لە خۆشی بێت.
ـ بەلایەنی کەمەوە ڕقی لە شیرینییە.
ـ لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا کار بەشێوەیەک ڕێک دەخرێت، کە کرێکار لە ڕاستیدا کاری کۆیلایەتیەکەی بۆ چینێکی تر دەکات. بەم شێوەیەش کرێکار هێزی کاری دەبەخشێت و لێرەشەوە هەموو بوونی مرۆڤانەشی دەخاتە دەستی بۆرجوازەوە.
ـ ئایا بەڕاستی هێندە ترسناکە؟
ـ ئێستاکە لە ڕوانگەی مارکسەوە دەدوێین. دەشبێت پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بهێنینە بەرچاومان... لێرەشەوە دەبێت بە دەنگێکی بەرز هاواربکەین و بڵێین؛ بەڵێ هێندە ترسناک بوو! کرێکارێک، ڕۆژانە دوانزە سەعات لە کارگەیەکی یەکجار ساردوسڕدا کاریدەکرد. موچەی کرێکاریش هێندە کەم بوو، کە منداڵ و ژنی سکپڕیشی ناچاردەکرد کاربکەن. ئەمەش بووە ئەنجامی گرفتێکی کۆمەڵایەتی یەکجار مەزن. لە زۆر شوێنیشدا لەبری بەشێکی کرێی کرێکار، خواردنەوەی خراپیان دەدا بە کرێکاران و ئافرەتانیان ناچاردەکرد ببنە سۆزانی. مشتەریەکانیش پیاوانی بۆرجوازی شاربوون. بەکورتی؛ ڕێک ئەو شتەی کە دەبوایە نرخی مرۆڤی پێ بپێورایە، واتە کارکردن، شێوەیەکی جودای وەرگرت و کرێکارانی خستە جێگەی ئاژەڵانەوە.
ـ ئەمە تەواو تورەم دەکات.

- مارکسیش هەروەها تورە بوو. هاوکاتی ئەم هەموو بارە کۆمەڵایەتیەش، منداڵانی بۆرجوازی لە پاش گەرماوێکی گەرم و خۆش دەچوونە ژورە گەورە و ڕازاوەکانیانەوە و کەمانیان دەژەند، یان دادەنیشتن و پیانۆیان لێدەدا... پاشانیش مێزیان بە چوار جۆر خواردنی جیاوازەوە بۆ دەڕازێنرایەوە. جارجارێکیش پاش ئەسپ سواریەکی دورودرێژ، ئەوجا دەهاتنەوە و کەمان و پیانۆیان لێدەدا.
- چ ناهەقییەکە!
- مارکسیش هەمان بڕوای هەبوو. لە ساڵی 1848دا لەگەڵ ئینجلسدا «مانیفێستی کۆمۆنیستیان (*بانگەوازی کۆمۆنیستیان.و) لە چاپدا. یەکەمین ڕستەی ئەو مانیفێستەش بەم شێوەیە دەست پێدەکات؛ «تارماییەک بەناو ئەوروپادا دەڕوات، تارمایی کۆمۆنیست.»
- تەواو دەترسم.
- بۆرجوازیەکانیش هەروەها دەترسان، لەبەرئەوەی لەو کاتەوە پڕۆلیتاریا دەستی بە شۆڕش کرد. دەتەوێت بزانیت مانیفێستەکە بە چ شێوەیەک کۆتایی دێت؟
- پێشم خۆش دەبێت.
- «کۆمۆنیستەکان پەسەندی ناکەن کە بۆچوون و ئامانجی خۆیان پەردەپۆش بکەن. بەو پەڕی ئاشکراییەوە هاواردەکەن، کە ئامانجیان ڕووخاندنی سەرتاپای ڕژێمی ئێستایە و ئەمەش بەهۆی زەبروزەنگەوە دێتە دی. دەبا چینی سەردەستە لەبەردەم شۆڕشی کۆمۆنیستدا بلەرزێ. لێرەدا پڕۆلیتارەکان تەنها کۆت و زنجیرەکانیان لەدەست دەدەن و جیهانێک دەبەنەوە. ئەی پڕۆلیتاریاکانی جیهان یەکگرن.»

ـ ئەگەر بارودۆخەکەیان ئاوها خراپبووبێت، وەک ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت، ئەوا منیش ئیمزام لەسەر مانیفێستەکەیان دەکرد، بەڵام پێم وابێت ئەمڕۆکە چیتر بەم شێوەیە نیە، وانیە؟
ـ نەخێر، بۆ نمونە لە نەرویجدا وانیە. بەڵام هەموو شوێنێک وەک ئێرە نیە، هێشتام کۆمەڵێک خەڵکانی زۆر لەژێر بارودۆخێکی نامرۆڤانەدا دەژین و لە هەمان کاتیشدا بەرهەمەکانیان سەرمایە دەوڵەمەندتر و دەوڵەمەنتر دەکات. مارکس بەمەی دەگوت «چەوسانەوە.«
ـ دەتوانیت ئەو وشەیە کەمێک زیاتر ڕوونبکەیتەوە؟
ـ کاتێک کرێکارێک شتێک بەرهەم دەهێنێت، ئەوا نرخێکی دیاریکراوی فرۆشتنی دەبێت.
ـ باشە...
ـ ئەگەر کرێی کرێکارەکە و هەموو خەرجیەکانی تری بەرهەمەکە لە بنەکۆی نرخی فرۆشتنی شتەکە دەربکەیت، ئەوا هەمیشە هێندێک پارە دەمێنێتەوە. مارکس بەو پارەیەی دەگوت «زێدەبایی» یان قازانج. واتە سەرمایەدار دەست بەسەر نرخێکدا دەگرێت کە لە ڕاستیدا کرێکار بەرهەمی هێناوە، ئەمەیە کە مارکس پێی دەڵێت چەوسانەوە.
ـ بەڵێ، تێدەگەم.
ـ پاش ئەمە سەرمایەدار دەتوانێت کەمێک لە قازانجەکەی بۆ سەرمایەی تر بەکاربهێنێتەوە، بۆ نمونە بۆ نوێکردنەوەی ئامێری بەرهەمهێنان. ئەم کارەش بەو نیازە بەئەنجام دەهێنێت تا بتوانێت شمەکی هەرزانتر بەرهەم بهێنێت و لێرەشەوە چەند هێندە قازانجەکەی زیاتربکات.
ـ لۆجیکیانەیە.

ـ بەڵێ، پێدەچێت لۆجیکی بێت. بەڵام لە کۆتایدا، چ بەم شێوەیە یان بەهەر شێوەیەکی تر بێت، ئەو شێوەیە نابێت کە سەرمایەدار چاوەڕوانی دەکات.
ـ مەبەستت چیە؟
ـ مارکس لەو بڕوایەدابوو کە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، چەندین لێکدژی ناوخۆیی تێدابێت. سەرمایەداری ڕژێمێکی ئابووریە کە هەر خۆی خۆی لەناودەبات، چونکە بەپێی سەرپەرشتی و جڵەوی ئەقڵ ناڕوات بەڕێوە.
ـ بەڵام ئەمە بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆ چەوساوەکان باشە.
ـ بەڵێ، لەبەرئەوەی کۆتایی سیستمی سەرمایەداری لەناو خودی خۆیدایە. لەم ڕوانگەیەشەوە سەرمایەداری «پێشکەوتوخوازە» یان بەرەوئاییندە دەڕوات ـلەبەرئەوەی قۆناخێکە بۆ گەیشتن بە کۆمۆنیستی.
ـ دەتوانیت نمونەیەکم لەسەر ئەوە بۆ بهێنیتەوە کە سەرمایەداری چۆن خۆی خۆی دەفەوتێنێت؟
ـ لەوەو پێش گوتمان سەرمایەیەک قازانجێکی باش دەکات و کەمێکی بۆ باشکردنی ئامرازی بەرهەمهێنان بەکاردەهێنێت. بێگومان هێندێکیشی بۆ وانەی کەمان ژەندن دەڕوات و جگە لەوەش لەوانەیە خێزانەکەی مەسرەفی گرانبەهای هەبێت.
ـ بەڵێ، ئەی پاشان چی؟
ـ ئامێری نوێ دەکڕێت و لەبەرئەوە پێویستی بەو هەموو کرێکارە نابێت. ئەم کارەش بۆ ئەو مەبەستە دەکات کە «توانای بەربەرەکانێی خۆی لە بازاڕدا زیادبکات.»
ـ باش تێدەگەم.

ـ بەڵام ئەو تەنها کەس نیە کە بەو شێوەیە بیربکاتەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەمیشە دەبێت زنجیرەی بەرهەمهێنان گورج وگۆڵتر بکرێت. کارگەکان گەورەتر دەبن و بەرەبەرە دەکەونە دەستی چەند کەسانێکەوە. ئەوجا چی ڕوودەدات سۆفیا؟

ـ ئممم...
ـ ئەوساکە کەمتر پێویستیان بە هێزی کار دەبێت و لەبەرئەوە بێکار زیاتر و زۆرتر دەبێت. وەک ئەنجامێکیشی ئەمەش گرفتی کۆمەڵایەتی گەشەدەکات، ئەم جۆرە «قەیرانانەش» نیشانەیەکن بۆ نزیکبوونەوەی سەرمایەداری لە کۆتایی. بەڵام چەندین سیمای خۆڕوخێنەری تریش لە سەرمایەداریدا هەیە. بۆ نمونە کاتێک سەرمایەدار ناچاردەبێت بەشێکی زۆری قازانجەکەی بۆ نوێکردنەوەی ئامێری بەرهەمهێنان بەکاربهێنێت، «بەبێ ئەوەی» قازانجە نوێکە هێندە گەورە بێت کە بتوانێت بەرگەی بەربەرەکانێی نرخی بازاڕ بگرێت...
ـ پاشان چی؟
ـ پاشان بە بڕوای تۆ سەرمایەدار چی دەکات؟ دەتوانیت وەڵامم بدەیتەوە؟
ـ نازانم، بەڕاستی نازانم...
ـ وا بهێنە بەرچاوت کە تۆ خاوەنی کارگەیەکیت و ناتوانیت هاوسەنگیەک لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا بدۆزێتەوە و هەڕەشەی ئیفلاسیشت لەسەرە... ئەوجا دەمەوێت بپرسم؛ چی دەکەیت بۆ ئەوەی بتوانیت هەندێ پارە پاشەکەوت بکەیت؟
ـ لەوانەیە موچەی کرێکاران کەم بکەمەوە.

- زیرەکانەیە! لە ڕاستیدا ئەوە زیرەکترین شتە کە بتوانیت بیکەیت. بەڵام ئەگەر هەموو سەرمایەکانی تریش وەک تۆ زیرەک بن -کە واشن- ئەوا کرێکاران هێندە فەقیردەبن کە توانای کڕینی هیچ شتێکیان نامێنێت. لەبەرئەوە دەڵێین؛ توانای کڕین کەم دەبێتەوە و لێرەشەوە دەکەوینە بازنەیەکی خراپەوە. مارکس دەڵێت؛ «لێرەدا سەردەمی موڵکیەتی تایبەتی سەرمایە بەسەر دەچێت». پاش ماوەیەکی کەمیش خۆمان لەباری شۆڕشدا دەبینینەوە.

- ئەوجا چی؟

- بۆ ئەوەی لە کورتی بیبڕینەوە؛ لە کۆتایدا پرۆلیتار شۆڕش دەکات و دەست بەسەر ئامڕازی بەرهەمهێناندا دەگرێت.

- ئەوجا چی ڕوودەدات؟

- بۆ ماوەیەک «چینێکی نوێ» سەرهەڵدەدات و پرۆلیتارەکان بە بەکارهێنانی هێز، بۆرجوازەکان سەرکوت دەکەن. مارکس بەم قۆناخەی دەگوت «دیکتاتۆری پرۆلیتاری». بەڵام پاش ئەم قۆناخە سەرەتاییە، «کۆمەڵگای بێ چین» یان کۆمۆنیست جێگەی دیکتاتۆری پرۆلیتاری دەگرێتەوە. ئەوساکە دەبێتە کۆمەڵگایەک کە ئامڕازی بەرهەمهێنان تێیدا دەبێتە موڵکی هەمووان، واتە خودی خەڵک دەبنە خاوەنیان. لە کۆمەڵگایەکی ئاوهادا هەموو کەسێک «بەپێی توانای کۆمەک دەکات»، بەڵام «بەپێی پێویستیش چێژ دەبینێت». ئەو کاتەش کار بۆ خودی گەل دەکرێت و «بەنامۆبوونەکەی» سەرمایەداریش دەفەوتێت و لەناو دەچێت.

- قەشەنگ دێتە بەرگوێ، بەڵام پاشان چی ڕوویدا؟ هیچ شۆڕشێک بەرپابوو؟

- هەم بەرپابوو و هەم بەرپاش نەبوو. ئابووری ناسەکانی ئەمڕۆکە دەتوانن بیسەلمێنن کە مارکس لە چەندین خاڵی گرنگدا بە هەڵەدا چووە. بە تایبەتیش شیکردنەوەکەی سەبارەت بە قەیرانی سەرمایەداری. هەروەها مارکس زۆر گرنگی بە بەکارهێنانی سروشت نەدەدا –ئەمەش شتێکە کە ئەمڕۆکە زۆر بە قوڵی ڕەچاو دەکرێت. بەڵام، لەگەڵ هەموو ئەم شتانەشدا...
- چی؟
- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مارکسیەت وەرچاخانێکی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. هیچ گومانێکی تێدا نیە کە سۆشیالیزم ماوەیەکی دورودرێژە سەرکەوتوانە توانیویەتی کۆمەڵگایەکی نامرۆڤانە سەرکوت بکات. بەلایەنی کەمەوە ئێستاکە ئێمە لە ئەوروپادا، ئەگەر لەگەڵ ئەو کاتەدا بەراوردی بکەین کە مارکسی تێدا دەژیا، لە کۆمەڵگایەکی دادپەروەریتر و هاودەنگیتردا (*سۆلیداریتردا) دەژین. ئەمەش بە تایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ مارکس و سەرتاپای ئەو بزوتنەوە سۆشیالیستیانەی کە ڕوویاندا.
- ئەوجا چی ڕوویدا؟
- پاش مارکس، بزوتنەوەی سۆشیالیستی خۆی بەسەر دوو بەشی گەورەدا دابەشکرد؛ لەلایەک «سۆشیال دیموکرات» و لەلایەکی ترەوە «لینینیزم». سۆشیال دیموکراتەکان دەیانەویست بە شێوەیەکی هێمن و ئاشتی خوازانە لە سۆشیالیزم نزیک ببنەوە، ئەمەش بووە ئەو ڕێگایەی کە ئەوروپای خۆرئاوا هەڵیبژارد. دەتوانین پێی بڵێین «شۆڕشێکی لەسەرخۆ». بەڵام لینینیزم، کە پارێزگاری بڕوای مارکسی دەکرد و بەبڕوای ئەوان تەنها لە ڕێگەی شۆڕشەوە ململانێی کۆمەڵگای چینایەتی کۆن دەکرێت، لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و ئاسیا و

ئەفریقادا بڵاوبووەوە. لە ڕاستیدا هەریەک لەو دوو بەشەش، هەریەک بە شێوەی خۆی، دژ بە چەوسانەوە و نەهامەتی تێدەکۆشان.

ـ بەڵام ئایا ئەمە شێوەیەکی نوێی چەوسانەوەی نەخوڵقاند؟ بۆ نموونە لە یەکێتی سۆفێت و ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا؟

ـ بێگومان، لێرەشدا دیسانەوە دەبینین کە هەموو شتێک کاتێک کە دەگاتە دەستی مرۆڤ، دەبێتە تێکەڵەیەک لە باشە و خراپە، ئەمە لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە ناهەقانەیە گەر پاش پەنجا یان سەد ساڵ لەدوای مردی مارکس، بێین و ئۆباڵی هەموو ئەو بارە نالەبارانە بخەینە ئەستۆی مارس، کە لەناو ئەو وڵاتانەدا دەبینرێت کە پێیان دەگوترێت وڵاتانی سۆشیالیستی. لەوانەیە مارکس ڕەچاوی نەکردبێت کە لە کۆمۆنیستیشدا مرۆڤ کارەکان بەڕێوە دەبەن. شتێکی وەک «وڵاتی ئاسوودەیش» هەرگیز نایەتە دی. مرۆڤ هەمیشە گرفتی نوێ دەخوڵقێنێت و بەربەرەکانێی لەسەر دەکات.

ـ بێگومان.

ـ لێرەشدا کۆتایی بە باسی مارکس دەهێنین، سۆفیا.

ـ بە یارمەتیت کەمێک بوارم بدە! تۆ نەتگوت هەق تەنها لە نێو خەڵکانی هاوتای یەکدا بوونی هەیە؟

ـ نەخێر، ئەوە سکرووج بوو کە وای گوت.

ـ چۆن دەزانیت کە ئەو بوو؟

ـ ئمم... من و تۆ هەمان نووسەرمان هەیە. لە ڕاستیدا ئێمە زۆر توندتر پێکەوە گرێدراوین، وەک لەوەی بەسەرزارەکی دەبینرێت.

ـ دیسانەوە تۆ و ئایرۆنیەکەت!

ـ دووجار ئایرۆنیە سۆفیا؛ ئەوەی کە گوتم دوو مانای هەیە.

ـ هەرچۆنێک بێت با بگەڕێینەوە سەر بابەتی هەقانیەکەمان... تۆ گوتت مارکس لەو بڕوایەدابوو کە سەرمایەداری کۆمەڵگایەکی ناهەقانی خوڵقاندووە. تۆ بە چ شێوەیەک پێناسەی کۆمەڵگایەکی هەقانی دەکەیت؟

ـ جۆن ڕاوڵس «John Rawls» یەکێک بوو لە فەیلەسوفە ئەخلاقیەکان و کارگەری مارکسیشی لەسەربوو، بەم نمونەیەی خوارەوە دەیەوێت شتێک لەو بارەیەوە باس بکات؛ وا بهێنە بەرچاوت کە تۆ ئەندامی لیژنەیەکی گشتی بەرزیت و هەمووتان پێکەوە دەتانەوێت هەموو یاساکانی کومەڵگایەکی نوێ دیارییبکەن.

ـ حەز دەکەم لە لیژنەیەکی ئاوها بەرزدا بەشداربم!

ـ ئەندامەکان ناچاردەبن بیر لە هەموو بوارەکان بکەنەوە (چونکە هەر کە تەبابوون —واتە کاتێک دەنگیان لەسەر یاساکان دا- ئەوا دەکەون و دەمرن).

ـ چ ترسناکە!

ـ بەڵام دیسانەوە یەکسەر لەنێو ئەو کۆمەڵگایەدا خەبەریان دەبێتەوە کە یاساکانیان بۆ دارِشتووە. مەبەستەکە لەوەدایە کە نازانن چ «ڕۆڵێکیان» لەو کۆمەڵگایەدا دەبێت.

ـ ئمم، بەو جۆرە.

ـ کۆمەڵگایەکی ئاوها هەقانی دەبێت، لەبەرئەوەی لەنێو «پیاوانی هاوتای یەکدا» سەرهەڵدێنێت.

ـ ئەی ئافرەتان؟

ـ بێگومان ئەوە خاڵێکی بنچینەی یاریەکەیە. کەس نازانێت وەک پیاو خەبەریدەبێتەوە یان وەک ئافرەت. لەبەرئەوەی هەردوو بوارەکە وەک

یەک کراوەیە، کەواتە کۆمەڵگا ناچاردەبێت بۆ پیاو و بۆ ئافرەتیش وەک یەک باشبێت.
ـ بیرۆکەیەکی سەرنج ڕاکێشەرە.
ـ ئێستاکە پێم بڵێ، ئایا ئەوروپا لە سەردەمی مارکسدا کۆمەڵگایەکی ئاوهابوو؟
ـ نەخێر!
ـ ئایا دەتوانیت ئەمڕۆکە کۆمەڵگایەکی ئاوها لە جیهاندا دەست نیشانبکەیت؟
ـ ئمم... پرسیارێکی بە جێیە.
ـ هەوڵبدە زیاتر بیری لێبکەیتەوە. لێرەشدا کۆتایی بە باسی مارکس دێنین.
ـ چیت گوت؟
ـ بەشێکی نوێ!

## ... بە بارێکی پڕ لە «جین»ەوە بەنێو ژیاندا تێدەپەڕین ...

بەیانی ڕۆژی یەکشەممە، هیلدە بە دەنگێکی گەورە خەبەری بووەوە... مەلەفە گەورەکەبوو کەوتە خوارەوە. دوێنێ، هەتا ئەو کاتەی لەسەر پشت خەوی لێکەوتبوو، لەسەر جێگاکەی پاڵکەوتبوو و لە زمانی سۆفیا و ئەلبێرتۆوە دەربارەی مارکسی دەخوێندەوە. پاشان مەلەفەکەی لەسەر سەرینەکەی دانابوو. گڵۆپی سەر جێگاکەشی بەدرێژایی شەو بە داگیرساوی مابووەوە.

کاتژمێری سەر مێزەکەی بە ڕەنگی سەوز ژمارەی **8،59**ی نیشاندەدا.

دوێنێ شەو خەونی بە کارگەی گەورە و شاری مەزنی دوکەڵاویەوە بینی. لە سوچی شەقامێکیشدا کچێکی بچکۆلانە دانیشتبوو و شقارتەی دەفرۆشت، چەندەها کەسی جل و بەرگ جوانیش بەلایدا تێدەپەڕین، بەڵام نەیان دەبینی.

هیلدە لەسەر جێگاکەی هەستا و یەکسەر بیری لەو یاسادانەرانە کردەوە کە لە کۆمەڵگاکەی خۆیاندا یاساکانیان دادەڕێژن و دواتر خەبەریان دەبێتەوە. بەڵام هیلدە دڵی بەوە خۆشبوو کە لە بیرکێڵیدا خەبەری بۆتەوە.

ئەگەر نەیزانیبایە لە چ شوێنێکی نەرویجدا خەبەری دەبێتەوە، بڵێیت ئەوساکە بیوێرایە هەستێت لە خەو؟

بەڵام پرسیارەکە تەنها لەوەدا نەبوو لە «چ شوێنێکدا» خەبەری ببێتەوە، بەڵکو ڕێشی تێدەچوو لە کاتێکی تەواو جیاوازیشدا خەبەری ببێتەوە. بۆ نمونە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، یاخود لە چاخە بەردینەکاندا و پێش دەیان هەزار ساڵ لەمەوبەر؟ هیلدە هەوڵی دەدا

**مەزەنەی ئەوە بکات کە لەبەردەم دەرکی ئەشکەوتێکدا دانیشتووە و خەریکی خۆشکردنی پێستی ئاژەڵێکە.**
**ئاخۆ کاتی خۆی پێش ئەوەی هیچ کەلتورێک هەبووبێت، ژیانی کچێکی پانزە ساڵان چۆن چۆنی بووبێت؟ ئەگەر هیلدە لەو کاتەدا بژیبایە، ئاخۆ بە چ شێوەیەک بیری بکردایەتەوە؟**
**هیلدە بلوسێکی لەبەرکرد و مەلەفە گەورەکەشی ڕاکێشایەوە سەر جێگاکەی. بە ڕاشکاوی بۆی دانیشتەوە و لەسەر خوێندنەوەی نامە دور و درێژەکەی باوکی بەردەوام بوو.**

ئەلبێرتۆ گوتی «بەشێکی نوێ» و لەو کاتەدا یەکێک لە دەرگای کوخەکەی مێجەری دا.
ـ پێم وابێت هیچ چارەیەکمان نیە؟ سۆفیا گوتی.
ـ نەخێر، نیمانە... ئەلبێرتۆ وەڵامی دایەوە.
لەسەر پلیکانەکانی بەردەرگاکە، پیاوێکی پیری سەروڕیش سپی وەستابوو. گۆچانێکی بەدەستی ڕاستیەوە گرتبوو و پۆستەرێکی گەورەش بە دەستی چەپیەوە، پۆستەرەکە وێنەی بەلەمێکی تێدا بوو. هەرچی کون و قوژبنی ناو بەلەمەکەشە، پڕبوو لە چەندەها جۆری ئاژەڵ و جمەیان دەهات... ئەوجا ئەلبێرتۆ لێی پرسی؛
ـ ئەی ئەم پیاوە پیرە کێیە؟
ـ ناوم "نوح"ە.
ـ مەزەندەم دەکرد.
ـ باپیرە هەرە گەورەکەتم، کوڕەکەم. بەڵام لەوە دەچێت چیتر باو نەبێت ڕەچەڵەکی خۆت بناسیت؟
ـ ئەی ئەوە چیە بە دەستتەوە؟ سۆفیا پرسی.

- ئەمە وێنەی هەموو ئەو ئاژەڵانەیە کە لە لافاوە گەورەکەدا ڕزگارکران. فەرموو کچەکەم، ئەمە بۆ تۆیە.
سۆفیا پۆستەرە گەورەکەی وەرگرت و ئەوجا پیاوە پیرەکە گوتی؛
- باشتر وایە بگەڕێمەوە ماڵەوە و دار مێوەکانم ئاو بدەم...
پاش ئەوە کەمێک هەڵبەزیەوە و لە ئاسماندا هەردوو قاچی لەیەکدا، ئەوجا بە دڵێکی خۆشەوە بەنێو دارستانەکەدا بۆی دەرچوو... دەتگوت هەر تەنها پیاوێکی پیری دڵخۆشی وەکو ئەو دەتوانێت شتێکی ئاوها بکات.
سۆفیا و ئەلبێرتۆ دیسانەوە ڕۆیشتنەوە ژوورەوە و دانیشتنەوە. سۆفیا تەماشای پۆستەرە گەورەکەی کرد، بەڵام پێش ئەوەی بتوانێت زۆر لێی ورد ببێتەوە، ئەلبێرتۆ لەدەستی سەند و گوتی؛
- دەبێت لە پێشدا سەرنج بخەینە سەر هێڵە گەورەکان.
- فەرموو دەست پێبکە!
- لەیادمان چوو بڵێین مارکس دواهەمین 34 ساڵی ژیانی لە لەندەندا بەسەر برد. لە ساڵی 1849دا گواستیەوە بۆ ئەوێ و لە ساڵی 1883دا مرد. بەدرێژایی ئەو ماوەیەش چارلس داروین «Charles Darwin» لە دەرەوەی لەندەندا دەژیا. لە ساڵی 1882دا مرد و بە شکۆوە وەک کوڕێکی مەزنی ئینگلتەرا لە "وێست مینیستەر ئابی"دا نێژرا. ڕێگەی مارکس و داروین دەچووەوە سەر یەک، ئەمەش تەنها بەهۆی ئەوەوە نەبوو کە لەیەک دەم و جێدا دەژیان، بەڵکو مارکس خۆی دەیویست شاکارە گەورەکەی کە ناوی «سەرمایە»یە پێشکەشی داروینی بکات، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە. کاتێکیش مارکس ساڵێک دوای داروین مرد، فریدریک ئینجلسی برادەری گوتی؛ «هەروەک چۆن داروین یاساکانی

گەشەکردنی ئەندامیی سروشتی دۆزیەوە، مارکسیش بە هەمان شێوە یاساکانی پێشکەوتنی مێژووی مرۆڤایەتی دۆزیەوە.«

ـ شتێکی کەممان لە بیر نەچووبوو!

ـ بیرمەندێکی گرنگی تریش کە دەیویست کارەکانی بە داروینەوە ببەستێتەوە، "سیگمۆند فرۆید«Sigmund Freud» "ی زانای دەروونناس بوو. ئەویش دواهەمین ساڵەکانی ژیانی لە لەندەندا بەسەربرد. فرۆید دەیگوت؛ تیۆری گەشەکردنی داروین و تیۆری شیکردنەوە دەروونیەکەی خۆی، بووە هۆی ڕسواکردنی «خۆپەرستی ساویلکانەی» مرۆڤ.

ـ ئەو هەموو ناوە زۆرانە! لێرەدا باسی مارکس و داروین و فرۆید دەکەین، وا نیە؟

ـ بە تێگەیشتنێکی فراوانتر دەتوانیت بڵێین، باس لە بزوتنەوەیەکی «سروشتیانە» دەکەین کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا دەستی پێکرد و هەتاوەکو زۆربەی ئەم سەدەیەی خۆشمان دەگرێتەوە. مەبەستمان لە «سروشتیانە»ش ئەو شێوە تێگەیشتنی هەقیقەتەیە کە جگە لە سروشت و جیهانی هەست پێکراو زیاتر، دان بە هیچ جۆرە هەقیقەتێکی تردا نانێت. لەبەرئەوە کەسێکی «سروشتی»، وەک بەشێکی سروشت تەماشای مرۆڤ دەکات. لێکۆڵەرەوەیەکی سروشتیش بەپلەی یەکەم، پشت بەو هەقیقەتانە دەبەستێت کە سروشت دەیبەخشێت، واتە نە بە بیرکردنەوەی ڕاشیونالیستی و نە بە هیچ جۆرە سروشتێکی خودایی متمانە دەکات.

ـ ئەمەش مارکس و داروین و فرۆیدیش دەگرێتەوە، وا نیە؟

ـ بێگومان. لە ناوەڕاستی سەدەی پێشووەوە، وشە دیارەکان «سروشت» و «مێژوو» و «گەشەکردن» و «نەشونماکردن» بوون. مارکس ئاماژەی

بۆ ئەوە دەکرد کە ئایدۆلۆجی مرۆڤ، بەرهەمێکی ژێرخانی مەتریالی کۆمەڵگایە، داروینیش وای دەبینی کە مرۆڤ ئامانجی گەشەکردنێکی دورو درێژی بایۆلۆجی بێت و لێکۆڵینەوەکانی فرۆیدیش لەسەر نائاگایی، نیشانی دا کە هەڵسوکەوتی مرۆڤ زۆر جار سەرچاوە لە هەندێ ماکی «ئاژەڵییەوە» وەردەگرێت.

- پێم وابێت تا ڕادەیەک تێدەگەم مەبەستت لە «سروشتی» چیە، بەڵام ئایا باشترێک نیە گەر یەکە یەکە باسیان بکەین؟

- دەربارەی داروین باسدەکەین، سۆفیا. لەوانەیە لەیادت بێت کاتێک فەیلەسوفە پێش سوکراتیەکان دەیانویست «لێکدانەوەیەکی سروشتی» بۆ پرۆسێسی سروشت بدۆزنەوە. هەروەک چۆن ئەوان دەبوایە خۆیان لە بیروڕای کۆنی میتۆلۆژیا ڕزگاربکردایە، بە هەمان شێوەش داروین کاتێک دەهاتە سەر باسی خوڵقاندنی مرۆڤ و ئاژەڵ، دەبوایە خۆی لە دونیا بینینی کڵێسە سەربەست بکردایە.

- بەڵام ئایا لە ڕاستیدا ئەو فەیلەسوف بوو؟

- داروین زانای بایۆلۆجی و توێژەرەوەی سروشت بوو. بەڵام داروین ئەو زانا زانستیەی سەردەمی نوێیە، کە دەربارەی شوێنی مرۆڤ لە تیۆری خوڵقاندنی ئاینی مەسیحیدا، گەورەترین بەربەرەکانێی دیدەی مەسیحیەتی دەکرد.

- کەواتە وا باشترە کە کەمێک دەربارەی تیۆری گەشەکردنی داروین باس بکەیت.

- لە خودی داروین خۆیەوە دەست پێدەکەین. لە ساڵی 1809 لە شاری چکۆلەی «شریوسبێری Shrewsbury» دا لەدایک بوو. باوکی، دکتۆر ڕۆبەرت داروین، پزیشکێکی ناسراوی ناوچەکە بوو، وە لە پەروەردەکردنی کوڕەکەیدا زۆر توند و تیژ بوو. کاتێک چارلس هەر

لەو شارەدا دەچووە قوتابخانە، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی دەیگوت داروین هەمیشە دەخولێتەوە و کاری نابەجێ دەکات، قسەی قۆڕ و بێمانا دەکات و هیچ شتێک ناکات کە سوودێکی هەبێت. «سوود»، لەلای بەڕێوەبەرەکەی مانای لەبەرکردنی فەرمانەکانی زمانی لاتینی و یۆنانی بوو. «دەخولێتەوە و کاری نابەجێدەکات»، مەبەستی لەوەبوو چارلس بەدوای مێرووەدا ڕایدەکرد و دەیگرتن.

ـ بێگومان پاشان بەڕێوەبەرەکەی لە قسەکانی پەشیمان بووەوە.

ـ داروین لەکاتی خوێندنی تیۆلۆجیشدا خولیای سەرنجدانی باڵندە و کۆکردنەوەی مێروو بوو، هەر لەبەر ئەو هۆیانەش پلەی بەرزی لە تاقیکردنەوەکانی تیۆلۆجیدا نەهێنا. بەڵام هێشتام لە کاتی خوێندنی تیۆلۆجیدا بوو کە تاڕادەیەک وەک توێژەرەوەیەکی سروشتی ناوبانگی دەرکردبوو. بەتایبەتیش گرنگی بە جیۆلۆجی دەدا، کە لەو کاتەدا بڵاوترین زانست بوو. لە ساڵی 1831دا خوێندنی تیۆلۆجی لە "کامبریج" تەواوکرد، ڕێک پاش ئەوە بەرەو باکوری "وێڵس" سەفەریکرد و دەستیکرد بە خوێندنی پێکهاتەی بەردەکان و بەدوای گیانەوەر و ڕووەکی «بەبەردبوو»دا دەگەڕا. لە مانگی هەشتی هەمان ساڵدا، کاتێک کە 22 ساڵان بوو، نامەیەکی بۆ هات و هەموو ژیانی وەرچەرخاند...

ـ لە نامەکەدا چی نووسرابوو؟

ـ نامەکە لە "جۆن ستیفن هێنسلۆ"ی برادەر و مامۆستایەوە هاتبوو. ئەو نووسیبووی؛ «داوام لێکراوە کە... توێژەرەوەیەکی سروشتی هەڵبژێرم بۆ ئەوەی لەگەڵ کابتن "فیتزرۆی"دا بڕوات، کە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ وێنە کێشانی نەخشەی قەراخ دەریاکانی ئەمریکای باشور ڕەوانە دەکرێت. منیش پێم ڕاگەیاندن کە تۆ باشترین کەسیت کە توانای

جێبەجێکردنی ئەم کارەی هەبێت. دەربارەی موچەش، هیچ زانیاریەکم لا نیە. سەفەرەکە دوو ساڵ دەخایەنێت....»
ـ چۆن دەتوانیت ئەو هەموو شتە لەبەر بڵێیت؟
ـ ئەرزشی نیە، سۆفیا.
ـ بەهەرحاڵ، ڕازی بوو؟
ـ زۆر بەپەرۆش بوو بۆ ئەوەی ئەو هەلە لەدەست نەدات، بەڵام ئەو کاتە پیاوانی گەنج بەبێ ڕاوێژکاری دایک و باوک، هیچ شتێکیان نەدەکرد. پاش گێرمە و کێشەیەکی زۆر، باوکی ڕازی بوو –دەبوایە هەر ئەویش خەرجی سەفەری کوڕەکەی بدایە، لەبەرئەوەی پاشان «دەربارەی موچەکە» ڕوونبوەوە کە هیچیان نەدەدایە.
ـ ئۆی...
ـ کەشتیەکە سەربە هێزی دەریایی بوو و ناوی «ه.م.س. بیگڵ H.M.S. Beagle» بوو، لە بەرواری 1831/12/27دا لە «پلایماوس»ەوە بەرەو باشوری ئەمریکا کەوتە ڕێ و هەتاوەکو مانگی نۆی 1836 نەگەڕایەوە بۆ بەریتانیا. واتە دوو ساڵەکە بوو بە پێنج ساڵ، بەڵام گەشتەکەی باشوری ئەمریکاش بوو بە گەشتێک بە دەوری هەموو جیهاندا. ئەمەش بوو بە یەکێک لە هەرە گرنگترین گەشتە پشکنەرەکانی سەدەی نوێ.
ـ بەڵام ئایا بە مانای وشە بە چواردەوری زەویدا سەفەریان کرد؟
ـ بەڵێ، بە مانای وشە. گەشتەکەیان لە ئەمریکای باشورەوە دەستی پێکرد و بەناو «ئۆقیانوسی ئارامدا» بەرەو نیوزلەندا ڕۆیشتن، پاشان بۆ ئوستراليا و باشوری ئەفریقا. لەوێشەوە پێش ئەوەی دیسانەوە بگەڕێنەوە بۆ بەریتانیا، جارێکی تریش بەرەو باشوری ئەمریکا ڕۆیشتنەوە. پاشان داروین سەبارەت بەمە نووسی؛ «بێگومان گرنگترین ڕووداوی ژیانم ئەو گەشتە بوو کە لەگەڵ "بیگڵ"دا کردم.»

ـ پێم وابێت لێکۆڵەرەوەیەکی سروشتی لەناو ئاودا، کارێکی سەختە.
ـ ساڵی یەکەم "بیگڵ" لە قەراغ ئاوەکانی باشوری ئەمریکادا دەهات و دەچوو، ئەمەش شارەزاییەکی باشی دەربارەی کیشوەرەکە و وڵاتەکانی بە داروین بەخشی. لەلایەکی تریشەوە گەڕانی قەراخ دەریاکانی ئەو هەموو دوورگانەی «گالاپاگۆس»Galapagos ، کە کەوتۆتە ناو ئۆقیانوسی ئارام و لەبەشی ڕۆژئاوای ئەمریکای باشوردایە، گرنگیەکی تایبەتی خۆی هەبوو. لەوێدا توانی چەندەها شتی گرنگ کۆبکاتەوە و پاشانیش ڕەوانەی بەریتانیای بکاتەوە، بەڵام تێبینیەکانی دەربارەی سروشت و مێژووی ژیانی زیندەوەرەکانی لەلای خۆی هێشتەوە. هەر لەتەمەنی 27 ساڵیدا کە گەڕایەوە ماڵەوە، وەک توێژەرەوەیەکی سروشتی ناوبانگی دەرکردبوو. لەو کاتەشدا بیرۆکەیەکی ڕوونی سەبارەت بە تیۆری گەشەکردنی لە مێشکدا گەڵاڵە بووبوو، بەڵام داروین پیاوێکی وریا بوو، سۆفیا. لێکۆڵەرەوەیەکی سروشتیش دەبێت زۆر وریا بێت.
ـ شاکارەکانی ناوی چیە؟
ـ لە ڕاستیدا چەندین شاکاری هەیە، بەڵام ئەو کتێبەی لە بەریتانیادا توند وتیژترین گفتوگۆی لەسەرکرا، ناوی «ڕەچەڵەکی ڕەگەزەکانە» کە لە ساڵی 1859دا لە چاپدرا. ناوی تەواوی کتێبەکە بەم جۆرە بوو؛ «دەربارەی ڕەچەڵەکی ڕەگەزەکان لە ڕێگەی هەڵبژاردنی سروشتیەوە یان مانەوەی ڕەگەزە هەرە باشەکان لە ململانێی مانەوە لە ژیاندا». لە ڕاستیدا ناونیشانە درێژەکەی، کورتکراوەیەکی هەموو تیۆریەکەیەتی.
ـ بە ڕاستی مانای زۆری خنیوەتە ناو ناونیشانەکەیەوە.

ـ بەڵام با بەش بەش بێینە سەر باسکردنیان. لە «ڕەچەڵەکی ڕەگەزەکاندا»، داروین دوو تیۆری یان دوو بیرۆکەی سەرەکی دەخاتە ڕوو؛ لە یەکەمیاندا دەڵێت هەموو ئەو ڕووەک و ئاژەڵانەی کە ئێستاکە دەژین، لە فۆرمی پێشووتر و سەرەتایی ترەوە هاتوون و بەبڕوای ئەو گەشەکردنێکی بایۆلۆجی ڕوودەدات. دووهەمیشیان دەیگوت؛ گەشەکردن بەهۆی «هەڵبژاردنی سروشتیەوە» ڕوودەدات.
ـ بەهێزترین دەمێنێتەوە، وا نیە؟
ـ بەڵێ، بەڵام با لەپێشدا سەرنج بخەینە سەر تیۆری گەشەکردنەکەی. لە ڕاستیدا زۆر نوێ نەبوو، لەبەرئەوەی بڕواکردن بە گەشەکردنێکی بایۆلۆجی، هەر لە ساڵی 1800وە لە زۆربەی شوێنەکاندا بڵاوبووبووەوە. زانای گیانەوەرناسی فەڕەنسی «لامارک Lamarck» یەکێک بوو لە دەنگە هەرە دیارەکان. لەپێش ئەویشەوە باپیرە گەورەی داروین خۆی، ئیراسمۆس داروین «Erasmus Darwin» مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد کە ڕووەک و گیانلەبەرەکان لە چەند ڕەگەزێکی سەرەتاییەوە گەشەیانکردووە. بەڵام کەسیان نەیانتوانی لێکدانەوەیەکی پەسەندکراو بهێننەوە و کەسیشیان نەیانتوانی چۆنیەتی گەشەکردنێکی ئاوها ڕوونبکەنەوە، لەبەرئەوە پیاوانی کڵێسە وەک هەڕەشەیەکی گەورە تەماشایان نەدەکردن.
ـ بەڵام داروینیان وەک هەڕەشەیەکی گەورە دەبینی؟
ـ بەڵێ، ئەوەش بێ هۆ نەبوو، چونکە خەڵکانی کڵێسە و هەندێک لە پیاوانی زانستیش بڕوایان بە تیۆریەکەی تەورات هەبوو کە دەیگوت هەموو ڕووەکە جیاوازەکان و ڕەگەزە گیانەوەریەکان نەگۆڕن. واتە لەو بڕوایەدا بوون کە هەر تاکە ڕەگەزی گیانەوەرێک بە شێوەیەکی تایبەتی، یەک کەڕەت و بۆ هەتاهەتایە خوڵقێنراوە. ئەم جۆرە

تێگەیشتنەی ئاینی مەسیحیش لەگەڵ تیۆری پلاتۆن و ئەریستۆتالیسدا هاوئاهەنگە.

- چۆن؟

- تیۆری "بیر"ی پلاتۆن دەیگوت هەموو ڕەگەزی گیانەوەرەکان نەگۆڕن، لەبەرئەوەی لەسەر "بیر"ی یان "فۆرمی" هەتاهەتایی دروستکراون. هەروەها نەگۆڕانی ڕەگەزی گیانەوەرەکان، یەکێک لە کۆڵەکەکانی فەلسەفەی ئەریستۆتالیسیش بوو. بەڵام ڕێک لە کاتی داروینداچەندین چاودێریکردنی وردیان ئەنجامدا و چەندەها شتی دۆزراوەیان هێنایە پێشەوە کە ڕاست و دروستی ئەو جۆرە بیروڕا کۆنانەیان پێ هەڵدەسەنگاند.

- چ جۆرە شتێکی دۆزراوە و چ چاودێریکردنێکیش؟

- لەپێش هەموو شتێکدا چەندین ڕووەک و گیانەوەری بەبەردبوویان خستە ڕوو، لەسەرو ئەوەشەوە چەندین ئێسقانی گەورەی گیانەوەری فەوتاویان دۆزیەوە. داروین خۆی تەواو سەری لەوە سوڕمابوو کە پاشماوەی گیانەوەری ئاوی لەسەر زەوی و لە شوێنێکی دور لە ئاوەوە دۆزیەوە. وەک ئەو پاشماوانەی کە لەسەر لوتکەی شاخەکانی "ئاندەس"دا لە ئەمریکای باشوردا دۆزیانەوە. بەڵام گیانەوەری ئاوی لەسەر لوتکەی ئاندەسدا چی دەکات، سۆفیا؟ دەتوانیت وەڵامم بدەیتەوە؟

- نەخێر.

- هەندێک کەس زۆر بەئاسانی لەو بڕوایەدابوون کە مرۆڤ فڕێی دابنە ئەو شوێنانەوە، یان دەیانگوت لەوانەیە لە ڕێگەی گیانەوەرەوە گواسترابنەوە. بە بڕوای هەندێ لە خەڵکانی تریش خودا پاشماوەی

ئەو گیانەوەرە ئاویانە و ئەو گیانەوەرە بەبەردبووانەی بۆیە خستۆتە ئەوێوە، تا بێ ئیمانەکان بە ڕێگای هەڵەدا بەرێت.
ـ ئەی زانست لە چ بڕوایەکدا بوو؟
ـ زۆربەی جیۆلۆجیەکان سەرنجیان بەلای «تیۆری کارەسات»دا دەچوو، کە دەڵێت لەوەوپێش زەوی چەندین جار کارەساتی گەورە گەورەی وەک بومەلەرزە و لافاوی مەزنی بەسەردا هاتووە کە هەموو ژیانی سەر زەوی سڕیوەتەوە. لە تەوراتیشدا ناوی یەکێک لەو جۆرە کارەساتانە هاتووە؛ مەبەستم لە لافاوی گوناحە گەورەکە و پاپۆڕەکەی نوحە. لە دوای هەموو کارەساتێکیشەوە خودا ژیانی سەر زەوی نوێ کردۆتەوە و ئەمەشی لە ڕێگەی خولقاندنی ڕووەک و گیانەوەری نوێتر و گونجاوترەوە کردووە.
ـ کەواتە گیانەوەرە بەبەردبووەکان شوێن پەنجەی ژیانی کۆنترن، کە بەهۆی کارەساتی مەزنەوە لەناوچوون، وا نیە؟
ـ ڕاستە، بۆ نمونە دەیانگوت گیانەوەرە بەبەردبووەکان شوێن پەنجەی ئەو گیانەوەرانەن کە لە پاپۆڕەکەی نوحدا جێگەیان نەکراوەتەوە. بەڵام کاتێک داروین گەشتەکەی دەست پێکرد، بەشی یەکەمی کتێبی «پرێنسیپی جیۆلۆجیا»ی "چارلس لایللس"ی زانای جیۆلۆجی بەریتانی لەگەڵ خۆیدا برد. ئەو پێی وابوو کە جیۆلۆجی ئەمڕۆکەی زەوی —بە هەموو شاخی بەرز و دۆڵی پانیەوە- لە ئەنجامی گەشەکردنێکی دور ودرێژەوە هاتبێت. مەبەستی لەوە بوو تەنانەت گۆڕانکاریە پچکۆلەکانیش لەوانەیە ببنە هۆی وەرچەرخانی گەورەی جیۆلۆجی، بە مەرجێک گەر ئەو ماوە دورو درێژە لەبەرچاو بگرین کە بەسەریدا تێپەڕیوە.
ـ بیری لە چ گۆڕانکاریەک دەکردەوە؟

ـ بیری لە هەمان ئەو هێزانە دەکردەوە کە ئەمڕۆکەش هەر هەن؛ بۆ نمونە ئاو و هەوا و با، یان بەفر کە دەتوێتەوە، بومەلەرزە و بەرزبوونەوەی ئاستی زەوی. پەندێک هەیە دەڵێت دڵۆپی ئاو بەرد کون دەکات ـنەک بەهۆی هێزەکەیەوە، بەڵکو بەهۆی بەردەوامیەکەیەوە. لە ڕوانگەی "لایللس"ەوە ئەو جۆرە گۆڕانکاریە چکۆلە و هێواشانە، بە تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر دەتوانن بەتەواوەتی سروشت بگۆڕن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تیۆریە بە تەنها نەیتوانی وەڵامی داروین بداتەوە و هۆی دۆزینەوەی پاشماوەی گیانەوەری ئاوی لەسەر لوتکەی شاخی ئاندەسدا بۆ لێکنەدایەوە، بەڵام داروین هەمیشە ئەم بیرکردنەوەیەی لەیادبوو؛ «گۆڕانکاری چکۆلە و هێواش، دەکرێت ببێتە هۆی گۆڕانکاری مەزن، بەمەرجێک کات ڕەچاوبکرێت.»
ـ لەوانەیە بیری لەوە کردبێتەوە کە جۆرە تیۆریەکی ئاوها بەسەر گەشەکردنی گیانەوەرانیشدا بچەسپێت؟
ـ بەڵێ، هەر بە هەمان شێوەش مەزەنەی دەکرد، بەڵام هەروەک لەوەوپێش گوتمان؛ داروین پیاوێکی وریا بوو. بۆ ماوەیەکی دورو درێژ پرسیارەکانی دەخستە ڕوو، بەبێ ئەوەی بوێرێت وەڵامیان بداتەوە. لە ڕاستیدا هەروەک هەموو فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە هەمان میتۆدی بەکاردەهێنا؛ واتە پرسیارکردن گرنگە، بەڵام هەموو کات پێویست ناکات پەلەی وەڵام دانەوەت بێت.
ـ بە کورتی زۆر بە ئارام بووە.
ـ هۆکارێکی گرنگی تیۆریەکەی لایللس، تەمەنی زەوی بوو. لەسەردەمی دارویندا باوبوو دەیانگوت خودا نزیکەی 6000 ساڵێک لەمەوبەر زەوی خوڵقاندووە. ئەو ژمارەیەشیان لە ئەنجامی ژماردنی

هەموو نەوەکانەوە دەرهێنابوو، هەر لە ئادەمەوە هەتاوەکو سەردەمی داروین.
- چەندە ساویلکانەیە!
- ئاسانە لەپاش ڕووداو زیرەک بیت! داروین خۆی تەمەنی زەوی بە 300 ملیۆن ساڵ دادەنا. لەبەرئەوەی بەلایەنی کەمەوە یەک شت ئاشکرابوو؛ ئەگەر ئەو کاتە دورو درێژە ڕەچاونەکرێت، ئەوا نە تیۆری گەشەکردنی هێواشی لايللس و نە تیۆری گەشەکردنی داروینیش، هیچ مانایەکی نەدەبەخشی.
- ئەی تەمەنی زەوی چەندە؟
- ئەمڕۆکە لەو باوەڕەداین تەمەنی زەوی 4،6 ملیارد ساڵ بێت.
- چ زۆرە...
- تاوەکو ئێستاکە، سەبارەت بە گەشەکردنی بایۆلۆجی، یەکێک لە بەڵگەکانی داروینمان باسکردووە، ئەویش «کەڵەکە بوونی توێ توێی گیانەوەرە بەبەردبووەکان»ی ناو تاشە بەردە جیاوازەکانە. بەڵگەیەکی تریشی، «دابەشبوونی جوگرافی» ڕەگەزە زیندووەکان بوو. لێرەدا لێکۆڵینەوەکانی گەشتەکەی داروین، دەستگیرۆییەکی زانیاری هێجگار دەوڵەمەند و نوێی پێبەخشی. بە چاوی خۆی دەیبینی کە ڕەگەزی گیانەوەرەکان لەیەک ناوچەدا، جیاوازیەکی یەکجار کەمیان لە نێواندایە. بەتایبەتیش لە دوورگەکانی گالاپاگۆسدا کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئێکوادۆرەوە، لەوێدا چەند سەرنجێکی یەکجار گرنگی دا.
- ئەو سەرنجانە چی بوون؟
- ئەو کۆمەڵە دوورگەیە بورکانین و لەیەکەوە نزیکن، لەبەرئەوە جیاوازیەکی گەورەیان لە نێوان ژیانی ڕووەک و گیانەوەرەکانیدا نەبووە. بەڵام داروین ڕێک بایەخی بەو جیاوازیە «پچکۆلانانە» دەدا.

لەسەر هەریەکێک لەو دوورگانە، کیسەڵی گەورە گەورەی دەبینی کە لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی تر «کەمێک» جیاواز بوون. ئایا بەڕاستی خودا بۆ هەریەکێک لەو دوورگانە ڕەگەزی تایبەتی کیسەڵی خۆی بۆ خوڵقاندووە؟
ـ جێگەی گومانە!
ـ ژیانی باڵندەکانی سەر گالاپاگۆس، جێگەی سەرنجێکی گرنگی تری داروین بوون. جیاوازیەکی ئاشکرای لە نێوان چۆلەکەکانی دوورگەیەک بۆ دوورگەیەکی تر بەدیدەکرد، بە تایبەتیش شێوەی دەنووکیان. داروین سەلماندی کە جیاوازیەکانیان پەیوەندی بە جۆری خواردنی چۆلەکەکانەوە هەیە، کە لەسەر دوورگە جیاوازەکاندا دەستدەکەون. دەنووک درێژەکان، لەسەر تۆوی دار سنەوبەر دەژیان. جۆرێکی تریشیان لەسەر مێروو و کۆمەڵێکی تریشیان لەسەر مێرووی سەر لق و پۆپی دارەکان دەژیان... بەڵام هەر هەموویان شێوەی دەنووکیان بە جۆرێک بوو، کە پڕاوپڕ لەگەڵ جۆری خواردنەکەیاندا دەگونجا. بڵێیت ئەم هەموو جۆرە چۆلەکەیە لە تەنها یەک ڕەگەزی چۆلەکەوە هاتبن؟ بڵێیت ئەو جۆرە چۆلەکەیە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، خۆی لەگەڵ بارودۆخی دوورگە جیاوازەکاندا نەگونجانبێت و بەم شێوەیەش جۆری نوێی چۆلەکە دروست بووبێت؟
ـ ئەمەش ڕێک ئەو دەرئەنجامە بوو کە ئەو پێی گەیشت، وانیە؟
ـ بەڵێ، لەوانەیە داروین ڕێک لەسەر دوورگەکانی گالاپاگۆسدا بووبێت بە «داروینی»، چونکە هەر لەو دوورگانەشدا سەرنجی ژیانی گیانەوەرانی دەدا کە تاڕادەیەکی زۆر لە ژیانی گیانەوەرەکانی باشوری ئەمریکا دەچوون، لەبەرئەوە ئەم پرسیارەی دەوروژاند؛ بڵێیت خودا بەڕاستی یەک جار و بۆ هەتاهەتایە ئەو جۆرە گیانەوەرانەی

بەکەمێک جیاوازیەوە خولْقاندبێت؟ یان جۆرە گەشەکردنێکیان بەسەردا هاتووە؟ هەتا دەهات زیاتر و زۆرتر گومانی لە نەگۆڕی ڕەگەزەکان دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتام هیچ لێکدانەوەیەکی باشی وای چنگ نەدەکەوت کە چۆنیەتی گەشەکردنێکی ئاوهای بۆ لێکبداتەوە یان بە شێوەیەکی تر بیلْێین نەیدەزانی بە چ جۆرێک خۆ گونجاندنێکی ئاوها لەگەڵ دەوروبەردا ڕوودەدات. بەڵام لە هەمان کاتیشدا بەڵگەیەکی ترشی دەربارەی خزمایەتی هەموو گیانەوەرەکانی سەر زەوی خستەڕوو.

ـ ئەو بەڵگەیەیان چی بوو؟

ـ دەربارەی گەشەکردنی کۆرپەی شیردەرەکان بوو. ئەگەر کۆرپەی سەگ و شەمشەمەکوێرە و کەروێشک و مرۆڤ لە کاتی سەرەتایدا بەراورد بکەین، ئەوا هێندە لەیەک دەچن کە سەختە بتوانیت جیایان بکەینەوە. تەنها لە قۆناخێکی گەشەکردنی دواتردا، دەتوانین کۆرپەی مرۆڤ و کەروێشک جودا بکەینەوە. ئایا ئەمە نیشانەی ئەوە نیە کە ئێمە خزمی دوری یەکتر بین؟

ـ بەڵام هێشتام هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی لانەبوو کە شێوەی ڕوودانی ئەو گەشەکردنەی پێ لێکبداتەوە؟

ـ داروین بەردەوام بیری لە تیۆریەکەی لایللس دەکردەوە کە دەیگوت پێدەچێت بە تێپەڕبوونی کاتێکی دورو درێژ، گۆڕانکاریە پچکۆلەکان کاریگەریەکی گەورەیان هەبووبێت، بەڵام هێشتام هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی نەدەدۆزیەوە کە بیکاتە پنتێک بۆ ڕێسایەکی گشتی. شارەزاییەکی فراوانی سەبارەت بە تیۆریەکەی لامارکی زانای ئاژەڵناسی فەڕەنسی هەبوو کە دەیگوت ڕەگەزە جیاوازەکانی گیانەوەر، ڕێک گەشەیان بەو بەشە داوە کە پێویستیانە. بۆ نمونە

زەڕافە گەشەی بە ملێکی درێژ داوە، لەبەرئەوەی لەپێش چەندەها نەوەوە ناچاربوون خۆیان بگەیەننە گەڵای درەختەکان. بە کورتی؛ بە بڕوای لامارک ئەو سیفەتانەی کە تاکە کەسێک یان تاکە گیانەوەرێک بەهۆی هەوڵی خۆیەوە بەدەستی دەهێنێت، بە میراتی بۆ نەوەی داهاتووی دەمێنێتەوە. بەڵام دواتر داروین وازی لە تیۆری مانەوەی «سیفاتە دەستکەوتووەکان» هێنا، لەبەرئەوەی لامارک نەیدەتوانی بیروڕا چاونەترسەکانی بسەلمێنێت. بەڵام داروین هێدی هێدی شتێکی تری بۆ دەرکەوت کە زۆر ئاشکراتر و ڕوونتر بوو. تاڕادەیەک دەتوانین بڵێین خودی ئەو میکانیزمەی کە دەبووە هۆی گەشەکردنی ڕەگەزەکان، ڕێک لەبەر دەستیابوو.

ـ کەواتە خەریکە دەگەینە سەر خاڵی مەبەست، وا نیە؟

ـ بەڵێ، بەڵام وای بەباش دەزانم خۆت ئەو میکانیزمە بدۆزیتەوە، لەبەرئەوە پرسیارێکت لێدەکەم؛ ئەگەر سێ مانگات هەبێت و لە هەمان کاتیشدا تەنها خواردنی دوو مانگات هەبێت، ئەوساکە چی دەکەیت؟

ـ ئەوساکە پێم وابێت یەکێکیان سەردەبڕم.

ـ ئمم... ئەی کامیان سەردەبڕیت؟

ـ وابزانم ئەو یەکەیان سەردەبڕم کە کەمترین شیر بەرهەمدێنێت.

ـ بەڕاست؟

ـ بەڵێ، زۆر لۆجیکیانەیە، وا نیە؟

ـ ئەوەش ڕێک ئەو شتەیە کە مرۆڤایەتی بەدرێژایی هەزاران ساڵە دەیکات. بەڵام هێشتام بابەتی دوو مانگاکەمان تەواو نەکردووە؛ با وای دابنێین گۆلکێکت دەوێت، ئەی ئەوساکە کامیان جوت دەکەیت؟

ـ بێگومان ئەو دانەیەیان کە زۆرترین شیر بەرهەم دەهێنێت، بەم شێوەیەش گۆلکەکەش مانگایەکی شیربەخشی باشی لێدەردەچێت.
ـ واتە ئەو مانگایەت بەلاوە باشترە کە شیری زۆر بەرهەم دەهێنێت.
کەواتە یەک پرسیاری ترمان ماوە؛ گریمان تۆ ڕاوچیت و دوو سەگی ڕاوت هەیە، بەڵام ناچاریت واز لە یەکێکیان بهێنیت، ئەوساکە کامیان دەهێڵیتەوە؟
ـ بێگومان ئەو یەکەیان دەهێڵمەوە کە باشتر لەگەڵ ڕاوکردنەکەمدا دەگونجێت.
ـ بەم شێوەیەش باشترین سەگی ڕاو هەڵدەبژێریت. وا زیاتر لە دەیان هەزار ساڵە سۆفیا، مرۆڤایەتی ڕێک بەم شێوەیە ئاژەڵ بە خێو دەکات. مریشکەکان هەمیشە پێنج هێلکەیان لە حەفتەیەکدا نەدەکرد، مەڕەکانیش هەمیشە خوری باشیان پێوە نەبوو، ئەسپەکانیش هەمیشە وەک ئێستاکە خێرا و بەهێز نەبوون. لێرەشەوە خەڵکیش هەڵبژاردنێکی دەستکردیان بەکاردەهێنا. دەربارەی جیهانی ڕووەکیش هەر هەمان شێوەیە، بۆ نمونە لە کاتێکدا پەتاتەی باشی چاندنمان هەبێت، پەتاتەی خراپ ناخەینە زەویەوە، یان کاتی خۆمان بە دروێنەی دەغڵێکی گەنمەوە ناکوژین ئەگەر دانی نەگرتبێت. داروین دەیگوت هیچ مانگایەک، هیچ گوڵە گەنمێک، هیچ سەگێک و هیچ چۆلەکەیەک تەواو وەک یەک نین. سروشت جیاوازکاریەکی مەزنمان دەخاتە بەردەست، تەنانەت لەنێو هەمان ڕەگەزیشدا، هیچ تاکێک تەواو وەک ئەوانی تر نیە. پێم وابێت کاتێک لە شەرابە شینەکەت خواردەوە، هەستت بەمە دەکرد.
ـ بەڵێ، بێگومان.

- ئەوجا داروین ناچاربوو پرسیار لەخۆی بکات و بڵێت؛ ئایا پێیدەچێت جۆرە جیاکردنەوەیەکی ئاوها لە سروشتیشدا بوونی هەبێت؟ ئایا ڕێی تێدەچێت سروشتیش بەپێی «هەڵبژاردنێکی سروشتی» بڕوات و بەم شێوەیەش بڕیاربدات چ تاکێک ڕێگەی گەشەدانی پێبدرێت؟ لەسەرو هەموو شتێکیشەوە ئایا جیاکردنەوە و هەڵبژاردنێکی ئاوها بۆ ماوەیەکی دورو درێژ، بڵێیت ببێتە هۆی دروستبوونی ڕەگەزی ڕووەک و گیانەوەری نوێ؟

- پێم وابێت وەڵامەکەی "بەڵێ"یە.

- داروین هێشتام بەتەواوەتی نەیدەزانی شێوە «هەڵبژاردنێکی سروشتی» ئاوها بە چ جۆرێک ڕوودەدات، بەڵام لە مانگی دەی 1838دا، واتە ڕێک پاش دوو ساڵ لەدوای ئەوەی لە گەشتەکەی گەڕایەوە، بەڕێکەوت چاوی بە کتێبێکی چکۆلەی «تۆماس مالتۆس Thomas Malthus»کەوت. تۆماس تایبەتمەندبوو لە لێکۆڵینەوەی ژمارەی دانیشتواندا. کتێبەکەشی ناوی «باسێک دەربارەی پرێنسیپی ژمارەی دانیشتوان» بوو. لەڕاستیدا بیرۆکەی کتێبەکەی لە «بینجامین فرانکلین Benjamin Franklin»ی ئەمریکیەوە وەرگرتبوو، ئەو کەسەی کە شێوەی خۆپاراستن لە بروسکە و چەندەها شتی تری دۆزیەوە. فرانکلین دەیگوت؛ ئەگەر هیچ هۆکارێکی سنووردانەر لە سروشتدا بوونی نەبوایە، ئەوا ڕووەکێکی دیاریکراو یان ڕەگەزێکی گیانەوەر، بەسەرتاپای سەر زەویدا بڵاودەبووەوە. بەڵام چونکە چەندین ڕەگەزی جیاواز جیاوازمان هەیە، لەبەرئەوە جۆرە هاوسەنگیەکمان لە نێوان ڕەگەزەکاندا هەیە.

- تێدەگەم.

- مالتۆس گەشەی بەو بیرۆکەیەدا و بۆ ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی بەکاریدەهێنا. ئەو دەیگوت منداڵی مرۆڤ هەمیشە زیاتر لەدایک دەبێت وەک لەوەی بواری مانەوەیان هەبێت، ئەمەشی بە توانای مەزنی زاوزێی مرۆڤەوە گرێدەدا. لە کاتێکیشدا ڕێژەی بەرهەمهێنانی خواردن هەرگیز لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتواندا هاوسەنگ نابێت، لەبەرئەوە بە بڕوای ئەو ژمارەیەکی زۆری مرۆڤ دووچاری چارەنووسی مردن دەبنەوە. ئەوانەش کە گەورەدەبن، ئەوانەن کە باشتر دەتوانن لە ململانێی ژیاندا بمێننەوە و لێرەشەوە بەردەوامی بە ڕەگەزەکەی خۆیان دەدەن.

- لۆجیکیانەیە.

- هەر ئەمەش خودی ئەو میکانیزمە گەردوونیە بوو کە داروین بەدوایدا دەگەڕا، لە پڕێکدا لێرەوە لێکدانەوەیەکی چۆنیەتی ڕوودانی گەشەکردنەکەی لەلا گەڵاڵە بوو. هۆی ڕوودانەکەشی، «هەڵبژاردنی سروشتی» بوو لە ململانێی مانەوەدا، واتە ئەوانەی بە باشی لەگەڵ چواردەورەکەیاندا هەڵدەکەن، ئەوانە دەبن کە دەمێننەوە و پارێزگاری ڕەگەزەکەیان دەکەن. ئەمەش دووهەمین تیۆری بوو کە لە کتێبی «ڕەچەڵەکی ڕەگەزەکاندا» باسی لێدەکرد. داروین نووسیبووی؛ «فیل لە هەموو گیانەوەرەکانی تر هێواشتر زیاد دەکات، بەڵام ئەگەر بکرێت هەموو بەچکەکانی بمێنێتەوە، ئەوا پاش ماوەی 750 ساڵ نزیکەی 19 ملیۆن فیل لە هەمان نێر و مێ دەکەوێتەوە.»

- ئەی ماسیەکی سمێڵە، کە بە ملیۆن هێلکە دادەنێت!

- داروین زیاتریش دەیگوت، ململانێی مانەوە زیاتر لەنێو ئەو ڕەگەزانەدا سەختە کە لە یەکەوە نزیکن، چونکە لەسەر هەمان جۆری خواردن شەڕ دەکەن. لەو کاتەدا باشیە پچکۆلەکان، واتە جیاوازیە

پۆزەتیڤە بچکۆلەکان، بەڕاستی دەردەکەون. لەلایەکی تریشەوە هەتاوەکو ململانێی مانەوە بەهێزتر بێت، گەشەکردنی ڕەگەزی نوێش خێراتر دەبێت. واتە تەنها ئەوانەی بە باشترین شێوە خۆیان دەگونجێنن، دەمێننەوە و ئەوانی دی دەفەوتێن.
ـ کەواتە هەتاوەکو خواردن کەمتر بێت و هەتاوەکو بەچکەکانیش زیاتربن، گەشەکردنکە خێراتر ڕوودەدات، وا نیە؟
ـ بەڵێ، بەڵام تەنها خواردن گرنگ نیە، بەڵکو لەوانەیە بە هەمان شێوەش گرنگ بێت کە ڕێگە نەدەیت لەلایەن گیانەوەرانی ترەوە بخورێیت. لێرەشەوە هەندێ سیفات بە باشە دەگەڕێتەوە، بۆ نمونە ڕەنگێکی وا کە ڕووەکەکە یان گیاندارەکە بپارێزێت یان توانایەکی ڕاکردنی خێرای هەبێت یان توانای ناسینەوەی دوژمنی هەبێت ـیان لە خراپترین حاڵەتدا تامێکی ناخۆش و تاڵی هەبێت. ژەهریش کە بتوانێت گیانەوەری دڕندەی پێ بکوژێت، سوودی خۆی هەیە، لەبەرئەوە ڕێکەوت نیە زۆربەی کاکتۆسەکان (*ڕووەکێکی دڕکاوی بێ گەڵایە.و) ژەهراوین، سۆفیا. چونکە تا ڕادەیەک تەنها شتێک لە بیاباندا بڕوێت کاکتۆسە، لەبەرئەوە بەتایبەتی ئەم ڕووەکە دەکەوێتە بەردەمی ئەو گیانەوەرانەی ڕووەک خۆرن.
ـ جگە لەوەش زۆربەی کاکتۆسەکان دڕکاوین.
ـ بەڵێ، لەلایەکی تریشەوە توانای زیادبوونیش گرنگیەکی بنچینەیی هەیە. داروین بە وردەکاریەوە شێوەی پیتاندنی لەڕادەبەدەر جوانی ڕووەکەکانی دەخوێند. گوڵەکان بە ڕەنگە قەشەنگەکانیانەوە دەدرەوشێنەوە و بۆنی خۆش بڵاودەکەنەوە، تەنها لەبەرئەوەی مێروو بۆلای خۆیان ڕابکێشن و یاریدەی پیتاندنیان بدەن. بولبولەکانیش هەر لەبەر هەمان هۆ دەخوێنن. گایەکی هێمن و ماتیش کە مانگای بەلاوە

گرنگ نەبێت، هیچ گرنگیەکی لە مێژووی ڕەگەزەکاندا نابێت، چونکە ئەو جۆرە سیفاتە ساردانە دەبێتە هۆی فەوتاندنی ڕەگەزەکەی. تاکە ئەرکی سەر شانی گایەک یان مانگایەک ئەوەیە کە گەورە ببێت، ئەندامی زاوزێی پێبگەیەنێت و زاوزێبکات، بەو شێوەیەش ڕەگەزەکەی بهێڵێتەوە و بەردەوامی پێبدات. زیاتر لە ڕاکردنێکی دورو درێژی "بەرید" دەچێت (*جۆرە یاریەکی ڕاکردنە). ئەو تاکەی کە بەهۆی هەر شتێکەوە نەتوانێت جینەکانی بەوەچەکانی دواتری بگەیەنێت، ئەوا بۆ هەتاهەتایە وەدەردەنرێت. بەم شێوەیەش ڕەگەزەکە بەردەوام باشتر دەبێت. بەتایبەتیش بەرگەگرتنی نەخۆشی یەکێکە لەو سیفەتانەی کە بەردەوام وەردەگیرێت و لەلای ئەوانەی کە دەمێننەوە، دەپارێزرێت.

- بەکورتی هەموو شتێک باشتر و باشتر دەبێت؟

- واتە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنە بەردەوامە، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوانەی کە بە باشترین شێوە لە ژینگەیەکی دیاریکراودا –یان لە ژینگەیەکی ژیانی لەباردا- خۆیان دەگونجێنن، ببنە ئەوانەی کە لە ماوەی دورو درێژی داهاتوودا ڕەگەزەکەیان لەو ژینگەیەدا بپارێزن. بەڵام ئەو شتەی لە ژینگەیەکی دیاریکراودا باشە، مەرج نیە لە ژینگەیەکی تردا باش بێت. بۆ نمونە توانای فڕین بەلای هەندێک لە چۆلەکەکانی سەر دوورگەکانی گالاپاگۆسدا زۆر گرنگ بوو، بەڵام لەو شوێنانەدا کە خواردنیان لەسەر زەویەکە دەچنییەوە و هیچ گیانەوەرێکی دڕندەی تێدا نەدەژیا، ئەو توانای فڕینە هێندە گرنگ نەبوو. ڕێک بەهۆی ئەو هەموو ژینگە جیاوازانەی کە لە سروشتدا هەیە وە بە تێپەڕبوونی کات، ئەو هەموو ڕەگەزە جیا جیایەی گیانەوەران پەیدابوون.

- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنها یەک جۆر ڕەگەزی مرۆڤ هەیە؟
- بەڵێ، لەبەرئەوەی مرۆڤ توانایەکی یەکجار گەورەی هەیە کە خۆی لەنێو بواری ژیانی جیاواز جیاوازدا بگونجێنێت. یەکێک لەو شتانەی کە سەری داروینی سوڕماند، ئەوە بوو کاتێک کە هیندیەکانی «وڵاتی ئاگر» Tierra del Fuego ی بینی کە چۆن لەو بارودۆخە یەکجار سەختەدا دەژیان. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە هەموو مرۆڤەکان چوون یەکبن. بۆ نمونە ڕەنگی پێستی ئەوانەی لە نزیک هێڵی ستوونیەوە دەژین تۆخترە لەوانەی کە لە ناوچەکانی باکوردا دەژین، لەبەرئەوەی پێستی تۆخ لەشمان لە تیشکی خۆر دەپارێزێت. خەڵکی سپی پێست کە خۆیان دەخەنە بەر خۆرێکی بە هێز، زیاتر شیاوی ئەوەن کە تووشی شێرپەنجەی پێست بن.
- ئایا بە هەمان شێوەش باشە گەر لە باکوردا بژیت و پێستت سپی بێت؟
- بەڵێ، ئەگەر وا نەبوایە ئەوا پێستی هەموو مرۆڤێکی سەر زەوی تۆخ دەبوو. بەڵام پێستی سپی بە ئاسانتر فیتامینی خۆر دروستدەکات، ئەمەش لەو ناوچانەدا کە خۆری کەم لێ هەڵدێت گرنگی خۆی هەیە. هەڵبەتە ئەمڕۆکە هێندە گرنگ نیە، لەبەرئەوەی دەتوانین بەدڵنیاییەوە فیتامینی خۆر لە ڕێگەی خواردنەوە وەربگرین. بەڵام هیچ شتێک لە سروشتدا ڕێکەوت نیە. هەموو شتێک دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانکاریە چکۆلانانەی کە بەدرێژایی چەندەها نەوە کاریگەری خۆی داناوە.
- بەڕاستی بیرکردنەوەیەکی بێ وێنەیە.
- بەڵێ، وا نیە؟ تا ئێستاکە دەتوانین بەچەند دێڕێک تیۆری گەشەکردنی داروین کورت بکەینەوە.

ـ فەرموو...
ـ دەتوانین بڵێین «مادەی سەرەتایی» یان ئەو کەرەسەیەی کە دەبێتە هۆی گەشەکردنی ژیانی سەر زەوی، جیاوازی بەردەوامی نێوان تاکەکانی هەمان ڕەگەزە، وە لەسەرو ئەوەشەوە بەهۆی «بەچکە زۆرەکانەوە» بەشێکی کەمیان توانای مانەوەیان دەبێت. خودی «میکانیزمەکە» یان هێزی بەڕێوەبردنی گەشەکردنەکەش، «هەڵبژاردنی سروشتیە» لە ململانێی مانەوەدا. ئەم هەڵبژاردنەش هەمیشە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەهێزترین یان «ئەوانەی کە باشترین شێوە خۆیان گونجاندووە» بمێننەوە.
ـ بەلای منەوە هەروەک ماتماتیک لۆجیکیە، بەڵام ئەی خەڵکی کتێبی «ڕەچەڵەکی ڕەگەزەکانیان» بەلاوە چۆن بوو؟
ـ کتێبەکە بووە هۆی مشتومڕێکی توندو تیژ. کڵێسە زۆر بەتوندی نارەزایی خۆی دەربڕی و جیهانی زانستی بەریتانیش بوو بە دوو بەشەوە. لە ڕاستیدا زۆر سەیر نەبوو، چونکە داروین خودای بەشێوەیەکی گەورە و هەستپێکراو لە کرداری خوڵقاندن دورخستەوە. هەندێکیش دەیانگوت ئافەراندنی شتێک کە توانای گەشەکردنی خۆبەخۆی لەناودا بێت، مەزنترە وەک لەوەی شتێک خەلق بکەیت کە یەکجاری بێت و بۆ هەتاهەتایە وەک خۆی بمێنێتەوە.
لەپڕێکدا سۆفیا لەسەر کورسیەکەی خۆی هەڵدا و هاواریکرد؛
ـ تەماشا کە!
لە پەنجەرەکەوە پەنجەی بۆ دەرەوە ڕادەکێشا. ژن و پیاوێک لەلای دەریاچەکەوە بەڕووت و قوتی دەڕۆیشتن و دەستیان لە دەستی یەکدا بوو... ئەوجا ئەلبێرتۆ گوتی؛

- ئەوە ئادەم و حەوایە... ئەوانیش ناچاربوون لە دواجاردا چارەنووسیان بخەنە پاڵ چارەنووسی کچە کڵاوسوورەکە و ئالیسی وڵاتی حەکایەتەکە. هەر لەبەرئەوەشە لێرەدا دەردەکەون.
سۆفیا چووە لای پەنجەرەکەوە و تەماشای کردن، بەڵام پاش کەمێک لەنێو دارەکاندا دیارنەمان.
- بەڵام داروین دەیگوت مرۆڤیش لە گیانەوەرەوە گەشەی کردووە؟
- لەساڵی 1871دا کتێبی «ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی» بڵاوکردەوە. لەوێدا باسی هەموو خاڵە هاوبەشە گەورەکانی نێوان مرۆڤ و گیانەوەر دەکات، هەروەها دەیگوت مرۆڤ و مەیمونی شێوە مرۆڤ، دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان لە یەک ڕەچەڵەکەوە گەشەیان کردبێت. لەو کاتەشدا کەللە سەرێکی بەبەردبووی جۆرە مرۆڤێکی فەوتاویان دۆزیەوە، یەکەمجار لەسەر شاخی تاریق و پاش چەند ساڵێکیش لە نیاندەرتاڵ لە ئەڵمانیادا. جێگەی سەرنجە کە بەرەنگاری لە ساڵی 1871دا کەمتربوو وەک لەساڵی 1859دا، ئەو ساڵەی کە داروین کتێبی «ڕەچەڵەکی ڕەگەزەکانی» بڵاوکردەوە. تیۆری هاتنی مرۆڤ لە گیانەوەرانەوە، لە ناواخنی کتیبی یەکەمیشدا هەر هەبوو، بەڵام هەروەک گوتم؛ کاتێک داروین لە ساڵی 1882دا مرد، بەو پەڕی ڕێزەوە وەک پێشەوایەکی زانستی نێژرا.
- ئەوجا نرخ و ڕێزیان بۆ دانا؟
- بەڵێ، لەپاشاندا. بەڵام لەسەرەتادا دەیانگوت «ترسناکترین پیاوی بەریتانیایە.»
- بەو جۆرە!
- ئافرەتێکی دەوڵەمەندی چینە بەرزەکان گوتی؛ «با ئومێدەواربین کە ئەمە ڕاست نەبێت، بەڵام ئەگەر ڕاستیش بێت، ئەوا با هیواداربین کە

بڵاونەبێتەوە». زانایەکی بەناوبانگی زانستیش شتێکی نزیک بەوەی گوت؛ «دۆزینەوەکەی سووک و ڕسواکەرە و هەتا کەمتریش باسبکرێت باشترە.»
- بەم شێوەیەش تاڕادەیەک سەلمێنرا کە مرۆڤ و وشترمرخ خێزانی یەکن.
- بەڵێ دەتوانین ئەوە بڵێین، چونکە بەلای ئێمەوە ئێستاکە ئاسانە زیرەک بین. بەڵام ئەو کاتە لەپڕێکدا خەڵکانێکی زۆر ناچاربوون بەسەر ئایەتەکانی ئافەراندنی تەوراتدا بچنەوە. "جۆن ڕوسکین "John Ruskinی نووسەری گەنج بەم شێوەیە سەرنجی خۆی دەربڕی؛ «خۆزگە جیۆلۆجیەکان وازیان لێدەهێنام! چونکە لەدوای هەموو ئایەتێکی تەوراتەوە گوێم لە دەنگی چەکوشەکانیانە.»
- دەنگی چەکوشەکانیش گومانکردن بوو لە وشەکانی خودا، وا نیە؟
- پێم وابێت مەبەستی ئەوە بووە، چونکە تەنها ئایەتەکانی خوڵقاندنی تەورات نەبوو کە بەمانا وشەییەکەی داڕمان. ناواخنی تیۆریەکەی داروین دەیگوت مرۆڤ لە دواجاردا بەهۆی گۆڕانکاریەکی «هەمەڕەکیەوە» دروست بووە. لەوەش زیاتر سۆفیا؛ داروین مرۆڤی کردە بەرهەمی شتێکی بێهەستی وەک «ململانێی مانەوە.»
- ئایا داروین هیچ شتێکی لەبارەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەو جۆرە گۆڕانکاریە «هەمەڕەکیانە» دەکرد؟
- ئێستاکە پەنجەت لەسەر لاوازترین خاڵی تیۆریەکەی دانا. داروین وێناکردنێکی نادیاری دەربارەی ویراسەت هەبوو. لە کاتی جوتبووندا، جۆری گیانەوەرەکە و ویراسەت ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن. دایک و باوکێکی دیاریکراو هەرگیز دوو منداڵی تەواو وەک یەکیان نابێت. هەر لێرەشەوە تاڕادەیەک جیاوازی سەرهەڵدەدات، بەڵام لەلایەکی

تریشەوە بەڕاستی سەختە بەو شێوەیە شتێکی نوێ دروست ببێت. جگە لەوەش چەند ڕووەک و گیانەوەرێکیش هەن کە بەهۆی گۆپکەکردن و دابەشبوونی ساکاری خانەکانیانەوە زیاددەکەن. کاتێک پرسیارەکە دێتە سەر ئەوەی ئەو جیاوازکاریانە بە چ شێوەیەک سەریان هەڵداوە، ئەوا تیۆریەکەی داروین پشت بە داروینیزمی نوێ دەبەستێت.

ـ ئەویان دەڵێت چی؟

ـ دەڵێت هەموو ژیان و هەموو جۆرە جوتبوونێک لە بنچینەدا دابەشبوونی خانەیە. کاتێک خانەیەک بەسەر دوو بەشدا دابەش دەبێت، ئەوا دوو خانەی تەواو وەک یەک پەیدا دەبن کە ڕێک هەمان مادەی ویراسیان تێدایە. لێرەدا مەبەستمان لە خانە دابەشبوون ئەوەیە کە خانەکە خۆی کۆپی دەکات.

ـ بەڵێ.

ـ بەڵام هەندێ جار ڕوودەدات لە کاتی ئەم پرۆسێسەدا هەڵەی زۆر چکۆلە ڕووبدات –بە شێوەیەک کە خانە کۆپیبووەکە بەتەواوەتی لە خانە دایکەکە ناچێت. لە زمانی بایۆلۆجی مۆدێریندا بەمە دەگوترێت «گۆڕانی بایۆلۆجی Mutation». ئەو جۆرە گۆڕانانە پێدەچێت هیچ گرنگیەکیان نەبێت، بەڵام لەوانەشە سیفەتی تاکە کەسێک یان تاکە گیانەوەرێک بە شێوەیەکی ئاشکرا بگۆڕن. ڕووشدەدات گۆڕانەکان ڕاستەوخۆ زەرەرەومەند بن، ئەو کاتەش (ئەو تاکانەی کە گۆڕانەکانیان بەسەردا هاتووە) لەبەچە زۆرەکان جودا دەکرێنەوە. لەڕاستیدا زۆربەی نەخۆشیەکانیش بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەوە ڕوودەدەن. بەڵام هەندێ جاریش ئەو گۆڕانکاریانە لەوانەیە

سیفەتێکی پۆزەتیڤی وا پێویست بدەن بە تاکە گیانلەبەرێک کە بتوانێت لە ململانێی مانەوەدا بمێنێتەوە.
ـ بۆ نمونە ملێکی درێژتر؟
ـ بەپێی لامارک زەڕافە بۆیە ملی درێژە، لەبەرئەوەی هەمیشە هەوڵیداوە بگاتە لقەکانی سەرەوە. بەڵام بەپێی داروینیزم ئەم جۆرە سیفاتانە ناکرێت بە شێوەیەکی ویراسی بگواسترێتەوە. داروین دەیگوت زەڕافە بەهۆی گۆڕانکاری سروشتیەوە ملی درێژە. داروینیزمی نوێش هات و بەنیشاندانی هۆی ڕوودانی ئەو جۆرە گۆڕانکاریانە، پشتگیری لە تیۆریەکەی داروین کرد.
ـ بەهۆی گۆڕانە بایۆلۆجیەکانەوەیە؟
ـ بەڵێ، گۆڕانە هەمەڕەکیەکانی هۆکارە ویراسیەکان، ملێکی درێژتری، وەک لە تێکڕای، بە زەڕافە بەخشیووە. لە کاتێکیشدا تەنها ڕێگەیەکی دیاریکراو هەبێت بۆ گەیشتن بە خواردن، ئەوا پێدەچێت ئەو سیفەتە گرنگ بێت. ئەوەی کە دەیتوانی بگاتە بەرزترین ئاستی دارەکە، باشتر دەیتوانی خۆی بەڕێوە بەرێت. دەشتوانین بەجۆرێکی تر وێنایبکەین و بڵێین هەندێک لەو «زەڕافە سەرەتاییانە» لەپێناوی خواردندا، گەشەیان بە توانای هەڵکۆڵینی زەوی داوە. لەپاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی دورو درێژدا لەوانەیە گیانەوەرێک، کە ئێستاکە فەوتاوە، خۆی بەسەر دوو ڕەگەزی جیاوازدا دابەشکردبێت.
بەڵام دەشتوانین بەهۆی نمونەی مۆدێرنەوە نیشانی بدەین کە هەڵبژاریدنی سروشتی بە چ شێوەیەک کاردەکات. لەڕاستیدا هەتا بڵێیت لەسەر ڕێسایەکی ساکار دەڕوات بە ڕێوە.
ـ فەرمووو!

ـ لە بەریتانیادا جۆرە ڕەگەزێکی پەپولە هەیە پێی دەگوترێت «پەپولەی داری بێتولا». (لە نەرویجیشدا ئەو جۆرە پەپولەیەمان هەیە). ئەم پەپولانە، هەروەک بە ناوەکەیدا دیارە، لەسەر لقی کاڵی داری بێتولا دەژین. ئەگەر بگەڕێینەوەساڵەکانی سەدەی هەژدە، ئەوا دەبینین پەپولەکانی ئەو کاتە ڕەنگیان خۆڵەمێشیەکی کاڵ بووە. دەزانیت بۆچی سۆفیا؟

ـ بەو جۆرە بەهۆی ڕەنگیانەوە بەئاسانی ناکەونە بەرچاوی باڵندە برسیەکان.

ـ بەڵام جارجارێک هەندێ ڕەنگی تۆختریان تێدا هەڵدەکەوت، ئەمەش بەهۆی گۆڕینی بایۆلۆجیەوە بوو کە بەشێوەیەکی ڕێکەوت ڕوویدەدا. بەبڕوای تۆ جۆرە تۆخەکان چیان بەسەر دەهات؟

ـ بینینیان ئاسانتربووە، کەواتە ئاسانتریش دەبوونە خۆراکی باڵندەکان.

ـ بەڵێ، لەبەرئەوەی لەو ژینگەیەدا –واتە کە لقی دارەکان ڕەنگیان کاڵ بوو- ڕەنگی تۆخ سیفەتێکی باش نەبوو، لەبەرئەوەش هەمیشە پەپولە ڕەنگ کاڵەکان ژمارەیان زیاتر و زۆرتر دەبوو. بەڵام پاشتر شتێک بەسەر ئەو ژینگەیەدا ڕوویدا؛ بەهۆی دوکەڵی زۆری پیشەسازیەوە لقی دارە کاڵەکان تۆختر بوون. بەبڕوای تۆ ئەوساکە چی بەسەر پەپولەکاندا هات؟

ـ ئەو کاتە پێم وابێت پەپولە ڕەنگ تۆخەکان باشتر دەمانەوە.

ـ بەڵێ، زیادبوونی ژمارەیان ماوەیەکی زۆری بەسەردا نەچوو. لە هەندێ شوێنی دیاریکراودا ڕێژەی پەپولە ڕەنگ تۆخەکان لە ساڵی 1848وە هەتا ساڵی 1948، لە سەدا یەکەوە بۆ لەسەدا 99 بەرزبووەوە. ژینگەکە گۆڕاو چیتر ڕەنگی کاڵ باشیەک نەبوو، بەڵکو

ڕێک بەپێچەوانەوە! ڕەنگ سپیە «دۆڕاوەکان» هەر لەسەر لقی دارەکان دەنیشتنەوە، باڵندەکانیش دەهاتن و لولیان دەکردن. بەڵام دیسانەوە گۆڕانکاریەکی گەورەی تر ڕوویدایەوە. بەکارهێنانی کەمتری خەڵوز و سوود وەرگرتن لە هۆکاری باشتر لە کارگەکاندا، لە چەند ساڵی ڕابووردودا بووە هۆی ئەوەی ژینگەکە دیسانەوە پاک ببێتەوە.

ـ کەواتە لقی دارەکانیش سەرلەنوێ پاک بوونەوە؟

ـ بەڵێ، لەبەرئەوە پەپولەکانیش خەریکە دەگەڕێنەوە سەر ڕەنگی سپی خۆڵەمێشی. ئەمەیە کە پێی دەگوترێت «خۆ گونجاندن»، لێرەدا باس لە یاسای سروشت دەکەین.

ـ لە مێشکم چەسپی.

ـ بەڵام نمونەی تریشمان لەسەر دەست تێوەردانی مرۆڤ لە سروشتدا زۆرە.

ـ وەک چی بۆ نمونە؟

ـ بۆ نمونە خەڵکی هەوڵدەدەن بە بەکارهێنانی چەندین مادەی ژەهراوی، مێرووی زیانبەخش لەناوببەن. یەکەمین جار لەوانەیە ئەنجامێکی باش ببەخشێت. بەڵام کاتێک مادەی ژەهر بە کێڵگەیەکەوە یان بە باخێکی میوەوە دەکەین، ئەوا لەڕاستیدا دەبێتە هۆی کارەساتێکی چکۆلەی ژینگەی ئەو مێرووانەی دەمانەوێت لەناویان بەرین. پێدەچێت بەردەوام بەهۆی گۆڕینی بایۆلۆجیەوە، هەندێک مێروو دروست بین کە توانای بەرگەگرتنی ئەو ژەهرەیان هەبێت کە بەکاردەهێنرێت. ئەو کاتە یاریەکە دەکەوێتە دەستی ئەوانەوە، «دەکەوێتە دەستی براوەکانەوە»، بەو شێوەیەش فەوتاندنیان زۆر سەختتر دەبێت، بێگومان هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ

هەوڵدانەکەی مرۆڤ کە دەیویست لەناویان بەرێت. وەک دەشزانیت ئەو جۆرە دەمێنێتەوە کە توانای بەرگەگرتنی زۆرترە.
- چ ترسناکە.
- بەلایەنی کەمەوە شایانی ئەوەیە کە بیری لێبکرێتەوە. بەڵام لەناو لەشیشماندا هەوڵدەدەین مشەخۆرە زەرەرەومەندەکان لەناوبەرین، مەبەستم لە بەکتریایە.
- لەدژی ئەوان مادەی پەنسلین و ئەنتی بایۆتیک بەکاردەهێنین.
- پەنسلینیش بەلای ئەو گیانەوەرە چکۆلانەوە دەبێتە «کارەساتێکی ژینگەیی». بەڵام ئەگەر بەردەوام پەنسلین بەکاربهێنین، ئەوا بەرە بەرە بەکتریاکان بەرگری پەیدا دەکەن. بەم شێوەیەش کۆمەڵێک بەکتریا سەرهەڵدەدەن کە لەناوبردنیان هەر زۆر سەختتر دەبێت. ئەوساکە ناچاردەبین دەرمانی ئەنتی بایۆتیکی بەهێزتر بەکاربهێنین، بەڵام لەدواجاردا...
- لەدواجاردا بەکتریاکان لە دەممانەوە دێنە دەرەوە؟ لەوانەشە ناچاربین فیشەکیان پێوە بنێین؟
- ئەمە لەوانەیە زیادەڕۆیی بێت، بەڵام دەرمانی مۆدێرن بەئاشکرا مرۆڤی خستۆتە بەردەمی دوو هەڵبژاردنی خراپەوە. گرفتەکەش تەنها ئەو ڕاستیە نیە کە بەکتریاکان لە جاران چالاکترن... لەوەوپێش بەهۆی نەخۆشی جۆراوجۆرەوە چەندەها منداڵ دەمردن. بۆ ماوەیەکیش ڕێک بەو شێوەیە بوو کە کەمایەتیەک لە منداڵەکان دەژیان، بەڵام دەرمانسازی مۆدێرن بەشێوەیەک لە شێوەکان، لایەنی هەڵبژاردنی سروشتی وەلاوەنا. ئەو دەرمانەی یاریدەی چاکبوونەوەی نەخۆشیەکی سەخت دەدات، لەوانەیە پاش ماوەیەکی دورو درێژ ببێتە هۆی ئەوەی توانای مرۆڤ بەرامبەر بە نەخۆشیەکان لاوازبکات. ئەگەر

بەهیچ جۆرێک گرنگی بەو شتە نەدەین کە پێی دەگوترێت «تەندروستی بۆماوە»، ئەوا پێدەچێت دووچاری دابەزینی «پلەی نەژادی» مرۆڤایەتی ببینەوە، لەبەرئەوەی توانای بنچینەیی بۆماوەی مرۆڤ، لە بەرەنگاری نەخۆشیە سەختەکاندا لاواز دەبێت.
- چ پێشبینیەکی ترسناکە.
- بەڵام فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە دەبێت واز لە گوتنی ئەو شتە «ترسناکانە» نەهێنێت، کە بەڕاستیان دەزانێت... بەهەرحاڵ با ئێستا هەوڵی کورتکردنەوەیەکی تریش بدەین.
- فەرمووو! فەرموو!
- دەتوانین بڵێین ژیان وەک یانسیبێکی گەورە وایە، کە تەنها ژمارە براوەکانی دەبینین.
- مەبەستت لە چیە؟
- ئەوانەی کە ململانێی مانەوە دەدۆڕێنن، دەمرن و دەڕۆن. هەموو جۆرە ڕووەکێک و گیانەوەرێکی سەر زەوی، پێویستی بە ملیۆنەها ساڵ هەبووە بۆ ئەوەی «ژمارە براوەکان» هەڵببژێرێت. ژمارە دۆڕاوەکانیش... بەڵێ، تەنها کەرەتێک خۆیان نیشان دەدەن. واتە هیچ جۆرە ڕووەکێک یان ڕەگەزی گیانەوەرێک ئەمڕۆکە بوونی نیە، کە وەک «براوەی» یانسیبی گەورەی ژیان دانەنرێت.
- لەبەرئەوەی تەنها باشترینیان ماوەتەوە؟
- بەڵێ دەتوانین وا بڵێین. ئێستاکەش بەیارمەتیت ئەو پۆستکارتەم بدەرێ... ئەوەی کە خاوەنی ئاژەڵەکان هێنای.
سۆفیا پۆستکارتەکەی دایە دەستی. لەسەر دیوێکی پۆستکارتەکە وێنەی پاپۆڕەکەی نوحی لەسەر کێشرابوو، وە لەسەر دیوەکەی تری

وێنەیەکی داری ڕەچەڵەکی هەموو گیانەوەرە جیاوازەکانی لەسەربوو. ئەو لاپەڕەیەبوو کە ئەلبێرتۆ دەیویست نیشانی سۆفیای بدات.
- ئەم نەخشە سەرەتاییە دابەشکردنی ڕەگەزی جیاوازی ڕووەک و گیانەوەرەکانمان نیشان دەدات. لێرەدا دەبینین کە ڕەگەزێکی دیاریکراو بە چ شێوەیەک دەچێتەوە سەر گروپ و پۆل و ڕیزی جیاوازەوە.
- بەڵێ دیارە.
- مرۆڤ و مەیمون سەر بەو بەشەن کە پێی دەگوترێت «سەرەکیەکان». سەرەکیەکانیش گیانەوەری شیردەرن و هەموو شیردەرەکانیش سەربە بڕبڕەدارەکانن و دیسانەوە ئەمانیش سەربە گیانەوەرە فرە خانەکانن.
- تاڕادەیەک ئەریستۆتالیسم دێتەوە یاد.
- ڕاستە، بەڵام نەخشەکە تەنها دابەشکردنی ئەمڕۆکەی ڕەگەزی گیانەوەرەکانمان نیشان نادات، بەڵکو شتێکیشمان دەربارەی گەشەکردنی ژیان پێدەڵێت. بۆ نمونە دەبینین چۆن باڵندەکان ڕۆژێک لە ڕۆژان لە گیانەوەرە خشۆکەکان جودا بوونەتەوە، خشۆکەکانیش لە کاتێکی دیاریکراودا لە وشکاوەکیەکان جیابوونەتەوە و ئەوانیش لە ماسیەکان جودا بوونەتەوە.
- بەڵێ، هەر زۆر ئاشکرایە.
- هەموو کەڕەتێک کە هێڵەکە دەبێت بەدوو بەشەوە، مانای ئەوەیە کە گۆڕانە بایۆلۆجیەکان بوونەتە هۆی سەرهەڵدانی ڕەگەزی نوێ. بەو شێوەیەش گروپ و پۆلی جیاوازی گیانەوەران لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا سەریان هەڵداوە. ئەمڕۆکە لەڕاستیدا پتر لە ملیۆنێک ڕەگەزی جیاوازی گیانەوەران لەسەر زەوی دەژین، ئەو ملیۆنەش تەنها بەشێکی کەمی ئەو ڕەگەزانەیە کە لەکاتی خۆیدا لەسەر زەوی ژیاون.

بۆ نمونە دەبینیت گروپی وەک سێ جومگەییەکان بەتەواوەتی فەوتاون.
ـ لە خواری خوارەوەشدا گیانەوەرە یەک خانەییەکانمان هەیە.
ـ لەوانەیە هەندێک لەوانە لە دوو ملیارد ساڵی ڕابووردودا گۆڕانکاریان بەسەردا نەهاتبێت. وەک دەبینیت هێڵێک لەو گیانەوەرە یەک خانانەییانەوە ڕێک بەرەو جیهانی ڕووەک دەڕوات، چونکە پێدەچێت ڕووەکەکانیش لە هەمان ئەو خانە سەرەتاییانەوە دروستبووبن کە گیانەوەرەکانی لێوە دروستبووە.
ـ بەڵێ، دەبینم. بەڵام من بیر لەشتێک دەکەمەوە.
ـ چی؟
ـ یەکەمین «خانەی سەرەتایی» چۆن دروستبووە؟ ئایا داروین هیچ وەڵامێکی پێیە؟
ـ پێم گوتیت ئەو پیاوێکی وریابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەی بەخۆیدا شێوە گریمانەیەکی پەتی دەربارەی ئەو پرسیارە بنووسێت؛ «...ئەگەر (چ ئەگەرێک!) مەزەنەی دەریاچەیەکی چکۆلە بکەین کە هەموو جۆرە ئامۆنیایەک و فسفۆڕ و خوێ و گەرمی و ڕووناکی و کارەبا و ...هەتا دوایی تێدا بێت، وە ئاوێتەیەکی کیمیایی پرۆتینی تێدا دروستببێت، کە ئامادەگی گەشەکردنی زیاتری تێدا بێت...»
ـ بەڵێ، ئەی پاشان؟
ـ داروین بە قوڵی بیری لە چۆنیەتی دروستبوونی یەکەمین خانەی زیندووی دەکردەوە کە لە مادەیەکی نائۆرگانیەوە هاتبێت. لێرەشدا دیسانەوە بۆچوونەکەی تەواوە، چونکە زانستی ئەمڕۆکەمان کتومت مەزەنەی ئەوە دەکات کە یەکەمین ژیانی سەرەتایی لەنێو

دەیاچەیەکی «گەرمی» ئاوهادا سەریهەڵدابێت، ڕێک هەروەک ئەوەی داروین دەیهێنایە پێش چاوی.
ـ بۆم باسبکە!
ـ لەوانەیە نەخشەیەکی سەرزارەکی مەبەستەکەمان بەجێبهێنێت، بەڵام لێرەدا داروین جێدەهێڵین و دەچینە سەر دواهەمین لێکۆڵینەوە سەبارەت بە سەرهەڵدانی ژیان لەسەر گۆی زەوی.
ـ خەریکە کەمێک دەشڵەژێم. کەس هەیە لەڕاستیدا بزانێت ژیان چۆن سەریهەڵداوە؟
ـ لەوانەیە کەس بەشێوەیەکی پڕاوپڕ نەزانێت. بەڵام هێدی هێدی بەشی زیاتر و زۆرتری ئەو وێنەیەمان بۆ دەرکەوتووە، کە چۆنیەتی ڕێتێچوونی سەرهەڵدانی ژیانمان نیشان دەدات.
با لەپێش هەموو شتێکدا وای دابنێین کە هەموو ژیان –ڕووەک و گیانەوەریش- لە هەمان مادە پێکهاتووە. ساکارترین شێوەی پێناسەکردنی ژیان ئەوەیە کە ژیان مادەیەکە و گەر بخرێتە گیراوەیەکی خۆراکییەوە، ئەوا دەتوانێت خۆی بەسەر دوو بەشی تەواو وەک یەکدا دابەشبکات. ئەم پڕۆسێسە مادەیەک دەیبات بەڕێوە کە ئێمە پێی دەڵێین"DNA" ، مەبەستیشمان لە DNA ئەو کرۆمۆسۆمانەیە یان ئەو مادەیەیە کە توانا ویراسیەکان دیاریدەکات و لە هەموو خانە زیندووەکانیشدا بوونی هەیە. هەروەها مەبەستیشمان لە مۆلکیولی DNA یە، لەبەرئەوەی مۆلکیولی DNA لەڕاستیدا مۆلکیولێکی یەکجار ئاڵۆزە یان مۆلکیولێکی یەکجار گەورەیە. واتە پرسیارەکە لەوەدایە کە یەکەمین مۆلکیولی DNA بە چ شێوەیەک سەریهەڵداوە.؟
ـ بەڵێ؟

- زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا 4،6 ملیارد ساڵ لەمەوبەر دروستبووە. لە بنەڕەتدا تەنێکی ئاگراوی بووە، بەڵام پاشان هێواش هێواش تەنی زەوی ساردبۆتەوە. لێرەدا زانستی مۆدێرن دەڵێت ژیان نزیکەی سێ بۆ چوار ملیارد ساڵ لەمەوبەر سەریهەڵداوە.

- ڕێی تێناچێت.

- نابێت وا بڵێیت هەتاوەکو هەموو باسەکەت گوێ لێ نەبێت. لەپێش هەموو شتێکدا دەبێت بیر لەوە بکەیتەوە کە ئەم زەویەی ئێستاکە هەیە، لەو زەوییەی ئەوسا زۆر جیاوازتر بووە. لە کاتێکیشدا ژیان هێشتام لەسەر زەویدا بوونی نەبووە، کەواتە ئۆکسجینیش لە ئاو وهەوادا بوونی نەبووە. ئۆکسجینی ئازاد، یەکەمین جار بەهۆی پێکهاتەی ڕووناکی ڕووەکەکانەوە دروستبوو. ڕاستی «نەبوونی» ئۆکسجینیش گرنگی خۆی هەیە، لەبەرئەوەی ڕێی تێناچێت خانەی ژیانی سەرەتایی –کە توانای دروستکردنەوەی DNA هەبێت- لە ئەتمۆسفیرێکی ئۆکسجیناویدا دروست بووبێت.

- بۆ نا؟

- لەبەرئەوەی ئۆکسجین مادەیەکە کە زۆر بە خێرایی کارلێکردن دەکات. واتە ئەگەر ئۆکسجینمان هەبێت، ئەوا زۆر پێش ئەوەی مۆلکیولی ئاڵۆزی وەک DNA بتوانێت دروست ببێت، هەموو مۆلکیولە بنچینەییەکانی «DNA ئۆکسیداوی» دەبن.

- ئممم!

- لەبەرئەوەش بەدڵنیاییەوە دەزانین کە ئەمڕۆکە بواری دروستبوونی ژیانی «نوێ» نیە، ...بەڵێ تەنانەت بەکتریایەکیش یان فیرۆسێکیش. واتە دەبێت هەموو ژیانی سەر زەوی بە تەواوەتی یەک تەمەنیان هەبێت. کەواتە ڕەگەزی بۆماوەی فیلێک وەک ڕەگەزی بۆماوەی

ساکارترین بەکتریا، دورو درێژە. تاڕادەیەک دەتوانین بڵێین فیلێک یان مرۆڤێک، لە ڕاستیدا کۆڵۆنیەکی پێکەوەگرێدراوی بوونەوەری یەک خانەییە، لەبەرئەوەی لە هەموو تاکە خانەیەکی لەشدا هەمان مادەی ویراسیمان هەیە. واتە تەواوی دەستوری دروستبوونمان، کە نیشانی دەدات ئێمە کێین، لەناو هەموو تاکە خانەیەککی چکۆلەی لەشماندا خۆی حەشارداوە.

ـ بیرکردنەوەیەکی سەیرە.

ـ یەکێک لە نهێنیە گەورەکانی ژیان ئەوەیە کە خانەکانی گیانەوەرێکی فرەخانەییش، توانای تایبەتمەنی کارەکانیان هەیە، لەبەرئەوەی هەموو سیفاتە ویراسیەکان لە هەموو خانەکاندا چالاک نین. هەندێک لەو سیفاتانە یان لەو جینانە «داگیرساون» و هەندێکی تریان «کوژاونەتەوە». خانەیەکی جگەر جۆرە پرۆتینێکی جیاوازتر بەرهەم دێنێت وەک لەو پرۆتینەی خانەیەکی دەمار یان پێست دروستیدەکات. بەڵام لەهەر سێ خانەکەدا هەمان مۆلکیولی DNA تێدایە، کە هەموو دەستوری دروستبوونی ئەو بوونەوەرەی لەخۆگرتووە کە لێرەدا باسی دەکەین.

لە کاتێکیشدا لەبەرئەوەی ئۆکسجین لە ئەتمۆسفیردا نەبووە، هیچ جۆرە بەرگێکی ئۆزۆنیش لە دەرەوەی زەویدا بوونی نەبووە کە پارێزگاری بکات. واتە هیچ شتێک نەبووە کە ڕێگەی تیشکی گەردوونی بگرێت. دیسانەوە ئەمەش گرنگە، لەبەرئەوەی لەوانەیە ڕێک ئەو تیشکانە ڕۆڵی گرنگیان بینیبێت لەو کاتەدا کە یەکەمین مۆلکیولی ئاڵۆز دروستبووە. تیشکێکی گەردوونی ئاوها، خودی ئەو وزەیە بووە کە بۆتە هۆی ئەوەی مادە جیاوازەکانی سەر زەوی یەکبگرن و گەردیلەی گەورەتر پێک بهێنن.

ـ باشە.
ـ بە کورتی؛ بۆ ئەوەی گەردیلەی ئاڵۆزی لەو شێوەیە دروست ببێت، کە هەموو ژیانی لێوە هاتبێت، دەبێت دوو مەرجمان هەبێت؛ یەکەمیان، نابێت ئۆکسجین لە ئەتمۆسفیردا هەبووبێت و دووهەمیشیان دەبێت ڕێگە بە «تیشکی گەردوونی» درابێت کە بێتە ناوەوە.
ـ لەوە تێگەیشتم.
ـ لەو دەریاچە «چکۆلە گەرمەدا»، یان وەک زانستی ئەمڕۆکە ناوی دەنێت لەو «شلە سەرەتاییەدا»، لە کاتێکی دیاریکراودا گەردیلەی گەورەی یەکجار ئاڵۆز دروست بووە، کە ئەو توانا سەر سوڕهێنەرەیان هەبووە کە خۆیان بەسەر دوو بەشی تەواو وەک یەکدا دابەش بکەن. لێرەشەوە سەرەتای گەشەکردنێکی دورو درێژ دەستی پێکردووە، سۆفیا. ئەگەر کەمێک سادەتری بکەینەوە، ئەوا دەتوانین بڵێین لێرەدا باس لە یەکەمین مادەی ویراسی دەکەین، واتە یەکەمینDNA ، یان یەکەمین خانەی زیندوو. خانەکە لەخۆ دابەشکردنێکی یەک بەدوای یەکدا بووە ـبەڵام هەر لەیەکەمین چرکەوە، بەردەوام گۆڕانی بایۆلۆجیش ڕوویداوە. پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی یەکجار دورو درێژ، ئەو جۆرە ئۆرگانیزمە یەک خانەییانە یەکیان گرتووە و ئۆرگانیزمی فرەخانە و ئاڵۆزتریان پێکهێناوە. ئەوجا پێکهاتەی ڕووناکی ڕووەک دروست بووە و بەو شێوەیەش ئۆکسجین هاتۆتە ناو ئەتمۆسفیرەوە. ئۆکسجینیش بوو بە هۆی ئەنجامی دوو شت؛ بوونی ئۆکسجین لە ئەتمۆسفیردا ڕێگەی بۆ دروستبوونی ئەو گیانەوەرانە خۆشکرد کە دەیانتوانی بەهۆی سیەکانیانەوە هەناسەبدەن. جگە لەوەش ئەتمۆسفیر ژیانی لە تیشکی گەردوونی دەپاراست، لەبەرئەوەی ئەو تیشکە گەردوونیانە ـکە لەوانەیە گرنگترین «پریشک» بووبن بۆ

سەرهەڵدانی یەکەمین خانەی زیندوو- زیان لە هەموو جۆرە ژیانێکیش دەدەن.
- بەڵام خۆ ئەتمۆسفیر لە شەو و ڕۆژێکدا دروست نەبووە؟
- لە پێشدا ژیان لە «دەریا» سەرەکیەکەدا دروستبوو، واتە ئەوەی کە ئەمرۆکە پێی دەڵێن «شلەی سەرەتایی». لەوێدا ئۆرگانیزمە زیندووەکان دەیانتوانی بژین و خۆشیان لە تیشکە زیان بەخشەکان بپارێزن. تەنها پاش ماوەیەکی دورو درێژ، واتە پاش ئەوەی ژیانی ناو دەریاکە ئەتمۆسفیری دروستکردبوو، ئەوجا یەکەمین وشکاوەکیەکان هاتنە دەرەوە و بەسەر زەویدا ڕۆیشتن. لێرە بەدواشەوە، وەک لەوەوبەر باسمان کرد. ئێستاکەش لێرەدا لە کوخێکدا دانیشتووین، دەگەڕێینەوە دواوە و تەماشای پرۆسێسێک دەکەین کە سێ چوار ملیارد ساڵی پێچووە، لەناوەوەشماندا ئەو پرۆسێسە دورو درێژە لە کۆتایدا بەئاگا بووە لە خۆی.
- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایا لەو بڕوایەدایت هەموو شتێک بە ڕێکەوت ڕوویدابێت؟
- نەخێر، من وام نەگوت. پۆستکارتەکەش ئەوەمان نیشان دەدات کە ئەو گەشەکردنە «ئاڕاستەیەکی» هەبووە. بەدرێژایی ملیۆنەها ساڵە، گیانەوەری وا دروستبوون کە بەردەوام سیستمی دەمارییان ئاڵۆزتر بووە و بەرە بەرەش مێشکیان گەورەتر بووە. من خۆم لەو بڕوایەدا نیم ئەمە ڕێکەوت بێت، ئەی تۆ لە چ بڕوایەکدایت؟
- پێم وانیە ڕێکەوتێکی پەتی، چاوی مرۆڤی دروست کردبێت. لەو بڕوایەدا نیت مانایەکی شاراوە لەوەدا هەبێت کە ئێمە توانای بینینی چواردەورمان هەیە؟

- گەشەکردنی چاو بەلای داروینیشەوە جێگەی سەرسوڕمان بوو. لەڕاستیدا نەیدەتوانی فیکرەیەک ڕێکبخات و بڵێت شتێکی هێندە باش و هەستیاری وەک چاو، تەنها بەهۆی هەڵبژاردنی سروشتیەوە دروستبووبێت.

سۆفیا دانیشتبوو و تەماشای ئەلبێرتۆی دەکرد. بیری لە سەیرو سەمەری ژیان دەکردەوە... لەدڵی خۆیدا دەیگوت چەندە سەیرە کە من ئێستاکە دەژیم... چەندە سەیرە تەنها ئەم جارە دەژیم و هەرگیزا و هەرگیز کەڕەتێکی تر نایەمەوە. لە پڕێکدا هاواری کرد؛

- «ئەگەر لە هەموو بارێکدا ئافەریدەکراو بەرەو عەدەم بچێت، کەواتە نرخی ئافەریدەی هەتاهەتایی دەبێت چی بێت؟.»

ئەلبێرتۆ بە تیژی تەماشایکرد و گوتی؛

- نابێت وا بڵێیت کچەکەم، ئەمە قسەی شەیتانە.

- شەیتان؟

- بەڵێ شەیتان، یان قسەکانی میفیستۆفیلیس«Mefistofeles» ە لە فاوست«Faust» ی گۆتەدا کە دەڵێت؛ «Was sol luns denn das Schaffen! Geschaffenes zu nichts hinwegzuraffen!»

- بەڵام ڕێک مانای ئەو وشانە چیە؟

- لە کاتێکدا فاوست دەمرێت و تەماشای هەموو کارەکانی ژیانی دەکات، بە شانازیەوە دەڵێت؛

«بمێنەرەوە ئەی ساتە خۆشەویستەکە!
جێگە پەنجەی ژیانی سەر زەویم،
ناتوانێت لە ئەبەدیەتدا بەبێ ناونیشان ونبێت.
من ئێستا لە چاوەڕوانی ئەو ئاسودەییە مەزنەدا،

چێژ لە خۆشترین ساتی ژیانم وەردەگرم.»

- جوانی گوتووە.
- بەڵام ئەوجا نۆبەی شەیتانە. هەر کە هەناسەکانی فاوست دەوەستێت، شەیتان هاواری لێبەرزدەبێتەوە؛

»ڕابوورد! ئەمە شێتانەترین وشەیە!
بۆچی ڕابوورد؟
خودی عەدەم و کۆتایی، تەواو چوون یەکن.
ئەگەر لە هەموو بارێکدا ئافەریدەکراو بەرەو عەدەم بچێت،
کەواتە نرخی ئافەریدەی هەتاهەتایی دەبێت چی بێت؟
ڕابوورد!
ئایا زیاتر فێربوویت؟ یاخود وەک ئەو کاتەیە کە هێشتام بوونت نەبوو؟
لەگەڵ ئەوەشدا هێشتام بەناو بازنەکەدا باوەخولەیەتی و
هەوڵی هاتنەوە دەدات.
نا، من، بەتاڵی هەتاهەتایم زۆر بەلاوە باشترە.»

- ڕەشبینانە بوو، لەبەرئەوە دەقەکەی یەکەمم بەلاوە باشترە. هەرچەندە ژیان کۆتایی هات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فاوست مانایەکی لەو شوێنەوارانەدا دەبینی کە بەجێی دەهێشتن.
- ئایا ئەمەش لە ڕاستیدا دەرئەنجامێکی تیۆریەکەی داروین نیە، کە دەڵێت ئێمە بەشداری شتێکی مەزن دەکەین، کە تێیدا بچوکترین فۆرمی ژیان، گرنگی خۆی لە گشتە گەورەکەدا هەیە؟ ئێمە ئەستێرە

زیندووەکەین سۆفیا! ئێمە ئەو کەشتیە گەورەیەین، کە بە دەوری خۆرێکی گڕاوی گەردووندا دەخولێینەوە. بەڵام هەر یەکەشمان کەشتیەکین و بە بارێکی پڕ لە «جین»ەوە بەنێو ئاوی ژیاندا تێدەپەڕین. کاتێکیش بارەکەمان گەیاندە بەندەرەکەی ئەوبەر، ئیتر ئەو کاتە ژیانمان بەهەدەر نەچووە. «بیۆنەستاین بینسن «Bjørnstjerne Bjørnson»هەمان فیکرەی لە شیعرێکدا بەم شێوەیە دەربڕی؛

«ڕێزی بەهاری هەمیشەیی ژیان بگرە،
کە هەموو شتێکی ئافەراندووە!
ڕۆژی ژیانەوە تەنانەت بە بچوکترین شتیش بەخشراوە و
تەنها شێوەکان لەناو دەچن.
نەوە نەوە دەخاتەوە و
بەردەوام دەگەنە بەهرەیەکی بەرزتر
ملیۆنەها ساڵە ڕەگەز ڕەگەز دەخولقێنێت...
جیهانەکانیش، یەک بەدوای یەکدا
دێن و دەفەوتێن...

مادام بوونت هەیە، خۆت ئاوێزانی ژیان بکە،
لەو بەهارەدا خونچەبکە،
چێژی ئەبەدیەت لەو شەو و ڕۆژە وەرگرە،
کە بە مرۆڤ بەخشراوە؛
توانا لاوەزەکەت،
پێشکەشی ئەو گێژاوە ئەبەدیە بکە

گەرچی لاوازیت و لێوان لێویت لە ئازار،
لێ سەرباری ئەوەش هەڵیمژە هەناسەی ئەو ڕۆژە ئەبەدیە«!

- بەڕاستی جوانە.
- بەڵام لێرەدا باسەکەمان دەوەستێنین. تەنها دەمەوێت بڵێم «بەشێکی نوێ.«!
- دەشێ ئیتر واز لەم ئایرۆنیە بهێنیت.
- گوتم «بەشێکی نوێ!» و تۆش دەبێت گوێڕایەڵ بیت.

## ...خواستە خۆپەرست و نەگونجاوەکەی، لەناوەوەیدا دەرکەوت...

هیلدە میوللە کنەی بە مەلەفەکەی دەستیەوە بەپەلە لە جێگاکەیدا بەرزبووەوە. مەلەفەکەی لەسەر مێزی نووسینەکەی دانا، جلەکانی هەڵگرت و بەرەو گەرماوەکەیان ڕۆیشت. یەک دوو خولەکێک خۆی خستە بەر دوشەکە و بەپەلە جلەکانی لەبەرکردەوە. ئەوجا ڕایکردە خوارەوە.
ـ نانی بەیانی ئامادەیە هیلدە!
ـ دەمەوێت لەپێشدا کەمێک سواری بەلەمە پچکۆلەکە بم!
ـ هیلدە!... بەڵام...
ڕایکردە دەرەوە و بەنێو باخچەکەدا تێپەڕی. پەتی بەلەمەکەی لێکردەوە و خۆی هەڵدایە ناویەوە. یەکسەر دەستیکرد بە سەوڵ لێدان، هێواش هێواش خێرایی سەوڵەکانی دەستی زیادی دەکرد... پاشان ئارام بووەوە.
»ئێمە ئەستێرە زیندووەکەین سۆفیا! ئێمە ئەو کەشتیە گەورەیەین، کە بە دەوری خۆرێکی گڕاوی گەردووندا دەخولێینەوە. بەڵام هەر یەکەشمان کەشتیەکین و بە بارێکی پڕ لە «جین»ەوە بەنێو ئاوی ژیاندا تێدەپەڕین. کاتێکیش بارەکەمان گەیاندە بەندەرەکەی ئەوبەر، ئیتر ئەو کاتە ژیانمان بەهەدەر نەچووە....«
هەمووی لەبەربوو. لەڕاستیدا دەیزانی هەر بۆ ئەویش نووسرابوو، نەک بۆ سۆفیا! هەموو نووسراوێکی ناو مەلەفەکە، نامەیەکی دورو درێژی بابە بوو بۆ هیلدە.

هەردوو سەوڵەکەی لە بەلەمەکە کردەوە و لەناو بەلەمەکەدا دینان. وازی لە بەلەمەکە هێنا بە ئارەزوی خۆی لە ئاوەکەدا بەرز و نزم ببێتەوە، ئاوەکەش زۆر بە نەرمی خۆی دەکێشا بە بنی بەلەمەکەدا.
هەروەک چۆن ئەو بەلەمە چکۆلەیە لەسەر ڕووکەشی ناو ئاوی کەنداوەکەی لیللەساندا بەسەر ئاوەکەوە بوو، بە هەمان شێوەش هەستی دەکرد خۆشی توێی توێکڵە گوێزێکە و بەسەر ڕووکەشی ژیانەوەیە.
سۆفیا و ئەلبێرتۆ لە چ شوێنێکی ئەم وێنەیەدان؟ بەڵێ، لە ڕاستیدا لە کوێدان؟
بەلایەوە سەختبوو باوەڕ بەوە بکات کە ئەو دوو بوونەوەرە تەنها چەند «هەڵچوونێکی ئەلیکترۆ موگناتیسی» مێشکی باوکی بن... نەیدەتوانی ڕازی بێت بەوەی کە ئەوان تەنها بەرهەمێکی کاغەز و ئامێری چاپەکەی باوکی بن و هیچی تر. گەر وا بوایە، کەواتە خۆشی لەم ڕوانگەیەوە تەنها بەرهەمی یەکگرتنی ئەو پرۆتینانەیە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لەپڕێکدا لەنێو «دەریاچەیەکی چکۆلەی گەرمدا» دروست بووە. بەڵام ئەو لەوە زیاتریش بوو... ئەو هیلدە میوللە کنەی بوو.
بێگومان مەلەفە گەورەکە دیاریەکی نایاب بوو، لە هەمان کاتیشدا دەبوایە دانی بەوەدا بنایە کە باوکی پەنجەی خستە سەر کرۆکی شتێکی هەتاهەتایی لە ناوەوەیدا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەنگی زاڵی باوکی بەسەر ئەلبێرتۆ و سۆفیادا پێخۆش نەبوو.
لەبەرئەوە دەبێت لە ڕێگەی هاتنەوەیدا بەڕاستی سەری بسوڕمێنێت، چونکە هیلدە قەرزاری ئەو دوو کەسەبوو کە دەربارەیانی دەخوێندەوە. هەستیدەکرد باوکی شایانی ئەوە بێت لە فرۆکەخانەی

**کۆبنهاگندا سەری لێبشێوێت، لەوانەشە وەک مرۆڤێکی بێدەسەڵات بۆ خۆی بەو ناوەدا هەر بخولێتەوە.**
**پاش کەمێک تەواو هێمن بووەوە. بەلەمەکەی گەیاندەوە قەراخ ئاوەکە و بەستیەوە. پاشانیش لەگەڵ دایکیدا بەهێمنی نانی بەیانی خوارد و دیسانەوە هاتنەوە سەر قسە باوەکانی خۆیان، هەروەک؛ تامی هێلکەکە زۆر خۆشبوو، بەڵام خۆزگە کەمێکی تریش بکوڵایە.**
**ئەوجا ئێوارە درەنگانێ دەستی بە خوێندنەوەی مەلەفە گەورەکە کردەوە. ئێستاکە هێندەی نەمابوو تەواوی بکات.**

دیسانەوە لەدەرگا درایەوە و ئەلبێرتۆ گوتی؛
- بۆچی گوێی خۆمانی لێ کەڕ نەکەین؟ بەو شێوەیە لەوانەیە بێزار ببێت و بڕوات.
- نەخێر، من پێم خۆشە بزانم کێیە.
سۆفیا بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و ئەلبێرتۆش دوایکەوت.
پیاوێکی ڕووت و قوت بەشێوەیەکی زۆر بەڕێزانەوە لەسەر پلیکانەکان وەستابوو و تاجێکیشی لەسەردابوو.
- باشە... ئێوەی بەڕێز بەرگی نوێی پاشاتان بەلاوە چۆنە؟
سۆفیا و ئەلبێرتۆ هەردووکیان دەمیان داپچڕی، ئەمەش وای لە پیاوەکە کرد کەمێک هەڵبچێت و هاواریکرد بەسەریاندا؛
- تەنانەت سەری ڕێزیشم بۆ دانانەوێنن!
ئەلبێرتۆ غیرەتی دایە بەرخۆی و گوتی؛
- ڕاستە، بەڵام پاشا ڕووت و قوتە.

پیاوەکە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە و بەردەوام هەر لەسەر شێوە لوتبەرزیەکەی خۆی وەستابوو. ئەلبێرتۆ بەلای ڕوی سۆفیادا چەمایەوە و بە هێواشی چرپاندی بەگوێیدا؛
- خۆی زۆر بە مرۆڤێکی ڕێک و پێک و لێهاتوو دەزانێت.
پیاوەکە دەموچاوی گرژ و مۆن کرد و لە پڕێکدا پرسی؛
- ئایا هیچ جۆرە سانسۆرێک لەم خانوەدا هەیە؟
- نەخێر بەداخەوە... ئەلبێرتۆ وەڵامی دایەوە. ئێمە لێرەدا تەواو بەخەبەرین و لە هەموو ڕوویەکیشەوە لەهەر پێنج هەستەکەمان بەئاگاین، لەبەرئەوەش ڕێگە بە پاشا نادەین بەم حاڵەتە پڕ شەرمەوە بەسەر پلیکانەکاندا بێتە ئەمماڵەوە.
سۆفیا هەستی دەکرد حاڵەتەکە شایانی ئەوە بێت گوێیان بۆ شلبکات، بەڵام بینینی پیاوی ڕووت هێندە پێکەنیناویە، لە دواجاردا خۆی پێ نەگیرا و دایە قاقای پێکەنین. هاوکات لەوە دەچوو پێکەنینەکەی نیشانەیەکی نهێنی بۆ پیاوەکە ناردبێت، ئەوجا پێی زانی کە بەتەواوەتی ڕووتە. بەهەردوو دەستی خۆی داپۆشی و بەڕاکردن خۆی گەیاندە نزیکترین دار و لەوێشەوە لەناو دارستانەکەدا ونبوو. لەوانەیە لەوێدا چاوی بە ئادەم و حەوا و نوح و کچە کڵاو سوورەکە و پیتەر پلوس بکەوێت.
ئەلبێرتۆ و سۆفیاش لەسەر قادرمەکان وەستابوون و پێی پێدەکەنین، دواتر ئەلبێرتۆ گوتی؛
- لەوانەیە ئێستاکە کاتی خۆی بێت کە بڕۆینەوە ژورەوە و دابنیشینەوە، دەمەوێت باسی فرۆید و تیۆری نائاگاییەکەیت بۆ بکەم.
دیسانەوە لەبەردەم پەنجەرەکەدا دانیشتنەوە. سۆفیا تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد و گوتی؛

- هەر لە ئێستاوە دوو و نیوە و هێشتام ئامادەکردنێکی زۆری ئاهەنگی باخچەکەشم ماوە.
- منیش هەروەها دەبێت خۆم ئامادە بکەم، بەڵام با ئێستاکە کەمێک دەربارەی سیگمۆند فرۆید «Sigmund Freud» باسبکەین.
- فەیلەسوف بوو؟
- بەهەرحاڵ دەتوانین ناوی بنێین فەیلەسوفی کەلتوری. فرۆید لە ساڵی 1856دا لەدایک بوو و لە دانیشگای فێنادا زانستی پزیشکی خوێند. هەر لەوێشدا زۆربەی ژیانی بردەسەر، ڕێک لەو کاتەدابوو کە فێنا گەشەکردنی ژیانێکی کەلتوری دەوڵەمەندی تێدا دەردەکەوت. فرۆید هەر زوو لە بەشی «نیۆرۆلۆجی«Neurologi دا (*زانستی پزیشکی دەمار.و) تایبەتمەندی وەرگرت. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا و هەتا نزیکی ناوەڕاستی ئەم سەدەیەشمان، کاری لەسەر «دەروونناسی قوڵایی» یان «شیکردنەوەی دەروونی» دەکرد.
- تکایە زیاترم بۆ ڕوونبکەرەوە.
- بەشێوەیەکی گشتی «شیکردنەوەی دەروون»، هەم وەسفکردنی حاڵەتی دەروونی و هەم شێوەی چارەسەرکردنی نەخۆشی و ئازارە دەروونیەکانیش دەگرێتەوە. لێرەدا نیازم نیە وێنەیەکی تەواوی فرۆید یان چالاکیەکانیت بۆ بکێشم. بەڵام بۆ ئەوەی تێبگەین مرۆڤ چیە (*بۆ ئەوەی لە ماهیەتی مرۆڤ بگەین.و)، ئەوا تەواو پێویستە تیۆری نائاگاییەکەی بزانین.
- هەر لەئێستاوە بەپەرۆشت کردم، فەرموو دەست پێبکە...
- بەپێی فرۆید، هەمیشە شێوە گرژیەک لەنێوان مرۆڤ و چواردەورەکەیدا بوونی هەیە. زیاتریش پەنجەی بخەینە سەر؛

گرژیەک یان «بەربەرەکانێییەک» هەیە لەنێوان غەریزە و پێویستی مرۆڤ لەلایەک و داواکردنی چواردەورەکەشی لەلایەکی دیەوە.
زیادەڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین فرۆید یەکەم کەس بوو کە غەریزەی مرۆڤی دۆزیەوە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ببێتە نوێنەرێکی گرنگی ئەو بزوتنەوە سروشتیانەی کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا سەریان هەڵدا.
ـ مەبەستت لە غەریزەی مرۆڤ چیە؟
ـ ئەقڵ، هەمیشە هەڵسوکەوتەکانمان بەڕێوە نابات. مرۆڤ هەمیشە بەو شێوەیە ئەقلانی نیە هەروەک فەیلەسوفەکانی سەدەی هەژدە دەیانویست قەناعەتمان پێبهێنن. زۆر جار هەڵچوونە نائەقلانیەکان بیرکردنەوەمان دەستنیشان دەکەن، بڕیاری خەونەکانمان و کردارەکانمان دەدەن. ئەو جۆرە هەڵچوونە نائەقلانیانەش دەکرێت دەربڕینێکی غەریزەی قوڵی یان پێویستیەکی قوڵی مرۆڤ بن. بۆ نمونە غەریزەی سێکسی مرۆڤ، هەروەک پێویستی شیرخواردنی منداڵ، پێویست و بنچینەییە.
ـ تێدەگەم.
ـ لەوانەیە ئەمە خۆی لە خۆیدا دۆزینەوەیەکی نوێ نەبووبێت. بەڵام فرۆید سەلماندی کە ئەو جۆرە پێویستیە بنچینەییانە، پێیدەچێت «پەردەپۆش بکرێن» یان بگۆڕێن بۆ شتێکی تر و بەو شێوەیەش بەبێ ئەوەی بەئاگابین لێیان، هەڵسوکەوتمان بەڕێوە بەرن. جگە لەوەش فرۆید بەئاگابوو لەوەی کە منداڵی بچوکیش جۆرە چالاکیەکی سێکسی هەیە. کۆمەڵەی ڕۆشنبیرانی فێناش ڕقیان لەباسی «چالاکی سێکسی منداڵ» بوو، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر ناوبانگی فرۆیدی کەمکردەوە.
ـ ئەوە سەرم ناسوڕمێنێت.

- ئەمڕۆکە باسی قۆناخی «فیکتۆریانیزم Victorianism» دەکەین، واتە ئەو کاتەی کە هەموو شتێک دەربارەی چالاکی سێکسی وەک تابویەک تەماشای دەکرا. فرۆید چالاکی سێکسی مندالّی لە ڕێگەی کارەکەیەوە بۆ دەرکەوت وەک دکتۆرێکی دەروونناس. واتە بەڵگەکانی بنچینەیەکی ئیمپیریستیان هەبوو –یان لە ڕێگەی تاقیکردنەوەوە پێیگەیشتبوو. جگە لەوەش لە ڕێگەی ئەزمونەوە بۆی دەرکەوت کە زۆر لە حاڵەتە دەماریەکان یان نەخۆشیە دەروونیەکان دەگەڕێنەوە بۆ ناتەباییەکانی سەردەمی مندالّی. بەم شێوەیەش بەرە بەرە کاری لەسەر شێوەیەکی چارەسەرکردن دەکرد، کە دەتوانین ناوی بنێین «ئەرکیۆلۆژی دەروونی.»

- مەبەستت لەوە چیە؟

- وەک دەزانیت ئەرکیۆلۆژ هەوڵدەدات شوێنەواری ڕابووردویەکی دور بدۆزێتەوە، ئەمەش لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی چەندین چینی جیاواز جیاوازی کەلتوریەوە بەجێدەهێنێت. لەوانەیە چەقۆیەک بدۆزێتەوە کە بگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدە. لە کەمێک قوڵتری لێکۆڵینەوەکانیدا، لەوەیە شانەیەکی سەدەی چواردە بدۆزێتەوە. لەوەش قوڵتر، پێدەچێت گۆزەیەکی سەدەی پێنج بەدیبکات.

- بەڵێ؟

- بە هەمان شێوەش شیکەرەوەیەکی دەروونی، بە هاریکاری نەخۆشەکەی، دەتوانێت بچێتە قوڵایی ئاگایی نەخۆشەکەوە و ئەو ئەزمونانە بهێنێتە پێشەوە کە کاتی خۆی بوونەتە هۆی ئازاردانی دەروونی کەسەکە. چونکە بەپێی فرۆید هەموو یادوەریەکانمان لە قوڵایی ناوەوەماندا کۆدەکەینەوە.

- ئەوجا تێدەگەم.

- لەوانەیە بەسەرهاتێکی پڕ لەئازار بدۆزێتەوە کە نەخۆشەکە بە درێژایی چەندین ساڵ هەوڵیدابێت لەیادی خۆی بەرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە قوڵایی دەروونیدا ماوەتەوە و توانای نەخۆشەکەی سست کردووە. لە ڕێگەی هێنانە دەرەوەی «ئەزموونێکی پڕ ئازاری» بەو جۆرە بۆ ناو ئاگایی و خستنە بەرچاوی نەخۆشەکە، کەسەکە دەتوانێت «کۆتایی پێ بهێنێت»، واتە دەتوانێت بەم شێوەیە چاکببێتەوە.

- زۆر لۆجیکیانەیە.

- بەڵام من زۆر خێرا لەباسەکەدا دەڕۆمە پێشەوە، لەبەرئەوە با لە پێشدا بزانین فرۆید بە چ شێوەیەک وەسفی دەروونی مرۆڤ دەکات... هەرگیز منداڵی پچکۆلەت بینیووە؟

- کۆڕی مامێکم چوار ساڵانە.

- کاتێک دێینە ناو جیهانەوە، بە شێوەیەکی زۆر ڕاستەوخۆ و ساکار پێویستیە فیزیاوی و دەروونیەکانمان دەردەبڕین. بۆ نمونە ئەگەر شیرمان نەدەنێ، هاواردەکەین. لەوانەیە هەمان شتیش بکەین ئەگەر داییبیەکەمان تەڕ بێت. لەسەرو ئەوەشەوە، بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕاستەوخۆ خواستی پێکەوە بوون و سۆزی لەیەکتر نزیکبوونەوە دەخوازین. فرۆید بەم «غەریزەیە» یان بەم «پرێنسیپی ویست»ەی دەگوت «پرێنسیپی غەریزە». وەک منداڵێکی بچکۆلەش، تاڕادەیەک هەر غەریزەین و هیچی تر.

- بەردەوام بە!

- پرێنسیپی غەریزە بە درێژایی ژیانمان لە گەڵماندا دەمێنێتەوە. بەڵام هێدی هێدی فێردەبین ویستەکانمان بە شێوەیەک ڕێک بخەین کە لەگەڵ چواردەورەکەماندا بگونجێت. واتە فێردەبین پرێنسیپی

هەقیقەت لەبەری پرێنسیپی غەریزە (یان پرێنسیپی ویست) دابنێین. فرۆید دەڵێت «خود»ێک هەڵدەچنین، کە کاری ئەو ڕێکخستنە دەگرێتە ئەستۆی خۆی. ئەو کاتەش هەرچەندە شتێکیش بخوازین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناگرین و هاوار ناکەین هەتاوەکو خواستەکەمان دێتە دی یان هەتاوەکو پێویستیەکەمان تێر دەکرێت.

ـ بێگومان نا، ئاشکرایە.

ـ پاشان ڕێی تێدەچێت شتێکمان زۆر بەتوندی بوویێت و لە هەمان کاتیشدا لەلایەن چواردەورەکەمانەوە قبولْ نەکرێت. ئەوجا ناچاردەبین خواستەکەمان «بچەپێنین»، واتە هەوڵدەدەین پاڵیان پێوە بنێین و لەیادیان بکەین.

ـ تێدەگەم.

ـ بەڵام بەپێی فرۆید «چالاکیەکی» تریش لە دەروونی مرۆڤدا بوونی هەیە. هەر لە سەردەمی منداڵیمانەوە بەرەنگاری داوا مۆراڵیەکانی دایک وباوک و چواردەورەکەمان دەبینەوە. کاتێک کە شتێکی هەڵە دەکەین، ئەوسا دایک و باوک دەڵێن؛ «نا، بەو شێوەیە نابێت!» یان دەڵێن «هۆ هۆو، چەندە بێ گوێیت». هەرچەندە کاتێک گەورەش دەبین، بەڵام لەناوەوەماندا ئەو جۆرە داوا مۆراڵیانە و حوکمی پێشترانە لەگەڵ خۆماندا ڕادەکێشین. دواتریش وەک ئەوە وایە کە چاوەڕوانکردنی چواردەورمان و حوکمدانیان، لەناوەوەماندا بمێننەوە و ببن بە بەشێک لەئێمە. فرۆید بەوەی دەگوت «خودی سەرو.«

ـ مەبەستی لە ویژدان بوو؟

ـ ویژدانیش بەشێکە لە «خودی سەرو». بەڵام بەبڕوای فرۆید، «خودی سەرو» ئەو کاتانە ئاگادارمان دەکاتەوە کە لە شتێکی «خراپ» یان کە لە شتێکی «نەگونجاو» نزیک دەکەوینەوە. بەتایبەتیش کاتێک کە

پەیوەندی بە خواستێکی سێکسیەوە هەبێت. هەروەک گوتمان فرۆید پێی وابوو ئەو جۆرە «خواستە نەگونجاوانە»، هەر لە سەردەمی منداڵیەوە لەناوەوەماندا بن.

- چۆن؟

- ئەمڕۆکە دەزانین کە منداڵی بچوک خۆشحاڵ دەبێت بە دەست لێدانی ئەندامی سێکسی خۆی. ئەمەش شتێکە بۆ نمونە لە هەموو مەلەوانگەیەکدا دەبینرێت. لە سەردەمی فرۆیددا ئەو منداڵە دوو سێ ساڵانەی شتێکی ئاوهای بکردایە، زلەیەکیان لە دەستی دەدا. لەوانەشە دایکەکەی پێی گوتبێ؛ «چ بێشەرمیت، دەستت لابە!» یان «دەستت دەربهێنە.»!

- ئەوە شێتێتیە!

- بەو شێوەیەش هەرچی شتێک پەیوەندی بە ئەندامی سێکسی و سێکسەوە هەبێت، دەبێتە مایەی هەستکردن بە گوناح. زۆر جاریش ئەم هەستی گوناحەش هێندە بە توندی لە «سەرو خود»دا دەمێنێتەوە کە خەڵکانێکی زۆر –بەپێی فرۆید زۆرینەی خەڵکی- بەدرێژایی ژیانیان هەست بە گوناح دەکەن، هەڵبەتە سەبارەت بە هەموو شتێک کە پەیوەندی بە سێکسەوە هەبێت. لە هەمان کاتیشدا فرۆید دووپاتی دەکردەوە کە خواستی سێکسی و پێویستی سێکسی، شتێکی سروشتیە و بەلایەن مرۆڤەوە گرنگە. لێرەشەوە، کچە باشەکەم سۆفیا، بەدرێژایی ژیان بەربەرەکانیەک یان ناتەباییەک لە نێوان ویست و هەستکردن بە گوناحدا بەرپادەبێت.

- لەو بڕوایەدانیت ئێستاکە ئەو بەربەرەکانیە، بەبەراوردکردنی لەگەڵ سەردەمی فرۆیددا کەمتر بووبێتەوە؟

- بێگومان. بەڵام هەندێک لە نەخۆشەکانی فرۆید هێندە بە توندی لەو بەربەرەکانێیەدا دەژیان، کە گەیشتبووە ڕادەی نەخۆشی دەمار لەلایان، هەروەک فرۆید ناوی نابوو «دەماری دەروونی». بۆ نمونە یەکێک لە نەخۆشەکانی بە نهێنی لەگەڵ مێردی خوشکەکەیدا کەوتبووە خۆشەویستیەوە، دواتر خوشکەکەی بە نەخۆشی دەمرێت، ئەویش لە دڵی خۆیدا دەڵێت؛ «ئێستاکە مێردەکەی ئازادە و دەتوانێت بمهێنێت!». ئەو بیرکردنەوەیەش هێندە نەگونجاو بووە بەلایەوە، هەروەک فرۆید دەڵێت یەکسەر «چەپاندویەتی». واتە گەڕاندویەتیەوە بۆ ناو قولایی نائاگایی. لەم بارەیەوە فرۆید نووسیبووی؛ «کچە گەنجەکە نەخۆش کەوت و ئێستاکە نیشانەی هێستریای تێدا دەبینرێت. لە کاتی چارەسەرکردنیدا، دەرکەوت کە بینینی مردنی خوشکەکەی بەتەواوەتی لەیادکردوە و خواستە خۆپەرست و نەگونجاوەکەی لە ناوەوەیدا دەرکەوت. بەڵام لەژێر چارەسەرکردندا توانی بیری بکەوێتەوە؛ ئەو چرکەیەی بیرکەوتەوە کە ببووە هۆی نەخۆشیەکەی، بە هەڵچوونێکی توندی مێشکیەوە گەڕاندیەوە و لەسەر ئەم چارەسەرکردنە بەردەوامبوو هەتاوەکو چاکبووەوە.»

- ئێستاکە دەزانم مەبەستت لە «ئەرکیۆلۆژی دەروونی» چیە.

- لێرەشەوە دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی وەسفێکی دەروونی مرۆڤ بکەین. فرۆید پاش تاقیکردنەوەیەکی دورو درێژ لەگەڵ چارەسەرکردنی نەخۆشەکانیدا، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە «ئاگایی» مرۆڤ تەنها بەشێکی چکۆلەی مرۆڤ پێکدەهێنێت. ئاگایی وەک ئەو بەشەی چیای بەفرینی ناو ئاو وایە کە بەسەر ئاوەکەوەیە. لەژێر ڕوی ئاوەکەدا —یان لەژێر سنووری ئاگایدا- «ئەقڵی شاراوە یان ئەقڵی نەزانراو»مان هەیە.

ـ ئایا نائاگایی هەموو ئەو شتانەی ناوەوەمان دەگرێتەوە کە لە یادمان کردوون و بە بیرماندا نایەنەوە؟
ـ وەک دەزانیت هەمیشە هەموو ئەزمونەکانمان لە ئاگایدا ئامادەنین. بەڵام هەموو ئەو شتانەی کە بیرمان لێکردونەتەوە و بینیومانن و دەتوانین بەبێ ئەوەی «هەوڵی زۆریان» لەگەڵدا بدەین بیرمان بکەونەوە، فرۆید ناوی نابوون «پێش ئاگایی». زاراوەی «نائاگایی»شی بۆ ئەو شتانە بەکاردەهێنا کە «چەپاندومانن». واتە ئەو بیرکردنەوە و شتانەی کە هەوڵماندوە بە زۆرەملێ لەیادیان بکەین، لەبەرئەوەی «نەگونجاو» و «ناشیرین» یان «بێزارکەر» بوون. کاتێک ئاگایی ـیان سەرو خود- بەرگەی خواستێک یان ویستێکمان ناگرێت، ئەوا پاڵیان پێوە دەنێتە چینی خوارەوە. دوریان دەخەینەوە!
ـ باش تێدەگەم.
ـ ئەم میکانیزمە لەلای هەموو مرۆڤێکی ساخ کاردەکات. بەڵام بەلای هەندێ کەسەوە دورخستنەوەی بیرکردنەوەی نەگونجاو لە ئاگاییدا زۆر سەختە، تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی دەبێتە هۆی نەخۆشی دەماری. ئەو شتەی کە بەو شێوەیە بچەپێنرێت، لە ڕاستیدا هەر خۆی بۆ خۆی هەوڵدەدات سەرلەنوێ لە ئاگاییدا دەرکەوێتەوە. لەبەر ئەو هۆیە هەندێ خەڵک پێویستیان بە وزەی زیاتر هەیە بۆ ئەوەی ئەو جۆرە بیرکردنەوانە لەبەردەم ڕەخنەی ئاگاییدا لابەرن. فرۆید لە ساڵی 1909دا لە ئەمریکادا وتارێکی دەربارەی شیکردنەوەی دەروونی خوێندەوە، لەوێدا بە نمونەیەک چۆنیەتی کارکردنی میکانیزمی چەپاندنی ڕوونکردەوە.
ـ باسی کە!

ـ گوتی؛ «با وایدابنێین یەکێک لەم هۆڵەدا... گێرەشێوێنە و دەیەوێت سەرنجم لەسەر خوێندنەوەکەم لابەرێت، بەدەنگی بەرز پێدەکەنێت و هاواردەکات و بە قاچیشی تەپەتەپ دەکات. منیش دەڵێم لەم بارودۆخەدا ناتوانم بەردەوامبم، لەبەرئەوە چەند پیاوێکی بەهێز هەڵدەسن و بەزۆر پیاوە دەنگ بەرزەکە دەکەنە دەرەوە. واتە پیاوەکەیان «چەپاند» و منیش ئێستاکە دەتوانم لەسەر خوێندنەوەکەم بەردەوام بم. بۆ ئەوەی جارسکردنەکە ڕوونەداتەوە — واتە بۆ ئەوەی نەهێڵن دیسانەوە پیاوەکە هەوڵبدات بێتەوە ژورەوە- ئەو پیاوانەی کە ویستی منیان بەجێهێنا، بە خۆیان و کورسیەکانیانەوە دەچنە بەردەمی دەرگاکە دادەنیشن و دەبنە «ڕێگرێک»ی کەسە چەپێنراوەکە —واتە بۆ ئەوەی چەپاندنەکە سەربگرێت. ئەگەر هۆڵەکە وەک «ئاگایی» و دەرەوەش وەک «نائاگایی» تێبگەن، ئەوا وێنەیەکی باشی پرۆسێسی چەپاندنتان لا ڕووندەبێتەوە.

ـ لەگەڵیدا تەبام کە نمونەیەکی نایابە.

ـ بەڵام «پیاوە جارسکەرەکە» دەیەوێت دیسانەوە بێتەوە ژوورەوە، سۆفیا. بەلایەنی کەمەوە هەمان شت بەسەر بیرکردنەوە و هەڵچوونی چەپێنراودا دێت. ئێمە بەردەوام لەگەڵ «فشاری» بیرکردنەوە چەپێنراوەکاندا دەژین، کە هەوڵدەدەن بگەنەوە ناو ئاگایی. لەبەرئەوە زۆرجار شتێک دەکەین یان شتێک دەڵێین کە هیچ «مانایەکی» نیە. بەم شێوەیەش کاردانەوەی نائاگاییمان دەتوانێت جڵەوی هەست و هەڵسوکەوتەکانمان بەدەستەوە بگرێت.

ـ دەتوانیت نمونەیەک بهێنیتەوە؟

- فرۆید کاری لەسەر شێوەی جیاواز جیاوازی ئەو میکانیزمە دەکرد. یەکێک لەوانە ئەوەبوو کە پێی دەگوت «بەرپەرچدانەوەی هەڵە». واتە بەبێ مەبەست شتێک دەڵێین یان شتێک دەکەین، کە لەوەوپێش چەپاندومانە. فرۆید خۆی نمونەیەک دەهێنێتەوە، باسی کرێکارێک دەکات کە دەبوایە پێکەکەی بەرزبکردایەتەوە و بەخۆشی خاوەنکارەکەیەوە بیخواردایەتەوە، بەڵام خاوەن کارەکەی کەسێکی خۆشەویست نەبوو، بەڵکو ڕێک پیاوێکی پیس و بەد بوو.

- بەڵێ، ئەوجا چی ڕوویدا؟

- کرێکارەکە پێکەکەی بەرزکردەوە و زۆر بەڕێزەوە هەڵسا و گوتی؛ «با بەخۆشی خاوەنکاری بەدفەڕمانەوە نۆشیکەین.«!

- نازانم بڵێم چی!

- کرێکارەکەش هەروەها نەیدەزانی چی بڵێت. لەبنەڕەتدا ڕێک ئەو شتەی گوت کە بەڕاستی بیری لێدەکردەوە، بەڵام مەبەستی نەبوو بیڵێت. نمونەیەکی ترشیت بۆ بهێنمەوە؟

- پێشم خۆش دەبێت.

- جارێکیان لەماڵی قەشەیەکدا کە کۆمەڵێ کچی جوان و شیرینی هەبوو، چاوەڕوانی میوانی قەشەیەکی گەورەتر بوون. بەڵام لوتی قەشە گەورەکە لەڕادەبەدەر گەورەبوو، لەبەرئەوە هەموو کچەکان ئاگادارکرانەوە کە زۆر وریابن و هیچ شتێک دەربارەی نەڵێن. زۆرجار ڕوودەدات کە منداڵی پچکۆلە بە شێوەیەکی سروشتی ڕاستی دەردەپەڕێنن و دەیدەن بە چاوی خەڵکیدا، لەبەرئەوەی هێشتام میکانیزمی چەپاندن لەلایان هێندە بەهێز نەبووە.

- بەڵێ.

ـ قەشە گەورەکە گەیشت و کچە بەئەدەبەکانیش تا ئەو پەڕی ڕادە زۆریان لەخۆیان دەکرد هیچ شتێک دەربارەی لوتی نەڵێن. لەوەش زیاتر؛ هەوڵیاندەدا بە هیچ جۆرێک تەماشای لوتی نەکەن، چونکە دەبوایە لەیادیان بکردایە. لەبەرئەوە هەمیشە بیریان لێدەکردەوە. پاشان یەکێک لە کچە بچکۆلەکان قاوەی گێڕا و زۆر بە ئەدەبەوە لێی پرسی؛ «حەز دەکەن کەمێک شەکر بکەنە لوتتانەوە؟.«
ـ چەند شەرمە!
ـ هەندێ جارییش هەوڵی «بەئەقڵانیەتکردنی» شتەکان دەدەین، واتە هەوڵدەدەین هەم بۆ خۆمان و هەم بۆ چواردەورەکەشمان چەندەها هۆی جیاواز جیاواز بهێنینەوە، بەڵام تەنها بۆ ئەوەی هۆ ڕاستیەکە نەدرکێنین. ئەمەش ڕێک لەبەرئەوەیە کە هۆ ڕاستیەکە جێی شەرمە.
ـ بە یارمەتیت نمونە بهێنەرەوە.
ـ بۆ نمونە لە ژێر خەوی موگناتیسیدا وات لێدەکەم پەنجەرەیەک بکەیتەوە. لە کاتێکدا دەتخەوێنم، دەڵێم کە من دەستم کێشا بە مێزەکەدا، تۆ هەڵدەسیت و پەنجەرەکە دەکەیتەوە. دواتر لێت دەپرسم بۆچی پەنجەرەکەت کردەوە؟ تۆش لەوانەیە بڵێیت لەبەرئەوەی گەرمام بوو، بەڵام ئەوە هۆ ڕاستیەکە نیە. لە ڕاستیدا ناتەوێت لەبەردەم خۆتدا دان بەوەدا بنێیت کە تۆ بە فرمانی من پەنجەرەکەت کردۆتەوە، لەبەرئەوە دەتەوێت کارەکەت «بەئەقڵانی کردن» پەردەپۆش بکەیت، سۆفیا.
ـ بەڵێ، پێم وابێت ڕاستە.
ـ تا ڕادەیەک ئەو جۆرە «زمانە دوولایەنیانە»، ڕۆژانە بەسەر هەمووماندا دێت.

- پێم گوتیت کە کوڕی مامێکم تەمەنی چوار ساڵانە. پێم وابێت هێندە برادەری زۆری نیە کە یاریان لەگەڵدا بکات، بەهەرحاڵ بە بینینی من زۆر شادمان دەبێت. کەڕەتێکیان پێم گوت دەبێت بگەڕێمەوە ماڵەوە بۆ لای دایکم، بەڵام دەزانیت چی پێ گوتم؟
- چی گوت؟
- گوتی «دایکت بێ ئەقڵە.»!
- ئەمە بەڕاستی نمونەیەکی نایابی بە ئەقڵانیەت کردنە. منداڵەکە هیچ مەبەستێکی وای لە قسەکەیدا نیە، بەڵام مەبەستیەتی بڵێت پێم ناخۆشە کە تۆ دەڕۆیت، بەڵام هەروەک چۆن بڵێین، شەرمە بەلایەوە دانی پێدا بنێت... هەندێ جاری تریش ڕوودەدات شتەکانی ناوەوەمان بەسەر چواردەورەکەماندا دەچەسپێنین.
- مەبەستت چیە؟
- واتە ئەو بیرکردنەوە و هەستانەی کە لە ناوەوەماندا هەوڵدەدەین بیان چەپێنین، دەیانخەینە سەر خەڵکانی دی. بۆ نمونە کەسێک کە خۆی چاوچنۆکە، زۆر ئازایانە دێت و خەڵکانی تر بە چاوچنۆک لەقەڵەم دەدات. یان کەسێک کە نایەوێت لەناوەوەیدا دان بەوەدا بنێت کە زۆر گرنگی بە سێکس دەدات، لەوانەیە یەکەم کەس بێت کە بە باسکردنی کەسانێک کە خولیای سێکسن، پەست ببێت.
- ئێستاکە تێدەگەم.
- فرۆید لەو بڕوایەدا بوو کە ژیانمان پڕ بێت لەو جۆرە هەڵسوکەوتە نائاگاییانە. بۆ نمونە ڕوودەدات هەمیشە ناوی کەسێکی دیاریکراومان بیر بچێتەوە، یان لە کاتی قسەکردندا دەست بەجلەکانماندا دەهێنین، یان بەبێ ئەوەی بەئاگابین شتەکانی ژورێک ئاڵوگۆڕ دەکەین. ڕووشدەدات زمانمان تەتەڵە بکات و شتی وا بڵێین کە تەواو

بێگوناحانە دیارن. بەڵام بە بڕوای فرۆید ئەو جۆرە هەڵەی زمانانە هەمیشە ڕێکەوت و بێگوناح نین وەک ئەوەی ئێمە مەزەنەیان دەکەین. ئەو دەیگوت دەبێت وەک «نیشانە» تەماشا بکرێن. ئەو جۆرە «هەڵسوکەوتە هەڵانە» و «کردارە ڕێکەوتانە» لەڕاستیدا پێدەچێت قوڵترین نهێنیەکانی ئێمە دەربخەن.

ـ لە ئێستا بەدواوە زۆر ئاگاداری هەموو وشەیەک دەبم کە دەیڵێم.

ـ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانیت لەدەست هەڵچوونی نائاگاییت ڕابکەیت. لەڕاستیدا هونەرەکە لەوەدایە کە هێزێکی زۆر بەکارنەهێنیت بۆ ئەوەی ئەو شتە ناخۆشانە فڕێ بدەیتە ناو نائاگاییەوە. وەک ئەوە وایە هەوڵبدەیت لە باخچەکەتاندا کونی مشکە کوێرەیەک بگریت. لەوێدا دەتوانیت بەتەواوەتی دڵنیابیت کە لە شوێنێکی تری باخچەکەوە سەرهەڵدەداتەوە. لە ڕاستیدا زۆر باشترە کە دەرگایەک لەنێوان ئاگایی و نائاگایدا بەکراوەیی بەجێبهێڵیت.

ـ ئەی ئەگەر ئەو دەرگایە دابخەین، ئایا ئەوسا تووشی نەخۆشی دەروونی دەبین؟

ـ بەڵێ، ئەو کەسەی کە نەخۆشی دەماری هەیە، ڕێک ئەو کەسەیە کە وزەیەکی زۆر بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی «شتە ناخۆشەکان» لە ئاگاییدا دەربکات. زۆر جاریش «شتە ناخۆشەکان» ئەزمون و بەسەرهاتی کۆنی تایبەتیە، کە دەبێت بچەپێنرێن. فرۆید بەو جۆرە ئەزمونانەی دەگوت "تراوما «traume» "، ئەمەش وشەیەکی یۆنانیە و مانای «ئازار» دەبەخشێت.

کاتێک فرۆید چارەسەری نەخۆشەکانی دەکرد، هەوڵی کردنەوەی ئەو دەرگا داخراوەی بە یەکێک لە شتە هەرە گرنگەکان دادەنا ـیان

هەوڵی دەدا دەرگایەکی نوێ بکاتەوە. واتە بە هاریکاری نەخۆشەکە دەیویست ئەزمونە چەپێنراوەکان دیسانەوە بهێنێتە دەرەوە. وەک دەزانیت نەخۆشەکە خۆی لە شتە چەپێنراوەکانی بەئاگا نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە زۆر بەپەرۆش بێت و یاریدەی دۆزینەوەی «ئازارە» شاراوەکانی بدات.

- ئەی پزیشکەکە چۆن چۆنی دەست پێدەکات؟

- فرۆید گەشەی بە شتێکدا کە خۆی ناوی نابوو «تەکنیکی هاریکاری ئازاد». واتە ڕێگەی بە نەخۆشەکە دەدا بە ڕاشکاوی پاڵبکەوێت و بە ئارەزوی خۆی باسی ئەو شتانە بکات کە بە خەیاڵیدا دێن، هەرچەندە ئەگەر باسەکانیشی شتی ڕێکەوت و ناگرنگ و ناخۆشیش بن، یان بۆ نمونە جێگەی شەرمیش بن. لێرەدا هونەرەکە ڕێک لەوەدایە کە ئەو «سەرقاپە» یان ئەو «کۆنترۆڵە» بشکێنرێت کە خۆی بەسەر ئازارەکاندا داوە، لەبەرئەوەی ئەو ئازارانەیە کە جێگەی بایەخی نەخۆشەکەن و هەمیشە لە چالاکیدان و کاریگەری خۆیان هەیە، بەڵام تەنها ئەوەندەیە کە نەخۆشەکە بێ ئاگایە لێیان.

- واتە هەتاوەکو زیاتر هەوڵبدەین شتێک لە یادبکەین، نائاگایمان زیاتر و زۆرتر بیری لێدەکاتەوە، وا نیە؟

- بەڵێ زۆر ڕاستە. لەبەرئەوە زۆر گرنگە گوێ بۆ نیشانەکانی نائاگایی شل بکەین. بەپێی فرۆید، «خەونەکانمان» خودی ئەو «شا ڕێگە»یەیە کە ڕێک بۆ ناو نائاگاییمان دەچێت. لەوانەیە کتێبی «لێکدانەوەی خەونەکان»ی فرۆید کە لە ساڵی 1900دا دەرچوو، گرنگترین کتێبی بێت، لەوێدا بۆمان ڕووندەکاتەوە کە ئێمە بە شێوەیەکی ڕێکەوت خەو نابینین، بەڵکو لە ڕێگەی خەونەکانەوە نائاگاییمان هەوڵدەدات خۆی بگەیەنێتە ئاگایی.

ـ بەردەوام بە!

ـ فرۆید پاش کۆکردنەوەی ئەزمونی چەند ساڵەی لەگەڵ نەخۆشەکانیدا ـهەروەها بەهۆی شیکردنەوەی خەونەکانی خۆشیەوە- گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە خەونەکان «خواستەکانمان دەهێننە دی». ئەو دەڵێت ئەمە شتێکە کە زۆر بە ئاشکرایی لە منداڵاندا دەبینرێت. منداڵان خەون بە گێلاس و دۆدرمەوە دەبینن. بەڵام بەلای گەورەکانەوە، زۆر جار خواستەکان ـواتە ئەو شتانەی کە لە خەوندا دەهێنرێنە دی- بە بەرگێکی تر دادەپۆشرێن، چونکە لە کاتی خەوتنیشدا سانسۆرێکی توندو تیژ لەسەر ئارەزوەکانمان دادەنێین. بێگومان ئەو سانسۆرە یان ئەو میکانیزمی چەپاندنە لە کاتی خەودا لاوازترە وەک لەو کاتەی کە بەخەبەرین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێندە بەهێزە کە لە کاتی خەونیشدا ئەو خواستانە دەگۆڕێت کە ناوێرین دانیان پێدا بنێین یان ناوێرین قبوڵیان بکەین.

ـ لەبەرئەمەیە کە دەبێت خەونەکانمان لێکبدەینەوە؟

ـ فرۆید دەڵێت؛ دەشێت ئەو خەونەی کە بەیانیان بە بیرمان دێتەوە، لەگەڵ مانای ڕاستەقینەی خەونەکەدا جودا بکەینەوە. ئەو ناوی وێنە خەونیەکانی نابوو «جەوهەری ئاشکرا یان جەوهەری دیاری خەون» - واتە ئەو «فلیمەی» یان ئەو «ڤیدیۆی» خەوەی کە دەیبینین. ئەم جەوهەرە «ئاشکرایەش» هەمیشە کەرەسەکانی ـیان مادەکانی- لە ڕووداوی ڕۆژی پێشووترەوە دەهێنێت. بەڵام خەون مانایەکی قوڵیشی هەیە کە بەلای ئاگاییەوە شاراوەتەوە. فرۆید بەمەی دەگوت «بیرکردنەوەی خەفەبووی خەون»، ئەم بیرکردنەوە شاراوانەش، کە لە ڕاستیدا ناواخنی خەونەکەیە، زۆر جار لە ڕابووردوی نەخۆشەکەوە

سەرچاوە دەهێنن –بۆ نمونە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی نەخۆشەکە.
ـ کەواتە بۆ ئەوەی لە بابەتی خەوەکە بگەین، ناچارین شیبکەینەوە.
ـ بەڵێ، هەرچی دەربارەی مرۆڤی نەخۆشیشە، ئەوا دەبێت کارەکەی لەگەڵ پزیشکێکی تایبەتمەندا بکات. بەڵام پزیشکەکە خەونەکە لێک ناداتەوە، بەڵکو هەموو کارەکەی بە هارکاری نەخۆشەکەی دەکات. لەو حاڵەتەشدا ڕۆڵی دکتۆرەکە وەک «مامانێکی» سوکراتی وایە، کە لەوێدا ئامادەیە و یاریدەی لێکدانەوەی خەونەکە دەدات و هیچی تر.
ـ بەڵێ تێدەگەم.
ـ فرۆید بە گۆڕانی «بیرکردنەوەی خەفەبووی خەون» بۆ «جەوهەری ئاشکرای خەون»ی دەگوت «کردەی خەون». لێرەدا دەتوانین باس لە «دەمامکێک» یان «هێما»یەکی بابەتی ڕاستەقینەی خەونەکە بکەین. بەم شێوەیە لە کاتی لێکدانەوەی خەوندا، لایەنی پێچەوانەی پڕۆسێسەکە دەگرین، واتە بۆ ئەوەی لە «بابەتی» ڕاستەقینەی خەونەکە بگەین، دەبێت دەمامکە «هاندەرەکە» هەڵماڵین، یان دەبێت «هێمای» پاڵپێوەری خەونەکە بدۆزینەوە.
ـ دەتوانیت نمونەیەک بهێنیتەوە؟
ـ کتێبی «لێکدانەوەی خەونکانی» فرۆید پڕە لە نمونە، بەڵام خۆمان دەتوانین نمونەیەکی ئاسان و لەهەمان کاتیشدا نمونەیەکی فرۆیدی بهێنینەوە؛ گریمان پیاوێکی گەنج لە خەونیدا کچی مامەکەی دوو میزەڵدانی دەداتێ...
ـ بەڵێ، ئەی پاشان؟
ـ دەی، خۆت هەوڵبدە مانای خەونەکەی لێکبدەیتەوە.

ـ ئمممم... کەواتە «جوهەری ئاشکرای خەونەکە» هەروەک خۆت گوتت؛ دوو میزەڵدان لە کچی مامەکەیەوە وەردەگرێت.
ـ بەردەوام بە!
ـ هەروەها گوتت هەموو کەرەسەکانی خەونەکە لە ڕۆژی پێشووترەوە دەهێنرێت... کەواتە لەوانەیە لە شاری یاری بووبێت، یان لەوانەیە لە ڕۆژنامەیەکدا وێنەی دوو میزەڵدانی بینیبێت.
ـ بەڵێ ڕێی تێدەچێت، بەڵام تەنها پێویستی بە بینینی وشەی «میزەڵدان» بووە، یان بینینی شتێک کە لەو دەچێت.
ـ بەڵام ئەی «ناواخنی خەفەبووی خەونەکە» چیە؟ واتە بابەتی ڕاستەقینەی خەونەکە.
ـ تۆ خەونەکە لێکدەدەیتەوە.
ـ لەوانەیە هەروا حەزی کردبێت یەک دوو میزەڵدانی هەبێت.
ـ نەخێر، ئەوە لێکدانەوەیەکی لاوازە. لەوەدا ڕاست دەکەیت کە خەونەکە دەبێت خۆزگەیەک بهێنێتە دی. بەڵام سەختە پیاوێکی گەورە میزەڵدانێک بخوازێت، ئەگەر واشبوایە ئەوا پێویستی بەوە نەدەکرد خەونی پێوە ببینێ.
ـ پێم وابێت ئێستاکە تێگەیشتم! لە ڕاستیدا کچی مامەکەی دەوێت و دوو میزەڵدانەکەش مەمکەکانین.
ـ بەڵێ، ئەم لێکدانەوەیەت زیاتر ڕێی تێدەچێت. بەڵام لەسەر ئەو بنەمایەی کە کوڕەکە خواستەکەی وەک شتێکی پڕ شەرم ببینێت.
ـ بەم شێوەیەیش خەونەکانمان بە چەندەها ڕێگەی پێچاوپێچدا دەڕۆن، وایە؟
ـ بەڵێ، فرۆید لەو بڕوایەدابوو کە خەون «تێرکردنێکی پەردەپۆشراوی خواستە چەپێنراوەکان بێت». بەڵام ئەو شتانەی کە دەیانچەپێنین

لەوانەیە بە بەراوردکردنی لەگەڵ ئەو کاتەی فرۆید لە فیێنادا دکتۆر بوو، گۆڕانکاریەکی زۆری بەسەردا هاتبێت، بەڵام خودی ئەوەی کە خەونەکان پەردەپۆش دەکەین، پێدەچێت ئێستاکەش هەروەک خۆی بێت.

ـ بەڵێ، ئاشکرایە.

ـ لە سالانی بیستەکاندا شیکردنەوەی دەروونی فرۆید گرنگیەکی مەزنی هەبوو، بە تایبەتیش لە چارەسەرکردنی نەخۆشیە دەروونیەکاندا. هەروەها تیۆری نائاگاییەکەشی، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هونەر و ئەدەب دانا.

ـ مەبەستت لەوەیە دواتر هونەرمەندەکان بایەخێکی زۆرتریان بە نائاگایی دەروونی مرۆڤ دەدا؟

ـ بەڵێ ڕێک مەبەستم ئەوەیە. هەرچەندە لە بواری ئەدەبدا و لە دواهەمین دە ساڵەی سەدەی نۆزدەدا، بایەخ پێدانی ژیانی ناوەوەی مرۆڤ گەشەی سەند –واتە پێش ئەوەی شیکردنەوە دەروونیەکەی فرۆید بڵاوببێتەوە- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە مانای ئەوە نابەخشێت کە فرۆید بە ڕێکەوت لە ساڵی 1890دا بنچینەی شیکردنەوەی دەروونی دامەزراند.

ـ مەبەستت لەوەیە بابەتەکە لەو سەردەمەدا باو بوو؟

ـ فرۆید خۆی لەو بڕوایەدا نەبوو کە چەند دیاردەیەکی وەک چەپاندن و بەرپەرچدانەوەی هەڵە و بەئەقلانیەتکردنی «دۆزیبێتەوە». بەڵام ئەو، یەکەمین کەس بوو کە شێوە هەڵسوکەوتێکی مرۆیی ئاوهای هێنایە ناو جیهانی دەروونناسیەوە. هەروەها بۆ ڕوونکردنەوەی تیۆریەکەشی، مامۆستایەکی بەسەلیقە بوو لە هێنانەوەی نمونەی ئەدەبیدا. بەڵام هەروەک گوتم لە سالانی بیستەکانەوە شیکردنەوەی

دەروونیەکەی، زیاتر بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر ئەدەب و هونەر دانا.
- چۆن؟
- نووسەر و وێنەکێشەکان هەوڵیاندەدا لە کارەکانیاندا هێزی نائاگایی بەکاربهێنن، ئەمەش بەتایبەتی «سۆریالیزمەکان» دەگرێتەوە.
- مانای ئەوە چیە؟
- «سوریالیزم «Surrealism وشەیەکی فەڕەنسیە و دەکرێت بەرامبەر وشەی «سەرو هەقیقەت» دابنرێت. لەساڵی 1924دا «ئاندرێ بریتۆن" «`Andre Bretonمانیفێستێکی سوریالی" بڵاوکردەوە. لەوێدا دەیگوت؛ دەبێت هونەر لە نائاگاییەوە بهێنرێتە دەرەوە. بەو شێوەیەش هونەرمەند لە کاتی سروشێکی ئازاددا، وێنە خەونیەکانی هەڵدەهێنجێنێ و بەرەو جۆرە «سەرو هەقیقەتێک» دەڕوات، کە تێیدا جیاوازی نێوان خەون و هەقیقەت بوونی نامێنێت و دەتوێتەوە. لە ڕاستیدا لەوانەیە بەلای هونەرمەندێکیشەوە گرنگبێت کە سانسۆری ئاگایی بشکێنێت، بەو شێوەیەش دەتوانێت وشەکان و وێنەکان بەسەربەستی دەرببڕێت.
- بەڵێ، ئەوە تەواو ئاشکرایە.
- فرۆید بە شێوەیەک لە شێوەکان سەلماندی کە هەموو کەسێک هونەرمەندێکە. خەونێک، کارێکی پچکۆلەی هونەریە و هەموو شەوێکیش خەونی نوێ دەبینین. فرۆید بۆ ئەوەی بتوانێت خەونی یەکێک لە نەخۆشەکانی لێکبداتەوە، ناچاربوو بەنێو چەندین زنجیرە سیمبولدا بڕوات –هەروەک چۆن ئێمە کاتێک دەمانەوێت تابلۆیەک یان تێکستێکی ئەدەبی لێکبدەینەوە.
- ڕاستە هەموو شەوێک خەون دەبینین؟

ـ لێکۆڵینەوەی نوێ سەلماندویێتی کە نزیکەی لە سەدا بیستی ئەو کاتەی دەنوین، خەون دەبینین، واتە هەموو شەوێک نزیکەی دوو تا سێ سەعات خەون دەبینین. ئەگەر لە قۆناخەکانی خەوبینیندا جارسبکرێین، ئەوا پێدەچێت توند مەزاج و تورە و پەست ببین. واتە هەموو کەسێک بە شێوەیەکی زگماکی پێویستی بەوەیە کە بە شێوەیەکی هونەریانە حاڵەتی بوونی خۆی دەرببڕێت. وەک دەزانیت خەونەکان دەربارەی خۆمانن، خۆمانین هەموو کەرەسەکانی دەهێنینە دەرەوە، خۆمانین کە هەموو ڕۆڵەکانی دەبینین، لەبەرئەوە ئەگەر کەسێک بڵێت لە هونەر تێناگەم، ئەوا کەسێکە کە بەباشی خۆی ناناسێت.

ـ بەڵێ ئێستاکە تێدەگەم.

ـ جگە لەوەش فرۆید بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە سەلماندی کە ئاگایی مرۆڤ یەکجار بێ وێنەیە. کارکردنی لەگەڵ نەخۆشەکانیدا بەتەواوەتی خستیە سەر ئەو قەناعەتەی کە ئێمە هەموو ئەو شتانەی بینیومانە و ئەزمونمان کردوون، لە شوێنێکی ناو قوڵایی ئاگاییماندا هەڵیان دەگرین. هەموو ئەو شتانەش دەکرێت دیسانەوە جارێکی تر بهێنرێنەوە دەرەوە. هەمووومان ئاشنای ئەو حاڵەتەین کە دەڵێین؛ «لەناکاودا هیچ شتێکم بیر نەما»، ئەوجا «دێتە سەر زمانمان» و دواجاریش «بیرمان دەکەوێتەوە» -لێرەدا ڕێک باسی شتێک دەکەین کە لە نائاگاییماندا بووە و لەپڕێکدا لە ڕێگەی دەرگایەکی نیوە کراوەوە دێتەوە ناو ئاگاییمان.

ـ بەڵام هەندێک جار کەمێک خاوەکۆ ڕودەدات.

ـ هەموو هونەرمەندەکان پەی بەوە دەبەن، بەڵام لەپڕێکدا لەوە دەچێت هەموو دەرگا و چەکمەجەکان بکرێنەوە. شتەکان خۆیان بۆ

خۆیان وروژم دەهێنن و ئێمەش ڕێک ئەو وشە و وێنانە هەڵدەڕێژین کە پێویستمانن. ئەمەش کاتێک ڕوودەدات کە «سەقاپی» سەر نائاگایمان لابردبێت. ئەمەیە کە پێی دەڵێن «سروش»، سۆفیا. ئەو کاتەش وا هەستدەکەین ئەو شتەی کە دەینووسین یان ئەو وێنەی دەیکێشین لە خۆمانەوە نایەت.

- دەبێت هەستێکی نایاب بێت.

- بەڵام بێگومان تۆش ئەوەت بینیووە. بۆ نمونە کاتێک منداڵان زۆر هیلاک دەبن، ئەوسا زۆر بە ئاسانی شێوە سروشێکی ئاوهایان تێدا دەبینرێت. جارجارێک منداڵان زیاد لە ڕادە هیلاک دەبن، بەڵام وا دەردەکەون کە لەوپەڕی بەخەبەریدا بن. لەپڕێکدا دەستدەکەن بە قسەکردن و وشەی وا دەردەپەڕێنن کە لەوە دەچێت هێشتام هەر فێری نەبووبن. بەڵام لەڕاستیدا فێری بوون، وشەکان و بیرکردنەوەکان «بەشاراوەیی» لە ئاگاییاندا ماوەتەوە، بەڵام تەنها ئەوەندەیە کە دواتر دەردەکەونەوە ـ واتە کاتێک کە هەموو ئاگاداریەک و سانسۆرێک هەڵدەگیرێت. بەلای هونەرمەندێکیشەوە هەمان شتە، لەوانەیە زۆر گرنگ بێت کە نەهێڵێت ئەقڵی یان بیرکردنەوەکانی کۆنترۆڵی کردنەوەی نائاگایی بکەن. چیرۆکێکی بچکۆلەت وەک نمونەیەک بۆ بهێنمەوە؟

- پێشم خۆش دەبێت.

- چیرۆکێکی زۆر گرنگ و زۆر خەمناکیشە.

- فەرموو دەست پێبکە!

- جارێکیان هەزارپێیەک هەبوو کە زۆر قەشەنگ سەمای دەکرد و هەر هەزار قاچەکەی بەکاردەهێنا. لە کاتی سەماکردندا، هەموو گیانەوەرانی دارستانەکە دەهاتنە تەماشاکردنی و هەمووشیان

سەریان لەو سەما بێ وێنەیەی سوڕدەما. بەڵام یەکێک لە گیانەوەرەکان سەماکردنی هەزارپێیەکەی بەلاوە خۆش نەبوو... ئەویش بۆقێکی گەورەبوو...
ـ لەوانەیە بەخیلی پێ بردبێت.
ـ بۆقەکە لە دڵی خۆیدا دەیگوت؛ «چۆن بتوانم وا لە هەزارپێیەکە بکەم کە ئیتر نەتوانێت سەمابکات؟» هەڵبەتە بێسوود بوو گەر پێی بگوتایە حەز بە سەماکەت ناکەم، یان بیگوتایە من لە تۆ باشتر سەما دەکەم، چونکە ئەو کاتە دەبووە مایەی پێکەنینی هەموو گیانەوەرەکانی دی. بەڵام دواتر پیلانێکی شەیتانانەی بەخەیاڵدا هات.
ـ چ پیلانێک؟
ـ نامەیەکی بۆ هەزارپێیەکە نووسی؛ «ئەی هەزارپێی بێ وێنە! من لە هونەری سەماکردنە نایابەکەت زۆر سەرم دەسوڕمێ و بەلامەوە یەکجار جوانە. لەبەرئەوە زۆر حەزدەکەم بزانم لە کاتی سەماکردندا بە چ شێوەیەک دەچیتە پێشەوە؟ ئایا لە پێشدا قاچی چەپی ژمارە 228 بەرزدەکەیتەوە و پاشان قاچی ڕاستی ژمارە 59؟ یان لە پێشدا قاچی ڕاستی ژمارە 26 و ئەوجا قاچی ڕاستی ژمارە 499 بەرزدەکەیتەوە؟ بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی وەڵامم. سڵاوی بۆقی گەورەت لێبێت.»
ـ شایانی قێز لێکردنەوەیە!
ـ کاتێک هەزارپێیەکە نامەکەی بەدەست گەیشت، یەکسەر کەوتە بیرکردنەوە و ویستی بزانێت لە ڕاستیدا بە چ شێوەیەک سەما دەکات. لەپێشدا کام قاچ بەرزدەکاتەوە؟ ئەوجا کامیان؟... بەبڕوای تۆ پاشان چی ڕوویدا؟
ـ ئیتر هەزارپێیەکە هەرگیز سەمای نەکردەوە.

ـ ڕێک ئاوهاش بوو. هەمان شتیش ڕوودەدات کاتێک بیرکردنەوەی ئەقڵ، فەنتاسیا دەبەستێتەوە.
ـ لەگەڵتام چیرۆکێکی خەمگینە.
ـ واتە بۆ هونەرمەندێک گرنگە کە «خۆی ڕەهابکات». سوریالیستەکان هەوڵدەدەن ئەمە بەکاربهێنن، بۆ ئەم مەبەستەش خۆیان دەخەنە حاڵەتێکەوە کە شتەکان خۆیان بۆ خۆیان دێن. پارچە لاپەڕەیەکی سپی دەخەنە بەردەمیان و دەستدەکەن بە نووسین، بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە چی دەنووسن. بەمەش دەڵێن «نووسینی ئۆتۆماتیکی». لە ڕاستیشدا زاراوەکە لە «ڕۆحانیەتەوە» وەرگیراوە، کاتێک کە کەسە ڕۆحانیەکە لە نێوان دونیای ڕۆح و فیزیاویدایە و وا دەزانێت مردووەکان پێنووسەکەی دەجوڵێنن. بەڵام ئەو جۆرە شتانەم داناوە بۆ سبەینێ باسیان بکەین.
ـ پێم خۆشە!
ـ هونەرمەندی سوریالیش بە شێوەیەک لە شێوەکان وەک ئەو کەسە ڕۆحانیە وایە، واتە وەک کەسێکی نێوان دوو شتە، یان دەبێتە زنجیرەیەکی پەیوەندی لە نێوان خۆی و بەشی نائاگایی خۆیدا. بەڵام لەوانەیە توخمێکی نائاگا لە هەموو پڕۆسێسێکی خوڵقێنەردا هەبێت. لە ڕاستیدا چ شتێک خوڵقاندنە؟
ـ بە تەواوەتی نازانم، بەڵام ئایا ئەوە شتێکی نوێ نیە کە دەیخوڵقێنین؟
ـ بەڵێ ڕاستە. ئەوەش ڕێک لە ئەنجامی هاریکاری نێوان ئەقڵ و فەنتاسیدا ڕوودەدات. زۆر پێدەچێت ئەقڵ فەنتاسیا بخنکێنێت و ئەمەش ترسناکە، لەبەرئەوەی بەبێ فەنتاسیا هیچ شتێکی

ڕاستەقینەی نوێ سەرهەڵنادات. مەبەستم لەوەیە کە فەنتاسیا وەک سیستمە داروینیەکە وایە.
- ببوورە بەڵام بە تەواوەتی تێنەگەیشتم.
- داروینیزم دەڵێت گۆڕانکاری بایۆلۆجی یەک لەدوای یەک لە سروشتدا دەردەکەوێت. بەڵام سروشت تەنها دەتوانێت کەمێکی ئەو گۆڕانکاریانە بەکاربهێنێت. واتە تەنها هەندێکیان مافی ژیانیان هەیە.
- بەڵێ، ئەی پاشان؟
- هەمان شێوەشە کاتێک کە بیردەکەینەوە، کاتێک کە سروشمان بۆ دێت و کۆمەڵێک بیرکردنەوەی نوێمان بۆ دەهێنێت. واتە «گۆڕانکاریە فیکریەکان» یەک بەدوای یەکدا لەناو ئاگایماندا دەردەکەون. لەم بارەدا بەمەرجێک ئەگەر سانسۆرێکی گەورەمان لەسەر خۆمان دانەنابێت. بەڵام تەنها بەشێکی ئەو فیکرانە بەکاردەهێنرێت. لێرەدا ئەقڵ مافی خۆی بەدەست دەهێنێت، لەبەرئەوەی ئەویش ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. واتە کاتێک دەستکەوتی ڕۆژەکەمان دەخەینە سەر مێزەکە، دەبێت جوداشیان بکەینەوە.
- بەڕاستی بەراوردکاریەکی جوانە.
- مەزەنەی ئەوە بکە گەر هەموو «بۆچوونێک» کە بە مێشکماندا دێت، بیانخەینە سەر زمانمان! یان هەموو تێبینیەکان و نووسراوی ناو چەکمەجەکانیش بخەینە ڕوو. ئەو کاتە جیهان پڕ دەبوو لە بیرکردنەوەی ڕێکەوت. ئەو کاتەش هیچ بوارێکی «هەڵبژاردن» نەدەمایەوە، سۆفیا.
- واتە ئەقڵ بیر و بۆچوونەکان هەڵدەبژێرێت، وا نیە؟

ـ بەڵێ، تۆش لەو بڕوایەدا نیت وابێت؟ بێگومان فەنتاسیا شتێکی نوێ دەخوڵقێنێت، بەڵام فەنتاسیا ناتوانێت هەڵبژاردنەکە ئەنجام بدات. فەنتاسیا «داهێنان» ناکات. داهێنان ـوەک هەموو کارێکی هونەری تر- لە ئەنجامی هاریکاری ئەقڵ و فەنتاسیاوە دروست دەبێت، یان لە نێوان بیرکردنەوە و هەستدا پێک دێت، لەبەرئەوەی لە هەموو پرۆسێسێکی خوڵقاندندا توخمێکی ڕێکەوتی تێدایە. پێدەچێت لە قۆناخێکدا گرنگ بێت ڕێگای ئەو بیرکردنەوە ڕێکەوتانە نەگرین. ئەگەر بمانەوێت چاودێری مەڕەکانمان بکەین، ئەوا دەبێت لەپێشدا بەریان بدەین.

ئەوجا ئەلبێرتۆ بێدەنگ بوو و لە پەنجەرەکەوە تەماشای درەوەی دەکرد. لەو کاتەشدا سۆفیا لە تەنیشت دەریاچەکەدا چاوی بە کۆمەڵێ خەڵک کەوت. لەوێدا هەموو کەسایەتیەکانی جیهانی «دیزنی Disney» کۆبووبونەوە.

ـ ئەوە «هۆبینە»... سۆفیا گوتی. ئەوەش «ئانەرسنی» مراوی و برازاکانیەتی... ئەوەش مام «یۆکیمە»... چاوت لە «چیپ و چاپە»؟ گوێت لێم نیە ئەلبێرتۆ؟ ئەوە «میکی ماوس»ە و ئەوەش...

ئەلبێرتۆ ڕووی کردە سۆفیا و گوتی؛

ـ بەڵێ، جێگای غەمە کچەکەم.

ـ مەبەستت چیە؟

ـ ئێمە بێدەسەڵات دانیشتووین و بووینەتە قۆچی قووربانی خەیاڵی مێجەر، بەڵام بێگومان خەتای منە... من بووم کە باسی بیرکردنەوەی ئازادم کرد...

ـ بەهەرحاڵ لۆمەی خۆت مەکە کە...

ـ دەمویست شتێک دەربارەی ئەوە بڵێم کە فەنتاسیا بەلای ئێمەی فەیلەسوفیشەوە گرنگە. مەبەستم لەوەیە بۆ ئەوەی بتوانین بیر لە شتێکی نوێ بکەینەوە، ئەوا دەبێت بوێرین خۆمان ڕەها بکەین. بەڵام پێم وابێت ئا ئێستاکە زیاد لە ڕادە سەربەست بووە.
ـ هێندە سەخت وەری مەگرە.
ـ ویستم شتێک دەربارەی گرنگی ئەندێشە بڵێم، کەچی ناچاربووین تەماشای ئەو شتە قۆڕانە بکەین. جا خۆ شەرم نایگرێت!
ـ ئا ئەمەش بە ئایرۆنیەوە دەڵێیت؟
ـ نەخێر، مەبەستی ئەو ئایرۆنیە نەک من. بەڵام دڵم بەو شتە خۆشە کە بنچینەی پیلانەکەمم لەسەر هەڵچنیووە.
ـ هیچ تێناگەم...
ـ باسی خەونمان کرد... لەمەشدا کەمێک ئایرۆنی تێدایە، لەبەرئەوەی ئێمە تەنها وێنەی خەونیی مێجەرین و هیچی تر.
ـ ئۆف...
ـ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی بیرچووە ڕەچاوی بکات.
ـ ئەویان چیە؟
ـ لەوانەیە زۆر باش ئاگای لە خەونەکەی بێت... هەروەک چۆن کەسێک ناواخنی خەونەکەی لەیادە، ئەویش ئاگای لە هەموو شتێکە کە ئێمە دەیڵێین و دەیکەین. وەک دەزانیت مێجەر خاوەنی پێنووسەکەیە و هەموو شتێکی ئێمەی لە بیرە، بەڵام ئیدی ئەمە مانای ئەوە نیە کە بەڕاستی بەخەبەربێت.
ـ مەبەستت چیە؟
ـ ئەو پەی بە بیرکردنەوە شاراوەکانی خەونەکە نابات، سۆفیا. لەبیری چۆتەوە کە ئەمەش خەونێکی داپۆشراوە.

ـ زۆر سەیر قسە دەکەیت.
ـ مێجەریش وەک تۆ لە هەمان بڕوادایە، لەبەرئەوەی لە زمانی خەونەکەی خۆی تێناگات. ئەمەش شتێکە کە دەبێت ئێمە دڵمان پێ خۆشبێت، چونکە لە ڕاستیدا کەمێک بوارمان بۆ دەڕەخسێنێت. ئەو سەربەستیەش پاش ماوەیەکی تر وامان لێدەکات لە لینجاوی ئاگایی مێجەر ڕەهابین و وەک مشکە کوێرەیەک لە ڕۆژێکی گەرمی هاویندا سەردەربهێنینەوە.
ـ لەو بڕوایەدایت بتوانین؟
ـ ناچارین... لەماوەی یەک دوو ڕۆژی داهاتوودا ئاسمانێکی نوێت پێ دەبەخشم. بەم شێوەیەش چیتر مێجەر نە دەتوانێت بزانێت مشکە کوێرەکانی لە کوێدان و نە دەشتوانێت بزانێت لە کوێوە سەر دەردەهێننەوە.
ـ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمە تەنها وێنەی خەونین، من هێشتام هەر کچی دایکمم. کاتژمێر پێنجە و ناچارم بگەڕێمەوە ماڵەوە و ئاهەنگی ناو باخچەکە ڕێک بخەم.
ـ ئممم... دەتوانیت لە ڕێگەی گەڕانەوەتدا کارێکی بچکۆلەم بۆ بکەیت؟
ـ بەڵێ، چیت بۆ بکەم؟
ـ هەوڵبدە کەمێک زیاتر ئاگایی مێجەر بەلای خۆتدا ڕابکێشیت. هەوڵبدە مێجەر بەدرێژایی ڕێگای ماڵەوە چاوی لەسەرت بێت... کاتێکیش گەیشتیتە ماڵەوە، بیر لە مێجەر بکەرەوە، ئەو کاتە ئەویش بیر لە تۆ دەکاتەوە.
ـ جا ئەوە سوودی چیە؟

ـ بەو شێوەیە دەتوانم بەڕاشکاوی کار لەسەر پیلانە نهێنیەکەم بکەم. سۆفیا من دەچمە قوڵایی نائاگایی مێجەرەوە. هەتا ئەو کاتەی یەکتر دەبینینەوە، لەوێدا دەمێنمەوە.

## ...مرۆڤ حوکمی بەسەردا کراوە کە سەربەست بێت...

کاتژمێر 23،55 ی نیشاندا. هیلدە ڕاکشابوو و تەماشای بنمیچەکەی دەکرد. هەوڵیدەدا بیرکردنەوەکانی بەو پەڕی سەربەستیەوە بەرەڵابکات. هەموو کەڕەتێکیش کە لە ناوەڕاستی زنجیرە بیرکردنەوەیەکدا دەوەستا، خێرا لە خۆی دەپرسی؛ بۆچی ناتوانم لەسەر هەمان بابەت بەردەوام بم؟

بڵێیت بیەوێت شتێک بچەپێنێت؟

ئەگەر تەنها بیتوانیبایە هەموو سانسۆرەکانی لاببردایە، ئەوا پێدەچێت لە حاڵەتی بەخەبەریدا خەونی ببینیایە. بەڵام تەنانەت بیرکردنەوەش لەو حاڵەتە بەلایەوە ترسناک بوو.

هەتاوەکو ئارامتر خۆی دەدایە دەستی بیرکردنەوەکان و وێنەکانی مێشکی، زیاتر و زۆرتر هەستیدەکرد لە کوخەکەی مێجەردایە و لەلای دەریاچە چکۆلەکەی ناو دارستانەکەدا خۆی دەبینیەوە.

ئاخۆ ئەلبێرتۆ لە چ شتێک ڕادەما؟ ئاخۆ بیری لە چ جۆرە پیلانێکی تۆڵەکردن دەکردەوە. بە ڕاست... بێگومان باوکی هیلدە بیری لەوە دەکردەوە، کە ئەلبێرتۆ پیلانێکی لە مێشکدایە... بەڵام ئایا خۆی دەزانێت ئەلبێرتۆ نیازی چیە؟ لەوانەشە هەوڵبدات هێندە بە سەربەستی بیربکاتەوە، کە لە دواجاردا ببێتە هۆی ڕوودانی شتێک کە تووشی سەرسوڕمانی بکات؟

هێندە لاپەڕەی زۆری نەماوە بیخوێنێتەوە، چی دەبێت گەر هەڵیداتەوە سەر دوا لاپەڕە؟ نا... ئەوە خۆ هەڵخڵەتاندنە. جگە

لەوەش هیلدە گومانی هەبوو کە هەر لەئێستاکەوە کۆتاییەکەی دانرابێت.
بیرکردنەوەیەکی سەیرە؟ مەلەفەکە لێرەدایە و بە هیچ جۆرێک ڕێی تێناچێت باوکی بتوانێت هیچ شتێکی زیادەی بخاتە سەر... بەڵام ئەمە بەو مەرجەی ئەگەر ئەلبێرتۆ نەتوانێت بە بیرکردنەوەی خۆی، پیلانێک بەجێبهێنێت... شتێک، کە چاوەڕوان نەکراوبێت...

هەرچۆنێک بێت هیلدە خۆی دەیویست یەک دوو شتی چاوەڕوان نەکراو ئامادەبکات، لەبەرئەوەی لە ڕاستیدا باوکی هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر ئەودا نیە! بەڵام ئایا هیلدە دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا هەیە؟
ئاگایی چیە؟ مەگەر ئەمە مەزنترین مەتەڵی گەردوون نەبێت؟ چ شتێکە وامان لێدەکات هەموو شتێک کە بینیومانە و بەسەرماندا هاتووە، «لەیادمان بێت»؟
چ میکانیزمێکە وامان لێدەکات هەموو شەوێک خەونێکی ئەفسوناوی ببینین؟
لەسەر جێگاکەی پاڵکەوتبوو و بیری دەکردەوە، جارجارێکیش چاوێکی بۆ دەنوقاند. ئەوجا چاوی دەکردەوە و سەرلەنوێ تەماشای بنمیچەکەی دەکردەوە. لە دواجاردا لەبیری چوو چاوی بکاتەوە و خەوی لێکەوت.
کاتژمێری **6،66** لە قیڕەی بەرزی نەورەسەکان خەبەری بووەوە. چ ژمارەیەکی سەیرە! هیلدە لە جێگاکەیدا بەرزبووەوە و وەک هەموو جارێک بەرەولای پەنجەرەکە ڕۆیشت، تەماشای دەریاچەکەی کرد... ئەمەش وەک خویەکی لێهاتبوو، زستان و هاوین دەیکرد.

لەوێدا و لەناکاودا لەوە دەچوو هەموو ڕەنگەکانی دونیا لەناو مێشکیدا دەرکەون... خەونەکەی بیرکەوتەوە، بەڵام لە خەونێکی ئاسایی زۆر زیاتر بوو. هەم ڕەنگەکانی و هەم شتەکانی ناو خەونەکەی تەواو لەڕاستی دەچوون...
لە خەونیدا باوکی لە لوبنانەوە گەڕابووەوە و هەموو خەونەکەی، لە درێژەپێدانی خەونەکەی سۆفیا دەچوو... ئەو جارێکیان لەخەونیدا لەلای قەراغ ئاوەکەوە زنجیرە ئاڵتونیەکەی هیلدەی دۆزیەوە...
هیلدە، هەر ڕێک وەک خەونەکەی سۆفیا، لە قەراغ پردی بەلەمەکەدا دەنیشتبوو. ئەوجا دەنگێکی هێواش چرپاندی بە گوێیدا و گوتی: «من ناوم سۆفیایە!» هیلدە بەتەواوەتی بێدەنگ مایەوە، چونکە دەیویست بزانێت دەنگەکە لە کوێوە دێت. ئەوجا دەنگەکە وەک خشەخشێکی لاواز بەردەوام بوو، لە دەنگی مێروویەک دەچوو کە قسەی لەگەڵدا بکات: «پێم وابێت هەم کەڕیت و هەم کوێریشیت». پاش کەمێک باوکی بەجلی سەربازی نەتەوە یەکگرتووەکانی بەریەوە، هاتە ناو باخچەکەوە و هاواریکرد: «هیلدەی بابە! هیلدە بەرەوڕوی ڕایکرد و دەستی کردە ملی... لەوێدا خەونەکەی تەواو بوو.
پاش کەمێک چەند دێڕە شیعرێکی ئارنۆلف ئیوێفەلاند «Arnulf Øverland»ی بیرکەوتەوە کە دەڵێت:

«شەوێکیان بە خەونێکی سەیر خەبەرم بووەوە
لەوە دەچوو دەنگێک بمدوێنێ،
دور، وەک تەوژمی ئاوێکی بن زەوی
منیش هەستام و پرسیم:
چیت لە من دەوێ؟»

**کاتێک دایکی هاتە ژورەوە، هێشتام هیلدە هەر لەبەردەم پەنجەرەکەدا وەستابوو.**

**ـ هیلدە! هەر لە ئێستاوە بە خەبەریت؟**

**ـ نازانم...**

**ـ وەک هەموو ڕۆژێک کاتژمێری چوار دەگەڕێمەوە.**

**ـ باشە.**

**ـ هیوادارم پشوویەکی خۆش بەسەربەریت هیلدە!**

**ـ سوپاس، منیش ڕۆژێکی خۆشت بۆ دەخوازم.**

**هیلدە هەر کە گوێی لەدایکی بوو دەرگاکەی دەرەوەی داخست، بەپەلە خۆی ئاخنیەوە ناو جێگاکەی و سەرلەنوێ مەلەفەکەی کردەوە.**

**»..سۆفیا من دەچمە قوڵایی نائاگایی مێجەرەوە. هەتا ئەو کاتەی یەکتر دەبینینەوە، لەوێدا دەمێنمەوە «**

**لەوێدا بووم! هیلدە دەستی کردەوە بە خوێندنەوە. بەپەنجەکانی دەستی چەپی هەستی بەوە دەکرد کە چەند لاپەڕەیەکی کەمی ماوە.**

کاتێک سۆفیا کوخەکەی مێجەری بەجێهێشت، هێشتام دەموچاوەکانی «دیزنی» لە چواردەوری دەریاچەکەدا دەبینران. بەڵام هێدی هێدی کە لێیان نزیکبووەوە، پێش ئەوەی بگاتە لای بەلەمەکە، لەوەدەچوو بتوێنەوە و دواتریش هیچیان دیار نەمان.

هەم لە کاتی سەوڵ لێداندا و هەم پاش ئەوەش کە بەلەمەکەی لەوبەر ئاوەکەوە بەستەوە، دەستی ڕادەوەشاند و شێوەی جیاواز جیاوازی بە دەموچاوی دروست دەکرد. دەیویست سەرنجی مێجەر

ڕابکێشێت و بەو شێوەیەش ئەلبێرتۆ بتوانێت بەبێ جارسکردن لە کوخەکەدا بمێنێتەوە.
کاتێکیش گەیشتە سەر ڕێگاکە، خوێ بە ئاسماندا هەڵدەدا. پاش کەمێک هەوڵیدا وەک ڕۆبۆتێک بڕوات بەڕێدا... کەمە کەمەش دەستی بە گۆرانی گوتن کرد، تەنها بۆ ئەوەی مێجەر بێتاقەت نەبێت لێی.
بۆ ماوەیەکی کەمیش وەستا و بیری لە پیلانەکەی ئەلبێرتۆ دەکردەوە... ئاخۆ چی بێت؟ بەڵام هەر زوو هەستی بەهەڵەکەی خۆی کرد و بووە مایەی دڵتەنگی... ئەوجا لە داخاندا بە دارێکدا هەڵزنا.
هەتا لە توانایدا هەبوو سەرکەوت، کاتێکیش خەریکبوو بگاتە سەر ترۆپکی دارەکە، ئەوجا بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت بێتە خوارەوە. ناچاربوو پاش کەمێک هەوڵی دابەزین بداتەوە، بەڵام خۆ نابێت هەروا بە ئارامی بمێنێتەوە، چونکە بێگومان ئەو کاتە مێجەر لە تەماشاکردنی بێزار دەبێت و لەبری ئەو سەرنجی دەچێتە سەر ئەلبێرتۆ.
سۆفیا قۆڵەکانی ڕاوەشاند و یەک دوو جاریش هەوڵیدا وەک کەڵەشێرێک بقوقێنێت، دوا جاریش دەستی کردەوە بە گۆرانی گوتن و لەسەر ئای ئایەکەی خۆی بەردەوام بوو. ئەمە یەکەم جاریبوو لە هەموو ژیانیدا بەو جۆرە گۆرانی بڵێت، لەبەرئەوە دەنگی خۆی بەلاوە خراپ نەبوو.
ئەوجا دیسانەوە هەوڵیدا بێتەوە خوارەوە، بەڵام لە ڕاستیدا گیری خواردبوو. لە پڕێکدا قازێکی گەورە لەسەر ئەو لقە نیشتەوە کە ئەو توند دەستی پێوە گرتبوو. بەلای سۆفیاوە ئاسایی بوو کە قازەکە دەستی بەقسەکردن کرد، بەتایبەتیش پاش ئەوەی کەمێک لەوەوبەر کۆمەڵێک لە دەموچاوەکانی «دیزنی» بینیبوو...

- من ناوم «مۆرتن»ە... قازەکە گوتی. لە ڕاستیدا من قازێکی دەستەمۆم، بەڵام ئەمڕۆکە بەتایبەتی لەگەڵ قازە کێویەکانی لوبنانەوە بۆ لای تۆ هەڵفڕیم... لەوە دەچێت پێویستیت بەیارمەتی هەبێت بۆ ئەوەی لەسەر ئەم دارە بێیتە خوارەوە.
- بەڵام تۆ زۆر بچکۆلەیت، چۆن دەتوانیت یارمەتیم بدەیت؟
- بیرکردنەوەیەکی بەپەلەبوو، کچی گەنج. لە ڕاستیدا تۆ گەورەیت، نەک من بچوک.
- بەڵام ئایا لە هەردوو بارەکەدا هەر هەمان شت نیە؟
- هەر بۆ زانینیت من لەوەوپێش بە کۆڵ کوڕە جوتیارێکی سویدی هاوتەمەنی تۆم بە هەموو سویددا گێڕاوە. ناوی «نیلز هۆڵگێرسن» بوو.
- من پانزەساڵانم.
- نیلز چواردە ساڵ بوو. پاشان ئەگەر کەسێک لەسەر کۆڵم بێت، ئەوا ساڵێک کەمتر یان زیاتر هیچ ڕۆڵێک نابینێت.
- چۆن توانیت بە کۆڵ هەڵیبگریت؟
- زلەیەکی بچکۆلەیان لێدا و لەهۆش خۆی چوو. کاتێکیش خەبەری بووەوە، باڵای بەقەد پەنجە گەورەیەک دەبوو.
- دە کەواتە تۆ زلەیەکم لێبدە، لەبەرئەوەی نامەوێت هەتا هەتایە لێرەدا بمێنمەوە. جگە لەوەش دەبێت شەممە ئاهەنگێکی فەلسەفی بەڕێوە بەرم.
- سەرنج ڕاکێشە. کەواتە وای دادەنێم ئەمە کتێبێکی فەلسەفی بێت. کاتێک لەگەڵ نیلزدا بەسەر سویددا دەفڕیم، کەڕەتێکیان لە "ڤارملاند"دا نیشتمەوە. لەوێدا چاوی بە ئافرەتێکی بەتەمەن کەوت. ئەو ماوەیەکی دورو درێژبوو خەونی بەوەوە دەبینی کە کتێبێک دەربارەی سوید بنووسێت کە بۆ منداڵانی قوتابخانە بگونجێت.

ئافرەتەکە گوتی دەبێت کتێبەکەم هەم ڕاستیش بێت و هەم پەروەردەیش بێت. پاشانیش کە نیلز باسی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە، بڕیاری دا کتێبێک لەسەر هەموو ئەو شتانە بنووسێت کە نیلز لەسەر پشتی منەوە بینیبووی.

ـ سەیرە.

ـ لە ڕاستیدا کەمێک ئایرۆنی تێدا بوو، لەبەرئەوەی هەر لەسەرەتاوە هەردووکمان لە کتێبەکەدا هەبووین.

لەپڕێکدا سۆفیا هەستیکرد شتێک بەر ڕوومەتی کەوت، پاش کەمێکیش تەواو بچکۆلە بووەوە. دارەکە وەک دارستانێکی لێهات و قازەکەش وەک ئەسپێک دەهاتە بەر چاو.

ـ ئێستاکە دەتوانیت بێیت... قازەکە گوتی.

سۆفیا چەند هەنگاوێک بەسەر لقەکەدا ڕۆیشت و چووە سەر پشتی قازەکە. هەرچەندە پەڕی قازەکە زۆر نەرم بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەمێک بە لەشیدا هەڵدەچەقین، چونکە ئێستاکە سۆفیا زۆر پچکۆلە بووبووەوە.

سۆفیا بەجوانی لەسەر پشتی دانیشت و قازەکە هەڵفڕی. زۆر بە بەرزی بەسەر دارەکاندا فڕی. سۆفیا تەماشایەکی دەریاچە چکۆلەکە و کوخەکەی مێجەری کرد. ئەلبێرتۆ لەوێدا دانیشتبوو و خەریکی چنینی پیلانەکەی بوو.

ـ گەشتێکی بچکۆلە دەکەین، قازەکە هێندەی گوت و لە هەمان کاتدا چەند جارێک باڵەکانی لەیەکدا.

پاشان ویستی لەبەردەم ئەو دارەدا بنیشتەوە کە سۆفیا کەمێک لەوەوپێش بەسەریەوە گیری خواردبوو. ئەوجا نیشتەوە و سۆفیاش بەسەر پشتیدا خۆی خزاندە خوارەوە. چەند جارێک بەسەر گیاکەدا گل

بووەوە و پاشان دانیشت. لەپڕێکدا سەری لەوە سوڕما کە وەک جاران گەورە بۆتەوە.
قازەکە چەند جارێک بە دەوریدا خولایەوە و ئەوجا سۆفیا گوتی؛
- زۆر زۆر سوپاس.
- شایانی نیە... گوتت ئەمە کتێبێکی فەلسەفیە؟
- نەخێر تۆ واتگوت.
- هەرچۆنێک بێت، هەردوو بارەکە هەر هەمان ئەنجامی هەیە. ئەگەر بەدەست من بوایە، هەروەک چۆن نیلز هۆلگێرسنم بە هەموو سویدا گەڕاند، ئاوها حەزم دەکرد تۆش بەنێو هەموو مێژووی فەلسەفەدا بگەڕێنم. ئەوساکە دەمانتوانی بەسەر میلێت و ئەسینا و قودس و ئەسکەندەریە و ڕۆما و فیرێنزا و لەندەن و پاریس و جیینا و هایدلبێرگ و بەرلین و کۆبنهاگن و چەندەها و چەندەها شاری تریشدا بفڕین.
- سوپاس، هێندە بەسە...
- بەڵام تەنانەت بەلای قازێکی پڕ لە ئایرۆنیشەوە، ئاسان نەدەبوو بە پێچەوانەی زەمەنی ناو سەدەکانەوە بفڕێت. کەواتە لە هەموو بارێکدا فڕین بەسەر بەشە جیاوازەکانی سویددا ئاسانترە.
پاش ئەوە قازەکە لەشەقەی باڵی دا و کەمێک دواتر لە ئاسماندا دەفڕی.
سۆفیا تەواو شەکەت بوو، بەڵام پاش ئەوەی خۆی خزاندە کوخەکەیەوە، بیری لە کارەکانی خۆی دەکردەوە و لەدڵی خۆیدا دەیگوت؛ دەبێت ئەلبێرتۆ زۆر شادمان بێت بە فرتوفێڵەکانم، لەبەرئەوەی بە هیچ شێوەیەک ڕێی تێناچێت لە ماوەی کاتژمێری

ڕابووردودا، مێجەر کاتی ئەوەی هەبووبێت کە ئاگای لە ئەلبێرتۆ بووبێت، مەگەر بە تەواوەتی تووشی نەخۆشی شیزۆفرینیا بووبێت!
چەند خولەکێک پێش ئەوەی دایکی لە کار بگەڕێتەوە، سۆفیا خۆی کرد بە ژوردا. بەمەش لە کۆمەڵێ بیانوو و باسی لابەلا ڕزگاری بوو، چونکە دەبوایە باسی قازە دەستەمۆکەی بگێڕایەتەوە کە لەسەر دارەکە یارمەتی دا و هێنایە خوارەوە.
پاش نانخواردنی نیوەڕۆ، دەستیانکرد بە ئامادەکردنی ئاهەنگی باخچەکە. لە هەورەبانەکەیاندا بەشی سەرەوەی مێزە سێ چوار مەترییەکەیان هێنایە خوارەوە و لە باخچەکەدا دایان نا، ئەوجا دیسانەوە بۆ هێنانی قاچەکانی ڕۆیشتنەوە سەرەوە.
دەیانویست مێزە درێژەکە لە ژێر داری میوەکاندا بڕازێننەوە. دواهەمین جاریش ئەو مێزەیان لە ساڵڕۆژی دە ساڵەی ژیانی هاوسەری دایک و باوکیدا بەکارهێنا. ئەو کاتە سۆفیا هەشت ساڵان بوو، بەڵام ئاهەنگی باخچەکەی ئەو ساڵەی باش لە یادە، ورد و درشتی خزم و خوێش هەموو بانگکرابوون و کۆبببوونەوە.
پێشبینی کردنی ئاو وهەوای خۆشیش، لە هەموو شتێک دڵخۆشکەرتر بوو. لە ڕۆژی پێش جەژنی لە دایک بوونی سۆفیاوە، کە ڕەهێڵە گەورەکە ڕوویدا، تا ئێستاکە تەنانەت دڵۆپە بارانێکیش چییە نەباریوە. ناچاربوون ڕازاندنەوەی باخچەکە و مێزەکەیان بخەنە بەیانی ڕۆژی شەممە، بەڵام دایکی وای بەباش دەزانی هەر لە ئێستاکەوە مێزە گەورەکە لە جێگای خۆیدا ئامادەبکرێت.
ئێوارە درنگانێک سەمونیان لە دوو جۆر هەویری جیاواز ئامادەکرد، دەیانویست بۆ بەیانی لەگەڵ مریشک و زەڵاتە و ساردیدا بیخۆن.

سۆفیا زۆر لەوە دەترسا کوڕانی پۆلەکەی بیرە لەگەڵ خۆیاندا بهێنن. تەنها شت کە حەزی نەدەکرد ڕووبدات، دەنگە دەنگ و کێشە بوو.
پێش ئەوەی سۆفیا بچێتە ناو جێگاوە، دایکی دیسانەوە دەربارەی هاتنی ئەلبێرتۆ پرسیاری لێکردەوە.
ـ ئەلبێرتۆ دێت؟
ـ بەڵێ بێگومان دێت. تەنانەت پەیمانی داوە کارێکی هونەری فەلسەفیشمان نیشان بدات.
ـ کارێکی هونەری فەلسەفی؟ وەک چی بۆ نمونە؟
ـ ئمم... ئەگەر جادووگەر بوایە، ئەوا بێگومان جادوویەکی نیشان دەداین... لەوانەیە کەروێشکێکی سپی لە کڵاوێکی درێژەوە بهێنایەتە دەرەوە...
ـ دیسانەوە دەستمان پێکردەوە...
ـ ...بەڵام لەبەرئەوەی فەیلەسوفە، ئەوا لەبری ئەوە کارێکی هونەری فەلسەفیمان پێشکەش دەکات. وەک دەزانیت دانیشتنی باخچەکەمان دەربارەی فەلسەفە دەبێت... خۆ لە بیرت نەچۆتەوە؟
ـ دەمە هەراشەکەت چەندە ئامادەیە!
ـ ئەی تۆ، بیرت لە هیچ شتێک کردۆتەوە پێشکەشمانی بکەیت؟
ـ بەڵێ شتێکم هەر بەخەیاڵدا دێت.
ـ شتێک دەخوێنیتەوە، وانیە؟
ـ نەخێر نامەوێت ئێستاکە پێت بڵێم... شەو شاد سۆفیا!
بەیانی زووی ڕۆژی دواتر پێش ئەوەی بڕواتە سەر کار، سۆفیای خەبەرکردەوە و خواحافیزی لێکرد. جگە لەوەش لیستەی ناوی ئەو شتانەی دایە، کە بۆ ئاهەنگەکەیان پێویستیانە و دەبێت بچێت لە بازاڕ بیانکڕێت.

لەگەڵ ڕۆیشتنە دەرەوەی دایکیدا، تەلەفۆن لێیدا. ئەلبێرتۆ بوو، تا ڕادەیەک دەیزانی کەی بەتەنها لە ماڵەوە دەبێت.
- لەگەڵ نهێنیەکانتا چۆنیت؟
- شششش... باسی مەکە! هیچ جۆرە بوارێکی مەدەرێ پەی بە پیلانەکەمان بەرێت.
- پێم وابێت دوێنی زۆر زیرەکانە سەرنجیم ڕاکێشا.
- ئافەرم.
- کۆرسی فەلسەفەکەمان زۆری ماوە؟
- منیش ڕێک لەبەرئەوەیە کە تەلەفونت بۆ دەکەم. وەک دەزانیت گەیشتوینەتە ئەم سەدەیەی خۆمان. لەبەرئەوە لە ئێستاکە بەدواوە دەبێت خۆت یارمەتی خۆت بدەیت. گرنگترین شت، بنچینەکەی بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت یەکتر ببینین بۆ ئەوەی کەمێک باسی سەردەمی خۆمان بکەین.
- بەڵام دەبێت بچمە ناو شار و ...
- زۆر باش ڕێکەوتووە، هەروەک پێم گوتیت باسی سەردەمی خۆمان دەکەین.
- بەڵێ؟
- کەواتە بە بڕوای من باشترە لەناو شار یەکتر ببینین.
- بێم بۆ لات؟
- نا، نا. هەموو ماڵەکە بەسەر یەکدا داپرژاوە، لەبەرئەوەی بەدوای مایکرۆفۆنی نهێنیدا دەگەڕام، تەواوی ماڵەکەم بەسەر یەکدا داوە.
- ئۆی...
- قاوەخانەیەکی نوێ لە تەنیشت گۆڕەپانە گەورەکەوە کراوەتەوە، ناوی قاوەخانەی "پیررێ"یە، دەزانیت لە کوێدایە؟

ـ بەڵێ، کەی بتبینم؟
ـ دەتوانیت کاتژمێری دوانزە لەوێ بیت؟
ـ بەڵێ.
ـ زۆر باشە، کەواتە ئێستاکە لەمە زیاتر ناڵێین.
ـ تا دیدار!
یەک دوو دەقەیەک پاش کاتژمێری دوانزە، سۆفیا سەریکردە ناو قاوەخانەکەوە. یەکێک بوو لە قاوەخانە نوێکان، مێزەکانی خڕبوون و کورسیەکانیش ڕەش... بتڵی مەشروبی ئاوەژو هەڵواسراو و بەلوعەدار، لە خواریشەوە زەڵاتەی جۆراوجۆر و سەمونی کەرتکراو دانرابوو.
هۆڵەکە گەورە نەبوو و یەکەم شتیش کە سەرنجی سۆفیای ڕاکێشا، ئەوەبوو کە ئەلبێرتۆی لێ نەبوو. خەڵکانێکی زۆریش دانیشتبوون، بەڵام سۆفیا بەتەواوەتی نەیدەبینین، چونکە تەنها ئەوەندەی دەبینی کە ئەلبێرتۆ لەوێدا دانەنەیشتبوو.
ڕانەهاتبوو بە تەنها بچێتە قاوەخانەوە. بۆ ساتێک بیری لەوە کردەوە بڕواتە دەرەوە و پاشان سەر بداتەوە. بەڵکو ئەلبێرتۆ ئەوساکە دەرکەوێت؟
بەڵام نا... سۆفیا ڕۆیشتە لای مێزە مەڕمەڕەکەوە و داوای چایەکی بەلیمۆی کرد. چاکەی وەرگرت و لەسەر کورسیەکی بەتاڵ دانیشت، بەردەوام تەماشای دەرگای هاتنە ژورەوەی دەکرد. خەڵکانێکی زۆر دەهاتنە ناوەوە و دەڕۆیشتنە دەرەوە، بەڵام ئەو تەنها ئەوەندەی دەبینی کە ئەلبێرتۆ لەنێوانیاندا نەبوو.
خۆزگە هەر هیچ نەبێت ڕۆژنامەیەکی پێدەبوو!
پاش کەمێک ناچاربوو تەماشایەکی ئەملاولای بکات. چەند کەسێکیش تەماشایان کردەوە. بۆ ماوەیەکی کەم سۆفیا وەک ئافرەتێک هەستی

بە خۆی دەکرد. ڕاستە تەمەنی تەنها پانزە ساڵ بوو، بەڵام بە ئاسانی وەک کچێکی حەڤدە ساڵان دەهاتە بەرچاو –یان بەلایەنی کەمەوە وەک شانزە ساڵ و نیو دەهاتە بەرچاو!

ئاخۆ ئەو خەڵکانەی لە قاوەخانەکەدا دانیشتوون، بە چ شێوەیەک بیر لە بوون دەکەنەوە؟ بەشێوەیەکی سەرزارەکی لەوەدەچێت هەروا لەوێدابن، بەڕێکەوت هاتوونەتە ژوورەوە و لەسەر کورسیەکان دانیشتوون. دەدوێن و باسی شتی جۆراوجۆر دەکەن، دەستیشیان لە کاتی قسەکردندا دەجوڵێنن، بەڵام لە ڕاستیدا لەوە ناچێت دەربارەی شتێکی گرنگ بدوێن. وتەکەی کیاگەگۆی بیرکەوتەوە کە دەیگوت یەکێک لە خاسیەتە هەرە دیاریارەکانی زۆربەی خەڵکی، ئەو شێوە «قسەکردنە بەتاڵەیە». بڵێیت ئەو هەموو خەڵکە لە قۆناخی جوانپەرستیدا بژین؟ یان بەلایەنی کەمەوە شتێک هەیە کە وەک بوون بەلایەنەوە گرنگ بێت؟

لە یەکێک لە نامەکانی سەرەتادا، ئەلبێرتۆ نووسیبووی منداڵ و فەیلەسوف خزمایەتیەکیان لە نێواندا هەیە. سۆفیا سەرلەنوێ هەستیدەکرد کە بەڕاستی لەوە دەترسێت کە گەورە ببێت. چی دەبێت ئەگەر ئەویش بچێتە ناو قوڵایی فەرووی کەروێشکە سپیەکەوە؟ ئەو کەروێشکەی لە کڵاوە درێژەکەی گەردوونەوە دەردەهێنرێت.

بەردەوام لە کاتی بیرکردنەوەدا چاوی بڕیبووە دەرگاکە. لە پڕێکدا ئەلبێرتۆ هاتە ژوورەوە. هەرچەندە هاوینیش بوو، بەڵام کڵاوە ڕەشەکەی هەر لەسەردا بوو. لەسەرو ئەوەشەوە چاکەتە خۆڵەمێشیە درێژەکەشی لەبەرکردبوو. یەکسەر چاوی بە سۆفیا کەوت و بەرەو ڕووی چوو. بەلای سۆفیاوە شتێکی نوێ بوو کە ژوانێکی ئاوهای لە شوێنێکی گشتیدا هەبێت.

ـ كاتژمێر دوانزه و چارەکە هەی بێ پەیمان!
ـ ئەوە پێی دەگوترێت چارەکی ئەکادیمی، سۆفیا... بۆم هەیە شتێک بۆ ئەم کچە گەنجە بهێنم؟
دانیشت و ڕێک تەماشای نێو چاوی سۆفیای کرد، ئەویش شانێکی هەڵتەکاند.
ـ پێشم خۆش دەبێت، بەیارمەتیت سەمونێکی خڕم بۆ بهێنە.
ئەلبێرتۆ چووە لای مێزەکەوە و پاش کەمێک بە خۆی و قاوەیەکەوە گەڕایەوە، دوو پارچە سەمونیشی بە پەنیر و توێژاڵێک گۆشتی بەرازەوە هێنا.
ـ گران بوو؟
ـ شایانی باسکردن نیە سۆفیا.
ـ بەلایەنی کەمەوە هیچ عوزرێکت هەیە کە وا دواکەوتیت؟
ـ نەخێر... لەڕاستیدا بەدەستی ئەنقەست درەنگ هاتم. پاش کەمێک بۆت ڕووندەکەمەوە.
ئەلبێرتۆ چەند گازێکی گەورەی لە نانەکەی گرت و پاش کەمێک گوتی؛
ـ باسی سەردەمی ئێستاکەمان دەکەین.
ـ لەسەر ئاستی فەلسەفی هیچ شتێکی گرنگ ڕوویدا؟
ـ هەر زۆر زۆر، هێندە زۆر کە بە هەموو ئاڕاستەکاندا دەڕوات. لە پێش هەموو شتێکدا باسی بزوتنەوەیەک دەکەین کە پێی دەگوترێت «بوونگەری_وجودی». ئەمیش خاسیەتی کۆمەڵێک بزوتنەوەی فەلسەفی دەگرێتەوە کە لە بوونی مرۆڤەوە دەستپێدەکەن یان لە بارودۆخی مرۆڤەوە دەستپێدەکەن. لەبەرئەوە باسی بوونگەرەکانی سەدەی بیست دەکەین. بنچینەی فیکری زۆربەی ئەو فەیلەسوفە

بوونگەرانە لە کیاگەگۆوە دێت، بەڵام هەروەها لە هیگڵ و مارکسیەشەوە.

- ئەوانمان باسکرد.

- فەیلەسوفێکی گرنگی تر کە لە سەدەی بیستدا ڕۆڵێکی مەزنی هەبوو، فریدریک نیتشە«Friedrich Nietzsche» ی فەیلەسوفی ئەڵمانی بوو، کە لە ساڵی 1844 ەوە تا ساڵی 1900 ژیا. نیتشەش هەروەها دژی فەلسەفەی هیگڵ و «دونیا بینی مێژوویی» ئەڵمانی وەستایەوە. ئەو هات و خودی ژیانی، بەرامبەر بە بایەخدان بە مێژووی بێ گیان دانا و هەروەها بەرامبەری ئەو شتەش دابینا کە خۆی پێی دەگوت «مۆراڵی کۆیلایەتی مەسیحی». نیتشە دەیویست «هەموو بەهاکان سەر لەنوێ هەڵبسەنگێنێتەوە»، بۆ ئەوەی بەو شێوەیە چالاکیە لاوازەکانی ژیان نەبنە ڕێگری چالاکیە بەهێزەکانی ژیان. بەپێی نیتشە هەم ئاینی مەسیحی و هەم کەلەپوری فەلسەفیش ڕوویان لەسەر جیهانی ڕاستەقینە لابردبوو و لەبری ئەوە ئاماژەیان بۆ «ئاسمان» یان «جیهانی بیرکردنەوە» دەکرد. بەڵام ئەو شتەی کە بە جیهانی «ڕاستەقینە»یان دادەنا، لە ڕاستیدا جیهانێکی خەیاڵاوی بوو. ئەو دەیگوت؛ «ڕێز لە زەوی بگرە و گوێ بۆ ئەوانە شل مەکە کە پەیمانی ژیانێکی ئاسوودەیی سەرو زەویت پێدەدەن.»

- چی...

- فەیلەسوفێکی بوونگەری تری ئەڵمانی کە لەلایەن نیتشە و کیاگەگۆوە کاریگەری لەسەربوو، مارتین هایدیگەر «Martin Heidegger»بوو، بەڵام لێرەدا سەرنجمان دەخەینە سەر جان پۆڵ سارتەر«Jean Paul Sartre» ، کە لە ساڵی 1905ەوە تا 1980 ژیا. سارتەر لە نێوان هەموو بوونگەرەکاندا وەک پێشەوایەک دادەنرێت،

بەلایەنی کەمەوە بەلای زۆربەی خەڵکیەوە. بەتاییەتیش لە چلەکاندا، واتە ڕێک پاش شەڕی جیهانی دووهەم، فەلسەفەکەی ئەم گەشەی پێدرا. پاشانیش لە بزوتنەوەی مارکسی فەڕەنسیەوە نزیک بووەوە، بەڵام هەرگیز ئەندامی هیچ پارتیەک نەبوو.
ـ لەبەرئەمە بوو کە دەبوایە لە قاوەخانەیەکی فەڕەنسیدا یەکترمان ببینیایە؟
ـ هەروا بە ڕێکەوت نەبوو؛ سارتەر زۆر دەچووە قاوەخانەکان و هەر لە قاوەخانەیەکیشدا چاوی بە سیمۆنە دی بیوڤوار «Simone de Beauvoir»ی هاوسەری ژیانی کەوت. ئەویش هەروەها فەیلەسوفێکی بوونگەر بوو.
ـ فەیلەسوفێکی ئافرەت؟
ـ بەڵێ تەواوت گوێ لێبوو.
ـ پێم خۆشە مرۆڤایەتی خەریکە بەرەو شارستانیەت دەڕوات.
ـ بەڵام لە هەمان کاتدا، سەردەمی خۆشمان نیگەرانی نوێی لەگەڵ خۆیدا هێنا.
ـ تۆ ویستت باسی بوونگەریم بۆ بکەیت.
ـ سارتەر دەیگوت؛ «فەلسەفەی بوونگەری، مرۆڤ دۆستیە»، مەبەستیشی لەوە بوو کە بوونگەرەکان تەنها لەسەر خاڵی بوونی مرۆڤەوە دەستپێدەکەن و هیچی تر. بەڵام شایانی باسە بڵێین، لێرەدا باس لە مرۆڤدۆستیەک دەکەین کە بە بەراوردکردنی لەگەڵ مرۆڤدۆستانی ڕێنیسانسدا، لە ڕوانگەیەکی زۆر تاریکترەوە دەبینرا.
ـ بۆچی؟
ـ کیاگەگۆ و چەند فەیلەسوفێکی بوونگەری تری ئەم سەدەیەمان مەسیحی بوون. بەڵام سارتەر یەکێک بوو لەوانەی کە پێیان دەگوترێت

«بوونگەری کافر». لەپاش «مردنی خوداوە»، دەتوانین فەلسەفەکەی وەک شیکردنەوەیەکی بێ بەزەییانەی حاڵەتی مرۆڤ دابنێین. گوتەی «خودا مرد»، لە نیتشەوە هاتووە.

- بەردەوام بە!

- وشەی گرنگی فەلسەفەی سارتەریش، هەروەک کیاگەگۆ، وشەی «بوون»ە. بەڵام لێرەدا ئەو وشەیە تەنها هەبوون لە ژیاندا ناگرێتەوە. ڕووەک و گیانەوەریش بوونیان هەیە، بەڵام پێویستیان بەوە نیە بیر لە بوونیان بکەنەوە. مرۆڤ تەنها بوونەوەرێکی زیندووە کە لە بوونی خۆی بەئاگایە. سارتەر دەڵێت شتە فیزیاویەکان هەر ئەوەندەن کە «خۆیان لە خۆیاندا» شتێکن و هیچی تر، بەڵام مرۆڤ، لەسەرو ئەوەشەوە، «خۆی بۆ خۆی» شتێکە. واتە بە مرۆڤ بوون شتێکی جیاوازە وەک لەوەی شتێک بین، یان هەر بوونەوەرێکی تر بین.

- بەڵێ تەواو ئاشکرایە.

- پاش ئەوە سارتەر دەیگوت بوونی مرۆڤ لەپێش هەموو جۆرە مانا بەخشینێکەوە دێت، کە بە بوونی مرۆڤی دەدەین. واتە ڕاستی «هەبوونی من»، لەپێش ئەو پرسیارەدا دێت کە دەڵێت «من چیم». سارتەر دەیگوت «بوون لەپێش جەوهەرەوە دێت.»

- ئاڵۆزە بۆم.

- مەبەستمان لە جەوهەر، ئەو شتانەیە کە شتێکی لێ پێکهاتووە، واتە «سروشتی» شتێک یان «پێناسەی» شتێک. بەڵام بەپێی سارتەر مرۆڤ خاوەنی هیچ جۆرە «سروشتێکی» زگماک نیە، لەبەرئەوە دەبێت مرۆڤ خۆی خۆی دروستبکات. دەبێت «سروشتی» تایبەتی خۆیان یان

«جەوهەری» خۆیان پێکبهێنن، لەبەرئەوەی ئەمە شتێکە کە هەر لە سەرەتاوە بە مرۆڤ نەبەخشراوە.
- پێم وابێت ئێستاکە لەمەبەستت تێدەگەم.
- فەیلەسوفەکان بە درێژایی هەموو مێژووی فەلسەفە هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەیان دەدا کە دەیگوت مرۆڤ چیە، یان سروشتی مرۆڤ چیە. بەڵام سارتەر لەو بڕوایەدابوو مرۆڤ سروشتێکی ئاوها هەتاهەتایی نەبێت کە بتوانێت بگەڕێتەوە سەری. لەبەرئەوە بەشێوەیەکی گشتی، هیچ سوودێکیشی نیە لە «مانای» ژیان بپرسین. بەشێوەیەکی تر دەریببڕین، ناچارین خۆمان جڵەوی ژیانمان بگرین بەدەستەوە و خۆمان شتەکان بدۆزینەوە. ئێمە بەو ئەکتەرانە دەچین، کە بەبێ ئەوەی ڕۆڵێکیان بۆ دیاریکرابێت، دەخرێینە سەر شانۆ، یان بەبێ ئەوەی نووسراوی ڕۆڵەکەمان بەدەستەوە بێت، یان بەبێ ئەوەی «پڕۆمپتەر»prompter یکمان هەبێت و وشە پێویستەکانمان بەگوێدا بچرپێنێت، دەبێت ڕۆڵێک ببینین. (*پڕۆمپتەر؛ کەسێکە کاتێک ئەکتەرەکان وتەکانیان بیردەچێتەوە، بە چرپە چرپ پێیان دەڵێتەوە.و). بە کورتی، دەبێت خۆمان چۆنیەتی ژیانمان هەڵببژێرین.
- زۆر ڕاستە. خۆ ناتوانین تەورات یان کتێبێکی فەلسەفی بکەینەوە و تەماشای ئەوە بکەین کە چۆن پێویستە بژین. ئەگەر تەنها هەر ئەوەندە بوایە، ئەوا ئەو کاتە هەموو شتێک زۆر ئاسان دەبوو.
- ئێستاکە لە مەبەستەکە گەیشتیت، بەڵام سارتەر دەیگوت کاتێک مرۆڤ بەئاگادەبێت لەوەی کە بوونی هەیە و تێدەگات کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت بمرێت، وە لە هەمان کاتیشدا هیچ مانایەک نادۆزێتەوە کە دەستی بداتێ، ئەوا هەموو ئەمانە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی «دڵەڕاوکێ». لەوانەیە لەیادت بێت کە کیاگەگۆش وەسفی دڵەڕاوکێی

بە شێوەیەک دەکرد کە وەک خاسیەتێکی ئاشکرای حاڵەتی بوونی مرۆڤ بێت.
- بەڵێ.
- جگە لەوەش سارتەر دەڵێت مرۆڤ لە جیهانێکی بێ مانادا، هەست بە «نامۆیی» دەکات. کاتێکیش وەسفی «بەنامۆبوونی» مرۆڤ دەکات، ئەوا لەگەڵ هەندێک لە بیرکردنەوە گرنگەکانی مارکس و هیگڵدا یەکدەگرێتەوە. هەستکردنی مرۆڤیش بە نامۆیی لەسەر زەویدا دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی هەستکردن بە بێزاربوون و بێ ئومێدی و بێ تاقەتی و بێمانایی.
- بەڵام هێشتام لەنێو خەڵکیدا هەستکردن بە «دڵتەنگی» زۆر باوە، یان شتێکی ئاساییە بڵێین هەموو شتێک «بێمانایە.»
- بەڵێ، سارتەر وەسفی مرۆڤی شاریی سەدەی بیستەم دەکات. لەوانەیە لەیادت بێت کە مرۆڤدۆستانی سەدەی ڕێنیسانس بەو پەڕی دڵخۆشیەوە ئاماژەیان بۆ سەربەستی و ئازادی مرۆڤ دەکرد، بەڵام سارتەر ئەو سەربەستیەی وەک نەفرینێک دەبینی. ئەو دەیگوت؛ «مرۆڤ حوکمی بەسەردا کراوە کە ئازاد بێت. حوکم، چونکە مرۆڤ خۆی خۆی نەخوڵقاندووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەربەستە. کاتێکیش فڕێدەرێتە نێو ئەم جیهانەوە، ئیتر دەبێت لە هەموو کردارەکانی بەرپرسیار بێت.»
- خۆ ئێمە داوای ئەوەمان نەکردووە وەک تاکە کەسێکی سەربەست بخوڵقێندرێین.
- مەبەستی سارتەریش هەمان شت بوو. بەڵام ئێمە تاکەکەسی «سەربەستین» و سەربەستیشمان بە درێژایی هەموو ژیانمان حوکممان بەسەردادەدات کە شتەکان هەڵببژێرین. هیچ جۆرە

بەهایەک یان باوەڕێکی هەتاهەتایی نیە کە خۆمانی لەسەر ڕاست بکەینەوە و لەسەری بڕۆین. لێرەشەوە گرنگی جۆریەتی ئەو بڕیارە دەردەکەوێت کە دەیدەین، لەبەرئەوەی ئێمە بەتەواوەتی بەرپرسیارین لە هەموو شتێک کە دەیکەین. سارتەر بە تایبەتی ئەوە دووپات دەکاتەوە کە مرۆڤ هەرگیز نابێت بەرپرسیاری کارەکانی لەسەر خۆی داماڵێت و لەخۆی دوربخاتەوە. کەواتە لەم ڕوانگەیەوە ناتوانین لە بەرپرسیاری هەڵبژاردنەکانی خۆمان ڕابکەین و بڵێین «ناچارین» بچینە سەر کار، یان بڵێین «ناچارین» بەپێی کۆمەڵێ ڕێسا و ویستی بۆرجوازی بڕۆین بەڕێوە، کە شێوەی ژیانمان بۆ دەستنیشان دەکات. ئەو کەسەی هەروا بەئاسانی بەو شێوەیە خۆی فڕێدەداتە ناو گشتە نەناسراوەکەوە، ئەوا لەناو خەڵکە گشتیەکەدا دەتوێتەوە و وەک مرۆڤێکی بێ کەسایەتی کۆتایی دێت. ئەو کەسە لە خودی خۆی ڕایکردووە و لە ژیانێکی درۆدا دەژی. بەڵام ئازادی پاڵمان پێوە دەنێت کە خۆمان شتێک بکەین، کە خۆمان ببینە شتێک، کە بە شێوەیەکی «ڕاستەقینە» بژین.

ـ تێدەگەم.

ـ ئەم لایەنە هەڵبژاردنە ئاکاریەکانیشمان دەگرێتەوە. ئێمە هەرگیز ناتوانین خەتاکە بخەینە سەر شانی «سروشتی مرۆڤانە»، یان «لاوازی مرۆییانە» یان بیخەینە پاڵی هەر شتێکی تری لەو بابەتە. ڕوودەدات کەسانی بەتەمەن وەک بەراز هەڵسوکەوت بکەن و پاشان خەتاکە بخەنە ملی «ئادەم». لە ڕاستیدا ئادەم وەک شکڵێک یان وەک ئەداتێک بەکاردەهێنین، بۆ ئەوەی بەرپرسیاری کارەکانمان لە خۆمان دوربخەینەوە.

- بەڵێ، بەڵام تا چ ڕادەیەک ئەو پیاوە دەبێت خەتای بخرێتە مل، خۆ دەبێت سنوورێک هەبێت و ئەوەمان نیشانمان بدات.
- هەرچەندە سارتەر دووپاتی دەکردەوە کە ژیان خۆی لە خۆیدا هیچ مانایەکی نیە، بەڵام ئەم شێوە بیرکردنەوەیەی مانای ئەوە نابەخشێت کە وا هەستکات پێنج و حەوت وەک یەک بن. ئەو یەکێک نیە لەوانەی کە پێیان دەگوترێت «نیهیلیست Nihilist».
- «نیهیلیست» چیە؟
- کەسێکە کە بە بڕوای ئەو هیچ شتێک هیچ مانایەکی نیە و هەموو شتێکیش ڕێگەی پێدەدرێت. سارتەر وای دەبینێت کە ژیان «دەبێت» مانایەکی هەبێت، بەڵام ئێمە خۆمانین کە دەبێت ئەو مانای ژیانە بخوڵقێنین. هەبوون، مانای ئەوەیە بتوانیت بوونی خۆت بخوڵقێنیت.
- دەتوانیت کەمێک زیاتر ڕوونی بکەیتەوە؟
- سارتەر دەیویست بیسەلمێنێت کە ئاگایی خۆی لە خۆیدا هیچ شتێک نیە گەر لەپێشدا هەست بە شتێک نەکات. لەبەرئەوەی ئاگایی لە بنەڕەتدا، هەمیشە بەئاگابوونە لە شتێک. ئەو «شتەش» بە هەمان هێندی هۆکارە دەرەکیەکان، خۆشمان هاوبەشی پێکهاتنی دەکەین. ئێمە لە ڕێگەی ئەو شتانەوەی کە هەڵیاندەبژێرین و مانایان بەلامانەوە هەیە، شێوەی هەستەکانمان هەڵدەبژێرین.
- دەتوانیت نمونەیەک بهێنیتەوە؟
- لەوانەیە دوو کەس لە هەمان هۆڵدا بن و لەگەڵ ئەوەشدا بە دوو شێوەی تەواو جیاواز هەست بکەن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئێمە کاتێک هەست بە چواردەورمان دەکەین، مانای تایبەتی یان بایەخدانی تایبەتی خۆمان دەئاخنینە ناو هەڵسەنگاندنی شتەکانەوە. یان بۆ نمونە ئافرەتێک کە سکی هەبێت... ئەو ئافرەتە وا

هەست دەکات لە هەموو شوێنێکدا ئافرەتی سکپڕ دەبینێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە لەوەوپێش ئافرەتی سکپڕ نەبووبێت، بەڵکو تەنها ئەوەندەیە کە سکپڕبوونی خۆی مانای نوێی پێ بەخشیووە. یان بۆ نمونە کەسێک کە نەخۆش بێت، پێدەچێت لە هەموو شوێنێکدا ئۆتۆمبیلی فریاگوزاری ببینێت...

ـ تێدەگەم.

ـ واتە بوونی تایبەتی خۆمان، بەشداری شێوەی چۆنیەتی و جۆریەتی هەستکردنی چواردەورەکەمان دەکات. ئەگەر شتێک بەلامەوە گرنگ نەبێت، ئەوا لەوانەیە بە هیچ جۆرێک نەیبینم. ئێستاکەش پێت دەڵێم بۆچی ئەمڕۆ درەنگ هاتم.

ـ بەدەستی ئانقەست بوو، وا نیە؟

ـ لەپێشدا حەزدەکەم بزانم، کاتێک هاتیتە ناو قاوەخانەکەوە چیت بینی؟

ـ یەکەم شت کە بینیم ئەوە بوو کە تۆ لێرە نەبوویت.

ـ سەیر نیە بەلاتەوە؟ ...یەکەم شت کە بینیت، شتێک بوو کە لێرەدا «نەبوو»؟

ـ لەوانەیە، بەڵام دەبوایە چاوم بە تۆ بکەوتایە.

ـ سارتەر لە ڕێگەی چاوپێکەوتنی قاوەخانەوە دەیویست بڵێت ئێمە ئەو شتانە «دەفەوتێنین» کە بەلامانەوە گرنگ نین و دەیوست ڕێک ئەو خاڵەمان نیشانبدات.

ـ ئایا تەنها لەبەرئەوە درنگ هاتیت بۆ ئەوەی ئەو خاڵەم نیشان بدەیت؟

ـ لەبەرئەوە بوو کە لەو خاڵە گرنگەی فەلسەفەی سارتەر تێبگەیت. جگە لەوەش دەتوانیت وەک ڕاهێنانێک تەماشای بکەیت.

ـ ئای شەیتان!
ـ بۆ نموونە ئەگەر ئاشق بیت و چاوەڕوانی «یار» بیت تەلەفونت بۆ بکات، ئەوا درێژایی ئێوارەکە «گوێت لەوە دەبێت» کە ئەو تەلەفون ناکات. بەردەوام ئەوە دەچێتە مێشکتەوە کە ئەو تەلەفون «ناکات». ئەگەریش لەلای ئیستگەکە ژوانت لەگەڵیدا هەبێت و ئەو ناوەش جمەی بێت لە خەڵک، بەڵام یاری تۆی لێنەبێت، ئەوا ئەو کاتە هەموو خەڵکەکان نابینیت. بەڵکو تەنها وەک ڕێگرێک دێنە بەرچاوت، چونکە ئەوان بەلاتەوە گرنگ نین. لەوانەشە ڕاستەوخۆ وەک جاڕسکەرێک یان بارێک بیان بینیت، لەبەرئەوەی شوێنێکی یەکجار گەورەیان گرتووە. تەنها شتێک کە دەچێتە مێشکتەوە، ئەوەیە کە ئەو لەوێ نیە.
ـ جێگەی داخە، بەڵام ڕاستیشە.
ـ لەلایەکی ترەوە سیمۆنە دی بیوڤوار، هەوڵیدەدا بوونگەری لەسەر ڕۆڵی ڕەگەزەکان بەکاربهێنێت. وەک دەزانیت سارتەر ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە مرۆڤ خاوەنی «سروشتێکی» هەتاهەتایی نیە کە پشتی پێ ببەستێت. زیاتریش دەیگوت ئێمە خۆمان، خۆمان دەخوڵقێنین و خۆشمان پێناسەی خۆمان دەستنیشان دەکەین.
ـ ئەی پاشان؟
ـ هەمان شتیشە کاتێک کە لە ڕەگەزەکان دەڕوانین. بە بڕوای سیمۆنە هیچ جۆرە «سروشتێکی ئافرەتانە» و «سروشتێکی پیاوانە»ی هەتاهەتایی بوونی نیە، بەڵکو ئەوانە تەنها جۆرە تێگەیشتنێکی باون و هیچی تر. بۆ نموونە ئاسایی بوو گەر بڵێن پیاو «سروشتێکی سنوورشکێنی» هەیە، لەبەرئەوە هەمیشە لە دەرەوەیماڵەوەدا هەوڵی دۆزینەوەی مانایەک و ئامانجێک دەدات. دەربارەی ئافرەتیش دەیانگوت جۆرە ئاڕاستەیەکی تەواو پێچەوانەیان هەیە، بۆ نموونە

دەیانگوت ئافرەت «پەیوەستە»، واتە حەز بەوە دەکات لەو شوێنەدا بێت کە هەیە. بەو شێوەیەش لە بواری خێزان و سروشت و شتەکانی دەوروبەریدا دەمێنێتەوە. لەکاتی ئێستاکەماندا ئافرەت لە پیاو زیاتر بایەخ بە «نرخە هێمنەکان یان نەرمەکان» دەدات.

ـ ئایا بە ڕاستی سیمۆنە لەو بڕوایەدا بوو؟

ـ نەخێر، باش گوێت شل نەکرد. بەبڕوای ئەو هیچ جۆرە «سروشتێکی ئافرەتانە» یان «سروشتێکی پیاوانە» بوونی نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە؛ لە دونیا بینینی ئەوەوە هەم پیاو و هەم ئافرەتیش دەبێت خۆیان لەو بڕوا چەسپیوانە یان لەو بۆچوونە پێشداوەریانە خۆیان ڕزگاربکەن.

ـ لەڕاستیدا منیش لەگەڵیدا تەبام.

ـ گرنگترین کتێبی بەناوی «ڕەگەزی دووهەم» لە ساڵی 1949دا دەرچوو.

ـ مەبەستی چی بوو لەوە؟

ـ مەبەستی لە ئافرەت بوو، چونکە کەلتوری ئێمە ئافرەتی کردووە بە ڕەگەزی «دووهەم» و تەنها پیاوان وەک بابەتێک دەردەکەون. ئافرەتانیش دەبنە داردەستەی پیاو و بەو شێوەیەش بەرپرسیارێتی ژیانی خۆیان لێ دەسەندرێتەوە.

ـ واتە؟

ـ واتە ئافرەت دەبێت ئەو بەرپرسیاریە بەدەست بهێنێتەوە. دەبێت خۆی بدۆزێتەوە و پێناسی خۆی بە پیاوەوە گرێنەدات. لە ڕاستیدا تەنها پیاو ئافرەت ناچەوسێنێتەوە، بەڵکو ئافرەتیش بەهۆی هەڵنەگرتنی بەرپرسیاری خۆی، خۆی دەچەوسێنێتەوە.

- مەبەستت لەوەیە ئێمە خۆمان بڕیاردەدەین چەندە سەربەست و نەبەستراوە بین؟

- دەتوانیت وا بڵێیت... لەلایەکی تریشەوە فەلسەفەی بوونگەری لە چلەکانەوە هەتاوەکو ئەمڕۆکەش ڕەنگدانەوەی خۆی لەناو ئەدەبدا جێهێشتووە، بەتایبەتیش لەبواری شانۆدا. سارتەر خۆی هەم ڕۆمان و هەم شانۆشی دەنووسی. لێرەدا دەبێت ناوی گرنگی وەک کامۆ «Camus»و بێکێت «Beckett» ی ئێرلەندی و لۆنیسکۆ «Lonesco» ی ڕۆمانی و گۆمبرۆڤیچ«Gombrowich» ی پۆڵەندیش بهێنین. خاڵی هاوبەشی ئەم نووسەرانە و کۆمەڵێ نووسەری تری مۆدێرنیش، ئەبسۆردیزم Absurdism» عەبەسی»ە. ئەم وشەیە بەتایبەتی لە شانۆدا بەکاردێت.

- چەندەها جار ئەو ناوەم بەرگوێ کەوتووە.

- دەزانیت وشەی «ئەبسۆرد» مانای چیە؟

- مانای شتێکی بێ مانا یان شتێکی دژ بە ئەقڵ ناگرێتەوە؟

- پڕاوپڕ ئەو مانایە دەبەخشێت. «شانۆی ئەبسۆرد»، وەک دژێکی «شانۆی ڕاستەقینە»سەریهەڵدا. ئامانجەکە لەوەدابوو بێمانایی ژیان —یان بوون- لەسەر شانۆ نیشانبدەن و لێرەشەوە هەستی خەڵکی ببزوێنن. واتە مەبەستەکە لەوەدا نەبوو کە سەرقاڵی بێمانایی بن، بەڵکو بە پێچەوانەوە؛ نیشاندان و ئاشکراکردنی شتە بێماناکان، بۆ نمونە ڕووداوەکانی ژیانی ڕۆژانە، بینەران ناچاردەکات بەدوای ژیانێکی ڕاستەقینەتر و پڕماناتردا بگەڕێن.

- بەردەوام بە!

- زۆر جار شانۆی ئەبسۆرد حاڵەتی ساکار و بێناوەڕۆکی نیشاندەدا. لەبەرئەوە دەتوانین ناوی بنێین جۆرە «زیادە ڕۆییەکی ڕیالیزمی»،

واتە مرۆڤەکان ڕێک بەو جۆرە نیشاندەدرێن کە هەن. بەڵام ئەگەر لەسەر شانۆ، دیمەنی ئاسایی ماڵێکی ئاسایی نیشان بدەیت –بۆ نمونە وێنەی گەرماوەکەیان- ئەوا بێگومان بینەران دەکەونە پێکەنین. دەکرێت ئەو پێکەنینەش وەک جۆرە بەرەنگاریەک لەدژی بینینی خۆیان بە ڕووتی لەسەر شانۆ، لێکبدەینەوە.

- تێدەگەم.

- ڕوودەدات شانۆی ئەبسۆرد خاسیەتی سوریالیشی هەبێت. زۆر جار کەسەکان لەسەر شانۆدا، خۆیان لە بارودۆخێکی نەشیاو و شێوە خەونیدا دەبیننەوە. ئەکتەرەکانیش بەبێ هیچ جۆرە سەرسوڕماندنێک ڕۆڵی خۆیان دەبینن و قبوڵی دەکەن، بەڵام ڕێک نەبوونی ئەو سەرسوڕماندنەیە کە وا لە بینەران دەکات بەناچاری سەریان بسوڕمێت. ئەم حاڵەتە فلیمە بێدەنگەکانی «شاری شاپلنیش» دەگرێتەوە. ئەو شتەی کە لە فلیمەکانی شاپلندا دەبێتە مایەی پێکەنین، سەرنەسوڕمانی خۆیەتی لە هەموو ئەو بارودۆخە نالەبارانەی کە تێی دەکەوێت. بەو شێوەیەش پێدەچێت بینەران ناچاربن بچنە ناو خۆیانەوە و بەدوای شتێکی زۆر ڕاست و دروستتردا بگەڕێن.

- بەلایەنی کەمەوە سەرمان لەو بارودۆخە سەیرانە دەسوڕمێت کە مرۆڤی تێدەکەوێت و هێشتام بە شێوەیەکی ئاسایی وەیدەگرێت.

- هەندێ جار لەوانەیە گرنگ بێت بەم جۆرە بیربکەینەوە و بڵێین؛ ئەمە شتێکە کە دەمەوێت «لێی دوربکەومەوە»، هەرچەندە هێشتام نازانم ڕوو لە چ شوێنێکی تر بکەم.

- بۆ نمونە کاتێک خانوەکەمان دەسوتێت، ئەوا ناچارین بێینە دەرەوە و دوربکەوینەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ خانویەکی ترمان نیە کە تێیدا بژین.
- بەڵێ. چایەکی ترت بۆ بهێنم؟ یان ساردیەک؟
- بەڵێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتام ناڕازیم لەوەی کە درەنگ هاتیت.
- ئاساییە.
پاش کەمێک ئەلبێرتۆ گەڕایەوە و ساردیەک و کوپێک قاوەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. سۆفیاش هێواش هێواش چێژی لە دانیشتنی قاوەخانەکە دەبینی، هەرچەندە گومانی هەبوو کە باسی سەر مێزەکانی دی هێندە گرنگ بن.
ئەلبێرتۆ بتڵی ساردیەکەی بە توندی لەسەر مێزەکە دانا. هەندێک لە دانیشتوانی قاوەخانەکە ئاوڕیان دایەوە و تەماشایان کرد... پاشان گوتی؛
- لێرەدا خەریکە دەگەینە کۆتایی ڕێگاکە.
- مەبەستت لەوەیە مێژووی فەلسەفە بە سارتەر و بوونگەری کۆتایی دێت؟
- نەخێر، ئەوە زیادە گوتنە. فەلسەفەی بوونگەری کاریگەریەکی گەورەی لەسەر ملیۆنەها خەڵکی سەرانسەری زەوی جێهێشت. هەروەک بینیشمان ڕەگە مێژووییەکەی دەگەڕێتەوە سەر کیاگەگۆ و تەنانەت سوکراتیش. بەو شێوەیە سەدەی بیستەم، سەرهەڵدان و نوێکردنەوەیەکی ئەو بزوتنەوە فەلسەفیانەی بەخۆیەوە دی کە لەوەو پێش باسمانکردن.
- دەتوانیت چەند نمونەیەک بهێنیتەوە؟

ـ وەک «تۆمیزمی نوێ«New Thomism ، واتە ئەو بیرمەندانەی لە ڕەچەڵەکدا سەر بە تۆماس ئەکویناسن، یان بۆ نمونە بزوتنەوەیەکی تر کە پێی دەگوترێت «فەلسەفەی شیکارگەری Analytical Philosophy«یان «ئیمپیریزمە لۆژیکیەکان «Logical Empiricism کە ڕەگەکەیان دەگەڕێتەوە سەر هیوم و ئیمپیریزمە بەریتانیەکان، بەڵام هەروەها دەگەڕێتەوە سەر لۆژیکی ئەریستۆتالیسیش. جگە لەمانەش سەدەی بیستەم ڕەنگدانەوەیەکی «مارکسیزمی نوێ»ی پێوە دیاربوو، بەخۆی و هەموو بزوتنەوە جیاوازەکانیەوە. لەوەو پێشیش باسی «داروینیزمی نوێ»مان کرد، لەسەرو ئەوەشەوە ئاماژەمان بۆ گرنگی «شیکردنەوەی دەروونی» کرد.

دواهەمین ڕێباز کە دەبێت ناوببرێت «مەتریالیزم«Materialism ە، ئەمیش هەروەها ڕەگی بە درێژایی مێژوودا داکوتیووە. دەتوانین زۆربەی زانستی ئەمڕۆکە بگەڕێنینەوە بۆ سەردەمی پێش سوکرات. بۆ نمونە تا ئێستاکەش گەڕان بەدوای ئەو «گەردیلە بنچینەییەی» کە دابەش ناکرێت هەر بەردەوامە، واتە ئەو گەردیلە بنچینەییەی کە هەموو مادەیەکی لێ پێکهاتووە. تا ئێستاکەش کەس نەیتوانیووە ڕاستی «مادە» بخاتە ڕوو. زانستی سروشتی مۆدێرن –وەک فیزیای ناوک و کیمیای بایۆلۆجی- هێندە سەرنجڕاکێشەرن، کە وای لێهاتووە ببێتە بەشێکی گرنگی ژیانی خەڵکانێکی زۆر.

ـ کەواتە تیوری کۆن و نوێ هەر بەردەوامن؟

ـ بەڵێ دەتوانیت وا بڵێیت، لەبەرئەوەی ئەو پرسیارانەی لەسەرەتای ئەم کۆرسەدا هەڵمان ڕشتن، هێشتام بێ وەڵام ماونەتەوە. لێرەدا سارتەر لە خاڵێکی گرنگی دا؛ ئەو دەیگوت ناکرێت پرسیارە بوونیەکان یەک کەڕەت و بۆ هەتاهەتایە وەڵام بدرێنەوە. پرسیارە

فەلسەفیەکان شتێکی تایبەتن و هەموو نەوەیەک -بەڵکو هەموو تاکەکەسێک- دەبێت سەرلەنوێ و سەرلەنوێ لە خۆیانی بکەنەوە.
- بیرکردنەوە لەم بابەتە، تا ڕادەیەک بێ ئومێدی دەبەخشێت.
- پێم وانیە لەگەڵتا تەبابم. مەگەر لە ڕێگەی کردنی ئەو پرسیارانەوە نەبێت کە هەست بەوە دەکەین کە دەژین؟ لەسەرو ئەوەشەوە کاتێک مرۆڤ خۆی بە دۆزینەوەی وەڵامی پرسیارە سەختەکانەوە سەرقاڵکردووە، ئەوا لە هەمان کاتدا وەڵامی ڕوون و ئاشکرای کۆمەڵێک پرسیاری تری دەستکەوتووە، هەمیشەش بەم شێوەیە بووە. زانست و لێکۆڵینەوە و تەکنیک، هەر هەموویان لە بیرکردنەوەی فەلسەفی مرۆڤەوە سەرچاوەیان هێناوە و هەڵقوڵاون. ئایا لە بنچینەدا تێڕامانی مرۆڤ سەبارەت بە بوون، نەبووە هۆی ئەوەی مرۆڤ بگەیەنێتە سەر مانگ؟
- بەڵێ ڕاستە.
- کاتێک ئارمسترۆنگ «Armstrong» پێی لەسەر مانگ دانا گوتی؛ «هەنگاوێکی چکۆلەیە بۆ مرۆڤێک، بەڵام هەنگاوێکی مەزنە بۆ مرۆڤایەتی». لە ڕێگەی ئەم ڕستەیەشەوە، کاتێک پێی لەسەر مانگ دانا، هەموو ئەو مرۆڤانەی کە لە پێش ئەوەوە ژیابوون لەگەڵ خۆیدا ڕایکێشانە سەر مانگ، لەبەرئەوەی وەک دەزانیت هەموو ئازایەتیەکە بۆ ئەو ناگەڕێتەوە.
- بێ گومان نەء.
- سەردەمی خۆشمان ڕووبەڕوی گرفتی نوێ بۆتەوە. بە پلەی یەکەم گرفتە گەورەکانی ژینگە دێت، لەبەرئەوە ڕێبازێکی گرنگی فەلسەفەی سەدەی بیستەم، «فەلسەفەی ژینگە» یان «ژینگەسۆفی» بوو، هەروەک چۆن یەکێک لە دامەزرێنەرەکانی، «ئارنە نێیس Arne

«N SSی فەیلەسوفی نەرویجی، ناوی لێنابوو. زۆرینەی ژینگەسۆفیەکانی ڕۆژئاوا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هەموو شارستانی ڕۆژئاوا نەک تەنها بەسەر ڕێگەیەکی تەواو هەڵەدا دەڕوات، بەڵکو خەریکە لەڕادەی بەرگەگرتنی ئەم گۆی زەویە تێدەپەڕێت. ئەوان هەوڵدەدەن ڕەگ و ڕیشەی کاریگەری ژینگە پیسکردن و شێواندنی ژینگە نیشانبدەن و لەو بڕوایەدان شێوەی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوا هەڵە بێت.

ـ پێم وابێت ڕاست دەکەن.

ـ بۆ نمونە ژینگەسۆفیەکان گومان لە خودی بیرکردنەوەی گەشەکردن دەکەن. وەک دەزانیت بنەمای بیرکردنەوەکەی لەسەر ئەو بنچینەیە دامەزراوە کە مرۆڤ «لەسەرو» هەموو شتێکەوە دادەنێت –بەڵکو وەک خاوەن دەسەڵاتێک بەسەر سروشتیشدا دایدەنێت. خودی ئەم شێوە بیرکردنەوەیەش بەئاشکرا مەترسیەکی تەواو لەسەر بەردەوامی هەموو ژیانی ئەم گۆی زەویە نیشاندەدات.

ـ تەنانەت بیرکردنەوەش لەو بابەتە، تورەم دەکات.

ـ بۆ پشتگیریکردنی ڕەخنەکانیشیان، زۆربەی ژینگەسۆفیەکان هانایان بۆ بیرکردنەوە و شێوەی تێڕوانینی کەلتوری تر دەبرد. بۆ نمونە کەلتوری هیندی. هەروەها لێکۆڵینەوەیان لەسەر شێوەی بیرکردنەوە و داب و نەریتی «خەڵکە سروشتیکان» دەکرد، یان «خەڵکە سەرەتاییەکانی» وەک هیندە سوورەکان، هەموو خوێندنەکەشیان بە مەبەستی دۆزینەوەی ئەو شتانەبوو کە ئێمە وونمان کردوون.

ـ باش تێدەگەم.

ـ هەروەها لە بواری زانستیشدا لە ماوەی چەند ساڵی ڕابووردودا باس لەوە دەکەن کە تەواوی جۆری بیرکردنەوەی زانستیمان لە بەرامبەر

«گۆڕانی نمونەی متمانە پێکراوی باوی زانستیدا» وەستاوە. واتە داوای گۆڕانکاریەکی بنچینەیی شێوازی بیرکردنەوەی زانستی دەکەن. هەر لەئێستاشەوە لە هەندێ بواری تایبەتیدا بە ئەنجامی خۆیان گەیشتوون. بۆ نمونە چەندەها بزوتنەوەی «ئەڵتەرناتیف»مان بینی کە بایەخ بە بیرکردنەوەی گشتی دەدەن و هەوڵدەدەن شێوە ژیانێکی نوێ بخوڵقێنن.

ـ ئەوە شتێکی باشە.

ـ بەڵام لە هەمان کاتدا، وەک هەمیشە، کاتێک شتێک پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەبێت، ئەوا دەبێت خێرا جیاوازی لە نێوان خراپی و باشیدا بکەین. هەندێک دەڵێن ئێمە چووینەتە سەردەمێکی نوێوە. بەڵام مەرج نیە هەموو شتێکی نوێ باش بێت و پێویستیش ناکات هەموو شتێکی کۆن فڕێ بدەین. ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی کە پاڵی پێوە نام ئەم کۆرسەت بدەمێ. ئێستاکە زانیاریەکی فەلسەفی باشت هەیە و لەم ڕوانگەیەوە دەتوانیت ئاراستەی ژیان و بوونی داهاتووت هەڵبژێریت.

ـ زۆر سوپاس بۆ ئاگاداریکردنەوەکەت!

ـ پێم وابێت بەم زوانە هەستدەکەیت کە زۆربەی ئەو شتانەی لە ژێر «ئالای نوێدان»، تەنها هەڵخڵەتاندنێکی پەتین و هیچی تر. لەچەند دە ساڵەی دوایدا، بەشی ڕۆژئاوای جیهان خەریکە لەژێر «ئاینی نوێ» و «پەنهان ناسی نوێ» و خورافاتی مۆدێرندا دادەپۆشرێت. دەتوانین بڵێین بۆتە پیشەسازیەکی نوێ. پاش ئەوەی ئاینی مەسیحی لایەنگرەکانی لەدەستدا، هەموو ئەو جۆرە بڕوایانە وەک قارچک لە بازاڕی بیرکردنەوەدا هەڵتۆقین.

ـ وەک چی بۆ نمونە؟

ـ لیستەکە هێندە زۆرە، ئەگەر ناوی هەموویان بهێنین، ئەوا هەر زۆر دورو درێژ دەردەچێت. ئاسانیش نیە باسی سەردەمی خۆت بکەیت. بەڵام بەهەرحاڵ ئێستاکە پێشنیاردەکەم بەناو شاردا بڕۆین... دەمەوێت شتێکت نیشان بدەم.
سۆفیا شانێکی هەڵتەکاند و گوتی؛
ـ ناتوانم زۆر بمێنمەوە، بەڵام هیوادارم ئاهەنگەکەی سبەینێت لەیاد نەکردبێت.
ـ بێگومان لەیادمە، لەبەرئەوەی خۆشترین شت لەوێدا ڕوودەدات. هەرچۆنێک بێت دەبێت لە پێشدا کۆرسی فەلسەفەکەی هیلدە تەواو بکەین. مێجەریش لە ڕاستیدا لەوە زیاتر بیری نەکردۆتەوە و لەپاش ئەوەش کەمێک لە دەسەڵاتی بەسەرماندا لەدەست دەدات.
دیسانەوە ئەلبێرتۆ بتڵی ساردیەکەی بەرزکردەوە، کە ئێستاکە بەتاڵبوو و بە توندی لەسەر مێزەکە داینایەوە.

چوونە دەرەوە... خەڵکانی بەپەلەی سەر شەقامەکە وەک مێروولەی بەگوڕی شارە مێروولەیەک جمەیان دەهات. سۆفیا بەپەرۆشەوە چاوەڕوانبوو بزانێت ئەلبێرتۆ چی نیشان دەدات.
پاش کەمێک بەلای کۆگایەکی گەورەدا تێپەڕین کە هەموو شتێکی وەک تەلەفیزۆن و ڤیدیۆ و سەتەلایت و تەلەفونی دەستی و کۆمپیوتەر و فاکسی دەفرۆشت.
ئەلبێرتۆ پەنجەی بۆ شتە دانراوەکان ڕاکێشا و گوتی؛
ـ لێرەدا دەتوانین سەدەی بیستەم ببینین، سۆفیا. دەتوانین بڵێین لە ڕێنیسانسدا جیهان تەقیەوە، ئەوروپیەکان بە خۆیان و دۆزینەوە

گەورەکانیانەوە بە هەموو جیهاندا دەگەڕان. ئەمڕۆکەش پێچەوانەکەی ڕوودەدات. دەتوانین بڵێین تەقینەوەیەکی هەڵاوگێڕاوە.

ـ مەبەستت چیە؟

ـ مەبەستم لەوەیە کە هەموو جیهان کەوتۆتە ناو تۆڕێکی گەورەی پەیوەندیگرتنەوە. هێشتام هێندەی بەسەردا تێنەپەڕیوە کە فەیلەسوفەکان ناچاربوون چەندین ڕۆژ بەئەسپ و عەرەبانە سەفەربکەن بۆ ئەوەی ئاشنایی لەگەڵ ژیان و بووندا پەیدا بکەن، یاخود بۆ ئەوەی لەگەڵ فەیلەسوفی تردا کۆببنەوە. ئەمڕۆکەش لە هەر شوێنێکی جیهاندا بین، دەتوانین هەموو زانیاری مرۆڤایەتی بهێنینە سەر شاشەی کۆمپیوتەرێک.

ـ بیرکردنەوە لەوە سەیرە و تاڕادەیەکیش ترسناکە.

ـ پرسیارەکە لەوەدایە ئایا مێژوو خەریکە تەواو دەبێت، یان ئێمە بە پێچەوانەوە لەسەر سەرەتای سەدەیەکی نوێدا وەستاوین. ئێمە چیتر هاووڵاتی شارێک یان وڵاتێکی دیاریکراو نین، بەڵکو لەنێو شارستانیەکی جیهانیدا دەژین.

ـ ڕاستە.

ـ گەشەکردنی تەکنیکی ـبەتایبەتیش لە بواری پەیوەندیگرتندا- لە 30 بۆ 40 ساڵی ڕابووردودا، لە هەموو درێژایی مێژوو بەگوڕتر بووە. هێشتام لەوانەشە هەر سەرەتاکەیمان بینیبێت...

ـ ئەمە بوو کە ویستت نیشانم بدەیت؟

لە کاتی ڕۆیشتنیاندا، وێنەی چەند سەربازێکی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر شاشەی تەلەفیزۆنێک دەرکەوت.

ـ تەماشا کە! سۆفیا هاواریکرد.

ئەوجا زۆمی کامێراکە چووە سەر سەربازێک کە تا ڕادەیەک هەروەک ئەلبێرتۆ ڕیشێکی ڕەشی دانابوو. لە پڕێکدا بەیاخێکی بەرزکردەوە و لەسەر نووسرابوو؛ «بەم زوانە دێمەوە هیلدە!» بەدەستەکەی تری ماڵئاوایی کرد و دیارنەما.

ـ چ کەڵەک بازێکە! ئەلبێرتۆ گوتی.

ـ مێجەر بوو؟

ـ تەنانەت نامەوێت وەڵامیشت بدەمەوە.

بەناو باخچەی بەردەم کڵێسەکەدا ڕۆیشتن و گەیشتنە سەر شەقامێکی سەرەکی تر. سیمای ئەلبێرتۆ کەمێک بێزار دەردەکەوت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەی بۆ کتێبخانەیەکی گەورە کرد. ناوی «لیبریس» بوو و گەورەترین کتێبخانەی شارەکە بوو.

ـ ئێرە بوو کە ویستت نیشانم بدەیت؟

ـ با بچینە ناوەوە.

لەناوەوەدا ئەلبێرتۆ پەنجەی بۆ گەورەترین دیوار ڕاکێشا، بەسەر سێ بەشدا جیاکرابووەوە؛ «سەدەی نوێ»، «شێوە ژیانی ئەلتەرناتیف»، «پەنهان ناسی.»

ڕەفەکان چەندین ناونیشانی سەرنج ڕاکێشەریان لە خۆگرتبوو؛ «ژیان لە دوای مردن»، «نهێنی ڕۆحانیەت»، «بەختگرتنەوە بە کارت»، «دیاردەی یۆفۆ»، «چارەسەرکردنی سروشتی»، «تۆ لەوەوپێش لەم ژیانەدا بوویت»، «ئەستێرە ناسی چیە؟»، «خواکان دەگەڕێنەوە»، ئەمانە و چەندەها و چەندەهای تریش... سەدان ناونیشانی جیاواز جیاواز. لە یەکێک لە ڕەفەکانی ژێری ژێرەوەشدا، چەندەها کتێبی لەو بابەتەی تێدا دانرابوو.

ـ ئەمەش هەروەها سەدەی بیستەمە، سۆفیا. ئەمە کلێسەی سەردەممانە.
ـ تۆ باوەڕت بەو جۆرە شتانە هەیە؟
ـ بەلایەنی کەمەوە فێڵ و تەڵەکەیەکی زۆری تێدایە. بەڵام هەروەک وێنەی ڕووت و گۆڤاری سێکسی باش دەفرۆشرێن. دەتوانین زۆربەیان وەک جۆرە گۆڤارێکی سێکسی ناوبنێین. لێرەدا گەنجەکان دەتوانن ئەو کتێبانە بکڕن کە زۆر بەلایانەوە گرنگن. بەڵام پەیوەندی نێوان فەلسەفە و ئەو جۆرە کتێبانە وەک پەیوەندی نێوان خۆشەویستی ڕاستەقینە و گۆڤاری سێکسی وایە.
ـ پێم وابێت زیاد لە ڕادە توندو تیژیت.
ـ با بڕۆین لە باخچەکەدا دابنیشین.
لە کتێبخانەکە هاتنە دەرەوە و لەسەر کورسیەکی بەتاڵی بەردەم کلێسەکەدا دانیشتن. لەژێر دارەکاندا دەنگی گمەگمی کۆتر دەهات و جارجارێکیش جریوە جریوی یەک دوو چۆلەکەیەک بەر گوێ دەکەوت. ئەوجا ئەلبێرتۆ گوتی؛
ـ ئەمەیە کە پێی دەگوترێت پاراسایکۆلۆجی. بەڵام هەروەک منداڵی بەناز ناوی تری زۆرە، بۆ نمونە پێشی دەگوترێت؛ توانای سەروسروشتی یان پەنهان ناسی یان ئەستێرە ناسی یان یۆفۆناسی.
ـ بەڵام بەڕاست وەڵامم بدەرەوە، ئایا تۆ لەو بڕوایەدایت هەموو ئەوانە تەنها فێڵ و تەڵەکە بن؟
ـ بێگومان بۆ فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە جوان نیە هەموو شتێک بە هەمان پێوانە هەڵبسەنگێنێت، بەڵام بە دوری نازانم هەموو ئەو وشانەی کەمێک لەوەوپێش ناوم بردن، نەخشەی وردی شوێنێکبن کە لە ڕاستیدا بوونی نیە. لێرەدا بەلایەنی کەمەوە هیوم دەیەوێت

زۆربەی ئەو «کۆرپە فەنتاسیانە» بخاتە ناو ئاگرەکەوە. زۆرینەی ئەو کتێبانە تەنانەت هێندەی یەک ئەزمونی ڕاستەقینەش لەدووتوێیدا بەدی ناکرێت.

ـ ئەی چۆنە ئەو هەموو کتێبە لەسەر ئەو بابەتانە دەنووسرێن؟

ـ یەکێکە لە بازرگانیە گەورەکانی جیهان و خەڵکانێکی زۆریش ئەو جۆرە کتێبانەیان گەرەکە.

ـ ئەی بە بڕوای تۆ بۆچی ئەو جۆرە کتێبانەیان مەبەستە؟

ـ بێگومان ئەوە نیشانەی تاسەکردنی شتێکی «نهێنی»یە، شتێک کە «جیاواز» بێت، واتە شتێک کە ژیانی ڕۆژانەی سەختیانی پێ بشکێنن. بەڵام ئەمە وەک ئەوە وایە بەسەر کانیەکەدا بڕۆیت و بتەوێت ئاو بهێنیت.

ـ مەبەستت چیە؟

ـ ئێمە لێرەدا لەناو حەکایەتێکی خۆشدا دێین و دەچین. بە ڕۆژی ڕووناک و ڕێک لەبەردەمماندا کارێکی هونەری نایاب سەرهەڵدەدات، سۆفیا! بەلاتەوە سەیر نیە؟

ـ بەڵێ.

ـ کەواتە چ پێویستیمان بەوەیە کە بچینە لای ژنە قەرەجێکی بەختگرەوە یان ئەکادیمیەک بۆ ئەوەی شتێکی «سەرنجڕاکێش» یان شتێکی «سنوور شکێن» ببینین؟

ـ لەو بڕوایەدایت هەموو ئەوانەی ئەو جۆرە کتێبانە دەنووسن درۆزن و تەڵەکەبازبین؟

ـ نەخێر من وام نەگوت. بەڵام لێرەدا باسی جۆرە «ڕژێمێکی داروینیش» دەکەین.

ـ چۆن؟

- بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە لە تەنها یەک ڕۆژدا ڕوودەدەن. یان تەنها بیر لە ڕۆژێکی ژیانی خۆت بکەرەوە. بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە دەیانبینیت و بەسەردا دێت.
- پاشان چی؟
- جارجارێک ڕێکەوتی سەیریشت بەسەردا دێت، بۆ نمونە دەچیتە بازاڕێکەوە و بایی 28 کرۆن شت دەکڕیت. پاش کەمێک یۆرون دێت و 28 کرۆنت دەداتێ، چونکە کاتی خۆی لێی قەرزکردبووی. ئەوجا بڕیاردەدەن بچنە سینەما و لەوێ ژمارەی کورسی 28تت بەردەکەوێت.
- بەڵێ، ئەوە ڕێکەوتێکی سەیرە.
- بەلایەنی کەمەوە ڕێکەوتە. بەڵام گرفتەکە لەوەدایە خەڵکانێکی زۆر ئەو جۆرە ڕێکەوتانە «کۆدەکەنەوە». ڕووداوی نهێنی کۆدەکەنەوە، یان ئەو ڕووداوانەی کە بۆیان لێکنادرێتەوە. کاتێکیش ئەو جۆرە ڕووداوانە —لە ژیانی چەند ملیارد مرۆڤێکەوە- کۆدەکرێنەوە، ئەوا پێدەچێت ببنە ئەنجامی ئەوەی باوەڕ بە بابەتەکە بکرێت و بەردەوامیش هەستکردن بە ڕاست ودروستی بابەتەکە گەورەترو گەورەتر دەبێت. لێرەشدا دیسانەوە هەروەک یانسیبێک وایە، کە تەنها ژمارە براوەکانی دەردەکەون.
- ئایا هیچ کەسێکی «پەنهان بین» یان کەسێکی ڕۆحانی نیە ( medium*میدیۆم؛ واتە ئەو کەسەی وەک نێوەندێک لە نێوان دونیای مادی و ڕۆحیدا دەوەستێت.و) کە هەمیشە لەو شتانەدا بژی و هەستیان پێبکات؟
- بەڵێ، بێگومان هەن، بەڵام ئەگەر واز لەو ڕوانگە پەتیە بهێنین، ئەوا دەتوانین جۆرە لێکدانەوەیەکی تری ئەو «ڕووداوە نهێنیانە» بکەین.

- چۆن؟
- لەیادتە لەوەوپێش باسی تیۆری نائاگایی فرۆیدمان کرد؟
- چەند جارت پێ بڵێم من شتم بیرناچێتەوە؟
- فرۆید دەیگوت ئێمە زۆرجار دەتوانین ڕۆڵی شێوە «ڕۆحانیەک - میدیۆمێک» لە نێوان خۆمان و نائاگایماندا ببینین. پێشی دەچێت کاتێک شتێک دەکەین یان کە شتێک دەڵێین و هۆکەی بەتەواوەتی نازانین، ببێتە مایەی سەرسوڕمانمان. بەڵام هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە بیرکردنەوە و ئەزمون و زانیارییەکی هێندە زۆرمان لە ناوەوەدایە، کە زۆر زیاترە لەوەی کە بەئاگاین لێی.
- بە ڕاست؟
- ڕووشدەدات مرۆڤ بەدەم خەوەوە بڕوات و قسەش بکات. دەتوانین ناوی ئەوە بنێین شێوە «مێشکێکی ئۆتۆماتیکی». لەکاتی خەواندنی موگناتیسیشدا دەکرێت مرۆڤ «لە خۆیەوە» شت بڵێت یان شت بکات. بێگومان سوریالیستەکانیشت لەیادە کە هەوڵیاندەدا نووسینەکانیان بە «نووسینی ئۆتۆماتیکی» بخەنە سەر پەڕە. بەو شێوەیەش دەیانویست ڕێک وەک شێوەی «ڕۆحانیەک -مۆدیۆمێک» بن لە نێوان خۆیان و نائاگایی خۆیاندا.
- ئەوەشم لەیادە.
- سەدەی بیستەم جارجارێکیش، وەک دەڵێن «بەخەبەربوونەوەی ڕۆحانیەتی» تێدا دەردەکەوێت. بیرکردنەوەکەش لە بنچینەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی «میدیۆمێک» پەیوەندی لەگەڵ مردوویەکدا دەگرێت. لێرەدا میدیۆمەکە لە ڕێگەی دەنگی مردووەکەوە -یان بۆ نمونە بەهۆی نووسینی ئۆتۆماتیکیەوە- پەیامی ئەو کەسە وەردەگرێت کە چەند ساڵێک لەوەوبەر ژیاوە. ئەمەش وەک پشتگیریکردنێکی ئەو

بۆچوونە بەکاردەهێنرێت، کە دەڵێت ژیان لەدوای مردن بوونی هەیە، یان بۆ ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت مرۆڤ خاوەنی چەند ژیانێکە.
- ئەو بابەتەم بەرگوێ کەوتووە.
- من ناڵێم هەموو ئەو «میدیۆمانە» تەڵەکە بازبوون. هەندێکیان نیەتیان باشبووە و بە دڵنیاییەوە «میدیۆم» بوون، بەڵام میدیۆمیش هەبووە کە لە نێوان خۆی و نائاگایی خۆیدا بۆتە میدیۆم. چەندەها نمونەمان هەیە کە زۆر بەوردی میدیۆمی تێدا تاقیکراوەتەوە و لەکاتی حاڵلێهاتنیدا کۆمەڵە زانیاریەک و توانایەکی وای خستۆتە ڕوو کە نە خۆی و نە چواردەورەکەشی توانیویانە بزانن لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە. بۆ نمونە ئافرەتێک هیچ جۆرە زانیاریەکی لە زمانی عیبریدا نەبوو، بەڵام پەیامێکی بە زمانی عیبری گوت. کەواتە دەبێت لەوەوپێش ژیابێت، سۆفیا. یان دەبێت پەیوەندی لەگەڵ ڕۆحی مردوویەکدا گرتبێت.
- خۆت لە چ بڕوایەکدایت؟
- پاشان دەرکەوت لە کاتی منداڵیدا دایەنێکی جولەکەی هەبووە.
- ئۆوو...
- نائومێد بوویت؟ بەڵام خۆی لە خۆیدا جێگەی سەرسوڕمانە کە چۆن تاکە مرۆڤێک ئەو توانایەی هەیە کە بتوانێت زانیاریەکانی قوڵایی نائاگایی دەربهێنێتەوە.
- باش لە مەبەستت تێدەگەم.
- دەشکرێت بە هۆی تیۆری نائاگایی فرۆیدەوە چەندەها ڕووداوی سەیری ژیانی ڕۆژانە لێکبدرێتەوە. بۆ نمونە ئەگەر لەپڕێکدا تەلەفونێکم لەلایەن برادەرێکەوە بۆ بکرێت کە چەندەها ساڵە

نەمدیوە و منیش ڕێک لەو کاتەدا بەدوای ژمارەی تەلەفونەکەیدا بگەڕێم...
- موچوڕکەم پێدا دێت.
- بەڵام دەکرێت بەو شێوەیە لێکی بدەینەوە کە هەردووکمان لە هەمان کاتدا گوێمان بۆ گۆرانیەکی ڕادیۆ شلکردووە، بەڵام هەمان ئەو گۆرانیەیە کە دواجار پێکەوە گوێمان لێبووە. خاڵەکە لەوەدایە کە هیچمان ئاگامان لەو پەیوەندیە شاراوەیە نیە.
- واتە هەمووی یان فێڵ و تەڵەکەیە... یان کاریگەری ژمارەی دەرچووەکانی یانسیبە... یان «نائاگاییە»، وا نیە؟
- بەلایەنی کەمەوە باشترە بە گومانێکی زۆرەوە لەو جۆرە کتێبانە نزیک ببینەوە، بە تایبەتیش ئەگەر فەیلەسوف بیت. لە بەریتانیادا ڕێکخراوێکی تایبەت بە گومانکاران هەیە. چەند ساڵێک لەوەوپێش پارەیەکی یەکجار زۆریان بۆ ئەو کەسە بەدیاری داناوە کە بتوانێت تەنها نمونەیەکی چکۆلەی شتێکی سەرو سروشتی نیشانبدات. مەرجیش نیە موعجیزەیەکی گەورە بێت، بەڵکو نمونەیەکی پچکۆلەی گواستنەوەی بیرکردنەوە بەسە. بەڵام هەتا ئێستاکە کەس نەهاتۆتە پێشەوە.
- بەڵێ، تێدەگەم.
- لەلایەکی تریشەوە چەندەها شت هەیە کە ئێمەی مرۆڤ لێیان تێناگەین، پێشی دەچێت هەموو یاساکانی سروشت نەزانین. لەسەدەی ڕابووردودا خەڵکانێکی زۆر هەبوون کە دیاردەی وەک کارەبا و موگناتیسیان وەک شێوە جادوویەک دەبینی. دەوێرم گرەو بکەم کە داپیرە هەرە گەورەکەم هەر دوو چاوی دەردەپەڕاند، گەر باسی تەلەفیزۆن یان کۆمپیوتەرم بۆ بکردایە.

- بەڵام بە کورتی باوەڕت بە شتێکی سەرو سروشتی نیە؟
- لەوەوپێش باسی ئەوەمان کرد. لە ڕاستیدا خودی زاراوەی «سەرو سروشتی» کەمێک سەیرە. نەخێر من لەو بڕوایەدام کە تەنها یەک سروشت هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر سەرسوڕهێنەرە.
- ئەی هەموو ئەو دیاردە نهێنیانەی ناو ئەو کتێبانەی نیشانت دام چی؟
- هەموو فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە دەبێت هەمیشە چاو کراوە بێت. هەرچەندە هەتاوەکو ئێستاکە هیچ قەلە ڕەشێکی سپیمان نەدیوە، بەڵام دەشێت هەرگیز کۆڵنەدەین لە دۆزینەوەیدا. لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان تەنانەت کەسێکی بە گومانی وەک منیش، ناچاربم باوەڕ بەو دیاردانە بکەم کە لەوەوپێش باوەڕم پێنەدەکردن. ئەگەر ئەو بوارەش بە کراوەیی بەجێنەهێڵم، ئەوا دۆگمایەکی کەللەڕەق دەبم و ئەوساکەش فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە نابم.
پاش ئەوە ئەلبێرتۆ و سۆفیا بە بێدەنگی لەسەر کورسیەکەدا مانەوە. کۆترەکان ملیان درێژدەکرد و گمەگمیان بوو، جارجارێکیش پاسکیل سوارێک یان جوڵەیەکی لەپڕ دەیترساندن. پاشتر سۆفیا گوتی؛
- دەبێت بگەڕێمەوەماڵەوە و ئاهەنگەکەم ئامادەبکەم.
- بەڵام پێش ئەوەی جیاببینەوە، دەمەوێت قەلە ڕەشێکی سپیت نیشانبدەم. لە ڕاستیدا زۆر لەوە نزیکترە کە مەزەنەی دەکەین.
ئەلبێرتۆ لەسەر کورسیەکەی هەستا و بەدەستی نیشانەی بە سۆفیادا کە دیسانەوە دەبێت بگەڕێنەوە کتێبخانەکە.
ئەمجارەیان بەلای کتێبە سەرو سروشتیەکاندا تێپەڕین. ئەلبێرتۆ لە کۆتایی هۆڵەکەدا، لەبەردەم ڕەفەیەکی تەواو باریکدا وەستا. تەختەناوێکی چکۆلەی لەسەربوو و لێی نووسرابوو «فەلسەفە.«

ئەلبێرتۆ ئاماژەی بۆ کتێبێکی دیاریکراو کرد و سۆفیاش کە چاوی بە ناونیشانەکەی کەوت، دڵی داخورپا. لەسەری نووسرابوو؛ «جیهانی سۆفیا.»
ـ بۆت بکڕم؟
ـ نازام ئەگەر بوێرم یان نا.
بەڵام پاش کەمێک بەرەوماڵەوە دەگەڕایەوە و کتێبەکەی بە دەستێکەوە گرتبوو و بە دەستەکەی تریشی شتەکانی ئاهەنگەکەی سبەینێی هەڵگرتبوو.

# کۆبۆنەوەی باخچەکە
## ...قەلە ڕەشێکی سپی...

هیلدە بەشێوەیەک دانیشتبوو، دەتگوت بە جادوویەک بە جێگاکەوە دوراوە. قۆڵەکانی سڕبووبوون و دەستەکانیشی بەمەلەفە گەورەکەوە دەلەرزین.
کاتژمێر نزیکەی یانزەبوو. زیاتر لە دوو سەعاتێک ئەبوو بە پاڵکەوتنەوە دەیخوێندەوە. جارجارێک سەری لەسەر تێکستەکە هەڵدەگرت و بەدەنگی بەرز پێدەکەنی، هەندێ جاری تریش لەسەرلا پاڵدەکەوت و هەناسەیەکی قوڵی هەڵدەکێشا. خۆشبەختانە تەنها خۆی لەماڵەوە بوو.
چی نەخوێندەوە لەماوەی ئەو دوو سەعاتەدا! بەوە دەستیپێکرد کە سۆفیا لە ڕێگەی ماڵەوەیدا، دەبوایە بە هەموو شێوەیەک سەرنجی مێجەری بەلای خۆیدا ڕابکێشایە. ئەوجا بەسەر دارێکدا هەڵزنا و پاشان مۆرتنی قازیش وەک فریشتەیەک لە لوبنانەوە هات و ڕزگاریکرد.
ئێستاکە هیلدە گەورە بووە، بەڵام هێشتام ئەو کاتەی لە یادە کە باوکی بۆ یەکەمین جار چیرۆکی گەشتە سەیرەکەی نیلزی بۆ خوێندەوە. چەندین ساڵیش لەوە بەدواوە، زمانێکی نهێنیان پێکەوە هەبوو کە لەو کتێبەوە وەریانگرتبوو. ئەوا ئێستاکەش سەرلەنوێ قازە کۆنەکەی هێنایەوە ناو ناوان.
پاشان سۆفیا خۆی وەک میوانێکی تەنهای قاوەخانەیەک بینیەوە. هیلدە بەتایبەتی سەرنجی چووە سەر قسەکانی ئەلبێرتۆ کاتێک باسی سارتەر و بوونگەری بۆ سۆفیا دەکرد. تا ڕادەیەک بڕوای سۆفیای

هەڵگێڕایەوە... بەڕاست، لەوەو پێشیش چەندەها جار لە باسەکانی پێشویدا، بەتەواوەتی بڕوای سۆفیای دەگۆڕی.
ساڵێک لەمەوبەر، کەڕەتێکیان هیلدە کتێبێکی دەربارەی ئەستێرەناسی کڕی. کەڕەتێکی تریش بە خۆی و چەند کارتێکی بەختگرتنەوەوە گەڕایەوە ماڵەوە. پاشانیش کتێبێکی بچکۆلەی دەربارەی ڕۆحانیەت کڕی. هەموو کەڕەتێکیش باوکی ئاگاداری دەکردەوە و وشەی وەک «هەستی ڕەخنە» و «خورافیاتی» بەکاردەهێنا، بەڵام ئێستاکە کاتی خۆی هات و بەتەواوەتی تۆڵەی خۆی لێکردەوە. هەر بەڕاستی هێرشی کردە سەر. بەئاشکرا دیاربوو کە باوکی نەیدەویست کچەکەی بەبێ ئاگادارکردنەوەیەکی تێروتەسەلی ئەو بابەتانە گەورەببێت. بۆ ئەوەی دڵنیاش بێت، لە ڕێگەی شاشەیەکی تەلەفیزۆنەوە دەستی بۆ ڕاوەشاند. بەڵام ئەمەیانی هەر نەکردایە باشتربوو...
ئەو شتەی لە هەموو شتێک زیاتر سەریدەسوڕماند، ئەو کچە قژ ڕەشەبوو.
سۆفیا، سۆفیا... تۆ کێیت؟ خەڵکی کوێیت؟ بۆچی هاتیتە ناو ژیانمەوە؟
لە دواجاردا سۆفیا کتێبێکی دەربارەی خۆی وەرگرت... بەڵام ئایا هەمان ئەو کتێبەیە کە ئێستاکە هیلدە بەدەستیەوەیەتی؟ بێگومان ئەمەی ئەم تەنها مەلەفێکە و هیچی تر، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا؛ چۆن ڕێی تێدەچێت لەناو کتێبێکدا کە دەربارەی خۆتە، کتێبێک دەربارەی خۆت بدۆزیتەوە؟ ئەی چی ڕوودەدات ئەگەر سۆفیا ئەو کتێبە بخوێنێتەوە؟
ئاخۆ ئێستاکە چی ڕوودەدات؟ چ شتێک «ڕێی تێدەچێت» ڕوودەدات؟

**هیلدە دەستی لەلاپەڕەکان دا، هەستی دەکرد تەنها چەند لاپەڕەیەکی ماوەتەوە.**

سۆفیا لە کاتی گەڕانەوەیدا، لەناو پاسەکەدا چاوی بە دایکی کەوت. چ بەختێکی ڕەشە! ئاخۆ دایکی چی بڵێت کاتێک چاوی بە کتێبەکەی دەستی سۆفیا دەکەوێت؟

ـ چۆنیت سۆفیا؟ چ ڕێکەوتێکی خۆشە هەردووکمان لە هەمان پاسدا بین!

ـ تۆ چۆنیت...

ـ کتێبت کڕیووە؟

ـ نەخێر بەتەواوەتی نا.

ـ «جیهانی سۆفیا»... چ ناوێکی سەیرە!

سۆفیا هەر زوو بۆیدەرکەوت کە ئەمجارەیان بە هیچ جۆرێک بواری تێدا نیە درۆیەک بدۆزێتەوە.

ـ ئەلبێرتۆ بەدیاری دایمێ.

ـ بەڵێ، بەلامەوە سەیر نیە. بەڵام وەک لەوەوپێش گوتم، زۆر پەرۆشی بینینی ئەو پیاوەم. یارمەتی هەیە تەماشایەکی کتێبەکەت بکەم؟

ـ دەتوانیت هەتا دەگەینەوەماڵەوە دان بەخۆتا بگریت؟ پاشانیش کتێبەکە هی منە، دایە.

ـ بێگومان هی تۆیە. حەزمکرد تەنها سەیرێکی لاپەڕەی یەکەمی بکەم... بەڵام... «سۆفیا ئامۆنسن لە قوتابخانەوە بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە. پێکەوە لەگەڵ یۆرونی برادەریدا بەشێکی ڕێگاکەی بڕی. باسی ڕۆبۆتیان دەکرد...»

ـ بەڕاستی وا نووسراوە؟

ـ بەڵێ، بەڕاستی وانووسراوە سۆفیا. کتێبەکە لەلایەن «ئەلبێرت کنەی» ناوێکەوە نووسراوە. لەوەدەچێت یەکەم جاری بێت شت بنووسێت. بەڕاست... باوکی ئەلبێرتۆ ناوی چیە؟
ـ کنۆکس.
ـ گرەودەکەم ئەو پیاوە سەیرە کتێبێکی تەواوی لەسەر تۆ نووسیوە، سۆفیا. بەڵام نازناوێکی تری هەڵبژاردووە.
ـ ئەو نیە دایە. باشتر وایە واز بهێنیت. خۆ تۆ هەر هیچ تێناگەیت.
ـ نا، پێم وانیە هیچ بزانم. بەیانی ئاهەنگی باخچەکەمان دەستپێدەکات و ئەو کاتە هەموو شتێک بەتەواوەتی دەچێتەوە سەر باری جارانی.
ـ ئەلبێرت کنەی لە هەقیقەتێکی تەواو جیاوازتردا دەژی، لەبەرئەوە ئەم کتێبە وەک قەلە ڕەشێکی سپی وایە.
ـ نا، نا، پێم وابێت بیبرپیتەوە باشترە. بەڕاست... لە پێشدا کەروێشکێکی سپی نەبوو؟
ـ تۆ بیبرەوە، ئیتر!
پاسەکە گەیشتە سەر شەقامی کلۆیڤە و باسەکەیان کۆتایی پێ هێنا. لەوێدا دابەزین و ڕووبەڕوی خۆپیشاندانێک بوونەوە.
ـ هۆهۆوو، ئەوە چیە؟ ...دایکی گوتی، بەڕاستی وام دەزانی لەم گەڕەکەدا لە خۆپیشاندان ڕزگارمان دەبێت!
ژمارەی ئەو کەسانەی کە کۆببوونەوە لە دە دوانزە کەسێک تێنەدەپەڕین. لەسەر بەیاخەکانیشیان نووسرابوو؛ «مێجەر بەم زوانە دێتەوە»، «ئێمە لەگەڵ خواردنی خۆشی جەژنی یۆحەنادایین»، «داوای دەسەڵاتی زۆرتر بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان دەکەین.»
سۆفیا تا ڕادەیەک بەزەیی بە دایکیدا دەهاتەوە و گوتی؛

ـ وا بزانە هەر لێرەشدا نین.
ـ بەڵام خۆنیشاندانێکی سەیرە و تاڕادەیەکیش بێ مانایە.
ـ گوێ مەدەرێ، هیچ نیە.
ـ هەتا بێت جیهان خێراتر و خێراتر دەگۆڕێت، بەڵام لە ڕاستیدا سەری من ناسورمێنێت.
ـ بەلایەنی کەمەوە دەبوایە سەرت لەوە بسوڕمایە کە بۆچی سەرت ناسوڕمێت.
ـ بەهیچ جۆرێک سەرم ناسوڕمێت، خۆ ئەمانە شەڕخواز و گێرەشێوێن نین. بەس ئەوەندە پێیان لە گوڵەکانم نەنابێت... بەڵام لەڕاستیدا تێناگەم بۆچی لە باخچەیەکدا خۆیان نیشاندەدەن؟ با خێرا بگەڕێینەوە ماڵەوە و بزانین گوڵەکانمان چیان بەسەرهاتووە.
ـ ئەوە خۆپیشاندانێکی فەلسەفیە، دایە. فەیلەسوفی ڕاستەقینە پێ لە گوڵی ناو باخ نانێت.
ـ بەڕاست؟ نازانم چیتر ئەگەر باوەڕم بە فەیلەسوفی ڕاستەقینە هەبێت یان نا، چونکە لە کاتی ئێستاماندا نزیکەی هەموو شتێک هەر دەستکردە.
پاشنیوەڕۆ و ئێوارەکەیان بە خۆئامادەکردنی ئاهەنگەکەوە بەسەربرد. سەر لەبەیانی ڕۆژی دواتر، یۆرونیش بۆ یارمەتیدان هات و مێز و باخچەکەیان ڕازاندەوە. بەڵام هەر کە هاتە باخچەکەوە، هاواریکرد و گوتی؛
ـ دواهەمین هەواڵی ناخۆش! دایک و باوکم دێنە ئاهەنگەکە! خەتای تۆیە سۆفیا!
نیو سەعاتێک پێش ئەوەی میوانەکان بگەن، هەموو شتێکیان ئامادەکردبوو. دارەکانی باخچەکەیان بە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ و چرای

لە پەڕە دروستکراو ڕازاندبۆوە. کارەباشیان لە ڕێگەی پەنجەرەی ژێر زەمینەکەوە ڕاکێشابوو. دارەکان و دەرگای دەرەوە و ڕووی پێشەوەی خانوەکەیان بە میزەڵدان ڕازاندبۆوە، ئەو میزەڵدانانەی سۆفیا و یۆرون بە درێژایی پاش نیوەڕۆ بەردەوام فوویان تێدەکرد.
مێزەکەش، بە مریشک و زەڵاتە و نان و سەمون ڕازێنرابووەوە. لە چێشتخانەکەشیاندا چەندەها جۆری جیاوازی کێکیان ئامادەکردبوو، بەڵام هەر لە ئێستاوە لە ناوەڕاستی مێزەکەی دەرەوەدا، کێکێکی 24 ئەڵقەییان دانابوو. بووکێکیش بەسەری سەرەوەی کێکەکەوە بوو، کە نیشانەی ڕۆژی بەمەسیح بوونی کەسێکی نیشاندەدا. دایکی سۆفیا سووربوو لەسەر ئەوەی کە بووکەکە لە هەمان کاتدا دەشێت وێنەی کچێکی ئاسایی پانزە ساڵان نیشانبدات، بەڵام سۆفیا خۆی لەو بڕوایەدابوو کە دایکی بەتایبەتی ئەو بووکەی هەڵبژاردبێت، چونکە سۆفیا هێشتام بڕیاری نەدابوو کە ببێتە مەسیحی. دایکی وا هەستیدەکرد کە ڕۆژی بەمەسیحی بوونی کچەکەی لەناو خودی کێکەکەدا بێت.
- بزانە... بەڕاستی بە هیچ جۆرێک ڕەزیلیمان لە هیچ شتێکدا نەکردووە. پێش ئەوەی میوانەکان بگەن، دایکی یەک دوو جار هەر ئەو ڕستەیەی دووبارە دەکردەوە.
ئەوجا میوانەکان هاتن. لەپێشدا سێ کچی پۆلەکەیان و کەمێک دواتریش کوڕان دەرکەوتن، "یۆرگین" و "لاسە" هێواش هێواش هاتنە ژورەوە. کەمێک شەرمن بوون، بەڵام بەشێوەیەکی ئاسایی خۆیان نیشاندا.
- پیرۆزە!
- ئیتر لەمڕۆ بەدواوە تۆش گەورە بوویت!

هەر لە ئێستاوە سۆفیا دەیبینی یۆرون و یۆرگین چۆن بەدزیەوە سەیری یەکتریان دەکرد. ئێوارەی جەژنی یۆحەنایە و دیاربوو شتێک ڕوودەدات.
هەموان دیاریان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو. ئاهەنگەکەش ئاهەنگێکی فەلسەفی بوو، لەبەرئەوە زۆربەی میوانەکان بەر لەهاتنیان هەوڵیاندابوو شتێک دەربارەی فەلسەفە بخوێننەوە. هەرچەندە هەموویان نەیانتوانیبوو دیاریەکی تەواو فەلسەفی بدۆزنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەیان تا ڕادەیەکی زۆر خۆیان ماندوو کردبوو کە لەسەر کارتەکان شتێکی فەلسەفی بنووسن. سۆفیا فەرهەنگێکی فەلسەفی و دەفتەرێکی یاداشتی بەدیاری وەرگرت، دەفتەرەکە قفڵ دەکرا و لەسەر لاپەڕەی یەکەمی نووسرابوو؛ «تێبینیە فەلسەفیەکانی خۆم.»
بەرە بەرەش لەگەڵ هاتنی میوانەکاندا، دایکی لە پەرداخی درێژی شەرابدا، شەربەتی سێوی دەگێڕا و میوانداریەکەی خستبووە ئەستۆی خۆی.
ـ بەخێر بێن... ئەی تۆ ناوت چیە؟ ... وا بزانم ئەمە یەکەم جارە تۆ ببینم... زۆر خۆشحاڵم بە هاتنت سیسیلیا.
گەنجان هەموویان شوێنی خۆیان کردەوە و بە پەرداخی شەرابی دەستیانەوە لە ژێر دارەکاندا کەوتبوونە قسەکردن، ئەوجا دایک و باوکی یۆرون دەرکەوتن و مارسیدسە سپیەکەیان لەبەردەم دەرگای دەرەوەدا ڕاگرت. ڕاوێژکاری دارایی قاتێکی خۆڵەمێشی نایابی لەبەرکردبوو، ژنەکەشی ماکسیەکی پولەکەداری سووری لەبەردابوو. سۆفیا بە دوری نەدەزانی کە دایکی یۆرون چووبێتە دوکانێکی یاری منداڵان و بووکەشوشەیەکی کڕیبێت، پاشانیش چووبێتە لای بەرگ

درووییەک و داوای لێکردبێت جلێکی هەمان شێوەی بووکەکەی بۆ بدووریێت. بێگومان ڕێی تێدەچێت ڕاوێژکاری دارایی بووکەکەی کڕیبێت و بردبێتی بۆلای جادووگەرێک بۆ ئەوەی بۆی بکات بە ئافرەتێکی ڕاستەقینە... بەڵام ئەمەی دواتریان بە هیچ جۆرێک نەدەگونجا، لەبەرئەوە سۆفیا چیتر بیری لێنەکردەوە.
لە مارسیدسەکە دابەزین، بۆ لای میوانە گەنجەکان هاتنە ناو باخچەکەوە و بوونە مایەی سەرسوڕمانی هەموان. ڕاوێژکار خۆی دیاریە درێژکۆلەکەی بەناوی خێزانی "ئینگەبریگستن"ەوە پێشکەشکرد. سۆفیا دیاریەکەی کردەوە و بووکێکی باربی بەرچاوکەوت... هەوڵیدا بە هێمنی وەریبگرێت، بەڵام یۆرون خۆی پێنەگیرا و هەڵیدایە؛
ـ بەڕاستی شێت بوون؟ خۆ سۆفیا چیتر یاری بە بووکەشوشە ناکات!
خاتو ئینگەبریگستن بەپەلە هاتە پێشەوە و خشەخشی کراسە پولەکەکەی زرنگەی دەهاتەوە؛
ـ تەنها بۆ ڕازانەوەی ژور بەکاردێت، یۆرون!
ـ هەرچۆنێک بێت من زۆر سوپاستان دەکەم... سۆفیا بە زمانێک گوتی کە دەیویست کەمێک خاویان بکاتەوە.
ئەوجا میوانەکان بە دەوری مێزەکەدا خڕبوونەوە.
ـ ئێستاکەش تەنها چاوەڕوانی ئەلبێرتۆ دەکەین. دایکی بەدەنگێگی کەمێک شڵەژاوەوە ئەمەی گوت و هەوڵیدەدا نائارامیەکەی خۆی داپۆشێت. هەر لە ئێستاوە دەنگوباسی ئەو میوانە تایبەتە، بەناو میوانەکاندا بڵاوبووبوەوە.
ـ پەیمانی داوە کە بێت، کەواتە هەر دێت.
ـ بەڵام ئایا ناکرێت بەبێ ئەو دەست پێبکەین؟

ـ بەڵێ بۆ نا، فەرموون با دابنیشین.
ـ دایکی سۆفیا فەرمووی لە میوانەکان کرد و هەموان بەدەوری مێزە درێژەکەدا دانیشتن. کورسیەکی بەتاڵیشی لەنێوان خۆی و سۆفیادا بەجێهێشت. پاشان چەند وشەیەکی دەربارەی خواردنەکە و ئاوهەوای خۆشی ڕۆژەکە گوت و دواتریش باسی سۆفیای کرد و گوتی ئێستاکە بۆتە ئافرەتێکی گەورە.
نیو سەعاتێک بەسەر دانیشتنەکەیاندا ڕابوورد و پیاوێکی تەمەن مام ناوەندی خۆی کرد بە باخچەکەدا، ڕیشێکی ڕەشی دانابوو و کڵاوێکیشی لەسەرکردبوو. پانزە گوڵی سووری کردبووە چەپکێک و بەدەستیەوە گرتبووی.
ـ ئەلبێرتۆ!
سۆفیا هەستا و بەرەوپیری ڕۆیشت. دەستی کردە ملی و گوڵەکانی لێ وەرگرت. ئەوجا ئەلبێرتۆ دەستی کرد بە گیرفانی چاکەتەکەیدا و چەند فیشەکە شێتەیەکی دەرهێنا، دایگیرساندن و بە چواردەوری خۆیدا هەڵیدان. پاشان لە مێزەکە نزیک بووەوە و مۆمێکی پریشکداری لەسەر کێکەکە چەقاند و دایگیرساند. دواتر لەلای کورسیە بەتاڵەکەی نێوان سۆفیا و دایکیدا وەستا و گوتی؛
ـ لە دڵەوە پێم خۆشە لێرەدا ئامادەبم!
هەموان واقیانوڕمابوو. خاتوو ئینگەبریگستن بەچاوێکی پڕ مەخزاوە تەماشایەکی مێردەکەی کرد. دایکی سۆفیاش لەبەرئەوەی دڵی بە هاتنی ئەلبێرتۆ خۆشبوو، لە هەموو شتێکی دەبووری. بەڵام سۆفیا نەیتوانی ڕێگەی پێکەنینێکی شێتانە بگرێت و بیگەڕێنێتەوە ناوەوە.
دایکی چەند جارێک لە پەرداخەکەیدا و بەوەش هەموانی ئاگادارکردەوە کە دەیەوێت قسە بکات، ئەوجا گوتی؛

ـ با بەخێرهاتنی ئەلبێرتۆ کنۆکس بکەین بۆ ئەم ئاهەنگی فەلسەفیە. دەمەوێت بە هەموان بڵێم کە ئەم پیاوە دڵداری نوێی من نیە. ڕاستە مێردەکەم سەفەری دورو درێژ دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی ئێستادا هیچ دۆستێکم نیە. ئەم پیاوە سەیرە، مامۆستای نوێی فەلسەفەی سۆفیایە. واتە جگە لە تەقاندنی فیشەکە شێتە، دەتوانێت چەندەها شتی تریش بکات. بۆ نمونە دەتوانێت کەروێشکێکی سپی زیندوو لە کڵاوێکی درێژەوە دەربهێنێت... بەڕاست، کەروێشک بوو یان قەلەڕەشی سپی، سۆفیا؟

ـ سوپاس، زۆر سوپاس. ئەلبێرتۆ هێندەی گوت و پاشان دانیشت.

ـ بەخۆشیتان، نۆش! سۆفیا بەدەنگی بەرز گوتی و هەموویان پەرداخی شەرابەکانیان بەرزکردەوە کە پڕبوو لە ساردی.

بۆ ماوەیەکی دورودرێژ دانیشتبوون و مریشک و زەڵاتەیان دەخوارد. لە پڕێکدا یۆرون هەستا و بەرەولای یۆرگین ڕۆیشت، ماچێکی توندی ناو دەمی کرد. ئەویش بۆ ئەوەی بتوانێت بە باشی ماچی بکاتەوە، هەستا و لەسەر مێزەکەدا خۆی بەسەر یۆروندا چەماندەوە.

ـ نا... هەتا ئێستا هەرگیز شتێکی وام...! خاتو ئینگەبریگستن هاواریکرد.

ـ نا، لەسەر مێزەکە نا، منداڵان!... دایکی سۆفیا گوتی.

ـ بۆ نا؟ ئەلبێرتۆ هەڵیدایە و ڕووی دەمی لە دایکی سۆفیا کرد.

ـ تۆش پرسیاری سەیر دەکەیت.

ـ بەڵام پرسیارکردن بەلای فەیلەسوفێکی ڕاستەقینەوە، هەرگیز هەڵە نیە.

لەناکاودا هەندێ لە کوڕەکان ئێسقانە مریشکیان کۆدەکردەوە و بەرەو سەربان هەڵیاندەدا. دیسانەوە ئەمەش وای لە دایکی سۆفیا کرد وەڵام بداتەوە؛

- بەیارمەتیتان وا مەکەن! لەبەرئەوەی ئێسکی مریشکەکان ئاوەڕۆی سەربانەکە دەگرێت.

- داوای لێبووردن دەکەین... یەکێک لە کوڕەکان گوتی و پاشان لەبری سەربانەکە، ئێسکەکانیان دەگرتە پەرژینی باخچەکە. پاش کەمێک دایکی سۆفیا گوتی؛

- پێم وابێت کاتی ئەوە هاتووە قاپەکان کۆبکەینەوە و کەمێک شیرینی بهێنین، چەند کەس دەخوازێت قاوە بخواتەوە؟ دایک و باوکی یۆرون و ئەلبێرتۆ و یەک دوو میوانی تر دەستیان بەرزکردەوە.

- سۆفیا و یۆرون... تاقەتتان هەیە یاریمەتیم بدەن؟

لە ڕێگادا بەرەو چێشتخانەکە، کەمێک بواری قسەکردن بۆ دوو کچە برادەرەکە کرایەوە؛

- بۆچی ماچت کرد؟

- دانیشتبووم و تەماشای دەمیم دەکرد، لەپڕێکدا یەکجار ئارەزوی ماچکردنیم کرد. بە هیچ جۆرێک ناتوانم بەرەنگاری ئەو کوڕە بکەم.

- ئەی ماچەکەی خۆشبوو؟

- کەمێک جیاوازتر بوو لەوەی مەزەنەم دەکرد، بەڵام...

- کەواتە یەکەم جاربوو ماچی بکەیت؟

- بەڵام بە دڵنیاییەوە دواهەمین جار نابێت!

پاش ماوەیەک قاوە و شیرینی لەسەر مێزەکە دانرا. ئەلبێرتۆش دەستیکردبوو بە دابەشکردنی فیشەکە شێتە بەسەر کوڕەکاندا. بەڵام دایکی سۆفیا ئەم جارەیان کەوچکەکەی لە کوپی قاوەکەیدا و گوتی؛

ـ نامەوێت وتەیەکی دورودرێژ بڵێم، بەڵام تەنها یەک کچم هەیە و تەنها ئەم جارەشە کە ڕێک هەفتەیەک و یەک ڕۆژ بەسەر ڕۆژی لەدایک بوونی پانزە ساڵەیدا تێپەڕیووە. وەک دەبینن ڕەزیلیمان لە هیچ شتێکدا نەکردووە... کێکەکە 24 ئەڵقەی هەیە، واتە بەلایەنی کەمەوە هەر کەسەی ئەڵقەیەکی بەردەکەوێت. ئەو کەسەی لەسەرەتاشەوە دەستپێشکەری دەکات، بۆی هەیە دوو ئەڵقە بەرێت، لەبەرئەوەی لەسەری سەرەوە دەست پێدەکەین و ئەڵقەکانیش لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا گەورەتر و گەورەتر دەبن. بەلایەن ژیانیشمانەوە هەر هەمان شتە. کاتێک سۆفیا کچێکی چکۆلە بوو، بە هێواشی بە دەوری چەند بازنەیەکی پچکۆلەدا دەخولایەوە. بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا، بازنەکانیشی گەورەتر و گەورەتر بوون. ئێستاکە بازنەکانی دەگەنە گەڕەکی کۆنی شار. باوکیشی بە هەموو جیهاندا سەفەر دەکات، لەبەرئەوە بۆ هەموو جیهانیش تەلەفون دەکات. هیوای ڕۆژی لەدایک بوونێکی خۆشت بۆ دەخوازین، سۆفیا!
ـ جوانە! دایکی یۆرون بە دەنگێکی بەرز گوتی.
سۆفیا لە مەبەستی دایکی یۆرون دڵنیا نەبوو... ئایا مەبەستی لە دایکی بوو، لە گوتارەکەی بوو، لە کێکەکە بوو، یاخود مەبەستی لە سۆفیا خۆی بوو.
هەموان چەپڵەیان لێدا و یەکێک لە کوڕەکان فیشەکە شێتەیەکی گرتە دار هەرمێییەک. ئەوجا یۆرون هەستا و دەیویست یۆرگین لەسەر کورسیەکەی هەڵبسێنێت. ئەویش خۆیدا بەدەستەوە و لەسەر چیمەنەکە پاڵکەوتن، وەک جاری پێشوو دەستیان کردەوە بە ماچکردن. پاش کەمێک لەژێر دار مێوەکاندا گیرسانەوە.

ـ لەوە دەچێت لەم ڕۆژگارەدا کچان دەستپێشکەری بکەن... ڕاوێژکاری دارایی گوتی.
پاشان بۆ ئەوەی بەوردی تەماشاکات، هەستا و خۆی گەیاندە لای دار مێوەکان و لەوێدا ڕاوەستا.
ـ پێم وابێت کەس ناتوانێت بیان وەستێنێت... خاتو ئینگەبریگستن بە دەنگێکی ئاساییەوە گوتی.
ـ نەخێر، دەبێت ڕەگەز بەدوای ڕەگەزدا بێتە خوارەوە... مێردەکەی وەڵامی دایەوە.
تەماشایەکی چواردەورەکەی کرد، پێی وابوو چەند وشەیەکی نایابی گوتبێت و بەو هیوایەوە بوو کەسێک پشتگیری وشەکانی بکات، بەڵام لە کاتێکدا هەموان بێدەنگ بوون، بەردەوامی بە قسەکانیدا و گوتی؛
ـ ناتوانین هیچ شتێک بکەین.
لەدورەوە سۆفیا دەیبینی کە یۆرگین دەیویست قۆپچەی کراسە سپیەکەی یۆرون بکاتەوە، ئەو کراسەی کە ئێستاکە ڕەنگی سەوزی لە ڕەنگە سپیەکەی زیاتربوو، یۆرونیش دەیویست قایشەکەی یۆرگین بکاتەوە. ئەوجا خاتو ئینگەبریگستن گوتی؛
ـ بەسە با سەرماتان نەبێت.
سۆفیا بە بێتاقەتیەوە تەماشایەکی ئەلبێرتۆی کرد. پاشان ئەلبێرتۆ گوتی؛
ـ شتەکان وەک لەوەی من مەزەنەم کردبوون، خێراتر ڕوودەدەن. دەبێت بە زووترین کات لەم ناوەدا نەمێنین، بەڵام لەپێشدا دەمەوێت وتەیەکی پچکۆلە بڵێم.
سۆفیا چەپڵەیەکی لێدا.
ـ بەیارمەتیتان دەتوانن دابنیشن؟ ئەلبێرتۆ دەیەوێت قسە بکات.

جگە لە یۆرون و یۆرگین، هەموان گەڕانەوە سەر مێزەکە و دانیشتنەوە. پاش کەمێک دایکی سۆفیا گوتی؛

ـ بەڕاستی دەتەوێت وتارێک بخوێنیتەوە؟ چەندەم پێ خۆشە!

ـ سوپاست دەکەم.

ـ وەک بیستوومە حەزتان لە پیاسەکردنیشە. دەڵێن پیاسەکردن بۆ جوان ڕاگرتنی لەش گرنگە، بەڵام پێم وابێت خۆشترە ئەگەر لەکاتی پیاسەدا، سەگێکیشت لەگەڵدا بێت. بەڕاست... سەگەکەت ناوی هێرمس نیە؟

ئەلبێرتۆ هەستا و لە کوپی قاوەکەی دا؛

ـ سۆفیای ئازیز... پێش ئەوەی دەست پێبکەم، پێم خۆشە بیرتان بخەمەوە کە ئەمە ئاهەنگێکی فەلسەفیە، لەبەرئەوە دەمەوێت وتارێکی فەلسەفی بڵێم.

هەر لەئێستاوە بەهۆی چەپڵەیەکی توندەوە قسەکانیان پێبڕی.

ـ لەم ئاهەنگە کراوەیەدا، پێم وابێت لە هەموو بارێکدا کەمێک ئەقڵمان پێویست دەبێت. بەڵام بەڕاستی با بیرمان نەچێت پیرۆزبایی لە سۆفیا بکەین کە دەبێتە پانزەساڵان.

لەپڕێکدا هەر بەدوای وتەکانیدا، دەنگی فڕۆکەیەکیان بەرگوێ کەوت، دەنگەکە بەرە بەرە نزیک دەبووەوە. لەبەرزاییەکی زۆر نزمەوە بەسەر باخچەکەدا فڕی. بەیاخێکی دورو درێژیش وەک کلکێک بەدوای فڕۆکەکەوە نووسابوو... لەسەری نووسرابوو؛ «ڕۆژی لەدایکبوونی پانزە ساڵەت پیرۆز بێت!». ئەوجا دایکی سۆفیا هاواریکرد؛

ـ بینیتان! بەڕاستی ئەم پیاوە جگە لە فڕێدانی فیشەکە شێتە، دەتوانێت شتی زۆر زیاتر بکات.

ـ سوپاس، ئەوە هیچ نەبوو. لە ماوەی چەند حەفتەی ڕابووردودا، من و سۆفیا لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی گەورەمان ئەنجامدا. ئێستاکەش دەمانەوێت بەرهەمی کارەکەمان دەربخەین. دەمانەوێت گرنگترین نهێنی بوونمان ئاشکرابکەین.
لەپڕێکدا هەموان هێندە بێدەنگ بوون، کە بە ئاسانی جریوەی چۆلەکەکانیان دەهاتە بەر گوێ. هەروەها دەنگی ماچ و موچی یۆرون و یۆرگینیش لەپشت دار مێوەکانەوە دەهات.
ـ بەردەوام بە!... سۆفیا گوتی.
ـ لەپاش لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی قوڵ –کە لە فەیلەسوفە یۆنانیەکانی سەرەتاوە هەتا ئەمڕۆکەی گرتەوە- بۆمان دەرکەوت کە هەموومان لە ناو ئاگایی مێجەرێکی دیاریکراودا دەژین. ئێستاکە ئەو چاودێریکەرێکی نەتەوە یەکگرتووەکانە لە لوبنان، بەڵام لە هەمان کاتیشدا لەوێوە کتێبێکی دەربارەی ئێمە نووسیوە و پێشکەشی کچەکەی کردووە کە لە لیللەساند دەژی. کچەکەی ناوی هیلدە میوللە کنەیە و ئەویش وەک سۆفیا لە هەمان ڕۆژدا پانزە ساڵ پڕدەکاتەوە. کتێبەکەی، کە دەربارەی هەر هەموومانە، سەر لەبەیانی ڕۆژی 6/15 لەسەر مێزی تەنیشت جێگەی خەوەکەی هیلدەدا دانرا. بۆ ئەوەی زیاتریش بەوردی وەسفی بکەم، لە ڕاستیدا مەلەفێکی گەورەیە و لە کاتی ئێستادا هیلدە بەسەری پەنجەکانی هەستدەکات کە هێندەی نەماوە تەواوی بکات.
جەوێکی شڵەژاو بەسەر مێزەکەدا باڵی ڕاکێشا، بەڵام ئەلبێرتۆ هەر بەردەوام بوو؛
ـ واتە هەموو بوونمان تەنها وەک جۆرە دیاریەکی خۆشە کە پێشکەش بە هیلدە میوللە کنەی کراوە و هیچی تر، ئێمە هەمووما وەک

چوارچێوەی وانەیەکی فەلسەفی دارێژراوین کە بۆ کچەکەی نووسراوە. ئەمەش، بۆ نمونە، مانای ئەوەیە کە ئەو مارسیدسە سپیەی لەبەردەرگا ڕاوەستاوە، لەڕاستیدا فلسێکی قەڵب ناهێنێت. واتە لە بنەڕەتدا هیچ شتێک نیە و لەو مارسیدسە سپیانەش زیاتر نیە کە لە مێشکی ئەو مێجەرە نەگبەتەدا دێن و دەچن، مەبەستم لەو مێجەرەیە کە ئێستاکە بۆ ئەوەی خۆر لێینەدات، لەژێر سێبەری دارخورمایەکدا دانیشتووە. لە ڕاستیدا ڕۆژانی لوبنان زۆر گەرمە، برادەران.
ـ قسەی بێ مانا! ڕاوێژکاری دارایی هاواریکرد... ئەمەیە قسەی هیچ و پوچ.
ـ بێگومان سەربەستیت هەرچیەک بڵێیت... ئەلبێرتۆ ئەمەی گوت و بواری نەدا وەڵام بداتەوە و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛ بەڵام لە ڕاستیدا ڕێک ئەم کۆبوونەوەیەمانە کە هیچ و پوچە و تەنها شتێکیش کە ئەقڵی تێدا بێت، ئا ئەم قسانەی منە.
ـ ئەوجا ڕاوێژکار هەستایە سەرپێ و گوتی؛
ـ ئێمە لێرەدا بەو پەڕی توانامانەوە هەوڵدەدەین ئاگاداری ئیشوکاری خۆمان بین و لەسەرو ئەوەشەوە هەموو شتێکی گەورە و بچوک تەئمین دەکەین، بەڵام لەپڕێکدا کەسێکی وەک ئەم پیاوە، کە ئارەزوی کاری نیە، دێت و دەیەوێت بەبۆنەی بۆچوونە «فەلسەفیەکانیەوە» هەموو شتێکمان هەڵوەشێنێتەوە.
ئەلبێرتۆ چەند جارێک سەری بۆ لەقاند و گوتی؛
ـ بەڵام ناتوانیت هیچ جۆرە تەئمینێک بۆ ئەم جۆرە زانیاریە فەلسەفیانە بەکاربهێنیت، لەبەرئەوەی لێرەدا باس لە شتێک دەکەین کە لە کارەساتی سروشتی زۆر خراپترە، کاکی ڕاوێژکار. بێگومان هەروەک دەشزانیت تەئمین ئەو جۆرە کارەساتانە ناگرێتەوە.

ـ لێرەدا باسی هیچ کارەساتێکی سروشتی لەئارادا نیە.
ـ نەخێر، بەڵکو کارەساتی بوونە. ئەگەر کەمێک تەماشای نێو دار مێوەکان بکەیت، ئەوسا لەمەبەستم تێدەگەیت. بەڵام هەروەک چۆن ناتوانیت تەئمینی ئەوە بکەین کە تیشکی خۆر تەواو نەبێت، ئەوا بە هەمان شێوەش ناتوانین دژی داتەپینی سەراپای بوونی خۆمان، تەئمینێک بدۆزینەوە.
ـ جا ئێمە چ مەجبورین بەمە ڕازیببین؟ باوکی یۆرون دەمی پرسیارەکەی لە ژنەکەی کرد.
ژنەکەی سەرێکی ڕاوەشاند، هەروەها دایکی سۆفیاش.
میوانە گەنجەکان بەردەوام چاویان لەسەر ئەلبێرتۆ دانابوو. زۆر جار ڕوودەدات گەنجەکان لە گەورەکان کراوەتر بن بۆ بیرکردنەوەی نوێ. پاشان کوڕێکی چاویکە لەچاو، کە قژێکی لولی زەردی هێنابووە خوارەوە گوتی؛
ـ پێمان خۆشە زیاترمان بۆ باسبکەیت.
ـ سوپاستان دەکەم، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ شتێک نەماوە بیڵێین. ئەگەر لەوە تێبگەین کە وێنەیەکی خەیاڵی نێو ئاگایی کەسێکی خەواڵوی ترین، ئەوا بە بڕوای من باشتر وایە بێدەنگ بین. بەڵام حەزدەکەم بە ئامۆژگاریەک کۆتایی بە قسەکانم بهێنم؛ من بەباشی دەزانم گەنجان کۆرسێکی بچکۆلەی فەلسەفە بخوێنن. بەو شێوەیەش گەشە بە جۆرە بینینێکی ڕەخنەگرانە دەدەن سەبارەت بەو جیهانەی کە تێیدا دەژین. بەتایبەتیش ڕەخنەگرتن لەو نرخ و بەهایانەی دایک و باوک و نەوەکانی پێشووتر باوەڕیان پێبووە. من ئەگەر شتێکم هەبووبێت و ویستبێتم فێری سۆفیای بکەم، ئەوا ڕێک ئەو بیرکردنەوە ڕەخنەگرانەیە بووە. هیگڵ بەوەی دەگوت «بیرکردنەوەی نەگەتیف.»

ڕاوێژکاری دارایی هێشتام هەر بە پێوە بوو، بە پەنجەکانی تەپەتەپی بە مێزەکە دەکرد.
ـ ئێمەی دایک و باوک هەوڵدەدەین هەڵوێستی باشی وەک قوتابخانە و کڵێسە لە مێشکی نەوەی داهاتوودا بچەسپێنین، بەڵام ئەم گێرەشێوێنە هەوڵدەدات سەرتاپای کارەکانمان هەڵبوەشێنێتەوە. وەک دەزانن نەوەی نوێ خاوەنی پاشەڕۆژە و ڕۆژێک لە ڕۆژان هەموو ئەو شتانەی ئێمە خوڵقاندومانن و بەرهەممان هێناون، بە میراتی بۆ ئەوان دەمێنێتەوە. ئەگەر ئەم پیاوە یەکسەر لەم کۆبوونەوەیەدا لانەبەن، ئەوا هەر ئێستاکە تەلەفون بۆ پارێزەری خێزانەکەمان دەکەم، ئەو دەزانێت چۆن چۆنی مامەڵە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا بکات.
ـ هەرچیەک بکەیت، هیچ شتێک لە بابەتەکە ناگۆڕێت. چونکە خۆت لە وێنەیەکی خەیاڵی زیاتر، هیچی تر نیت. هەرچۆنێک بێت، من و سۆفیا لەڕاستیدا کەمێکی تر جێتان دەهێڵین. کۆرسی فەلسەفەکەمان تەنها پڕۆژەیەکی تیۆری پەتی نەبووە، بەڵکو لایەنێکی کرداریشیی لەخۆ گرتووە. کە کاتی لەبار هاتە پێشەوە، من و سۆفیا بەشێوەیەکی هونەری خۆمان بزر دەکەین. بەو شێوەیەش لە ئاگایی مێجەریشدا خۆمان دەرباز دەکەین.
دایکی سۆفیا دەستی کچەکەی گرت.
ـ خۆ ناتەوێت جێم بهێڵیت سۆفیا؟
سۆفیا دەستێکی کردە ملی دایکی و تەماشایەکی ئەلبێرتۆی کرد؛
ـ دایکم زۆری پێ ناخۆش دەبێت...
ـ نا، قسەی بێ مانایە. بەڵام ئەو شتانەت لەیادبێت کە فیری بوویت. وەک دەزانیت ئەم شتە هیچانەیە کە دەبێت خۆمانی لێ سەربەست

بکەین. دایکت ئافرەتێکی خان و مان و شیرینە، ڕێک بەهەمان شێوەی سەبەتەکەی کڵاوسوورە، کە پڕبوو لە خواردن بۆ نەنکی. بەڵام لەو فرۆکەیە دڵتەنگتر نیە کە کەمێک لەوەوپێش بەسەرماندا تێپەڕی و پێویستی بە بەنزین بوو بۆ ئەوەی پیرۆزبایمان نیشانبدات.

ـ وابزانم لەمەبەستت تێدەگەم... ئەوجا سۆفیا ڕووی لە دایکی کرد و پێی گوت؛ لەبەرئەوە دەبێت بەگوێی بکەم، دایە. خۆ لە هەموو بارێکدا ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر دەبێت بەجێت بهێڵم.

ـ ئاخر زۆرت بیردەکەم، بەڵام ئەگەر ئاسمانێک لەسەرو ئەم ئاسمانەی ئێستامانەوە هەبێت، ئەوا بفرە. خەمی گۆڤینداشت نەبێت، من بەخێوی دەکەم. بەڕاست، ڕۆژی گەڵایەک کاهوو دەخوات یان دوو گەڵا؟

ئەلبێرتۆ دەستێکی خستە سەر شانی دایکی سۆفیا و گوتی؛

ـ نە تۆ بیرمان دەکەیت و نە هیچ کەسێکی تریش، لەبەرئەوەی زۆر بەئاسانی بوونتان نیە، کەواتە ناتوانن بیرمان بکەن.

ـ ئەمە ناخۆشترین شتە کە لە هەموو ژیانمدا بەرگوێم کەوتبێت! خاتو ئینگەبریگستن گوتی و ڕاوێژکاری مێردیشی سەرێکی بۆ لەقاند؛

ـ هەرچۆنێک بێت دەشێت بەرپرسیاری بوختانەکانی هەڵبگرێت. بەڵام دڵنیام کە کۆمۆنیستە، لەبەرئەوەی دەیەوێت هەموو ئەو شتانەمان لێبدزێت کە ئێمە خۆشمان دەوێن. ئەم پیاوە ناکەس بەچە و هیچ و پوچە، بگرە لە نەفرین لێکراویش زیاترە...

پاش ئەوە ڕاوێژکاری دارایی و ئەلبێرتۆ دانیشتنەوە، بەڵام دەموچاوی ڕاوێژکار لە تورەیدا سوور هەڵگەڕابوو. ئەوجا یۆرون و یۆرگین هاتنەوە سەر مێزەکە، جلەکانیان چرچ و لۆچ و پیس بووبوو. قژی یۆرون خۆڵ و قوڕی لەسەر نیشتبوو و لە پڕێکدا گوتی؛

ـ دایە، مندالْم دەبێت.
ـ بەڵێ، بەڵام بەلایەنی کەمەوە دەبێت دان بەخۆتدا بگریت هەتا دەگەینەوە ماڵەوە!
باوکی یۆرون خێرا پشتی ژنەکەی گرت؛
ـ بێگومان دەبێت کەمێک دان بەخۆیدا بگرێت. ئەگەر هەر دەشیەوێت ئەم ئێوارەیە بچێتە کڵێسە و ناوی مندالْەکەی بنێت، ئەوا دەبێت خۆی هەموو شتێک ڕێکبخات.
ئەلبێرتۆ بە چاوێکی پڕ لە مەخزاوە تەماشای سۆفیای کرد و گوتی؛
ـ ئێستاکە کاتی خۆیەتی.
لەو کاتەدا دایکی سۆفیا ڕووی دەمی کردە کچەکەی؛
ـ دەتوانیت پێش ئەوەی سەفەربکەیت، کەمێک قاوەمان بۆ بهێنیت؟
ـ بەڵێ، بێگومان دەتوانم.
تەرمۆزەی قاوەکەی هەڵگرت و بەرەو چێشتخانەکەیان کەوتە ڕێ. دەبوایە خۆی قاوەی لێبنایە. لەو کاتەشدا کە چاوەڕوانی دەکرد، خواردنی بە چۆلەکەکان و ماسیەکانی دا. فریای ئەوەش کەوت بچێتە سەرەوە و گەڵایەکی کاهوو بداتە کیسەڵەکەی. پشیلەکەی نەبینی، بەڵام قتوویەک خواردنی بۆ کردەوە و ڕۆیکردە ناو قاپەکەیەوە، ئەوجا لەسەر قادرمەکان داینا. هەموو ئەمانەی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بەجێهێنا.
کاتێکیش گەڕایەوە، ئاهەنگی باخچەکەی وەک کۆبوونەوەیەکی مندالان دەهاتە بەرچاو و هیچ ڕەنگ و بۆیەکی ئاهەنگی فەلسەفی کچێکی گەنجی پێوە نەمابوو. چەندین بتڵی ساردیان بەسەر مێزەکەدا ڕشتبوو، پارچەیەک کێکی گەورەش کەوتبووە خوارەوە و لەگەڵ ناندا لەناو خۆڵەکەدا تێکەڵبوو بوو. لەو کاتەدا کە سۆفیا گەیشتە لای

مێزەکە، یەکێک لە کوڕەکان فیشەکە شێتەیەکی لەناو کێکەکەدا دانا و پاشان دایگیرساند، پاش کەمێک کێکە گەورەکە تەقیەوە و بەسەر مێز و میوانەکاندا پەرشوبڵاو بووەوە. گەورەترین بەشیش بەسەر جلە سوورەکەی خاتو ئینگەبریگستندا پرژا.

بەڵام لە هەموو شتێک سەیرتر ئەوە بوو کە هەموویان زۆر بەئارامیەوە وەریاندەگرت. یۆرون پارچە کێکێکی گەورەی هەڵگرت و لە دەموچاوی یۆرگینی هەڵسوو، ڕێک دوای ئەوەش کەوتە لێسانەوەی و هەموو دەموچاوی پاککردەوە.

دایکی و ئەلبێرتۆش کەمێک دورەپەرێز دانیشتبوون، دەستێکیان بۆ سۆفیا ڕاوەشاند و بانگیانکردە لای خۆیان، ئەوجا سۆفیا گوتی؛

ـ هەرچۆنێک بێت، خۆ ئێوە توانیتان بەڕاشکاوی پێکەوە قسە بکەن.

دایکی بە دڵخۆشیەکەوە وەڵامی دایەوە؛

ـ تۆش بەتەواوەتی ڕاستت دەکرد، ئەلبێرتۆ مرۆڤێکی زانایە. من بەو پەڕی دڵنەواییەوە دەتخەمە نێو دەستە بەهێزەکانیەوە.

سۆفیا لە نێوان هەردووکیاندا دانیشت.

دوو کوڕ بەسەر سەربانەکەدا سەرکەوتن و کچێکیش بە باخەکەدا دەسوڕایەوە و بە تەوقەیەک میزەڵدانەکانی دەتەقاند. ئەوجا میوانێکی بانگنەکراو بەخۆی و ماتۆڕەکەیەوە هات. سەرپشتی ماتۆڕەکەی پڕبوو لە بیرە و خواردنەوەی قورس. هەندێک لە گەنجانیش بە خۆشیەوە بەرەو ڕووی چوون.

ئەوجا ڕاوێژکاری دارایی هەستایە سەرپێ، چەپڵەیەکی لێدا و گوتی؛

ـ کوڕ و کچە گەنجەکان... یاری بکەین؟

بیرەیەکیان دایە و بەپەلە خواردیەوە، ئەوجا بتڵەکەی لەناو چیمەنەکەدا دانا. پاشان بەرەولای مێزەکە ڕۆیشت و دواهەمین پێنج

بازنەی کێکەکەی هەڵگرت. دواتریش شێوەی فڕێدانی کێکەکەی پیشانی میوانەکان دەدا و پێی دەگوتن بازنەی کێکەکان بە چ جۆرێک بگرنە بتڵەکە.
ـ ئەمە دواهەمین هەناسەیە... ئەلبێرتۆ گوتی، پێش ئەوەی مێجەر خاڵی کۆتایی دابنێت و هیلدەش مەلەفەکەی دابخات، باشتر وایە بۆی دەربچین.
ـ دایە... دەبێت بەتەنها ئەو ناوە کۆبکەیتەوە.
ـ هیچ گرنگیەکی نیە کچەکەم. بەهەرحاڵ، ئەم جۆرە ژیانەی ئێرە بۆ تۆ نیە. ئەگەر ئەلبێرتۆ بتوانێت ژیانێکی باشترت پێ ببەخشێت، ئەوا کەس بەقەدەر من ئاسوودە نابێت. گوتت ئەسپێکی سپی هەیە، وانیە؟
سۆفیا تەماشایەکی باخچەکەی کرد... نەدەناسرایەوە، بتڵ و ئێسکی مریشک و سەمون و میزەڵدان، هەموو وەک یەک لە چیمەنەکەدا پەرشوبڵاو بووبوونەوە، پاش کەمێک گوتی؛
ـ ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەمە بەهەشتە پچکۆلەکەی من بوو.
ـ ئێستاکەش لەو بەهەشتەدا دەردەکرێیت... ئەلبێرتۆ وەڵامی دایەوە.
یەکێک لە کوڕەکان لەناو مارسیدسە سپیەکەدا دانیشتبوو، سلفێکی لێدا؛ بەناو دەرگای باخچەکەدا لێیخوڕی و بەسەر چەوی داڵانەکەدا هاتە ناو باخچەکەوە.
سۆفیا هەستیکرد یەکێک بەتوندی قۆڵی گرتووە... یەکێک کە بەرەو کوخەکە ڕایدەکێشا، ئەوجا گوێی لە دەنگی ئەلبێرتۆ بوو گوتی؛
ـ ئێستاکە!
لە هەمان کاتدا مارسیدسە سپیەکە بەر دار سێوێک کەوت و سێوە کاڵ و کرچەکان بەسەریدا دابارین. پاشانیش ڕاوێژکاری دارایی هاواری لێهەستا؛

ـ لە ڕادەبەدەر ناخۆشیان کرد! دەبێت هەموو زەرەرەکانم بەتەواوەتی بۆ ببژێرن...
ژنەکەشی بەتەواوەتی پشتی گرت؛
ـ هەمووی خەتای ئەو هیچ و پوچە بوو. بەڕاست... کوا؟ چی لێهات؟
ـ دەڵێی زەوی قوتی دان... دایکی سۆفیا بە دەنگێکی پڕ لە شانازیەوە وەڵامی دایەوە.
ئەوجا هەستا و بەرەولای مێزەکە ڕۆیشت، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی پاشماوەی ئاهەنگی فەلسەفیەکە و گوتی؛
ـ کەس قاوەی تر دەخواتەوە؟

# تێکەڵکردنی ئاوازەکان
## ...دوو ئاواز یان زیاتر، کە لە هەمان کاتدا دەژەنرێن...

هیلدە لەسەر جێگاکەی دانیشت. لێرەدا چیرۆکی سۆفیا و ئەلبێرتۆ کۆتایی هات. بەڵام ئایا لە ڕاستیدا چی ڕوویدا؟
بۆچی باوکی ئەو بەشەی دواهەمینی نووسیبوو؟ ئایا تەنها لەبەرئەوە بوو کە دەسەڵاتی خۆی بەسەر جیهانی سۆفیادا نیشانبدات؟
بە بیرکردنەوە قوڵەکانی مێشکیەوە بەرەو گەرماوەکە ڕۆیشت و جلەکانی لەبەرکرد. کەمێک نانی بەیانی خوارد، پاشان خۆی گەیاندە جۆلانەی ناو باخچەکە و لەسەری دانیشت.
لەگەڵ ئەلبێرتۆدا تەبابوو کە تەنها شتێکی ئاقڵانەی ئاهەنگەکە، وتارەکەی ئەو بوو. بەڵام بڵێیت باوکی مەبەستی ئەوە بووبێت کە جیهانی هیلدەش وەک ئاهەنگی باخچەکەی سۆفیا شێواو بێت؟
ئەی ئەلبێرتۆ و سۆفیا... ئەی پیلانە نهێنیەکەی ئەوان چی بەسەرداهات؟
ئایا دەبێت هیلدە نووسینەکە تەواو بکات؟ یان بەڕاستی لە چیرۆکەکەدا ون بوون؟
بەڵام ئەگەر ونبوون، ئەی کەواتە ئێستاکە لە کوێدان؟
لە ناکاودا هیلدە سەرنجی چووە سەر شتێک؛ ئەگەر ئەلبێرتۆ و سۆفیا بەڕاستی توانیبێتیان لە چیرۆکەکەدا دەربازببن، ئەوا نابێت دەربارەی ئەوە هیچ شتێک لە مەلەفەکەدا نووسرابێت، لەبەرئەوەی باوکی زۆر بەباشی ئاگای لە هەموو نووسراوەکانی نێو مەلەفەکەیە.
بەڵام ئایا ڕێی تێدەچێت شتێک لە نێوان دێڕەکاندا نووسرابێت؟ لە چیرۆکەکەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ شتێکی وا کرابوو.

**هەرچۆنێک بێت ئێستاکە هیلدە تێگەیشت کە دەبێت یەک دوو جاری دی هەموو چیرۆکەکە سەرلەنوێ بخوێنێتەوە.**

لەو کاتەدا کە مارسیدسە سپیەکە بەر دار سێوەکان کەوت، ئەلبێرتۆ سۆفیای لەگەڵ خۆیدا ڕاکێشایە ناو کوخی ناو پەرژینەکەوە، لەوێشەوە ڕایانکردە ناو دارستانەکەوە و بەرەو کوخەکەی مێجەر بۆی دەرچوون. ئەوجا ئەلبێرتۆ هاواریکرد؛
- خێراکە!... پێش ئەوەی ئەو بەدواماندا بگەڕێت، دەبێت کارەکەمان ئەنجام دابێت.
- ئێستاکە لەدەرەوەی بازنەی ئاگاداری مێجەردایین؟
- لەسەر سنوورین.
بە بەلەمە پچکۆلەکە پەڕینەوە ئەو بەری دەریاچەکە و خۆیانکرد بە کوخەکەی مێجەردا. ئەلبێرتۆ، پاڵی بە سۆفیاوە نا و لە ژێرزەمینەکەی توند کرد، پاشان هەموو شتێک ڕەش بوو.

**هیلدە لە ڕۆژانی دواتردا، کاری لەسەر پیلانەکەی خۆی دەکرد. چەند نامەیەکی بۆ ئاننە نارد، کە لە کۆبنهاگن دەژیا و یەک دوو جارێکیش تەلەفونی بۆ کرد. لە لیللەساندیشدا، داوای لە ناسیاو و برادەرەکانی کرد کە کۆمەکی بکەن... نزیکەی نیوەی برادەرانی پۆلەکەی تێوەگلاندبوو.**
**جارجارێکیش «جیهانی سۆفیا»ی دەخوێندەوە، لەبەرئەوەی مەلەفەکە چیرۆکێک نیە کە یەکجار بیخوێنیتەوە و تەواو لێی تێبگەیت. هیلدە بەردەوام بیرکردنەوەی نوێی سەبارەت بە چارەنووسی سۆفیا و ئەلبێرتۆی بە خەیاڵدا دەهات.**

**شەممەی 23ی مانگی شەش، نزیکەی کاتژمێری نۆ خەبەری بووەوە. دەیزانی باوکی لە لوبنانەوە بەرەو ماڵەوە کەوتۆتە ڕێ. ئێستاکەش تەنها دەبێت چاوەڕوان بێت و هیچی تر، بەڵام زۆر بەوردی نەخشەی دوا بەشی ڕۆژەکەی باوکی داڕشتبوو.**
**سەر لەبەیانیەکەشی لەگەڵ دایکیدا شتەکانی ئێوارەی جەژنی یۆحەنایان ئامادەکرد. هیلدە بەردەوام بیری لە سۆفیا دەکردەوە کە چۆن لە ئێوارەی جەژنی یۆحەنای «ئەواندا» یارمەتی دایکی دەدا.**
**بەڵام ئەوە شتێک بوو کە کردیان و ڕابووورد! یان بەڕاست... کێ دەڵێت ئا ئێستاکە بەڕاستی خەریکی ڕازاندنەوەی مێزەکەیان نین؟**

سۆفیا و ئەلبێرتۆ لەسەر چیمەنی باخچەیەکدا بەرامبەر بە دوو بینای گەورە دانیشتبوون. لە ڕووکاری دەرەوەی بیناکانەوە، چەند پانکەیەکی گەورەی ناشیرین و چەند شوێنێکی هەواگۆڕکێی تێدابوو. لە بینایەکیانەوە ژن و پیاوێکی گەنج هاتنە دەرەوە؛ پیاوەکە جانتایەکی قاوەیی هەڵگرتبوو و ژنەکەش کۆڵە پشتێکی سووری بەشانەوە بوو. لە پشتیشیانەوە ئۆتۆمبیلێک تێپەڕی.
- ئەوە چی بوو؟... سۆفیا گوتی.
- ڕزگارمان بوو!
- بەڵام ئەی ئێستاکە لە کوێداین؟
- ئێرە پێی دەگوترێت "کوخی مێجەر."
- بەڵام... کوخی مێجەر؟
- لە "ئۆسلۆ"دایە.
- دڵنیایت؟

- تەواو دڵنیام. یەکێک لەو بینایانە ناوی «کۆشکی نوێ»یە و لەوێدا خوێندکاران مۆسیقا دەخوێنن. بیناکەی تریش «کۆلیجی ئاینی»یە و تیۆلۆجی تێدا دەخوێنرێت. لەسەرو ئەویشەوە زانستە سروشتیەکان و لەسەری سەرەوەشدا جێگەی خوێندنی ئەدەب و فەلسەفەیە.
- ئایا بەتەواوەتی لە کتێبەکەی هیلدە و ژێر دەسەڵاتی مێجەر دەرباز بووین؟
- بەڵێ، لەدەستی هەردووکیان قورتاربووین، هەرگیزاو هەرگیزیش ناتوانێت لێرەدا بمان دۆزێتەوە.
- بەڵام ئەی ئەو کاتەی بەناو دارستانەکەدا ڕاماندەکرد... ئەو کاتە لە کوێدابووین؟
- کاتێک مێجەر سەرقاڵی ڕێکخستنی پێکدادانی مارسیدس و دار سێوەکە بوو، بە هەلمان زانی و خۆمان لە کوخەکەدا شاردەوە. ئەو کاتە لە قۆناخی کۆرپەدا بووین، سۆفیا. لەوێدا سەربە هەردوو جیهانی کۆن و نوێش بووین. بەڵام ڕێی تێناچێت مێجەر بیری لەوە کردبێتەوە کە لەوێدا خۆمان بشارینەوە.
- بۆ نا؟
- لەبەرئەوەی ئەو کاتە هەروا بە ئاسانی دەستی لێ هەڵنەدەگرتین. وەک دەزانیت شتەکان هەروەک خەونێک ڕوویاندا... بەڕاست، ڕێشی تێدەچێت کە خۆشی بەشداری یاریەکەی کردبێت.
- مەبەستت چیە؟
- ئەو بوو کە مارسیدسە سپیەکەی خستە ئیش. لەوانەیە تا ئەو پەڕی ڕادەش خۆی ماندووکردبێت بۆ ئەوەی لەبەرچاودا ونببین. پێم وابێت لەپاش ئەو هەموو ڕووداوە خۆشی شەکەت بووبێت.

ژن و پیاوە گەنجەکە چەند هەنگاوێکیان مابوو بگەنە لایان. سۆفیا کەمێک هەستی بەشەرم دەکرد کە لەگەڵ پیاوێکی بەتەمەندا لەنێو ئەو چیمەنەدا دانیشتووە. لە هەمان کاتیشدا دەیویست کەسێکی تریش هەمان ئەو قسانەی ئەلبێرتۆی بۆ دووپات بکاتەوە، لەبەرئەوە لە شوێنی خۆی بەرزبووەوە و بەرەو ڕووی ژن و پیاوەکە ڕۆیشت؛

ـ ببوورن... ناوی ئەم شوێنە چیە؟

بەڵام نە وەڵامیان دایەوە و نە پێشی دەچوو بیبینن.

سۆفیا کەمێک تورە بوو و دیسانەوە بەرەو ڕوویان چووەوە؛

ـ پێم وابێت ئاساییە گەر وەڵامی پرسیارێک بدەنەوە؟

لەوە دەچوو پیاوە گەنجەکە سەرقاڵی باسکردنی شتێک بێت بۆ کچەکە؛

ـ شێوازی تێکەڵکردنی ئاواز، لەسەر دوو تەوەرە کار دەکات؛ ئاسۆیی، واتە شێوەی میلۆدیەکەی، هەروەها شاقوڵیش، واتە هارمۆنی. واتە بە کورتیەکەی دوو ئاواز یان زیاتر، کە لە هەمان کاتدا دەژەنرێن...

ـ ببوورن قسەکانتان پێ دەبڕم، بەڵام...

ـ میلۆدیەکانیش بەشێوەیەک تێکەڵدەکرێن، کە تا بتوانرێت بە سەربەستی لەژێر کەمترین کاریگەری کۆمەڵەکەدا، دەرکەون. بەڵام ئەو کاتە پێویستمان بە شێوە هارمۆنیەکیش دەبێت. بەوەش دەڵێن؛ «تێکەڵکردنی ئاوازەکان»، لە ڕاستیدا مانای "نۆتە دژ بە نۆتە دەبەخشێت."

ـ چەندە بێ ئەدەبن! چونکە نە کوێرن و نە کەڕیشن... سۆفیا بۆ جاری سێهەم هەوڵیدایەوە، ئەمجارەیان ڕێک لەبەردەمیاندا قوت بووەوە و ڕێگاکەی پێگرتن، بەڵام بە هێواشی پاڵێکیان پێوە نا.

ـ لەوەدەچێت ڕەشەبا هەڵکات... کچە گەنجەکە گوتی.

سۆفیا ڕایکردەوە لای ئەلبێرتۆ؛
- گوێیان لە دەنگم نیە! لەو چرکەیەدا خەونەکەی بیرکەوتەوە کە کاتی خۆی بە هیلدە و زریزە ئاڵتونیەکەوە بینی.
- ئەوە ئەو نرخەیە کە دەبێت بیدەین. ڕاستە لە کتێبەکە دەرباز بووین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت چاوەڕوانی ئەوە بین کە بگەینە هەمان پلەی نووسەرەکەی. بەڵام وەک دەزانیت ئێستاکە ئێمە لێرەداین. لە ئێستا بەدواوە، لە هەمان تەمەنیشدا دەمێنینەوە... ڕێک هەروەکو ئەو کاتەی کە ئاهەنگی باخچەکەمان جێهێشت.
- بەڵام ئایا ئیتر هەرگیز ناتوانین پەیوەندی لەگەڵ کەسانی تردا بگرین؟
- فەیلەسوفی ڕاستەقینە هەرگیز ناڵێت «هەرگیز»... کاتژمێر چەندە؟
- هەشتە.
- هەمان ئەو کاتەیە کە ئاهەنگەکەمان بەجێهێشت.
- ئەمڕۆکە باوکی هیلدە لە لوبنانەوە دەگەڕێتەوە.
- لەبەرئەوە دەبێت پەلە بکەین.
- مەبەستت چیە؟
- حەز ناکەیت بزانیت ئەو کاتەی مێجەر دەگەڕێتەوەماڵەوە، چی ڕوودەدات؟
- بێگومان، بەڵام...
- دەبا بڕۆین!
بەرەو شار کەوتنە ڕێ. زۆر جار خەڵکی بەلایاندا تێدەپەڕین، بەڵام لەوە دەچوو بەلای هەوادا بڕۆن.

ئۆتۆمبیلەکان بەدرێژایی قەراغی شەقامەکە بەڕیز ڕاگیرابوون. لەپڕێکدا ئەلبێرتۆ لەبەردەم ئۆتۆمبیلێکی سووری وەرزشیدا وەستا، سەرەکەشی هەڵدرابووەوە، ئەوجا گوتی؛
- پێم وابێت ئەم یەکەیان بەکەڵکمان دێت، بەڵام لە پێشدا دەبێت دڵنیابین کە ئەمە هی «خۆمانە.«
- بەهیچ جۆرێک تێناگەم مەبەستت چیە.
- کەواتە وا باشترە گەر بۆت باسبکەم؛ ناتوانین هەروا بە ئاسانی ئۆتۆمبیلی کەسێکی تر هەڵببژێرین و سواری ببین. بەبڕوای تۆ خەڵکی چی دەکەن ئەگەر سەیارەک ببینن کە بەبێ شۆفێر بڕوات؟ جگە لەوەش بە دڵنیاییەوە ناتوانیت بیخەینە ئیش.
- ئەی ئەم ئۆتۆمبیلی وەرزشیە چی؟
- پێم وابێت لە فلیمێکی کۆندا بینیوومە.
- ببوورە، بەڵام لەڕاستیدا خەریکە ئەم هەموو هێما نهێنیانەت، تەواو بێزارم دەکەن.
- ئەمە ئۆتۆمبیلێکی فەنتاسییە، سۆفیا. هەروەک خۆمان وایە. خەڵکانی چواردەورمان کە بێرەدا تێدەپەڕن تەنها شوێنێکی بەتاڵ دەبینن و هیچی تر. ئێمەش، پێش ئەوەی بڕۆین، دەبێت ڕێک لەم خاڵە دڵنیابین.
دوای ساتێک چاوەڕوانکردن هێندەی نەبرد کوڕێکی پاسکیل سوار بەسەر شۆستەکەدا هات. لەناکاودا ڕاستەوخۆ بەناو ئۆتۆمبیلەکەدا تێپەڕی و چووە سەر شەقامەکە.
- بینیت؟ کەواتە هی خۆمانە!

ئەلبێرتۆ لە شوێنی شۆفێردا دانیشت، سویچەکەش لە شوێنی خۆیدا ئامادەبوو، بایدا و یەکسەر کەوتە ئیش. لێرەو لەوێش، لەکاتی لێخوڕینیاندا، چاویان بە چەندین ئاگری جەژنی یۆحەنا کەوت.
ـ ناوەڕاستی هاوینە سۆفیا... خۆش نیە؟
ـ ڕەشەبایەکی خۆشیش دێتە ناو ئۆتۆمبیلێکی سەر بەتاڵی ئاوهاوە، بەڵام بەڕاستی کەس ناتوانێت بمانبینێت؟
ـ تەنها ئەوانە دەتوانن کە لە ڕەگەزی خۆمانن. لەوانەیە هەندێکیان ببینین. کاتژمێر بووە بە چەند؟
ـ هەشت و نیوە.
ـ کەواتە دەبێت قەدبڕی بکەین... بەلایەنی کەمەوە ناتوانین هەروا بە هێواشی لەپشت ئەو ترێلەیەوە لێبخوڕین.
پاش ئەوە ئەلبێرتۆ ڕێک بەناو دەغڵێکی گەنمدا لێیخوڕی، سۆفیاش ئاوڕێکی دایەوە و چاوی بە هێڵێکی پانی گوڵە گەنمی پان بووەوە کەوت. ئەوجا ئەلبێرتۆ گوتی؛
ـ بەیانی دەڵێن ڕەشەبا خستوویەتی.

**کاتژمێر چوار و نیوی ئێوارەی 23ی 6، مێجەر ئەلبێرت کنەی لە فڕۆکەخانەی کۆبنهاگن نیشتەوە. ڕۆژێکی دورو درێژی بەسەر بردبوو. پێش کۆبنهاگن، دواهەمین شوێنی نیشتنەوەی فڕۆکەکەی لە ڕۆمادا بوو.**
**بە جلوبەرگی نەتەوە یەکگرتووەکانی بەریەوە، کە هەمیشە شانازی پێوە دەکرد، بە شوێنی کۆنترۆڵی پاسپۆرتدا تێپەڕی. ئەو کەسێک نەبوو کە تەنها نوێنەری خۆی یان تەنانەت نوێنەری وڵاتێکیش بێت، بەڵکو ئەلبێرت کنەی نوێنەری نەریتێکی سەد ساڵەی دادوەری**

نێونەتەوەیی بوو، کە ئێستاکە خەریکە سەرانسەری هەموو جیهان دەگرێتەوە.
تەنها جانتایەکی چکۆلەی بەشانەوە بوو، هەموو شتەکانی تریشی لە ڕۆماوە ناردبوو. گەیشتە لای کۆنترۆڵەکە و تەنها ئەوەندەی بەسبوو کە پاسپۆرتە سوورەکەی بەرزبکاتەوە.
»هیچ شتێکم پێ نیە ئاشکرای بکەم.«
مێجەر دەبوایە نزیکەی سێ سەعاتێک لە فڕۆکەخانەی کۆبنهاگندا بمایەتەوە، ئەوجا فڕۆکەکەی دواتری بەرەو کریستیاندساند هەڵدەسا، لەبەرئەوە بەهەلی زانی هەندێک دیاری بۆ خێزانەکەی بکڕێت. دوو حەفتە لەوەوپێش، گەورەترین دیاری ژیانی بۆ هیلدەی کچی نارد. ماریتی هاوسەری، لەسەر مێزی تەنیشت جێگای خەوەکەی هیلدەوە داینا، بۆ ئەوەی کاتێک سەر لەبەیانی ڕۆژی لەدایکبوونەکەی خەبەری دەبێتەوە، یەکسەر چاوی پێبکەوێت. دواجاریش کە قسەی لەگەڵ هیلدەدا کرد، لەشەوی لەدایکبوونەکەیدا بوو کە تەلەفونی بۆ کرد.
ئەلبێرت چەند ڕۆژنامەیەکی نەرویجی کڕی، لە بارێکدا دانیشت و داوای کوپێک قاوەی کرد. هێشتام فریای خوێندنەوەی سەرباسی ڕۆژنامەکان نەکەوت کە دەنگێکی گەورە لە بڵنگۆکانەوە بەرز بووەوە؛
»پەیامێکی تایبەتی بۆ مێجەر ئەلبێرت کنەی... داوا لە مێجەر ئەلبێرت کنەی دەکەین کە خۆی بگەیەنێتە نووسینکەی "ساس " «**SAS**».
چی ڕوویداوە؟ ئارەقێکی سارد بە پشتیدا هاتە خوارەوە. ناشێت فەرمانی پێبکەن کە بگەڕێتەوە بۆ لوبنان؟ بڵێیت شتێک لەماڵەوە ڕووینەدابێت؟

پاش کەمێک خۆی گەیاندە نووسینگەی ساس.
ـ ناوم ئەلبێرت کنەیە.
ـ فەرموو، پەیامێکی بەپەلەت بۆ هاتووە.
یەکسەر نامەکەی کردەوە و لەناوەوەیدا نامەیەکی پچکۆلەتری بەدیکرد. لەسەر زەرفەکە نووسرابوو؛ «بۆ مێجەر ئەلبێرت کنەی، لە ڕێگەی نووسینگەی ساسی فرۆکەخانەی کۆبنهاگنەوە». نامە بچکۆلەکەی کردەوە و دەستیکرد بە خوێندنەوەی؛

»باوکی خۆشەویستم؛ بەخێرهاتنی گەڕانەوەت دەکەم. وەک دەبینیت تەنانەت ناتوانم چاوەڕوان بم هەتاوەکو دەگەیتە ماڵەوە. بمبوورە کە ناچاربووم لە ڕێگەی بڵنگۆکانەوە بانگت بکەم، بەڵام بەو شێوەیە کارەکەم ئاسانتردەبوو.
تێبینی؛ بەداخەوە ڕاوێژکاری دارایی داوای بژاردنی زەرەرەکانی مارسیدسە دزراوەکەی دەکات.
تێبینیەکی تر؛ کاتێک دەگەڕێیتەوە ماڵەوە، لەوانەیە لە باخچەکەدا بم، بەڵام لەوانەشە تا ئەو کاتە نامەی ترت بۆ بنێرم.
دوا تێبینی؛ ئێستاکە گەر بۆ ماوەیەکی زۆر لە باخچەکەدا دانیشم، کەمێک ترسم لێدەنیشێت، لەبەرئەوەی مرۆڤ لەو جۆرە شوێنانەدا بەئاسانی زەوی قووتی دەدات.
لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستی هیلدەی کچت، کە کاتێکی باشی بۆ پێشوازیکردنی گەڕانەوەت تەرخانکردووە.«

بزەیەک بەناچاری هاتە سەر لێوانی مێجەر ئەلبێرت کنەی، بەڵام لە هەمان کاتیشدا زۆری پێناخۆش بوو بەو شێوەیە بکرێتە قەشمەرچی و

یاری پێبکرێت. ئەو هەمیشە حەزیدەکرد دەسەڵاتی تەواوی بەسەر ژیانی تایبەتی خۆیدا هەبێت. بەڵام لەپڕێکدا ئەو کچە شەیتانە لە لیللەساند دانیشتووە و جوڵەی ناو فڕۆکەخانەی کۆبنهاگنی بەڕێوە دەبات! بەڵام ئەی چۆن بۆی کرا؟
نامەکەی خنیە ناو گیرفانیەوە و بە هێمنی بەلای دوکانەکانی فڕۆکەخانەکەدا کەوتە ڕێ. خۆی کرد بە کۆگایەکی پڕ لە خواردەمەنی تایبەتی دانیمارکیدا و لەبەر دەرگا شوشەکەی چوونە ژورەوەکەیدا، چاوی بە نامەیەکی چکۆلە کەوت کە بەدەرگاکەوە چەسپێنرابوو. بە خەتێکی گەورەی ڕەش لەسەری نووسرابوو؛ «مێجەر ئەلبێرت کنەی».
نامەکەی لێکردەوە و کەوتە خوێندنەوەی؛

»پەیامێکی تایبەتی بۆ مێجەر ئەلبێرت کنەی، لە ڕێگەی کۆگایەکی دانیمارکیەوە، فڕۆکەخانەی کۆبنهاگن؛
باوکی ئازیزم؛ زۆرم پێخۆش دەبێت گەر یەک دوو کیلۆ باستورمەی دانیمارکیم بۆ بکڕیت. بێگومان دایکیشم دڵی بە باستورمەی بە کۆنیاک خۆش دەبێت.
تێبینی؛ کاڤیاری لیمفۆردیش خراپ نیە.
سڵاوی هیلدە.«

ئەلبێرت تەماشایەکی چواردەوری خۆی کرد، بڵێیت هیلدە لەو ناوەدا بێت؟ تۆ بڵێیت تەنها بۆ ئەوی چاوی پێبکەوێت، ڕێگەی پێدرابێت تا کۆبنهاگن بێت؟ دەستوخەتی هیلدە خۆیەتی...

لەپڕێکدا چاودێریکەری نەتەوە یەکگرتووەکان هەستی کرد یەکێک چاودێری خۆی دەکات. لەوە دەچوو لە دورەوە کەسێک بیبات بەڕێوە. هەستیدەکرد بووکەشوشەی دەستی منداڵێکە.
چووە ناو کۆگاکەوە و دوو کیلۆ باستورمەی دانیمارکی و باستورمەیەکی بە کۆنیاک و سێ پەرداخ کاڤیاری داواکراوی کڕی. پاشان دیسانەوە بەناو کۆگاکاندا کەوتەوە گەڕان. دەیویست دیاریەکی ئاسایی ڕۆژی لەدایکبوون بۆ هیلدە بکڕێت... بڵێیت هیلدە ئامێرێکی چاپی بەدڵ نەبێت؟ یان ڕادیۆیەکی چکۆلە کە بتوانێت لە کاتی سەفەردا لەگەڵ خۆیدا بیبات؟... دواجار بڕیاریدا و ڕادیۆکەی بەلاوە باشتربوو.
دوکانێکی شتومەکی ئەلەکترۆنی دۆزیەوە و دیسانەوە لەکاتی چوونە ژورەوەیدا بەدەرگا شوشەکەیەوە، چاوی بە نامەیەک کەوت؛ «مێجەر ئەلبێرت کنەی، لە ڕێگەی گرنگترین کۆگای فرۆکەخانەی کۆبنهاگنەوە»، لەناو نامەکەشدا، ئەم پەیامەی بۆ نووسرابوو؛

»بابە گیان؛ سۆفیا هەواڵت دەپرسێت و سوپاسیشت دەکات بۆ ئەو تەلەفیزۆن و ڕادیۆ پچکۆلەیەی کە لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا، وەک دیاریەک لە باوکە دڵ گەورەکەیەوە وەریگرت. تا بڵێیت نایاب بوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بێ نرخ بوو. بەداخەوە منیش وەک سۆفیا حەزم لەو شتە بێ نرخانەیە.
تێبینی؛ نازانم تا ئێستاکە سەردانی کۆگای خواردەمەنی و بازاڕی ئازادت کردووە یان نا... هەرچۆنێک بێت، لەوێدا زانیاری زۆرترم بۆ داناویت.

تێبینیەکی دی؛ پارەیەکی باشم لە ڕۆژی لەدایکبوونەکەمدا بۆ هات، لەبەرئەوە دەتوانم **350** کرۆنێک بەکاربهێنم بۆ کڕینی ڕادیۆ و تەلەفیزۆنێکی بچکۆلە.
خۆشەویستی هیلدە، کە هەر لە ئێستاوە ناو سکی قەلەکەی پڕ کردووە لە شتی خۆش و ئەو زەڵاتەیەشی ئامادەکردووە کە تۆ زۆرت حەز لێیە.»

تەلەفیزۆنێکی پچکۆلە بە **985** کرۆنی دانیمارکی بوو، بەڵام بەبەراوردکردنی لەگەڵ حاڵەتی مێجەردا هەر زۆر بێ نرخ بوو، مێجەر بە تەواوەتی هەستیدەکرد کە هیلدەی فێڵباز بە ئارەزوی خۆی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری دەبات و بە یەکجاری بەڕێوەی دەبات، بەڵام ئایا هیلدە لەوێدایە یان نا؟
لەو چرکەیەوە بۆ هەر شوێنێک بڕۆشتایە، بەردەوام تەماشای ئەملاولای دەکرد. لە هەمان کاتدا هەستیدەکرد هەم وەک سیخوڕێک و هەم وەک قەرەقۆزێکیش وایە. لەوە دەچوو بە زۆرەملێ سەربەستیان لێسەندبێتەوە.
بەناچاری بەرەو بازاڕی ئازادی فڕۆکەخانەکەش کەوتە ڕێ. لەوێدا نامەیەکی سپی نوێی بەناوی خۆیەوە بۆدانرابوو. لەوە دەچوو هەموو فڕۆکەخانەکە بووبێتە یاریەکی گەورەی کۆمپیوتەر و خۆشی وەک مشکی کۆمپیوتەرەکەی لێهاتبێت. لەسەرنامەکە نووسرابوو؛

«بۆ مێجەر ئەلبێرت کنەی، لە ڕێگەی بازاڕی ئازادی گەورەی فڕۆکەخانەکەوە؛ هەموو ئەو شتانەی لەم بازاڕەدا داوایان دەکەم، کیسەیەک بنێشت و هەندێک شیرینی ئەنتۆن بێرگە. لەبیرت نەچێت

ئەو جۆرە شیرینیانە لە نەرویجدا زۆر گرانن! ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم دایکم زۆر حەزی لە کامپارییە.
تێبینی؛ لە ڕێگەی هاتنەوەتدا زۆر ئاگاداربە... لەبەرئەوەی دڵنیام کە ناتەوێت هیچ پەیامێکی گرنگت لە کیس بچێت.
سڵاوی کچەکەت، کە زۆر خێرا شت فێردەبێت.

ئەلبێرت هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆیکرد بە بازاڕی ئازاددا و داواکاریەکانی کڕی. بەجانتایەکی شان و سێ کیسەی دەستیەوە بەرەو دەرگای ژمارە **28** کەوتە ڕێ، لەوێدا دەبوایە چاوەڕوانی هەستانی فڕۆکەکەی بکردایە. ئەگەر هێشتام پەیامی تریشی مابێت، ئەوا با بۆخۆیان هەر بە هەڵواسراوی بمێننەوە.
بەڵام بە یەکێک لە پایەکانی دەرگای ژمارە **28**یشەوە نامەیەکی سپی بۆ هەڵواسرابوو؛ «بۆ مێجەر ئەلبێرت کنەی، لە ڕێگەی دەرگای ژمارە **28**ەوە، فڕۆکەخانەی کۆبنهاگن». دەستوخەتی هیلدە بوو، بەڵام لەوە دەچوو ژمەی دەرگاکە بە دەستوخەتێکی تر خرابێتە سەری؟ بە ئاسانی نەیدەتوانی دڵنیابێت، لەبەرئەوەی بۆی سەختبوو ژمارە و نووسین بەراورد بکات.
لەسەر کورسیەک دانیشت و بەباشی پاڵیدایەوە. هەموو ئەو شتانەش کە کڕیبوونی لەسەر کۆشی دانان. ئا بەو شێوەیە مێجەری لوتبەرز لەسەر کورسیەک دانیشتبوو و وەک منداڵێک کە یەکەمین جاری بێت سەفەر بکات، بەردەوام سەیری ئەملاولای دەکرد. ئەگەر هیلدە لەوێ بێت، ئەوا بەلایەنی کەمەوە ناهێڵێت خۆشی لەوە ببینێت کە لە پێشدا ئەو، ئەم ببینێت.

**زۆر بەوردی تەماشای دەموچاوی هەموو ڕێبوارانی تری دەکرد. بۆ ماوەیەکی کەمیش وەک دوژمنێک هەستیدەکرد، کە لەلایەن ئاسایشی وڵاتەوە بەردەوام چاودێری بکرێت. تەنها ئەو کاتەی ڕێگەیان پێدان بچنە ناو فڕۆکەکەوە، کەمێک خەیاڵی هێمن بووەوە و هەناسەیەکی بۆ هەڵکێشا. ئەو دواهەمین کەسبوو کە چووە ناو فڕۆکەکەوە.**
**لە کاتی سپاردنی بۆردین کارتەکەشیدا، دیسانەوە نامەیەکی تریشیان بۆ نووساندبوو بە مێزەکەوە. ئەویشی لێکردەوە.**

سۆفیا و ئەلبێرتۆ بەسەر پردی "بریڤیکس"دا تێپەڕین، پاش کەمێکیش گەیشتنە سەر دووڕیانی "کراگەئیو"، ئەوجا سۆفیا گوتی؛
ـ لەسەر 180 دەڕۆیت.
ـ کاتژمێر لە نۆ نزیک دەبێتەوە. هێندەی نەماوە لە فڕۆکەخانەی کیڤیک بنیشێتەوە. هەرچۆنێکیش بێت پۆلیسی مرور ناتوانێت بمانگرێت.
ـ ئەی ئەگەر لە ئۆتۆمبیلێکی ترمان دا؟
ـ ئەگەر ئۆتۆمبیلێکی ئاسایی بێت، ئەوا هیچ ڕوونادات. بەڵام ئەگەر یەکێک لەمانەی وەک خۆمان بێت...
ـ ئێ؟
ـ ئەوا دەبێت زۆر ئاگاداربین. نەت بینی چۆن بەلای ماشێنە گەورەکەدا تێپەڕین؟
ـ نەخێر.
ـ لەلای گردەکەی سەرەوەدا وەستابوو.
ـ بەڵام سەختە بەلای ئەم پاسی گەشتوگوزاریەی بەردەممان‌دا تێپەڕین، لەبەرئەوەی لە هەردوو لاوە دارستانە.

ـ ئاساییە سۆفیا. بەڵام دەبێت ڕابێیت.
ئەلبێرتۆ پێچێکی کردەوە، ڕێک بەناو دارستانەکەدا ڕووبەڕووی ئەو هەموو دارە گەورانە لێیخوڕی و بەناویاندا تێپەڕی.
سۆفیا هەناسەیەکی هەڵکێشا.
ـ تۆ منت ترساند.
ـ تەنانەت ئەگەر بە دیوارێکی پۆڵاشدا بڕۆین، هێشتام هەر هەست بە هیچ ناکەین.
ـ واتە لەچاو چواردەورەکەماندا تەنها وەک ڕۆحێکی سوک واین؟
ـ نەخێر، بەم شێوەیە بە پێچەوانەوە دەیبینیت. لەڕاستیدا هەقیقەتی چواردەورمان وەک چیرۆکێکی سوکە بەلای ئێمەوە.
ـ بەیارمەتیت بۆ ڕوونبکەرەوە.
ـ کەواتە باش گوێ بگرە؛ وا باوە بەشێوەیەکی هەڵە دەگوترێت ڕۆح لە هەڵمی ئاو «سوکترە»، بەڵام پێچەوانەکەی ڕاستە؛ ڕۆح لە سەهۆڵ «پتەوترە.«
ـ هەرگیز لەوەوپێش بیرم لەوە نەکردبۆوە.
ـ کەواتە چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە. جارێکیان پیاوێک هەبوو باوەڕی بە فریشتە نەبوو. بەڵام ڕۆژێکیان کاتێک لە دارستانەکەدا کاریدەکرد، فریشتەیەک هاتە لای.
ـ بەڵێ، ئەی پاشان؟
ـ بۆ ماوەیەک پێکەوە ڕۆیشتن و دواجار پیاوەکە ڕوویکردە فریشتەکە و گوتی؛ «ناچارم دان بەوەدا بنێم کە فریشتە هەیە، بەڵام ئێوە لە ڕاستیدا وەک ئێمە بوونتان نیە». «مەبەستت چیە؟» فریشتەکە پرسی. پیاوەکەش لە وەڵامدا گوتی؛ «کاتێک گەیشتینە لای بەردە گەورەکە، من ناچاربووم خۆم لابدەم و بەدەوری بەردەکەدا بڕۆم، بەڵام

سەرنجمدا تۆ ڕێک بەناویدا تێپەڕیت. کاتێکیش گەیشتینە لای ڕەگی داره گەورەکەی سەر ڕێگاکە، من ناچاربووم بەسەریدا هەڵزنێم، بەڵام تۆ هەر زۆر بەئاسانی بەردەوام ڕۆیشتیت». وەڵامی پیاوەکە سەری فریشتەکەی سوڕماند و ئەوجا گوتی؛ «ئەی سەرنجی ئەوەت نەدا کاتێک بە زەلکاوەکەدا ڕۆیشتین؟ لەوێدا هەردووکمان بەناو تەمەکەدا ڕۆیشتین، لەبەرئەوەی پێکهاتەی ئێمە لە تەم پتەوترە.«

- بەڵێ...

- هەمان شتیش بەسەر ئێمەدا دەچەسپێت، سۆفیا. ڕۆح دەتوانێت بەناو دەرگای پۆڵادا تێپەڕێت. هیچ تۆپێک و چەکێک ناتوانێت شتێکی ڕۆحی بهاڕێت یان بیفەوتێنێت.

- بیرکردنەوە لەو بابەتە بەلامەوە سەیرە.

- پاش کەمێک بەلای "ڕیسۆر"دا تێدەپەڕین و لەو کاتەشەوە کە کوخەکەی مێجەرمان جێهێشتووە، هێشتام سەعاتێکیش تێنەپەڕیووە. بەڵام ئێستاکە حەزم لە قاوەیەکە.

کە گەیشتنە "فیانە"، ڕێک لەپێش "سویندلید"دا، بەدەستی چەپدا بەلای قاوەخانەیەکدا ڕۆیشتن. ناوی «سەندرێلا» بوو. ئەلبێرتۆ لایدا و لەسەر چیمەنێک ئۆتۆمبیلەکەی وەستاند.

سۆفیا لە قاوەخانەکەدا بە هەموو شێوەیەک هەوڵیدەدا ساردیەک بەرزبکاتەوە، بەڵام بێسوود بوو. لەوە دەچوو بەمێزەکەوە چەسپ کرابێت. پاش کەمێک ئەلبێرتۆ کوپێکی مقەبای لە ئۆتۆمبیلەکەدا دۆزیەوە و بە هەموو هێزیەوە دەیویست بەلوعەی قاوەکە بۆ خوارەوە ڕاکێشێت، بەڵام هەرچەندێکی دەکرد نەیدەتوانی لە شوێنی خۆی بیجوڵێنێت.

ئەلبێرتۆ زۆر توڕەبوو، ئاوڕی لە خەڵکەکە دایەوە و داوای یارمەتی لێکردن. کاتێکیش کەس وەڵامی نەدایەوە، هێندە بە توندی قیژانی کە سۆفیا لە تاواندا هەردوو گوێچکەی خۆی گرت؛

ـ قاوەم دەوێت!

کە بۆی دەرکەوت هیچ شتێک ڕوونادات، کەمێک ساردبووەوە و خەریک بوو لە پێکەنیندا بەپشتدا بکەوێت.

ـ خۆ گوێیان لێمان نیە! بێگومان ناشتوانین سوود لە قاوەخانەکەیان ببینین.

خەریک بوو بڕۆنە دەرەوە بەڵام لەپڕێکدا پیرێژنێک لەسەر یەکێک لە کورسیەکان بەرزبووەوە و بەرەو ڕوویان هات. تەنورەیەکی سووری تۆخ و بلوسێکی شینی بەدەست چنراوی لەبەردابوو، لەچکێکی سپیشی لەسەریەوە ئاڵاندبوو. ڕەنگی جلەکانی بەری و کەسایەتیەکەشی لەگەڵ هەموو شتێکی تری قاوەخانەکەدا جودا بوو.

بەرەو ڕووی ئەلبێرتۆ ڕۆیشت و گوتی؛

ـ چ نەڕەیەکت پێوەیە، کوڕم!

ـ ببوورە.

ـ گوتت قاوەت دەوێ، وا نیە؟

ـ بەڵێ، بەڵام...

ـ ئێمە دەزگایەکی پچکۆلەمان لەم نزیکانەدا هەیە.

لەگەڵ پیرێژنەکەدا ڕۆیشتنە دەرەوە و لەپشتەوە چوونە سەر ڕێگایەکی باریک. لەکاتی ڕۆیشتندا پیرێژنەکە گوتی؛

ـ دیارە ئێوە نوێن لەم ناوەدا؟

ـ بەڵێ ڕاستە... ئەلبێرتۆ وەڵامی دایەوە.

ـ بەڵێ، بەڵێ، کەواتە بەخێربێنە جیهانی هەتاهەتاییەوە، کۆرپەکانم.
ـ ئەی تۆ خۆت؟
ـ من لە چیرۆکی برایانی گریمەوە هاتووم. خەریکە دوو سەد ساڵێکی بەسەردا تێدەپەڕێت. ئەی ئێوە لەکوێوە هاتوون؟
ـ ئێمە لە کتێبێکی فەلسەفیەوە هاتووین. من مامۆستای فەلسەفەم و ئەمەش سۆفیای قوتابیمە.
پیرێژنەکە بەدەم مرخەمرخی پێکەنینەوە وتی؛
ـ بەڵێ، ئەمەیان شتێکی نوێیە!
پاش کەمێک بەناو دارەکاندا تێپەڕین و گەیشتنە پانتاییەک. لەوێدا چەند خانویەکی ڕەنگ قاوەیی دڵفڕێنی لێبوو. لەسەر پانتایی نێو خانوەکاندا ئاگرێکی گەورەی جەژنی یۆحەنایان کردبووەوە و چەندین کەسی پڕ ڕەنگیش بەدەوری ئاگرەکەدا جمەیان دەهات. سۆفیا زۆربەیانی دەناسیەوە. سەندرێللا و هەندێک لە حەوت کورتە بنەکەی لێبوو. پیتەر پان و پیپی گۆرەوی درێژ و واستۆن و شارلۆک هۆڵمس و کڵاوسوورەش ئامادەبوون. جگە لەوانەش لە دەوری ئاگرەکەدا چەندین دەموچاوی ناسراوی لێبوو کە هیچ ناوێکیان نەبوو؛ هەموو ئەوانە ئامادەبوون کە پێیان دەگوترێت کەسایەتیە خەیاڵیەکان.
ـ چ هەراو هوریا و قەرەباڵخیەکە!... ئەلبێرتۆ گوتی.
بەڵام وەک دەزانیت جەژنی یۆحەنایە... پیرێژنەکە وەڵامی دایەوە. لە ڕۆژی «فالبۆرگ»یشەوە کۆبوونەوەی ئاوهامان نەبووە، ئەو کاتە لە ئەڵمانیادا بووین. ئێستاکە من هەروا بۆ سەردانێکی پچکۆلە هاتوومەتە ئێرە. گوتت قاوە دەخۆیتەوە، وانیە؟
ـ بەڵی، سوپاست دەکەم.

ئەوجا سۆفیا بۆی دەرکەوت کە هەموو خانووەکان لە کێک و شەکر بەفرین دروستکراون. هەندێک لە میوانەکان ڕاستەوخۆ لە خانووەکانیان دەخوارد و ئافرەتێکیش بەدەوری خانووەکاندا دەخولایەوە و شوێنە خوراوەکانی چاکدەکردەوە. سۆفیا گازێکی پچکۆلەی لە سوچی خانویەک گرت. تامەکەی لە هەموو ئەو شتانەی لەوەو پێش خواردبوونی خۆشتر و شیرینتر بوو.
پاش کەمێک پیرێژنەکە بە خۆی و قاوەوە گەڕایەوە لایان.
- زۆر زۆر سوپاس... ئەلبێرتۆ گوتی.
- ئەی میوانەکانمان لەباتی قاوەکە چی دەدەن؟
- چی دەدەین؟
- لێرە باوە لەبری شتێک چیرۆکێک دەگێڕنەوە، بەڵام لەبری قاوەیەک حەکایەتێکی بچکۆلەش هەر باشە.
- لەڕاستیدا دەمانتوانی تەواوی چیرۆکی سەیروسەمەرەی مرۆڤایەتیتان بۆ بگێڕینەوە، بەڵام بەداخەوە کاتمان کەمە. ئاساییە گەر کەڕەتێکی تر بێینەوە و بۆتانی بگێڕینەوە؟
- بێگومان ئاساییە، بەڵام بۆچی کاتتان کەمە؟
ئەلبێرتۆ باسەکەی بۆ گێڕایەوە و دواجار پیرێژنەکە گوتی؛
- بەڵێ، بەڕاستی ئێو تازە لەدایکبوون، بەڵام دەبێت لەمەودوا پەتی ناوکتان لەگەڵ ڕەگەزی مرۆڤدا ببڕن. ئێمە چیتر سەربە گۆشت و خوێنی مرۆڤ نین. ئێستاکە ئێمە سەربە «خەڵکانی نەبینراوین.«
پاش کەمێک سۆفیا و ئەلبێرتۆ گەڕانەوە لای قاوەخانەکەی سەندرێللا و ئۆتۆمبیلە سوورەکەیان. ڕێک لە تەنیشت ئۆتۆمبیلەکەوە ئافرەتێک میزی بە منداڵەکەی دەکرد، دیاربوو پەلەی بوو.

پاش بڕینی چەند ڕێگایەکی قەدبڕ بەسەر دار و بەرددا، گەیشتنە لیللەساند.

کاتژمێر **9،35** دەقەی ئێوارە فڕۆکەی «**SK876**» لە فڕۆکەخانەی کیڤیک نیشتەوە. مێجەر لەکاتی هەستانی فڕۆکەکەدا لە کۆبنهاگنەوە، دواهەمین نامەی کردەوە، کە لە کاتی سپاردنی بۆردین کارتەکەیدا دۆزیبوویەوە؛

»بۆ مێجەر ئەلبێرت کنەی، مێزی بۆردین کارتی فڕۆکەخانەی کۆبنهاگن، ئێوارەی جەژنی یۆحەنا **1990**؛
باوکی خۆشەویستم؛ لەوانەیە لەو بڕوایەدابوو‌بیت لە پڕێکدا لە فڕۆکەخانەی کۆبنهاگندا دەرکەوم، بەڵام دەسەڵاتم بەسەر هەڵسوکەوت و هات و چۆتدا زۆر لەوە زیرەکانەترە. من لە هەموو شوێنێکدا دەتبینم بابە. لە ڕاستیدا سەردانی هەمان خێزانی قەرەجم کرد کە چەندین ساڵ لەمەوبەر ئاوێنە ئەفسوناویەکەیان بە نەنکم فرۆشت. جگە لەوەش تۆپێکی کریستاڵیشم پەیدا کردووە. لە کاتی ئێستادا دەتبینم خەریکە لەسەر کورسی ناو فڕۆکەکە دادەنیشیت، لەبەرئەوە لە بیرت بێت قایشەکەت باش ببەستیت و لە شوێنی خۆتدا بمێنەرەوە هەتاوەکو گڵۆپەکە دەکوژێتەوە. هەر کە فڕۆکەکە هەستا، ئەو کاتە دەتوانیت پاڵبدەیتەوە و کەمێک ماندوویت دەرکەیت، لەبەرئەوەی وا باشترە کاتێک کە دەگەیتەوە ماڵەوە ماندوویت دەرچووبێت. ئاوهەوای لیللەساند تا بڵێیت خۆشە، بەڵام پلەی گەرمای کەمێک لە پلەی گەرمای لوبنان کەمترە. هیوای سەفەرێکی خۆشت بۆ دەخوازم.

سڵاو و خۆشەویستی کچە جادووگەرەکەت، شاژنی ئاوێنەکە.»

لەڕاستیدا ئەلبێرت نەیدەزانی تورەیە یان شەکەت و ماندوو، بەڵام لە پڕێکدا دایە قاقای پێکەنین... هێندە بەدەنگی بەرز پێکەنی، کە خەڵکانی چواردەوری هەموویان ئاوڕیان دایەوە و تەماشایان کرد.
ئەوجا فڕۆکەکە هەستا.
لە ڕاستیدا هیلدە هەر هەمان یاریەکەی باوکی بەکاردەهێنایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازیەکی گەورەی هەبوو... گەمەکەی ئەلبێرت، بەشێوەیەکی سەرەکی بەسەر ئەلبێرتۆ و سۆفیادا دەشکایەوە... ئەوانیش، تەنها فەنتاسی بوون و هیچی تر!
ئەلبێرت ئامۆژگاریەکەی هیلدەی ڕەچاوکرد، کەمێک پاڵیدایەوە و چاوێکی بۆ گەرم کرد. کاتێکیش بەشوێنی پاسپۆرت کۆنترۆڵکردنی فرۆکەخانەی کیڤیکدا تێپەڕی، هێشتام بە تەواوەتی خەبەری نەبووبووەوە. لەوێدا کە گەیشتە ناو هۆڵەکە، ڕووبەڕووی خۆپیشاندانێکی ڕاستەقینە بووەوە.
نزیکەی هەشت نۆ کەسێک دەبوون و زۆربەیان لە تەمەنی هیلدەدا بوون. لەسەر بەیاخەکانیشیان نووسیبوو؛ «بەخێربێیتەوە بابە!»، «هیلدە لە باخچەکەدا چاوەڕوانتە»، «هێشتام ئایرۆنی هەر بەردەوامە.»!
لە هەموو شتێک خراپتریش ئەوە بوو کە نەیدەتوانی یەکسەر سواری تەکسیەک ببێت و بڕوات، چونکە دەبوایە چاوەڕوانی جانتاکانی بکردایە. بەو شێوەیەش ناچاربوو لەنێوان برادەرەکانی هیلدەدا بمێنێتەوە و بەیاخەکانیان دووبارە و سێ بارە بخوێنێتەوە، بەڵام تەواو هەستی بزوا کاتێک کە یەکێک لە کچەکان بە خۆی و چەپکێک

**گوڵەوە هاتە بەردەمی... دەستیکرد بەیەکێک لە کیسەکاندا و سەرو چکلێتێکی خۆشی دانێ. ئەوجا تەنها دوو دانە بۆ هیلدە مابووەوە. کاتێکیش جانتاکان گەیشتن، یەکێک لەکوڕەکان هاتە پێشەوە و پێی ڕاگەیان کە لە خزمەتی «شاژنی ئاوێنەدایە» و فەرمانی پێکراوە هەتا بیرکێلی بگەیەنێت. خۆنیشاندەرەکانی تریش لەناو قەرەباڵخیەکەدا ونبوون.**

**سواری ئۆتۆمبیلەکە بوون و لە هەموو شوێنێکدا، لەسەر کونی تونێل و پردەکاندا، بەیاخی گەورەی جیاواز جیاواز هەڵواسرابوون؛ «بەخێربێیتەوە!»، «قەلەمونەکەمان خەریکە دەکولێ و چاوەڕوانتە!»، «بابە، دەتوانم بتبینم.»!**

**کاتێک کە گەیشتنە بەردەرگایماڵەوە، ئەلبێرت هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەک سوپاسێکیش 100 کرۆن و سێ بیرەی قورسی بە شۆفێرەکە بەخشی.**

**ماریتی هاوسەری لەبەردەرگا چاوەڕوانی دەکرد، پاش ئەوەی تێر باوەشیان بەیەکتردا کرد، لێی پرسی؛**

**ـ ئەی هیلدە کوا؟**

**ـ لە خوارەوەیە، لەلای بەلەمەکە چاوەڕوانت دەکات.**

ئەلبێرتۆ و سۆفیا سەیارە سوورەکەیان ڕێک لە تەنیشت ئوتێلی نەرویجدا لە گۆڕەپانی لیللەساندا ڕاگرت. کاتژمێر چارەکی دەویست بۆ دە. لەوێوە دەیانتوانی ئاگری کراوەی دوورگەکانی ئەوبەر ببینن.

ـ بە چ شێوەیەک بیرکێلی بدۆزینەوە؟... سۆفیا پرسی.

ـ بەدوایدا دەگەڕێین، خۆ تابلۆی کوخەکەی مێجەرت لە یادە؟

ـ بەڵام دەبێت خێرابکەین، دەمەوێت پێش ئەوەی بگات بیبینم.

بەچەند لاڕێیەکدا لێیان خوڕی، بەسەر دار و بەرد و لێژایی و تەپۆڵکەشدا دەڕۆیشتن. دەگەڕان و دڵنیابوون بیرکێلی لە تەنیشت ئاویکەوەیە.

لە پڕێکدا سۆفیا هاواریکرد؛

ـ لەوێدایە! دۆزیمانەوە.

ـ پێم وابێت ڕاست دەکەیت، بەڵام هێندە بەرز مەقیژێنە.

ـ گوێ دەدەیتە چی، خۆ کەس ناتوانێت دەنگمان ببیستێت!

ـ سۆفیای ئازیز، پاش ئەو کۆرسە فەلسەفیە دورو درێژە هێشتام هەر بەپەلە دەرئەنجام دەدەیت بەدەستەوە... هەست بەنائومێدی دەکەم.

ـ بەڵام...

ـ ناشێت لەو بڕوایەدابیت ئەم شوێنە بەتاڵ بێت لە جنۆکەی باش و جادووباز و ڕۆحە دارستانیەکان و پەریە باشەکان؟

ـ ئۆیی... ببوورە!

بەناو دەرگای باخچەکەدا ئۆتۆمبیلەکەیان لێخوڕی و بەسەر چەوەڵانەکەی بەردەمماڵەکەدا تێپەڕین. ئەلبێرتۆ ئۆتۆمبیلەکەی لە پانتاییەکی تەنیشت جۆلانەی باخچەکەوە ڕاگرت. کەمێکیش لەولاترەوە مێزێک بۆ سێ کەس ئامادەکرابوو.

سۆفیا بەگوێی ئەلبێرتۆدا چرپاندی؛

ـ دەتوانم هیلدە ببینم! هەروەک چۆن لە خەونەکەمدا بینیم، ئەوەتا لە تەنیشت بەلەمەکەوە دانیشتووە.

ـ ئەی دەبینیت چۆن باخچەکەش هەر لە باخچەکەی ماڵی خۆتان دەچێت؟

ـ بەڵێ ڕاست دەکەیت، تەنانەت جۆلانەکەش... هەموو شتێک هەروەک ئەوێیە. ئاساییە بچم بۆ لای؟

ـ بێگومان ئاساییە، بەڵام من لێرەدا دادەنیشم...
سۆفیا بەڕاکردن چووە خوارەوە. خەریک بوو خۆی بدات بە هیلدەدا، بەڵام پاشان خۆی گرتەوە و بە جوانی لە تەنیشتیەوە دانیشت.
هیلدە دانیشتبوو و یاری بە پەتی بەلەمە بەستراوەکە دەکرد. کاغەزێکی چکۆلەش لە دەستی چەپیدا بوو. چەند جارێک تەماشای کاتژمێرەکەی کرد، ئاشکرا دیاربوو کە چاوەڕوانی شتێکە. سۆفیا، هیلدەی زۆر بەلاوە جوانبوو. قژێکی زەرد و لول و دوو چاوی سەوزی جوانی پێوەبوو. بەکراسە هاوینیە زەردەکەشیەوە، کەمێک لە یۆرون دەچوو.
هەرچەندە سۆفیا دەیزانی بێسوودە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیدا قسەی لەگەڵدا بکات.
ـ هیلدە! من ناوم سۆفیایە!
هیلدە بە هیچ جۆرێک وەڵامی نەدایەوە و بێئاگابوو لێی.
سۆفیا لەسەر ئەژنۆ دانیشت و هاواریکرد بە گوێیدا؛
ـ هیلدە، گوێت لێمە؟ کەڕ و کوێریت، یان چی؟
هەستیکرد هیلدە کەمێک چاوی داپچڕی. ئایا ئەوە نیشانەیەک نیە کە گوێی لە شتێک بێت، تەنانەت ئەگەر زۆر کەمیش بێت؟
ئەوجا سەرلەنوێ ئاوڕیدایەوە. بەلای ڕاستدا سەری وەرچەرخاند و ڕێک تەماشای ناو چاوی سۆفیای کرد. بەڵام چاوی لەسەر ڕانەگرت، لەوە دەچوو لەناو سۆفیاوە تەماشای شتێکی تر بکات.
ـ هێندە توند نا، سۆفیا!
ئەلبێرتۆ بوو لە تەنیشت سەیارەکەوە هاواری لێکرد و ئەوجا بەردەوام گوتی؛
ـ نامەوێت هەموو باخچەکە پڕ بێت لە پەری دەریایی.

سۆفیا بە بێدەنگی دانیشت. بەلای سۆفیاوە تەنانەت دانیشتنیش لەتەنیشت هیلدەوە هەر خۆش بوو.
لە پڕێکدا گوێی لە دەنگی پیاوێک بوو کە گوتی «هیلدە گیان»!
مێجەر بوو، بە خۆی و جلە سەربازیەکانی بەری و کڵاوە شینەکەی سەریەوە، لەسەری سەرەوەی باخچەکەدا ڕاوەستابوو.
هیلدە هەستا و بەڕاکردن بەرەوڕووی ڕۆیشت. لەنێوان جۆلانە و ئۆتۆمبیلە سوورەکەدا بەیەک گەیشتن. باوەشی پێداکرد و بەرزیکردەوە بۆ ئاسمان و باوەخولەی پێکرد.

**هیلدە لەسەر پردی بەلەمەکە دانیشتبوو و چاوەڕوانی باوکی دەکرد. لەو کاتەوەی باوکی لە فڕۆکەخانەی کۆبنهاگن نیشتبووەوە، هیلدە بەردەوام لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئاخۆ ئێستا چی دەکات و بە چ شێوەیەک پەیامەکانم وەردەگرێت. هەر لەبەیانیشەوە هەموو کاتەکانی لەسەر پەڕەیەک نووسیبووەوە و بەردەوام لە دەستیدابوو.**
**چۆنە ئەگەر تووڕە بێت؟ بەڵام خۆ ناشتوانێت هەروا بە ئاسانی کتێبێکی پڕ لە نهێنی بۆ کچەکەی بنووسێت و لە هەمان کاتیشدا چاوەڕوانی ئەوە بێت کە هیچ ڕوونەدات؟**
**جارێکی تریش تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کردەوە. ئێستاکە دە و چارەکە. لە ئێستا بەدواوە، دەبێت لەپڕێکدا خۆی بکات بە ژووردا.**
**بەڵام ئێستاکە هەروەک خەونەکەی کە بە سۆفیاوە بینی، گوێی لە دەنگێکی هێواشە... ئەو دەنگە چیە؟**
**ئاوڕێکی دایەوە... دڵنیابوو کە شتێک لەو «ناوەدایە»، بەڵام چی؟**
**بڵێیت تەنها جوانی ئێوارەیەکی هاوین بێت و هیچی تر؟**
**بۆ چەند چرکەیەک هەستی دەکرد توانای بینینی پەنهانی هەبێت.**

ـ هیلده گیان!
ئێستاکه دەبوایه بەلاکەی تردا ئاوڕ بداتەوە. بابەی بوو! لەسەری سەرەوەی باخچەکەدا وەستابوو.
هیلده بەپەلە هەستایه سەرپێ و بەڕاکردن بەرەوڕووی ڕۆیشت. لە تەنیشت جۆلانەکەدا بەیەک گەیشتن. باوکی، هیلدەی لەباوەشکرد و بە ئاسماندا بەرزیکردەوە و باوەخولەی پێکرد.
هیلده دەستیکرد بەگریان و باوکیشی نەیتوانی فرمێسکەکانی ڕابگرێت.
ـ بوویت بە ژنێکی تەواو، هیلده.
ـ تۆش بوویت بە نووسەرێکی ڕاستەقینە!
هیلده بە کراسە زەردەکەی فرمێسکەکانی سڕی.
ـ هەقی خۆمم لێکردیتەوە، بەڵام ئێستاکە وەک یەکین، وا نیە؟
ـ ڕاستە، پاکمان لە پاک... باوکی وەڵامی دایەوە.
لەسەر مێزەکە دانیشتن. لەپێش هەموو شتێکدا هیلده دەیویست باوکی تەواوی هەموو بەسەرهاتەکەی فڕۆکەخانەی کۆبنهاگنی بۆ بگێڕێتەوە، پاشان یەک لەسەر یەک قاقای پێکەنینیان لێدەدا.
ـ ئەی نامەی ناو قاوەخانەکەت نەبینی؟
ـ بۆ هێشتت دابنیشم و شتێک بخۆم، هەی زۆرزان! ئێستاکەش وا خەریکە لەبرساندا دەمرم.
ـ بابە داماوەکەم.
ـ پێم وابێت باسی قەلەمونەکەش هەروا بۆ خۆشی بوو، وانیە؟
ـ نا، نا، وا نیە! بەڕاستی هەموو شتێکم ئامادەکردووە، بەڵام بڕیارە دایکم سفرە بڕازێنێتەوە.

ئەوجا بە چەپ و ڕاستدا کەوتنە باسکردنی مەلەفە گەورەکە و ئەلبێرتۆ و سۆفیا. پاش ماوەیەک دایکی قەلەمونەکەی خستە سەر مێزەکە، زەلاتە و شەرابێکی کاڵیشی دانا، دواتریش نانە سپیەکەی هێنا کە هیلدە زۆری حەز لێبوو.
باوکی باسی پلاتۆنی دەکرد و لەپڕێکدا هیلدە قسەکانی پێبڕی.
- ششششش...
- چیە؟
- گوێت لێ نیە؟ لەوە دەچێت جیکەی شتێک بێت.
- نەخێر؟
- بەلام دڵنیام دەنگی شتێک دێت... بەهەرحاڵ لەوانەیە مشک بێت.
لەو کاتەدا دایکی بۆ شەراب هێنان چووە ژوەرەوە و باوکی گوتی؛
- بەلام مێژووی فەلسەفەکە هێشتام تەواو نەبووە.
- مەبەستت لە چیە؟
- ئەم شەو باسی گەردوونت بۆ دەکەم.
پێش ئەوەی ئاهەنگە بچکۆلەکەیان دەست پێبکەن، باوکی ڕوویکردە هاوسەرەکەی و گوتی؛
- هیلدە گەورەبووە و چیتر ناخرێتە سەر کۆش، بەلام تۆ هێشتام ماوتە!
ئەوجا ماریتی ڕاکێشا و خستیە سەر کۆشی، بەناچاری پێش ئەوەی دەست بەنان خواردن بکات، ماوەیەکی دورو درێژ لەوێدا مایەوە.
- دەشڵێین خەریکە لە تەمەنی چل ساڵی نزیک دەبیتەوە...

پاش ئەوەی هیلدە بەرەوڕووی باوکی ڕایکرد، سۆفیا خۆی بۆ نەگیرا و فرمێسکەکانی ڕێچکەیان بەست.

سۆفیا هەرگیز نەیدەتوانی ببێتە ئەو!
بەخیلی پێدەبرد، لەبەرئەوەی هیلدە مرۆڤێکی ڕاستەقینەیە و لە گۆشت و خوێن پێکهاتووە.
کاتێک هیلدە و مێجەر لەسەر مێزەکە دانیشتن، ئەلبێرتۆ هۆڕنێکی لێدا.
سۆفیا تەماشایەکی کرد. لەوە دەچوو هیلدەش بەهەمان شێوە ئاوڕبداتەوە.
سۆفیا ڕایکردە لای ئەلبێرتۆ و لەناو سەیارەکەدا لە تەنیشتیەوە دانیشت.
ـ با کەمێک لێرەدا دانیشین و بزانین چی ڕوودەدات.
سۆفیا سەرێکی بۆ لەقاند.
ـ گریایت؟
دیسانەوە سەرێکی بۆ لەقاندەوە.
ـ بۆچی؟
ـ هیلدە خۆشبەختە، چونکە مرۆڤێکی ڕاستەقینەیە... هێواش هێواش گەورە دەبێت و دەبێتە ئافرەتێکی تەواو. بێگومان پاشان منداڵی ڕاستیشی دەبێت...
ـ منداڵی منداڵیشی دەبێت، سۆفیا. بەڵام هەموو شتێک دوو لایەنی هەیە. ئەمەش یەکێک بوو لەو شتانەی هەر لەسەرتای دەستپێکردنی ئەم کۆرسی فەلسەفەیەوە، هەوڵمدا فێرت بکەم.
ـ مەبەستت چیە؟
ـ منیش وەک تۆ لەو بڕوایەدام خۆش بەخت بێت. بەڵام ئەو کەسەی گرەوی ژیان دەباتەوە، دەبێت گرەوەی مردنیش بباتەوە، لەبەرئەوەی گرەوی ژیان و مردن پێکەوەیە.

ـ بەڵام ئایا ئەو ژیانە باشتر نیە وەک لەوەی کە هەرگیز بەڕاستی نەژین؟

ـ ئێمە ناتوانین ژیانێکی وەک ژیانی هیلدە بژین... یان بۆ نمونە وەک ژیانی مێجەر. بەڵام لە بەرامبەردا هەرگیز نامرین. لەبیرت چووەوە پیرێژنەکەی ناو دارستانەکە چی وت؟ ئێمە سەربە «خەڵکانی نەبینراوین». جگە لەوەش گوتی تەمەنی خۆی نزیکەی دوو سەدساڵێک دەبێت. بەڵام لە ئاهەنگەکەی ئەوێدا چەند کەسایەتیەکم بینی کە تەمەنیان لە سێ هەزار ساڵ زیاتر بوو...

ـ لەوانەیە بەخیلی... بەخیلی بە ژیانی خێزانی هیلدە ببەم.

ـ ئێ خۆ تۆش خێزانت هەیە. پشیلەیەک و یەک دوو بولبول و کیسەڵێکت نیە؟

ـ پێم وابێت دەستمان لەو هەقیقەتە هەڵگرت.

ـ بە هیچ جۆرێک. تەنها مێجەر لەو هەقیقەتەدا دەرچووە. ئەو خاڵی کۆتایی دانا، کچەکەم. تازە هەرگیز ناتوانێت بمان دۆزێتەوە.

ـ مەبەستت لەوەیە دەتوانین بگەڕێینەوە؟

ـ بەئارەزوی خۆمان. بەڵام دەبێت چاومان بە چەند برادەرێکی دارستانەکەی پشت قاوەخانەکەی «سەندرێللا»ش بکەوێت.

خێزانی میوللە کنەی بۆ نانخواردن دانیشتن. بۆ ساتێک سۆفیا دەترسا نانخواردنەکەیان وەک ئاهەنگی فەلسەفیەکەی باخچەکەی خۆیانی لێبێت. هەرچۆنێک بێت لەوە دەچوو مێجەر بیەوێت ماریت بدات بەسەر مێزەکەدا، بەڵام دیسانەوە ڕایکێشایەوە سەر باوەشی.

ئۆتۆمبیلەکەیان کەمێک لە دوری خێزانەکەوە ڕاگرتبوو. تەنها جارجارێک گوێیان لە قسەکانیان دەبوو. سۆفیا و ئەلبێرتۆ لەسەیارەکەدا مانەوە و تەماشای باخچەکەیان دەکرد. ئەوجا بە

ڕاشکاوی ڕووداوەکانی ئاهەنگە ناخۆشەکەی خۆیان دەهێنایەوە بەرچاو.
نزیکەی نیوە شەو، خێزان لەسەر مێزی نانخواردن هەستان، ئەوجا هیلدە و مێجەر بەرەو جۆلانەی باخچەکە کەوتنە ڕێ. دەستیان بۆ دایکی ڕاوەشاند، کە دەیویست بڕواتە ناو خانوە سپیەکەوە.
ـ تۆ بخەوە دایە! چونکە ئێمە بابەتی زۆرمان هەیە باسیان بکەین.

## تەقینەوە گەورەکە «The Big Bang»
## ...ئێمەش گەردی ئەستێرەین...

هیلدە بەڕاشکاوی لەتەنیشت باوکیەوە لەسەر جۆلانەکە بۆی دانیشت. کاتژمێر نزیکەی دوانزەبوو. دانیشتبوون و تەماشای دەریاکەیان دەکرد. لەو کاتەدا چەند ئەستێرەیەکی ئاسمان دەدرەوشانەوە. شەپۆلەکانیش هێواش هێواش خۆیان دەکێشا بە بەردەکانی ژێر پردی بەلەمەکەدا.

لەپڕێکدا باوکی بێدەنگیەکەی شکاند و گوتی؛

ـ سەیرە کاتێک بیر لەوە دەکەینەوە کە لەسەر ئەستێرەیەکی پچکۆلەی گەردووندا دەژین.

ـ بەڵێ...

ـ زەوی یەکێکە لەو کۆمەڵە ئەستێرەیەی کە بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە، بەڵام تەنها ئەم گۆی زەویەی ئێمە ئەستێرەیەکی زیندووە.

ـ لەوانەیە لە هەموو گەردوونیشدا هەر تەنها بێت؟

ـ بەڵێ، ڕێی تێدەچێت. بەڵام لەوانەشە گەردوون جمەی بێت لە ژیاندا، لەبەرئەوەی گەردوون یەکجار گەورەیە. مەوداکان هێندە دورودرێژن کە بە «خولەکی تیشکی» و «ساڵی تیشکی» دەیان پێوین.

ـ مەبەستت چیە؟

ـ خولەکی تیشکی ئەو دوریەیە کە تیشک لە ماوەی یەک خولەکدا دەیبڕێت. ئەوەش دوریەکی زۆرە، چونکە تیشک **300000** هەزار کیلۆمەتری گەردوون لە تەنها یەک چرکەدا دەبڕێت. واتە خولەکێکی

تیشکی یەکسانە بە 60 کەڕەت 300000 یان 18 ملیۆن کیلۆمەتر. ساڵێکی تیشکیش نزیکەی دە بلیۆن کیلۆمەترە.

ـ ئەی خۆر چەندێک لێمانەوە دورە؟

ـ کەمێک لەسەرو هەشت خولەکی تیشکیەوە دورە. واتە ئەو تیشکەی لە ڕۆژێکی گەرمی مانگی شەشدا ڕوومەتمان گەرم دەکات، پێش ئەوەی بە ئێمە بگات هەشت خولەکێک بە گەردووندا تێپەڕیووە.

ـ بەردەوام بە!

ـ دوری «پلۆتۆ Pluto» کە دورترین ئەستێرەی کۆمەڵەی خۆری خۆمانە، لەم گۆی زەویەی خۆمانەوە نزیکەی پێنج کاتژمێری تیشکی دەبێت. واتە کاتێک ئەستێرە ناسێک لە تەلیسکۆبەکەیەوە تەماشای پلۆتۆ دەکات، ئەوا لە ڕاستیدا پێنج کاتژمێر لەوەوپێشی دەبینێت، دەشتوانین بڵێین هەتا وێنەی پلۆتۆ دەگاتە لامان، پێنج کاتژمێری پێدەچێت.

ـ مەزەنەکردنی ئەمە کەمێک سەختە، بەڵام پێم وابێت لە مەبەستت تێدەگەم.

ـ زۆر باشە هیلدە، بەڵام وا خەریکە بەرە بەرە دەچینە ناو باسەکەمانەوە. ئەم خۆرەی ئێمە لەگەڵ 400 ملیارد ئەستێرەی تردا، لە گەلەهەسارەیەکدا (مەجەرە) کۆبوونەتەوە کە پێی دەگوترێت «ڕێگای کاکێشان». ئەم گەلەهەسارەیەش لە خەپلەیەکی یەکجار گەورە دەچێت کە چەندەها لولپێچی تێدایە و خۆریش سەربە یەکێک لەو لولپێچانەیە. ئەگەر لە شەوێکی ڕوونی زستاندا تەماشای ئاسمان بکەین، ئەوا پشتوێنە ئەستێرەیەکی پان بەدیدەکەین، لەبەرئەوەی ڕێک تەماشای چەقی "ڕێگای کاکێشان" دەکەین.

- لەوانەیە لەبەر ئەو هۆیە بێت کە بە سویدی بە ڕێگای کاکێشان دەڵێن «ڕێگای زستان.»
- دوری نزیکترین ئەستێرەی هاوسێمان لە ڕێگای کاکێشاندا، چوار ساڵی تیشکییە. لەوانەیە ڕێک ئەو دانەیە بێت کە ئێستاکە دەیبینین؟ ئەگەر بیهێنیتە بەرچاوت کە لەم کاتەدا یەکێک لەوێوە دانیشتووە و بەهۆی تەلیسکۆبێکی تیژەوە تەماشای بیرکێلی دەکات، ئەوا ڕێک چوار ساڵ لەمەوبەری بیرکێلی دەبینێت. لەوانەیە کچێکی یانزە ساڵان ببینێت کە لەسەر جۆلانەکە دانیشتووە و قاچەکانی ڕادەوەشێنێت.
- سەرم دەسوڕمێت.
- بەڵام ئەوەی کە باسمان کرد نزیکترین ئەستێرە بوو. هەموو گەلەهەسارەکە، یان هەروەک پێشی دەگوترێت «تەمە ئەستێرەکان»، **90000** ساڵی تیشکی پانە. واتە تیشک ئەو هەموو ساڵەی پێدەچێت بۆ ئەوەی لەم سەرەوە تا ئەو سەری گەلەهەسارەکە بڕوات. کاتێکیش تەماشای ئەستێرەیەکی ڕێگای کاکێشان دەکەین کە **50000** ساڵی تیشکی دوورە، ئەوا **50000** ساڵ لەمەوبەری دەبینین.
- ئەمە بەلای سەرێکی بچکۆلەی وەک منەوە، بیرکردنەوەیەکی گەورەیە.
- واتە تەنها شێوەیەک کە بتوانین تەماشای گەردوونی پێبکەین، لە ڕێگەی بینینی ڕابووردووەوەیە. لەبەرئەوە هەرگیز ناکرێت بزانین گەردوون «ئێستاکە» بە چ شێوەیەکە، بەڵکو تەنها ئەوەندە دەزانین کە لەوەوپێش چۆن «بووە». واتە کاتێک تەماشای ئەستێرەیەک دەکەین کە هەزار ساڵی تیشکی دورە، ئەوا لە ڕاستیدا دەگەڕێینەوە سەر هەزار ساڵ لەوەوپێشی مێژووی گەردوون.

- زۆر سەختە لەوە تێبگەین.
- بەڵام ئێمە هەموو شتێک لە ڕێگەی شەپۆلی تیشکیەوە دەبینین، کە بەرچاومان دەکەوێت. ئەو شەپۆلانەش بۆ ئەوەی بۆشایی ببڕن، پێویستیان بە کات هەیە. دەتوانین لەگەڵ هەورە بروسکەدا بەراوردی بکەین. هەمیشە پاش ئەوەی هەورە بروسکەکە دەبینین، گوێمان لە هەورە گرمەکە دەبێت. ئەوەش لەبەرئەوەیە کە شەپۆلی دەنگ لە شەپۆلی تیشک خاوترە. کاتێک کە گوێم کە گرمەیەک دەبێت، ئەوا لە ڕاستیدا گوێم لە شتێک دەبێت کە کەمێک لەوەوپێش ڕوویداوە. کاتێکیش کە تەماشای ئەستێرەیەک دەکەم کە هەزارساڵی تیشکی دوورە، ئەوا «بروسکەی» ڕووداوێک دەبینم کە هەزار ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە.
- ئێستاکە بە باشی تێدەگەم.
- بەڵام هەتاوەکو ئێستا تەنها باسی ئەم گەلەهەسارەیەی خۆمانمان کردووە. ئەستێرە ناسەکان لەو بڕوایەدان کە نزیکەی سەد ملیارد گەلەهەسارەی لەو بابەتە لە گەردووندا هەبێت. هەر یەکەش لەو گەلەهەسارانە لە سەدەها ملیارد ئەستێرە پێکهاتووە. نزیکترین گەلەهەسارە لە ڕێگای کاکێشانەوە پێی دەگوترێت «تەمی ئاندرۆمیدا **Andromeda**»، کە دوو ملیۆن ساڵی تیشکی لە گەلەهەسارەکەی خۆمانەوە دورە. واتە هەروەک لەوەوپێش گوتمان، تیشکی ئەو گەلەهەسارەیە پێویستی بە دوو ملیۆن ساڵە بۆ ئەوەی پێمان بگات. دیسانەوە واتە کاتێک تەماشای ئاسمان دەکەین و «تەمی ئاندرۆمیدا» دەبینین، ئەوا لە ڕاستیدا تەماشای دوو ملیۆن ساڵ لەمەوبەری دەکەین. ئەگەر کەسێک لە تەلیسکۆبە نایابەکەیەوە لەوێوە تەماشای زەوی بکات (چاوم لێیە هەر ئێستاکە زۆرزانێک خەریکە لولەی

تەلیسکۆبەکەی دەخاتە سەر زەوی) ئەوا ناتوانێت ئێمە ببینێت، بەڵکو چەند مرۆڤێکی نیاندەرتاڵ دەبینێت.
ـ هیلدە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا.
ـ دورترین گەلەهەسارە کە ئەمڕۆکە ناسراوبێت، نزیکەی دە ملیارد ساڵی تیشکی لێمانەوە دورە. واتە ئەگەر نیشانەیەکمان لەو گەلەهەسارەیەوە پێبگات، ئەوا کات دەگەڕێنینەوە بۆ دە ملیارد ساڵ لەمەوبەری مێژووی گەردوون. ئەوەش، دوو ئەوەندەی تەمەنی کۆمەڵەی خۆری خۆمانە.
ـ سەرم بەتەواوەتی گێژ دەخوات.
ـ پێدەچێت مەزەنەکردنی گەڕانەوەی ئەو ماوە دورودرێژەی مێژوو سەخت بێت، بەڵام ئەستێرە ناسەکان گەیشتوونەتە شتێکی تر کە مانایەکی گەورەتر بە بینینی جیهانی ئێمە دەبەخشێت.
ـ باسی کە!
ـ لەوە دەچێت هیچ گەلەهەسارەیەک لە شوێنی خۆیدا بەئارامی نەوەستابێت. هەموو گەلەهەسارەکانی گەردوون بە خێراییەکی یەکجار گەورە لە یەکتری دور دەکەونەوە. هەتاوەکو دورتریش بن لێمانەوە، وا دێنە بەرچاو کە خێراتر دەجولێێنەوە. واتە هێدی هێدی دوری نێوان گەلەهەسارەکان گەورەتر و گەورەتر دەبێت.
ـ هەوڵدەدەم بیهێنمە بەرچاوم.
ـ ئەگەر میزەڵدانێک بهێنیت و چەند خاڵێکی ڕەشی لەسەر دابنێیت، ئەوا لەگەڵ فووتێکردندا نەختە نەختە خاڵەکان لەیەک دور دەکەونەوە. هەمان شتیش بەسەر گەلەهەسارەکانی گەردووندا ڕوودەدات. ئێمە دەڵێین گەردوون پان دەبێتەوە یان درێژ دەبێتەوە.
ـ ئەی هۆکەی چیە؟

- زۆربەی ئەستێرە ناسەکان لەسەر یەک جۆر لێکدانەوەی درێژبوونی گەردوون تەبان. پێش پانزە ملیارد ساڵ هەموو مادەکانی گەردوون لە پانتاییەکی پچکۆلەدا خڕبووبنەوە، لەبەرئەوە چڕیەکەی بێ ڕادە زۆر بووە. ئەوجا بە هۆی هێزی ڕاکێشانەوە مادەکە یەکجار گەرم بووە. لە دواجاریشدا چڕی و گەرمیە زۆرەکەی بوونەتە هۆی ئەوەی مادەکە بتەقێتەوە. ئەو تەقینەوەیەیە کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن «The Big Bang»، واتە تەقینەوە گەورەگە .
- تەنها بە بیرکردنەوە لەوە ، موچوڕکە بەلەشمدا دێت.
- تەقینەوە گەورەکە بووە هۆی ئەوەی هەموو مادەی گەردوون بە هەموو لایەکدا پەرشوبڵاو ببێتەوە و پاشانیش کە مادەکە بەرە بەرە سارد دەبێتەوە، ئەستێرە و گەلەهەسارەکان و مانگ دروست دەبن...
- بەڵام تۆ گوتت گەردوون بەردەوام پان دەبێت؟
- وایە، ئەوەش ڕێک بە هۆی ئەو تەقینەوەوەیە کە چەندین ملیارد ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە، چونکە گەردوون جوگرافیەکی هەتاهەتایی (*نەگۆڕ و) نیە. گەردوون ڕووداوێکە. گەردوون تەقینەوەیەکە و گەلەهەسارەکانیش بەردەوام بە خێراییەکی گەورە لە یەکتری دور دەکەونەوە.
- بەو شێوەیەش هەتاهەتایە بەردەوام دەبێت، وا نیە؟
- ئەوە یەکێکە لە ئەگەرەکان، بەڵام ئەگەرێکی تریشمان هەیە. لەوانەیە لە یادت بێت کاتێک ئەلبێرتۆ باسی دوو هێزی بۆ سۆفیا دەکرد و دەیگوت دەبنە هۆی ئەوەی ئەستێرەکان بەهێڵێکی نەگۆڕ بەدەوری خۆردا بخولێنەوە؟
- هێزی ڕاکێشان و هێزی سستی نەبوو؟

ـ بەڵێ، لە نێوان گەلەهەسارەکانیشدا هەمان پەیوەندیمان هەیە. لەبەرئەوەی هەرچەندە گەردوون بەردەوام پان دەبێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێزی ڕاکێشان کاریگەریەکی پێچەوانەی هەر دەبێت. کاتێکیش کەمە کەمە هێزی تەقینەوە گەورەکەی یەکەمجار کەمتر و کەمتر دەبێتەوە، لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان (لەماوەی چەند ملیارد ساڵێکی تردا) هێزی ڕاکێشان سەرلەنوێ هەموو تەنە ئاسمانیەکان پێکەوە بنووسێنێتەوە. ئەو کاتە پێچەوانەی تەقینەوەکە ڕوودەدات، واتە ئەو شتەی کە پێی دەڵێن «تەقینەوەی ناوەکی». «Implosion» بەڵام چونکە دوریەکە یەکجار گەورەیە، لەبەرئەوە وەک «فلیمێک» ڕوودەدات کە بەخاوی لێبدرێت. لەوانەیە بکرێت لەگەڵ فشکردنەوەی میزەڵدانێکدا بەراوردبکرێت.

ـ ئایا پاشان هەموو گەلەهەسارەکان کۆدەبنەوە و سەرلەنوێ تەنێکی گەورە پێکدەهێننەوە؟

ـ بەڵێ، باش تێگەیشتیت. بەڵام ئەی پاش ئەوە چی ڕوودەداتەوە؟

ـ کەواتە دیسان تەقینەوەیەکی تر ڕوودەداتەوە و ڕێگە بە گەردوون دەدات سەرلەنوێ پەرشوبڵاو ببێتەوە. لەبەرئەوەی یاسا سروشتیەکان هەروەک خۆیان دەمێننەوە. بەو شێوەیەش ئەستێرە و گەلەهەسارەی نوێ دروست دەبنەوە.

ـ بیرکردنەوەیەکی ڕاستە. ئەستێرە ناسەکان دەبارەی پاشەڕۆژی گەردوون، دوو ئەگەر لەبەردەم خۆیاندا دادەنێن؛ یان ئەوەتا گەردوون هەتاهەتایە لەسەر پان بوونەوەکەی بەردەوام دەبێت و بەو شێوەیەش هێواش هێواش دوری نێوان گەلەهەسارەکان زیاتر و زۆرتر دەبێت، یاخود گەردوون دیسانەوە کۆدەبێتەوە. ڕوودانی هەریەکێک لەو ئەگەرانەش کەوتۆتە سەر قورسی یان چڕی گەردوون، ئەمەش

شتێکە کە هەتاوەکو ئێستاکە ئەستێرە ناسەکان زانیاریەکی تەواوەتیان دەربارەی نیە.

ـ بەڵام «ئەگەر» گەردوون هێندە چڕبێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێتە هۆی ئەوەی کۆببێتەوە، کەواتە ڕێی تێدەچێت لەوەوپێش چەندین جار بڵاوبووبێتەوە و سەرلەنوێ کۆبووبێتەوە؟

ـ بیرکردنەوەیەکی سەرنجڕاکێشەرە، بەڵام لێرەشدا دیسانەوە تیۆریەکە دەبێتەوە بە دوو بەشەوە. چونکە ڕێی تێدەچێت پان بوونەوەکەی گەردوون شتێک بێت کە تەنها ئەم جارە ڕوویدابێت. بەڵام ئەگەر بۆ هەتاهەتایە هەر درێژببێتەوە، ئەوا بابەتی چۆنیەتی دەستپێکردنی هەموو شتێک دەکەوێتە بەر فشارێکی گەورەترەوە.

ـ ئەی ئەو هەموو مادەیەی لەپڕێکدا تەقیەوە، چۆن دروستبوو؟

ـ لێرەدا بەلای مەسیحیەکەوە تەقینەوەی یەکەم، چرکەی یەکەمینی خوڵقاندنە. لەبەرئەوەی خودا لە ئینجیلدا دەڵێت «ڕووناک ببەرەوە!» لەوانەشە لەیادت بێت کە ئەلبێرتۆ دەیگوت ئاینی مەسیحی بە شێوەیەکی «هێڵی» تەماشای مێژوو دەکات، لەبەرئەوە لە ڕوانگەی بڕوای مەسیحیەوە، ئەگەر بڵێین گەردوون بەردەوام درێژدەبێتەوە، ئەوا ئەو کاتە لەگەڵ بڕواکەیاندا باشتر دەگونجێت.

ـ بەڵێ.

ـ بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لە ڕۆژهەڵاتدا شێوە بینینێکی «بازنەیی» مێژوویان هەیە. واتە مێژوو بە شێوەیەکی هەتاهەتایی خۆی دووبارە دەکاتەوە. بۆ نمونە لە هیندستاندا تیۆریەکی کۆنیان هەیە دەڵێت گەردوون بۆیە خۆی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی دیسانەوە کۆببێتەوە. بەو شێوەیەش، هەروەک هیندیەکان خۆیان دەڵێن، «ڕۆژی براهمان» و «شەوی براهمان» یەک بەدوای یەکتردا دێن. بێگومان ئەم بۆچوونەش

**لەگەڵ تیۆری دووهەمدا باشتر دەگونجێت کە دەڵێت گەردوون لە پرۆسەیەکی «بازنەیی» هەتاهەتایدا بڵاودەبێتەوە و سەرلەنوێ کۆدەبێتەوە. واتە دەتوانم دڵێکی گەورەی گەردوونی ببینم کە بەردەوام لێدەدات و لێدەدات و...**

**- پێم وابێت هەردوو تیۆریەکە وەک یەک سەختن و وەک یەکیش سەرنجڕاکێشەرن.**

**- دەشکرێت لەگەڵ ئەو پارادۆکسە هەتاهەتاییەدا بەراورد بکرێت، کە سۆفیا کەڕەتێکیان لە باخچەکەیاندا دانیشتبوو و بەقوڵی بیری لێدەکردەوە؛ یان ئەوەتا گەردوون هەمیشە هەر هەبووە، یان لە پڕێکدا لە هیچی نەبووەوە دروستبووە...**

**- ئای...**

**هیلدە دەستی بۆ ناوچەوانی برد.**

**- چی بوو؟**

**- وابزانم مێشولەیەک پێوەی دام.**

**- پێدەچێت ئەوە سوکرات بێت و بیەوێت لە خەونێکی دورودرێژ بەخەبەرت بکاتەوە...**

سۆفیا و ئەلبێرتۆ لە ئۆتۆمبیلە سوورەکەدا دانیشتبوون و گوێیان لە مێجەر دەگرت کە باسی گەردوونی بۆ هیلدە دەکرد. پاش کەمێک ئەلبێرتۆ پرسی؛

- سەرنج دەدەیت ئێستاکە ڕۆڵەکان بەتەواوەتی هەڵگەڕاونەتەوە؟

- مەبەستت چیە؟

ـ جاران ئەوان گوێیان لە قسەکانمان دەگرت و ئێمەش نەمان دەتوانی بیان بینین. بەڵام ئێستاکە ئێمە گوێ دەگرین و ئەوان ناتوانن بمان بینن.
ـ نەک تەنها هەر ئەوە.
ـ ئەی چی تریش؟
ـ لەسەرەتادا نەماندەزانی هەقیقەتێکی تر بوونی هەیە و هیلدە و مێجەری تێدا دەژی. بەڵام ئێستاکە ئەوان هیچ شتێک دەربارەی هەقیقەتی ئێمە نازانن.
ـ تۆڵە سەندنەوە خۆشە.
ـ بەڵام مێجەر دەیتوانی بێتە ناو جیهانەکەمانەوە...
ـ ئاخر وەک دەزانیت ئەو کاتە جیهانەکەمان تەنها چەند فێڵ و تەڵەکەیەکی جیاواز جیاوازی مێجەربوو و هیچی تر.
ـ منیش هەر بەو هیوایەوەم کە ئێمەش بتوانین بچینە ناو ژیانیانەوە.
ـ بەڵام ئەوە مەحاڵە و خۆشت باش دەزانیت. لەبیرت چووەوە لە قاوەخانەکەی «سەندرێللا»دا چی ڕوویدا؟ بیرمە کە چۆن دەتویست شوشەی ساردیەکە بەرزبکەیتەوە.
سۆفیا کەمێک بێدەنگ بوو و تەماشای دەریاکەی دەکرد، لەو کاتەدا مێجەر باسی تەقینەوە گەورەکەی دەکرد و شتێک لەناو دەربڕینەکەیدا، بیرکردنەوەیەکی نوێی لە مێشکی سۆفیادا گەڵاڵەکرد. سۆفیا لەناو سەیارەکەدا کەوتە تەپ و هوڕ. پاش کەمێک ئەلبێرتۆ لێی پرسی؛
ـ چیە؟
ـ هیچ.

سندوقی ئامێرەکانی کردەوە و ئیسپانەیەکی دەرهێنا. لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرت و لە ماشێنەکەدا هاتە دەرەوە. چووە لای جۆلانەکە و لەبەردەمی هیلدە و مێجەردا وەستا. هەوڵیدا سەرنجی هیلدە ڕابکێشێت، بەڵام بێسوودبوو. پاشان ئیسپانەکەی بەرزکردەوە و کێشای بەناوچەوانی هیلدەدا.

- ئای... لەدەمی هیلدەوە هاتە دەرەوە.

ئەوجا سۆفیا ئیسپانەکەی کێشا بەناوچەوانی مێجەردا، بەڵام ئەو هەستی بەهیچ نەکرد.

- چی بوو؟ باوکی پرسی.

- وابزانم مێشولەیەک پێوەیدام.

- پێدەچێت ئەوە سوکرات بێت و بیەوێت لە خەونێکی دوورودرێژ بەخەبەرت بکاتەوە...

سۆفیا لەسەر گیاکە پاڵکەوت و دەیویست بە قاچی پاڵ بە جۆلانەکەوە بنێت، بەڵام لە شوێنی خۆیدا چەقیبوو... یان لەوە دەچوو توانیبێتی یەک ملیمەتر بیجوڵێنێت؟

- قاچم سەرمایەتی... هیلدە گوتی.

- بەڵام خۆ ئاوهەوای ئەم شەو خۆشە.

- مەبەستم تەنها لە ئاوهەوا نیە. هەستدەکەم شتێک «لێرەدایە.»

- تەنها من و تۆ و شەوێکی جوانی هاوینی لێیە.

- نەخێر هەست دەکەم شتێک لە هەوادایە.

- وەکو چی؟

- پیلانە نهێنیەکەی ئەلبێرتۆت لەیادە؟

- بەڵێ، بێگومان... چۆن شتی وام بیردەچێتەوە؟

- لە ئاهەنگی باخچەکەدا ونبوون و لەوە دەچوو زەوی قووتیدابن...

- بەڵام...
- «لەوە دەچوو زەوی قووتی دابن....»
- بەڵام خۆ دەبوایە چیرۆکەکە لە شوێنێکدا تەواو بوایە و وەک دەزانیت ئەوەش شتێک بوو کە هەروا من نووسیبووم...
- بەڵێ ڕاستە، بەڵام نەتنووسیبوو پاشان چی ڕوودەدات. مەزەنەی ئەوە بکە گەر ئێستاکە لێرەدا بن...
- لەو بڕوایەدایت؟
- وا هەستدەکەم، بابە.
سۆفیا بەپەلە بەرەو ئۆتۆمبیلەکە ڕایکرد. لە کاتێکدا بە ئیسپانەکەی دەستیەوە خەریکبوو بێتە ناوەوە، ئەلبێرتۆ بەناچاریەوە گوتی؛
- سەرسوڕهێنەرە! بێگومانم کە تۆ چەند توانایەکی تایبەتیت هەیە کچەکەم.

**مێجەر دەستی کردە ملی هیلدە.**
**- گوێت لەو دەنگە خۆشەی شەپۆلی ئاوەکان نیە؟**
**- بەڵێ گوێم لێیە.**
**- بەیانی بەلەمەکە دەخەینە ناو ئاوەکەوە.**
**- بەڵام ئەی گوێت لێ نیە هەواکە چ سرتە سرتێکی سەیری هەیە؟ تەماشای گەڵای دارەکان بکە چۆن دەلەرێنەوە.**
**- وەک دەزانیت ئەستێرەیەکی پڕ ژیانمان هەیە...**
**- تۆ شتێکت دەربارەی ناواخنی «نێو دێڕەکان» نووسیبوو.**
**- بەڵێ.**
**- لەوانەیە لەم باخچەیەشدا شتێک «لەناو دێڕەکاندا» هەبێت؟**

- هەرچۆنێک بێت، سروشت پڕە لە نهێنی. ئێستاش باسی ئەستێرەکانی ئاسمان دەکەین.
- لەناو ئاویشدا ئەستێرە هەیە.
- بەڵێ، کە منداڵبوویت پێت دەگوت «ڕووناکی ئەستێرە». بە شێوەیەک لە شێوەکانیش ڕاستت دەکرد، لەبەرئەوەی ڕووناکی ئەستێرەکان و هەموو تەنەکانی تریش لە مادەیەک دروستبوون، کە لەوەوپێش تەنها یەک ئەستێرە بووە.
- ئێمەش؟
- بەڵێ، ئێمەش گەردی ئەستێرەین.
- ئەو قسەیەم بەلاوە جوانە.
- تەلیسکۆبە ڕادیۆییەکان تیشکی ئەو گەلەهەسارانە وەردەگرن کە چەندین ملیارد ساڵی تیشکی دورن، لێرەشەوە دەتوانین بەهۆیانەوە نەخشەی گەردوون بکێشین، بەشێوەیەکیش ڕێک هەروەک ئەو کاتەیە کە لە سەرەتای سەرەتادا و لە پاش تەقینەوە گەورەکەوە هەبووە. واتە هەرچی شتێک کە لە گەردووندا دەیبینین، شوێنەواری گەردوونی هەزارەها و ملیۆنەها ساڵ لەمەوبەرە. تەنها شتێکیش کە ئەستێرەناسێکی فیزیاوی بتوانێت بیکات، تەماشاکردنی ڕابووردوە.
- لەبەرئەوەی پێش ئەوەی ڕووناکی ئەستێرەکان بە ئێمە بگات، ئەستێرەکان لە ئێمە دوردەکەونەوە؟
- ئەگەر تەنها دوو هەزار ساڵێک بگەڕێینەوە دواوە، ئەوا دەبینین ئەستێرەکان، لەچاو ئەو شێوەیەی ئەمڕۆکە دەیانبینین، تەواو تەواو جیاوازن.
- ئەوەم نەزانیبوو.

- له شەوێکی ڕووندا هەزارەها، بەڵکو ملیاردەها ساڵی ڕابووردوی مێژووی گەردوون دەبینین. بەو شێوەیەش تا ڕادەیەک دەچینەوە سەر ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتووین.

- بۆم ڕوونبکەرەوە...

- من و تۆش لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەدا دەستمان پێکردووە، لەبەرئەوەی هەموو مادەی گەردوون یەک ئۆرگانیزمە (*یەک مادەیە.و) لەسەرەتای سەرەتادا هەموو مادەکە لەیەک تۆپەڵی یەکجار چڕدا کۆبووبوەوە. چڕییەک کە «سەرە دەرزیەکی» چەندین ملیارد تەن بووە. ئەم «ئەتۆمە سەرەتاییە»ش بەهۆی کێشە مەزنەکەیەوە تەقیوەتەوە. ئەو کاتە لەوە دەچوو کە شتێک بشکێت و پەرشوبڵاو ببێتەوە، بەڵام ئێستاکە کاتێک تەماشای ئاسمان دەکەین، هەوڵدەدەین ڕێگای چوونەوەی ناو خۆمان بدۆزینەوە.

- بە شێوەیەکی سەیر دەرتبڕی.

- هەموو ئەستێرەکان و گەلەهەسارەکانی گەردوون لە هەمان مادە دروستبوون. هەندێک لەبەشەکانی لێرە و لەوێدا کۆبوونەتەوە و تۆپەڵەیەکیان پێکهێناوە. لەوانەیە ملیارد ساڵی تیشکی لە نێوان گەلەهەسارەیەک و گەلەهەسارەیەکی تردا هەبێت، بەڵام هەموو شتێک لەیەک سەرچاوەوە هاتووە، هەموو ئەستێرەکان لە یەک ڕەگەزەوە هاتوون...

- تێدەگەم.

- بەڵام ئەی ئەو مادە گەردونیە چیە؟ ئەو شت چی «بوو» کە ملیاردەها ساڵ لەمەوبەر تەقییەوە؟ ئەو شتە چۆن دروست بوو؟

- ئەوە نهێنیە گەورەکەیە.

**ـ بەڵام ئەوە شتێکە کە پەیوەندی بە هەموومانەوە هەیە، لەبەرئەوەی ئێمە خۆمان لەو مادەیەوە هاتووین. ئێمە پریشکێکی ئەو ئاگرە گەورەیەین کە چەندین ملیارد ساڵ لەوەوپێش داگیرساوە.**

**ـ ئەمەشیانم بەلاوە جوانبوو.**

**ـ بەڵام با گرنگیەکی لە ڕادەبەدەر نەدەین بەو هەموو ژمارە گەورانە. هێندە بەسە ئەگەر بەردێک بەدەستمانەوە بگرین. بەڵام ئەو کاتەش ئەگەر گەردوون بەقەد ئەو بەردەبووایە کە لە پرتەقاڵێک گەورەتر نیە، ئەوا دیسانەوە هەر لێی تێنەدەگەیشتین. سەرلەنوێ هەمان پرسیار سەری هەڵدەدایەوە؛ ئەم بەردە چۆن دروست بووە؟**

لەپڕێکدا سۆفیا لە سەیارەکەدا بەرزبووەوە و پەنجەی بۆ دەریاچەکە ڕاکێشا و گوتی؛

ـ زۆر حەز دەکەم کەمێک سواری بەلەم ببم.

ـ بەستراوەتەوە، جگە لەوەش هێزی ئەوەمان نیە سەوڵ لێبدەین.

ـ هەوڵێک نەدەین؟ ئێوارەی جەژنی یۆحەنایە ئیتر...

ـ بەلایەنی کەمەوە دەتوانین بچینە لای ئاوەکەوە.

لە سەیارەکە هاتنە دەرەوە و بە ڕاکردن بەناو باخچەکەدا ڕۆیشتن.

لای بەلەمەکەوە، بەو پەڕی توانایان هەوڵیان دەدا پەتە بەستراوەکەی بەلەمەکە، لە ئاسنە چەقیوەکەی قەراغ ئاوەکە بکەنەوە. پاش کەمێک ئەلبێرتۆ گوتی؛

ـ دەڵێیت بەزەویدا داکوتراوە.

ـ بەڵام هێشتام کاتێکی باشمان لەبەردەستایە.

ـ وەک دەزانیت فەیلەسوفی ڕاستەقینە هەرگیز نابێت خۆی بدات بەدەستەوە. ئەگەر تەنها ئەم، ئا... ئا، ئا ئەم پەتەمان بکردایەتەوە...

**هێشتام هەر ئەستێرەی تریش دێنە ئاسمانەوە... هیلدە گوتی.**
**ـ بەڵێ، ئێستاکە تاریکترین شەوی هاوینە.**
**ـ بەڵام لە زستاندا دەدرەوشێنەوە. شەوی پێش سەفەرەکەی لوبنانت لەیادە؟ یەکەمین شەوی ساڵی نوێ بوو.**
**ـ ئەو ڕۆژە بوو کە بڕیارمدا کتێبێکی فەلسەفیت بۆ بنووسم. پێشتر ڕۆیشتمە لای کتێب فرۆشەکانی لیللەساند، تەنانەت چوومە کتێبخانە گەورەکانیش، بەڵام هیچ کتێبێکی وام بەرچاو نەکەوت کە تایبەت بێت بە گەنجان.**
**ـ لەوە دەچێت لەسەر ترۆپکی تاڵێکی باریکی فەرووی کەروێشکەکەدا دانیشتبین.**
**ـ تۆ بڵێیت کەسێکی تر لەو گەردوونە گەورەیەدا هەبێت؟**
**ـ تەماشاکە، بەلەمەکە بەربوو!**
**ـ بەڵێ، بەڕاست...**
**ـ مەحاڵە، ئەمڕۆکە پێش ئەوەی تۆ بگەڕێیتەوە، خۆم چوومە خوارەوە و بەوردی تەماشام کرد بەسترابووەوە...**
**ـ بەڕاست؟**
**ـ ئەو کاتەم بیردەخاتەوە کە سۆفیا سواری بەلەمەکەی ئەلبێرتۆ بوو. لەیادتە بەلەمەکەی چۆن لە ناوەڕاستی دەریاچەدا جێما؟**
**ـ کێ دەڵێت ئەم جارەشیان هەر پەنگی سۆفیا نیە؟**

ـ گاڵتەم  پێدەکەیت، بەڵام بە درێژایی ئێوارەکەمان هەستم دەکرد کەسێکمان لەگەڵدایە.
ـ دەبێت یەکێکمان بە مەلە خۆی بگەیێنێتە بەلەمەکە.
ـ بابە، با هەردووکمان بەمەلە بۆی بچین.